# مختصر صحيح مسلم

للإمام زكي الدين عبد العظيم عبد القوي المنذري
المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردى كردن و ڕوونكردنه‌وه‌ى
نورى فارس حمه‌خان

سه‌رپه‌رشتى چاپ
مه‌لا مه‌حموودى گه‌لاڵه‌يى

دار المعرفة
بيروت - لبنان

# مختصر

# صحيح مسلم

للإمام زكي الدين عبد العظيم بن عبد القوي المنذري

المتوفى ٦٥٦ هـ

به كوردی كردن و ڕونكردنه‌وه‌ی

**نوری فارس حمه‌خان**

سه‌رپه‌رشتی چاپ

مه‌لا مه‌حموودی گه‌لاڵه‌یی

( به‌رگی دووه‌م )

بسم الله الرحمن الرحيم




📖 ناوی کتێب ﴿ مختصر صحيح مسلم ﴾

📖 وەرگێڕانی: نوری فارس حەمەخان.

📖 تیراژ: (٣٠٠٠) دانــە.

📖 ژمارەی سپاردن: ژمارە (١٦٢٧)ی ساڵی (٢٠١١)ی وەزارەتی رۆشنبیری پێدراوە.

📖 ساڵی چاپ: ٢٠١١ز - ١٤٣٢ ك.

📖 تایپ: (نیان حسین)



# ٢- نـــامـەی زەكـــات

## كتاب الزكاة

{بڕوانــە: تــاج/٢، زنجــيرە: ١ هــەتا زنجــيرە: ٢٤ لــە ژمــارە: ١١٧٥ هــەتا ١٢٩٤ + تەجريد/٢، لاپەڕە: ٩٢ هەتا لاپەڕە: ١٥٦ لە ژمارە: ١٣٩٥/٦٦٦ هەتا ژمارە: ١٥١٢/٧٢٧ + فيقهی ئاسان/١ لاپەڕە: ٣١١ هـەتا لاپـەڕە: ٣٥٢ لـە زنجـيرە: ١١٣ وە هـەتا زنجـيرە: ١٣٦ + ريـاض/٣، لاپــەڕە: ١٤٦ هــەتا لاپــەڕە: ١٦١ لــە ژمـارە: ١٢٠٦ وە هــەتا ژمـارە: ١٢٢٠ لــە زنجيرە: ٢١٦ وە هەتا زنجيرە: ٢١٧}.

### ٣٨٩) باسی پێویستی (وجوب)ی زەكات. (١٢١ - ١٢٣).

### باب: وُجُوبِ الزكاةِ

٥٠١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): عَنْ مُعَاذٍ قَالَ: بَعَثَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « إِنَّكَ تَأْتِى قَوْمًا مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ. فَادْعُهُمْ إِلَى شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّهُ وَأَنِّى رَسُولُ اللَّهِ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ خَمْسَ صَلَوَاتٍ فِى كُلِّ يَوْمٍ وَلَيْلَةٍ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ فَأَعْلِمْهُمْ أَنَّ اللَّهَ افْتَرَضَ عَلَيْهِمْ صَدَقَةً تُؤْخَذُ مِنْ أَغْنِيَائِهِمْ فَتُرَدُّ فِى فُقَرَائِهِمْ، فَإِنْ هُمْ أَطَاعُوا لِذَلِكَ، فَإِيَّاكَ وَكَرَائِمَ أَمْوَالِهِمْ، وَاتَّقِ دَعْوَةَ الْمَظْلُومِ، فَإِنَّهُ لَيْسَ بَيْنَهَا وَبَيْنَ اللَّهِ حِجَابٌ ». {الحديث: ١٢١ = ١٣٢ فـم. تجريـد/٢/٩٢ رقـم: ٦٦٦ = ١٣٩٥، ١٤٥٨، ١٤٩٦، ٢٤٤٨، ٤٣٤٧، ٧٣٧١، ٧٣٧٢. أبو داود. زكاة: ١٥٨٤. ترمذى. زكاة: ٦٢٥. نسائى. زكاة: ٢٤٣٤. تحفة: ٦٥١١}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) موعـازی كوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەنو كردی بەسەركارو مامۆستایان، لەسەر ئـەم شێوەیە فەرمانی پێكردو پێی فەرموو: (ئەوا تۆ دەچیت بۆ ناو گەلێك، كە ئـەهلی كیتـابنو خـاوەنی نامـەنو، خـاوەن عـیلمو زانسـتنو بەشـی خۆیـان هۆشـیارن، لەبەرئـەوە بەنەزاكەت موخاطەبەیان بكە، كاتێ دەچیتە ناویان لەپێشدا داوایان لێ بكە شایەتی

بدەن: کە هەر خودا خودایەو خودای تر نییەو، من کە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلام، پێغەمبەری خودام، ئەوجا ئەگەر بۆ ئەمە بە گوێیان کردی، ئەوا پێشیان بڵێ: کە خودا (لەهەموو شەوو ڕۆژێکا) پێنج نوێژی لەسەریان داناوە، جا ئەگەر بۆ ئەمەیش بەگوێیان کردی، ئەوا پێیان بڵێ: کە خودای گەورە زەکاتی لەسەریان داناوە، کەلە دەوڵەمەندەکانیان وەردەگیرێ‌و دەدرێتەوە بە هەژارەکانیان، جا ئەگەر بۆئەمەیش بەگوێیان کردی، ئەوا نەکەیت بچیت نایابی سامان‌و ماڵەکانیان هەڵبژێری‌و لەباتی زەکات وەری بگری، بەڵکو ماڵی مامناوەندی لەباتی زەکات وەربگرە، وە خۆشت لەناڵەو نزای ستەمبار بپارێزە، چونکە ئاهو نزوولەی ستەمبار تیرێکی کوشندەیەو، لەگەڵ لەکەوان دەرچوو، بڕستی ستەمکار دەبڕێ‌و، هیچ شتێ بەری ناگرێ، تاخۆی دەگەیەنێتە بارەگای پەروەردگار). {ریاض/١/١٩٥، ژمارە: ٢٠٨، زنجیرە: ٢٦}.

### ٣٩٠) باسی زەکاتی پارەو دانەوێڵەو میوەو ئاژەڵ (٢٢٦٠ - ٢٢٧٤).

### بابٌ: مَافِيهِ الزَّكَاةُ مِنَ الأَمْوَالِ العَيْنِ والحَرْثِ وَالماشِيَةِ

٥٠٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لَيْسَ فِي حَبٍّ وَلاَ تَمْرٍ صَدَقَةٌ، حَتَّى تَبْلُغَ خَمْسَةَ أَوْسُقٍ، وَلاَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ ذَوْدٍ صَدَقَةٌ، وَلاَ فِيمَا دُونَ خَمْسِ أَوَاقٍ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٢٢٦٥ = ٢٢٤٣ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٠٠، رقم: ٦٧٢ = ١٤٠٥، ١٤٤٧، ١٤٥٩، ١٤٨٤. أبو داود. زكاة: ١٥٥٨. ترمذی. زكاة: ٦٢٦. نسائی. زكاة: ٢٤٤٥. تحفة الأشراف: ٤٤٠٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (خودای لێ ڕازی بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دانەوێڵەو خورماو بەری درەخت هەتا نەگاتە پێنج ویسق، زەکاتی لێ ناکەوێ، ژمارەی وشتر لەپێنج وشتر کەمتربێ، زەکاتی لێ ناکەوێ، زیو لەپێنج ئۆقیە کەمتربێ زەکاتی لێ ناکەوێ). {تاج/٢/٢٦، زنجیرە: ٧، ژمارە: ١٢٠٦ چاپی چوارەم}.

ئۆقیە چل درەمی زیوی ساغە، بەکێشانە، ئیتر سکەو دراوبێ، یا زیوی خشڵ، یا خاوبێ، جیاوازی نییە.

## ٣٩١) زەكاتی دەیەك‌و بیست یەك
## باب: مَافِيهِ العُشْرُ أَوْ نِصْفُ العُشْرِ

٥٠٣- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) يَذْكُرُ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « فِيمَا سَقَتِ الأَنْهَارُ وَالْغَيْمُ الْعُشُورُ، وَفِيمَا سُقِيَ بِالسَّانِيَةِ نِصْفُ الْعُشْرِ ». {الحديث: ٢٢٦٩ = ٢٢٤٧ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (زەكاتی بەراوو دیمەكار دەیەكە، وە زەكاتی ئەوەی بە وڵاخی چەرخ گێڕ ئاوبدرێ بیست یەكە). {تاج/٢/٢٦، زنجیرە: ٧، ژمارە: ١٢٠٧ چاپی چوارەم}.

## ٣٩٢) بەندەو ئەسپ‌و ماینی موسوڵمان زەكاتیان لێ ناكەوێ
## باب: لا زكاة عَلَى مُسْلِمٍ فِي عَبْدِهِ وَفَرَسِهِ

٥٠٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أن رسول الله (صلى الله عليه وسلم) قال: « لَيْسَ عَلَى الْمُسْلِمِ فِى عَبْدِهِ، وَلاَ فَرَسِهِ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٢٢٧٠ = ٢٢٤٨ فم. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ٧٠٢ = ١٤٦٣، ١٤٦٤. أبو داود. زكاة: ١٥٩٤، ١٥٩٥. ترمذي. زكاة: ٦٢٨. نسائي. زكاة: ٢٤٦٦، ٢٤٦٧، ٢٤٦٨، ٢٤٦٩، ٢٤٧٠، ٢٤٧١. ابن ماجة. زكاة: ١٨١٢. تحفة الأشراف: ١٤١٥٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (موسوڵمان لەم دوو شتەیدا زەكاتی لەسەر نییە: لە وڵاخی بەرزەی داو، لە كۆیلەیدا) واتە: ماین‌و ئەسپ‌و كۆیلە ژن بێ، یا پیاو، بەمەرجێ هی بازرگانی نەبن، زەكاتیان لێ ناكەوێ. {تاج/٢/١٦، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٩٠ چاپی چوارەم}.

## ٣٩٣) پێشخستنی زەكات، یا نەدانی زەكات
## باب: في تقديم الزَّكَاةِ وَمَنْعِها

٥٠٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عُمَرَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَقِيلَ: مَنَعَ ابْنُ جَمِيلٍ، وَخَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ وَالْعَبَّاسُ عَمُّ رَسُولِ اللَّهِ

(صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا يَنْقِمُ ابْنُ جَمِيلٍ إِلاَّ أَنَّهُ كَانَ فَقِيرًا فَأَغْنَاهُ اللَّهُ، وَأَمَّا خَالِدٌ فَإِنَّكُمْ تَظْلِمُونَ خَالِدًا قَدِ احْتَبَسَ أَدْرَاعَهُ وَأَعْتَادَهُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَأَمَّا الْعَبَّاسُ فَهِيَ عَلَيَّ، وَمِثْلُهَا مَعَهَا ». ثُمَّ قَالَ: « يَا عُمَرُ أَمَا شَعَرْتَ أَنَّ عَمَّ الرَّجُلِ صِنْوُ أَبِيهِ ». {الحديث: ٢٢٧٤ = ٢٢٥٢ فم. تجريد/٢/١٢٩، رقم: ٧٠٦ = ١٤٦٨. نسائي. زكاة: ٢٤٦٦. أبو داود. زكاة: ١٦٢٣. تحفة الأشراف: ١٣٩٢٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عومەری نارد كردی بەسەركاری سەر زەكات كە كۆی بكاتەوە، گوترا: ئیبنو جەمیلو خالیدی كوڕی وەلیدو عەبباسی مامەی پێغەمبەر زەكاتەكەیان نەداوە. كە ئەم هەواڵە درا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئیبنو جەمیل تۆڵەی ئەوە دەستێنێ، كە لەپێش ئیسلامبوونیدا هەژار بوو، لەپیتو فەڕی ئیسلامو، لە سایەی خوداو پێغەمبەرەوە ئێستا دەوڵەمەند بووە، واتە: ئەم كارەی ئیبنو جەمیل ئەوپەڕی سپڵەیی‌و پێنەزانییە، بەڵام ئێوە ناهەقی لەخالید دەكەن، چونكە ئەو تەنانەت زریەكەی‌و چەك‌و تفاقی جەنگی خۆیی تەرخان (وەقف) كردووە، لەڕێگەی خودادا، ئیتر چۆن زەكات نادات، عەبباسی كوڕی عەبدولموتتەلیبیش، كە هەق مامەی منە، كە پێغەمبەری خودام، بەڵێنتان دەدەمێ ئەو زەكاتەی كە لەسەریەتی دەیدات، وە ئەوەندەی تریش لەگەڵیدا دەبێ بدات.

ئەوجا فەرمووی: (ئەی عومەر! ئەوە نازانی كە مامەی پیاو لەجێی باوكیەتی؟). {بۆ باسی ئیبنو جەمیل بڕوانە تەجرید ژمارە: ٧٠٦}.

## ٣٩٤) هەڕەشە لە زەكاتنەدەر. (٢٢٩٥ - ٢٢٩٦)
## باب: فِيمَنْ لا يُؤَدِّي الزَّكَاةَ

٥٠٦- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضي الله عنه) قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ جَالِسٌ فِي ظِلِّ الْكَعْبَةِ، فَلَمَّا رَآنِي قَالَ: « الأَخْسَرُونَ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ ». قَالَ: فَجِئْتُ حَتَّى جَلَسْتُ، فَلَمْ أَتَقَارَّ أَنْ قُمْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، فِدَاكَ أَبِي وَأُمِّي مَنْ هُمْ؟ قَالَ: « هُمُ الأَكْثَرُونَ أَمْوَالاً، إِلاَّ مَنْ قَالَ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا (مِنْ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ وَعَنْ

**يَمِينِهِ، وَعَنْ شِمَالِهِ) وَقَلِيلٌ مَا هُمْ، مَا مِنْ صَاحِبِ إِبِلٍ وَلاَ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ، لاَ يُؤَدِّي زَكَاتَهَا، إلاَّ جَاءَتْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ أَعْظَمَ مَا كَانَتْ وَأَسْمَنَهُ، تَنْطِحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهَا بِأَظْلاَفِهَا كُلَّمَا نَفِدَتْ أُخْرَاهَا، عَادَتْ عَلَيْهِ أُولاَهَا حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ ». {الحديث: ٢٢٩٧ = ٢٢٧٥ فـم. بخاري. زكاة: ١٤٦٠، ٦٦٣٨. ترمذي. زكاة: ٦١٧. نسائي. زكاة: ٢٤٣٩. تحفة الأشراف: ١١٩٨١}:**

**ئەبو زەڕ** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: چووم بۆلای پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **لەسێبەری کەعبەدا دانیشتبوو، کە گەیشتمە لای و چاوی بەمن کەوت، فەرمووی: (سوێندم بەخودای کەعبە زیانمەندترین کەس خۆیانن!).**

**ئەبو زەڕ فەرمووی: منیش چووم لەخزمەتیدا دانیشتم، بەڵام ئۆقرەم پێ نەگیراو هەڵسامو عەرزیم کرد: ئەی پێغەمەری خودا! باوك و دایکم بەقوربانت بن، ئەوانە کێن کە گەورەترین زیانمەند خۆیانن؟ فەرمووی: (ئەوانە ئەوانەن کە زۆرترین ماڵو سامانیان هەیەو مافی مافدارانی لێ نادەن) ئەوجا پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **بەهەردوو دەستی ئاماژەی بۆ هەرچوار لای خۆی کرد، بۆ بەردەمیو بۆ پشتیو بۆلای راستیو بۆلای چەپیو فەرمووی: (مەگەر ئەوانەیان کە ئاوا بەهەر چوار لادا، سامان ببەخشنو لەڕێگەی خوادا ماڵی خۆیان خەرج بکەن، وە ئەم جۆرە خودا پێداوانەیش زۆر کەمن).**

**ئەوجا حەزرەت** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی وشتربێ، یاهی رەشەوڵاخ بێ، یاهی مەڕو بزنبێو مافی مافدارانیان لێ نەداو، زەکاتیان لێنەدا، لەرۆژی زینەوەدا، لە قیامەتدا، لە دەشتێکی کاکی بەکاکی تەختدا، لەسەر سك وەك بەڕە رادەخرێ بۆیان، ئەوجا ئەو ئاژەڵە دێن، هەتا بڵێی زل زلو قەڵەو قەڵەون، بە شاخ شۆقی تێ هەڵ دەدەن، بەسم گێرەی دەکەن، هەموو جارێ کەدواییەکەیان تێ دەپەڕێ بەسەریا، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆسەری ئیتر ئەو کابرایە ئەمە حاڵیەتی، تا دادگایی نێوانی ئەوخەڵکە تەواو دەبێ). {تاج/٢/١٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١١٨٦}.**

٥٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ صَاحِبِ ذَهَبٍ وَلاَ فِضَّةٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، إلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ صُفِّحَتْ لَهُ صَفَائِحَ مِنْ نَارٍ فَأُحْمِىَ عَلَيْهَا فِى نَارِ جَهَنَّمَ، فَيُكْوَى بِهَا جَنْبُهُ وَجَبِينُهُ وَظَهْرُهُ، كُلَّمَا بَرِدَتْ أُعِيدَتْ لَهُ، فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ فَيُرَى سَبِيلُهُ، إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالإِبِلُ؟ قَالَ: « وَلاَ صَاحِبُ إِبِلٍ لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، وَمِنْ حَقِّهَا حَلَبُهَا يَوْمَ وِرْدِهَا، إلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، أَوْفَرَ مَا كَانَتْ، لاَ يَفْقِدُ فَصِيلاً وَاحِدًا مِنْهَا، تَطَؤُهُ بِأَخْفَافِهَا، وَتَعَضُّهُ بِأَفْوَاهِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا، رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا، فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: فَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ؟ قَالَ: « وَلاَ صَاحِبُ بَقَرٍ وَلاَ غَنَمٍ، لاَ يُؤَدِّى مِنْهَا حَقَّهَا، إلاَّ إِذَا كَانَ يَوْمُ الْقِيَامَةِ بُطِحَ لَهَا بِقَاعٍ قَرْقَرٍ، لاَ يَفْقِدُ مِنْهَا شَيْئًا لَيْسَ فِيهَا عَقْصَاءُ، وَلاَ جَلْحَاءُ وَلاَ عَضْبَاءُ، تَنْطَحُهُ بِقُرُونِهَا وَتَطَؤُهُ بِأَظْلاَفِهَا، كُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ أُولاَهَا رُدَّ عَلَيْهِ أُخْرَاهَا فِى يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ، حَتَّى يُقْضَى بَيْنَ الْعِبَادِ، فَيُرَى سَبِيلُهُ إِمَّا إِلَى الْجَنَّةِ وَإِمَّا إِلَى النَّارِ. قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ فَالْخَيْلُ؟ قَالَ: « الْخَيْلُ ثَلاَثَةٌ: هِىَ لِرَجُلٍ وِزْرٌ، وَهِىَ لِرَجُلٍ سِتْرٌ، وَهِىَ لِرَجُلٍ أَجْرٌ، فَأَمَّا الَّتِى هِىَ لَهُ وِزْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا رِيَاءً وَفَخْرًا وَنِوَاءً عَلَى أَهْلِ الإِسْلاَمِ، فَهِىَ لَهُ وِزْرٌ، وَأَمَّا الَّتِى هِىَ لَهُ سِتْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ ثُمَّ لَمْ يَنْسَ حَقَّ اللَّهِ فِى ظُهُورِهَا وَلاَ رِقَابِهَا، فَهِىَ لَهُ سِتْرٌ، وَأَمَّا الَّتِى هِىَ لَهُ أَجْرٌ، فَرَجُلٌ رَبَطَهَا فِى سَبِيلِ اللَّهِ لأَهْلِ الإِسْلاَمِ فِى مَرْجٍ وَرَوْضَةٍ فَمَا أَكَلَتْ مِنْ ذَلِكَ الْمَرْجِ أَوِ الرَّوْضَةِ، مِنْ شَىْءٍ إلاَّ كُتِبَ لَهُ عَدَدَ مَا أَكَلَتْ حَسَنَاتٌ، وَكُتِبَ لَهُ عَدَدَ أَرْوَاثِهَا وَأَبْوَالِهَا حَسَنَاتٌ وَلاَ تَقْطَعُ طِوَلَهَا فَاسْتَنَّتْ شَرَفًا أَوْ شَرَفَيْنِ، إلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ آثَارِهَا وَأَرْوَاثِهَا حَسَنَاتٍ، وَلاَ مَرَّ بِهَا صَاحِبُهَا عَلَى نَهْرٍ فَشَرِبَتْ مِنْهُ وَلاَ يُرِيدُ أَنْ يَسْقِيَهَا إلاَّ كَتَبَ اللَّهُ لَهُ عَدَدَ مَا شَرِبَتْ حَسَنَاتٍ ». قِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: فَالْحُمُرُ؟ قَالَ: « مَا أُنْزِلَ عَلَىَّ فِى الْحُمُرِ شَىْءٌ إلاَّ هَذِهِ الآيَةُ الْفَاذَّةُ الْجَامِعَةُ: (فَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ، وَمَنْ يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ)». {الحديث: ٢٢٨٧ = ٢٢٦٥ فم. تجريد/٢/٩٥، رقم: ٦٧٠ = ١٤٠٢، ٢٣٧٨، ٣٠٧٣، ٩٦٥٨ + ١٠٤٢ =

٢٣٧١، ٢٨٦٠، ٣٦٤٦، ٤٩٦٢، ٤٩٦٣، ٧٣٥٦. نسائی. خیل: ٣٥٦٥. تحفة الأشراف: ١٢٣١٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوکەسەی خاوەنی زێڕو زیوبێو زەکاتی لێ دەرنەکا، لەرۆژی قیامەتدا، ئەو زێڕو زیوە سوور دەکرێتەوە، لەناو ئاگری دۆزەخا، تادەبێ بەیەك پلێتو یەك پارچە ئاگری سوور، ئەوجا تەنیشتیو ناوچەوانیو پشتیو هەموو لەشی تری پێی داخ دەکرێ، هەموو جارێ کەسارد دەبێتەوە، سەرلەنوێ سوور سووری دەکەنەوە بۆیو دیسان وای لێ دەکەنەوە، ئیتر لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، ئەو کابرایە ئەمە حاڵیەتی، هەتا دادگایی بەندەکان لەناو خۆیانا لە دادگای خودادا تەواو دەبێ، ئەوجا رێگەی خۆی پێ نیشان دەدرێ، سا یا بۆ بەهەشت، یا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! ئەی بڕیاری وشتر چییە؟! فەرمووی: (وە ئەوەی کەخاوەنی وشتربێو، مافی مافدارانی لێ نەدات کە یەکێ لەو مافانەی کە لەوشتردا هەن ئەوەیە: ئەو رۆژەی کە وشترەکە دەبەن بۆ سەرئاوو ئاو دەدرێو دەدۆشرێ، لەو شیرەی ئەو رۆژەیشدا، مافی هەژارانی واتیادا، وەك خەرمانلۆغەی خەرمانی دانەوێڵە، ئەو خاوەن وشترەی کە مافی مافدارانی لێ نەدا، لەرۆژی قیامەتدا، لە دەشتێکی کرکای کرکدا، لەسەردەم، رایدەخەن بۆ ئەو وشترانە، وە تابڵێیت زل زلو فیلەتەنو قەبەنو، یەك پارینەشیان کەم نییە، ئیتر ئەوانیش بەپێ دەیشێلنو، بەدەم دەیگەزنو قەپی لێ دەگرن، گشت جارێ کەدواییەکەیان بەسەریدا تێدەپەڕێ، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو رۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا دادگاییو دادپرسیی نێوان بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا رێگەی خۆی پیشان دەدرێ، سایا بۆ بەهەشت یا بۆ دۆزەخ.

گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! ئەی رەشە وڵاخو مەڕو بزن؟!

فەرمووی: (وە ئەوەی خاوەنی رەشە وڵاخو مەڕو بزن بێ، مافی هەژارانیان لێ نەداو زەکاتی شەرعییان لێ دەرنەکا، لەرۆژی ژینەوەدا، لە قیامەتدا، لە دەشتێکی

کرکای کرکا، لەسەردەم بۆیان تەخت دەکرێ، ئەو ئاژەڵە لەو کاتەدا، نە تاقە یەکێکیان کەمە، نە شاخ بادراوێکیان واتیادا، نە کۆڵێ، نە شاخ شکاوێ، بەڵکوو هەموو زرتو زیتو بزو ئامادەن بۆ شەڕە شۆقو قۆچ وەشاندن، ئیتر بەشاخ دەیدەنە بەرقۆچو، بەسم گێرەی دەکەن، گشت جارێ کەدواییەکەیان بەسەریدا تێدەپەڕێ، دیسانەوە بەراییەکەیان دەگێڕنەوە بۆسەری، ئیتر ئەمە حاڵیەتی لەو ڕۆژەدا کە پەنجا هەزار ساڵ درێژە، هەتا مەحکەمەی نێوان بەندەکان تەواو دەبێ، ئەوجا ڕێگەی خۆی پێ پیشان دەدرێ، جایا بۆ دۆزەخ، یا بۆ بەهەشت.

گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! ئەوا بڕیار (حوکم)ی زێڕو زیوو وشترو ڕەشەوڵاخو بزنو مەڕمان زانی، ئەی بڕیاری وڵاخی بەرزە چییەو چۆنە!

فەرمووی: (وڵاخی بەرزە سێ جۆرە: بۆ هەندێ پیاو مایەی شەڕە، بۆ هەندێ پیاو پەردەو داپۆشەرە، بۆ هەندێ پیاویش مایەی پاداشو خێرە، مایەی تاوانو شەڕە بۆ کەسێ کە رایدەگرێ بۆ ریاو چاوەو خۆنواندنو شانازی کردنو هەروا بۆ دوژمنایەتیو دژایەتیی گەلی ئیسلامو لەدژی موسوڵمانان بەکاری دەهێنێ!

پەردەو تارایەکی داپۆشەریشە بۆ ئەو پیاوەی کە لەڕێگەی خودادا رایدەگرێو بۆ ڕوو سووریی هەردوو جیهان، کارو کەسابەتی پێوە دەکاو، ئەو مافەی کەخودا لەسەر ئەو وڵاخەی داناوە، کە برێتییە لە خەباتگێڕان لەسەر پشتی، ئەو مافە فەرامۆش ناکا، لەکاتی خۆیدا ئاوو ئالیکی دەدا، وچانی دەدا، نایڕەتێنێ، مایەی پاداشی باشو خێری زۆریشە بۆ ئەو پیاوەی کە رایدەگرێ، بۆ غەزاکردنو تێکۆشان لەبەر رەزای خودا، بۆ بەرژەوەندیی گەلی ئیسلام، لە مێرگێکدا، یا لەمێرغوزارێکا دەیبەستێتەوە، ئیتر ئەو وڵاخە هەرچی بخوات لەو مێرگو مێرغوزارەو، چەندە لەو لەوەڕە بلەوەڕێ، بە ژمارەی ئەوە چاکەو خێرو خێرات بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ، تەنانەت ئەگەر مەڕبەندەکەی بپسێنێ، یان پەتو گوریسەکەی بپچڕێنێ، وە سەرێ دوو سەر غاربکاو، بای باڵی خۆی بداو، یاریو تەراتێن بکاو، تەنانەت ئەگەر بەبێ سوارەکەیشی تەراتێن بکا، هەتا لەکاتی وایشدا خودا بە

ژمارەی شوێن سمو بە ژمارەی تەرسو میزەکەی، چاکەو خێر بۆ خاوەنەکەی دەنووسرێ.

گریمان خاوەنەکەی بەسەر ئاوێکا بردی، نیازی ئەوەیشی نەبێ کە ئاوی بدا، بەڵام وڵاخەکە لە خۆیەوە دەمی نایە ئاوەکەوەو لێی خواردەوە، ئەوە بەقەد ژمارەی ئەو ئاوەی کەدەیخواتەوە چاکەی بۆ دەنووسرێ.

گوترا: قوربان! ئەی بڕیاری شەرع، سەبارەت بە گوێدرێژ چییە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەبارەی گوێدرێژەوە هیچ سرووشێکم بەتایبەتی بۆ نەهاتووە، تەنیا ئەم ئایەتە دانسقەو کەم هاوتایە نەبێ، کە کۆگیرەو تێکڕا گشت جۆرە خێرو چاکەیەك، کەمو زۆر، دەگرێتەوە، کە دەفەرموێ: {فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ (٧) {وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ (٨) – زلزلة – ٩٩/٧ – ٨} . واتە: هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ چاکەی کردبێ، پاداشە باشەکەی وەردەگرێ، هەروا هەرکەسێ بەقەی سەنگی تۆسقاڵێ خراپەی کردبێ، پاداشتەکەی وەردەگرێ).
{ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٦، ژمارە: ١٢١٤ + تاج/٤ چاپی چوارەم، ژمارە: ٤٣٩٤} .

**٣٩٥) هەڕەشە لەوانەی هەر پووڵو پارە کەڵەکە دەکەن.** (٢٢٩٧ - ٢٣٠٤).

**بابٌ: فِي الكَانِزِينَ وَالتَّغْلِيظِ عَلَيْهِمْ**

٥٠٨- عَنِ الأَحْنَفِ بْنِ قَيْسٍ قَالَ: كُنْتُ فِى نَفَرٍ مِنْ قُرَيْشٍ، فَمَرَّ أَبُو ذَرٍّ (رضى الله عنه) وَهُوَ يَقُولُ: (بَشِّرِ الْكَانِزِينَ بِكَيٍّ فِى ظُهُورِهِمْ، يَخْرُجُ مِنْ جُنُوبِهِمْ، وَبِكَيٍّ مِنْ قِبَلِ أَقْفَائِهِمْ يَخْرُجُ مِنْ جِبَاهِهِمْ. قَالَ: ثُمَّ تَنَحَّى فَقَعَدَ. قَالَ: قُلْتُ: مَنْ هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا أَبُو ذَرٍّ. قَالَ: فَقُمْتُ إِلَيْهِ فَقُلْتُ: مَا شَىْءٌ سَمِعْتُكَ تَقُولُ قُبَيْلُ؟ قَالَ: مَا قُلْتُ إِلاَّ شَيْئًا قَدْ سَمِعْتُهُ مِنْ نَبِيِّهِمْ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: قُلْتُ: مَا تَقُولُ فِى هَذَا الْعَطَاءِ؟ قَالَ: خُذْهُ فَإِنَّ فِيهِ الْيَوْمَ مَعُونَةً، فَإِذَا كَانَ ثَمَنًا لِدِينِكَ فَدَعْهُ). {الحديث: ٢٣٠٤ = ٢٢٨٢ فـم. بخاري. زكاة: ١٤٠٧. تحفة الأشراف: ١١٩٠٠} :

ئەحنەفی کوڕی قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ کۆمەڵێ پیاوی قوڕەیشدا دانیشتبووم، ئەبو زەڕی غەفاری (ڕەزای خودای لێ بێ) تێپەڕیو دەیفەرموو:

موژده بده بەئەوانە، کە بەناهەق ماڵو سامان کەڵەکە دەکەنو مافی ڕەوای خوّی لێ نادەن، بەداخێکی ئاگرین، کە دەنرێ بە پشتیانا لە لاتەنیشتیانەوە دەردەچێ، وەدەنرێ بە پشتملیانا، لەناوچاوانیانەوە دەردەچێ). فەرمووی: ئەوجا پەڕی گرتو بەتەنها دانیشت، فەرمووی: گوتم: ئەمە کێیە؟ گوتیان: ئەمە ئەبو زەڕە فەرمووی: (جا هەڵسام چووم بۆلای، عەرزیم کرد: توّزێ لەمەوبەر گوێم لێت بوو، شتێکت فەرموو، ئەوە چی بوو؟ فەرمووی: (ئەوەی کە گوتم فەرمایشتی پێغەمبەرە، کە پێغەمبەری هەمووهانە، شتێك نییە کە لەخۆمەوە بیڵێم!!). فەرمووی: عەرزیم کرد: ئەی چی دەفەرمووی، سەبارەت بەم بەراتو مووچەیەی کە ئێستە دەوڵەت دەیدا بە ئێمەومانان؟ فەرمووی: وەری بگرە، بەپێی ئەم ڕۆژگارە دەبێ بە کۆمەکی لەسەر باری ژیان، بەڵام هەرکاتێ بوو بە بەهای فرۆشتنی ئایینەکەت ئەوە وەری مەگرەو وازی لێ بهێنە).

**٣٩٦) فەرمانکردن بە ڕازیکردنی کارگوزاری سەر زەکات.** (٢٢٩٥ - ٢٢٩٦).

**باب: الأَمْرُ بِإِرْضَاءِ الْمُصَدِّقِينَ**

٥٠٩- عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنه) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالُوا: إِنَّ نَاسًا مِنَ الْمُصَدِّقِينَ يَأْتُونَنَا فَيَظْلِمُونَنَا، قَالَ: فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ارْضُوا مُصَدِّقِيكُمْ ». قَالَ جَرِيرٌ: مَا صَدَرَ عَنِّى مُصَدِّقٌ مُنْذُ سَمِعْتُ هَذَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلاَّ وَهُوَ عَنِّى رَاضٍ».
{الحديث: ٢٢٩٥ = ٢٢٧٣ فم. أبو داود. زكاة: ١٥٨٩، نسائي. زكاة: ٢٤٥٩. تحفة الأشراف: ٣٢١٨} :

جەریری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لە عەرەبە دەشتەوانەکان هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سکاڵایان لەلای کرد، گوتیان: کەسانێك دێنەلامان زەکات کۆدەکەنەوە، ناهەقیمان لێ دەکەن، ئەویش فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (کارگوزاری سەر زەکاتەکانتان ڕازی بکەن).

جەریر دەفەرموێ: ئەوەتەی ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە، هیچ سەرکارێکی زەکاتم بەرێ نەکردووە کەلێم نارازی بێت). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٣٩، چاپی چوارەم}.

**٣٩٧) نزای باش کردن بۆ کەسێ بەسەر راستی زەکاتەکەی بدا.** (٢٤٨٩ - ٢٤٩٠)
**باب: الدُّعَاءُ لِمَنْ أَتى بِصَدَقَتِهِ**

**٥١٠- عَنْ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أَبِى أَوْفَى (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَتَاهُ قَوْمٌ بِصَدَقَتِهِمْ، قَالَ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَيْهِمْ ». فَأَتَاهُ أَبِى أَبُو أَوْفَى بِصَدَقَتِهِ، فَقَالَ: « اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِى أَوْفَى ». {الحديث: ٢٤٨٩ = ٢٤٦٧ فم. تجريد/٢/١٤١، رقم: ٢٧٠ = ١٤٩٧، ٤١٦٦، ٦٢٣٢، ٦٣٥٩. أبو داود. زكاة: ١٥٩٠. نسائى. زكاة: ٢٤٥٨. ابن ماجة. زكاة: ١٧٩٦}:**

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کە کەسێ زەکاتی خۆی بۆی دەهێنا، دەیفەرموو: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِى فُلاَنٍ): خودایە! رەحمەت برێژە بەسەر کەسوکارو بنەماڵەی فیسارە کەسدا).

باوکیشم کە زەکاتەکەی خۆی بۆی برد فەرمووی: (اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى آلِ أَبِى أَوْفَى): خودایە رەحمەت برێژە بەسەر بنەماڵەی ئەبو ئەوفادا). {تاج/٢/٤٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ١٢٤١}.

**روونکردنەوە:**

١- نەوەوی (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پاڕانەوەو نزاکردن، لەلایەنی زەکات وەرگرەوە، بۆ زەکات دەرکەر، سوننەتە، بەپێی ئایەتی: {وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلاَتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ – توبة/١٠٣} واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! کاتێ زەکات لە موسوڵمانان وەردەگریت، بۆیان بپاڕێرەوەو نزای باشیان بۆبکە، ئەم نزاو پاڕانەوەی

تۆ بۆ ئەوان بەتایبەتی لەم کاتەدا، دەبێ بەهۆی دڵ ئارامی بۆ ئەوان، وە ئەم نزایەی پێغەمبەریش، بەپێی ئەم ئایەتە بووە.

٢- عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودایان لێ بێ) خۆیو باوکی لە هاوەڵانی پێغەمبەر بوون، ئەبو ئەوفا ناوی عەلقەمەی کوڕی خالیدە، لە عەبدوڵڵاوە نەوەدو پێنج فەرموودە گێڕانەوە کراوە، بوخاری یازدە فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەبو ئەوفا، یەکێك بوو لەو کۆمەڵە هاوەڵانە، کە لە رۆژەکەی حودەیبییەدا، لەبن دار سەمووسەرەکەدا پەیمانی خۆشنوودییان بەست لەگەڵ پێغەمبەردا، کە ناودارە بە بەیعەتی ریزوان.

عەبدوڵڵا (یەکێکە لەو حەوت سەحابەیە، کە پێشەوا ئیمامی ئەبو حەنیفە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) بە خزمەتیان گەیشتووە، کە یەکێکی تریان ئەنەسی کوڕی مالیکە، ئەوکاتە کە ئەبو حەنیفە بەخزمەت عەبدوڵڵا دەگا، ساڵی هەشتای کۆچی بووە، ئەبو حەنیفە حەوت ساڵان بووە، کە تەمەنی فامینو لەشت تێگەیشتنە، کەواتە: ئەبو حەنیفە تابیعییە، بەپێی فەرموودەی ساغی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەباشیو چاکیدا، لەپلەی دووەمی چاکانی نەتەوەی ئیسلام دایە، وەك دەفەرموێ: « خَيْرُ أُمَّتِي قَرْنِي ثُمَّ الَّذِينَ يَلُونَهُمْ – تاج/٣، لاپەڕە: ٥٣١، زنجیرە: ١، ژمارە: ٣٢٢١ – ش/د/ت».

عەبدوڵڵا ئامادەی حودەیبییەو خەیبەرو مەڵبەندو شەڕگەکانی تری دوا ئەوانیش بووە، خۆیو باوکی لە یارانی بەیعەتی ریزوانن، عەبدوڵڵا هەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، لەمەدینە لە خزمەتیدا بوو، لەپاشا باریکرد بۆ کووفە، لەکۆتایی تەمەنیدا نابینا بوو، عەبدوڵڵا دەیفەرموو: (شەش غەزام لە خزمەتی پێغەمبەردا کردووە، لەو غەزایانەدا، لەبرسانا کوللەمان دەخوارد، لەهەشتاو حەوت، هەشتاو شەشی کۆچیدا لە کووفە مردووە، دوا هاوڕێی پێغەمبەر بووە کە لەکووفە مردووە، ئەم زاتانە فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە: ئەبو ئیسحاقی شەیبانیو سەلەمەی کوڕی کەهیل (رەزای خودایان لێ بێ).

## ٣٩٨) دڵنەوایی باوەڕ لاواز بە بەشدانی

## باب: إعْطَاءُ مَنْ يَخَافُ عَلَى إيمانِهِ

٥١١- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَسْمًا. فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَعْطِ فُلاَنًا فَإِنَّهُ مُؤْمِنٌ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « أَوْ مُسْلِمٌ » أَقُولُهَا ثَلاَثًا وَيُرَدِّدُهَا عَلَىَّ ثَلاَثًا: « أَوْ مُسْلِمٌ » ثُمَّ قَالَ: « إِنِّى لأُعْطِى الرَّجُلَ، وَغَيْرُهُ أَحَبُّ إِلَىَّ مِنْهُ، مَخَافَةَ أَنْ يَكُبَّهُ اللَّهُ فِى النَّارِ ». {الحديث: ٣٧٦ = ٣٩٠ فم. تجريد/١/٤٦ رقم: ٢٦ = ٢٧، ١٤٧٨. أبو داود. سنة: ٤٦٨٥. نسائى. إيمان: ٥٠٠٧}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من خۆم دانیشتبووم، لەوکاتەدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەستەیەکی دا، بەڵام بەشی پیاوێکی نەدا، بەلای منەوە ئەو پیاوە باشترینیان بوو، لەبەرئەوە گوتم: قوربان! ئەی پێغەمەری خودا! ئەوە بۆچی بەشی جوعەیکی کوڕی سوراقەی ضەمریت نەدا، خۆ بەخودا من بەبڕواداری دەزانم؟! فەرمووی: (بەڵکوو بڵێ بە موسوڵمانی دەزانم‌و لەکاتی وادا، شایەتی باوەڕ، کە شتێکە والەناو دڵدا، بۆئەم جۆرە کەسەی مەدە).

جامنیش کەمێ بێ دەنگ بووم، هەتا ئەوەی کە دەیمزانی لەبارەی موسوڵمانەتی ئەو پیاوەوە زۆری بۆم هێنا، لەبەرئەوە پرسیارەکەمم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لەبەر ئەوە کەمێکی تریش بێ دەنگ بوومەوە، هەتا لەبەر هەمان هۆی پێشوو پرسیارەکەم بۆ جاری سێیەم دووبارە کردەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) دیسانەوە هەر فەرمایشتەکەی پێشووی دووبارە کردەوە، لە دواییدا فەرمووی: (ئەی سەعد! گەلێ جار من بەش دەدەم بەهەندێ کەس، هەیشە لە دڵەوە لەوم خۆشتر دەوێ‌و بەشیشی نادەم، دەزانی بۆچی؟ چونکە هەندێ کەس نۆ موسوڵمانن، یا چاو چنۆکن، دەمەوێ بە بەش پێدان بیان لاوێنم‌و بیانکەم بە دۆستی ئیسلام، نەبادا بچێتەوە ناو بێ بڕوایی‌و خودا لەناو ئاگری دۆزەخدا سەرەنگرێی بکا، بەڵام هەیە خۆی موسوڵمانی ساغە، پێویستی بەلاواندنەوە نییە).

ئەمە دەقی ئەم فەرموودەیەیە لە تەجریدی بوخاریدا بڕوانە: (ژمارە: ٢٦ = ٢٧ فتح البارى).

**٣٩٩) بەشدانی نۆ موسوڵمانو ئارامگرتنی باوەڕ دامەزراوەکان.** (٢٤٢٥ - ٢٤٦٩)

**باب: إِعْطَاءُ الْمُؤَلَّفَةِ قُلُوبُهُمْ عَلَى الأسلام وَتَصبُّرُ مَنْ قَوِىَ إِيمَانُهُ**

٥١٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا كَانَ يَوْمُ حُنَيْنٍ أَقْبَلَتْ هَوَازِنُ وَغَطَفَانُ وَغَيْرُهُمْ بِذَرَارِيِّهِمْ وَنَعَمِهِمْ، وَمَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَئِذٍ عَشَرَةُ آلاَفٍ وَمَعَهُ الطُّلَقَاءُ، فَأَدْبَرُوا عَنْهُ، حَتَّى بَقِيَ وَحْدَهُ، قَالَ: فَنَادَى يَوْمَئِذٍ نِدَاءَيْنِ لَمْ يَخْلِطْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، قَالَ: فَالْتَفَتَ عَنْ يَسَارِهِ فَقَالَ: « يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ!». قَالُوا: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَبْشِرْ نَحْنُ مَعَكَ، قَالَ: وَهُوَ عَلَى بَغْلَةٍ بَيْضَاءَ، فَنَزَلَ، فَقَالَ: «أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ» فَانْهَزَمَ الْمُشْرِكُونَ، وَأَصَابَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَنَائِمَ كَثِيرَةً، فَقَسَمَ فِي الْمُهَاجِرِينَ وَالطُّلَقَاءِ، وَلَمْ يُعْطِ الأَنْصَارَ شَيْئًا، فَقَالَتِ الأَنْصَارُ: إِذَا كَانَتِ الشِّدَّةُ فَنَحْنُ نُدْعَى وَيُعْطَى الْغَنَائِمُ غَيْرَنَا، فَبَلَغَهُ ذَلِكَ فَجَمَعَهُمْ فِي قُبَّةٍ، فَقَالَ: « يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ، مَا حَدِيثٌ بَلَغَنِي عَنْكُمْ؟». فَسَكَتُوا، فَقَالَ: « يَا مَعْشَرَ الأَنْصَارِ! أَمَا تَرْضَوْنَ أَنْ يَذْهَبَ النَّاسُ بِالدُّنْيَا، وَتَذْهَبُونَ بِمُحَمَّدٍ، تَحُوزُونَهُ إِلَى بُيُوتِكُمْ؟» قَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ رَضِينَا. قَالَ: فَقَالَ: «لَوْ سَلَكَ النَّاسُ وَادِيًا، وَسَلَكَتِ الأَنْصَارُ شِعْبًا لأَخَذْتُ شِعْبَ الأَنْصَارِ» قَالَ هِشَامٌ — يَعْنِي ابْنَ زَيْدِ بْنِ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ — فَقُلْتُ: يَا أَبَا حَمْزَةَ أَنْتَ شَاهِدٌ ذَلِكَ؟ قَالَ: وَأَيْنَ أَغِيبُ عَنْهُ؟). {الحديث: ٢٤٣٨ = ٢٤١٦ فم. زكاة. تجريد/٤/٣٤٠ رقم: ١٥٩٥ = ٤٣٣٤ + ١٢٧٠ = ٣١٤٦ = بەرگى/٣ تجريد لاپەڕە: ٣٩٤ + رقم: ١٢٧١ تجريد}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی غەزای حونەین، کە رەزمگای حونەین رویدا، لەشکری هۆزی هەوازینو سوپای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرامبەری یەکتری راوەستان، هۆزی هەوازینو هۆزی غەطەفانو چەند کۆمەڵێ لەچەند هۆزێکی تر، بەخۆیانوماڵو منداڵو خێزانو ئاژەڵیانەوە هاتبوون بۆ ئەو جەنگە، سوپاکەی پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەو نۆ موسوڵمانانەی کە لەکاتی گرتنی مەککەدا ئیسلام بوو بوون، دە هەزار کەس بوون، جا لەسەرەتاوە،

لەشکرەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شکستیان هێنا، تەنانەت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی بەتەنیا مایەوە، جا لەوکاتە ناسکەدا، دوو بانگەوازی کرد، لەنێوانیانا، بانگەوازی تری لەکەسی تر نەکرد، بەلای راستیدا ئاوڕی دایەوەو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئەی دەستەی ئەنصار!) ئەنصارەکانیش بەیەك دەنگ وەڵامیان دایەوەو فەرموویان: (ئەی پێغەمەری خودا! ئەمەتاین واین لەخزمەتتا، فەرموو بفەرموو سەرمان لەڕێتایە!) فەرمووی: ئەوجا ئاوڕی دایەوە بەلای چەپاو دیسان فەرموویەوە: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران!) ئەوانیش بەیەك دەنگ فەرموویانەوە: ئەی پێغەمەری خودا! موژدەت لێ بێ واین لەخزمەتتا، سەرمان وا لەڕێتا، فەرموو بفەرموو). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا ئەوکاتە، بەسواری هێسترێکی سپی بوو، جا لەوڵاخەکەی دابەزی، کەناوی دوڵدوڵ بوو، فەرمووی: (من بەندەو پێغەمبەری خودام‌و، درۆزن‌و جادوو بازنیم‌و، قسەی من وەحیەو راست‌و دروستەو سەرکەوتن هەر بۆ ئێمەیە ئیتر بۆ ورە بەردەدەن‌و نوشوست دەهێنن، ئیتر لەشکری ناموسوڵمانەکان شکاو هەڵیان تۆڕاند، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تالأنییەکی زۆری دەست کەوت، دابەشی کرد بەسەر کۆچکاران‌و ئازادکراوەکانی فەتحی مەککەدا، هیچ بەشی یاریدەدەرانی لەو تالأنییە نەدا، جا یاریدەدەران لەسەر ئەمە گلەییان لە پێغەمبەر کرد وەك ئەوە گوتیان: (ئەگەر تەنگانە بێ ئێمە بانگ دەکرێین، بەڵام تالأن دەدرێ بەکەسانی تر). کە ئەم قسەو باسە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناردی بەشوێنیاناو لەناو خێوەتێکی چەرمێندا کۆیکردنەوەو فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی ئەنصار! ئەو قسەیە چییە کە لەئێوەوە پێم گەیشتۆتەوە، گوایە گلەییتان لەمن کردووە؟). ئەوانیش بێ دەنگ بوون، ئەوسا بۆ دڵدانەوەی ئەوان فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی یاریدەدەران! ئایا بەوە رازی نابن، کە خەڵکی پڕوپیتی جیهان لەگەڵ خۆیان ببەنەوە، بەڵام ئێوە موحەممەدی پێغەمبەری خودا، لەبری بەش، لەگەڵ خۆتان ببەنەوە بۆ ماڵەکانتان لەشاری مەدینە؟). گوتیان: بەڵێ: ئەی پێغەمەری خودا! بەوە رازین. فەرمووی:

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی بزانن ئەگەر خەڵکی تر هەموویان، لەشارێوە بڕۆن، بەڵام ئێوەی یاریدەدەران، لە باریکە ڕێوە بڕۆن، من لە باریکە ڕێگەی ئێوەوە دەڕۆم‌و ئەوەندەم خۆش دەوێن لەئێوە جیانابمەوە).

هیشامی کوڕی زەیدی کوڕِ ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسی باپیرەمم کرد: ئەی ئەبو حەمزە! ئایا تۆ بۆخۆت ئامادەی ئەم داستانە بووی؟ فەرمووی: (بەڵێ ئەی چۆن لەوێ نەبم؟). بڕوانە ئەم جێگەیانە، بۆ شارەزایی تەواو لە درێژەی باسی ناو ئەم فەرموودەیە: {تاج/٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥١٧ + زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤٤٧٠ + زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥١٨، ٤٥١٩ + زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٤٦٣٤ + تەجرید. ژمارە: ١٢٧٠، ١٢٧١، ١٥٩٥. موسلیم. زکاە: ٢٤٣٣، ٢٤٣٤، ٢٤٣٦، ٢٤٣٧، ٢٤٣٩، ٢٤٤٠، ٢٤٤١، ٢٤٤٢، ٢٤٤٣، ٢٤٤٤}.

٥١٣- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رضى الله عنه) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَبَا سُفْيَانَ بْنَ حَرْبٍ وَصَفْوَانَ بْنَ أُمَيَّةَ وَعُيَيْنَةَ بْنَ حِصْنٍ، وَالأَقْرَعَ بْنَ حَابِسٍ، كُلَّ إِنْسَانٍ مِنْهُمْ مِائَةً مِنَ الإِبِلِ، وَأَعْطَى عَبَّاسَ بْنَ مِرْدَاسٍ، دُونَ ذَلِكَ، فَقَالَ عَبَّاسُ بْنُ مِرْدَاسٍ:

أَتَجْعَلُ نَهْبِى وَنَهْبَ الْعُبَيْدِ بَيْنَ عُيَيْنَةَ وَالأَقْرَعِ

فَمَا كَانَ بَدْرٌ وَلاَ حَابِسٌ يَفُوقَانِ مِرْدَاسَ فِى الْمَجْمَعِ

وَمَا كُنْتُ دُونَ امْرِئٍ مِنْهُمَاوَمَنْ تَخْفِضِ الْيَوْمَ لاَ يُرْفَعِ

قَالَ: فَأَتَمَّ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِائَةً. {الحديث: ٢٤٤٠ = ٢٤١٨ فم. زكاة. تحفة الأشراف: ٣٥٦٣}:

ڕافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) هەریەکی سەد وشتری دا بەم زاتانە: بە ئەبو سوفیانی کوڕی حەرب‌و بە صەفوانی کوڕی ئومەییەو بە عویەینەی کوڕی حیصن‌و بە ئەقرەعی کوڕی حابیس، بەڵام لەسەد وشتر کەمتری دا بە عەبباسی کوڕی میرداس، جا بەم

بۆنەیەوە، عەبباسی کوڕی میرداس، بەشیعر سکاڵای لەخزمەت حەزرەتدا کردو فەرمووی:

أَتَجْعَلُ نَهْبِي وَنَهْبَ الْعُبَيْدِ بَيْنَ عُيَيْنَةَ وَالأَقْرَعِ
فَمَا كَانَ بَدْرٌ وَلاَ حَابِسٌ يَفُوقَانِ مِرْدَاسَ فِي الْمَجْمَعِ
وَمَا كُنْتُ دُونَ امْرِئٍ مِنْهُمَاوَمَنْ تَخْفِضِ الْيَوْمَ لاَ يُرْفَعِ

بەشیعر لە بەحرەکەی خۆی کە بەحری موتەقنارەبە، واتە:

لەبەرچی لەتالان، خەلاتی منت وەک
عویەینەوو ئەقرەع بەیەکسان نەداوە
نە خۆیان لەخۆم و نە بابیان لە بابم
لەکن خەڵکی ڕێزیان پتر لێ گیراوە،،
ئەوەی تۆ کە ئەمڕۆ پەسەندی نەکەی قەت
بەسەر بەرزی نازی، هەتاوەکوو ماوە

فەرمووی: ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەویشی کرد بەسەد وشتری تەواو. {تاج/٤، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ٤٥٢٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ -عوبەید لە دەقە عەرەبییەکەدا، ناوی ئەسپەکەیەتی، عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) لەدوو ئاستەوە بۆ پێغەمبەری ڕوونکردۆتەوە، کە سکاڵاکەی هەقەو دەبێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دادی بپرسێ: یەکەم ئەمیش وەك ئەو هاوەڵانەی تر خانەدانەو بنەماڵەیەو سەرۆك هۆزە، دووەم: ئەم خەڵاتەی پێغەمبەر، دەبێ بەهۆی گەورەترین شانازیو سەربەرزی وا، کە لەدەست چوو، دەست ناکەوێتەوە.

٢ - ڕافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، لەڕۆژی بەدردا، لەبەرئەوەی کە مێرد منالّ بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ نەدا کە بەشداریی لە غەزای بەدردا بکا، بەڵام لەڕۆژی جەنگی ئوحوددا، پەسەندی کرد بە جەنگاوەرو ڕێگەی پێدا کە بەشداری تیادا بکات، لەم جەنگەدا تیرێ بەریکەوت، شوێنی ئەو

تیره، لەپاش حەفتا ساڵێ، لە حەفتاو چواری کۆچیدا، لە تەمەنی هەشتاو شەش ساڵیدا، هەڵی دایەوەو بوو بە تیراوێ‌و کوشتی، لە مەدینە مرد، ئیبنو عومەر نوێژی تەرمی لەسەری کردو تەرمەکەی بەڕێکرد، کۆمەڵێ ژن بە قیژەو هاوار شوێنی تەرمەکەی دەکەون بۆسەر گۆڕستان، ئیبنو عومەر پێیان دەفەرموێ: وس بن ئەم پیرە مێردە گوناهبار مەکەن، خۆی پیرە مێردێکی ئیختیارە بەرگەی سزای خودای گەورە ناگرێ). {بڕوانە: تەجرید/٣، لاپەڕە: ١١٤، ژمارە: ١٠٢٥} .

٥١٤- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه)، قَالَ: بَعَثَ عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رضى الله عنهما) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ مِنَ الْيَمَنِ بِذَهَبَةٍ فِي أَدِيمٍ مَقْرُوظٍ، لَمْ تُحَصَّلْ مِنْ تُرَابِهَا، قَالَ: فَقَسَمَهَا بَيْنَ أَرْبَعَةِ نَفَرٍ بَيْنَ عُيَيْنَةَ بْنِ حِصْنٍ، وَالأَقْرَعِ بْنِ حَابِسٍ، وَزَيْدِ الْخَيْلِ وَالرَّابِعُ إِمَّا عَلْقَمَةُ بْنُ عُلاَثَةَ، وَإِمَّا عَامِرُ بْنُ الطُّفَيْلِ، فَقَالَ: رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ: كُنَّا نَحْنُ أَحَقَّ بِهَذَا مِنْ هَؤُلاَءِ، قَالَ: فَبَلَغَ ذَلِكَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: « أَلاَ تَأْمَنُونِي وَأَنَا أَمِينُ مَنْ فِي السَّمَاءِ، يَأْتِينِي خَبَرُ السَّمَاءِ صَبَاحًا وَمَسَاءً؟!».

قَالَ: فَقَامَ رَجُلٌ غَائِرُ الْعَيْنَيْنِ، مُشْرِفُ الْوَجْنَتَيْنِ، نَاشِزُ الْجَبْهَةِ، كَثُّ اللِّحْيَةِ، مَحْلُوقُ الرَّأْسِ، مُشَمَّرُ الإِزَارِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اتَّقِ اللَّهَ! فَقَالَ: « وَيْلَكَ أَوَلَسْتُ أَحَقَّ أَهْلِ الأَرْضِ أَنْ يَتَّقِيَ اللَّهَ؟». قَالَ: ثُمَّ وَلَّى الرَّجُلُ، فَقَالَ خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أَضْرِبُ عُنُقَهُ؟ فَقَالَ: « لاَ، لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ يُصَلِّي ». قَالَ خَالِدٌ: وَكَمْ مِنْ مُصَلٍّ يَقُولُ بِلِسَانِهِ مَا لَيْسَ فِي قَلْبِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنِّي لَمْ أُومَرْ أَنْ أَنْقُبَ عَنْ قُلُوبِ النَّاسِ، وَلاَ أَشُقَّ بُطُونَهُمْ». قَالَ: ثُمَّ نَظَرَ إِلَيْهِ وَهُوَ مُقَفٍّ فَقَالَ: « إِنَّهُ يَخْرُجُ مِنْ ضِئْضِئِ هَذَا قَوْمٌ يَتْلُونَ كِتَابَ اللَّهِ رَطْبًا، لاَ يُجَاوِزُ حَنَاجِرَهُمْ، يَمْرُقُونَ مِنَ الدِّينِ كَمَا يَمْرُقُ السَّهْمُ مِنَ الرَّمِيَّةِ). قَالَ: أَظُنُّ قَالَ: «لَئِنْ أَدْرَكْتُهُمْ لأَقْتُلَنَّهُمْ قَتْلَ ثَمُودَ ». {الحديث: ٢٤٤٩. زكـاة = ٢٤٢٧ فـتح الملـهم. تجريـد/٤، لاپـەڕە: ٣٥٠، رقـم: ١٦٠٢ = ٤٣٥١، ٣٣٤٤، ٣٦١٠، ٤٦٦٧، ٥٠٥٨، ٦١٦٣، ٦٩٣١، ٦٩٣٣، ٧٤٣٣، ٧٥٦٢. أبـــو داود. سنة: ٤٧٦٤. نسائي. زكاة: ٢٥٧٧، ٤١١٢. تحفة الأشراف: ٤١٣٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) لە یەمەنەوە، پارچۆڵەیێ زێڕی پوختە نەکراوی، لەماڵی تالآنی جەنگ، نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زێڕەکە لەپارچە قایشێکا بوو، بەگەڵا سەلەم (قورظ) خۆشە کرابوو، هێشتا خاكو خۆڵی ناو کانەکەی پێوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کرد بەسەر ئەم چوار کەسەدا: بەسەر عویەینەی کوڕی حیصنی کوڕی حوزەیفەی کوڕی بەدرو بەسەر ئەقرەعی کوڕی حابیسو زەیدی خەیلداو، چوارەمیشیان یا عەلقەمەی کوڕی عولاسە بوو، یا عامیری کوڕی توفەیل بوو. پیاوێ لە یارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێمە شایستەتر بووین بەم ماڵو سامانی تالآنییە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەشی کرد بەسەر ئەمانەدا!! جا ئەم قسەیە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من کە ئەمینداری خودای ئەرزو ئاسمانمو ئێوارەو بەیانی لە ئاسمانەوە وەحیو سرووشم بۆدێ، کەچی هێشتا ئێوە متمانەم پێ ناکەنو، ئەوەتانێ هەندێکتان بەقای پێم نییەو رەخنەم لێ دەگرێ!).

فەرمووی: جا کابرایەکی چاو بەقوولا چووی، سەر کولم دەرپەڕیوی، گۆنا زەقی، ناوچاوان قۆقزی، ریش پڕی، سەرتاشراوی، چاك بەلادا کردوو، پیاوێکی لەم حاڵەو لەم رەنگە، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! لەخودا بترسەو شەرمو شکۆیێ لەخودا بکە!!

حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەدبەخت خۆت! ئەی خانە خراپ! بۆچی کەس هەیە لەسەر رووی زەوی، کە وەك من لەخودا بترسێو، ئەوەندەی من شەرمو شکۆ لەخودا بکات!. گوتی: ئەوجا کابراکە رۆیشت، خالیدی کوڕی وەلیدیش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆچی نەدەم لە گەردنی؟ فەرمووی: (نا، شتی وا مەکە، بەشکم نوێژکەر بێ). خالید فەرمووی: زۆر نوێژکەری وا هەیە، زمانو دڵی یەك نینو، سەری زمانی شیرینەو بنی زمانی ژەهرینە. پێغەمبەریش (دروودی خودای

لەسەر بێ) فەرمووی: (مـن خـودا پێـی نەفـەرمووم، کـەناو دڵـی خـەڵك بپشكنم، یانـاو سكیان هەڵ بدڕم!).

گـوتی: کـەکاتێ پیاوەکـه پشـتی هـەڵکردو ڕۆیشـت، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسـەر بێ) فەرمووی: (لەنەوەی ئەم پیـاوە هـۆزێ دەکەوێـەوە، بـه زمـانی پـاراو، نامـەی خـودا، قورئانی پیرۆز، دەوردەکەنەوە، بەڵام لە گەروویان ڕەت نابێو ناچێتە ناو دڵیانـەوە، ئەوانە وا لەئايين بەلەسە دەبن، وا لەئايينی ئيسلام بەپەلە دەردەچنو تـەرا دەبـن، وەك چۆن تیرێ کەبدا لە نێچیرێ، خێرا گورج دەیسمێو لێی دەردەپەڕێ، ئـەوانيش ئاوا لە ئيسلام دەردەچنو تەرادەبن!).

فـەرمووده گێـڕەوە (ڕاوی) دەفـەرموێ: وادەزانم حـەزرەت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فەرمووشـی: (ئەگـەر خـۆم فريـای ئـەو هـۆزەو وەچـەیە بکـەوم، لەچـەرخی منـدا، کەسـانێ لەوانـە، پەيـدا بـبن،، وەك چۆن خـودا يـافتی هـۆزی ثـەمـوودی بڕییـەوە، منــيش ئــاوا، يــافتی ئــەوان دەبڕمــەوە، هــەموويان دەکـوژم تاقيــان لێ نــابوێرم!). {بڕوانە: تاج/٤، لاپەڕە: ٨٤٨، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ٤٦٤٩}.

## ٤٠١) زەکات بە پێغەمبەرو کەسوکاری پێغەمبەر ناشێ. (٢٤٧٠ - ٢٤٧٩)

## باب: لا تَحِلُّ الصَّدَقَةُ لِرَسُولِ اللّهِ صَلَّى اللّهُ عليه وسلم وَ أَهْلِ بَيْتِهِ

٥١٥- عَنْ أَبِی هُرَيْـرَةَ (رضی الله عنـه) قَـالَ: أَخَـذَ الْحَسَـنُ بْـنُ عَلِـيٍّ (رضی الله عنهما) تَمْرَةً مِنْ تَمْرِ الصَّدَقَةِ، فَجَعَلَهَا فِی فِيهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله عليـه وسـلم) « كِخْ كِخْ ارْمِ بِهَا، أَمَا عَلِمْـتَ أَنَّـا لاَ نَأْكُـلُ الصَّـدَقَةَ؟!»). {الحديث: ٢٤٧٠ = ٢٤٤٨ فـم. زكـاة. تجريـد/٢، لاپـەڕە: ١٣٧، رقـم: ٧١٥ = ١٤٨٥، ١٤٩١، ٣٠٧٢. تحفـة الأشـراف: ١٤٣٨٣}:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: حەسـەنی کوڕی عـەلی (خودايـان لێ ڕازی بێ) دەنکێ خورمای زەکاتی هەڵگرتو نایە ناو دەمیەوە، ویستی بیخوات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تێی خوڕی، تا فڕێی بدا، فەرمووی: (قخ قخ: یەع یـەع، فڕێیـدە، چ

عەجەب نازانی کە ئێمەی ئالوبەیتی موحەممەد، زەکات ناخۆین!). {تاج/٢/٤٩، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٤}.

**٤٠٢) ناباشە کە خزمو کەسوکاری پێغەمبەر بکرێن بەسەر کاری سەر زەکات کۆکردنەوە**
**باب: كَرَاهِيَةُ إسْتِعْمَالِ آلِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)**

٥١٦- عَبْدَ الْمُطَّلِبِ بْنَ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ قَالَ: اجْتَمَعَ رَبِيعَةُ بْنُ الْحَارِثِ وَالْعَبَّاسُ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَقَالاَ: وَاللَّهِ لَوْ بَعَثْنَا هَذَيْنِ الْغُلاَمَيْنِ (قَالَ لِى وَلِلْفَضْلِ بْنِ عَبَّاسٍ) إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَكَلَّمَاهُ، فَأَمَّرَهُمَا عَلَى هَذِهِ الصَّدَقَاتِ، فَأَدَّيَا مَا يُؤَدِّى النَّاسُ، وَأَصَابَا مِمَّا يُصِيبُ النَّاسُ، قَالَ: فَبَيْنَمَا هُمَا فِى ذَلِكَ، جَاءَ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ فَوَقَفَ عَلَيْهِمَا، فَذَكَرَا لَهُ ذَلِكَ، فَقَالَ عَلِيٌّ: لاَ تَفْعَلاَ، فَوَاللَّهِ مَا هُوَ بِفَاعِلٍ، فَانْتَحَاهُ رَبِيعَةُ بْنُ الْحَارِثِ، فَقَالَ: وَاللَّهِ مَا تَصْنَعُ هَذَا إِلاَّ نَفَاسَةً مِنْكَ عَلَيْنَا، فَوَاللَّهِ لَقَدْ نِلْتَ صِهْرَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَمَا نَفِسْنَاهُ عَلَيْكَ، قَالَ عَلِيٌّ: أَرْسِلُوهُمَا، فَانْطَلَقَا، وَاضْطَجَعَ عَلِيٌّ، قَالَ: فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الظُّهْرَ سَبَقْنَاهُ إِلَى الْحُجْرَةِ، فَقُمْنَا عِنْدَهَا حَتَّى جَاءَ، فَأَخَذَ بِآذَانِنَا، ثُمَّ قَالَ: « أَخْرِجَا مَا تُصَرِّرَانِ ». ثُمَّ دَخَلَ، وَدَخَلْنَا عَلَيْهِ، وَهُوَ يَوْمَئِذٍ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ. قَالَ: فَتَوَاكَلْنَا الْكَلاَمَ، ثُمَّ تَكَلَّمَ أَحَدُنَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنْتَ أَبَرُّ النَّاسِ، وَأَوْصَلُ النَّاسِ وَقَدْ بَلَغْنَا النِّكَاحَ، فَجِئْنَا لِتُؤَمِّرَنَا عَلَى بَعْضِ هَذِهِ الصَّدَقَاتِ، فَنُؤَدِّىَ إِلَيْكَ كَمَا يُؤَدِّى النَّاسُ، وَنُصِيبَ كَمَا يُصِيبُونَ. قَالَ: فَسَكَتَ طَوِيلاً حَتَّى أَرَدْنَا أَنْ نُكَلِّمَهُ، قَالَ: وَجَعَلَتْ زَيْنَبُ تُلْمِعُ إِلَيْنَا مِنْ وَرَاءِ الْحِجَابِ أَنْ لاَ تُكَلِّمَاهُ، قَالَ: ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ الصَّدَقَةَ لاَ تَنْبَغِى لآلِ مُحَمَّدٍ، إِنَّمَا هِىَ أَوْسَاخُ النَّاسِ، ادْعُوا لِى مَحْمِيَةَ (وَكَانَ عَلَى الْخُمُسِ) وَنَوْفَلَ بْنَ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ».

قَالَ: فَجَاءَاهُ، فَقَالَ لِمَحْمِيَةَ: « أَنْكِحْ هَذَا الْغُلاَمَ ابْنَتَكَ ». (لِلْفَضْلِ ابْنِ عَبَّاسٍ) فَأَنْكَحَهُ، وَقَالَ لِنَوْفَلِ بْنِ الْحَارِثِ: « أَنْكِحْ هَذَا الْغُلاَمَ ابْنَتَكَ ». (لِى) فَأَنْكَحَنِى، قَالَ لِمَحْمِيَةَ: «أَصْدِقْ عَنْهُمَا مِنَ الْخُمُسِ كَذَا وَكَذَا ».

قَالَ الزُّهْرِيُّ: وَلَمْ يُسَمِّهِ لِى. {الحديث: ٢٤٧٨ = ٢٤٥٦ فم. زكاة. أبو داود. خراج: ٢٩٨٥. نسائى. زكاة: ٢٦٠٨}:

عەبدولموتتەلیبی کوڕی ڕەبیعەی کوڕی حاریث دەفەرموێ: ڕۆژێ: ڕەبیعەی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموتتەلیب‌و عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیب، کۆبونەوەو تەگبیریان کرد کە منو فەزڵی کوڕی عەبباس، بنێرن بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و فەرموویان: بەخودا واباشە، ئەم دوو گەنجە بنێرین بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە قسەی لەگەڵا بکەن، سەبارەت بەوەی کە بیانکات بە کارمەندی سەر زەکات، ئەوانیش وەك ئەو خەڵکەی تر ئەرکی خۆیان ببینن‌و لەهەمان کاتا وەك ئەوانیش لەم بارەیەوە سوودمەند ببن، فەرمووی: باوکم‌و عەبباسی مامەی خەریکی ئەم وت‌و وێژە بوون، لەوکاتەدا عەلی کوڕی ئەبو طالیب هات بەسەریانا، ئەوانیش ئەم پێشنیارەیان بۆی باس کرد، عەلیش فەرمووی: شتی وامەکەن، بەخودا بۆیان ناکات. باوکم (کە ڕەبیعەی کوڕی حاریث بوو) لێی ڕاپەڕی‌و پێی گوت: بەخودا تۆ بۆیە وا دەڵێی چونکە بەخیلی بە ئێمە دەبەی، بەڵام تۆ کەبووی بەزاوای پێغەمبەرو فاطیمەی کچی ئەوت بۆ خۆت هێنا، ئێمە بەخیلیمان بەتۆ نەبرد، عەلی فەرمووی: کەواتە بیان نێرن، جا ئێمە چووین بۆ خزمەت پێغەمبەرو عەلی ڕاکشا. جا لەخزمەتیدا نوێژی نیوەڕۆمان بەجەماعەت کرد، ئیتر ئێمە پێش خۆی چووین بۆلای ماڵەکەی، لەوێ وەستاین، هەتا خۆشی هاتەوە، گوێی گرتین‌و ئەوجا فەرمووی: (ئادەی چیتان لەلایە هەڵیرێژن!) ئەوجا ئەو چووە ژوورەوەو ئێمەیش بەشوێنیا چووینە ژوورەوە، ئەو ڕۆژە نۆرە سەرەی زەینەبی کچی جەحش بوو، لە ژنەکانی، کە پێغەمبەر لەلای ئەوبێ، فەرمووی: جا لەناو خۆمانا دەستمان کرد بە مقۆ مقۆ کە کاممان قسە بکەین، تا یەکێکمان دەستی کرد بەقسە کردن‌و گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ باشترین کەسی بۆ کەسوکاری خۆت‌و لەهەموو کەسێکی تریش باشتر سیلەی ڕەحم بەجێ دەهێنی‌و، ئێمەیش لە کەسوکاری تۆین‌و گەیشتووینەتە پلەی پیاوی‌و کاتی ژنهێنانمان هاتووە، جا هاتووین بۆ خزمەتی تۆ، کە بفەرمووی بمانکەیت بە سەرکاری سەر زەکات کۆکردنەوەو، ئێمەیش وەك خەڵکانی تر، ئەرکی خۆمان بەجێ دەهێنین‌و

زەکاتت بۆ کۆدەکەینەوەو، لەهەمان کاتا خۆشمان وەك ئەو خەڵکەی تر کە کەسوکاری تۆنین، لەم لایەنەوە شتێکمان دەست دەکەوێ.

فەرمووی: ماوەیەکی زۆر زۆر پێغەمبەر خامۆش بوو، قسەی نەکرد، تەنانەت ویستمان کە سەرلەنوێ قسەی بۆ بکەینەوە، فەرمووی: زەینەبی هاوسەری پێغەمبەریش، ئاماژەی بۆمان دەکرد لەودیو پەردەوە، کە قسەنەکەین بۆی، لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی ئێمەی دایەوەو فەرمووی: (ئەمەی ئێوە دەیڵێن نابێ، چونکە زەکات دەست نادات، بۆ کەسوکاری موحەممەد، چونکە زەکات هۆی سڕینەوەی پیس و پۆخڵی مەردومە زەکات دەرەکەیە، ئەوەیش شایانی کەسوکاری موحەممەد نیە). ئەوجا فەرمووی: (ئادەی مەحمییەم بۆ بانگ بکەن). مەحمییە پیاوێ بوو، سەرکاری سەر کۆکردنەوەی خومس بوو، هەروا فەرمووی: (نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عەبدولموتتەلیبیشم بۆ بانگ بکەن).

فەرمووی: جا هەردووکیان هاتن، حەزرەت بە مەحمییەی فەرموو: (کچەکەت مارە بکە لەم گەنجە) واتە: لە فەزڵی کوڕی عەبباس، ئەویش لیی مارە بڕی. وە بەنەوفەلی کوڕی حاریثیشی فەرموو: (کچەکەت مارەبکە لەم کوڕە) واتە: لەمن، ئەویش کچەکەی، کە ئامۆزام بوو، مارە بڕی لەمن. ئەوجا بە مەحمییەی فەرموو: (لە دەست کەوتی پێنج یەك مارەیی ئەم دوو بووکە، لەبری مێردەکانیان بدە).

زوهری دەفەرموێ: فەرمووده گێڕەوەی پێش خۆم کە عەبدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی نەوفەلی کوڕی حاریثی کوڕی عبدالمطلب بوو، ئەندازەی ئەو مارەییانەی بۆم باس نەکرد. {تاج/٢/٥٠، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٨}.

### ٤٠٣) زەکات لەلایەنی وەرگرەکەیەوە دروستە ببرێ بەدیاری بۆ پێغەمبەرو کەسوکاری.(٢٤٨٠ - ٢٤٨٨).

### باب: إِبَاحة مَاأُهْدِيَ مِنَ الصَّدَقَةِ لِآلِ النبّي صلى الله علية وسلم

٥١٧- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: أَهْدَتْ بَرِيرَةُ إِلَى النَّبِـيِّ (صلى الله عليه وسلم) لَحْمًا تُصُدِّقَ بِـهِ عَلَيْهَـا ، فَقَـالَ: « هُـوَ لَهَـا صَـدَقَةٌ وَلَنَـا هَدِيَّـةٌ ». {الحديث:

٢٤٨٢ = ٢٤٦٠ فم. زكاة. تجريد/٢/١٤١، رقم: ٧١٨ = ١٤٩٥، ٢٥٧٧. أبو داود. زكاة: ١٦٥٥. نسائی. عمری: ٣٧٦٩. تحفة/ ١٢٤٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گۆشتیان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەبیخوات، عەرزیان کرد: ئەم گۆشتە هی زەکاتە، دراوە بە بەریرەی ئازادکراوی عائیشە، ئایا تۆ لێی دەخۆیت؟! فەرمووی: (ئەمە بۆ بەریرە زەکاتە، بەلام بۆ ئێمە، کە بەریرە بەدیاری داویتی پێمان، دەبێ بەدیاری‌و لە زەکاتی دەردەچێ لەبەرئەوە حەلالەو دەیخۆین). {بڕوانە: تاج/٢/٥٠، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٦}.

**ڕوونکرنەوە:**

زەکات بەهەموو کەسێ ناشێ، ئەوەی زەکاتی پێ دەشێ مەرجی خۆی هەیە. بەلام هەرکاتێ مالی زەکات بەپێی شەرع درا بەکەسێ، وە کەسەکە وەری گرت، ئیتر لە زەکاتی دەردەچێ، وە دەبێ بەهی وەرگرەکەی، خاوەنە تازەکەی دەتوانێ هەموو تەصەرروفێکی شەرعی تیادا بکا، وەك ئەوە بیفرۆشێ، یا بەدیاری بیدا بە دەولەمەندێ، یا دەرخواردی سەییدی بدات کە نەوەی پێغەمبەرن، یا بیدات بە سەرفترەی خۆی‌و خێزانی، یا بیکا بەخێر.

٥١٨- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: بَعَثَ إِلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِشَاةٍ مِنَ الصَّدَقَةِ، فَبَعَثْتُ إِلَى عَائِشَةَ مِنْهَا بِشَيْءٍ، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى عَائِشَةَ قَالَ: « هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟». قَالَتْ: لاَ، إِلاَّ أَنَّ نُسَيْبَةَ بَعَثَتْ إِلَيْنَا مِنَ الشَّاةِ الَّتِى بَعَثْتُمْ بِهَا إِلَيْهَا، قَالَ: « إِنَّهَا قَدْ بَلَغَتْ مَحِلَّهَا». {الحديث: ٢٤٨٧ = ٢٤٦٥ فم. زكاة. تجريد البخارى/٢/١١٥، رقم: ٦٩٣ = ١٤٤٦، ١٤٩٤، ٢٧٧٩. تحفة الأشراف: ١٨١٢٥}:

ئوم عەتێ (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: من کەناوم نوسەیبەی ئەنصارییەو، ناسراوم بە دایکی عەتێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەڕێکی زەکاتی بۆم نارد، کاتێ سەریم بڕی، بەدیاری بەشی عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم لێی نارد، پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) بە عائیشە دەفەرموێ: (ئایا شتێکتان لەلا هەیە کە قاوەڵتی پێ بکەین؟).
عائیشە دەفەرموێ: هیچم لەلا نییە، تەنیا دیارییەکەی ئوم عەتێ نەبێ، کە لە گۆشتی ئەو مەڕە زەکاتە بۆی ناردووم، کەتۆ پێت دابوو، ئایا تۆ لەوە دەخۆیت؟
پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی دەفەرموێ: (بیهێنە بۆم، ئەوە گەیوەتە جێگەی خۆی، گەیوەتە ئەو جێگەیەی کە پێی حەڵاڵ دەبێ، چونکە هەتا زەکات بێ بەمن نادروستە، ئێستا بووە بە ماڵی ئوم عەتێو لە زەکاتی دەرچووە، بەڵکوو دادەنرێ بەدیاری، دیاریش بەمن دروستە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩}.

**٤٠٤) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیاری وەردەگرت، بەڵام زەکاتی وەرنەدەگرت بۆ خۆی**

**بابٌ: قَبُولُ النبّي صلى الله عليه وسلم الهَدِيَّةَ وَرَدُّ الصَّدَقَةِ**

٥١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: إِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا أُتِيَ بِطَعَامٍ، سَأَلَ عَنْهُ، فَإِنْ قِيلَ: هَدِيَّةٌ، أَكَلَ مِنْهَا، وَإِنْ قِيلَ صَدَقَةٌ، لَمْ يَأْكُلْ مِنْهَا. {الحديث: ٢٤٨٨ = ٢٤٦٦ فم. زكاة}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، کاتێ نانیان بۆی دادەنا، ئەگەر لە حەڵاڵییەکەی دڵنیا نەبوایە دەیپرسی، جا ئەگەر بگوترایە: هی دیارییە، لێی دەخوارد، بەڵام ئەگەر بگوترایە: هی زەکاتە، لێی نەدەخوارد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٧ — ت/م}.

**٤٠٥) زەکاتی سەرفترە فەرزە لەسەر هەموو موسوڵمانێ، لە خورماو جۆو شتی تری وا دەدرێ.(٢٢٧٥ - ٢٢٨٦).**

بڕ: تاج/٢ ل/٣٥ زنجیرە/١٤ و ١٥ بەتەواوی).

**بابٌ: في زَكَاةِ الفِطرِ عَلَى المُسْلِمِينَ مِنَ التَّمْرِ والشَّعِيرِ**

٥٢٠- عَنِ عَبْدُ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَرَضَ زَكَاةَ الْفِطْرِ مِنْ رَمَضَانَ عَلَى النَّاسِ: صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ،

عَلَى كُلِّ حُرٍّ أَوْ عَبْدٍ، ذَكَرٍ أَوْ أُنْثَى مِنَ الْمُسْلِمِينَ. {الحديث: ٢٢٧٥ = ٢٢٥٣ فم. تجريد/٢/١٥٤، رقم: ٧٢٥ = ١٥٠٣، ١٥٠٤، ١٥٠٧، ١٥٠٩، ١٥١١، ١٥١٢. أبو داود. زكاة: ١٦١١. ترمذي. زكاة: ٦٧٦. نسائي. زكاة: ٢٥٠١. ابن ماجة. زكاة: ١٨٢٦}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مەنێ خورما، یا مەنێ جۆ، سەرفترەی دانا: لەسەر هەموو موسوڵمانێ، ئیتر کۆیلە بێ، یا ئازادبێ، نێرینە بێ، یا مێیینە بێ، گەورەبێ، یا بچووك) لە تەجریدی بوخاریدا ئەمەی پترە، وە فەرمانیشی کرد: کە لەپێش ئەوەدا مەردوم بڕۆن بۆ نوێژی جەژن، سەرفترەکە بدەن. واتە: واباشە کە سەرفترە نەکەوێتە دوای نوێژی جەژن، بەڵکوو لەپێشتر بدرێ). {تاج/٢/٣٦، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣٠}.

### ٤٠٦) زەکاتی سەرفترە لە خۆراكو کەشكو مێوژ
### باب: زكاة الفطرِ منَ الطَّعامِ وَالْإقط وَالزَّبيب

٥٢١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنَّا نُخْرِجُ إِذْ كَانَ فِينَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) زَكَاةَ الْفِطْرِ عَنْ كُلِّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ، حُرٍّ أَوْ مَمْلُوكٍ، صَاعًا مِنْ طَعَامٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ، فَلَمْ نَزَلْ نُخْرِجُهُ حَتَّى قَدِمَ عَلَيْنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ أَبِى سُفْيَانَ، حَاجًّا أَوْ مُعْتَمِرًا، فَكَلَّمَ النَّاسَ عَلَى الْمِنْبَرِ، فَكَانَ فِيمَا كَلَّمَ بِهِ النَّاسَ أَنْ قَالَ: إِنِّى أُرَى أَنَّ مُدَّيْنِ مِنْ سَمْرَاءِ الشَّامِ، تَعْدِلُ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ، فَأَخَذَ النَّاسُ بِذَلِكَ. قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَأَمَّا أَنَا فَلاَ أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ أَبَدًا مَا عِشْتُ). {الحديث: ٢٢٨١ = ٢٢٥٩ فتح الملهم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٥٤، رقم: ٧٢٦ = ١٥٠٦، ١٥٠٨، ١٥١٠. أبو داود. زكاة: ١٦١٦. ترمذي. زكاة: ٦٧٣. نسائي. زكاة: ٢٥١٠. ابن ماجة. زكاة: ١٨٢٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرفترەمان بەم شێوەیە دەدا، لەبری هەموو سەرێ، بچووك بێ، یا گەورە، ئازادبێ، یا کۆیلە، لەبری هەر سەرێ لەمانە، مەنێ خۆراکمان لەباتی سەرفترە دەدا، وەك مەنێ کەشك، یا مەنێ جۆ، یا مەنێ خورما، یا مەنێ مێووژ،

ئیتر هەر بەم شێوەیە زەکاتی سەرفترەمان دەدا، هەتا سەردەمی جێنشینیی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) لەو سەردەمەدا، موعاوییە لە شامەوە هات بۆ حەج، یا هات بۆ عەمرە، گەنمیش پەیدا بوو بوو، جا موعاوییە خۆی لەسەر دوانگە قسەی بۆ مەردووم کرد، یەکێك لە قسەکانی ئەمە بوو فەرمووی: من وادەزانم کە دوو مست (مودد) لەم گەنمەی شام هاوتای مەنێ خورما دەکا).

ئیتر خەڵکیش رەفتاریان بەم قسەیەی ئەوکرد، ئەبو سەعید دەیفەرموو: بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم، هەتا ماوم، هەروەك جاران مەن (صاع)ێ دەدەم بە سەرفترە، لەهەموو جۆرە خۆراکێ). {تاج/٢، لاپەڕە: ٣٧، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣١} .

**روونکردنەوە:**

بەپێی فەرمایشتی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی بیارە، (رەحمەتی خودای لێ بێ)، پێنج وەسق دەکاتە سێ سەد صاع، بەپێوانەی کوردەواری دەکاتە نزیکەی چل‌و پێنج تەنەکە (شەریعەتی ئیسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٢٢٢).

کەواتە: تەنەکەیێ دەکاتە شەش صاع‌و نیو، کەمێ‌پتر، لە (النهایة فِي غَرِيب الحدیث والأثـر)ی ئیبنولئەثیریشدا دەفەرموێ: صاعێ یەکسانە بەچوار مودد، موددیش لەلای شافیعی‌و شەرعزانانی حیجاز دەکاتە رەتڵ‌و سێ یەکە رەتڵێ، بە رەتڵی عیراقی، لەلای ئەبو حەنیفەو شەرعزانەکانی عێراقیش موددێ دەکاتە دوو رەتڵ، کەواتە: صاع لەلای شافیعی‌و هاوڕایانی دەکاتە:

$$٤\times ١\frac{١}{٣} = \frac{٤}{١} \times \frac{٤}{٣} = \frac{١٦}{٣} = ٥\frac{١}{٣}$$ رەتڵ

لەلای حەنەفییەکان‌و هاوڕاکانیان صاع دەکاتە: ٤ × ٢ = ٨ رەتڵ.

هەروا مامۆستای بیارە دەفەرموێ: (بزانن هەرکەسێ لەبەر پیری، نەتوانێ بەرۆژوو بێ... واجبە لەجیاتیی رۆژووی هەر رۆژێ (مُدّ)ێك، یەعنی مشتێك، قووت بدا بە فەقیرێك (شەریعەتی ئیسلام، بەرگی یەکەم، لاپەڕە:٢٥٣ باسی رۆژووی مانگی رەمەزانی پیرۆز).

له (بلوغ المرام شرح سبل السلام)یشدا دەفەرموێ: (مودد) پڕ بە هەردوو لەپی دەستە، کە بنووسێنرێن بەیەکەوە، کە نە بنووقێنرێن‌و نە پانیش بکرێنەوە).

له مونجیدیشدا دەڵێ: مودد نزیکەی هەژدە لیترە، بە لیتری أفرنجی.

گوتەی پوخت: (صاع‌و مەن‌و موددو مشت‌و ربەو تەغارو رەتل‌و لیتر) جۆرێکن لە ئامێری پێوان‌و کێشان، جا چ خۆیان، وەچ وەرگەڕاویان، جۆرە فەرق‌و جیاوازییەك، لەنێوان واتای شەرعی‌و واتای زمانییانا هەیە، گەرچی لەزۆریانا وەجهە تەسمییە رەچاوکراوە، لەنێوان واتای زمانی‌و زاراوەییاندا (*).

---

* بەڕێز کاك سروود عوسمان دەروێش، دانیشتووی گەڕەکی مەڵکەندی، لەشاری سلێمانی، لەبەرواری شەوی ٢٠٠٩/٤/١٢ ئەم سەرەنجانەو ئەم نەخشەیەی بۆم هێنا، کە پەخشی بکەینەوە، لەناو ئەم صەحیحی موسلیمەدا، کە پەیوەندی بە فەرمووده دووبارەکانی هەرپێنج بەرگەکەی تاجول ئوصولەوە هەیە. هەرکەسێ رەچاوی بکا، بە ئاسانی فەرمووده دووبارەکان، لەچاپی چوارەمی تاجەکەدا، لە جێگەی ئاماژە پێکراودا دەدۆزێتەوە، وە ئێمەیش بە سوپاسەوە لێرەدا پەخشی دەکەینەوەو نزای باش بۆ ئەم جۆرە لاوە خوانانسە دڵسۆزانە دەکەین:

(خشتەی کتێبی تاجول ئوصول بەپێی چاپی کۆن‌و چاپی نوێ، کەچاپی چوارەمە)

١- بەرگی یەکەمی تازە (چ/٤) لە لاپەڕەی (١)وە هەتا لاپەڕەی (٥٩٥) کە بە فەرموودەی (١) دەست پێ دەکات، هەتا فەرموودەی ژمارە: (١١٧٤) کە بریتییە لە بەرگی یەکەمی کۆن (چاپی یەکەم = چ/١) بەبێ کەم‌و زیاد، لە زنجیرە (١)وە هەتا زنجیرە (٢٢٩).

٢- بەرگی دووەمی تازە (چاپی چوارەم = چ/٤):

أ- لە لاپەڕە (٣)وە هەتا لاپەڕەی (٤١٥) کە بە فەرموودەی (١١٧٥) دەست پێ دەکات، هەتا فەرموودەی (١٩٦٥) کە بریتییە لە بەرگی دووەمی کۆن بە تەواوی، لە زنجیرە (١) هەتا زنجیرە (١٨٥) چ/١.

ب- لەلاپەڕەی (٤١٦)وە هەتا لاپەڕەی (٦٠١) کە بە فەرموودەی (١٩٦٦) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٢٢٨٦) کە برێتییە لە بەشی یەکەمی بەرگی سێیەمی کۆن، لە زنجیرە (١) هەتا زنجیرە (٨٠).

٣- بەرگی سێیەمی تازە (چ/٤):

أ- لەلاپەڕەی (٣)وە هەتا لاپەڕەی (١٤٧): کە بە فەرموودەی (٢٢٨٧) دەست پێدەکات، هەتا فەرموودەی (٢٥٤٨) کە بریتییە لەبەشی دووەمی بەرگی سێیەمی کۆن، لە زنجیرەی (٨١) هەتا زنجیرەی (١٢٥).

ب- لەلاپەڕەی (١٤٨)وە هەتا لاپەڕەی (٥٢٩) کە بە فەرموودەی (٢٥٤٩) دەست پێدەکات هەتا فەرموودەی (٣٢٢٠) کە بریتییە لەبەرگی چواری کۆن بەتەواوی، لە زنجیرە (١)وە هەتا زنجیرە (١٢٠).

ج- لەلاپەڕە (٥٣٠)وە هەتا لاپەڕە (٧٩٣) کە بە فەرموودەی (٣٢٢١) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٣٥٨٩) کە بەشی یەکەمی بەرگی پێنجەمی کۆنە، لە زنجیرەی (١) هەتا زنجیرەی (٧٥).

٤- بەرگی چوارەمی تازە (چ/٤):

أ- لەلاپەڕەی (٣)وە، هەتا لاپەڕەی (٧٤) کە بە فەرموودەی (٣٥٩٠) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٣٦٨٥) کە بریتییە لەبەشی کۆتایی بەرگی پێنجی کۆن، لە زنجیرە (٧٦)وە هەتا زنجیرە (٩٤).

ب- لەلاپەڕە (٧٥)وە هەتا لاپەڕەی (٣٣٨) کە بە فەرموودەی (٣٦٨٦) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٣٩٧٣) کە بریتییە لەبەرگی شەشی کۆن بەتەواوی لە زنجیرە (١)وە هەتا زنجیرەی (١٨).

ج- لەلاپەڕەی (٣٣٩)وە هەتا لاپەڕەی (٦٠٤): کە بە فەرموودەی (٣٩٧٣) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٤٢٣٨) کە بریتییە لە بەرگی حەوتەمی کۆن بەتەواوی، لە زنجیرەی (١) هەتا زنجیرەی (٩٢).

د- لەلاپەڕەی (٦٠٥)وە هەتا لاپەڕەی (٨٧٢) کە بە فەرموودەی (٤٢٣٩) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٤٦٤٩) = بەرگی هەشتەمی کۆن بەتەواوی، لە زنجیرەی (١) هەتا زنجیرەی (١٠٥).

٥- بەرگی پێنجەمی تازە (چ/٥):

أ- لەلاپەڕە (٣)وە هەتا لاپەڕە (٣٣١) کە بە فەرموودەی (٤٦٥٠) دەست پێ دەکات، هەتا فەرموودەی (٥٢٢٥م) کە بریتییە لە بەرگی نۆیەمی کۆن بە تەواوی، لە زنجیرە (١)وە هەتا زنجیرە (٩٩).

ب- لەلاپەڕە (٣٣٢)وەوە هەتا لاپەڕە (٨٢١) کە بە فەرموودەی (٥١٢٦) دەست پێ دەکات هەتا فەرموودەی (٥٧٩٦) کە بریتییە لە بەرگی دەیەمی کۆنی تاج بەتەواوی لە زنجیرە (١)وە هەتا زنجیرە (١٥٩). ئەمەش نەخشەکەیە:-

| چاپی کۆن | | | | | | چاپی تازە | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| بەرگ | لە | زنجیرە | هەتا | زنجیرە | ← | بەرگ | لاپەڕە | هەتا | لاپەڕە | لە | لە ژمارە | بۆ ژمارە |
| ١ | لە | ١ | هەتا | ٢٢٩ | ← | ١ | ١ | هەتا | ٥٩٥ | لە | ١ | ١١٧٤ |
| ٢ | لە | ١ | هەتا | ١٨٥ | ← | ٢ | ١ | هەتا | ٤١٥ | لە | ١١٧٥ | ١٩٦٥ |
| ٣ - ١ | لە | ١ | هەتا | ٨٠ | ← | ٢ | ٤١٦ | هەتا | ٦٠١ | لە | ١٩٦٦ | ٢٢٨٦ |
| ٣- ب | لە | ٨١ | هەتا | ١٣٥ | ← | ٣ | ١ | هەتا | ١٤٧ | لە | ٢٢٨٧ | ٢٥٤٨ |
| ٤ | لە | ١ | هەتا | ١٢٠ | ← | ٣ | ١٤٨ | هەتا | ٥٢٩ | لە | ٢٥٩ | ٣٢٢٠ |

## ٤٠٧) فەرمانكردن بەدەركردنی زەكاتی سەرفترە بەر لەكردنی نوێژی جەژنی رەمەزان
## بابٌ: الأمر بِإِخْرَاجِ زَكَاةِ الفِطْرِ قَبْلَ الصَّلاَةِ

**٥٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَ بِإِخْرَاجِ زَكَاةِ الْفِطْرِ أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ). {الحديث: ٢٢٨٦ = ٢٢٦٣ فم}:**

**عەبدوڵلای كوڕی عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمانی كرد: كە لەپێش ئەوەدا كە مەردوم بڕۆن بۆ نوێژی جەژن، سەرفترەكە بدەن. {تاج/٣٦/٢، زنجیرە: ١٥، ژمارە: ١٢٣٠ — ش/د/ت/ن — رەزای خودایان لێ بێ}..**

## ٤٠٨) هاندان لەسەر ماڵ بەخشین. (٢٢٩٧ - ٢٣٠٤)
## بابٌ: التَّرْغِيبُ فِي الصَّدَقَةِ

**٥٢٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَا يَسُرُّنِى أَنَّ لِى أُحُدًا ذَهَبًا تَأْتِى عَلَىَّ ثَالِثَةٌ، وَعِنْدِى مِنْهُ دِينَارٌ، إِلاَّ دِينَارٌ أُرْصِدُهُ لِدَيْنٍ عَلَىَّ». {الحديث: ٢٢٩٩ = ٢٢٧٧ فم} {انظر: تجريد/٣/١٤٠، رقم: ١٠٤٧ = ٢٣٨٨ فتح}:**

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لەسەر بێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەم كێوەی ئوحودە، ئەگەر هەمووی زێڕبێ‌و هی من بێ، حەزدەكەم گشتی دابەش بكەم‌و هەمووی بكەم بەخێرو بە پیاوەتی‌و پێش ئەوەی سێ شەوی بەسەرا بێتەوە،**

| | | | | | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ١-٥ | له | ١ | هەتا | ٧٥ | ← | ٣ | ٥٣٠ | هەتا | ٧٩٣ | له | ٣٢٢١ | ٣٥٨٩ |
| ٥-ب | له | ٧٦ | هەتا | ٩٤ | ← | ٤ | ١ | هەتا | ٧٤ | له | ٣٥٩٠ | ٣٦٨٥ |
| ٦ | له | ١ | هەتا | ١٨ | ← | ٤ | ٧٥ | هەتا | ٣٣٨ | له | ٣٦٨٦ | ٣٩٧٣ |
| ٧ | له | ١ | هەتا | ٩٢ | ← | ٤ | ٣٣٩ | هەتا | ٦٠٤ | له | ٣٩٧٣ | ٤٢٣٨ |
| ٨ | له | ١ | هەتا | ١٠٥ | ← | ٤ | ٦٠٥ | هەتا | ٨٧٢ | له | ٤٢٣٩ | ٤٦٤٩ |
| ٩ | له | ١ | هەتا | ٩٩ | ← | ٥ | ١ | هەتا | ٣٣١ | له | ٤٦٥٠ | ٥٢٢٥م |
| ١٠ | له | ١ | هەتا | ١٥٩ | ← | ٥ | ٣٣٢ | هەتا | ٨٢١ | له | ٥١٢٦ | ٥٧٩٦ |

بەخێرو خێرات هەمووی داغان بکەمو یەك دیناری لەلام نەمێنێ، مەگەر ئەو دینارەی کە هەڵی بگرم بۆدانەوەی قەرزێ لەسەرم). {تاج/٥/٣٩٦، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢١٩ چ/٤} + {تاج/٥/٣٩٦، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢١٩ چ/٤ + لاپەرە: ٢٨٨، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٣م}.

٥٢٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ وَأَكْثِرْنَ الاسْتِغْفَارَ، فَإِنِّى رَأَيْتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ ». فَقَالَتِ امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ جَزْلَةٌ: وَمَا لَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ؟ قَالَ: « تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، وَمَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَغْلَبَ لِذِى لُبٍّ مِنْكُنَّ ». قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَمَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ وَالدِّينِ؟ قَالَ: « أَمَّا نُقْصَانُ الْعَقْلِ فَشَهَادَةُ امْرَأَتَيْنِ تَعْدِلُ شَهَادَةَ رَجُلٍ، فَهَذَا نُقْصَانُ الْعَقْلِ، وَتَمْكُثُ اللَّيَالِىَ لا تُصَلِّى، وَتُفْطِرُ فِى رَمَضَانَ، فَهَذَا نُقْصَانُ الدِّينِ ». {الحديث: ٢٣٨ = فم. إيمان. تجريد/١/٢١٣ رقم: ٢٠٣ = ٣٠٤، ٩٥٦، ١٤٦٢، ١٩٥١، ٢٦٥٨. نسائى. عيدين: ١٥٧٥، ١٥٧٨. ابن ماجة: ١٢٨٨. تاج/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ١٨}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی کۆمەڵەی ژنان! خێرو خێرات زۆر بکەنو زۆریش بپاڕێنەوە، داوای لێ بووردن لەخودا بکەن، چونکە من لەشەوی میعراجدا دیم کە ئێوەی ژنان زۆرینەی خەڵکی دۆزەخ بوون، ئافرەتێکی بەدەمو پلیان گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! لەبەرچیمانە کەوا ئێمە زوربەی خەڵکی ئاگرین؟ فەرمووی: (چونکە زۆر رەفو نەفرین دەکەنو سپڵەیی لەگەڵ مێرد دەکەنو چاکەی مێردتان لەبەرچاو نییە، کەسم نەدیوە کە وەك ئێوە ئاوا کەم هۆشو کەم ئایین بێ، کەچی لەگەڵ ئەوەیشا ئاوا زاڵ بنو، پیاو بەو هەموو زیرەکیو زرنگییەوە دەیخەڵەتێننو تەفرەی دەدەن!).

ژنەکەیش گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! کەم هۆشیو کەم ئایینیەکەمان کامەیە؟ فەرمووی: (کەم هۆشییەکەتان برێتییە لەوە کە شایەتی دووژن بە شایەتی تاقە پیاوێ حسێبە، ئەمە کەم هۆشییەکەتانە، ئافرەتیش لەکاتی بێنوێژیدا چەن

شـەوێ دەمێنێتـەوە، نـە نوێـژ دەكـاو نـە ڕۆژووی ڕەمـەزان دەگـرێ، ئەمـەیش كـەم ئایینیەكەتانە).

### ٤٠٩) هاندان لەسەر شت بەخشین. (٢٣٠٥ - ٢٣٠٦)
### بَابٌ: فی الحثّ علَی النَّفَقَة

٥٢٥- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رضی الله عنه) یَبْلُغُ بِهِ النَّبِیَّ (صلی الله علیه وسلم) قَالَ: « قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَی: یَا ابْنَ آدَمَ! أَنْفِقْ أُنْفِقْ عَلَیْكَ ». وَقَالَ: « یَمِینُ اللَّهِ مَلأَی (وَقَالَ ابْنُ نُمَیْرٍ: مَلآنُ) سَحَّاءُ لاَ یَغِیضُهَا شَیْءٌ، اللَّیْلَ وَالنَّهَارَ ». {الحدیث: ٢٣٠٥ = ٢٢٨٣ فم. تجرید/٤/٤٤٨ رقم: ١٦٦٦ = ٤٦٨٤، ٥٣٥٢، ٧٤١١ – ٧٤١٩، ٧٤٩٦. ترمذی. تفسیر: ٣٠٤٥. ابن ماجة. مقدمة: ١٩٧} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (خودای گەورە لە فەرموودەیـەكی پـیرۆز (حەدیسـێكی قودسـی)دا دەفـەرموێ: ئـەی ئـادەمیزاد! مـاڵ بـەخت بكـەو خێـر زۆر بكـە، تۆڵـەت بۆدەكەمـەوە، وەتـۆ چـاوت لەبەنـدەكانی من بێ، منیش چاوی خێرم لەتۆ دەبێ).

فەرمووی: حەزرەت فەرمووشی: (دەستی ڕاستی خـودا هەمیشـە پـڕەو سـەرڕێژ دەكا، خەزێنەو گەنجینەی خودا هەمیشە لیپـان لیپـە لـە خێـرو بێـر، ئـەوەتا وا بـە بەرچاوەوە، هەمەدەم، شەوو ڕۆژ، خودای گـەورە، بەدرێـژایی سـاڵ، لێـی دەبەخشـێ، نازو بـەهرە دەرێـژێ بەسـەر دروسـتكراوەكانیدا، ڕزقو ڕۆزی تێـرو تەسـەلیان دەدا، بەڵام هیچ كەم ناكا، خۆبـاش دەزانـن ئـەوەتی خـودا ئاسمانـەكانو زەمینـی دروسـت كردووە، چەنـدەی بەخشیوەتەوە، دیـارە كـە زۆر زۆری بەخشـیوەتەوە، دەسـا لەگـەڵ ئەوەشدا خەزێنەو گەنجینەی خـودا، یـەك تاقـە دەنـك چییە كـەمی نـەكردووە، وە وەك خۆی ماوە!).

فـــەرمووی: (وە لـــەپێش دروســـتكردنی دروســـتكراەكاندا، تـــەختو بارەگـــا (عەرش)ی خودا، لەسەر ئاو بوو، تەرازوویش وا لەدەستەكەی تریداو، بە ئـارەزووی خۆی ئاوتووی پێ دەكاو، سەر بەرەو ژوورو سەر بەرەو خـواری پـێ دەكا، لەنگـەری

دادپەروەری پێ رادەگرێ، بەپێی دانایی خۆی کە لەئێمە پەنهانە، رزق و رۆزیی کەسێ، زیاد دەکاو رۆزیی کەسێکی تر، کەم دەکات، ئەم بەرزەوە دەکاو ئەوی تر نەوی دەکا، ئیتر هەروەها). {تاج/١/٦٤، ژمارە: ١٢٨٥}.

**٤١٠) هاندان لەسەر خێرکردن، بەرلەوەی کەسێ دەست نەکەوێ، کەوەری بگرێ.** (٢٣٢٥ - ٢٣٤٣).

**بابٌ: الترغيبُ في الصَّدَقَةِ قَبْلَ أنْ لا يُوجَدَ مَنْ يَقْبَلُهَا**

٥٢٦- عَنْ حَارِثَةَ بْنَ وَهْبٍ (رضى الله عنها) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « تَصَدَّقُوا، فَيُوشِكُ الرَّجُلُ يَمْشِي بِصَدَقَتِهِ، فَيَقُولُ الَّذِى أُعْطِيَهَا: لَوْ جِئْتَنَا بِهَا بِالأَمْسِ قَبِلْتُهَا، فَأَمَّا الآنَ فَلاَ حَاجَةَ لِى بِهَا، فَلاَ يَجِدُ مَنْ يَقْبَلُهَا». {الحديث: ٢٣٣٤ = ٢٣١٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٧٤ = ١٤١١، ١٤٢٤، ٧١٢٠}:

حاریثەی کوڕی وەهب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (تا زوو خێربکەن درەنگە، هاکا کەوتنە رۆژگارێکی واوە، کەستان دەست ناکەوێ، کە خێرتان لێ وەربگرێ، هاکا وای لێهات، پیاو بەماڵی خێرەوە بەسەر خەڵکا بسوورێتەوە، ئەو کەسەی کە خێرەکەی دەداتێ، پێی دەڵێ: ئەگەر دوێنێ بهاتیتایە لێتم وەردەگرت، بەڵام ئێستا کارم پێی نییە، لەبەرئەوە وەری ناگرم، لە ئەنجامدا کەسی دەست ناکەوێ کە خێرەکەی لێ وەربگرێ). {تاج/٥، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢١}.

**روونکردنەوە:**

حاریسەی کوڕی وەهب، خوزاعییە، برای دایکی عەبدوڵڵای کوڕی عومەرە، لە صەحیحەیندا چوار فەرموودەی هەیە، لە بوخاریدا چوار فەرموودەی هەیە، دادەنرێ بە کووفەیی. (رەزای خودای لێ بێ).

٥٢٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَقِيءُ الأَرْضُ أَفْلاَذَ كَبِدِهَا، أَمْثَالَ الأُسْطُوَانِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ، فَيَجِيءُ الْقَاتِلُ فَيَقُولُ:

فِى هَذَا قَتَلْتُ، وَيَجِىءُ الْقَاطِعُ فَيَقُولُ: فِى هَذَا قَطَعْتُ رَحِمِى، وَيَجِىءُ السَّارِقُ فَيَقُولُ: فِى هَذَا قُطِعَتْ يَدِى، ثُمَّ يَدعُونَهُ، فَلاَ يَأْخُذُونَ مِنْهُ شَيْئًا». {الحديث: ٢٣٣٨ = ٢٣١٦ فم. زكاة. ترمذى. فتن: ٢٢٠٨} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (زەوی گەنجی ناوسکی خۆی، پارچە پارچە یەق دەکاتەوە، شووشی زێڕو زیو (لە وێنەی پایەو کۆڵەکە) هەڵ دەڕێژێتە دەرێ. پیاوکوژ دێتە سەری دەڵێ: من لەسەر ئەمە خەڵکم کوشتووە، ئەوەی رشتەی خزمایەتی پساندووە، دێ دەڵێ: من لەسەر ئەمە دەنگم لەخزمانی خۆم دابڕیوە، دزی دەست بڕاو دێ دەڵێ: من لەسەر ئەمە دەستم بڕاوە، کەچی ئەوکاتە ئەم زەلامانە ئەو گەنجە بەجێ دەهێڵن و دەڕۆن و هیچی لێ نابەن!). {تاج/٥/٣٩٩، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٣}.

**روونکردنەوە:**

١ ـ ئەم حاڵە لەپێش هاتنی قیامەتدا روو دەدا، وەنیشانەی نزیکبوونەوەی هاتنی قیامەتە.

٢ - ئەمە یەکێکە لەو ئاژاوانەی کە لەپێش قیامەتدا روو دەدات.

### ٤١١) خێرکردن بە مێردو بە منالی خۆت دەشێ. (٢٣١٢ - ٢٣٢٢).
### بابٌ: الصَّدَقَةُ عَلَى الزَّوْجِ وَالوَلَدِ

٥٢٨- عَنْ زَيْنَبَ امْرَأَةِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ (رضى الله عنهما) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَصَدَّقْنَ يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ وَلَوْ مِنْ حُلِيِّكُنَّ ». قَالَتْ: فَرَجَعْتُ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ فَقُلْتُ: إِنَّكَ رَجُلٌ خَفِيفُ ذَاتِ الْيَدِ، وَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ أَمَرَنَا بِالصَّدَقَةِ فَأْتِهِ فَاسْأَلْهُ، فَإِنْ كَانَ ذَلِكَ يَجْزِى عَنِّى، وَإِلاَّ صَرَفْتُهَا إِلَى غَيْرِكُمْ، قَالَتْ: فَقَالَ لِى عَبْدُ اللَّهِ: بَلِ ائْتِيهِ أَنْتِ، قَالَتْ: فَانْطَلَقْتُ فَإِذَا امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِبَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَاجَتِى حَاجَتُهَا قَالَتْ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ أُلْقِيَتْ عَلَيْهِ الْمَهَابَةُ، قَالَتْ: فَخَرَجَ عَلَيْنَا بِلاَلٌ، فَقُلْنَا لَهُ: ائْتِ رَسُولَ

اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَخْبِرْهُ أَنَّ امْرَأَتَيْنِ بِالْبَابِ تَسْأَلاَنِكَ: أَتَجْزِى الصَّدَقَةُ عَنْهُمَا إِلَى أَزْوَاجِهِمَا، وَعَلَى أَيْتَامٍ فِى حُجُورِهِمَا؟ وَلاَ تُخْبِرْهُ مَنْ نَحْنُ، قَالَتْ: فَدَخَلَ بِلاَلٌ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «مَنْ هُمَا؟». فَقَالَ: امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ وَزَيْنَبُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «أَيُّ الزَّيَانِبِ؟». قَالَ: امْرَأَةُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَهُمَا أَجْرَانِ: أَجْرُ الْقَرَابَةِ، وَأَجْرُ الصَّدَقَةِ ». {الحديث: ٢٣١٥ = ٢٢٩٣ فم. زكاة. تجريد/٢/١٢٧، رقم: ٧٠٤ = ١٤٦٦. ترمذي. زكاة: ٦٣٥، ٦٣٦. ابن ماجة. زكاة: ١٨٣٤ تحفة الأشراف/١٥٨٨٧}:

زەینەبی ژنی عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی ژن گەل! خێرو خێرات بکەن، ئەگەر خشڵی بەری خۆتان کردووە بەخێر بیکەن). فەرمووی: منیش چوومەوە بۆ ماڵەوە بە عەبدوڵلای کوڕی مەسعوودم گوت: تۆ پیاوێکی دەست کورتی، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمەی ژنانی فەرموو کە خێربکەن، جا تۆ بچۆ بۆلایو لێی بپرسە: ئەگەر خێرەکەم بدەم بە ئێوە، برێتی خێر دەکەوێ؟ دەنا دەیبەم بۆ کەسێکی تر کەپێی بشێ. عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەڵکوو خۆت بچۆ بۆ خزمەتی، منیش کە چووم روانیم کە ئافرەتێکی ئەنصاریش لە دەرگاکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) راوەستابوو، ئەویش وەك من بۆ هەمان پرسیار هاتبوو، ئەوسەردەمەیش پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەلێ بەسام بوو، لەخوداوە شەرمو شکۆی لێ دەکرا، جا بیلال هاتە دەرەوە بۆلامانو پێمان گوت: بچۆ عەرزی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بکە بڵێ: کە دوو ژن وان لەبەردەرگا، پرسیارت لێ دەکەن: ئایا دروستە کە خێرەکانیان بدەن بە مێردەکانیانو بەچەند هەتیوێ کەوان لەلای خۆیانو خۆیان هەقداریانن، وە عەرزی مەکە کە ئێمە کێین، جا بیلال رۆیشتەوە بۆ ژوورەوە بۆلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کێو کێین؟). بیلال فەرمووی: ژنێکی ئەنصاریو زەینەبن، دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (کام

زەینــەب؟). دەفـەرموێ: ژنەکـەی ئیبنـو مەسـعوود، جـا حـەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوە لەباتی پاداشـتێ دوو پاداشـتیان بـۆ هەیـە: پاداشـتی خزمایـەتیو پاداشتی خێرکردن). {ریاض/١/٢٦٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٢٦} + {تـاج/١، زنجـیرە: ٣، ژمارە: ١٨}.

## ٤١٢) خێرو بەخشین بە خزمو خوێش
## باب: الصَّدَقَةُ عَلَى الأَقْرَبِينَ

٥٢٩- عَنْ أَنَسَ بْـنَ مَـالِـكٍ (رضـى الله عنـه) قَـالَ: كَـانَ أَبُـو طَلْحَـةَ أَكْثَـرَ أَنْصَـارِيٍّ بِالْمَدِينَةِ مَالاً، وَكَانَ أَحَبَّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرَحَى وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) يَدْخُلُهَا، وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ، قَالَ أَنَسٌ: فَلَمَّـا نَزَلَـتْ هَـذِهِ الآيَةُ: (لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ) قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ فِى كِتَابِهِ: (لَـنْ تَنَـالُوا الْبِـرَّ حَتَّـى تُنْفِقُـوا مِمَّـا تُحِبُّونَ) وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِى إِلَىَّ بَيْرَحَى، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ، أَرْجُـو بِرَّهَـا وَذُخْرَهَـا عِنْـدَ اللَّـهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ شِئْتَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « بَخْ ذَلِكَ مَـالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، قَـدْ سَـمِعْتُ مَـا قُلْـتَ فِيهَـا، وَإِنِّـى أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَـا فِـى الأَقْـرَبِينَ». فَقَسَـمَهَا أَبُـو طَلْحَـةَ فِـى أَقَارِبِـهِ، وَبَنِـى عَمِّـهِ). {الحـديث: ٢٣١٢ = ٢٢٩٠ فـم. زكـاة. تجريد/٢/١٢٣، رقم: ٧٠٠ = ١٤٦١، ٢٣١٨، ٢٧٥٢، ٢٧٥٨، ٢٧٦٩، ٤٥٥٤، ٤٥٥٥، ٥٦١١}:

ئیمامی ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە مەدینە، ئەبو تەلحـە، لــەناو یاریدەدەرانــدا (لــەناو ئەنصــارەکاندا) لــە هــەموویان دەوڵەمەنــدتر بــوو، بەتایبەتی باخە خورمای زۆری هەبوو، باخێ خورمای هـەبوو نـاوی بـەیرەحا بـوو، بەرابەر قیبلەی مزگەوتەکەی پێغەمبـەر بـوو، ئـەم باخـە خۆشەویسـترین سـامانی بوو، کانیاوێکی سازگاری تیادا بوو، گەلێ جار پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشـریفی دەچوو لەئاوی ئەو کارێزەی نۆش دەفەرموو.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جا کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ - آل عمران – ٣/٩٢}. واتە: ناگەن بە پاداشتی زۆر چاكو نایابو خێری هەرە تەواو، هەتا خەرج نەکەن، لە ڕێگەی خودادا، لە ماڵە نایابو سامانە خۆشەویستەکانتانو، لەنازو بەهرەو نیعمەتو پایەو بەهرە باشانەی کە خودا بە ئێوەی داوە). جا کاتێ ئەم ئایەتە هات ئەبو طەلحە هەڵسا چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا، کە نامەی خۆیەتی، دەفەرموێ: {لَن تَنَالُواْ الْبِرَّ حَتَّى تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ} وە منیش باشترین ماڵم بەلامەوە، باخی بەیرەحایە، جا ئەوا ئەو باخی بەیرەحایەم کرد بەخێر، ساخ لەبەر ڕەزای خودا، ئومێد دەکەم کە خودا بەچاکە بینووسێ بۆم، وە پاشەکەوتی بکا بۆم، بۆ ڕۆژی دواییم، جا تۆیش ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت سەرپشك بە، چۆنی بەباش دەزانی ئاوای لێ بکە،، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەه، بەه، لەم خێرە جوانە! بەڕاستی ماڵی بەسوودو خێردار هەر ئاوا دەبێ! تێگەیشتم دەڵێی چی، من وا بەباشی دەزانم کە بیدەی بە خزمو خوێشانی خۆت!). ئەبو تەلحەش فەرمووی: باشە وادەکەم، ئەوسا ئەبو تەلحە باخەکەی دابەش کرد بەسەر خزمو ئامۆزاکانی خۆیدا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ١٩٥٢ ج/٤}.

## ٤١٣) خێرکردن بەخاڵوان
## باب: الصَّدَقَةُ عَلَى الأَخْوَالِ

٥٣٠- عَنْ مَيْمُونَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ (رضى الله عنها): أَنَّهَا أَعْتَقَتْ وَلِيدَةً فِى زَمَانِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « لَوْ أَعْطَيْتِهَا أَخْوَالَكِ كَانَ أَعْظَمَ لأَجْرِكِ ». {الحديث: ٢٣١٤ = ٢٢٩٢ فتح الملهم. تجريد/٣/١٩٥، رقم: ١١٠٦ = ٢٥٩٢، ٢٥٩٤. تحفة الأشراف: ١٨٠٧٨}:

**مەیموونەی کچی حاریث** (رەزای خودای لێ بێ) **کە هاوسەری پێغەمبەر بوو** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: کەنیزەکێکم هەبوو، کۆیلەم بوو، ئازادم کرد، بەبێ ئاگا لێبوونی پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **جا لە نۆرە سەرەی رۆژی خۆمدا، کە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **شەو لای من مایەوە، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا دەزانی کە کەنیزەکەکەم ئازادکرد؟ فەرمووی: (ئاها کردت؟ گوتم: ئەرێ فەرمووی: (دەی ئەگەر بتدایە بە خاڵۆکانت پاداشی گەورەتر بوو بۆت!).**

## ٤١٤) سیلەی رەحم بەجێهێنان لەگەڵ دایکی بتپەرستدا
## باب: صِلَةُ الأمِّ المُشْرِكَةِ

٥٣١- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِي بكر (رضى الله عنهما) قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أُمِّي قَدِمَتْ عَلَيَّ وَهْيَ رَاغِبَةٌ - أَوْ رَاهِبَةٌ - أَفَأَصِلُهَا؟ قَالَ: « نَعَمْ ». {الحديث: ٢٣٢١ = ٢٢٩٩ فم. تجريد/٣/٢٠٠، رقم: ١١١٢ = ٢٦٢٠، ٣١٨٣، ٥٩٧٨، ٥٩٧٩. أبو داود. زكاة: ١٦٦٨. تحفة الأشراف: ١٥٧٢٤}:

**ئەسمائی کچی ئەبوبەکری صدیق** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: لە مەدینە قوتەیلەی دایکم لە مەککەوە هات بۆلام، لەکاتی رێکەوتنەکەی حودەیبییەدا، عەرزی حەزرەتم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم هاتووە بۆ سەردانم، بەتەمای ئەوەیشە کە یارمەتی بدەمو دیاریو دەسەنەی پێ بدەم، جا ئایا سیلەی رەحمی دایکم بەجێ بهێنم یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ، سیلەی رەحمی دایکت بەجێ بهێنە، گەرچی نا موسوڵمانیشە، بەڵام لەبەرئەوەی کە دایکتە مافی ئەوەی هەیە لەسەرت کە سیلەی رەحمی بەجێ بهێنی).** {ریاض/١/٢٦٢، ژمارە: ٣٢٥}.

## ٤١٥) خێرکردن بۆ مردوو دروستەو پێی دەگات. (٢٣٢٣ - ٢٣٢٤)
## باب: الصَّدَقَةُ عَنِ الأمِّ المَيِّتَةِ

٥٣٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّ أُمِّيَ افْتُلِتَتْ نَفْسَهَا وَلَمْ تُوصِ، وَأَظُنُّهَا لَوْ تَكَلَّمَتْ تَصَدَّقَتْ، أَفَلَهَا

أَجْرٌ، إِنْ تَصَدَّقْتُ عَنْهَا؟ قَالَ: « نَعَمْ ». {الحديث: ٢٣٢٣ = ٢٣٠١ فم. تجريد/٣/٨٤، رقم: ٦٦٢ = ١٣٨٨، ٢٧٦٠}:

**عائیشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: سەعیدی کوڕی عوبەیدە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **عەرزی پێغەمبەری کرد** (درودی خودای لەسەر بێ)، **فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! دایکم لەناکاو مرد، فریا نەکەوت کە راسپێری‌و وەسیێت بکا، تا خێری بۆ بکەین، وەها دەزانم ئەگەر مەودای قسەکردنی ببوایە خێرێکی بڕیار دەدا بۆ خۆی، کە لەپاش مردنی بۆی بکرێ، جا ئایا خێری دەگا ئەگەر من ئێستا، لەحیاتی خۆی خێری بۆ بکەم؟ فەرمووی: (بەڵێ خێری دەگا بۆیبکە). {تاج/١/٥٨١، زنجیرە: ٢٢٩، ژمارە: ١١٦٨ + ١١٦٩ + ١١٧٠ + زنجیرە: ١٩ + ١١٥٢} + {ریاض/٣/٣، زنجیرە: ١٦٢، ژمارە: ٩٤٨}.**

### ٤١٦) هاندان لەسەر خێرکردن بەو داماوان‌و پاداشی ئەو کەسەی کە لەم بوارەدا ببێ بە سەرمەشقێ جوان بۆ کەسانی تر. (٢٣٤٤ - ٢٣٥١)

### باب: الحثُّ عَلَى الصَّدَقَةِ عَلَى ذَوِي الحاجَةِ، وَأَجْرُ مَنْ سَنَّ فيهَا سُنَّةً حَسَنَةً

٥٣٣- عَنِ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِاللّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي صَدْرِ النَّهَارِ، قَالَ: فَجَاءَهُ قَوْمٌ حُفَاةٌ عُرَاةٌ مُجْتَابِي النِّمَارِ أَوِ الْعَبَاءِ، مُتَقَلِّدِي السُّيُوفِ، عَامَّتُهُمْ مِنْ مُضَرَ، بَلْ كُلُّهُمْ مِنْ مُضَرَ،، فَتَمَعَّرَ وَجْهُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، لِمَا رَأَى بِهِمْ مِنَ الْفَاقَةِ، فَدَخَلَ ثُمَّ خَرَجَ، فَأَمَرَ بِلاَلاً فَأَذَّنَ وَأَقَامَ، فَصَلَّى، ثُمَّ خَطَبَ فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ) إِلَى آخِرِ الآيَةِ: (إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ) وَالآيَةَ الَّتِي فِي الْحَشْرِ: (اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ). تَصَدَّقَ رَجُلٌ مِنْ دِينَارِهِ، مِنْ دِرْهَمِهِ، مِنْ ثَوْبِهِ، مِنْ صَاعِ بُرِّهِ، مِنْ صَاعِ تَمْرِهِ، حَتَّى قَالَ: « وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ ». قَالَ: فَجَاءَ رَجُلٌ مِنَ الأَنْصَارِ بِصُرَّةٍ كَادَتْ كَفُّهُ تَعْجِزُ عَنْهَا، بَلْ قَدْ عَجَزَتْ. قَالَ: ثُمَّ تَتَابَعَ النَّاسُ، حَتَّى رَأَيْتُ كَوْمَيْنِ مِنْ طَعَامٍ وَثِيَابٍ، حَتَّى رَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَتَهَلَّلُ، كَأَنَّهُ مُذْهَبَةٌ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَلَهُ أَجْرُهَا، وَأَجْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ وَمَنْ سَنَّ فِي الإِسْلاَمِ سُنَّةً سَيِّئَةً، كَانَ عَلَيْهِ وِزْرُهَا

وَوِزْرُ مَنْ عَمِلَ بِهَا مِنْ بَعْدِهِ، مِنْ غَيْرِ أَنْ يَنْقُصَ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ ». {الحديث: ٢٣٤٨ = ٢٣٢٦ فم. نسائى. زكاة: ٢٥٥٣} :

جەریری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەر لەبەیانییەك لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بووین، دەستەیێ پیاوی شرۆڵەی رووت و قووت هاتن بۆلای، بالاّ پۆشەکانی خۆیانیان لەبەر هەڵکێشا بوو). یا فەرمووی: سەرو عابایان بە تەنیا لەبەردا بوو، وە هەر کەسەیان شمشێری خۆی لەملدا بوو، زوربەیان (بگرە هەموویان) لەبەرەی موضەر بوون!

کاتێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر ئەم حاڵی کەساسییە بینینی، دڵی پێیان سووتاو رووی کرژبوو، یا درژ بوو، ئەوجا چوو بۆ ماڵەوەو لەپاشا هاتەوەو فەرمانی بە بیلال کرد: بانگی داو قامەتی کرد، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی کردو لەپاشا وتارێکی داو فەرمووی: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ – نساء/١} واتە: ئەی بەرەی ئادەمیزاد! لە خودای خۆتان بترسن، خودا ئەو خودایە، کە ئێوەی هەموو لەیەك کەس دروست کردووە، کە ئادەمی باوکتانە). هەتا دوایی ئایەتەکە: (إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا) کە لەویش هاوسەرەکەیی دروست کردووە، کە حەووای دایکتانە، وە لەم دوو کەسە ئەو هەموو پیاوو ژنە زۆرەی خستۆتەوەو بەناو زەویدا، بڵاوی کردوونەتەوە، کەواتە هەم لە خودای خۆتان بترسن، کە دروستی کردوونو لەناو خۆتانا بە خاتری خودا داوای شت لە یەکتری دەکەن، هەم لەتۆڵەی سەختی تاوانی پساندنی رشتەی خزمایەتی بترسن، چ نزیکی، چ دووری، هەمووتان لە ئادەمنو ئادەمیش لە گڵە، دیارە کە خودا ئاگای لە هەموو جموجووڵو هەڵسو کەوتێکتانە). وە ئەم ئایەتەی تریشی بەسەردا خوێندینەوە، کەوا لەکۆتایی سوورەتی حەشردا، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنظُرْ نَفْسٌ مَّا قَدَّمَتْ لِغَدٍ – الحشر/ ١٨} واتە: ئەی موسوڵمانینە! ئەی کەسانێ کە باوەڕی ساختان بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێناوە! بەردەوام خۆتان لەقاری خودا بپارێزن، با هەموو کەسێ باش ورد ببێتەوە کەچی کردەوەیەکی ئامادە کردووە بۆ سبەینێی کە رۆژی ژیانەوەیە).

لەپاش ئەوە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاو با لەدیناری، لە درەمی، لە جلو بەرگی، لەمەنە گەنمی، لە مەنە خورمایی، با خێری لێ بکا، چەندەی لەدەست دێ لەکەم کەمو لە زۆر زۆر، با درێغی نەکاو خێر بکا). تەنانەت فەرمووی: (با لەتی خورمایەکیش بێ هەرباشە، خێر هەر خێرە).

جا پیاوێکی ئەنصاری پریاسکەیێ خێری هێنا، پڕی بوو لەپارە، بە حاڵە حاڵ دەستی هەڵی دەگرت، ئیتر مەردومەکە، یەك لەشوێن یەکەوە، شتیان دەهێنا، تا بەچاوی خۆم دوو کۆمەڵی گەورەم بینی، یەکێ خۆراكو، یەکێ پۆشاكو جلو بەرگ. تەماشام کرد: روخساری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەك مانگو پارچەی زڕکفت کراو گەشایەوەو ورشە ورشی بوو، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ (لە ئیسلاما) رەوشتو یاسایەکی جوان دابهێنێ، وە خەڵك بیکەن بەسەر مەشقو چاوی لێ بکەنو رەفتاری پێ بکەن، چ لە ژیانیدا، چ لەپاش مردنی، ئەوە لەپاداشتی ئەوەدا، بەقەد پاداشتی ئەو کەسانە کە بەو یاسایە کاردەکەن، خێرو پاداشتیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لە خێری ئەوان کەم بکاتەوە، وە هەرکەسێ (لە ئیسلاما) یاسایەکی ناشیرین دابهێنێو خەڵك چاوی لێ بکەنو رەفتاری پێ بکەن، چ لە ژیانیا، چ لەپاش خۆی، ئەوە بەقەد گوناهی ئەوانەی کاری پێ دەکەن، گوناهیش بۆ ئەو کەسە دەنووسرێ، بەبێ ئەوە کە هیچ لە گوناهی ئەوان کەم بکاتەوە). {ریاض/١/١٦١، ژمارە: ١٧١، زنجیرە: ١٩}.

## ٤١٧) **خێرکردن بە نەداراو رێبوار**. (٧٣٩٨ – ٧٣٩٩).

٥٣٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « بَيْنَا رَجُلٌ بِفَلاَةٍ مِنَ الأَرْضِ، فَسَمِعَ صَوْتًا فِى سَحَابَةٍ: اسْقِ حَدِيقَةَ فُلاَنٍ، فَتَنَحَّى ذَلِكَ السَّحَابُ فَأَفْرَغَ مَاءَهُ فِى حَرَّةٍ، فَإِذَا شَرْجَةٌ مِنْ تِلْكَ الشِّرَاجِ قَدِ اسْتَوْعَبَتْ ذَلِكَ الْمَاءَ كُلَّهُ، فَتَتَبَّعَ الْمَاءَ، فَإِذَا رَجُلٌ قَائِمٌ فِى حَدِيقَتِهِ يُحَوِّلُ الْمَاءَ بِمِسْحَاتِهِ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ مَا اسْمُكَ؟ قَالَ: فُلاَنٌ. لِلاِسْمِ الَّذِى سَمِعَ فِى السَّحَابَةِ، فَقَالَ لَهُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ! لِمَ تَسْأَلُنِى عَنِ

اسْمِي؟ فَقَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ صَوْتًا فِي السَّحَابِ الَّذِي هَذَا مَاؤُهُ، يَقُولُ: اسْقِ حَدِيقَةَ فُلَانٍ، لاسْمِكَ، فَمَا تَصْنَعُ فِيهَا؟ قَالَ: أَمَّا إِذَا قُلْتَ هَذَا، فَإِنِّي أَنْظُرُ إِلَى مَا يَخْرُجُ مِنْهَا، فَأَتَصَدَّقُ بِثُلُثِهِ، وَآكُلُ أَنَا وَعِيَالِي ثُلُثَهُ وَأَرُدُّ فِيهَا ثُلُثَهُ ». {الحديث: ٧٣٩٨ = ٧٤٣٣ فم. وَفِي رِوَايَةٍ: «وَ أَجْعَلُ ثُلُثَهُ فِي المَسَاكِينِ والسائلين وابن السبيل. رقم: ٧٣٩٩} :

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جارێ پیاوێ لە بیابانێکەوە دەڕۆیشت گوێی لە دەنگێ بوو، لەناو پەڵەیێ هەوردا، بە هەورەکەی دەفەرموو: باخەکەی فیسارە کەس ئاوبدە، ئیتر هەورەکە دەسبەجێ لەلایەوە کۆ بۆوەو، هەرچی ئاوێکی تیادا بوو، هەڵی رژاندە ناو تاوێرەڵانێکەوە، لەولاشەوە ئاوەڕۆگەیێ، کە لەناو چەند ئاوەڕۆگەیەکی تردا بوو، ئەو باراناوەی هەموو گرتە خۆیو بردی بەرەو جێگەیێ، پیاوەکە شوێنی کەوت، روانی وا پیاوێ، لە باخەکەیا، بە بێڵێکەوە وەستاوە، لەم دێراوەوە بۆ ئەو دێراو ئاوەکە بەبێڵەکەی دەگوێزێتەوەو دێراو لەپاش دێراو ئاوی دەدا، پێی گوت: ئەی بەندەی خودا! ناوت چییە؟ گوتی: ناوم ئەوەیە، رێك ئەو ناوەی گوت، کە لەناو هەورەکەدا بیستی، گوتی: ئەی بەندەی خودا! تۆ بۆ لەناوی من دەپرسی؟ گوتی: دەنگێکم بیست لەناو پەڵەیێ هەوردا، کە ئەمە ئاوەکەیەتی، کەتۆ ئەم باخەیەی پێ ئاو دەدەیت، دەیفەرموو: ئەی هەور! باخەکەی فیسارە کەس ئاوبدە، کە ئەم ناوەیش ناوی تۆیە، ئەوە بەری ئەم باخە چی لێ دەکەی، کە لەخوداوە ئاوا چاودێری دەکرێ؟! فەرمووی: مادام وات گوت، ئەوا منیش بۆت روون دەکەمەوە: بەرهەمی ئەم باخە دەکەم بەسێ بەشەوە: سێیەکێکی دەکەم بەخێر، خۆمو خێزانەکەیشم سێیەکێکی دەخۆینو ئەو سێیەکەکەی تریشی دەچێنمەوە بە خۆیەوە). {ریاض/٢/١١٦، ژمارە: ٥٦٢}.

لە گێڕانەوەیەکا: سێیەکی بەرهەمەکەی دەکەم بەخێرو دەیدەم بە هەژارانو داواکەرانو رێبواران).

**٤١٨) فەرموودەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر بەدەنکێ خورماش بووە، خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن.** (٢٣٤٤ - ٢٣٥١).

٥٣٥- عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) النَّارَ فَأَعْرَضَ وَأَشَاحَ، ثُمَّ قَالَ: « اتَّقُوا النَّارَ ». ثُمَّ أَعْرَضَ وَأَشَاحَ، حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ كَأَنَّمَا يَنْظُرُ إِلَيْهَا، ثُمَّ قَالَ: « اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ، فَبِكَلِمَةٍ طَيِّبَةٍ». {الحديث: ٢٣٤٦ = ٢٣٢٤ فم. بخاری. أدب: ٦٠٢٣، ٦٥٤٠، ٦٥٦٣. نسائی. زكاة: ٢٥٥٢. تحفة الأشراف: ٩٨٥٣} :

**عەدی کوڕی حاتەم** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) باسی ئاگری کرد، وەك ترساو رووی خۆی وەرچەرخان، وەك ئاگرەکە بەڕاستی بەرابەری بێ وا، لەپاشا فەرمووی: (خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن) دیسان رووی خۆی وەرچەرخانو رووی وەرگیڕایەوە، تەنانەت ئەمجارە وا موتەئەثیر بوو، وامانزانی کە ئاگرەکە وا لەبەرچاوی، ئەوجا فەرمووی: (خۆتان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزن، بابەلەتی دەنکە خورمایەکیش بووە، ئەگەر هەر هیچ نەبوو، بە قسەیەکی باش، بە گفتێکی شیرین خۆتان رزگار بکەن). {ریاض/١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٣٩} .

**٤١٩) هاندان لەسەر بەخشینی ئاژەڵی دۆخە.** (٢٣٥٤ - ٢٣٥٥)

**بابٌ: الترغيب في صَدَقَةِ المَنِيحَةِ**

٥٣٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) يَبْلُغُ بِهِ إِلَى النَبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): « أَلاَ رَجُلٌ يَمْنَحُ أَهْلَ بَيْتٍ نَاقَةً تَغْدُو بِعُسٍ وَتَرُوحُ بِعُسٍّ، إِنَّ أَجْرَهَا لَعَظِيمٌ ». {الحديث: ٢٣٥٤ = ٢٣٣٢ فم} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئای بۆ پیاوێکی خێرەومەند، وشترە مێنگەیەکی شیردەر بدا بە دۆخە، بە خێزانێ کە شیرەکەی بخۆن، بەیانی جامێ شیرو ئێوارە جامێ شیریان بۆ بهێنێتەوە، بەڕاستی کاری واباش پاداشتی گەورەی بۆ هەیە). {بڕوانە: تەجرید/٣، ژمارە: ١١١٦ + ژمارە: ١١١٧ = ٢٦٣١ + تەجرید/٥، ژمارە: ١٨٤٧ = ٥٦٠٨} .

**٤٢٠) باسی شاردنەوەی خێرکردنو کردنی خێر بە پەنامەکی.** (٢٣٧٧ - ٢٣٧٨).

**بابٌ: فَضْلُ إِخْفَاءِ الصَّدَقَةِ**

٥٣٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ الْعَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ بِعِبَادَةِ اللَّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي الْمَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ، اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا، حَتَّى لاَ تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ ». {الحديث: ٢٣٧٧ = ٢٣٥٥ فـم. تجريـد/١/٣٦٦، رقـم: ٣٧٤ = ٦٦٠، ١٤٢٣، ٦٤٧٩، ٦٨٠٦. ترمذي. زهد: ٢٣٩١} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (حەوت تاقم هەن، خودا لە ڕۆژی قیامەتدا، دایان دەنێ لەژێر سێبەری تەختو بارەگا (عەرش)ی خۆیدا، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایەو سێبەرێکی تر نییە، بێجگە لە سایەو سێبەری خودا خۆی: یەکەم: پادشای عادڵو پێشەوای دادپەروەرو کاربەدەستی بەداد، دووەم: لاوێ کە لە عیبادەتو خودا پەرستیدا قاڵ بووبێو پێ گەیشتبێو بەرە بەرە گەورە بووبێ، سێیەم: پیاوێ کە دڵی ئالوودەی مزگەوت بێ، چوارەم: دوو کەس کە ساخ لەبەر ڕەزای خودا یەکتریان خۆش بوێ، لەبەر ڕەزای خودا کۆببنەوەو هەر لەبەر ڕەزای خودایش لە یەکتر جیاببنەوە، لەپاش تەواو بوونی کۆبوونەوەکەیان، پێنجەم: پیاوێ کە ئافرەتێکی خانەدانی خانوومانی، شۆخو شەنگی جوان، داوای ئیشی خراپی لێ بکاو خۆیی تەسلیم بکا، ئەویش لەبەر ترسی خودا نەیکاو پێی بڵێ: من ئیشی بێ شەرعی ناکەم، چونکە لەخودا دەترسم، شەشەم: پیاوێ خێرێ بە پەنامەکی بکا، کە ئەم دەستی بەو دەستی نەزانێ، حەوتەم: کەسێ کە بەتەنیا خۆی بێو یادی خودا بکاو دڵی گەرم ببێو فرمێسک بەچاوەکانیدا، لەترسی خودا سەر ڕێژبکاو هۆن هۆن بێتە خوارەوە). {ریاض/١، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٣٧٦} + {تاج/١، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٦٨١ چ/٤}.

**روونكردنەوە:**

١- وشەی (پیاو) لەم جۆرە فەرموودەیەدا، بۆ نموونەیە، یان بلێین بۆ نموونەی لەبەرچاو ترە، لەبەرئەوە چەمكو مەفهوممی نییە، كەواتە ئەم حەوت تاقمە ژنیش وەك پیاو دەگرێتەوە. بڕوانە (راڤەو شیكردنەوەی) فەرموودەی ژمارە/١٣ لە تەجریدی بوخاریدا كورتو پوختی ئەم حەوت تاقمە پیاوبن، یا ژن، كوڕبن، یا كچ، لەرۆژی قیامەتدا لەبن سێبەری رەحمەتی خودادا دەبن. گەر كەسێ بلێ: یەكەمو سێیەمو پێنجەم بۆ رەگەزی مێ ناگونجێن، لە وەلامدا دەلێین: مەبەست لە (ئیمامی عادل) هەموو دەسلاتدارو كاربەدەستێكی دادپەروەرە، بەڕێوەبەری قوتابخانەبێ، ژن بێ یا پیاو، بەمەرجێ دادپەروەری بەر ئەم بڕگەیە دەكەوێ، وەك زاناكان دەفەرموون: (مەبەست لە پێشەوای دادپەروەر، پاشای عادلە، هەروا هەموو كەسێ دەگرێتەوە، كە كاروباری موسولمانانی لە ئەستۆ بێو تیا دادپەروەربێ).

هەروا دەلێین هاموشۆی مزگەوتو ئالوودە بوونی، بۆ ژنیش بەمەرجێ خۆی سوننەتە، زۆر لە بەڕێزان مامۆستا ئاینییەكان مالەكانیان وا لەپەنا مزگەوتا، كچو ژنیان زۆر بەجوانی خزمەتی مزگەوت دەكەنو، لە شوێنی تایبەتیدا ئامادەی جومعەو جەماعەت دەبنو دلیان وا ئالوودەی مزگەوت بووە، دەلێی ماسیو ئاون. زۆرجار بووە بڕگەی پێنجەم بە پێچەوانەوە بووە، بڕوانە: {ریاض/١، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٢ + تاج/١، زنجیرە: ١١، ژمارە: ٨٥ + بخاری/٣٤٦٥ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٢، لاپەڕە: ٢٦٨، ژمارە: ٥١٤٧م داستانی كیفلو ژنەكە} .

**٤٢١) خێری كاتی لەشساخیو كاتێ دلت بە مالداری خۆشە.** (٢٣٧٩ - ٢٣٨١).

**باب: فضل صَدَقَةِ الصَّحِيحِ الشَّحِيحِ**

٥٣٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَيُّ الصَّدَقَةِ أَعْظَمُ؟ فَقَالَ: « أَنْ تَصَدَّقَ وَأَنْتَ صَحِيحٌ شَحِيحٌ، تَخْشَى الْفَقْرَ وَتَأْمُلُ الْغِنَى، وَلاَ تُمْهِلْ حَتَّى إِذَا بَلَغَتِ الْحُلْقُومَ قُلْتَ: لِفُلاَنٍ كَذَا، وَلِفُلاَنٍ كَذَا، أَلاَ وَقَدْ كَانَ لِفُلاَنٍ ». {الحديث: ٢٣٧٩ = ٢٣٥٧ فم. تجريد/٢/١٠٥ رقم: ٦٨٠ =

١٤١٩، ٢٧٤٨. نسـائى. زكـاة: ٢٥٤١. أبـو داود. وصـايا: ٢٨٦٥. تحفـة الأشـراف: ١٤٩٠٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمـەتی خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) عـەرزی کـرد: ئـەی پێغەمـەری خـودا! کـام خێـرو بەخشـین پاداشـی گەورەترە؟ فەرمووی: (ئەو خێرەی کە دەیکەیت، لەشت ساخ بـێو دڵت بەماڵداری خـۆش بـێو مەترسـی هـەژاریت هـەبێو هیـوای دەوڵەمەنـد بوونـت هـەبێ، نـەوەك کەمتەرخەمی بکەی تا ئەودەمەی کە گیـان دەگاتـە سـەر لێـوو مـردن پەخـەت پـێ دەگرێ، جا ئەو حەلە بەپەلە پرووزە بڵێـی: ئـەوە بـۆ ئـەمو ئەمـە بـۆ ئـەو، تـازە چ سوود! گریمان ئەگەر سوودیشی هەبێ کەمە، لەچاو خێرکردنی حاڵی لەش ساخیدا، چونکە ئەو شتە لەدەستی تۆ دەرچووەو دەبێ بە ماڵی یەکێکی تـر کـە میراتبـەرە).
{تاج/٦/٢، ژمارە: ١٢٨٠، زنجیرە: ٢٢ – چ/٤}.

## ٤٢٢) خێری کاسبی حەڵاڵ گیرایەو پەروەردە دەکرێ. (٢٣٢٥ - ٢٣٤٣).

## باب: قَبُولُ الصَّدَقَةِ مِنَ الْكَسْبِ الطَّيِّبِ وَتَرْبِيَتُهَا

٥٣٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَتَصَدَّقُ أَحَدٌ بِتَمْرَةٍ مِنْ كَسْبٍ طَيِّبٍ إِلاَّ أَخَذَهَا اللَّهُ بِيَمِينِهِ، فَيُرَبِّيهَا كَمَا يُرَبِّى أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، أَوْ قَلُوصَهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الْجَبَلِ أَوْ أَعْظَمَ ». {الحديث: ٢٣٤٠ = ٢٣١٨ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٠٠، رقم: ٦٧٣ = ٧٤٣٠}:

ئەبو هـورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەوەی خێرێ بکا، لە رەنجەشانی حەڵاڵی خۆی، با دەنکە خورمایەکیش بـێ، دڵنیـا کە خودا بە دەستی راستی خـۆی وەری دەگـرێ، وەك چـۆن یـەکێ لـەئێوە جوانـووی ماینێ، یا نیۆنە وشترێ، بۆ خۆی پەروەردە بکا، خـودایش ئـەو خێـرە بـۆ ئێـوە بـەو شێوەیە پـەروەردە دەکـاو نەشـونمای پـێ دەکـا، تـا تـەواو گـەورە دەبـێ، وە بەقـەد کێـوێکی لێ دێ، بگـرە گـەورەتریش). {تـاج/٦/٢، زنجـیرە: ١، ژمـارە: ١١٧٨} + {ریاض/١١٥/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٥٦١}.

٥٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللَّهَ طَيِّبٌ، لاَ يَقْبَلُ إِلاَّ طَيِّبًا، وَإِنَّ اللَّهَ أَمَرَ الْمُؤْمِنِينَ بِمَا أَمَرَ بِهِ الْمُرْسَلِينَ، فَقَالَ: ( يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ). وَقَالَ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُلُوا مِنْ طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ) ». ثُمَّ ذَكَرَ الرَّجُلَ يُطِيلُ السَّفَرَ، أَشْعَثَ أَغْبَرَ، يَمُدُّ يَدَيْهِ إِلَى السَّمَاءِ: يَا رَبِّ يَا رَبِّ وَمَطْعَمُهُ حَرَامٌ، وَمَشْرَبُهُ حَرَامٌ، وَمَلْبَسُهُ حَرَامٌ، وَغُذِيَ بِالْحَرَامِ، فَأَنَّى يُسْتَجَابُ لِذَلِكَ ». {الحديث: ٢٣٤٣ = ٢٣٢١ فم} :

ئەبو هورەیرە (خۆشنوودی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەی مەردوم! ئەی نەوەی ئادەم! بزانن خودا بۆ خۆی پاك‌و خاوێنە، هەرچیش پاك‌و خاوێن‌و حەلاڵ نەبێ وەری ناگرێ‌و قەبووڵی دەكا، بزانن خودای گەورە چی فەرمانێكی بە پێغەمبەران كردووە، لەبارەی كردنی حەلاڵ‌و نەكردنی حەرامەوە، هەمان فەرمانیشی بە موسوڵمانان‌و خاوەن باوەڕەكان كردووە، ئەوەتانێ بە پێغەمبەرەكان دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الرُّسُلُ كُلُوا مِنَ الطَّيِّبَاتِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا – ٢٣/١٥} :

واتە: ئەی پێغەمبەرانی خودا! ئەی خاوەنانی پەیامانی خودا! بخۆن لە خواردەمەنی حەلاڵ‌و پاك، وە كارو كردەوەی باش بكەن‌و بەس).

لەهەمان كاتدا، لەسەر هەمان شێوە، بە موسوڵمانان‌و باوەڕدارانیش دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُلُواْ مِن طَيِّبَاتِ مَا رَزَقْنَاكُمْ – ٢/١٧٢} :

واتە: ئەی كەسانێ كە باوەڕتان هەیە بەخوداو بە پێغەمبەرانی خودا! بخۆن لەو خواردەمەنیە باش‌و پاك‌و حەلاڵە، كە ئێمە بەخشیومانە بە ئێوەو كردوومانن بە رۆزی بۆتان).

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ‌و سەرو ماڵ‌و مناڵ‌و هەست‌و نەست، گشتی بەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) باسی هەندێ كەسی كرد، كە تاعەتێكی جوانی خودا دەكەن، بەڵام نان‌و ئاوەكەیان حەرامە، فەرمووی: (هەندێ كەس دەچن بۆ سەفەری دوورو درێژ،

وەك حەج و غەزاو سەردانی کەس وکار، جا قژیان گڤ دەبێ و چڵك و تەپوتۆزیان لێ دەنیشێ و سەرگەرمی بەندەیی خودان و، بە کوڵ و بەدڵ، دەست درێژ دەکەن بەرەو ئاسمان، کە قیبلەگای نزاو پاڕانەوەیەو دەڵێن: خودایە! ئەوەم پێ بدە، خودایە! لەو دەردو بەڵایە لام بدە، ئەو خواردنەکەی حەرامە، خواردنەوەکەی حەرامە، بە حەرام گۆش کراوە، ئیتر لەکوێ دوعاو نزای ئەو جۆرە کەسەیە گیرا دەبێ!).
{ریاض/٢٢١/٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٥١/٤٤ - ٣١٥}.

## ٤٢٣) خێر با کەمیش بێ، نابێ بەسووك تەماشا بکرێ. (٢٣٧٦).
## بابٌ: تَرْكُ إحْتِقارِ قَلِيلِ الصَّدَقَةِ

٥٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَقُولُ: « يَا نِسَاءَ الْمُسْلِمَاتِ! لاَ تَحْقِرَنَّ جَارَةٌ لِجَارَتِها، وَلَوْ فِرْسِنَ شَاةٍ ». {الحديث: ٢٣٧٦ = ٢٣٥٤ فم. تجريد/٣/١٨٦، رقم: ١٠٩٥ = ٢٥٦٦، ٦٠١٧. ترمذى. هبة: ٢١٣٠. تحفة الأشراف: ١٤٣١٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دیاریی پێشکەشی یەکتری بکەن، چونکە دیاری دڵ ساف دەکاو دەغەزی سینگ دەکێشێ، با ئافرەتی موسوڵمانیش بۆ ئافرەتی دراوسێی خۆی هیچ دیاری و دەسەنەو کاسە ئاو سێ یەك بەکەم نەزانێ و بۆی بەرێ، با لاسمی مەڕێ، یا بزنێکیش بێ!!). {تاج/٢/٤٠١، زنجیرە: ١٧٦، ژمارە: ١٩٣٦} + {ریاض/١/١٢٥، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢٤}.

## ٤٢٤) باسی فەرمایشتی خوای گەورە: {يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ}. (٢٣٥٢ - ٢٣٥٣).
## باب: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ

٥٤٢- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ (رضى الله عنه) قَالَ أُمِرْنَا بِالصَّدَقَةِ. قَالَ كُنَّا نُحَامِلُ قَالَ: فَتَصَدَّقَ أَبُو عَقِيلٍ بِنِصْفِ صَاعٍ، قَالَ: وَجَاءَ إِنْسَانٌ بِشَيْءٍ أَكْثَرَ مِنْهُ فَقَالَ الْمُنَافِقُونَ: إِنَّ اللَّهَ لَغَنِيٌّ عَنْ صَدَقَةِ هَذَا وَمَا فَعَلَ هَذَا الآخَرُ إِلاَّ رِيَاءً فَنَزَلَتْ ( الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ

مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِى الصَّدَقَاتِ وَالَّـذِينَ لاَ يَجِدُونَ إلاَّ جُهْدَهُمْ). {الحديث: ٢٣٥٢ = ٢٣٣٠ فـم. تجريـد/٢/١٠٤، رقـم: ٦٧٨ = ١٤١٥، ١٤١٦، ٢٢٧٣، ٤٦٦٨، ٤٦٦٩. نسـائى. زكاة: ٢٥٢٨} :

ئـەبو مەسعوودی بـەدری (رەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردین بە کردنی خێرو صەدەقە، هەمان بوو دەچوو بۆ بازاڕو کۆڵ کێشی دەکردو مشتێ دانەوێڵەی پەیدا دەکردو دەیکرد بەخێر، فەرمووی: جا ئـەبو عەقیل لـەنیو مـەن خـۆراك خێـری کـرد، عەبدوڕەحمانی کوڕی عـەوفیش هەشت هەزار درەمی هێنا، کە دەکاتە هەزار دیناری زێـڕ کـردی بـەخێر. جا ناپاکەکان بـە تەوسـەوە گوتیـان: ئەمـە چییە ئـەبو عـەقیل کردوویـەتی بـەخێر، خـوا پێویستی بەشتی وا بێ نموود نییە، عەبدوڕەحمانیش ئەمەی بۆ خودا نییـە، بـەڵکوو بـۆ ریـا بازییە. جا بـەم بۆنەیـەوە، بـۆ پەرچـدانەوەی ئـەم دوو رووانـە خـودای گـەورە ئـەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {الَّذِينَ يَلْمِزُونَ الْمُطَّوِّعِينَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ فِي الصَّدَقَاتِ وَالَّـذِينَ لاَ يَجِدُونَ إلاَّ جُهْدَهُمْ – ٩/٧٩} واتە: ئەو کەسانەی کە رەخنـەو لەقـەم دەگـرن لـەو موسوڵمانە خێرکـەرە ساخ‌و راسـتانەی، کـە ساغ لەبـە رەزای خـودا، خێـرو خێـرات دەکـەن، یـا لـەو موسـوڵمانە کـەم دەسـتانەی کـە بـەپێی تـەواناى خۆیـان، لـەو ماڵـە کەمەی هەیانە، بەزیادەوە خێری لێ دەکـەن، تەنانـەت لـەو ماڵـەیش کـە بـە ئـارەقی ناوچەوان‌و بە رەنجی شان، پەیدای دەکەن، بەشـی خـودای لێ دەدەن، ئـەو کەسـانەی کەبـەم دوو دەسـتەیە لاقرتـێ‌و قەشمـەری دەکـەن‌و، تـیرو توانجیـان تـێ دەگـرن‌و دەیانەوێ دڵیان سارد بکەنەوە، ئەوانە بە پێچەوانەوە خـودا لـەخۆیان دەڕەنجێـنن‌و خودا خۆیان دەکا بە گاڵتـەجاڕو دەیانکـا بـە پەنـد، لـە رۆژی دوا رۆژدا، کـە هـەموو شـت بەدەسـتی خـودا خۆیـەتی سـزایەکی سـەختیان بـۆ دەبڕێتـەوە). {تـاج/٤/٢٦٢، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٥}.

**روونكردنەوە:**

ئــەبو مەســعوود نــاوی عوقبــەی كــوڕی عــامیرە، ئەنصــارییە، خەزرەجییــە، بەدرییــە، لەگــەڵ حــەفتا كەســەكەدا، لــە شــەوەكەی عەقەبــەدا، ئامــادەی پــەیمانی عەقەبە بوو، لە هــەموویان بــە تەمــەن بچووكتر بــوو، ئامــادەی جــەنگی ئوحــودیش بــووە، ســەدو دوو فــەرموودەی لــە پێغەمبــەرەوە، (دروودی خودای لەسەر بێ) گێڕاوەتــەوە، لــە بوخاریــدا دە فــەرموودەی هەیــە، لــە موســلیمدا شــازدەی هەیــە، نۆیــان پەســەندی هــەردوو پــیری بوخــاریو پــیری موســلیمن، لــە كووفــە نیشــتەجێ بــوو هــەر لــەوێش مــردووە.

### ٤٢٥) كۆكردنەوەی خێرو كۆمەڵێ كاری چاكەی تر (٢٣٦٨ - ٢٣٧١)
### باب: مَنْ جَمَعَ الصَّدَقَةَ وَأَعْمَالَ الْبِرِّ

٥٤٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ صَائِمًا ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه): أَنَا. قَالَ: « فَمَنْ تَبِعَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ جَنَازَةً ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه): أَنَا. قَالَ: « فَمَنْ أَطْعَمَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مِسْكِينًا ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه): أَنَا. قَالَ: « فَمَنْ عَادَ مِنْكُمُ الْيَوْمَ مَرِيضًا ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه): أَنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «مَا اجْتَمَعْنَ فِي امْرِئٍ إِلاَّ دَخَلَ الْجَنَّةَ ». {الحديث: ٢٣٧١ = ٢٣٤٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) فــەرمووی: خۆشەویســت (دروودی خودای لەسەر بێ) فــەرمووی: (كامتان ئەمڕۆ بەڕۆژوون؟ ئەبوبەكر فەرمووی: من. دەفەرموێ: ئەی كێتان ئەمڕۆ لەگەڵ تــەرما ڕۆیشتووە بۆسەر گۆڕستان؟ ئەبوبــەكر فــەرمووی: مــن. دەفــەرموێ: ئــەی كامتــان ئــەمڕۆ ســەردانی نەخۆشــی كــردووە؟ ئەبوبــەكر دەفــەرموێ: مــن. دەفەرموێ: ئەی كامتان ئەمڕۆ نانی هەژارێكی داوە؟ ئەبوبەكر دەفەرموێ: من.

پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فــەرمووی: (دەی ئــەم كــارە باشــانە لــە هەركەســێكا كۆببنــەوە، مسۆگەر كــە ئــەو كەســە دەچێتە بەهەشــت). واتــە: ئــەی ئەبوبــەكر تــۆ بەهەشتیت. {تاج/٣/٥٤٤، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٣٢٣٩ چ/٤}.

٥٤٣ب- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ أَنْفَقَ زَوْجَيْنِ فِى سَبِيلِ اللَّهِ نُودِىَ فِى الْجَنَّةِ يَا عَبْدَ اللَّهِ هَذَا خَيْرٌ. فَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّلاَةِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الصَّلاَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الْجِهَادِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الْجِهَادِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصَّدَقَةِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الصَّدَقَةِ، وَمَنْ كَانَ مِنْ أَهْلِ الصِّيَامِ دُعِىَ مِنْ بَابِ الرَّيَّانِ ». قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! مَا عَلَى أَحَدٍ يُدْعَى مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ مِنْ ضَرُورَةٍ فَهَلْ يُدْعَى أَحَدٌ مِنْ تِلْكَ الأَبْوَابِ كُلِّهَا؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ، وَأَرْجُو أَنْ تَكُونَ مِنْهُمْ ». {الحديث: ٢٣٦٨ = ٢٣٤٦ فم. تجريد/٢/٢٦٨، رقم: ٨٧٣ = ١٨٩٧، ٢٨٤١، ٣٢١٦، ٣٦٦٦. ترمذی. مناقب: ٣٦٧٩. نسائی. صيام: ٢٢٣٧، ٢٤٣٨، ٣١٣٥. تحفة الأشراف: ١٢٢٧٩}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:**

**(هەرکەسێ جووتێ شت لە رێگەی خودادا ببەخشێ، وەك ئەوە دوو درەم، یا دوو دینار، یا وەك ئەوە مەڕو بزنێ، یا کەواو کراسێ، یا هەنێ شەکرو چای، بۆ رەزای خودا ببەخشێ، کاتێ دەچێتە بەهەشت دەرگاوانەکان بانگی دەکەن: ئەی بەندەی خودا! ئەی فیسارە کەس! ئەم دەرگایە باشە لەباوەڕی مندا، فەرموو وەرە لێرەوە بچۆرە ژوورەوە!.**

**جا ئەوەی خاوەنی نوێژە لە دەرگای نوێژەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەنی خەباتو غەزابێو لەجیهاندا بە غەزاوە ناوی جوانی دەرکردبێ، لە دەرگای خەباتو غەزاوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خاوەنی رۆژوو بێ لە دەرگای تێراوو پاراوەوە بانگ دەکرێ، وە ئەوەی خێرەومەند بێ لە دەرگای خێرەومەندانەوە بانگ دەکرێ، ئیتر هەروا هەموو کردەوەیەکی باش دەرگای تایبەتی خۆی هەیە).**

**ئەبوبەکری صەدیقیش** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمەری خودا! بە باوكو دایکمەوە بەقوربانت بم، خۆ قەیدی نییە کە کەسێ لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ بکرێ؟**

خۆشەویست (درودی خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ کەسی وا هەیە لەهەموو دەرگاکانەوە بانگ دەکرێ، وە ئومێد دەکەم کە تۆ ئەی ئەبوبەکر! یەکێك بیت لەوکەسانە!). {ریاض/٣/٩٠٨، زنجیرە: ٢١٧، ژمارە: ١٢١٦/٢ - ٢٧١}.

### ٤٢٦) هەموو چاکەیێ خێریکە. (٢٣٢٥ - ٢٣٤٣).

### باب: كُلُّ معروفٍ صَدَقَةٌ

٥٤٤- عَنْ حُذَيْفَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): قَالَ: «كُلُّ مَعْرُوفٍ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٢٣٢٥ = ٢٣٠٣ فم. أبو داود. أدب: ٤٩٤٧. تحفة الأشراف: ٣٣١٣}:

حوزەیفە (رەزای خوداى لەسەر بێ) لە خۆشەویستەوە (درودی خوداى لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی یاسا نامەی خودا پەسەندی بکا بەخێرو چاکە حسێبە). {ریاض/١/١٢٩، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٨/١٣٤}.

### ٤٢٧) هەموو یادێکی خوداو هەموو کارێکی باش خێریکە

### باب: التسبيح والتهليل وأعمال البرِّ صَدَقَةٌ

٥٤٥- عَنْ أَبِى ذَرٍّ (رضى الله عنه) أَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالُوا لِلنَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): يَا رَسُولَ اللَّهِ ذَهَبَ أَهْلُ الدُّثُورِ بِالأُجُورِ يُصَلُّونَ كَمَا نُصَلِّى وَيَصُومُونَ كَمَا نَصُومُ وَيَتَصَدَّقُونَ بِفُضُولِ أَمْوَالِهِمْ. قَالَ: « أَوَلَيْسَ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ مَا تَصَّدَّقُونَ إِنَّ بِكُلِّ تَسْبِيحَةٍ صَدَقَةً وَكُلِّ تَكْبِيرَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلِّ تَحْمِيدَةٍ صَدَقَةٌ وَكُلِّ تَهْلِيلَةٍ صَدَقَةٌ وَأَمْرٌ بِالْمَعْرُوفِ صَدَقَةٌ وَنَهْىٌ عَنْ مُنْكَرٍ صَدَقَةٌ وَفِى بُضْعِ أَحَدِكُمْ صَدَقَةٌ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِى أَحَدُنَا شَهْوَتَهُ وَيَكُونُ لَهُ فِيهَا أَجْرٌ؟ قَالَ: « أَرَأَيْتُمْ لَوْ وَضَعَهَا فِى حَرَامٍ أَكَانَ عَلَيْهِ فِيهَا وِزْرٌ فَكَذَلِكَ إِذَا وَضَعَهَا فِى الْحَلاَلِ كَانَ لَهُ أَجْرٌ ». {الحديث: ٢٣٢٦ = ٢٣٠٤ فم. أبو داود. أدب: ٥٢٤٣. ابن ماجة. صلاة: ٩٢٧}:

ئەبو زەڕ (رەزای خوداى لێ بێ) فەرمووی: چەن کەسێ عەرزی خۆشەویستیان کرد: ئەی پێغەمەری خودا! هەرچی پاداشی هەرە گەورە هەیە، هەمووی داراو دەوڵەمەندەکان

دەیبەن بۆخۆیان! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چۆن؟) عەرزیان کرد: چونکە ئێمە نوێژ دەکەین، ئەوانیش رێك وەك ئێمە نوێژ دەکەنو وەك ئێمە رۆژوو دەگرنو، سەرەڕای ئەوەیش ماڵی زیادەیان هەیە، خێروخێراتی لێ دەکەن.

فەرمووی: چۆن وا دەڵێن: لەکاتێکا کە خودا هەقی بۆ ئێوەیش کردۆتەوەو رێگەیەکی زۆری بۆتان داناوە، بۆ خێرکردن: هەموو تەسبیحاتێ خێرێکە، هەموو تەکبیراتێ خێرێکە، هەموو حەمدو سوپاس کردنێ خێرێکە، هەموو تەلیلەیێ خێرێکە، فەرمانکردنێ بەچاکەیێ خێرێکە، هەموو نەهی کردنێ لە خراپەیێ خێرێکە، دروست ببن لەگەڵ حەلاڵی خۆتان خێرێکە. گوتیان: قوربان! وەك تۆ دەفەرمووی: ئەگەر کەیف لەگەڵ حەلاڵی خۆمانا بکەین، ئەوەیش خێرو پاداشی هەیە؟ فەرمووی: باشە بەمن بڵێن ئەگەر کەسێ لەئێوە لە داوێنپیسیدا بەکاری بهێنێ ئایا لەکاتی وادا، تاوانی لەسەرە یانا؟ کەواتە هەر لەسەر ئەم بنیاتە ئەگەر لە حەلاڵا بەکاری بهێنێ پاداشی باشی بۆ هەیە). {ریاض/١٢٣،١، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢٠}.

### ٤٢٨) هەموو جومگەیێ خێرێکی لەسەرە. (٢٣٢٥ - ٢٣٤٣).

### باب: الصَّدَقةُ وَ وُجُوبُهَا عَلَى السَّلاَمى

٥٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّهُ خُلِقَ كُلُّ إِنْسَانٍ مِنْ بَنِى آدَمَ عَلَى سِتِّينَ وَثَلاَثِمَائَةِ مَفْصِلٍ فَمَنْ كَبَّرَ اللَّهَ وَحَمِدَ اللَّهَ وَهَلَّلَ اللَّهَ وَسَبَّحَ اللَّهَ وَاسْتَغْفَرَ اللَّهَ وَعَزَلَ حَجرًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ أَوْ شَوْكَةً أَوْ عَظْمًا عَنْ طَرِيقِ النَّاسِ وَأَمَرَ بِمَعْرُوفٍ أَوْ نَهَى عَنْ مُنْكَرٍ عَدَدَ تِلْكَ السِّتِّينَ وَالثَّلاَثِمائَةِ السُّلاَمَى فَإِنَّهُ يَمْشِى يَوْمَئِذٍ وَقَدْ زَحْزَحَ نَفْسَهُ عَنِ النَّارِ ». قَالَ: أَبُو تَوْبَةَ وَرُبَّمَا قَالَ: « يُمْسِى ». {الحديث: ٢٣٢٧ = ٢٣٠٥ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەموو ئادەمیزادێ لەنەوەی ئادەم، لەسەر سێ سەدو شەست جمگە دروست کراوە، جا هەرکەسێ هەر رۆژێ بەقەد ژمارەی ئەو سێ سەدو شەست جمگەیە خێرو چاکە

بكا، ئيتر ئەو رۆژە ئەو كەسە خۆی دوور خستۆتەوە لە دۆزەخ، ئەڵڵاهوئەكبەری چاكەیەكە، ئەلحەمدو لیللایەك چاكەیەكە (لا إلهَ إلاّ اللّهُ)یەك چاكەیەكە (سبحان الله)یەك چاكەیەكە (أستغفر الله)یەك چاكەیەكە، وە بەردێ، یا درِكێ، یا ئێسكێ دوور بخەیتەوە لەسەرە رێگەی خەڵك چاكەیەكە، یا فەرمان بكەی بە چاكەیێ خێرێكە، یا نەهی بكەی لە خراپەیێ چاكەیەكە). {ریاض/١/١٢٤، زنجیرە: ١٣، ژمارە: ١٢٢/٦، ١١٨ + تاج/١/٤٧٢، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ٩٥٧، ٩٥٨}.

**٤٢٩) خێر بابچێتە دەستی كەسی ناشایستەشەوە هەرگیرایە. (٢٣٥٩).**

**باب: فِي قَبُولِ الصَّدَقَةِ تَقَعُ فِي غَيرِ أَهْلِهَا**

٥٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « قَالَ رَجُلٌ لأَتَصَدَّقَنَّ اللَّيْلَةَ بِصَدَقَةٍ فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِى يَدِ زَانِيَةٍ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ عَلَى زَانِيَةٍ. قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِى يَدِ غَنِيٍّ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى غَنِيٍّ. قَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى غَنِيٍّ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِى يَدِ سَارِقٍ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ. فَقَالَ: اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ عَلَى زَانِيَةٍ وَعَلَى غَنِيٍّ وَعَلَى سَارِقٍ. فَأُتِىَ فَقِيلَ لَهُ أَمَّا صَدَقَتُكَ فَقَدْ قُبِلَتْ أَمَّا الزَّانِيَةُ فَلَعَلَّهَا تَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ زِنَاهَا وَلَعَلَّ الْغَنِيَّ يَعْتَبِرُ فَيُنْفِقُ مِمَّا أَعْطَاهُ اللَّهُ وَلَعَلَّ السَّارِقَ يَسْتَعِفُّ بِهَا عَنْ سَرِقَتِهِ ». {الحديث: ٢٣٥٩ = ٢٣٣٧ فم. تجريد/٢/١٠٦، رقم: ٦٨٢ = ١٤٢١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەبێ لەنەوەی ئیسرائیل، دەڵێ: بەخودا دەبێ ئەمشەو خێرێ بكەم شەو خێرەكەی دەباو دەینێتە ناو دەستی ژنێكی داوێنپیسەوە، بۆ بەیانی خەڵك دەڵێن: زۆر سەیرە ئیمشەو خێر بە ژنێكی داوێنپیس كراوە، خێركەرەكە دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرە بەم ژنە داوێنپیسە، ئەمە لەسەر خواستی تۆ بووە، خواستی تۆیش پڕە لەدانایی، دەبێ خێری تر بكەم، خێرەكەی دەباو، دەینێتە ناو

دەستی دەوڵەمەندێکەوە، دیسان بۆ بەیانی خەڵکەکە دەڵێن: ئای چەندە سەیرە، خێر بە کابرایەکی دەوڵەمەند کراوە، پیاوەکەش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر ئەم خێرەیش بەم پیاوە دەوڵەمەندە، دەبێ خێرێکی تر بکەم، جا خێرەکەی دەباو، دەینێتە ناو دەستی دزێکەوە، دیسانەوە بۆ بەیانی، خەڵکەکە گوتیان: ئای چەندە سەیرە! خێر بەدز کراوە!

پیاوەکەش دەڵێ: خودایە! سوپاس بۆ تۆ لەسەر خێر بەژنی داوێنپیس‌و بە پیاوی دەوڵەمەندو بەدز. خێرکەرەکە شەو لەخەودا خەوی بینی، لەخەودا پێیان گوت: موژدەت لێ بێ، هەرسێ خێرەکەت گیرابوون، سا بەڵکوو ئەو ژنە خراپەکارە، بەهۆی خێرەکەی تۆوە دەست لەو ئیشە خراپە هەڵبگرێ، سا بەشکوو دەوڵەمەندەکەیش پەندو ئامۆژگاری وەربگرێ‌و شەرم لەخۆی بکاو، لەو ماڵ‌و سامانەی کە خودا پێی داوە، دەست بکا بە بەخشین‌و خێرکردن، سا بەڵکوو ئەو دزەش بەهۆی خێرەکەی تۆوە، دەست لەدزی هەڵبگرێ). {تاج/٥/٤٠٠، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٤ چ/٤} .

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١-نیازی پاك کاریگەری خۆی دەبینێ، خێرکەر ئەگەر نیازی پاك بێ خێرەکەی دەگاتە جێگەی خۆی‌و قەبووڵە.

٢- ئەمە بۆ خێری سوننەت وایە، لە زەکاتا، ئەگەر دەرکەوت زەکات وەرگرەکە شایستە نییە، دەبێ زەکاتەکە دووبارە بداتەوە.

٣ گێڕانەوەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم داستانە، بەڵگەی ڕاستی‌و دروستیەتی‌و بەڵگەی ئەوەیە کە ئەوانەی لە خەونەکەدا موژدەیان داوە بەخێرکەرەکە فریشتەی خودا بوون کە ئەم جۆرە بەڵگەیە لە زانستی فەرموودەو ئوصولا پێی دەگوترێ تەقریری قەولی.

٤ بەشێوەی گشتی خێری سوننەت، نەوەك صەدەقەی فەرز، وەك زەكاتو نەزر، بەهەموو كەسێ دەشێ، بەخزم بە بێگانە، بە موسوڵمان، بە ناموسوڵمان، بە مرۆڤ، بە ئاژەڵی تر، بەباش‌و بەخراپ، بەمەرجێ نەبێ بەهۆی یاریدان لەسەر گوناهو تاوان. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (ئەوەی تەڕایی ژیانی تیادا بێ، خێری پێ دەشێ).

## ٤٣٠) وێنەی بەخشندەو رەزیلی چرووك. (٢٣٥٦ - ٢٣٥٨).

## باب: في المتصدِّق والبخيل

٥٤٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَثَلُ الْبَخِيلِ وَالْمُتَصَدِّقِ مَثَلُ رَجُلَيْنِ عَلَيْهِمَا جُنَّتَانِ مِنْ حَدِيدٍ إِذَا هَمَّ الْمُتَصَدِّقُ بِصَدَقَةٍ اتَّسَعَتْ عَلَيْهِ حَتَّى تُعَفِّىَ أَثَرَهُ وَإِذَا هَمَّ الْبَخِيلُ بِصَدَقَةٍ تَقَلَّصَتْ عَلَيْهِ وَانْضَمَّتْ يَدَاهُ إِلَى تَرَاقِيهِ وَانْقَبَضَتْ كُلُّ حَلْقَةٍ إِلَى صَاحِبَتِهَا ». قَالَ: فَسَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « فَيَجْهَدُ أَنْ يُوَسِّعَهَا فَلاَ يَسْتَطِيعُ ». {الحديث: ٢٣٥٨ = ٢٣٣٦ فم. تجريد/٢/١١٣، رقم: ٦٩٢ = ١٤٤٣، ١٤٤٤، ٢٩١٧، ٥٢٩٩، ٥٧٩٧. نسائي. زكاة: ٢٥٤٧. تحفة الأشراف: ١٣٩١١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوی رەزیل‌و پیاوی بەخشندە (سەخی) مانەندی دوو پیاو وان، كە یەكی سەرو زریەی ئاسنینی تەسكیان لەبەردابێ، لە ئاستی مەمكیانەوە بێ، هەتا ددانەی سینگیان كە پێی دەگوترێ چۆڵەمە (قووڵایی خوار قورگ). جا جار لەگەڵ جارا، بەخشندەكە كەشتێ دەبەخشێ، زریەكەی بەرە بەرە كشی دێ‌و گەورەو فەرەح دەبێ، تاوای لێ دێ لەبەر پێی دەخشێ، وەك چۆن جلی شۆڕ شوێن پێ كوێردەكاتەوە، بەخشندەییش ئاوا گوناهو تاوانی خاوەنەكەی دەسڕێتەوە. بەڵام پیاوی رەزیل‌و چرووك هەركاتێ ویستی خێرێ بكا، یا شتێ ببەخشێ، ئەڵقەی زریەكەی دێتەوە یەك‌و زیاتر قوڵفەكانی تەسك دەبنەوە، هەتا بەرە بەرە هەردوو دەستی توند شەتەك دەدرێن بە بەربینیەوە!).

فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (جا رەزیلەکە هەر هەوڵ و تەقەلا دەدات کە کشی بێنێ و فەرحی بکا بەڵام ناتوانێ). {تاج/٥/٤٠١، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٥ ج/٤ + ریاض/٢/١١٥، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٧/٥٦٠}.

## ٤٣١) باسی بەخشندەو گیری دەستقووچاو
## باب: في الْمُنْفِقِ وَالْمُمْسِك

٥٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ يَوْمٍ يُصْبِحُ الْعِبَادُ فِيهِ إِلاَّ مَلَكَانِ يَنْزِلاَنِ فَيَقُولُ أَحَدُهُمَا اللَّهُمَّ أَعْطِ مُنْفِقًا خَلَفًا. وَيَقُولُ الآخَرُ اللَّهُمَّ أَعْطِ مُمْسِكًا تَلَفًا ». {الحديث: ٢٣٣٣ = ٢٣١١ فم. تجريد/٢/١١٣، رقم: ٦٩١ = ١٤٤٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو رۆژێ سەر لەبەیانی کە بەندەکان رۆژیان لێ دەبێتەوە، دوو فریشتە دێنە خوارەوە، یەکێکیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی بەخشندەیە، تۆیش پێی ببەخشەو، تۆڵەی بەزیادەوە بۆ بکەرەوە، ئەوی تریشیان دەفەرموێ: خودایە! ئەوەی چرووك و گیرو خێرنەکەرە، تۆش لەوی بگرەوەو ئایەو مایەی بفەوتێنە). {ریاض/١/٢٤٧، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٩٥} + {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١١٧٧}.

**روونکردنەوە:**

نەوەوی (پڕگۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ) دەفەرموێ: زاناکان دەفەرموون: مەبەست لەم بەخشینە هەموو شتێکە کە سەرف بکرێ بۆ پەرستش و خوا پەرستی، وەك زەکات و خەرجی حەج و سەفەری سیلەی رەحم و پیاوەتی و مەسرەفی خێزان و دیوەخان و خێرو خێرات و شتی تری لەم بابەتە، مەبەست لە گیری و دەستنووقاویش، خۆگرییە لەم جۆرە کارە باشانە، با کابرا رۆژی هەزار لیرەی زێڕیش لەکاری خراپا داغان بکا، خوا پەنامان بدا.

**٤٣٢) كليل بەدەستی دەستپاك كاتێ خێردەكا لەوماڵەی كەوا لەژێر دەستی دا، ئەویش وەك خاوەنەكەی خێری دەگات. (٢٣٦٠ - ٢٣٦٧).**

**باب: الخازِنُ الأمين أحَدُ المتصدِّقيْن**

٥٥٠- عَنْ أَبِى مُوسَى الأشعرى عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الْخَازِنَ الْمُسْلِمَ الأمِينَ الَّذِى يُنْفِذُ - وَرُبَّمَا قَالَ يُعْطِى - مَا أُمِرَ بِهِ فَيُعْطِيهِ كَامِلاً مُوَفَّرًا طَيِّبَـةً بِـهِ نَفْسُهُ فَيَدْفَعُهُ إِلَى الَّذِى أُمِرَ لَهُ بِهِ - أَحَدُ الْمُتَصَدِّقَيْنِ ». {الحديث: ٢٣٦٠ = ٢٣٣٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٩٠ = ١٤٣٨ فتح}:

**لە ئەبوو مووسای ئەشعەرییەوە** (رەزای خودای لێ بێ) **لە پێغەمبەرەوە** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (كليل بەدەستی موسوڵمانی دەستپاك، كاتێ ئەو فەرمانەی كە خاوەن ماڵ پێی دەكا، سەبارەت بەكردنی خێرێ، ئەگەر بەتەواویو بەتێرو تەسەلی، وەك پێی گوتراوە، ئەو فەرمانە ئەنجام بداو، بیدا بەو كەسەی كە پێی وتراوە، وە پێخۆشحاڵ بێ بە ئەنجامدانی، ئەوە خێركەرەكان دەبن بەدوو، كە ئەو یەكێكیانەو خاوەن شتە بەخشراوەكەیش ئەوی تریانە). {بڕوانە: تجريد. ژمارە: ٦٨٤}.**

**٤٣٣) بەخشین بەبێ دەست ترسان. (٢٣٧٢ - ٢٣٧٥)**

**باب: أنْفِقى وَلاَ تُحْصِى وَلاَ تُوعِى**

٥٥١- عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ أَبِى بَكْرٍ (رضى الله عنهما) أَنَّهَـا جَـاءَتِ النَّبِـىَّ (صـلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ لَيْسَ لِى شَىْءٌ إِلاَّ مَا أَدْخَلَ عَلَىَّ الزُّبَيْرُ فَهَلْ عَلَىَّ جُنَـاحٌ أَنْ أَرْضَخَ مِمَّا يُدْخِلُ عَلَىَّ فَقَالَ: « ارْضَخِى مَا اسْتَطَعْتِ وَلاَ تُوعِى فَيُوعِىَ اللَّهُ عَلَيْـكِ ». {الحديث: ٢٣٧٥ = ٢٣٥٣ فم. تجريد/٢/١١٢. رقم: ٦٨٨ = ١٤٣٤ فتح}:

**ئەسماء** (رەزای خودای لێ بێ) **چووە خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەرزی كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! هەرچی زوبەیری مێردم بۆم نەهێنێ نیمەو ماڵ ماڵی ئەوە، جا ئایا گوناهم ناگات ئەگەر لەو ماڵەی كە زوبەیر دەیهێنێ بۆم خێرو شتی وای لێ بكەم؟ فەرمووی: (بەپێی توانای خۆت خێری لێ بكەو لێی ببەخشە، بەشێوەی گشتی بیكە بە دەستوور: بەبێ هۆیەكی ڕەوا، پارەو پووڵو ماڵ كەڵەكە مەكەو**

دەستت نەترسێ لەخێردان بە شایستەگانو دەست مەگرەرەوە، با خودایش لەتۆی نەگرێتەوە). {ریاض/١١٤/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٥٥٩ + تاج/٤٠٢/٥، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٧}.

### ٤٣٤) ژن لە ماڵی مێردی خێربکا، خێری هەردوولا دەگا. (٢٣٦٠ - ٢٣٦٧).

### باب: إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ بَيْتِ زَوْجِهَا

٥٥٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا أَنْفَقَتِ الْمَرْأَةُ مِنْ طَعَامِ بَيْتِهَا غَيْرَ مُفْسِدَةٍ كَانَ لَهَا أَجْرُهَا بِمَا أَنْفَقَتْ وَلِزَوْجِهَا أَجْرُهُ بِمَا كَسَبَ وَلِلْخَازِنِ مِثْلُ ذَلِكَ لاَ يَنْقُصُ بَعْضُهُمْ أَجْرَ بَعْضٍ شَيْئًا ». {الحديث: ٢٣٦١ = ٢٣٣٩ فم. تجريد/٢/١٠٨ رقم: ٦٨٤ = ١٤٢٥، ١٤٣٧، ١٤٣٩، ١٤٤٠، ١٤٤١، ٢٠٦٥ فتح. أبو داود. زكاة: ١٦٨٥. ترمذى. زكاة: ٦٧٢. ابن ماجة. تجارات: ٢٢٩٤. تحفة الأشراف: ١٧٦٠٨}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ ژن (بەبێ دەستبلاوی) لە خۆراکی ماڵەوەی ببەخشێ، ئەوە پاداشتی باشی بۆ هەیە لەسەر ئەو بەخشینە، چونکە ئەو هۆی ئەوەیە، هەروەها مێردەکەشی پاداشتی باشی بۆ هەیە، چونکە ئەو پەیدای کردووە، کلیلدارو کلیل بەدەستیش هەروەها، کەسیشیان لە پاداشتی کەسیان کەم ناکەنەوە، واتە: نابن بە موزاحیمی یەکتری). {تاج/٦٤/٢، زنجیرە: ٢٣، ژمارە: ١٢٨٦}.

### ٤٣٥) کۆیلە لەماڵی خاوەنی خێر دەکاو خێری هەردوکیان دەگا

### باب: مَا أَنْفَقَ الْعَبْدُ مِنْ مَالِ مَوْلاَهُ

٥٥٣- عَنْ عُمَيْرٍ مَوْلَى آبِى اللَّحْمِ (رضى الله عنهما) قَالَ: أَمَرَنِى مَوْلاَىَ أَنْ أُقَدِّدَ لَحْمًا فَجَاءَنِى مِسْكِينٌ فَأَطْعَمْتُهُ مِنْهُ فَعَلِمَ بِذَلِكَ مَوْلاَىَ فَضَرَبَنِى فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَدَعَاهُ. فَقَالَ: « لِمَ ضَرَبْتَهُ ». فَقَالَ: يُعْطِى طَعَامِى بِغَيْرِ أَنْ آمُرَهُ. فَقَالَ: « الأَجْرُ بَيْنَكُمَا ». {الحديث: ٢٣٦٦ = ٢٣٤٤ فم. نسائى. زكاة: ٢٥٣٦}:

عومەیر (کە بەنـدەی ئـابی لـەحم بـوو) (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: رۆژێ ئاغام پێی گوتم گۆشت توێ بکەم، لەوکاتەدا، هەژارێ هات، منیش لە گۆشتەکە بەشیمدا، کە ئاغام بەمەی زانـی لێـی دام، منـیش ئـەوەم عـەرزی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی کردو پێی فەرموو: (بۆچی لێت داوە؟) گوتی: بـەبێ پرسـی مـن، خـۆراکی مـن دەدا بەخـەڵك! فـەرمووی (دروودی خـودای لەسـەر بێ): (پاداشەکەی بۆ هەردوکتانە). {تاج/٥/٤٠٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٥٢٢٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئابی لەحم هاوەڵێکی نـاودارە، نـاوی عەبـدوڵڵای کوڕی عەبدولمەلیکە پیـاوێکی خانەدانی شاعیر بوو، ئامادەی غـەزای حونـەین بـووەو هـەر لـەو غەزایەشا شـەهید بـووە، بۆیـە پێـی دەگـوترێ ئـابی لـەحم (واتـە: گۆشـت نـەخۆر) چـونکە گۆشـتی نەدەخوارد، بەسەردەمی نەفایدا گەیشتووە.

٥٥٤- عَنْ أَبُو هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَصُمِ الْمَرْأَةُ وَبَعْلُهَا شَاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ، وَلاَ تَـأْذَنْ فِـى بَيْتِـهِ وَهُـوَ شَـاهِدٌ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ، وَمَـا أَنْفَقَتْ مِنْ كَسْبِهِ مِنْ غَيْرِ أَمْـرِهِ فَـإِنَّ نِصْـفَ أَجْـرِهِ لَـهُ ». {الحديث: ٢٣٦٧ = ٢٣٤٥ فم. بخاري. نفقات: ٥٣٦٠، ٢٠٦٦، ٥١٩٢، ٥١٩٥}:

ئـەبو هـورەیرە لـە خۆشەویسـتەوە دەفـەرموێ (دروودی خـودای لەسـەر بێ): (نابـێ ژن ڕۆژووی سـوننەت بگـرێ ئەگـەر مێردەکـەی لـە ماڵـەوە بـوو، مەگـەر بـەڕەزای مێردەکەی، هەروەها نابێ کە ژن ڕێگەی کەس بدا کە هاموشۆی بکاو بچێ بـۆ مـاڵی مەگـەر بـەڕەزای مێردەکـەی، هـەرکاتێکیش ژن بـەبێ وەرگرتنـی فـەرمانی ڕوون‌و ئاشکرا لە مێردەکەی، لە مـاڵی مێردەکـەی شـتێ ببەخشێ، یـا خـەرج بکـا بـۆ کـاری خێـر، خێـری ئـەو بەخشـینە نیوەییانـە). {تـاج/٢/٥٢١، زنجیرە: ٤٦، ژمـارە: ٢١٥١ + ریاض/١، زنجیرە: ٣٥، ژمارە: ٢٨٢ + تجرید/٥/٤٣، ژمارە: ١٧٧٤}.

### ٤٣٦) خۆپاراستن لە هەڵپەی زۆر بۆ ماڵو ئارامگرتنو ساچان بە بەشی خوا.

### (٢٤٢١ - ٢٤٢٤). باب: التعفُّفُ والصَّبْر

٥٥٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ: أَنَّ نَاسًا مِنَ الأَنْصَارِ سَأَلُوا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَأَعْطَاهُمْ، ثُمَّ سَأَلُوهُ فَأَعْطَاهُمْ، حَتَّى إِذَا نَفِدَ مَا عِنْدَهُ، قَالَ: « مَا يَكُنْ عِنْدِى مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ أَدَّخِرَهُ عَنْكُمْ، وَمَنْ يَسْتَعْفِفْ يُعِفَّهُ اللَّهُ، وَمَنْ يَسْتَغْنِ يُغْنِهِ اللَّهُ، وَمَنْ يَصْبِرْ يُصَبِّرْهُ اللَّهُ، وَمَا أُعْطِىَ أَحَدٌ مِنْ عَطَاءٍ خَيْرٌ وَأَوْسَعُ مِنَ الصَّبْرِ ». {الحديث: ٢٤٢١ = ٢٣٩٩ فم. تجريد/٢/١٣١، رقم: ٧٠٧ = ١٤٦٩، ١٤٧٠. أبو داود. زكاة: ١٦٤٤. ترمذي. بروصلة: ٢٠٢٤. نسائي. زكاة: ٢٥٨٧. تحفة: ٤١٥٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ لە یاریدەدەران (ئەنصار) چەند جارێ داوای بەشیان لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد، ئەویش هەموو جارێ بەشی دەدان، تا ئەو ماڵەی کە لەلای بوو هەمووی تەواو بوو، جا فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (ئەو ماڵو خێرو بێرەی کە لەلای من بێ، لە ئێوەی ناشارمەوە، وەمن ئەوەی لە دەستم بێ، لەئێوە درێغی ناکەم، وە هەرکەسێکیش خۆی بەدوور بگرێ لە روو زەرد یی سواڵو سواڵکردن، خودا لەهەردوو جیهانا، روو سوورو سەربەرزی دەکا، وە هەرکەسێکیش چاوی تێربێو خۆی بێ نیاز بگرێو چاوی لەدەستی ئەمو ئەو نەبێ، خودا دەوڵەمەندو بێ نیازی دەکاو، وە هەرکەسێکیش دان بەخۆیا بگرێو سەبووری خۆی بدا، دڵنیابێ کە خودایش سەبرو ئارامی پێ دەبەخشێ، وەباشترینو گەورەترین خەڵاتێ کە بەکەسێ بدرێ، یا درابێ، خەڵاتو نازو بەهرەی سەبرو ئارامگرتنە). {تاج/٢/٥٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٠} + {ریاض/١، زنجیرە: ٣، ژمارە: ٢٦}.

**روونکردنەوەی ژمارە/ ٥٥٤ و ٥٥٥:**

١-کەسو کاری خۆییو مەحرەم، بەشێوەی گشتیو بەپێی عورفو باوی جوانی ناو کۆمەڵ، دروستە هاموشۆی ماڵی یەکتری بکەنو رێگە پێدانی گشتی مێرد لەم لایەنەوە بەسە، رۆژووی سوننەتی ژن، مێردەکەشی رەزای لەسەر نەبێ،

حەرام نییە، بەڵام کەراهەتی هەیە، بەمەرجێ مێرد لەسەر هەق بێ، دەنا کەراهەتیشی نییەو بەڵکوو سونەتە.

٢ - ژنو نۆکەرو منداڵو کلیل بەدەست، ئەگەر خاوەن شت ڕێگەی پێدان، یا وایان دەزانی کە ڕەزای لەسەرە، ئەوا دەبن بە خاوەن بەش لە خێراو مافی ئەوەیان هەیە کە پێشوازی لە میوانو کەسی وا بکەن.

## ٤٣٧) باسی گوزەرانو سەروبەرو ساچان بە بەشی خودا

## باب: فِي الكفافِ والقناعةِ

٥٥٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « قَدْ أَفْلَحَ مَنْ أَسْلَمَ وَرُزِقَ كَفَافًا، وَقَنَّعَهُ اللَّهُ بِمَا آتَاهُ ». {الحديث: ٢٤٢٣ = ٢٤٠١ فم. ترمذى. زهد: ٢٣٤٨. ابن ماجة. زهد: ٤١٣٨: تحفة الأشراف: ٨٨٤٨}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (رەزای خودا لەخۆیو باوکی) لە خۆشەویستەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەڕاستی سەرفرازو ڕزگار ئەو کەسەیە کە موسوڵمان بێو ڕزقو ڕۆژیی سەروبەر بەپێی حاڵ بێو بە بەشی خودا ڕازی بێ). {تاج/٢/٥٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦١} + {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٣}.

## ٤٣٨) پارێز لە سواڵ. (٢٣٨٦ - ٢٤٠٠)

## باب: التَّعَفُّفُ عَنِ المَسْأَلَةِ

٥٥٧- عَنْ مُعَاوِيَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُلْحِفُوا فِى الْمَسْأَلَةِ، فَوَاللَّهِ لاَ يَسْأَلُنِى أَحَدٌ مِنْكُمْ شَيْئًا فَتُخْرِجَ لَهُ مَسْأَلَتُهُ مِنِّى شَيْئًا وَأَنَا لَهُ كَارِهٌ فَيُبَارَكَ لَهُ فِيمَا أَعْطَيْتُهُ ». {الحديث: ٢٣٨٧ = ٢٣٦٥ فم. نسائى. زكاة: ٢٥٩٢. تحفة الأشراف: ١١٤٤٦}:

موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) لە پێغەمبەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە سواڵکردنو داواکردندا ورك مەگرنو خوازەڵۆك مەبن، سا

بەوخودایە، کەناوی ئەڵلایە، هەرکەسێ بە زۆری سواڵو خوازەڵۆکی، شتێ لەمن بسێنێ، کە خۆم پێم خۆش نەبێو بە حوسنو رەزای خۆم نەبێ، ئەستەمە کە پیتو فەڕی تێ بکەوێ بۆی!). {ریاض/٢/٩٩، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٨}.

## ٤٣٩) ناباشیو ناپەسەندیی سواڵو سواڵکاری بۆ خەڵك
## باب: كراهية المسألة للناس

٥٥٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عمر (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَزَالُ الْمَسْأَلَةُ بِأَحَدِكُمْ، حَتَّى يَلْقَى اللَّهَ وَلَيْسَ فِي وَجْهِهِ مُزْعَةُ لَحْمٍ ». {الحديث: ٢٣٩٣ = ٢٣٧١ فم. تجريد/٢، رقم: ٧١١ = ١٤٧٤، ١٤٧٥، ٤٧١٨}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پیاوی واتان هەیە، ئەی موسوڵمانینە! هەر خەریکی دەرووزەو سواڵکردنە، هەتا لە رۆژی زینەوەدا، کەدێ بۆ دیوانی خوای گەورە بۆ لێپرسینەوە یەك پرزۆڵە گۆشت بەروویەوە نامێنێ، لەو دەشتی مەحشەرەدا خودا مۆری سواڵکەریی دەنێ بە روویەوە، دەموچاوی یەك پارچە ئێسقانی رووتی بێ گۆشتە). {ریاض/٢/١٠٠، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٠}.

٥٥٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لأَنْ يَغْدُوَ أَحَدُكُمْ فَيَحْطِبَ عَلَى ظَهْرِهِ فَيَتَصَدَّقَ بِهِ، وَيَسْتَغْنِيَ بِهِ مِنَ النَّاسِ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَسْأَلَ رَجُلاً أَعْطَاهُ أَوْ مَنَعَهُ ذَلِكَ، فَإِنَّ الْيَدَ الْعُلْيَا أَفْضَلُ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَابْدَأْ بِمَنْ تَعُولُ ». {الحديث: ٢٣٩٧ = ٢٣٧٥ فم. تجريد/٢/١٣٢، رقم: ٧٠٨ = ١٤٧٠، ١٤٨٠، ٢٠٧٤، ٢٣٧٤، ترمذى. زكاة: ٦٨٠ تحفة الأشراف: ١٤٢٩٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، کەسێ لە ئێوە گوریسێ هەڵبگرێو بە کۆڵ کۆڵەدار بهێنێو بیفرۆشێو خێرو خێراتی لێ بکاو خۆی پێ رزگار بکا لەچاو بەرەوژێری ئەمو ئەو، ئەوەی گەلێ باشترە لەوە کەبچێ دەست لە

مـەردوم پـان بكاتـەوە، ئـيتر ئـەو خەڵكـە بەشـی بـدەن يـا بەشـی نـەدەن، هەرئيشكردنەكە باشترە لـە سواڵكردنەكە. ديـارە كـە دەسـتی سـەروو كـە دەسـتی خێركـەرە لەدەسـتی ژێـروو كەدەسـتی دەرووزەكـەرە گـەلێ باشـترە، لـە خێزانـی خۆشـتەوە، كـە بـژێوييان لەسـەر تۆيـە، دەسـت بكـە بـەخێركردن!). {تـاج/٢/٥٣، زنجيرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٢} .

## ٤٤٠) دەستی سەروو باشترە لە دەستی ژێروو. (٢٣٨٢ - ٢٣٨٥).

## باب: اليد العُلْيَا خيْرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى

٥٦٠- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ وَهُوَ يَذْكُرُ الصَّدَقَةَ وَالتَّعَفُّفَ عَنِ الْمَسْأَلَةِ: « الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى، وَالْيَدُ الْعُلْيَا الْمُنْفِقَةُ وَالسُّفْلَى السَّائِلَةُ ». {الحديث: ٢٣٨٢ = ٢٣٦٠ فم. تجريد/٢/١١، رقم: ٦٨٦ = ١٤٢٩ فتح. أبو داود. زكاة: ١٦٤٨. نسائي. زكاة: ٢٥٣٢. تحفة الأشراف: ٨٣٣٧}:

عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رەزای خودايان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوتاردا لەسەر دوانگە، باسی خێركردنو خۆپاراستن لە دەرووزەو گەدايی فەرموو، لەم لايەنەوە فەرمووی: (دەستی سەرەوە لە دەستی ژێرەوە باشترە، دەسـتی سـەرەوە ئەو دەستەيە كەشت دەبەخشێ، دەستی ژێرەوەيش ئەو دەستەيە كە گەدايی دەكا).

٥٦١- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَعْطَانِى، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِى، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِى، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرَةٌ حُلْوَةٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِطِيبِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِى يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى ». {الحديث: ٢٣٨٤ = ٢٣٦٢ فم. تجريد/٢/١٣٢، رقم: ٧٠٩ = ١٤٧٢، ٢٧٥٠، ٣١٤٣، ٦٤٤١. ترمذي. صفة القيامة: ٢٤٦٣. نسائي. زكاة: ٢٥٣٠. تحفة الأشراف: ٣٤٢٦}:

حەكيمی كوڕی حيزام (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ داوای بەشم لە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد ئەويش بەشی پێمدا، ديسان داوام لێ كردەوە، ديسانەوە بەشی

دامەوە، هەم دیسان داوام لێ کردەوە هەمدیس بەشی دامەوە، ئەمە بوو بەسێ جار، لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەکیم! راستە کە ماڵ میوەیەکی سەوزو شیرین‌و خۆشە بەڵام بزانە ئەوەی بە بەرچاو تێریو بەدڵتێری وەری بگرێ، خودا پیت‌و فەڕی بۆ تێدەخاو، ئەو ماڵە خێر دەداتەوە بۆی، وەلێ ئەوەی کە بەخوازەلۆکی‌و چاو چنۆکی هەڵپە هەڵپی بۆ دەکاو قرم‌و مرخی لێ خۆش دەکاو چاوی تێ دەبڕێ هەتا دەیسێنێ، بە شێوەیەکی وا، لەوەدوایش خاوەنەکەی چاوی لەدوایەتی، ئەوە ئەو ماڵە پیت‌و فەڕی بەحەوادا دەچێ! ئیتر ئەو کەسە کە ئەوە حاڵیەتی وەك ژەمەنبوردەی لێ دێ، هەردەخواو هەرتێر نابێ!

دیارە دەستی سەروو کە دەستی خێرکەرە، یا ئەو دەستەیە کە بێز لە دەرووزەو گەدایی دەکاتەوە، دیارە کە دەستی سەروو لە دەستی ژێروو کە دەستی دەرووزەکەرە، گەلێ باشترە).

گێڕانەوەی بوخاری ئەمەی پترە: حەکیم (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە ئەمەم لە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەوت گوتم: ئەی رابەری خودا! بەو کەسە کەتۆی کردووە بە پێغەمبەری راست‌و دروست‌و رەوانەی کردووی لەگەڵ ئەو ئایینە راست‌و دروستەدا، ئیتر لەپاش تۆ تا لەجیهان دەردەچم شت لەکەس وەرناگرم.

لەپاش مەرگی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکرو عومەر (رەزای خودا لە هەرسێکیان بێ) لەکاتی جێنشینی (خەلافەت)ی خۆیاندا، بەشی حەکیمیان لە دەسکەوتی جەنگی (فەیء) دەدا، بەڵام حەکیم هەتا مرد بزگوڕێکی لەکەس وەرنەگرت‌و بەڵێنەکەی خۆی کەدای بە پێغەمبەر، بردە سەر، عومەریش لەکاتی خۆیدا شایەتی لێ گرت‌و فەرمووی: ئەی گەلی موسوڵمانینە! ئێوە بەشایەت بن، ئەوەتا من بە بەرچاوی ئێوەوە، لەم دەسکەوتە بەشی خۆیی دەدەمێ، وەك ئەو پشکەی کە خودا بۆی داناوە، بەڵام حەکیم خۆی وەری ناگرێ!). {ریاض/٢/٩٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٤ + تاج/٢، لاپەڕە: ٥٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٢٦٣} .

## ٤٤١) هەژاری دڵتێری داوانەکەر. (٢٣٨٦ - ٢٤٠٠)

## باب: المسكين الذي لا يجدُ غنىً ولاَ يسألُ النَّاسَ

٥٦٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لَيْسَ الْمِسْكِينُ بِهَذَا الطَّوَّافِ الَّذِى يَطُوفُ عَلَى النَّاسِ، فَتَرُدُّهُ اللُّقْمَةُ وَاللُّقْمَتَانِ، وَالتَّمْرَةُ وَالتَّمْرَتَانِ »، قَالُوا: فَمَا الْمِسْكِينُ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: « الَّذِى لاَ يَجِدُ غِنًى يُغْنِيهِ، وَلاَ يُفْطَنُ لَهُ فَيُتَصَدَّقَ عَلَيْهِ، وَلاَ يَسْأَلُ النَّاسَ شَيْئًا ». {الحديث: ٢٣٩٠ = ٢٣٦٨ فم. تجريد/٢/١٣٤، رقم: ٧١٢ = ١٤٧٩، ١٤٧٦، ٤٥٣٩. نسائي. زكاة: ٢٥٧٢. أبو داود. زكاة: ١٦٣١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەژاری بەڕاستی ئەوە نییە کە دەرگاو دەرگاو ماڵەو ماڵ دەسووڕێتەوەو خەڵك خێری پێ دەکەن‌و، لێرەو لەوێ بە پارووێ دوو پاروو، یا بەدەنکێ دوو دەنك خورما دەستی پێوە دەنێن‌و لە کۆڵی خۆیانی دەکەنەوە، بەڵام هەژاری تەواو، کە شایستەی ئەوەیە کە دەستگیرۆیی بکرێ‌و زەکاتی پێ بدرێ، ئەو کەسەیە کە خۆی ئەوەندەی دارایی نییە کە بەباشی بەشی بکاو، کەسیش پێی نازانێ تا زەکاتی پێ بداو دەسگیرۆیی‌و یارمەتی پێ بدا، وە خۆشی لەبەر قەدر گرتنی خۆی ناچێ سواڵ لەم‌و لەو بکا). {ریاض/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٣٧ + تاج/٢/٤٥، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٢٤٦}.

## ٤٤٢) دەوڵەمەندیی بە دڵە، بە ماڵ نییە. (٢٤١٧)

## باب: ليس الغنَى عَنْ كثرة عرض

٥٦٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَيْسَ الْغِنَى عَنْ كَثْرَةِ الْعَرَضِ، وَلَكِنَّ الْغِنَى غِنَى النَّفْسِ ». {الحديث: ٢٤١٧ = ٢٣٩٥ فم. بخاري. رقاف: ٦٤٤٦. ترمذي. زهد: ٢٣٧٣. ابن ماجة. زهد: ٤١٣٧}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (دەوڵەمەندیی بەزۆری ماڵو دارایی نییە، بەڵام دەوڵەمەندیی بە بەرچاو تێریی‌و دڵ تێرییە). {ریاض/٢/٩٥، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٥٢٢}.

**٤٤٣) ناپەسەندیی چاو برسێتی‌و سوور بوون لەسەر پڕوپیتی جیهان.** (٢٤٠٧ - ٢٤١٦).

**باب: كَرَاهِيَةُ الحِرْصِ عَلَى الدُّنْيَا**

٥٦٤- عَنْ أَنَسٍ بن مالك (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَهْرَمُ ابْنُ آدَمَ، وَتَشِبُّ مِنْهُ اثْنَتَانِ: الْحِرْصُ عَلَى الْمَالِ، وَالْحِرْصُ عَلَى الْعُمُرِ ». {الحديث: ٢٤٠٩ = ٢٣٨٧ فم. بخارى. رقاق: ٦٤٢١. ترمذى. زهد: ٢٣٣٩. تحفة الأشراف: ١٤٣٤}:

**ئەنەس** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئادەمیزاد هەتا پیرتر ببێ ئەم دوو رەوشەی تیادا گەنجتر دەبێتەوە: سوور بوون لەسەر ماڵو سوور بوون لەسەر تەمەنی درێژ). {تاج/٢/٢٩٧، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥١٩٣م}.

**٤٤٤) گریمان ئادەمیزاد پڕ دوو شیو سامانی هەبێ هەوڵ دەدا کە بیکا بەسێ شیو.** (٢٤١٦).

**باب: لَوْ كَانَ لِإبْنِ آدَمَ وَادِيان مِنْ مَالٍ لا يبتغى ثالثاً**

٥٦٥- عَنْ أَبِى الأَسْوَدِ قَالَ: بَعَثَ أَبُو مُوسَى الأَشْعَرِيُّ إِلَى قُرَّاءِ أَهْلِ الْبَصْرَةِ، فَدَخَلَ عَلَيْهِ ثَلاَثُمِائَةِ رَجُلٍ قَدْ قَرَءُوا الْقُرْآنَ، فَقَالَ: أَنْتُمْ خِيَارُ أَهْلِ الْبَصْرَةِ وَقُرَّاؤُهُمْ، فَاتْلُوهُ، وَلاَ يَطُولَنَّ عَلَيْكُمُ الأَمَدُ، فَتَقْسُوَ قُلُوبُكُمْ، كَمَا قَسَتْ قُلُوبُ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ، وَإِنَّا كُنَّا نَقْرَأُ سُورَةً كُنَّا نُشَبِّهُهَا فِى الطُّولِ وَالشِّدَّةِ بِ(بَرَاءَةَ) فَأُنْسِيتُهَا، غَيْرَ أَنِّى قَدْ حَفِظْتُ مِنْهَا: لَوْ كَانَ لاِبْنِ آدَمَ وَادِيَانِ مِنْ مَالٍ لاَبْتَغَى وَادِيًا ثَالِثًا، وَلاَ يَمْلأُ جَوْفَ ابْنِ آدَمَ إِلاَّ التُّرَابُ، وَكُنَّا نَقْرَأُ سُورَةً كُنَّا نُشَبِّهُهَا بِإِحْدَى الْمُسَبِّحَاتِ فَأُنْسِيتُهَا، غَيْرَ أَنِّى قد حَفِظْتُ مِنْهَا: (يَا أَيُّهَا

الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لاَ تَفْعَلُونَ، فَتُكْتَبُ شَهَادَةً فِى أَعْنَاقِكُمْ فَتُسْأَلُونَ عَنْهَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ. {الحديث: ٢٤١٦ = ٢٣٩٤ فم}:

ئەبول ئەسوەد فەرمووی: ئەبو مووسای ئەشعەری کاتێ والی بەصرە بوو، ناردی بەشوێن قورئان خوێنەکانی بەصرەدا، کە هاتن بۆ خزمەتی سێ سەد پیاوی قورئان خوێن بوون، فەرمووی پێیان: ئێوە پیاو چاکانی خەڵکی بەصرەن‌و قورئان خوێنەکانی ئەوانن، بەردەوام بەڕێزەوە بیخوێنن، نەبادا ئێوەش وەك خاوەن نامەکان، بەهۆی ڕۆژگاری دوورو درێژەوەو دوور کەوتنەوەتان لەسەردەمی پێغەمبەرەکەتانەوە، دڵتان وەك بەرد ڕەق ببێ، وەك ئەوان ئەوەیان بەسەر هاتووە، لەسەردەمی ژیانی پێغەمبەردا سوورەتێ هەبوو، دەمانخوێند، ئێستا لەبیرم نەماوە کەچی سوورەتێکە، لە درێژی‌و توندی‌و تیژیدا لە سوورەتی بەرائەت دەچوو، بەڵام هێشتا ئەمەم لەو سوورەتە لەبەرماوە، کە دەفەرموێ: (گریمان ئادەمیزاد پڕ دوو شیو زێڕی هەبێ، هەوڵ‌و تەقەللا دەدا بۆ پڕ شیوێ تریش! ئادەمیزاد بەهیچ تێرناخوا، هەر هەڵپە دەکا بۆ پڕو پیتی جیهان، تا دەمرێ‌و چاوی پڕ دەبێ لە گڵی گۆڕ!

ئەبو مووسا فەرمووی: سوورەتێ تریش هەبوو، لە سوورەتێ لەو سوورەتانەی دەکرد، کە ناسراون بە موسەبیحات، کە لە سەرەتایانەوە (سُبْحَانَ) یا (يُسَبِّحُ لِلّهِ) هەیە، کە ئەم پێنج سوورەتانەن: ١- حەدید، ٢- حەشر، ٣- صەفف، ٤- جوموعە، ٥- تەغابوون. من ئێستا ئەو سوورەتەم لەیاد نەماوە، بەڵام هێشتا ئەمەم لەو سوورەتە لەبەرماوە کە دەفەرموێ: (ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوەو موسوڵمان بوون! بۆچی دەم‌و دڵتان یەك نین، گوتارو کردارتان ئاسمان‌و ریسمانن، دەی ئەم دۆخە نابارەتان دەنووسرێ‌و دەکرێ بە بەڵگە نامەو لە ڕۆژی قیامەتا دەکرێتە ملتان‌و بەپێی ئەوە لێپرسینەوەتان لەگەڵ دەکرێ!). {تاج/٤، لاپەڕە: ٤٣، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٣٦٥٤ + تاج/٥، لاپەڕە: ٢٨٧، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٠.م}.

## ٤٤٥) بەرهەمە رازاوەکانی زەوی کەدەبن بە مایەی ئارایش و رەونەقی ژیانی جیهان. (٢٤١٨ - ٢٤٢٠).

## بابٌ: مَايَخْرُجُ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا

٥٦٦- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: قَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: « لاَ وَاللَّهِ مَا أَخْشَى عَلَيْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ إِلاَّ مَا يُخْرِجُ اللَّهُ لَكُمْ مِنْ زَهْرَةِ الدُّنْيَا ». فَقَالَ رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِى الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَصَمَتَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سَاعَةً ثُمَّ قَالَ: « كَيْفَ قُلْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيَأْتِى الْخَيْرُ بِالشَّرِّ؟ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ الْخَيْرَ لاَ يَأْتِى إِلاَّ بِخَيْرٍ. أَوَ خَيْرٌ هُوَ؟ إِنَّ كُلَّ مَا يُنْبِتُ الرَّبِيعُ يَقْتُلُ حَبَطًا أَوْ يُلِمُّ، إِلاَّ آكِلَةَ الْخَضِرِ، أَكَلَتْ حَتَّى إِذَا امْتَلأَتْ خَاصِرَتَاهَا اسْتَقْبَلَتِ الشَّمْسَ ثَلَطَتْ أَوْ بَالَتْ ثُمَّ اجْتَرَّتْ فَعَادَتْ فَأَكَلَتْ، فَمَنْ يَأْخُذْ مَالاً بِحَقِّهِ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ يَأْخُذْ مَالاً بِغَيْرِ حَقِّهِ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الَّذِى يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ ».

{الحديث: ٢٤١٨. تجريد/٢/١٢٥، رقم: ١٤٦٥، ٩٢١، ٢٨٤٢، ٦٤٢٧. نسائي. زكاة: ٢٥٨٢}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر دوانگەکەی دانیشتبوو، ئێمەیش لەدەوری دانیشتبووین، هەڵسایەوە وتارێکی بۆ مەردومەکە داو فەرمووی: (سوێند بەخودا، ئەی موسوڵمانینە! من زۆرتر لەوە مەترسیتان لێ دەکەم، کە خودا لە پیتو فەڕو بەرهەمی زەوی دەری دەهێنێ بۆتان). گوترا: ئەی پێغەمەری خودا! مەبەست لە پیتو فەڕو بەرهەمی زەوی چییە؟ فەرمووی: (ئەوەیە کەدەبێ بەمایەی ئارایشتو رەونەقی ژیانی جیهان، وەك زێڕو زیوو کانو سامانی نایابی تر، کە زەوی بەرهەمی دەهێنێ!).

پیاوێ عەرزی کرد: قوربان! بۆچی شتی وا دەبێ کە ئەم خێرو خۆشییە ببێ بەهۆی خراپەو شەڕ؟!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا ماوەیێ راماو ماتو خامۆش بوو، هەتا زەینمان بۆ ئەوە چوو کە لەم بارەیەوە سرووشی بۆبێ (سرووش = نیگا = وەحی) جا پاش ماوەیێ باراناوی ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕی (چونکە وەك حەزرەتی

عائیشە دەفەرموێ: بەخودا بۆ خۆم پێغەمبەرم بینیوە، کاتێ سرووشی بۆ دەهات، وەها سەخڵەت دەبوو، لەرۆژی سەرماو سۆڵەدا، کە سرووش دەهاتە خوارەوە بۆی، لەوکاتەدا واشەکەت دەبوو، کاتێ کە بارودۆخی سرووشەکە بەری دەدا، چۆڕاوگەی ئارەق بە ناوچەوانیدا، خوڕ خوڕ ەهاتە خوارەوە!). {تەجرید/١، ژمارە: ٢} .

جا ئارەقی ناوچەوانی خۆی سڕی‌و فەرمووی: (پرسیارکەرەکە کوانێ؟) فەرمووی: قوربان! ئەمەتام، فەرمووی: (چۆنت گوت؟) فەرمووی: عەرزم کردی: شتی وا دەبێ کە خێر سەر بکێشێ بۆ خراپە؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خێر هەر خێر دەهێنێ‌و چاکە هەردەبێ بەهۆی چاکە، بەڵام ماڵی دنیا میوەیەکی شیرین‌و خۆشە، وەك سەوزەگیای بەهار ناسك‌و نازدارە، هەموو کەسێ کەم تازۆر حەزی لێ دەکا، جا ئەوەی کە بەشێوەیەکی رەوا پەیدای دەکاو، لەسەر شێوەیەکی رەوا جێگەی دەکاتەوە، ئەوە کۆمەك‌و دەسمایەیەکی فرەخاسە بۆی، بەڵام ئەوەی کە بەشێوەیەکی ناڕەوا پەیدای بکاو لە رێگەیەکی خراپەوە خەرجی بکا، ئەوە وەك سکەڕۆو ژەمەنبووردە وایە، هەردەخواو هەرتێر ناخوا، دەق ماڵیش وەك سەوزەو گژوگیای بەهار وایە، ئێوە دەڵێن: گوایە گژوگیای بەهار شتی چاکەو ئاژەڵی پێ دەژی، بەڵام ئەم قسەیە گشت کاتێ وانییە چونکە گەلێ گژوگیای بەهار ئاژەڵ ئەگەر هەربیماشێتەوەو زیادە خۆری تیابکا، تورخەو کاپێچی پێ دەکاو دەیکوژێ، یا زۆری نامێنێ کە بیکوژێ، بەڵام ئاژەڵی گیاخۆر، کە بەدەم‌و جەم دەیخوات کەلەکەی هەڵ دێ، ئەوجا خۆی دەدا بەخۆرو دەست دەکا بە کاوێژو بە ئاسایی ریخ‌و گمیزی خۆی دەکاو، لەپاشدا هەمیشە لەسەر ئەم رێساو دەستوورە تێ هەڵ دەچێتەوە، لەگیا خواردن‌و وچانگرتنی خۆی، ئەو ئاژەڵە هیچی لێ نایەت.

ئیتر هەرکەسێ لە رێگەی رەواوە ماڵداری بکا، خودا بۆی پیرۆز دەکا، بەڵام هەرکەسێ بەناڕەوا سامان کۆبکاتەوە، چەشنی سکەڕۆی ژەمەنبوردە وایە، هەردەخواو هەر تێر ناخوا). {تاج/٥، لاپەڕە: ٢٩٠، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ٥١٧٧.م} .

### ٤٤٦) وەرگرتنی ڕەوا. (٢٤٠٢ - ٢٤٠٦).
### باب: إباحة الأخذ لمَنْ أعطى مِنْ غيْر مَسْألَةٍ ولا إشْرافٍ

٥٦٧- عَنِ ابْنِ عمَر (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يُعْطِي عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ الْعَطَاءَ فَيَقُولُ لَهُ عُمَرُ: أَعْطِهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَفْقَرَ إِلَيْهِ مِنِّي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « خُذْهُ فَتَمَوَّلْهُ أَوْ تَصَدَّقْ بِهِ، وَمَا جَاءَكَ مِنْ هَذَا الْمَالِ وَأَنْتَ غَيْرُ مُشْرِفٍ وَلاَ سَائِلٍ فَخُذْهُ، وَمَا لاَ فَلاَ تُتْبِعْهُ نَفْسَكَ ». قَالَ سَالِمٌ: فَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَانَ ابْنُ عُمَرَ لاَ يَسْأَلُ أَحَدًا شَيْئًا، وَلاَ يَرُدُّ شَيْئًا أُعْطِيَهُ. {الحديث: ٢٤٠٣ = ٢٣٨١ فم. تجريد/٢/١٣٤، رقم: ٧١٠ = ١٤٧٣، ٧١٦٣، ٧١٦٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشی دەدا بە عومەر، عومەر دەیفەرموو: (ئەم ماڵە بدە بەکەسێ کە ئەو لەمن زیاتر پێویستیی پێی هەبێ). ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەی عومەر! کاتێ لەم ماڵە شتێکت پێ درا، وەری بگرەو بیکە بە ماڵ بۆ خۆت، یا بیکە بەخێرو بیبەخشە، بەمەرجێ چاوی تێ نەبڕیو خۆت داوای نەکەی، ئەگەر وانەبوو خۆتی تێ مەگەیەنەو مەچۆ لەشوێنی).

سالم (کە کوڕی ئیبنو عومەر بوو) دەیفەرموو: لەبەر ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر بوو، کە عەبدوڵڵای باوکم داوای شتی لەکەس نەدەکرد، بەڵام ئەگەر بەشێ، یا ماڵێ، یا شتێکی پێ بدرایە وەری دەگرتو ڕەتی نەدەکردەوە! {تاج/٢، لاپەڕە: ٥٥، ژمارە: ١٢٦٥}.

ڕوونکردنەوە:

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەری کوڕی خەتاب، تابیعییە، لە پەیڕەوانە، لەچینی دووەمی موسوڵمانانە، دایکی کچی یەزدەجورد بوو، کە پاشای ئێران بووە، ناسراوە بە (أبو عبدالله المدنی الفقیه) گێڕانەوەی زۆری ئەنجام داوە: لە عەبدوڵڵای باوکیەوە، لە ئەبو هورەیرەوە، لە کەسانی ترەوە، قورئان خوێنێکی جوان بوو، ئیمامی مالیك (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (لەسەردەمی سالمدا، مانەندی سالم، لەپیاو

چاكىو خواناسىو زوهدو بەرێزيدا كەم بوو). ئيبنو موبارەك دەفەرموێ: سالم يەكێكە لە حەوت شەرعزانەكانى مەدينە. كە پرسيارێكيان بۆ دەهات، هەر حەوتيان لێى دەكۆڵينەوە، قازى مەدينە ئەگەر پرسيارێكى بۆ حەل نەكرايە، دەينارد بۆ ئەوان، هەتا وەڵامەكەى ئەوانى وەرنەگرتايەتەوە بڕيارى نەدەدا. سالم سەوداو مامەڵەى بازاڕى دەكرد، هەتا مرد، ئيمامى ئەحمەدو إسحاقى كوڕى راهويە دەفەرموون: (دروستترين رشتە (واتە: أَصَحُّ الأَسَانِيد): زوهرى لە سالم، لە باوكيەوە. ئيمامى بوخارى دەفەرموێ: سالم بيستنى لە عائيشەوە نييە. واباوە كە لەمانگى قوربانى ساڵى سەدو شەشى كۆچيدا مردووە، دايكى سالمو دايكى قاسمى كوڕى موحەممەدى كوڕى ئەبوبەكرو دايكى عەلى كوڕى حوسەينى كوڕى ئيمامى عەلى، هەرسێكيان خوشك بوونو كچى يەزدجرد بوون، كە ئاخر پاشاى ئێران بووە، لە (٦٥١)ى زاينيدا، لەكاتى ئازادكردنى خۆراساندا لە لايەنى سوپاى ئيسلامەوە كوژراوە.

### ٤٤٧) يارمەتى كۆكردنەوە بۆكێ دروستە؟ (٢٤٠١)
### باب: من تَحِلُّ لَهُ المسألة

٥٦٨- عَنْ قَبِيصَةَ بْنِ مُخَارِقٍ الْهِلاَلِيِّ، قَالَ: تَحَمَّلْتُ حَمَالَةً فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَسْأَلُهُ فِيهَا، فَقَالَ: « أَقِمْ حَتَّى تَأْتِيَنَا الصَّدَقَةُ فَنَأْمُرَ لَكَ بِهَا ». ثُمَّ قَالَ: « يَا قَبِيصَةُ إِنَّ الْمَسْأَلَةَ لاَ تَحِلُّ إِلاَّ لأَحَدِ ثَلاَثَةٍ: رَجُلٍ تَحَمَّلَ حَمَالَةً، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَهَا ثُمَّ يُمْسِكُ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ اجْتَاحَتْ مَالَهُ فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، أَوْ قَالَ: سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، وَرَجُلٍ أَصَابَتْهُ فَاقَةٌ حَتَّى يَقُومَ ثَلاَثَةٌ مِنْ ذَوِى الْحِجَا مِنْ قَوْمِهِ: لَقَدْ أَصَابَتْ فُلاَنًا فَاقَةٌ، فَحَلَّتْ لَهُ الْمَسْأَلَةُ حَتَّى يُصِيبَ قِوَامًا مِنْ عَيْشٍ، أَوْ قَالَ: سِدَادًا مِنْ عَيْشٍ، فَمَا سِوَاهُنَّ مِنَ الْمَسْأَلَةِ يَا قَبِيصَةُ سُحْتًا يَأْكُلُهَا صَاحِبُهَا سُحْتًا ». {الحديث: ٢٤٠١ = ٢٣٧٩ فم. أبو داود. زكاة: ١٦٤٠. نسائي. زكاة: ٢٥٧٨. تحفة: ١١٠٦٨}:

قەبیصەی کوڕی موخاریقی هیلالی (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: باربوویەکم لە ئەستۆی خۆم گرتبوو. واتە: چووبوومە ژێر چەردەیێ ماڵی بڕیاردراو، کە بیدەم لە پێناوی ناوبژیکردنی دوو دەستەی ناکۆکا. جا بۆئەمە چوومە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وە داوای پیتاکم لێ کرد بۆ ئەم مەبەستە. فەرمووی: بمێنەرەوە تا زەکاتمان بۆ دێ، لەوە بەشت دەدەم بۆ ئەم کارەی کە پێی هەڵ دەستیت، ئینجا فەرمووی: ئەی قەبیصە! دەرووزەو پیتاك کۆکردنەوە دروست نییە بۆ ئەم سێ کەسە نەبێ: بۆ پیاوێ دروستە کە چووبێتە ژێر ئەندازەیەك ماڵ بۆ کوژانەوەی ئاژاوەیەك، بۆ ئەمە دروستە کە ئەوەندە پیتاك کۆبکاتەوە تا ئەو ئەندازە دیاریکراوە پەیدا دەکاو، ئیتر دەبێ وازبهێنێ، بۆ پیاوێکیش کە قورتێکی هاتبێ بەسەرداو، هەژار کەوتبێ، بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە پیتاك کۆبکاتەوە تا گوزەرانی پێی دەچێ بەڕێوە). یا فەرمووی: (تا گوزەرانی پێ دەکا، بۆ پیاوێکیش کە سێ پیاوی هۆشیار، لە هۆزی خۆی، شایەتی بۆ بدەن کە فیسارە کەس هەژارو نابووت بووە، جا بۆ ئەمیش دروستە ئەوەندە باربوویی وەربگرێ، تا گوزەرانی پێی بچێ بەڕێوە). یا فەرمووی: (تا گوزەرانی پێ دەکات، ئەی قەبیصە! ئیتر لەمانە بترازێ سواڵو دەرووزەو شت کۆکردنەوە، بەناوی یارمەتییەوە ناڕەوایەو خاوەنەکەی بە ناڕەوایی دەیخوات). {تاج/٢/٤٦، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ١٢٤٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

قەبیصەی کوڕی موخاریقی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی شەددادی هیلالی، هاوەڵی پێغەمبەرە، لە بەسرە نیشتەجێ بوو، لە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو، لە ئەفرادی موسلیمە، لە بوخاریدا فەرموودەی نییە، یەکێ لە ڕاویەکانی قەطەنی کوڕی بوو، یەکێ تریان ئەبو عوثمانی نەهدی بوو.

## ٤٤٨) بەش دان بەكەسێ بەڕەقی داوای بەش بکا. (٢٤٢٥ - ٢٤٦٩).
## بابُ: إعْطَاءُ مَنْ يَسْأَلُ بِغِلْظَةٍ

٥٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنْتُ أَمْشِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَعَلَيْهِ رِدَاءٌ نَجْرَانِيٌّ غَلِيظُ الْحَاشِيَةِ، فَأَدْرَكَهُ أَعْرَابِيٌّ فَجَبَذَهُ بِرِدَائِهِ جَبْذَةً شَدِيدَةً، نَظَرْتُ إِلَى صَفْحَةِ عُنُقِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ أَثَّرَتْ بِهَا حَاشِيَةُ الرِّدَاءِ مِنْ شِدَّةِ جَبْذَتِهِ، ثُمَّ قَالَ: يَا مُحَمَّدُ مُرْ لِي مِنْ مَالِ اللَّهِ الَّذِي عِنْدَكَ، فَالْتَفَتَ إِلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَضَحِكَ، ثُمَّ أَمَرَ لَهُ بِعَطَاءٍ. {الحديث: ٢٤٢٦ = ٢٤٠٤ فم. تجريد/٣، لاپەڕە: ٣٩٨، رقم: ١٢٧٣ = ٣١٤٩، ٥٨٠٩، ٦٠٨٨. تحفة الأشراف: ٢٠٥}:

ئەنەسی كوڕی ماليك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە خزمەتی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەڕۆیشتم بەڕێدا، شاڵێكی نەجرانی پەراوێز ئەستووری بەسەر شانەوە بوو، عارەبێكی دەشتەكی پێ گەیشت، یەخەی پۆشاكەكەی پێغەمبەری گرت‌و بەتوندی وا رایكێشا لاملی حەزرەتی دابڕی‌و كاری تێكرد! ئەوجا پێی گوت: ئەی موحەممەد! لەم ماڵە كەهی خودایەو لای تۆ دانراوە بەشم بدە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوڕی لێ دایەوەو بەدەمیەوە پێكەنی‌و فەرمانی كرد كە بەشی بدەن، ئەوانیش بەشیاندا). {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٥٢، زنجيرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٨٢}.

٥٧٠- عَنِ الْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: قَسَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَقْبِيَةً وَلَمْ يُعْطِ مَخْرَمَةَ شَيْئًا، فَقَالَ مَخْرَمَةُ: يَا بُنَيَّ انْطَلِقْ بِنَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَانْطَلَقْتُ مَعَهُ، قَالَ: ادْخُلْ فَادْعُهُ لِي، قَالَ: فَدَعَوْتُهُ لَهُ، فَخَرَجَ إِلَيْهِ وَعَلَيْهِ قَبَاءٌ مِنْهَا، فَقَالَ: « خَبَأْتُ هَذَا لَكَ ». قَالَ: فَنَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: « رَضِيَ مَخْرَمَةُ ». {الحديث: ٢٤٢٨ = ٢٤٠٦ فم. تجريد/٣، لاپەڕە: ١٩٦، رقم: ١١٠٨ = ٢٥٩٩، ٢٦٥٧، ٣١٢٧، ٥٨٠٠، ٥٨٦٢، ٦١٣٢. أبو داود. لباس: ٤٠٢٨. ترمذی. أدب: ٢٨١٨. نسائی. زينة: ٥٣٣٩، تحفة الأشراف: ١١٢٦٨}:

میسوەری كوڕی مەخرەمە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوكم فەرمووی پێم: كوڕم! دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەندێ كەوای بۆ هاتووە خەریكە

دابەشیان دەکا، بابڕۆین بۆ خزمەتی، کەچووین پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ماڵەوە بوو، باوکم گوتی: کوڕم بچۆرە ژوورەوە بانگی بکە بۆم (منیش شتی وام بەلاوە ئەستەم بوو، بۆیە گوتم: پێغەمبەر بانگ بکەم بۆ تۆ!! گوتی: کوڕم! خۆ من مەبەستم ئەوە نییە کە لەقەدری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەم بکەمەوە، بەڵکوو مەبەستم ئەوەیە کە ئەو پێغەمبەرەو بێ هەوایە، خۆ زۆردارو زەبردار نییە، تا بە فیزو دەعیە بێو کەس نەوێرێ بانگی بکا) جا منیش چووم بانگم کرد بۆیو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوە بۆلای باوکم، کەوایەکی دێباجی لەبەردا بوو، بە دوگمەی زێڕ یەخەکەی داخرابوو، فەرمووی: (ئەی مەخرەمە! ئەمەمان بۆ تۆ شاردۆتەوە!). فەرمووی: باوکیشم سەیری کردو بەدڵی بوو، ئەوجا فەرمووی: بەڵێ قوربان! بەدڵمە! ئیتر کەواکەی دا بە باوکم. {تاج/٣، لاپەڕە: ٢٥٦، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٧٧٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

میسوەری کوڕی مەخرەمە، خۆیو باوکی، لە هاوەڵانی پێغەمبەرن، خۆی لە هاوەڵە بچکۆلەکانی پێغەمبەرە، چونکە بە دوو ساڵ لەدوا کۆچ (هیجرەت) لەدایك بوو، لە مەککە لەدایك بووە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مرد، ئەو تەمەنی هەشت ساڵان بوو، لە ریجالی صەحیحەینە، واتە: لە بوخاریو موسلیمدا فەرموودەی هەیە، لە مەککە لەدایك بووە، مەلایەکی شەرعزانی گەورە بوو، زۆر بەڕێزو بەدین بوو، لە تەمەنی شەستو دوو ساڵیدا، لە ئابلۆقەکەی مەککەدا، لەسەردەمی ئیبنو زوبەیردا، لە شەستو چواری کۆچیدا لە کاتێکا، لە مەسجیدولحەرام، لەناو حیجردا نوێژی دەکرد، بەردێ لە مەنجەنیقی گەمارۆ دەرەکان بەری کەوتو شەهیدی کرد! ئیبنو زوبەیر لە حەجوون نوێژی لەسەر تەرمەکەی کرد.

مەخرەمەی کوڕی نەوفەل (کە باوکی ئەم میسوەرەیە، لە مەسلەمەی فەتحە، ڕەگەز ناسێکی باش بوو، یەکێك بوو لەو چوار پیاوەی کە عومەر ناردنی بۆ نوێژەن کردنەوەی کێڵەکانی بەستی مەککە، کە خاکی حیلل لە خاکی حەرەم

جیادەکەنەوە، لە کۆتایی تەمەنیدا کوێر بوو، دەڵێن: سەدو پازدە ساڵ ژیاوە، لەساڵی پەنجاو چواری، یا پەنجاو پێنجی کۆچیدا مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

**ڕوونکردنەوە:**

پوختەی بڕیارە شەرعییەکانی نامەی زەکات:

١ -زەکات روکنی سێیەمە لە پێنج روکنەکەی ئیسلامو فەرزە.

٢ - زەکات لە دانەوێڵەو ئاژەڵو پولو پارەو زێڕو زیوو سامانی بازرگانی دەکەوێ، هەریەکەیان بەپێی مەرجی خۆی.

٣ زەکات نەدان تاوانێکی گەلێ گەورەیەو دەبێ بەهۆی سزای سەختی خودا، زوو یا درەنگ.

٤ زەکات وەرگر، بانزای باش بۆ زەکاتدەر بکا، واباشە هەردوولا لەیەکتری رازی بنو فەرمانی شەرع رەچاو بکەن.

٥ ئەوانەی زەکاتیان پێ دەشێ هەشت جۆرە کەسن.

٦ - سەییدی نەسەب ساخ زەکاتی پێ ناشێ، مەگەر مافی شەرعی خۆی پێ نەدرێو نەداراو هەژار بێ.

٧ - ماڵی زەکات کەدرا بەکەسێ، لە زەکاتی دەردەچێو دەبێ بەماڵی ئەو کەسە، ئیتر ئەو کەسەی وەری گرتووە هەرچی لێ دەکا دروستە.

٨ - سەرفیترە فەرزە، هەموو ساڵێ لەسەر هەموو موسوڵمانێ.

٩ ماڵو سامان، بێجگە لە زەکاتیش، مافی شەرعی تری واتیادا، وەك یارمەتی هەژارو نەداراو لێقەوماو خەرج کردنی لەهەموو کارێکی باشدا، وەك غەزاو حەجو مزگەوت دروستکردن...

١٠ - خێرو خێراتو شت بەخشین جۆری زۆرە، بەشێوەی گشتی خێر هەر خێرە، کەمیش بێ هەر زۆرە، بەهەموو کەسێکیش دەشێ، خزم بێ، بێگانەبێ، تەنانەت بە ناموسوڵمانیش دەشێ، بگرە بە ئاژەڵو جانەوەرو دارو درەختیش خێر هەر خێرە.

١١ - سوالكردن كارێ ناباشە مەگەر لەبەر ناچاری، دەنا دەبێ بەهۆی رووزەردی هەردوو جیهان.

١٢ - لەكاتی خێركردندا، كۆمەڵێ بەشدارن لە پاداشتەكەیدا، هەر كەسەیان بەپێی ئەركێ كە دەیكێشێ لەو پێناوەدا، وەك:

أ- خاوەن ماڵ، كە ماڵەكەی پەیدا كردووەو ماڵەكە هی ئەوە.

ب- ئەو كەسەی خێرەكە جێبەجێ دەكاو دەیداتە دەست خێر پێكراوەكە، وەك ژنو نۆكەرو منداڵو سەرپەرشتیار، چونكە خێرەكە جێبەجێ دەكاو دەبێ بەهۆی جێبەجێ كردنی.

ج- مەلاو مامۆستا، كە سەرپەرشتی جێبەجێ كردنی خێرەكە دەكەن، هەتا بەپێی شەرع بێو بەهەڵە نەكرێ، وەك چاوێری سەربڕینی قوربانیو حەوتەو نەزرو شتی تریوا، كە مامۆستاو مەلاكان بەم كارە هەڵ دەسنو گەلێ جار نزای تایبەت دەخوێننو رێو رەسمی شەرعی جێبەجێ دەكەنو رێنمایی شایان ئەنجام دەدەن.

١٣ - مەرجی سەرەكی قەبووڵ بوونی خەرجكردنی سامانو ماڵ بەخشین سێ شتە: یەكەم نیازی پاك، دووەم: لەبەر ریا بازیو شانازیو منەتو شاباش نەبێ، سێیەم: ماڵەكە حەلاڵ بێ.

١٤ - خاوەن ماڵ، نێربێ، یامێ، گەورەبێ، یا بچووك، شێت بێ، یاژیر، زەكاتو سەرفترەی لەسەرە، وە هەروەها بەپێی حاڵ خێرو خێراتی تر لە ماڵەكەی دەكرێ، بەڵام بەپێی یاساو رێسایەكی تایبەت، كە لەشوێنی خۆیدا باسكراوە.

١٥ - پاداشی خێركردن بۆ مردوو پێی دەگا، بەتایبەتی خێری سامانی، وەك وەقفو قوربانی.

١٦ - شتدان بە دۆخە بە ئاتاج سوننەتە، وەك بزنە بە دۆخەو شتی تری وا.

١٧ - خێری شاراوە زۆر پەسەندە.

١٨ - خێر جۆری زۆره، هەرچی شەرع پەسەندی بکا دادەنرێ بەخێر، با وشەیەکی خێریش بێ، یا سوبحانەڵلاییێ بێ.

١٩ - رۆژانە ئادەمیزاد کۆمەڵێ خێری لەسەره.

٢٠ - گوزەرانی سەروبەرو پێ رازیبوونی مایەی رزگارییە، هەڵپەی زۆریش بۆ پڕوپیتی جیهان نیشانەی چاو برسێتیو چاو چنۆکییە!

٢١ - خۆشی ژیانی جیهان، ئەگەر لێزانانە نەبێو بەپێی یاسا نامەی خودا نەبێ، هۆی سەرتیاچوونو کێشەو بەرەیە.

٢٢ - دروشمی پیاو چاکان ئەمەیە: (نە داوای یارمەتی لەکەس دەکەینو نە یارمەتی کەسیش رەت دەکەینەوە!).

٢٣ - بەپێی تەوانا، ئەوەی داوای یارمەتیت لێ دەکا، هەرکەسێ هەیە نا ئومێدی مەکە. رەحمەت لە گوتەری ئەم شیعرانە:

سەر مەشقێ جوان بە، وەک داری بەری
لەبەری دەخۆن دەچنە سێبەری
بەردی تێ دەگرن، کە دەگرێ بەری
نزات بۆ دەکەن: فریشتەو پەری!



# ٣- نامەی ڕۆژوو

{بڕوانە: تاج الأصول في أحاديث الرسول، بەرگی دووەم، لاپەڕە: ٧٠، زنجیرە: ٢٥ هەتا زنجیرە: ٧٧ لە ژمارە: ١٢٩٥ هەتا ژمارە: ١٤٥٨ + تەجریدی بوخاری/٢، لاپەڕە: ٢٦٣ هەتا ٣٠٢، زنجیرە: ٣٦ هەتا کۆتایی. لە ژمارە: ٨٧١ وە هەتا ژمارە: ٩٢٠ + ریاض الصالحین/٣، لاپەڕە: ١٥٤ هەتا ١٨٤ لە زنجیرە: ٢١٧ هەتا ٢٣١ لە ژمارە: ١٢١٥ هەتا ژمارە: ١٢٦٧ هەروا زنجیرە: ٢١٢و ٢١٣ + فیقهی ئاسان/١، لاپەڕە: ٢٥٣ — ٢٨٤ زنجیرە: ١٣٧ هەتا زنجیرە: ١٥٦}.

## ٤٤٩) باسی خێرو بەهرەی ڕۆژوو. (٢٦٩٨ - ٢٧٠٣)
## باب: فَضْلُ الصِّيَام

٥٧١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه)قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « قَالَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ، إِلاَّ الصِّيَامَ، فَإِنَّهُ لِى، وَأَنَا أَجْزِى بِهِ، وَالصِّيَامُ جُنَّةٌ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ صَوْمِ أَحَدِكُمْ، فَلاَ يَرْفُثْ يَوْمَئِذٍ، وَلاَ يَسْخَبْ، فَإِنْ سَابَّهُ أَحَدٌ، أَوْ قَاتَلَهُ، فَلْيَقُلْ: إِنِّى امْرُؤٌ صَائِمٌ، وَالَّذِى نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ لَخُلُوفُ فَمِ الصَّائِمِ، أَطْيَبُ عِنْدَ اللَّهِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، مِنْ رِيحِ الْمِسْكِ، وَلِلصَّائِمِ فَرْحَتَانِ يَفْرَحُهُمَا، إِذَا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وَإِذَا لَقِىَ رَبَّهُ، فَرِحَ بِصَوْمِهِ ». {الحديث: ٢٧٠٠ = ٢٦٨١ فم. تجريد/٢/٢٦٦، رقم: ٨٧٧ = ١٩٠٤. نسائى. صيام: ٢٢١٥ تحفة: ١٢٨٥٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لە فەرموودەیەکی پیرۆز (قودسی)دا دەفەرموێ: (خودای گەورەو سەروەر دەفەرموێ: هەموو کردەوەیەکی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی‌و بەشی دنیایی خۆیی پێوە هەیە، بێجگە لە ڕۆژوو، بەڵام ڕۆژوو ساخ هەر بۆ منە، وە لەبەرئەوە من خۆم پاداشی باشی دەدەمەوە، وە ڕۆژوو قەڵغانەو مەردوم لە خراپە دەگێڕێتەوەو، دەبێ بە حەساری دەوری ئاگری دۆزەخ بۆ خاوەنی!

جا هەر رۆژێ بەرۆژوو بوون قسەی پڕو پووچو شاتە شات مەكەن، ئەگەر یەكێكیش گەڕی پێكردنو جنێویدا پێتان، یا شەڕی فرۆشت پێتان، بڵێن: من بابایەكی بەرۆژووم، شەڕە جمێنو شەڕكردن بۆمن نەهاتووە، بەزمانی بەرۆژووەوە دەمی خۆم چەپەڵ ناكەم!

بەوكەسە كە گیانی موحەممەدی بەدەسە، بۆنی بەڵخی دەمی رۆژووەوان (لەلای خودا) لە بۆنی میسك خۆشترە.

رۆژوەوان لەدوو كاتا شادو كەیف خۆش دەبێ: لەكاتی بەربانگا شادو كەیف خۆش دەبێ، وە لەوكاتەشدا كە دەچێتەوە دیوانی خودا بەهۆی رۆژووەكەیەوە تەواو كەیف خۆش دەبێ). {تاج/٧٤/٢، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ١٢٩٨} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٧، ژمارە: ١٢١٥}.

## ٤٥٠) باسی گەورەیی مانگی رەمەزان. (٢٤٩٢ - ٢٤٩٤)

## باب: فَضْلُ شَهْرِ رَمَضَانَ

٥٧٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا جَاءَ رَمَضَانُ فُتِّحَتْ أَبْوَابُ الْجَنَّةِ. وَغُلِّقَتْ أَبْوَابُ النِّيران، وَصُفِّدَتِ الشَّيَاطِينُ ».

{الحديث: ٢٤٩٢ = ٢٤٧٠ فم. تجريد/٢/٢٦٥، رقم: ٨٧٤ = ١٨٩٩، ١٨٩٨، ٣٢٧٧. نسائي. صيام: ٢٠٩٩، ٢١٠٠. ترمذي. صوم: ٦٨٢ تحفة الأشراف: ١٤٣٤٢}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كاتێ مانگی رەمەزان تەشریف دەهێنێ، دەرگاكانی بەهەشت دەكرێنەوە، دەبێ بە رەحمەت باران، دەرگاكانی دۆزەخ دادەخرێن، وە شەیتانەكان كۆتو زنجیرو كەلەبچە دەكرێن). {ریاض/٣/١٦١، زنجیرە: ٢١٧، ژمارە: ١٢٢٠} + {تاج/٢/٧٣، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ١٢٩٦، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ١٢٩٨}.

## ٤٥١) لەپێش هاتنی مانگی رەمەزانەوە، نابێ بەرۆژێ یا بەدوو رۆژ خەڵك بەرۆژووبن (٢٤٩٥ - ٢٥٢٢).

## باب: لاَ تُقَدِّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ

٥٧٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَقَدَّمُوا رَمَضَانَ بِصَوْمِ يَوْمٍ وَلاَ يَوْمَيْنِ، إِلاَّ رَجُلٌ كَانَ يَصُومُ صَوْمًا فَلْيَصُمْهُ ». {الحديث: ٢٥١٤ = ٢٤٩٣ فم. تجريد/٢/٢٧٤، رقم: ٨٨٣ = ١٩١٤. نسائى. صيام: ٢١٧٤. أبو داود} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (بە رۆژو دوو رۆژ لەپێش رەمەزانا بەرۆژوو مەبن، مەگەر بۆ کەسێ رۆژووی خۆی بگرێ، وەك ئەوە کەسێ دەستووری وابێ: دووشەممان و پێنج شەممان بەرۆژوو بێ، یا رۆژووی نەزربێ، یان قەرزاربێ). {تاج/٢/١٢٨، زنجیرە: ٥٤، ژمارە: ١٤٠٥} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٩، ژمارە: ١٢٢٤} .

## ٤٥٢) گرتنی رۆژوو بەپێی بینینی مانگ

٥٧٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: ذَكَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْهِلاَلَ فَقَالَ: « إِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَصُومُوا، وَإِذَا رَأَيْتُمُوهُ فَأَفْطِرُوا، فَإِنْ أُغْمِىَ عَلَيْكُمْ فَعُدُّوا ثَلاَثِينَ ». {الحديث: ٢٥١٣ = ٢٤٩٢ فم} :

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **باسی** مانگی یەك شەوەی کرد، فەرمووی: (تا مانگی نوێ نەبینن نەبیکەن بە رەمەزان و نەبیکەن بە جەژن، ئەگەر هەورو هەڵاش بوو، وە هەور بەری مانگی گرتبوو، سیی رۆژی تەواو دابنێن بۆ مانگی پێشوو). {تاج/٢/٨٥، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٢} + {ریاض/٣، زنجیرە: ٢١٩، ژمارە: ١٢٢٥} .

## ٤٥٣) مانگی وا هەیە بیستو نۆ رۆژە
## بابٌ: الشَّهْرُ تِسْعٌ وَعِشرونَ

٥٧٥- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها): أَخْبَرَتْهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) حَلَفَ أَنْ لاَ يَدْخُلَ عَلَى بَعْضِ أَهْلِهِ شَهْرًا، فَلَمَّا مَضَى تِسْعَةٌ وَعِشْرُونَ يَوْمًا غَدَا عَلَيْهِمْ، أَوْ رَاحَ، فَقِيلَ لَهُ: حَلَفْتَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ أَنْ لاَ تَدْخُلَ عَلَيْنَا شَهْرًا، قَالَ: « إِنَّ الشَّهْرَ يَكُونُ تِسْعَةً وَعِشْرِينَ يَوْمًا ». {الحديث: ٢٥١٩ = ٢٤٩٨ فم. تجريد/٢/٢٦٧، رقم: ٨٨٠ = ١٩١٠، ٥٢٠٢ فتح}:

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوێندی خوارد لە ژنەکانی، کە یەك مانگ نەچێتەلایان، کەبەم جۆرە سوێندە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: ئیلاء، جا لەپاش بیستو نۆ رۆژ، سەر لەبەیانی، یا سەر لەئێوارە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای خیزانەکانی، کەپێیان گوت: خۆ تۆ سوێندت خواردبوو کە یەك مانگ نەچیت بۆلایان؟ فەرمووی: (مانگ بیستو نۆ رۆژیش دەبێ، خۆ مەرج نییە کە گشت مانگێ سیی رۆژی دەق بێ). {تاج/٢/٨٦، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٥، چ/٥}.

**روونکردنەوە:**

ئوم سەلەمە (رەزای خودای لێ بێ) هاوسەری پێغەمبەرە، (٣٧٨) فەرموودەی هەیە، سیازدەیان پەسەندی هەردوو پیرە، دوو کۆچو رەوی لە پێناوی ئیسلاما کردووە، کۆچێ بۆ حەبەشە، کۆچێ بۆ مەدینە، لەمانگی شەشەلآنی سالّی چواری کۆچیدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هێناویەتی، لەتەمەنی هەشتاو چوار سالّیدا، لە بەهاری سالّی شەستو چواری کۆچیدا، لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە، ئەبو هورەیرە نوێژی مردووی لەسەرکرد، لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردرا. {تاج/٣، لاپەڕە: ٦٧٣، زنجیرە: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١}.

٥٧٦- عَنِ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ، لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ، الشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، وَعَقَدَ الإِبْهَامَ فِى الثَّالِثَةِ، وَالشَّهْرُ هَكَذَا وَهَكَذَا وَهَكَذَا، يَعْنِى تَمَامَ ثَلاَثِينَ». {الحديث: ٢٥٠٨ = ٢٤٨٧ فم. تجريد/٢/٢٦٨، رقم: ٨٨٢ = ١٩١٣. أبو داود. صوم: ٢٣١٩. نسائى. صيام: ٢١٣٩}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئێمە گەلێکی نەخوێندەوارو بێ سەوادین، نووسینو ئەستێرە ژمێریی نازانین، مەگەر زۆر کەم، جا لەبەرئەوە خودای میهرەبان بەپێی حاڵ، نیشانەی ئاسانو ئاشکرای بۆداناوین، بۆ زانینی کاتی طاعەتو پەرستشو کاروباری ترمان، وەك دیتنی خۆرو دیتنی مانگی یەك شەوە، هەموو مانگێکیش مەرج نییە سیی رۆژی تەواوبێ).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ روونکردنەوەی باسەکە، دووجار بە پەنجەانی هەردوو دەستی ئاماژەی کردو لەجاری یەکەما، بەهەر دە پەنجەکەی سێجار فەرمووی: (جاری وا دەبێ مانگ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە) لە ئاماژەی سێیەمی ئەمجاری یەکەمەدا، پەنجە کەلەی خۆی نووقاند، واتە: وا دەبێ مانگ دووجار دەو یەك جار نۆیە کە دەکاتە بیستو نۆ رۆژ، بەلام لەجاری دووەما، بەهەر دە پەنجەکەی سێجار ئاماژەی کردو فەرمووی: (جاری وایش دەبێ مانگ ئەوەندەو ئەوەندەو ئەوەندەیە، واتە: سێجار دە، کە دەکاتە سیی رۆژی تەواو).

## ٤٥٤) گەورەو بچووکی مانگی یەك شەوە بایەخی زۆری نییە. (٢٥٢٤ - ٢٥٢٥)
## باب: إِنَّ اللّهَ مَدَّهُ أَيْ مَدَّ الهِلاَلَ لِرُؤْيَتِهِ

٥٧٧- عَنْ أَبِى الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: خَرَجْنَا لِلْعُمْرَةِ، فَلَمَّا نَزَلْنَا بِبَطْنِ نَخْلَةَ، قَالَ: تَرَاءَيْنَا الْهِلاَلَ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: هُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ، وَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: هُوَ ابْنُ لَيْلَتَيْنِ. قَالَ: فَلَقِينَا ابْنَ عَبَّاسٍ فَقُلْنَا: إِنَّا رَأَيْنَا الْهِلاَلَ فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ هُوَ ابْنُ ثَلاَثٍ وَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ هُوَ ابْنُ لَيْلَتَيْنِ. فَقَالَ: أَىَّ لَيْلَةٍ رَأَيْتُمُوهُ؟ قَالَ: قُلْنَا لَيْلَةَ كَذَا وَكَذَا، فَقَالَ ابن عباس: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ

(صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ مَدَّهُ لِلرُّؤْيَةِ فَهُوَ لِلَيْلَةِ رَأَيْتُمُوهُ ». {الحديث: ٢٥٢٤ = ٢٥٠٤ فم}:

ئەبولبەختەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ڕۆیشتین بۆ عەمرە، کاتێ گەیشتینە بەطنی نەخلە، لەوێ چاومان گێڕا بۆ مانگی یەك شەوەی رەمەزان، کاتێ دیمان هەندێکمان گوتیان: سێ شەوەیە، هەندێکی ترمان گوتیان: نەء، دوو شەوەیە، جا بەخزمەت ئیبنو عەبباس گەیشتین، مەسەلەکەمان عەرزکرد، کە سەبارەت بە مانگ راجیاییمان هەبوو، فەرمووی: کام شەو مانگتان بینی؟ گوتمان: فیسارە شەو، ئیبنو عەبباس فەرمووی: لەم بابەتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەبارودۆخی وادا، کە هەست دەکەن مانگەکە گەورەیەو لەیەك شەوە ناکا، ئەوە خودا ئەو ماوەیە درێژ دەکاتەوە، ببینرێ، لەسەر ئەم بنیاتە، ئەوەی ئێوە دیوتانە لەم بابەتەیەو مانگی یەك شەوە بووە!).

٤٥٥) هەر ولاتێ روانگە (مەتلەع)ی خۆی هەیە. (٢٥٢٣)

باب: لِكُلِّ بَلَدٍ رُؤْيَتُهُمْ

٥٧٨- عَنْ كُرَيْبٍ: أَنَّ أُمَّ الْفَضْلِ بِنْتَ الْحَارِثِ بَعَثَتْهُ إِلَى مُعَاوِيَةَ (رضى الله عنهم) بِالشَّامِ. قَالَ: فَقَدِمْتُ الشَّامَ فَقَضَيْتُ حَاجَتَهَا وَاسْتُهِلَّ عَلَيَّ رَمَضَانُ وَأَنَا بِالشَّامِ، فَرَأَيْتُ الْهِلاَلَ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ، ثُمَّ قَدِمْتُ الْمَدِينَةَ فِي آخِرِ الشَّهْرِ، فَسَأَلَنِي عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ، ثُمَّ ذَكَرَ الْهِلاَلَ فَقَالَ: مَتَى رَأَيْتُمُ الْهِلاَلَ؟ فَقُلْتُ: رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ. فَقَالَ: أَنْتَ رَأَيْتَهُ؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، وَرَآهُ النَّاسُ، وَصَامُوا وَصَامَ معه مُعَاوِيَةُ، فَقَالَ: لَكِنَّا رَأَيْنَاهُ لَيْلَةَ السَّبْتِ، فَلاَ نَزَالُ نَصُومُ حَتَّى نُكْمِلَ ثَلاَثِينَ، أَوْ نَرَاهُ. فَقُلْتُ: أَوَلاَ تَكْتَفِي بِرُؤْيَةِ مُعَاوِيَةَ وَصِيَامِهِ؟ فَقَالَ: لاَ، هَكَذَا أَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). (وَشَكَّ يَحْيَى بْنُ يَحْيَى فِي نَكْتَفِي أَوْ تَكْتَفِي). {الحديث: ٢٥٢٣ = ٢٥٠٣ فم. أبو داود. صوم: ٢٣٣٢. ترمذي. صوم: ٦٩٣. نسائي. صيام: ٢١١٠ تحفة: ١٣٥٧}:

کورەیب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو فەزلی کچی حاریث ناردمی بۆلای موعاوییە لەشام، ئیشەکەی ئوممو فەضلم جێبەجێ کرد، لەوێ مام تابوو بە رەمەزان، من خۆم ئێوارەی شەوی هەینی مانگی نوێم دی. جا لەکۆتایی مانگی رەمەزانا هاتمەوە بۆ مەدینە، ئیبنو عەبباس لێی پرسیم: ئێوە کەی مانگتان دی؟ گوتم: شەوی هەینی مانگمان دی، گوتی: تۆ خۆت دیت؟ گوتم: بەڵێ، وەخەڵکی تریش دینییانو هەموو بەرۆژوو بوونو موعاوییەش بەرۆژوو بوو. گوتی: بەڵام ئێمە ئێوارەی شەوی شەممە مانگمان دیوە، لەبەرئەوە هەر بەرۆژوو دەبین تا سیی رۆژ تەواو دەکەین، یا خۆمان مانگ دەبینین. گوتم: ئەی بەدیتنو بەرۆژوو بوونی موعاویە اکتفا ناکەیتو ئەوە بەس نییە؟ گوتی: نەء، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوەها فەرمانی پێمان کردووە کە هەر وڵاتەی بەپێی روانگە (مطلع)ی خۆیان رەفتار دەکەن). {تاج/٢/٨٩، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ١٣٢١}.

## ٤٥٦) مانگی رەمەزانو مانگی قوربان کەم ناکەن. (٢٥٢٦ - ٢٥٢٧)

## باب: شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ

٥٧٩- عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «شَهْرَا عِيدٍ لاَ يَنْقُصَانِ، رَمَضَانُ وَذُو الْحِجَّةِ». {الحديث: ٢٥٢٧ = ٢٥٠٦ فم. بخاري/٢/٢٦٨، رقم: ٨٨١ = ١٩١٢. أبو داود. صوم: ٢٣٢٣. ترمذي. صوم: ٦٩٢. ابن ماجة. صيام: ١٦٥٩. تحفة الأشراف: ١١٦٧٧}:

ئەبو بەکرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دوو مانگی دوو جەژنەکە (واتە: مانگی رەمەزانو مانگی قوربان) بەدەگمەن رێ دەکەوێ، کە لەیەك ساڵا، کە هەردوو مانگەکان لەسیی رۆژ کەمتربن، بەڵکوو زۆرینەی کات، یا هەردوو مانگەکان سیی تەواو دەبن، یا ئەگەر یەکێکیان بیستو نۆ بوو ئەوی تریان سیی تەواو دەبێ). {تاج/٢/٨٧، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ١٣١٦، چ/٤}.
هەندێ دەفەرموون: مەبەست ئەوەیە ئەم دوو مانگە ئەگەر بە ژمارەی رۆژیش

لەسیی کەمتربن، هەر خێری تەواوی ئەو ساڵانەی تریان هەیە کەسیی پڕبن.
{ریاض/١٦٥/٣، زنجیره: ٢٢١، ژماره: ١٢٢٩} .

## ٤٥٧) پارشێو بۆ گرتنی ڕۆژوو سوننەتە. (٢٥٤٤ - ٢٥٥٢).

## باب: فِي السُّحُورِ تفِي الصَّوْمِ

٥٨٠- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَسَحَّرُوا فَإِنَّ فِى السُّحُورِ بَرَكَةً ». {الحديث: ٢٥٤٤ = ٢٥٢٤ فم} :

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پارشێو بکەن، چونکە پیرۆزیی‌و پیت‌و فەڕ وا لەپارشێودا). {تاج/٢/٩١، زنجیره: ٣٢، ژماره: ١٣٢٤ ج/٤} + {ریاض/١٦٥/٣، زنجیره: ٢٢١، ژماره: ١٢٢٩} .

## ٤٥٨) دواخستنی پارشێو

## باب: تأخير السُّحُورِ

٥٨١- عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ (رضى الله عنه) قَالَ: تَسَحَّرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ قُمْنَا إِلَى الصَّلاَةِ. قُلْتُ: كَمْ كَانَ قَدْرُ مَا بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: خَمْسِينَ آيَةً. {الحديث: ٢٥٤٧ = ٢٥٢٧ فم. تجريد/٢/٢٧٦ رقم: ٨٨٦ = ١٩٢١ فتح. ترمذي. صوم: ٧٠٣، ٧٠٤. نسائي. صيام: ٢١٥٤} :

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) پارشێومان کرد، ئینجا لە خزمەتیدا هەڵساین چووین بەلای نوێژی بەیانییەوە، ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: عەرزی زەیدم کرد: نێوانی لێبوونەوەی پێغەمبەر لە پارشێوەکەو، بانگی بەیانی چەندێ دەبوو؟ فەرمووی: بەقەد ئەوە دەبوو کەیەکێ بە خوێندنی ئاسایی، نەخێرا، نەسست، پەنجا ئایەتی مامناوەندی نەکورت نەدرێژ بخوێنێ!). {تاج/٢/٩٢، زنجیره: ٣٢، ژماره: ١٣٢٦ ج/٤ + ریاض/٣/٩١٤، زنجیره: ٢٢١، ژماره: ١٢٣٠/٢} .

**٤٥٩) نیشانەی شەبەق، کەدەبێ بەهۆی نادروستبوونی خواردن بۆ ڕۆژووەوان.** (٢٥٢٨ - ٢٥٤٣).

**باب: صفة الفجر الذي يحرم الأكل على الصائم**

٥٨٢- عَنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَغُرَّنَّكُمْ مِنْ سَحُورِكُمْ أَذَانُ بِلاَلٍ، وَلاَ بَيَاضُ الأُفُقِ الْمُسْتَطِيلُ هَكَذَا، حَتَّى يَسْتَطِيرَ هَكَذَا »، وَحَكَاهُ حَمَّادٌ بِيَدَيْهِ، قَالَ: يَعْنِى مُعْتَرِضًا. {الحديث: ٢٥٤١ = ٢٥٢١ فم. أبو داود. صوم: ٢٣٤٦. ترمذى. صوم: ٧٠٦. نسائى. صيام: ٢١٧٠ تحفة الأشراف: ٤٦٢٤}:

**سەموورەی کوڕی جوندوب** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بۆ پارشێوتان نە بانگی بیلال‌و نەسپیدە بالا (فەجری کازب = بەیانییە درۆزنە) تەفرەتان نەدەن‌و دەستە شکێنتان نەکەن‌و ڕێگەی هیچتان لێ نەگرن، چونکە ئەوکاتە هێشتا شەوی ماوە، بخۆن‌و بخۆنەوە، هەتا سپیدە پەهنا (فەجری صادق = بەیانی تەواو) دەدا). {تاج/٢/٨٥، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ١٣١١ چ/٤ — م/د/ت/ن}. گفتەی (ت) ئاوایە: (نە بانگی بیلال‌و نە سپیدە بالا ڕێگەی پارشێوتان لێ نەگرن، بخۆن‌و بخۆنەوەو بچنەلای ژنی خۆتان، هەتا شەبەق دەداو ڕووناکی بەیان بلاودەبێتەوە بە کەناری ئاسمانا).

**٤٦٠) لەبارەی فەرمایشتی خودای گەورە: {حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ}.** (٢٥٢٨ - ٢٥٤٣).

**باب: في قوله تعالى: {حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ}**

٥٨٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ)، قَالَ: فَكَانَ الرَّجُلُ إِذَا أَرَادَ الصَّوْمَ، رَبَطَ أَحَدُهُمْ فِى رِجْلَيْهِ الْخَيْطَ الأَسْوَدَ، وَالْخَيْطَ الأَبْيَضَ، فَلاَ يَزَالُ يَأْكُلُ وَيَشْرَبُ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُ رِئْيُهُمَا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ بَعْدَ ذَلِكَ: (مِنَ الْفَجْرِ) فَعَلِمُوا أَنَّمَا يَعْنِى بِذَلِكَ اللَّيْلَ

وَالنَّهَارَ. {الحديث: ٢٥٣٠ = ٢٥١٠ فم. بخاري. صوم: ١٩١٧، ٤٥١١. تحفة الأشراف: ٤٧٥٠}:

سەهلی کوڕی سەعد (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: { وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ – بەقەرە/ ١٨٧} واتە: بخۆنو بخۆنەوە تا هێڵی رەش لە هێڵی سپی جیادەکەنەوە، کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارەوە، پیاوی وا هەبوو کاتێ دەیویست بۆ بەیانی بەڕۆژووبێ، دەچوو پەتێکی سپی دەبەست بە قاچێکی خۆیەوەو پەتێکی رەشیشی دەبەست بەقاچەکەی تریەوە، ئیتر هەرشتی دەخواردو شتی دەخواردەوەو بەشەوی دادەنا، هەتا شێوەو رەنگی دوو پەتەکەی لەیەکتری جیا دەکردەوە، ئەوجا دایدەنا بەرۆژوو وازی لە خواردنو خواردنەوەو شتی تری وا دەهێنا. جا خودای گەورە لەپاش ئەمە، بۆ روونکردنەوەی مەبەستەکە، وشەی (مِنَ الفَجْرِ) لە کۆتایی ئایەتەکەوە دابەزاندو ئایەتەکە ئاوای لێهات: { وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ – بەقەرە/ ١٨٧}. جا واتای ئایەتەکە ئاوا روون بوویەوە: (کاتێ دەتانەوێ لە رۆژدا بەرۆژووبن، بەشەو بخۆنو بخۆنەوەو هەرچی لە رۆژووەوان نادروست دەبێ، لەخۆتانی نادروست مەکەن، تا روشتەی سپیدەی بەیانیتان، لە روشتەی رەشی تاریکی شەو بۆجیا دەبێتەوە).

ئەوجا موسوڵمانان زانییان کە مەبەستی ئایەتەکە جیاکردنەوەی شەوە لەرۆژ. {بڕوانە: تاج/٢/٨٠، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ١٣٠٦، ١٣٠٨ + تەجرید/٢/٢٧٦، ژمارە: ٨٨٥ = ١٩١٦، ٤٥٠٩، ٤٥١٠ – فتح الباری}.

### ٤٦١) فەرموودەی: (بیلال شەوی دەمێنێ کە بانگ دەدا).
### باب: إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ فَكُلُوا وَاشْرَبُوا

٥٨٤- عَنِ عبدالله بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ لِرَسُولِ اللَّهِ مُؤَذِّنَانِ: بِلاَلٌ، وَابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ بِلاَلاً يُؤَذِّنُ بِلَيْلٍ

فَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يُؤَذِّنَ ابْنُ أُمِّ مَكْتُومٍ »، قَالَ: وَلَمْ يَكُنْ بَيْنَهُمَا، إِلاَّ أَنْ يَنْزِلَ هَذَا، وَيَرْقَى هَذَا. {الحديث: ٢٥٣٣ = ٢٥١٣ فم. تجريد/٢/٣٥٦، رقم: ٣٥٨ = ٦١٧، ٦٢٠، ٦٢٣، ١٩١٨، ٢٦٥٦، ٧٢٤٨}:

ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو بانگدەری هەبوو، یەکێکیان بیلال بوو، ئەوی تریان ئیبنو ئوممی مەکتووم بوو، کە پیاوێکی کوێر بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (بیلال هێشتا شەوی دەمێنێ کە بانگ دەدا، جا لەبەرئەوە بخۆنو بخۆنەوە تا ئیبنو ئوممی مەکتووم بانگ دەدا، فەرمووی: هەرئەوەندەشیان بەین بوو، کە ئەمیان دادەبەزیو ئەویتریان سەردەکەوت). {تاج/٢/٨٤، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ١٣١٠ چ/٤} + {ریاض/٣/١٦٦، زنجیرە: ٢٢١، ژمارە: ١٢٣١}.

## ٤٦٢) بڕیاری ڕۆژووی کەسێ بەیانی لێبداو لەشی پیس بێ. (٢٥٨٤ - ٢٥٨٩)

## باب: صَوْمُ مَنْ أَدْرَكَهُ الفَجْرُ وَهُوَ جُنُبٌ

٥٨٥- عَنْ عَائِشَةَ وَأُمِّ سَلَمَةَ زَوْجِي النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُمَا قَالَتَا: إِنْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيُصْبِحُ جُنُبًا مِنْ جِمَاعٍ غَيْرِ احْتِلاَمٍ فِي رَمَضَانَ، ثُمَّ يَصُومُ. {الحديث: ٢٥٨٧ = ٢٥٦٧ فم. تجريد/٢/٢٧٨، رقم: ٨٨٩ = ١٩٢٥، ١٩٢٦، ١٩٣٠، ١٩٣١، ١٩٢٦، ١٩٣٢}:

عائیشەو ئوم سەلەمە (کە هەردوکیان هاوسەری پێغەمبەر بوون)، دەفەرموون: شەوی وا دەبوو، لە ڕەمەزانا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆیدا دروست دەبوو، هەتا بەیانی لێ دەدا، بەو لەش پیسییەوە دەمایەوە، ئەوسا خۆی دەشۆردو لەکاتی ئاسایی نوێژی بەیانیدا، نوێژی بەیانیی دەکرد، لەهەمان کاتا ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبوو، مەبەستی پێغەمبەر لەم کارە بەیانی جەوازی شتی وابوو). {تاج/٢/١١٠، زنجیرە: ٤٤، ژمارە: ١٣٦٣، ١٣٦٤ + ریاض/٣/١٧٣، زنجیرە: ٢٢٤، ژ/١٢٤٤، ١٢٤٥}.

٥٨٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَجُلاً جَاءَ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَفْتِيهِ وَهِيَ تَسْمَعُ مِنْ وَرَاءِ الْبَابِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُدْرِكُنِي الصَّلاَةُ وَأَنَا جُنُبٌ أَفَأَصُومُ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَأَنَا تُدْرِكُنِي الصَّلاَةُ وَأَنَا جُنُبٌ فَأَصُومُ »، فَقَالَ: لَسْتَ مِثْلَنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَدْ غَفَرَ اللَّهُ لَكَ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ. فَقَالَ: « وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَخْشَاكُمْ لِلَّهِ، وَأَعْلَمَكُمْ بِمَا أَتَّقِي ». {الحديث: ٢٥٨٨ = ٢٥٦٨ فم. أبو داود. صوم: ٢٣٨٩. تحفة الأشراف: ١٧٨١٠}:

**عائیشه** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: جارێ پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **پرسیاری لێکرد، من لەپشت دەرگاکەوە گوێم لێیان بوو، پیاوەکە گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! وادەبێ کە نوێژم لێ دەبێ لەشم پیسەو لەشپیسیم لەسەرە، ئایا دروستە، بەلەشی پیسەوە بەرۆژووبم؟ فەرمووی: (شتی وا ئاساییە، منیش وادەبێ، کە نوێژم لێ دەبێ لەشپیسیم لەسەرە، لەگەڵ ئەوەشا، ئەو رۆژە بەرۆژوو دەبم). پیاوەکە گوتی: قوربان! تۆ وەکوو ئێمە نیت، تۆ خودا لە گوناهی بەرودوات خۆش بووە) پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەمەوایە، بەڵام بەخوا من ئومێد دەکەم کە لەهەمووتان زیاتر لەخودا بترسمو لە هەمووتان زیاتر باشتر بزانم کە خۆم لەبێ فەرمانی خودا بپارێزم).**

## ٤٦٣) رۆژووەوان ئەگەر لەبیری نەبوو، شتی خوارد، یاشتی خوزاردەوە قەیناکا.

(٢٧٠٩)

## باب: فِي الصَّائِمِ يَأْكُلُ أَوْ يَشْرَبُ نَاسِياً

٥٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ نَسِيَ وَهُوَ صَائِمٌ، فَأَكَلَ أَوْ شَرِبَ، فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، فَإِنَّمَا أَطْعَمَهُ اللَّهُ وَسَقَاهُ ». {الحديث: ٢٧٠٩ = ٢٦٩١ فم. تجريد/٢/٢٧٩، رقم: ٨٩١ = ٦٦٦٩. أبو داود. صوم: ٢٣٩٨. ترمذي. صوم: ٧٢٢. ابن ماجة. صيام: ١٦٧٣}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەبیری نەبوو کە بەرۆژووە، وە چشتی خوارد، یا چشتی خواردەوە،**

ئـەوە بـا ڕۆژووەکـەی نەشـکێنیو تـەواوی بکـا چـونکە بـەوە ڕۆژووەکـەی پـووچ نابێتەوە، بەڵکوو ئەو نانو ئاوەیش کە خواردوویەتی ڕزقو ڕۆژیەك بووە خوا بۆی ڕەخساندووە). {تاج/٢/١٠٦، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ١٣٥٦}.

**٤٦٤) ڕۆژووەوان ئەگەر خوڵك کرا بۆسەر قاوەڵتی بابڵێ: من بەڕۆژووم.**

**(٢٦٩٦ - ٢٦٩٧)**

**باب: فِي الصَّائِمِ يُدْعى لِطَعَامٍ فَلْيَقُلْ إِنِّي صَائِمٌ**

٥٨٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَـالَ: « إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ إِلَى طَعَامٍ، وَهُوَ صَائِمٌ فَلْيَقُلْ: إِنِّى صَـائِمٌ ». {الحديث: ٢٦٩٦ = ٣٦٧٧ فـم. أبـو داود. صـوم: ٢٤٦١. ترمـذى. صـوم: ٧٨١. ابـن ماجـة. صـيام: ١٧٥، تحفـة: ١٣٦٧١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەگەر کەسێ لەئێوە بەڕۆژوو بوو، وە خوڵك کرا بۆ نان خواردن، بابڵێ: ناخۆم من بەڕۆژووم).

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەسـت ئەوەیـە چـوون بۆسـەر دەعـوەت واجبـە، جـا ئەگـەر خـاوەن بانگهێشتنەکە بەمەوازی هێنا ئەوە پێویست ناکا کەبچێت، دەنـا بـا ئامادەبێ بـەڵام شت نەخوا.

**٤٦٥) کەسێ لە ڕەمەزانا بچێتە لای ژنی خۆی کەفارەتی دەکەوێتە سەر.**

**(٢٥٩٠ - ٢٥٩٨)**

**باب: كفارة مَنْ وَقَعَ عَلَى إمْرأَتِهِ فِي رَمَضَانَ**

٥٨٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: هَلَكْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ: « وَمَا أَهْلَكَكَ؟ ». قَالَ: وَقَعْتُ عَلَى امْرَأَتِى فِى رَمَضَانَ، قَالَ: « هَلْ تَجِدُ مَـا تُعْتِقُ رَقَبَـةً؟ ». قَـالَ: لاَ. قَـالَ: « فَهَـلْ تَسْتَطِيعُ أَنْ تَصُومَ

شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ؟ ». قَالَ: لاَ. قَالَ: « فَهَلْ تجِدُ مَا تُطْعِمُ سِتِّينَ مِسْكِينًا ». قَالَ: لاَ. قَالَ: ثُمَّ جَلَس، فَأُتِيَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) بِعَرَقٍ فِيهِ تَمْرٌ، فَقَالَ: « تَصَدَّقْ بِهَذَا ». قَالَ: أَفْقَرَ مِنَّا؟ فَمَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَحْوَجُ إِلَيْهِ مِنَّا. فَضَحِكَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى بَدَتْ أَنْيَابُهُ، ثُمَّ قَالَ: « اذْهَبْ فَأَطْعِمْهُ أَهْلَكَ ». {الحديث: ٢٥٩٠ = ٢٥٧٠ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٢٧٩، رقم: ٨٩٢ = ١٩٣٦، ١٩٣٧، ٢٦٠٠، ٥٣٦٨، ٦٠٨٧، ٦١٦٤، ٦٧٠٩، ٦٧١٠، ٦٧١١، ٦٨٢١ فتح. أبو داود. صوم: ٢٣٩٠. ترمذي. صوم: ٧٢٤. ابن ماجة. صيام: ١٦٧١. تحفة الأشراف: ١٢٢٧٥}:

ئەبو هورەیرە (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمەری خودا! فەوتاوم. فەرمووی: (بۆچی فەوتاوی؟) گوتی: لە ڕەمەزانا بەرۆژوو بووم لەگەڵ ژنەکەم دروست بووم. فەرمووی: (ئایا هەتە کە کۆیلەیێ ئازاد بکەی؟). گوتی: نەء. فەرمووی: (ئەی دەتوانی دوو مانگ لەسەر یەك بەڕۆژوو بی؟ گوتی: نەء. فەرمووی: (ئەی دەتوانی نانی شەست هەژار بدەی؟). گوتی: نەء. ئەبو هورەیرە فەرمووی: جا پیاوەکە لەلای پێغەمبەر دانیشت، تا زەمیلەیێ خورمایان هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە بکە بەخێر). پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمەری خودا! کێ لە ئێمە هەژارترە تا پێی بدەم! دەسا بەوخودایە، لەم پەڕی مەدینەوە تا ئەوپەڕی مەدینە خێزانێکی وای تیانیە کە وەك ئێمە پێویستی بەم خورمایە بێ!

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەها پێکەنی تەنانەت ددانە پێشینەکانی وەدەرکەوتن، ئینجا فەرمووی: (دەبڕۆ دەرخواردی خێزانەکەی خۆتی بدە!). {تاج/٢/١٠٥، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ١٣٥٤}.

٥٩٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: احْتَرَقْتُ. قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِمَ؟ ». قَالَ: وَطِئْتُ امْرَأَتِي فِي رَمَضَانَ نَهَارًا، قَالَ: « تَصَدَّقْ تَصَدَّقْ ». قَالَ: مَا عِنْدِي شَيْءٌ، فَأَمَرَهُ أَنْ يَجْلِسَ

فَجَاءَهُ عَرَقَانِ فِيهِمَا طَعَامٌ، فَأَمَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَتَصَدَّقَ بِهِ. {الحديث: ٢٥٩٦ = ٢٥٧٦ فم. بخاري: ١٩٣٥، ٦٨٢٢ فتح. أبو داود. صوم: ٢٣٩٤}:

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: قوربان! ئاگری دۆزەخ سووتاندمی؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چۆن؟ بۆچی؟). گوتی: دروست بووم لەگەڵ ژنەکەما لە رەمەزانا، لە رۆژدا، فەرمووی: (دەی خێربکە، دەی خێربکە). پیاوەکە گوتی: هیچم نییە تابیکەم بەخێر، جا پێغەمبەر فەرمانی پێکرد کە لەلای دابنیشێ، جا دوو زەمیلە خۆراکیان هێنا بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەر ئەو دوو زەمیلە خۆراکەی دا بەپیاوەکەو پێی فەرموو کە بیکا بەخێر لە کەفارەتا).

### ٤٦٦) بڕیاری ماچ بۆ رۆژووەوان. (٢٥٦٨ - ٢٥٨٣)
### باب: فِي القبلة للصَّائِم

٥٩١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُقَبِّلُ وَهُوَ صَائِمٌ، وَيُبَاشِرُ وَهُوَ صَائِمٌ وَلَكِنَّهُ أَمْلَكُكُمْ لإِرْبِهِ. [ الحديث ٢٥٧١=٢٥٥١ خم. تجريد/٢/٢٧٨ رقم: ٨٩٠=١٩٢٧، ١٩٢٨ فتح. أبوداود. صوم:٢٣٨٢. ترمذي. صوم: ٧٢٩. تحفة الأشراف: ١١٥٩٥ ] !.

عائیشه (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وادەبوو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرۆژوو بوو، کەچی لەگەڵ ئەوەشا، ماچو مووچو یاریو دەسبازیی لەگەڵ حەلاڵو هاوسەری خۆیا دەکرد. (واتە: بەم جۆرە شتانە رۆژوو ناشکێ) بەڵام کێتان وەك پێغەمبەری پێ دەکرێ، ئەو لەهەمووتان باشتر ئارەزووی خۆی پێ زەوت دەکراو، لەم لایەنەوە سنووری نەدەبەزان، تا خوا نەخواستە تووشی بێ شەرعی ببێ!). {تاج/٢/١٠٩، زنجیرە: ٤٢، ژمارە: ١٣٦١}.

## ٤٦٧) كه شەو داهاتو خۆر ئاوابوو كاتی بەربانگە. (٢٥٥٣ - ٢٥٥٧)

## باب: إِذَا أَقْبَلَ اللَّيْلُ وَغَرَبَتِ الشَّمْسُ أَفْطَرَ الصَّائِمُ

٥٩٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى أَوْفَى (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى سَفَرٍ فِى شَهْرِ رَمَضَانَ، فَلَمَّا غَابَتِ الشَّمْسُ قَالَ: « يَا فُلاَنُ انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا ». قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ عَلَيْكَ نَهَارًا. قَالَ: « انْزِلْ فَاجْدَحْ لَنَا ». قَالَ: فَنَزَلَ فَجَدَحَ، فَأَتَاهُ بِهِ فَشَرِبَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ قَالَ بِيَدِهِ: « إِذَا غَابَتِ الشَّمْسُ مِنْ هَا هُنَا، وَجَاءَ اللَّيْلُ مِنْ هَا هُنَا فَقَدْ أَفْطَرَ الصَّائِمُ ». {الحديث: ٢٥٥٤ = ٢٥٣٤ فم. تجريد/٢/٢٨٠، رقم: ٨٩٤ = ١٩٤١، ١٩٥٥، ١٩٥٦، ١٩٥٨، ٥٢٩٧. أبو داود. صوم: ٢٣٥٢. تحفة الأشراف: ٢٥٥٤}:

ئەبو ئیبراهیم عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەفەرێكا، لە خزمەتی پێغەمبەردا بووین، بەرێوە بەسواری دەڕۆیشتین، دنیا رەمەزان بوو، حەزرەت خۆی بەڕۆژوو بوو، كە خۆر ئاوابوو حەزرەت بە پیاوێكی فەرموو: (ئەی فیسار! دابەزە لە وڵاخەكەت، قاوتو ئاومان بۆ بكەو بەكەوگیرەكە تێی رادە تاباش ساف ببێ).

پیاوەكەیش (كە بیلال بوو) فەرمووی: ئەی پێغەمەری خودا! زووە، بابەتەواوی ببێ بە ئێوارە، خۆ ئەوە رووناكی خۆرە. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەوە: (دابەزەو قاوتو ئاوەكەمان بۆ بگرەوە). بیلال دیسان گوتی: قوربان! هێشتا هەر رۆژە. فەرمووی: (تۆ دابەزەو قاوتو ئاومان بۆ بگرەوە). بیلالیش دابەزیو قاوتو ئاوی بۆ كردنو باش شەڵەقاندیو دای پێیان، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خواردیەوە. لەپاشا فەرمووی: (كە تەماشاتان كرد وا خۆر لێرەوە، لە رۆژئاواوە ئاوابوو، وە شەو لێرەوە لە خۆرهەڵاتەوە داهات، ئیتر كاتی بەربانگی رۆژووەوانەو با رۆژووەكەی بشكێنێ). {ریاض/١٦٩/٣، زنجیرە: ٢٢٢، ژمارە: ١٢٣٧}.

## ٤٦٨) زوو رۆژوو شكاندن. (٢٥٤٤ - ٢٥٥٢)

## باب: في تَعْجِيلِ الفِطْرِ

٥٩٣- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَزَالُ النَّاسُ بِخَيْرٍ مَا عَجَّلُوا الْفِطْرَ ». {الحديث: ٢٥٤٩ = ٢٥٢٩ فم. تجريد/٢/٢٨٦، رقم: ٩٠٣ = ١٩٥٧. ترمذى. صوم: ٦٩٩}:

سەهلى كوڕى سەعدى ئەل-ساعيدى، (ڕەزاى خوداى لێ بێ) فەرمووى: خۆشەويست (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (مەردوم هەتا پەلە لەبەربانگ بكەن‌و بەربانگ بە فتگا نەخەن‌و، لەكاتى خۆيدا ڕۆژوو بشكێنن، نيشانەى ئەوەيە كە هێشتا هەر باشن‌و لە ڕێگەى ڕاست لايان نەداوە). {تاج/٢/٩٣، زنجيره: ٣٢، ژماره: ١٣٣٠ + رياض/٣/١٦٧، زنجيره: ٢٢٢، ژماره: ١٢٣٣}.

٥٩٤- عَنْ أَبِى عَطِيَّةَ قَالَ: دَخَلْتُ أَنَا وَمَسْرُوقٌ عَلَى عَائِشَةَ، فَقَالَ لَهَا مَسْرُوقٌ: رَجُلاَنِ مِنْ أَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صلى الله عليه وسلم) كِلاَهُمَا لاَ يَأْلُو عَنِ الْخَيْرِ، أَحَدُهُمَا يُعَجِّلُ الْمَغْرِبَ وَالإِفْطَارَ، وَالآخَرُ يُؤَخِّرُ الْمَغْرِبَ وَالإِفْطَارَ؟ فَقَالَتْ: مَنْ يُعَجِّلُ الْمَغْرِبَ وَالإِفْطَارَ؟ قَالَ: قلنا عَبْدُ اللَّهِ، فَقَالَتْ: هَكَذَا كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصْنَعُ. {الحديث: ٢٥٥٢ = ٢٥٣٢ فم}:

ئەبو عەطييە (ڕەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: من‌و مەسرووق چووين بۆلاى عائيشە بۆ ماڵەوەى، كە چووينە خزمەتى مەسرووق فەرمووى پێى: ئەى دايكى موسوڵمانان! دوو پياو هەن، هەردوكيان بۆ خێرو چاكەكردن درێغى ناكەن، وە هەردووكيشيان لە يارانى موحەممەدن، بەڵام يەكێكيان زوو نوێژى شێوان دەكاو زوويش ڕۆژوو دەشكێنێ‌و بەربانگ دەكاتەوە، وە ئەوى تريان درەنگ نوێژى شێوان دەكاو درەنگيش بەربانگ دەكاتەوە؟

عائيشە فەرمووى: كامەيان بە زوويى نوێژى شێوان دەكاو بەزوويى بەربانگ دەكاتەوە؟ فەرمووى: گوتمان: عەبدوڵلاى كوڕى مەسعوود. فەرمووى: پێغەمبەريش (دروودى خوداى لەسەر بێ) جاران هەروەهاى دەكرد، ئەوى تريشيان ئەبو مووساى ئەشعەرى بوو. {تاج/٢/٩٣، زنجيره: ٣٢، ژماره: ١٣٣٢ ج/٤}.

### ٤٦٩) ریگری له دانەدەمی چەند رۆژێ رۆژوو. (٢٥٥٨ - ٢٥٦٧)

### باب: النهي عن الوصل في الصوم

٥٩٥- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْوِصَالِ، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْمُسْلِمِينَ: فَإِنَّكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوَاصِلُ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَأَيُّكُمْ مِثْلِى إِنِّى أَبِيتُ يُطْعِمُنِى رَبِّى وَيَسْقِينِى ». فَلَمَّا أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا عَنِ الْوِصَالِ وَاصَلَ بِهِمْ يَوْمًا ثُمَّ يَوْمًا، ثُمَّ رَأَوُا الْهِلاَلَ، فَقَالَ: « لَوْ تَأَخَّرَ الْهِلاَلُ لَزِدْتُكُمْ »، كَالْمُنَكِّلِ لَهُمْ حِينَ أَبَوْا أَنْ يَنْتَهُوا. {الحديث: ٢٥٦١ = ٢٥٤١ فم. أبو داود. حدود: ٦٨٥١. تحفة الأشراف: ١٥٣٢١. تجريد/٢/٢٨٨، رقم: ٩٠٧ = ١٩٦٥، ١٩٦٦، ٦٨٥١، ٧٢٤٢، ٧٢٩٩}:

ئـەبو هـورەیرە (رەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) رێگـەی نەدەدا، کە یەکێ دوو رۆژ یا زیاتر شەوو رۆژ بـەرۆژوو بـێو لـەو ماوەیـەدا بـەهیچ جـۆرێ رۆژووەکـەی نەشـکێنێ. یـاران گوتیـان: ئـەی پێغەمـەری خـودا! تـۆ خـۆت وادەکەی؟ فەرمووی: جا ئێـوە وەك مـن وان، مـن جیـام لـەئێوە، مـن خـودا فرسـەتم دەداو بەشەو نانو ئاوم دەداتێ).

جـا کەهـەر وازیـان نـەهێنا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دوو رۆژ لەسـەریەك نەیشـکاند پێیـان، تـا مانگیـان دیو بـوو بەجـەژن، جـا فـەرمووی: (ئەگـەر مـانگ نەبینرایە پترم پێ دەگرتن، وەك کەسێ بیەوێ چاو ترسێنیان بکا، تـا جارێکی تـر شتی وا نەکەن). {تاج/٢/١٠٧، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ١٣٥٩. چاپی چوارەم}.

### ٤٧٠) رۆژوو گرتن لەسەفەردا. (٢٥٩٩ – ٢٦٢٦)

### بابٌ: الصَّوْمُ وَالفِطْرُ فِي سَفَر

٥٩٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَافَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ عُسْفَانَ ثُمَّ دَعَا بِإِنَاءٍ فِيهِ شَرَابٌ فَشَرِبَهُ نَهَارًا، لِيَرَاهُ النَّاسُ، ثُمَّ أَفْطَرَ حَتَّى دَخَلَ مَكَّةَ، قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَصَامَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَفْطَرَ، مَنْ شَاءَ صَامَ، وَمَنْ شَاءَ أَفْطَرَ. {الحديث: ٢٦٠٣ = ٢٥٨٣ فم. بخاري. صوم: ١٩٤٨، ٢٤٠٤، نسائي. صيام: ٢٢٩٠ تحفة الأشراف: ٥٧٤٩}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رەمەزانا سەفەری کرد، لە رێگە بەرۆژوو بوو هەتا گەیشتە عوسفان، کەسییو شەش میل دووره لە مەککەوە، لەوێ داوای جامێ ئاوی کرد، لە رۆژدا بە بەرچاوی خەڵکەکەوە خواردیەوەو رۆژووەکەی شکاند، ئیتر پێغەمبەر لە رێگە بەرۆژوو نەبوو هەتا گەیشتە مەککە، کە گەیشتینە مەککە، رەمەزانی مابوو، ئیبنو عەبباس دەیگوت: پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) وابووە لە سەفەردا بەرۆژوو بووە، وە وابووە بەرۆژوو نەبووە، جا کەوابوو لەسەفەردا ئەوەی حەزدەکا ئەوا با بەرۆژوو بێ، وە ئەوەیشی کە حەزناکا ئەوا با بەرۆژوو نەبێ). {تاج/٢/١١٣، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٤}.

٥٩٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) خَرَجَ عَامَ الْفَتْحِ إِلَى مَكَّةَ فِى رَمَضَانَ فَصَامَ حَتَّى بَلَغَ كُرَاعَ الْغَمِيمِ فَصَامَ النَّاسُ ثُمَّ دَعَا بِقَدَحٍ مِنْ مَاءٍ فَرَفَعَهُ حَتَّى نَظَرَ النَّاسُ إِلَيْهِ ثُمَّ شَرِبَ، فَقِيلَ لَهُ بَعْدَ ذَلِكَ: إِنَّ بَعْضَ النَّاسِ قَدْ صَامَ فَقَالَ: «أُولَئِكَ الْعُصَاةُ أُولَئِكَ الْعُصَاةُ». {الحديث: ٢٦٠٥ = ٢٥٨٥ فم}:

جابیری کوری عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ئازادکردنی (فەتح)ی مەککە، لە رەمەزانا، بەرەو مەککە خۆیو سوپاکەی لە مەدینە دەرچوون، ساڵی هەشتی کۆچی بوو، دووی مانگی رەمەزان بوو، دوازدە رۆژ بەرێوە بوون، سەرلەبەیانی رۆژی سیازدەی مانگ گەیشتنە ناو شاری مەککە، لەرێگە بەرۆژوو بوون هەتا گەیشتنە پێ دەشتێ پێی دەگوترێ (کوراعەلغەمیم) لەوێ عەرزی پێغەمبەریان کرد: مەردومەکە رۆژووەکە سەخڵەتی کردوون، چاوەڕوانی فەرمانی تۆیانە، ئەویش لەپاش نوێژی عەصر داوای جامێ ئاوی کردو لەبەرچاوی عەشاماتەکە بەرزیکردەوە بۆ دەمی هەتا بیبینن، خەڵکەکە تەماشایان کرد، ئەوجا لەبەرچاوی ئەوان ئاوەکەی خواردەوە، خەڵکەکەیش چاویان لەو کردو رۆژووەکەیان شکاند، بەڵام عەرزی حەزرەت کرا: هێشتا بازێ کەس هەر بەرۆژوون، فەرمووی: (ئەوانە یاخین ئەوانە یاخین).

## ٤٧١) له سەفەردا ڕۆژوو باش نییەو ناباشە
## باب: لَيْسَ مِنَ البِرِّ الصِّيَامِ فِي السَّفَرِ

٥٩٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى سَفَرٍ، فَرَأَى رَجُلاً قَدِ اجْتَمَعَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَقَدْ ظُلِّلَ عَلَيْهِ. فَقَالَ: « مَا لَهُ؟». قَالُوا: رَجُلٌ صَائِمٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَيْسَ مِنَ الْبِرِّ أَنْ تَصُومُوا فِى السَّفَرِ ». {الحديث: ٢٦٠٧ = ٢٥٨٧ فم. تجريد/٢/٢٨٤، رقم: ٨٩٨ = ١٩٤٦. نسائى. صيام: ٢٢٥٩. أبو داود. صوم: ٢٤٠٧ تحفة الأشراف: ٢٦٤٥} :

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەسەفەرێکا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەوری پیاوێ قەرەباڵغییەکی بینی، کە سێبەری بۆ کرابوو، فەرمووی: (ئەم جەنجاڵییە چییە؟) گوتیان: ڕۆژووەوانە، ناوی ئەبو ئیسرائیلە بەڕۆژووە، لەگەرماناو لە توونیانا لەهۆش خۆی چووە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ڕۆژوو لەسەفەردا کارێکی ناباشەو کارێکی باش نییە). {تاج/٢/١١٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٦ چ/٤}.

## ٤٧٢) لەسەفەردا نەنگ ناگیرێ نە لە ڕۆژووەوانو نە لە ڕۆژوو شکێن.
## باب: تَرْكُ العَيْبِ عَلَى الصَّائِمِ وَالْمُفْطِرِ

٥٩٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: غَزَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِسِتَّ عَشْرَةَ مَضَتْ مِنْ رَمَضَانَ، فَمِنَّا مَنْ صَامَ، وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، فَلَمْ يَعِبِ الصَّائِمُ عَلَى الْمُفْطِرِ، وَلاَ الْمُفْطِرُ عَلَى الصَّائِمِ. {الحديث: ٢٦١٠ = ٢٥٩٠ فم} :

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: شازدەی ڕەمەزان بوو، لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا چووین بۆ غەزا، هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، هەمان بوو بەڕۆژوو نەبوو، جا نە ڕۆژووەوان نەنگو عەیبی لە ڕۆژوو شکێن دەگرت، لەسەر ئەوە کە لەسەفەرا بەڕۆژ نییە، وە نە ڕۆژوو شکێن نەنگی لە بەڕۆژوو دەگرت، لەسەر ئەوە کە بەڕۆژووە). {تاج/٢/١١٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٥ چ/٤}.

### ٤٧٣) پاداشتی کەسێ لەسەفەرا، بەڕۆژوو نەبێ‌و کاروباری سەفەرەکە بگرێتە ئەستۆی خۆی. (٢٥٩٩ - ٢٦٢٦).

### بابٌ: أجْرُ المُفْطِرِ فِي السَّفَرِ إِذَا تَوَلَّى العَمَلَ

٦٠٠- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كُنَّا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِى السَّفَرِ، فَمِنَّا الصَّائِمُ، وَمِنَّا الْمُفْطِرُ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْزِلاً فِى يَوْمٍ حَارٍّ، أَكْثَرُنَا ظِلاًّ صَاحِبُ الْكِسَاءِ، وَمِنَّا مَنْ يَتَّقِى الشَّمْسَ بِيَدِهِ، قَالَ: فَسَقَطَ الصُّوَّامُ وَقَامَ الْمُفْطِرُونَ، فَضَرَبُوا الأَبْنِيَةَ وَسَقَوُا الرِّكَابَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ ». {الحديث: ٢٦١٧ = ٢٥٩٧ فم. تجريد/٢/٣١٦، رقم: ١١٩٠ = ٢٨٩٠. نسائي. صيام: ٢٢٨٢. تحفة الأشراف: ١٦٠٧}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەسەفەرێکا، لە خزمەت پێغەمبەردا بووین، ڕۆژەکەی زۆر گەرم بوو، گەیشتینە شوێنێ سێبەر نەبوو، لەوێ لاماندا، ئەوەمان سێبەری گەورەی هەبوو، کە عەبای پێبوو، لەباتی چاتۆڵ دەیکرد بە سێبەر بۆ خۆی! هەمان بوو دەستی دەدایە بەرتیشکی خۆرەکە، ئەوانەشی کەلەو ڕەوتەنییەدا، بەڕۆژوو بوون هیچ خزمەتێکیان پێ نەکراو لاڵو پاڵ پاڵکەوتن، بەڵام بە پێچەوانەوە ئەوانەی کە بەڕۆژوو نەبوون، هەموو کارەکان ئەوان کردیان، دەوارو چادرەکانیان هەڵدا، ولاخەکانیان برد بۆ لەوەڕو بۆسەر ئاو، دەستیان کرد بە خزمەت کردن‌و نان‌و ئاویان بۆ ئامادەکردین.

پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) کە حاڵەکەی بینی، فەرمووی: (پاداشی هەرە گەورە، ئەمڕۆ، ئەوانە بردیان کە بەڕۆژوو نەبوون!). {تاج/٢/١٤٥، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ١٣٧٧}.

### ٤٧٤) ڕۆژوو شکاندن هەتا بەرابەر دوژمن بەهێزبێ

### باب: الفِطْرُ لِلقُوَّةِ لِلِقَاءِ العَدُوِّ

٦٠١- عَنْ قَزَعَةَ قَالَ: أَتَيْتُ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ وَهُوَ مَكْثُورٌ عَلَيْهِ، فَلَمَّا تَفَرَّقَ النَّاسُ عَنْهُ قُلْتُ: إِنِّى لاَ أَسْأَلُكَ عَمَّا يَسْأَلُكَ هَؤُلاَءِ عَنْهُ، سَأَلْتُهُ عَنِ الصَّوْمِ فِى السَّفَرِ فَقَالَ:

سَافَرْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى مَكَّةَ وَنَحْنُ صِيَامٌ، قَالَ: فَنَزَلْنَا مَنْـزِلاً، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّكُمْ قَدْ دَنَوْتُمْ مِنْ عَدُوِّكُمْ، وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ »، فَكَانَتْ رُخْصَةً، فَمِنَّا مَنْ صَامَ وَمِنَّا مَنْ أَفْطَرَ، ثُمَّ نَزَلْنَا مَنْـزِلاً آخَرَ، فَقَالَ: « إِنَّكُمْ مُصَبِّحُو عَدُوِّكُمْ وَالْفِطْرُ أَقْوَى لَكُمْ، فَأَفْطِرُوا ». وَكَانَتْ عَزْمَةً فَأَفْطَرْنَا، ثُمَّ قَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنَا نَصُومُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعْدَ ذَلِكَ فِي السَّفَرِ. {الحديث: ٢٦١٩ = ٢٥٩٩ فم}:

قەزعە فەرمووی: چووم بۆ خزمەتی ئەبو سەعیدی خودری، عەشاماتێکی زۆری لەدەور بوو، کە خەڵکەکە دەوریان چۆڵ کردو بڵاو بوونەوە لەدەوری، عەرزیم کرد: من لەبابەت ئەو شتانەوە پرسیارت لێ ناکەم، کە ئەمانە لێتی دەپرسن، لەبابەت ڕۆژووی سەفەر پرسیارم لێی کرد، فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی مەککە، لە مانگی ڕەمەزانا، لە مەدینەوە، سەفەرمان کرد بۆ مەککە، لەڕێگە هەم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژوو بوو، هەم سوپاکەی، تا گەیشتینە هەوارێ لەوێ لاماندا بۆ وچان، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وا ئێوە بەرە بەرە نزیك دەبنەوە لە دوژمنی خۆتان، دیارە ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێزتر دەبن). جا ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەت بوو، جا بۆ بەیانی، هەمان بوو بەڕۆژوو بوو، وە هەمان بوو بەڕۆژوو نەبوو، جا ڕۆژێ تر، گەیشتینە هەوارێ تر، لەوێش دابەزین، لەوێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بێگومان ئێوە سبەینێ ئاوقەدی دوژمنی خۆتان دەبن و ڕوو بەڕووی دەبنەوە، دیارە ئەگەر بەڕۆژوو نەبن بەهێزتر دەبن، کەواتە ئیتر بەڕۆژوو مەبن) جا ئەمەیان عەزیمە بوو، واتە: جەخت و دووپاتکردنەوەی تەواو بوو لەسەر بەڕۆژوو نەبوون، ئیتر ئێمەش هەموومان ڕۆژوومان شکاندو لەو سەفەرەدا بەڕۆژوو نەبووین. لەپاشا ئەبو سەعید دەیفەرموو: بەڵام لەپێش ئەم سەفەرەو لەپاش ئەم سەفەرەیش بەچاوی خۆم دیومە کە ئێمە لەسەفەردا بەڕۆژوو دەبووین و پێغەمبەریش ڕێگەی ئەوەی لێ نەدەگرتین. {بڕوانە: ژمارە: ٥٩٧ کە لەپێشەوە ڕۆیشت}.

### ٤٧٥) كردن بەسەرپشك لەسەفەردا، لەنێوانی ڕۆژوو گرتنو ڕۆژوو شکاندندا
### باب: التخيير في الصَّوْمِ والفِطْرِ فِي السَّفَرِ

٦٠٢- عَنْ حَمْزَةَ بْنِ عَمْرٍو الأَسْلَمِيِّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، أَجِدُ بِى قُوَّةً عَلَى الصِّيَامِ فِى السَّفَرِ فَهَلْ عَلَىَّ جُنَاحٌ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « هِىَ رُخْصَةٌ مِنَ اللَّهِ، فَمَنْ أَخَذَ بِهَا فَحَسَنٌ وَمَنْ أَحَبَّ أَنْ يَصُومَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ ». {الحديث: ٢٦٢٤ = ٢٦٠٤ فم}:

حەمزەی کوڕی عەمری ئەل‌ئەسلەمی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گوتم: قوربان! ئەی پێغەمەری خودا! من تەوانای بەڕۆژوو بوونم هەیە لەسەفەردا، جا ئایا ئەگەر لەسەفەردا بەڕۆژوو ببم گوناهم دەگا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژوو شکاندن لەسەفەردا، مۆڵەتو ڕوخصەتو ڕێپێدانێکە لەخوداوە، هەرکەسێ کار بەو مۆڵەتەی خودا بکا ئەوە کارێ باش دەکاو شتێ جوانی کردووەو بەخشش‌و خەلاتی خودای ڕەت نەکردۆتەوە، بەلام ئەگەر کەسێ لەسەفەردا، حەزبکا بەڕۆژووبێ، هیچ گوناهی لەسەر نییە).

**ڕوونکردنەوە:**

حەمزەی کوڕی عەمری ئەسلەمی، هاوەڵی پێغەمبەر، بە خەلکی حیجاز دائەنرێ، ساڵ دوازدە مانگە بەڕۆژوو بوو، خەلکی مەدینە فەرموودەکانی ئەو دەگێڕنەوە، لە تەمەنی حەفتاو یەك، یا لە تەمەنی هەشتا، ساڵیدا، لە شەست‌و یەکی کۆچیدا، مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

٦٠٣- عَنْ أَبِى الدَّرْدَاءِ (رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ فِى شَهْرِ رَمَضَانَ، فِى حَرٍّ شَدِيدٍ، حَتَّى إِنْ كَانَ أَحَدُنَا لَيَضَعُ يَدَهُ عَلَى رَأْسِهِ مِنْ شِدَّةِ الْحَرِّ، وَمَا فِينَا صَائِمٌ إِلاَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ. {الحديث: ٢٦٢٥ = ٢٦٠٥ فم. تجريد/٢/٢٨٢، رقم: ٨٩٧ = ١٩٤٥. أبو داود. صوم: ٢٤٠٩}:

ئەبو دەرداء (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەتی پێغەمبەردا، لەمانگی ڕەمەزانا، لە ڕۆژێکی زۆر گەرما، تەنانەت پیاو لەتاو گەرما، بەدەستی سێبەری بۆ

سەری دەکرد، لە ڕۆژێکی ئاوا گەرما، لە خزمەت پێغەمبەردا، دەرچووین بۆ سەفەرێ، ئێمە هەموومان بەڕۆژوو نەبووین، بێجگە لە پێغەمبەرو عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە).

## ٤٧٦) گێڕانەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان لە مانگی کوڵە مانگ (شەعبان)دا (٢٦٨٢ - ٢٦٨٦) باب: قَضَاءُ رَمَضَانَ فِي شَعْبَان

٦٠٤- عَنْ أَبِى سَلَمَةَ قَالَ: سَمِعْتُ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) تَقُولُ: كَانَ يَكُونُ عَلَىَّ الصَّوْمُ مِنْ رَمَضَانَ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَقْضِيَهُ إِلاَّ فِى شَعْبَانَ، الشُّغُلُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَوْ بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٢٦٨٢ = ٢٦٦٢ فم. بخاري. صوم: ١٩٥٠. أبو داود. صوم: ٢٣٩٩. نسائى. صيام: ٢٣١٨} :

یەحیای کوڕی سەعید فەرمووی: ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: بە سەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی هاوسەرانی پێغەمبەر، هەندێکمان لەبەر بێنوێژیی، یا زەیستانی، بەڕۆژوو نەدەبووین، لەبەرئەوەیشی کە لەخزمەتی پێغەمبەردا بووین نەمان دەتوانی بیگرینەوە، هەتا کوڵە مانگ (شەعبان) دەهات. {تاج/٢/١١٨، زنجیرە: ٤٨، ژمارە: ١٣٨٤} .

## ٤٧٧) گێڕانەوەی ڕۆژوو بۆ مردوو. (٢٦٨٧ - ٢٦٩٥) باب: قَضَاءُ الصِّيَامِ عَنِ المَيِّت

٦٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ مَاتَ وَعَلَيْهِ صِيَامٌ صَامَ عَنْهُ وَلِيُّهُ ». {الحديث: ٢٦٨٧ = ٢٦٦٧ فم. تجريد/٢/٢٨٥، رقم: ٩٠٠ = ١٩٥٢. أبو داود. صوم: ٢٤٠٠ تحفة الأشراف: ١٦٣٨٢} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خۆشەویستو ئازیز، دەفەرموێ: (کەسێ بمرێو ڕۆژووی لەسەر بێ، کەسوکاری دەتوانن لەباتی ئەو بەڕۆژوو بنو بۆی بگێڕنەوە). {تاج/٢/١١٩، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ١٣٨٦} .

٦٠٦- عَنْ بُرَيْدَةَ ( رضى الله عنه) قَالَ: بَيْنَا أَنَا جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذْ أَتَتْهُ امْرَأَةٌ فَقَالَتْ: إِنِّى تَصَدَّقْتُ عَلَى أُمِّى بِجَارِيَةٍ، وَإِنَّهَا مَاتَتْ، قَالَ: فَقَالَ: « وَجَبَ أَجْرُكِ، وَرَدَّهَا عَلَيْكِ الْمِيرَاثُ ». قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ كَانَ عَلَيْهَا صَوْمُ شَهْرٍ أَفَأَصُومُ عَنْهَا؟ قَالَ: « صُومِى عَنْهَا ». قَالَتْ: إِنَّهَا لَمْ تَحُجَّ قَطُّ، أَفَأَحُجُّ عَنْهَا؟ قَالَ: « حُجِّى عَنْهَا ». {الحديث: ٢٦٩٢ = ٢٦٧٢ فم}:

بورەیدە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ خۆم لە خزمەتی حەزرەتدا، (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووم، لەوکاتەدا ژنێ هات بۆ خزمەتی، ئەم پرسیارەی ئاڕاستە کرد: قوربان! دایکێکم هەبوو، کەنیزەکێکم بەخشی پێی، دوایی دایکم مرد، ئێستا کەنیزەکەکە ماوە، بڕیاری ئەمە چییە؟ فەرمووی: (پاداشی بەخشینەکەت مسۆگەر کردووە، لەهەمان کاتا، بەهۆی میراتو کەلەپوورەوە، کەنیزەکەکە بووەتەوە بەهی خۆت). ژنەکە گوتیشی: ئەی پێغەمەری خودا! دایکم ڕۆژووی مانگێ قەرزارە، ئایا دەبێ خۆم بۆی بگێڕمەوە؟ فەرمووی: (لەجیاتی دایکت بەڕۆژوو بەو ئەو مانگەی بۆ قەزا بکەرەوە). ژنەکە گوتیشی: قوربان! دایکم هەرگیز حەجی نەکردووە، ئایا دەبێ کە من حەجی بۆ بکەم؟ فەرمووی: (حەج بۆ دایکت بکە).

### ٤٧٨) فەرمایشتی خودای گەورە: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ}
### بابٌ: فِى قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ}

٦٠٧- عَنْ سَلَمَةَ بْنِ الأَكْوَعِ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ) كَانَ مَنْ أَرَادَ أَنْ يُفْطِرَ وَيَفْتَدِىَ، حَتَّى نَزَلَتِ الآيَةُ الَّتِى بَعْدَهَا فَنَسَخَتْهَا. {الحديث: ٢٦٨٠ = ٢٦٦٠ فم. بخارى. تفسير: ٤٥٠٧. أبو داود. صوم: ٢٣١٥. ترمذى. صوم: ٧٩٨}:

سەلەمەی کوڕی ئەکوەع (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ} بەپێی ئەم ئایەتە موسوڵمان خۆی سەرپشك بوو لەنێوانی ئەم دوو شتەدا: یا بەڕۆژوو بێ، یا بەڕۆژوو نەبێو

تۆڵە (كەفارەت) بدا، بەڵام ئایەتەكەی پاشی كەهات، ئەمەی نەسخ كردەوە، چونكە فەرمانی كرد بەگرتنی رۆژوو، وەك دەفەرموێ: {فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ الشَّهْرَ فَلْيَصُمْهُ}.

٤٧٩) **بەرۆژوو بوونو رۆژوو شكاندن لە مانگەكاندا**. (٢٧١٠ - ٢٧٢٠)

٦٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَقِيقٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ: أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصُومُ شَهْرًا كُلَّهُ؟ قَالَتْ: مَا عَلِمْتُهُ صَامَ شَهْرًا كُلَّهُ إِلاَّ رَمَضَانَ؟ وَلاَ أَفْطَرَهُ كُلَّهُ، حَتَّى يَصُومَ مِنْهُ، حَتَّى مَضَى لِسَبِيلِهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٢٧١١ = ٢٦٩٣ فم. نسائی. صيام: ٢١٨٣. تحفة الأشراف: ١٦٢١٨}:

عەبدوڵلای كوڕی شەقیق فەرمووی: بە عائیشەم گوت: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەبوو كە مانگێ هەمووی بەسەریەكەوە بەرۆژوو بێ؟ فەرمووی: ئاگام لێ نییە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مانگێ سەراسەر بەرۆژوو بووبێ، بێجگە لە مانگی رەمەزان، كە هەمووی دەگرت، هەروا ئاگام لێ نییە كە مانگێ سەراسەر هەمووی بەرۆژوو نەبووبێ، هەرچۆنێ بووە، كەم تازۆر شتێكی لێ بەرۆژوو بووە، ئەمە حاڵی بوو هەتا وەفاتی كرد).

٤٨٠) **گەورەیی رۆژوو لەرێگەی خودادا**. (٢٧٠٤ – ٢٧٠٦)

**باب: فضل الصَّوْمِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ**

٦٠٩- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا مِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْمًا فِي سَبِيلِ اللَّهِ، إِلاَّ بَاعَدَ اللَّهُ بِذَلِكَ الْيَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النَّارِ سَبْعِينَ خَرِيفًا ». {الحديث: ٢٧٠٤ = ٢٦٨٦ فم. تجريد/٢/٣٠١، رقم: ١١٧٠ = ٢٨٤٠. ترمذی. جهاد: ١٦٢٣. نسائی. صيام: ٢٢٤٧. تحفة الأشراف: ٤٣٨٨}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ رۆژێ بەرۆژووبێ، لەبەر رەزای خودا، بەهۆی ئەو رۆژووەوە، خودا حەفتا ساڵ رووی لە ئاگری دۆزەخ دوور دەخاتەوە). {تاج/٢/١٣٠، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ١٤١٠}.

### ٤٨١) گەورەیی ڕۆژووی مانگی موحەڕڕەم. (٢٧٤٧ - ٢٧٤٩)

### باب: فَضْلُ صِيَامِ المُحَرَّمِ

٦١٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَفْضَلُ الصِّيَامِ بَعْدَ رَمَضَانَ شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ، وَأَفْضَلُ الصَّلاَةِ بَعْدَ الْفَرِيضَةِ صَلاَةُ اللَّيْـلِ ». {الحديث: ٢٧٤٧ = ٢٧٣١ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٢٩. ترمذى. صلاة: ٤٣٨. نسـائى. قيام الليل: ١٦١٢}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفـەرموێ:** (لـەپاش ڕۆژووی ڕەمــەزان، گـەورەترین ڕۆژوو ڕۆژووی موحەڕڕەمــە، کـە مـانگی خودایە، لەپاش نوێژی فەرزیش گەورەترین نوێژ، نوێژی شەو نوێژە). {تاج/١/٤٧٨، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٦٨}.

### ٤٨٢) گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورا. (٢٦٣٢ - ٢٦٦٥)

### باب: صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

٦١١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ قُرَيْشًا كَانَتْ تَصُومُ عَاشُورَاءَ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، ثُمَّ أَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِصِيَامِهِ حَتَّى فُرِضَ رَمَضَانُ، فَقَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ شَاءَ فَلْيَصُمْهُ، وَمَنْ شَـاءَ فَلْيُفْطِـرْهُ ». {الحـديث: ٢٦٣٦ = ٢٦١٦، تجريد/٢/٢٩٩، رقم: ٩١٩ = ٢٠٠٢ فتح}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی:** جاران قوڕەیش لەسـەردەمی نەزانیـدا، ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورایان دەگرت، وە **پێغەمبەریش** (درودی خودای لەسەر بێ) هـەر لـەو سـەردەمەدا، چاوی لەوان دەکردو دەیگرت، کاتێ هـاتیش بۆ مەدینـە هـەردەیگرتو فەرمانیشی دەکـرد بـەگرتنی، جـا کـە خـودا ڕۆژووی ڕەمـەزانی دانـا لەسـەر موسوڵمانان، ئـیتر **پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) وازی لەڕۆژووی ڕۆژی عاشـوورا هێنـا، جـا ئێسـتا ئاوایـە: کەسێ حەزکا دەیگرێ، وە کەسێ حەزکا نـایگرێ). {تـاج/٢/١٣٣، زنجیـرە: ٦٠، ژمـارە: ١٤١٧ + تجرید/٢/١٩١، ژمارە: ٧٦٤ = ١٥٩٢}.

### ٤٨٣) چ رۆژێ لەباتی عاشوورا بەڕۆژوو دەبێ. (٢٦٣٢ - ٢٦٦٥)
### باب: أيُّ يَوْمٍ يَصُومُ فِي عَاشُورَاءَ

٦١٢- عَنِ الْحَكَمِ بْنِ الأَعْرَجِ قَالَ: انْتَهَيْتُ إِلَى ابْنِ عَبَّاسٍ وَهُوَ مُتَوَسِّدٌ رِدَاءَهُ فِي زَمْزَمَ، فَقُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِي عَنْ صَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: إِذَا رَأَيْتَ هِلَالَ الْمُحَرَّمِ فَاعْدُدْ وَأَصْبِحْ يَوْمَ التَّاسِعِ صَائِمًا، قُلْتُ: هَكَذَا كَانَ محمد (صلى الله عليه وسلم) يَصُومُهُ؟ قَالَ: نَعَمْ. {الحديث: ٢٦٥٩ = ٢٦٣٩ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٤٦. ترمذي. صوم: ٧٥٤ تحفة الأشراف: ٥٤١٢} :

حەکەمی کوڕی ئەعرەج (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: چووم بۆلای ئیبنو عەبباس (خودایان لێ رازی بێ) لەلای بیری زەمزەم، شانی دادابوو، لەسەر پۆشاکەکەی، پێم گوت: پێم بلێ رۆژووی عاشوورا کامەیە؟ فەرمووی: کە مانگی یەك شەوەی مانگی موحەڕەمت دی، رۆژ بژمێرە، وە رۆژی نۆهەم بەڕۆژوو بە. عەرزیم کرد: جاران پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) هەرئاوا دەیگرت؟ فەرمووی: بەلێ). {تاج/٢/١٣١، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ١٤١٣}.

### ٤٨٤) گەورەیی گرتنی رۆژووی رۆژی عاشوورا. (٢٦٣٢ - ٢٦٦٥)
### باب: فَضْلُ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ

٦١٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدِمَ الْمَدِينَةَ، فَوَجَدَ الْيَهُودَ صِيَامًا يَوْمَ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا هَذَا الْيَوْمُ الَّذِي تَصُومُونَهُ؟ ». فَقَالُوا: هَذَا يَوْمٌ عَظِيمٌ أَنْجَى اللَّهُ فِيهِ مُوسَى وَقَوْمَهُ، وَغَرَّقَ فِرْعَوْنَ وَقَوْمَهُ فَصَامَهُ مُوسَى شُكْرًا، فَنَحْنُ نَصُومُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَنَحْنُ أَحَقُّ وَأَوْلَى بِمُوسَى مِنْكُمْ ». فَصَامَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ. {الحديث: ٢٦٥٣ = ٢٦٣٣ فم. تجريد/٢/٢٩٩، رقم: ٩٢٠ = ٢٠٠٤، ٣٣٩٧، ٣٩٤٣، ٤٦٨٠، ٤٧٣٧} :

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەهات بۆ مەدینە، لەوێ جوولەکەی لێ بوو، کاتێ مانگی موحەڕەم هات، تەماشای کرد کەوا

جوولەکەکان دەی موحەڕەم بەڕۆژوو دەبن، فەرمووی: (ئەم ڕۆژووە هی چییە کەوا دەیگرن؟) گوتیان: ئەمڕۆ ڕۆژێی زۆر گەورەو باشە، ئەمە ئەو ڕۆژەیە کە خودای گەورە مووساو هۆزەکەیی، تیادا رزگار کردووە لەدەستی فیرعەونی دوشمنیان‌و فیرعەونی تیا لەدەریادا خنکان وە مووسا لەم ڕۆژەدا، سوپاس بۆ خودا، لەسەر نیعمەتی رزگاربوون لەدەستی دوژمن، بەڕۆژوو بووە، وە ئێمەیش چاو لەو دەکەین‌و ئەمڕۆژە بەڕۆژوو دەبین، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ بەمەی زانی فەرمووی: (کەوابێ بۆ من ڕەواترە کە لەمەدا پەیڕەوی مووسا بکەم هەتا ئێوە). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەم خۆی گرتی‌و هەم فەرمانی کرد بە موسوڵمانان کە ئەم ڕۆژە بەڕۆژووبن). {تاج/٢/١٣٣، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ١٤١٧ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی مەولوودا کەپێی دەگوترێ ڕەبیعول ئەووەل، لە سەفەری کۆچدا گەیشتە مەدینە، کاتێ مانگی موحەڕەم دێ‌و دەبێ بەرۆژی عاشوورا، دەبینێ جوولەکەکان ئەو ڕۆژە بەڕۆژوو دەبن‌و ئەو پرسیارو وەڵامە ڕوودەدا کە لە فەرموودەکەدا رابورد.

٢ - هەندێ دەفەرموون: جوولەکەکان بەپێی ساڵی هەتاوی بەڕۆژوو بوون، بۆیە کە پێغەمبەر دەگاتە مەدینە ئەوان بەڕۆژوو بوون، بەڵام ئەمە دوورە.

٦١٤- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى يَزِيدَ سَمِعَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) وَسُئِلَ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ عَاشُورَاءَ، فَقَالَ: مَا عَلِمْتُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَامَ يَوْمًا يَطْلُبُ فَضْلَهُ عَلَى الأَيَّامِ، إِلاَّ هَذَا الْيَوْمَ، وَلاَ شَهْرًا إِلاَّ هَذَا الشَّهْرَ. يَعْنِى رَمَضَانَ. {الحديث: ٢٦٥٧ = ٢٦٣٧ فم. بخاري. صوم: ٢٠٠٦. نسائي. صيام: ٢٣٧٢}:

عوبەیدی کوڕی ئەبو یەزید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: گوێم لە ئیبنو عەبباس بوو، لێیان پرسی، لەبارەی گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی عاشووراوە. فەرمووی: نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مشووری ڕۆژووی هیچ ڕۆژێ بخوا، کە بە گەورەتری دابنێ لە ڕۆژانی تر، جگە لەم ڕۆژە کە ڕۆژی عاشوورایە، وە بێجگە لەم مانگە کە مانگی ڕەمەزانە). {تاج/١/١٣٥، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٤٢٢}.

**٤٨٥) کەسێ لەرۆژی عاشووورادا بەڕۆژوو نەبووە با کە ئەم فەرمانەی پێ دەگا، بائیتر بەڕۆژوو بێ.**

**باب: مَنْ أَكَلَ يَوْمَ عَاشُورَاءَ فَلْيَكُفَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ**

٦١٥- عَنِ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ بْنِ عَفْرَاءَ قَالَتْ: أَرْسَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَدَاةَ عَاشُورَاءَ إِلَى قُرَى الأَنْصَارِ الَّتِى حَوْلَ الْمَدِينَةِ: « مَنْ كَانَ أَصْبَحَ صَائِمًا فَلْيُتِمَّ صَوْمَهُ، وَمَنْ كَانَ أَصْبَحَ مُفْطِرًا فَلْيُتِمَّ بَقِيَّةَ يَوْمِهِ ». فَكُنَّا بَعْدَ ذَلِكَ نَصُومُهُ وَنُصَوِّمُ صِبْيَانَنَا الصِّغَارَ مِنْهُمْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ وَنَذْهَبُ إِلَى الْمَسْجِدِ فَنَجْعَلُ لَهُمُ اللُّعْبَةَ مِنَ الْعِهْنِ، فَإِذَا بَكَى أَحَدُهُمْ عَلَى الطَّعَامِ أَعْطَيْنَاهَا إِيَّاهُ عِنْدَ الإِفْطَارِ. {الحديث: ٢٦٦٤ = ٢٦٤٣ فم. تجريد/٢/٢٨٧، رقم: ٩٠٥ = ١٩٦٠. تحفة الأشراف: ١٥٨٣٣}:

روبەییعی کچی موعەززیذ (خوای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەبەیانی رۆژی عاشوورا، پەیامی نارد بۆ گوندەکانی یاریدەدەران (أنصار) کە لە دەوروبەری شاری مەدینە بوون، فەرمووی: (هەرکەسێ ئەمڕۆ بەڕۆژووە، با نەیشکێنێ تا ئێوارێ، وە هەرکەسێ ئەمڕۆ بەڕۆژوو نییە با ماوەی ئەمڕۆ بەڕۆژووبێ، ئیتر لەوەدوا دەستوورمان وابوو، ئەو رۆژە بەڕۆژوو دەبووین، تەنانەت بە منداڵی بچکۆلەی خۆشمان دەگرت، بەوانەیان کە خودا لەچارەی نووسیبوون، وە دەچووین بۆ مزگەوتو یاریلۆکە (لوعبة)مان لەخوری رەنگاو رەنگ دروست دەکرد بۆیان، جا کە دەگریان بۆنانو ئاو بەوە ژیرمان دەکردنەوە، هەتا کاتی بەربانگ). {تاج/٢/١٣٤، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ١٤٢١}..

**روونکردنەوە:**

نەوەوی دەفەرموێ: لەلای ئیبنو عەباس رۆژی عاشوورا نۆی مانگی موحەررەمە، بەڵام ئەم رایە لاوازە، بەڵکوو رای بەهێز فەرمایشتی جەماوەری زانایانە، کە دەفەرموون: رۆژی عاشوورا دەی موحەررەمە. {بڕوانە: تاج/٢/١٣٢، زنجیرە: ٥٩، ژمارە: ١٤١٥، ١٤١٦}. {بۆ ژیننامەی روبەییعی کچی موعەوویز بڕوانە پاش فەرموودەی ژمارە: ٦١٦}.

## ٤٨٦) گرتنی ڕۆژووی کوڵە مانگ (شەعبان). (٢٧١٠ - ٢٧٢٠)

## باب: صِيَامُ شَعْبَانَ

٦١٦- عَنْ أَبِی سَلَمَةَ (رضی الله عنه) قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ عَنْ صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: كَانَ يَصُومُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ صَامَ، وَيُفْطِرُ حَتَّى نَقُولَ: قَدْ أَفْطَرَ، وَلَمْ أَرَهُ صَائِمًا مِنْ شَهْرٍ قَطُّ أَكْثَرَ مِنْ صِيَامِهِ مِنْ شَعْبَانَ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ كُلَّهُ، كَانَ يَصُومُ شَعْبَانَ إِلاَّ قَلِيلاً. {الحديث: ٢٧١٤ = ٢٦٩٧ فم. تجريد/٢/٢٩٠، رقم: ٩٠٩ = ١٩٦٩، ١٩٧٠، ٦٤٦٥. أبو داود. صوم: ٢٤٣٤. نسائی. صيام: ٢٣٥}:

**ئەبو سەلەمە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەبارەی چۆنێتیو چەندێتیی ڕۆژووی پێغەمبەرەوە،** (دروودی خودای لەسەر بێ)، **پرسیارم لە عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر کرد، فەرمووی: دەستووری ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ئاوابوو: جاری وادەبوو کە دەستی دەکرد بە گرتنی ڕۆژوو دەمانگوت: ئیتر هەر بەڕۆژوو دەبێو نایشکێنێ، جاری وایش دەبوو کە بەڕۆژوو نەدەبوو، دەمانگوت: بەردەوام دەبێ لەسەر ڕۆژوو شکاندن، هەرگیز نەیشم دیوە کە لەهیچ مانگێك بەقەی مانگی کوڵە مانگ (مانگی شەعبان) بەڕۆژوو بێ، بگرە کوڵە مانگی هەموو دەگرت کەمێکی نەبێ).**

**ڕوونکردنەوە:**

**ڕوبەییعی کچی موعەوویز** (ڕەزای خودای لێ بێ) **یەکێکە لەو ژنانەی کە هاوەڵو سەحابەی پێغەمبەر بوون، ژنێکی بەڕێزی ناودارە، ئەنصارییە، بەنی نەجارییە، واتە: لەهۆزی خاڵوانی پێغەمبەر. موعەوویز دەفەرموێ: کەچووم بە بووکی، بەیانی شەوی بووکێنیم، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **هات بۆ دێنیم، یەکێکە لەو ژنانەی کە لەژێر درەختی بەیعەتوڕیزواندا پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەرداو، خودا بە ئایەتی قورئان پەسنی ئەوانی کرد کە دەفەرموێ: {لَقَدْ رَضِيَ اللَّهُ عَنِ الْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ الشَّجَرَةِ - فتح/١٨} ئامادەی هەندێ لە غەزاکانی پێغەمبەر بووە، خۆی دەفەرموێ: لە خزمەت پێغەمبەردا دەچووین بۆ غەزا، ئێمەی ژنان، لە غەزادا ئیشمان ئەوەبوو، ئاومان دەدا بە جەنگاوەرەکان، خزمەتمان**

دەكردن‌و شەهیدو زامارمان دەگواستەوە، بۆ مەدینە، جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) میوانی بوو، كاتێ دەستنوێژی گرت، روبەییع خۆی ئاوی دەستنوێژەكەی دەكرد بە دەستیدا، ئیبنو عەبباس بەتایبەتی چوو بۆ خزمەتی، تا چۆنێتی ئەو دەستنوێژەی پێغەمبەری بۆ باس بكا. لە صەحیحی بوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، ئەبو عوبەیدەی كوڕی موحەممەد دەڵێ: عەرزی خاتوو روبەییعم كرد: چۆنێتیی شێوەی پێغەمبەرم بۆ باس بكە؟ فەرمووی: (خۆرێكی هەڵاتوو بوو بۆ خۆی!).

## ٤٨٧) رۆژووی ناوەڕاستی مانگی كوڵە مانگ. (٢٧٤٣ - ٢٧٤٦)

## بابٌ: فِي صَوْمِ سُرَرِ شعبانَ

٦١٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لَهُ أَوْ لآخَرَ: « أَصُمْتَ مِنْ سَرَرِ شَعْبَانَ؟ ». قَالَ: لاَ. قَالَ: « فَإِذَا أَفْطَرْتَ فَصُمْ يَوْمَيْنِ ». {الحديث: ٢٧٤٣ = ٢٧٢٨ فم. تجريد البخارى/٢/٢٩٦، رقم: ٩١٤ = ١٩٨٣. أبو داود. صوم: ٢٣٢٨. تحفة الأشراف: ١٠٨٤٨}:

عیمرانی كوڕی حوصەین (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخۆمی فەرموو، یا فەرمووی: بە پیاوێكی تری فەرموو: (ئایا لە ناوەڕاستی مانگی كوڵە مانگدا، هیچ بەڕۆژوو بووی؟) گوتی: نەء، فەرمووی: (دەی لەجیاتی ئەوە، كە رەمەزان تەواو بوو، دوو رۆژ بەڕۆژووبە).

## ٤٨٨) رۆژووی شەش رۆژ لە مانگی شەشەڵان (واتە: مانگی شەووال)(٢٧٥٠ - ٢٧٥٢)

## باب: إِتْبَاعُ رَمَضَانَ بِصِيَامِ سِتَّةِ أَيَّامٍ مِنْ شَوَّال

٦١٨- عَنْ أَبِى أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ صَامَ رَمَضَانَ ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كَانَ كَصِيَامِ الدَّهْرِ ». {الحديث: ٢٧٥٠ = ٢٧٣٤ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٣٣. ترمذى. صوم: ٧٥٩. تحفة الأشراف: ٣٤٨٢}:

ئەبو ئەییوبی ئەنصاری (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ کاتێ رەمەزان هات، رۆژووەکەی بگرێو، لەپاش ئەو، لەپاش یەکەم رۆژی جەژن، شەش رۆژیش لە شەشەڵان بگرێ، ئەوە وەکوو بەدرێژایی ساڵ، ساڵ دوازدە مانگە، بەرِۆژوو بێ وایە). {تاج/١٤١/٢، زنجیرە: ٦٤، ژمارە: ١٤٣٤}.

### ٤٨٩) نەگرتنی رۆژووی دەی یەکەمی مانگی قوربان. (٢٧٨١ – ٢٧٨٢)

### بابٌ: تركُ صِيامِ عَشْرِ ذِي الحَجَّة

٦١٩- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قالت: ما رأيت رسول الله (صلى الله عليه وسلم) صَائِمًا فِي الْعَشْرِ قطُّ. {الحديث: ٢٧٨١ = ٢٧٦٥ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٣٩. ترمذي. صوم: ٧٥٦. تحفة الأشراف: ١٥٩٤٩}:

عائیشە (رەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: من بەش بەحاڵی خۆم هەرگیز نەمدیوە، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدەی یەکەمی مانگی قوربانا، بەرِۆژووبێ).

**روونکردنەوە:**

رۆژووی دە رۆژەی یەکەمی مانگی قوربان، جگە لە رۆژی دەهەمی کە رۆژی جەژنە زۆر سوننەتێکی گەورەیە، بەتایبەتی رۆژی عەرەفە، کە نۆی مانگە. باشترین تەئویل بۆ ئەم فەرموودەیەی خاتوو عائیشە ئەوەیە، کە ئەو نەیدیوە پێغەمبەر لەم رۆژانەدا بەرِۆژووبێ، بەڵام کەسانی تر دیویانەو مەرج نییە کە ئەو نەیدیبێ ئیتر سوننەت نەبێ.

### ٤٩٠) گرتنی رۆژووی رۆژی عارفە. (٢٧٣٦ - ٢٧٤٢)

### بابٌ: صَوْمُ يَوْمِ عَرَفَةَ

٦٢٠- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ (رضى الله عنه): أن رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: كَيْفَ تَصُومُ؟ فَغَضِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) من قوله. فَلَمَّا رَأَى عُمَرُ غَضَبَهُ قَالَ: رَضِينَا بِاللَّهِ رَبًّا وَبِالإِسْلاَمِ دِينًا وَبِمُحَمَّدٍ نَبِيًّا. نَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ غَضَبِ اللَّهِ،

وَغَضَبِ رَسُولِهِ، فَجَعَلَ عُمَرُ يُرَدِّدُ هَذَا الْكَلاَمَ حَتَّى سَكَنَ غَضَبُهُ، فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: كَيْفَ بِمَنْ يَصُومُ الدَّهْرَ كُلَّهُ؟ قَالَ: « لاَ صَامَ وَلاَ أَفْطَرَ» أَوْ قَالَ: «لَمْ يَصُمْ وَلَمْ يُفْطِرْ ». قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمَيْنِ وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: « وَيُطِيقُ ذَلِكَ أَحَدٌ؟ ». قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا؟ قَالَ: « ذَاكَ صَوْمُ دَاوُدَ (عَلَيْهِ السَّلاَمُ) »، قَالَ: كَيْفَ مَنْ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمَيْنِ؟ قَالَ: « وَدِدْتُ أَنِّى طُوِّقْتُ ذَلِكَ ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ثَلاَثٌ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ، فَهَذَا صِيَامُ الدَّهْرِ كُلِّهِ، صِيَامُ يَوْمِ عَرَفَةَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِى قَبْلَهُ وَالسَّنَةَ الَّتِى بَعْدَهُ، وَصِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِى قَبْلَهُ ». {الحديث: ٢٧٣٨ = ٢٧٢٢ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٢٥. ترمذي. صوم: ٧٤٩. نسائي. صيام: ١٧١٣ تحفة: ١٢١١٧}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هاتە خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لێی پرسی: تۆ چۆن چۆنی بەرِۆژوو دەبی؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەم قسەیەی تووڕە بوو، چونکە دوور نییە کەسەر بکێشێ بۆ هەندێ کێشە، کاتێ عومەر تووڕەبوونەکەی پێغەمبەری بینی، بۆ عوزر خوایی لە خزمەت پێغەمبەردا، نەوەکوو نزای خراپ بکا، فەرمووی: خودامان بە پەروەردگاری خۆمان قەبووڵەو، ئیسلاممان بە ئایین قەبووڵەو، موحەممەدمان بە پێغەمبەر قەبووڵە، ئیتر عومەر هەر ئەم گوتەیەی دووبارە دەکردەوە، هەتا تووڕە بوونەکەی پێغەمبەر، دامردەوە، ئەوجا عومەر خۆی ئەم پرسیارەی لە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کرد: ئەی پێغەمەری خودا! دەبێ کەسێ ساڵ دوازدە مانگ بەرِۆژوو بێ، پلەو پایەی چۆن بێ، باشە یا خراپ؟ فەرمووی: (ئەوە وەك کەسێ وایە دەمی خۆی بە بەلاش بەستبێ، نە رۆژووەکەی تەواوەو نە رۆژوو شکانەکەی!). عومەر فەرمووی: ئەی ئەگەر کەسێ دوو رۆژ بەرِۆژووبێو رۆژێ بشکێنێ چۆنە؟ فەرمووی: (جا هەیە توانای ئەوەی هەبێ؟ ئەگەر بتوانێ قەیدی نییە). عومەر فەرمووی: ئەی ئەگەر کەسێ رۆژ نا رۆژێ بەرِۆژووبێ چۆنە؟ فەرمووی: (ئەوە زۆر رێكو پێكە، پێغەمبەر داوود (سڵاوی خودای لەسەر بێ) ئاوا بەرِۆژوو دەبوو). عومەر فەرمووی: ئەی ئەگەر کەسێ دوو رۆژ

بەڕۆژوو نەبێ‌و ڕۆژێ بەڕۆژوو بێ چۆنە، واتە: هەمیشە لەسێ ڕۆژ ڕۆژێ بەڕۆژووبێ چۆنە؟ فەرمووی: (خۆزگەم گەلی موسوڵمانی من بەشێوەی گشتی توانای شتی وا چاك‌و نایابیان بوایە!!).

لەپاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ڕۆژووی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێ لەگەڵ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان لەهەموو ساڵێ، ئەوە بەڕۆژوو بوونی ساڵ دوانزە مانگەیە، ئومێد دەکەم کە ڕۆژووی ڕۆژی نۆی مانگی قوربانیش، کە لەو ڕۆژەدا حاجیان وان لەکێوی عەرەفە، لەبەرئەوە پێی دەگوترێ ڕۆژی عارفە، بڕێتی گوناهی ساڵی پێش خۆی‌و ساڵی پاش خۆی بکەوێ، هەروا ئومێدم هەیە کە ڕۆژووی ڕۆژی عاشوورایش بڕێتی گوناهی ساڵی پێش خۆی بکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٥، ژمارە: ١٤٣٦، ١٤٣٧، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ١٤٣٨، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ١٤٤١، ١٤٤٢}.

**٤٩١) ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفە، بۆ کەسێ خەریکی حەج کردن بێ بڕیاری چییە؟**
**(٢٦٢٧ - ٢٦٣١)**

**بابٌ: تَرْكُ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ لِلْحَاجِّ**

٦٢١- عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ بِنْتِ الْحَارِثِ: أَنَّ نَاسًا تَمَارَوْا عِنْدَهَا يَوْمَ عَرَفَةَ فِي صِيَامِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). فَقَالَ بَعْضُهُمْ: هُوَ صَائِمٌ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لَيْسَ بِصَائِمٍ، فَأَرْسَلْتُ إِلَيْهِ بِقَدَحِ لَبَنٍ وَهُوَ وَاقِفٌ عَلَى بَعِيرِهِ بِعَرَفَةَ فَشَرِبَهُ. {الحديث: ٢٦٢٧ = ٢٦٠٧ فم. تجريد/٢/٢٠٦، رقم: ٧٨٨ = ١٦٥٨، ١٦٦١، ١٩٨٨، ٥٦٠٤، ٥٦١٨، ٥٦٣٦}:

ئوم فەضل (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی عارفە، کە ڕۆژی نۆهەمی مانگی قوربانە، کە حاجیان لەو ڕۆژەدا، لەچیای عەرەفە، سەرگەرمی ئەنجامدانی کردارەکانی حەجن، کۆمەڵێ لەلای من بوون، کەوتنە گومانەوە: کە ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم ڕۆژەدا، کەسەرگەرمی حەجکردنە، بە ڕۆژووە یانا؟ بازێکیان دەیانگوت بەڕۆژووە، بازێکیشیان دەیان گوت بەڕۆژوو نییە، جا منیش جامێ شیرم بۆی نارد، تا بزانین بەڕۆژووە یانا، جا حەزرەت لەوکاتەدا، بەسەر وشترەکەیەوە

بـوو، لـەكێوی عەرەفـە وەسـتابوو، شـیرەكەی وەرگـرتو خواردیـەوە، زانیمـان كـە بەڕۆژوو نییە). {تاج/٢/ ١٤٤، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ١٤٣٩}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئـوم فـەزڵ، نـاوی لوبابـەی كچـی حـاریثـە، ئـامۆژنی پێغەمبـەرە، ژنـی ئیمـامی عەبباسی كوڕی عەبدول موطەلیبە، كـە حـەق مامـەی پێغەمبـەرە، لـەپێش كۆچا ئیسلام بووە، فەرموودەی زۆری لە پێغەمبـەرەوە گێڕاوەتـەوە، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپەسـنی خـۆیو خوشـكەكانیدا دەفـەرموێ: (چـوار خوشـكە موسـوڵمانەكە: مەیموونەی كچـی حـاریـثو ئـوم فـەضـلو سەلماو ئـەسما). مەیموونـەیان هاوسـەری پێغەمبەر بوو، كە خوشكی هەقی ئوم فەضلە، جارێ خـەوێ دەبینـێ، دەیگێڕێتـەوە بۆ پێغەمبەر، عەرزی دەكا: قوربان! لەخەونمدا بینیم ئەندامێ لە ئەندامەكانی تـۆ وا لەماڵی مندا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (فاطیمەی كچم كـوڕی دەبـێ، تۆ شیری پێ دەدەی). زۆری پێ نەچوو حوسەین لەدایك بوو. گـەلێ جار پێغەمبـەر بۆ ڕێز لێنانی ئوم فەضل دەچوو بۆ ماڵی ئوم فـەضـل، كـە فـەضـلی كـوڕی ئـامۆزای پێغەمبەر بوو، ئوم فەزڵ لەپێش ئیمامی عەباسی مێردیدا، لەسەردەمی جێنشینیی عوثماندا دەمرێ، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

### ٤٩٢) جڵەوگیریی لە ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی قوربانو ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان. (٢٦٦٦ - ٢٢٧١)

### باب: النَّهْىُ عَنْ صِيَامِ يَوْمِ الأَضْحى والفِطْرِ

٦٢٢- عَنْ أَبِى عُبَيْدٍ مَوْلَى ابْنِ أَزْهَرَ قَالَ: شَهِدْتُ الْعِيدَ مَعَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ، فَجَاءَ فَصَلَّى، ثُمَّ انْصَرَفَ، فَخَطَبَ النَّاسَ فَقَالَ: إِنَّ هَذَيْنِ يَوْمَانِ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ صِيَامِهِمَا: يَوْمُ فِطْرِكُمْ مِنْ صِيَامِكُمْ، وَالآخَرُ يَوْمٌ تَأْكُلُونَ فِيهِ مِنْ نُسُكِكُمْ. {الحديث: ٢٦٦٦ = ٢٦٤٦. تجريد/ ٥، لاپەڕە: ١٣٦، رقم: ١٨٣٩ = ٥٥٧١، ١٩٩٠. أبو داود. صوم: ٢٤١٦. ترمذى. صوم: ٧٧١. تحفة الأشراف: ١٠٦٦٣، ١٠٣٣٠}:

زوهری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو عوبەیدی ئازادكراوی ئیبنو ئەزهەر، بۆیگێڕامەوە، فەرمووی: لەكاتی جێنشینی ئیمامی عومەردا، لە خزمەتیدا، ئامادەی كردنی نوێژی جەژنی قوربان بووم، لەپێش وتار خوێندنەوەدا نوێژی جەژنی بۆمان كرد، ئەوجا وتاری داو فەرمووی: ئەی موسوڵمانینە! پێغەمبەری خودا، (درودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی كردووە لە گرتنی ڕۆژووی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانو ڕۆژی جەژنی قوربان، چونكە یەكەمیان ڕۆژی جەژنی ڕۆژوو شكاندنە، ئەوی تریشیان ڕۆژی جەژنی خواردنی قوربانیەكانتانە). {بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ١٢٧، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ١٤٠٢}.

**٤٩٣) ئەو سێ ڕۆژەیش (كە لەپاش یەكەم ڕۆژی جەژنی قوربان) قوربانییان تیادەكرێ، گرتنی ڕۆژووەكەیان ناپەسەندوناباشە. (٢٦٧٢ - ٢٦٧٥)**

**باب: كَرَاهِيَة صِيَامِ أَيَّامِ التَّشْرِيقِ**

٦٢٣- عَنْ نُبَيْشَةَ الْهُذَلِيِّ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَيَّامُ التَّشْرِيقِ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ». (وَفِي رِوَايَةٍ) وذِكرٍ لله». {الحديث: ٢٦٧٢، ٢٦٧٣ = ٢٦٥٢، ٢٦٥٣ فم}:

نوبەیشەی هوزەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سێ ڕۆژەی پاش ڕۆژی یەكەمی جەژنی قوربانیش، كە ناودارن بە ئەییامو تەشریق، واتە: ڕۆژانی قوربانی سەربڕینو كردنی گۆشتەكەیان بە لەتكە گۆشت (قەدید) بە هەڵخستنی لەبەر خۆر، ئەم سێ ڕۆژەیش وەك یەكەم ڕۆژی جەژن، ڕۆژانی خواردنو خواردنەوەو یادكردنی خودای گەورەن). {تاج/٢/١٢٧، زنجیرە: ٥٣، ژمارە: ١٤٠٣}.

**ڕوونكردنەوە:**

١-نوبەیشەی كوڕی عەمری هوزەلی، لە ئەفرادی موسلیمە، لە بوخاریدا، فەرموودەی نییە، ئەم فەرموودەیە، لە خاوەنانی شەش پەڕاوە (أصحاب الكتب

الستة)كە، بەس ئیمامی موسلیم ئیخراجی کردووە، نوبەیشە چەند فەرموودەیەکی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، دەڵێن: جارێ دەچێ بۆ خزمەتی پێغەمبەر، کۆمەڵێ دیلی لادەبێ، پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! یا بەسەرانە ئازادیان بکە، یا بیکە بە شاباش‌و بەرەڵایان بکە بە خۆڕایی؟ پێغەمبەریش پێی دەفەرموێ: (پێشنیارێکی خاست کرد، کەواتە: تۆ نوبەیشە باشەی). ئیتر ناو دەرئەکا بە نوبەیشەتولخەیر.

٢ - رۆژووی چوار رۆژەی جەژنی قوربان، لەلای جەماوەری زانایان حەرام‌و نادروستە، نەك ناباش‌و ناپەسەند.

## ٤٩٤) رۆژووی رۆژی دووشەممان سوننەتە. (٢٧٣٦ - ٢٧٤٢)

## باب: صِيَامُ يَوْمِ الإِثْنَيْنِ

٦٢٤- عَنْ أَبِى قَتَادَةَ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سُئِلَ عَنْ صَوْمِ الاِثْنَيْنِ؟ فَقَالَ: « فِيهِ وُلِدْتُ، وَفِيهِ أُنْزِلَ عَلَىَّ ». {الحديث: ٢٧٤٢ = ٢٧٢٦ فم}:

ئەبو قەتادە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ گرتنی رۆژووی دووشەممە، پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بڕیاری گرتنی رۆژووی ئەم رۆژە چییە؟ فەرمووی: (من لە رۆژی دووشەممەدا لەدایك بووم‌و، هەر لەم رۆژەیشا، یەکەمجار قورئانم بۆ هات، کەواتە: ئەم رۆژە رۆژێکی پیرۆزەو شایانی ئەوەیە کە مرۆڤ تیادا بەڕۆژووبێ). {تاج/٢/١٤٧، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ١٤٤٦}.

## ٤٩٥) گرتنی رۆژووی هەینی یا شەممە بەتەنیا باش نییەو ناباشە(٢٦٧٦ - ٢٦٧٩)

## باب: كَرَاهِيَةُ صِيَامِ يَوْمِ الجُمُعَةِ مُنْفَرِداً

٦٢٥- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَصُمْ أَحَدُكُمْ يَوْمَ الْجُمُعَةِ إِلاَّ أَنْ يَصُومَ قَبْلَهُ أَوْ يَصُومَ بَعْدَهُ ». {الحديث: ٢٦٧٨ = ٢٦٥٨ فم. تجريد/٢/٢٩٧، رقم: ٩١٥، ٩١٦ = ١٩٨٤، ١٩٨٦ فتح}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کەس لەئێوە بەتایبەتی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی بەتەنیا نەگرێ، مەگەر لەپێشیەوە یا لەپاشیەوە، ڕۆژێکی تری لەگەڵدا بگرێ). {تاج/٢/١٢٩، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ١٤٠٨}.

٦٢٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَخْتَصُّوا لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ بِقِيَامٍ مِنْ بَيْنِ اللَّيَالِى، وَلاَ تَخُصُّوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ بِصِيَامٍ مِنْ بَيْنِ الأَيَّامِ، إِلاَّ أَنْ يَكُونَ فِى صَوْمٍ يَصُومُهُ أَحَدُكُمْ ». {الحديث: ٢٦٧٩ = ٢٦٥٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەتایبەتی بەتەنیا شەوی هەینی هەڵ مەسن بۆ شەو نوێژ، هەروا بەتایبەتی ڕۆژووی ڕۆژی هەینی، لەناو ڕۆژانی هەفتەدا، بەتەنیا مەگرن، مەگەر واڕێ بکەوێ کە سەرەی ڕۆژووی خۆی بێ، وەك ڕۆژ نارۆژێ بەڕۆژووبێ، یا نەزرێکی کردبێ، ئەوە قەیناکا).

## ٤٩٦) گرتنی سێ ڕۆژ لەهەموو مانگێ سوننەتە. (٢٧٣٦ – ٢٧٤٢)

## باب: صَوْمُ ثَلاَثَةِ أيام مِن كُلِّ شَهْرٍ

٦٢٧- عَنْ مُعَاذَةَ الْعَدَوِيَّةِ أَنَّهَا قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): أَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصُومُ مِنْ كُلِّ شَهْرٍ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ؟ قَالَتْ: نَعَمْ. فَقُلْتُ لَهَا: مِنْ أَىِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ كَانَ يَصُومُ؟ قَالَتْ: لَمْ يَكُنْ يُبَالِى مِنْ أَىِّ أَيَّامِ الشَّهْرِ يَصُومُ. {الحديث: ٢٧٣٦ = ٢٧٢٠ فم. أبو داود. صوم: ٢٤٥٣. ترمذى. صوم: ٧٦٣. ابن ماجة. صيام: ١٧٠٩. تحفة الأشراف: ١٧٩٦٦}:

موعازەی عەدەوییە (خودای لێ رازی بێ) بە عائیشەی دایکی بڕوادارانی فەرموو: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کردبووی بە یاساو دەستوور، کە لەهەموو مانگێ سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بێ؟ فەرمووی: ئا، فەرمووی پێشیم گوت لە کوێی مانگەوە بەڕۆژوو دەبوو؟ فەرمووی: دەربەستی ئەوە نەبوو کە چ ڕۆژێ لەمانگ بەڕۆژووبێ، بۆ ئەمە جیاوازی لەنێوانی سەرەتای مانگو ناوەڕاستی مانگو کۆتایی مانگ نەدەکرد. {تاج/٢/١٤٥، زنجیرە: ٦٧، ژمارە: ١٤٤٤}.

## ٤٩٧) ڕۆژووی بەردەوام ناپەسەندە. (٢٧٢١ - ٢٧٣٥)
## باب: كراهيَةُ سَرْدِ الصَّوْمِ

٦٢٨- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بن العاص قَالَ: بَلَغَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّى أَسْرُدُ الصَّوْمَ وَأُصَلِّى اللَّيْلَ، فَإِمَّا أَرْسَلَ إِلَيَّ، وَإِمَّا لَقِيتُهُ، فَقَالَ: « أَلَمْ أُخْبَرْ أَنَّكَ تَصُومُ وَلاَ تُفْطِرُ وَتُصَلِّى اللَّيْلَ؟ فَلاَ تَفْعَلْ، فَإِنَّ لِعَيْنِكَ حَظًّا، وَلِنَفْسِكَ حَظًّا، وَلأَهْلِكَ حَظًّا، فَصُمْ وَأَفْطِرْ، وَصَلِّ وَنَمْ، وَصُمْ مِنْ كُلِّ عَشْرَةِ أَيَّامٍ يَوْمًا، وَلَكَ أَجْرُ تِسْعَةٍ »، قَالَ: إِنِّى أَجِدُنِى أَقْوَى مِنْ ذَلِكَ يَا نَبِيَّ اللَّهِ! قَالَ: « فَصُمْ صِيَامَ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ »، قَالَ: وَكَيْفَ كَانَ دَاوُدُ يَصُومُ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟! قَالَ: « كَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا، وَلاَ يَفِرُّ إِذَا لاَقَى »، قَالَ: مَنْ لِي بِهَذِهِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ؟ قَالَ عَطَاءٌ: فَلاَ أَدْرِي كَيْفَ ذَكَرَ صِيَامَ الأَبَدِ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ. لاَ صَامَ مَنْ صَامَ الأَبَدَ». {الحديث: ٢٧٢٦ = ٢٧١٠ فم. تجريد البخاري/٢/٢٩٣، رقم: ٩١٢ = ١٩٧٥، ١١٣١، ١١٥٢، ١١٥٣، ١٩٧٤، ١٩٧٦، ١٩٧٧، ١٩٧٨، ١٩٧٩، ١٩٨٠، ٣٤١٨، ٣٤١٩، ٣٤٢٠، ٥٠٥٢، ٥٠٥٣، ٥٠٥٤، ٥١٩٩، ٦١٣٤، ٦٢٧٧ + تجريد/١/٥٤٢، رقم: ٥٦٤. ترمذي. صوم: ٧٦٨. نسائي. صيام: ٢٣٩٦. تحفة الأشراف: ٦٦٣٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆی و باوکی) فەرمووی: عەرزی حەزرەتیان کردبوو کەمن بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبم و بە شەویش هەر شەو نوێژ دەکەم، جایا ناردی بەشوێنما، یا بە خزمەتی گەیشتم، فەرمووی: (ئایا وایە، گوایە تۆ دەڵێی بەردەوام هەر بەڕۆژوو دەبم و ڕۆژێکی لێ ناخۆم و بە شەویش ناخەوم هەر شەو نوێژ دەکەم؟). گوتم: بەڵێ گوتوومە. فەرمووی: (شتی وا مەکە، چونکە چاوەکانت مافیان هەیە لەسەر تۆ، کە بەشی خۆیان بخەون، تا کزو کوێر نەبن بەهۆی شەو نوخوونی زۆرەوە، دەروونت مافی حەوانەوەی هەیە لەسەر تۆ، وە خێزانەکەت هەقی هەیە لەسەر تۆ، وەخۆت مافو هەقت هەیە لەسەر خۆت، جا دەبێ موراعاتی حاڵی ئەمانە بکەی، کەواتە: ناوبەناو بەڕۆژووبەو ناوبەناویش بەڕۆژوومەبە، ناوبەناویش بە شەو، شەو نوێژبکەو ناوبەناویش بەشی خۆت بخەوە، لە دە ڕۆژ ڕۆژێ بەڕۆژووبە، خێری گرتنی نۆ ڕۆژەکەی تریشت بۆ حسێب

دەكرێ). عەبدوڵڵا فەرمووی: قوربان! ئەی پێغەمەری خودا! توانای زیاترم هەیە، كەواتە بۆم زیاتر بكە؟ فەرمووی: (دە تۆش وەك داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەڕۆژووبە). عەبدوڵڵا عەرزی دەكا: ئەی پێغەمەری خودا! داوود پێغەمبەر چۆن ڕۆژووی سوننەتی دەگرت؟ فەرمووی: (داوود ڕۆژ نارۆژێ بەڕۆژوو دەبوو، كاتێكیش لەكاتی شەڕدا، بەرەنگاری لەشكری دوژمن دەبوو، لەبەری هەڵ نەدەهاتو شێرانە دەجەنگی لەگەڵیانا).

عەبدوڵڵا فەرمووی: قوربان! جا شتی وانایاب دەست كێ دەكەوێ! عەطاء كە ئەم فەرموودەیە لە ئەبولعەبباسەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش لە عەبدوڵڵای كوڕی عەمرەوە دەیگێڕێتەوە، عەطاء دەفەرموێ: نازانم ئەبول عەبباس باسی ڕۆژووی ساڵ دوانزە مانگەی چۆن گێڕایەوە، لەم بارەیەوە تەنیا ئەمەم لەبەرماوە كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دووجار لەسەر یەك دەفەرموێ: (ڕۆژووی ئەو كەسە گیرانەبێ كە ساڵ دوانزە مانگە بەڕۆژوو دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ١٤٥٢ + زنجیرە: ٧٠، ژمارە: ١٤٥٠، ١٤٥١}.

**٤٩٨) باشترین ڕۆژوو ئەوەیە، كە وەك حەزرەتی داوود پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مرۆڤ ڕۆژنا ڕۆژێ بەڕۆژوو بیت. (٢٧٢١ - ٢٧٣٥)**

٦٢٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ أَحَبَّ الصِّيَامِ إِلَى اللَّهِ صِيَامُ دَاوُدَ، وَأَحَبَّ الصَّلاَةِ إِلَى اللَّهِ صَلاَةُ دَاوُدَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ، كَانَ يَنَامُ نِصْفَ اللَّيْلِ، وَيَقُومُ ثُلُثَهُ، وَيَنَامُ سُدُسَهُ، وَكَانَ يَصُومُ يَوْمًا وَيُفْطِرُ يَوْمًا ». {الحديث: ٢٧٣١ = ٢٧١٥ فـم. تجريد/٢/٥٤٢، رقم: ٥٦٤. راجع رقم: ٦٢٨ لمعرفة أطرافه. أبو داود. صوم: ٢٤٤٨. نسائى. قيام الليل: ١٦٢٩. تحفة الأشراف: ٨٨٩٧}:

عەبدوڵڵای كوڕی عەمری كوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پەسەندترین ڕۆژوو ئەو ڕۆژووەیە، كە لەسەر دەستووری داوود پێغەمبەر بێ، (دروودی خودای لەسەر بێ)، وە هەروەها نوێژی شەو نوێژیش، یاسای

داوود پێغەمبەریش بۆ شەونوێژ ئاوا بوو: نیوەی شەو دەخەوت، سێیەکی شەویش شەو نوێژی دەکرد، ئەمە دەکاتە پێنج بەش لە شەش بەش، وە ئەو شەشیەکەی تریشی دەخەوتەوە! وە رۆژ نارۆژێکیش بەڕۆژوو دەبوو). {تاج/١/٤٩٤، ج/١ = ج/٤، زنجیرە: ١٨١، ژمارە: ٩٧٣}.

**٤٩٩) کەسێ رۆژووی سوننەت بگرێ بۆی هەیە بیشکێنێ. (٢٧٠٧ - ٢٧٠٨)**

**باب: مَنْ يُصْبِحُ صَائِماً مُتَطَوِّعاً ثُمَّ يُفْطِرُ**

٦٣٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) ذَاتَ يَوْمٍ فَقَالَ: « هَلْ عِنْدَكُمْ شَيْءٌ؟ ». فَقُلْنَا: لاَ. قَالَ: « فَإِنِّى إِذًا صَائِمٌ »، ثُمَّ أَتَانَا يَوْمًا آخَرَ، فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُهْدِىَ لَنَا حَيْسٌ فَقَالَ: « أَرِينِيهِ، فَلَقَدْ أَصْبَحْتُ صَائِمًا »، فَأَكَلَ. {الحديث: ٢٧٠٨ = ٢٦٩٠ فم}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: رۆژێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، فەرمووی: (ئایا شتێ هەیە لەلاتان کە بیخۆم؟) عەرزمان کرد: هیچ نییە. جا فەرمووی: (کەوایە رۆژووەکەم ناشکێنم). لەپاشا رۆژێ تر تەشریفی هات بۆلامان، عەرزمان کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! کەشك بە خورماو رۆنمان هەیە، بەدیاری بۆمان هاتووە، ئایا ئەفەرمووی کە لێی بخۆیت؟ فەرمووی: (ئادەی پیشانمی بدە، خۆمن ئەمڕۆ بەڕۆژووشم) کە بۆیمان هێنا نۆشی کرد).

**پوختەی بڕیارە شەرعییەکانی نامەی رۆژوو:**

١ رۆژوو روکنی چوارەمە لە پێنج روکنەی ئیسلامو فەرزێکە لە فەرزە گرنگە ئایینییەکانو رێزو پاداشێکی گەورەی هەیە.

٣ رێزو گەورەیی مانگی رەمەزان.

٤ پارشێو سوننەتە، هەتا دوابخرێ خێرترە.

٥ لەگەڵ شەبەقی بەیانا رۆژوو دەست پێ دەکا.

٦ - ڕۆژوو دانەدەم ڕۆژوو باش نییە، واتە: ویصال ناباشە.

٧ - لە سەفەردا، دەتوانی بەڕۆژووبی، دەتوانی بیشکێنی.

٨ - ڕۆژووی ڕەمەزان دەبێ قەزا بکرێتەوە بەمەرجی خۆی.

٩ کەسێ بمرێو ڕۆژووی لەسەربێ، کەسوکاری دەتوانن بۆی بگێڕنەوە، دەتوانن حەجیشی بۆ بکەن.

١٠ -ڕۆژووی سوننەت جۆرو بۆنەی زۆری هەیە.

١١ - ڕۆژووی عاشوورا سوننەتە.

١٢ -ڕۆژووی شەش ڕۆژ لە مانگی شەشەڵان سوننەتە.

١٣ -ڕۆژووی نۆی مانگی قوربان، بۆ غەیری حاجی لەکاتی حەجدا، سوننەتە.

١٤ - ڕۆژووی ڕۆژەکانی دوو جەژنەکە دانامەزرێو حەرامە.

١٥ -ڕۆژووی دوو شەممەو پێنج شەممە سوننەتە.

١٦ -بەتەنها ڕۆژی هەینی بەڕۆژوو بوون باش نییە.

١٧ -کەسێ ڕۆژووی سوننەت بگرێ دەتوانێ بیشکێنێ.

١٨ -ڕۆژووی سوننەت بۆ ڕەگەزی مێ، ئەگەر مێردی هەبێو لەگەڵیابێ، بەبێ ڕەزابوونی مێردەکەی ناباشە، بەڵام دادەمەزرێ.

١٩ -بۆ ژنی مێردار ڕۆژووی فەرزو ڕۆژووی نەزرو ڕۆژووی قەزا، پێویستی بە ڕەزابوونی مێرد نییە.

٢٠ -ڕۆژووی شەو حەرامە.

٢١ -هەموو مانگێ گرتنی سێ ڕۆژ سوننەتە.

٢٢ -لەشپیسی بۆ ڕۆژوو بایەخی نییەو ڕۆژووی پێ ناشکێ.

٢٣ -خواردنو خواردنەوەو چوونە لای ژنو هەروا خۆرەحەتکردنو چوونە لای ئاژەڵو مرۆڤ، چی بەپێش چی بەپاش ڕۆژوو بەتاڵ ئەکاتەوە، بکەرو بدەر ئەگەر بەڕۆژووبن، ڕۆژووی هەردوولایان بە جیماع بەتاڵە، کەفارەتیشیان دەکەوێتە سەر. لەم جۆرە شتانەدا لەبیر نەبوون کاریگەری هەیە.



# ٤- نامەی خەڵوەکێشان

{بڕوانە: تاجول ئوصول. بەرگی/٢، زنجیرە: ٧٤ هەتا ٧٧ لە ژمارە: ١٤٥٩ — ١٤٦٩ + تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٢، زنجیرە: ٣٨ — نامەی خەڵوەکێشان لە ژمارە: ٩٢٧ هەتا ژمارە: ٩٣٢ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم لاپەڕە: ٣٨٤ زنجیرە: ١٥٧ + ریاض/٣، لاپەڕە: ١٨٥، زنجیرە: ٢٣٣، ژمارە: ١٢٦٨، ١٢٦٩، ١٢٧٠}.

## ٥٠٠) باب: مَتَى يَدْخُلُ مَنْ أَرَادَ الإعتِكَافَ مُعْتَكَفَهُ؟

٦٣١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا أَرَادَ أَنْ يَعْتَكِفَ صَلَّى الْفَجْرَ ثُمَّ دَخَلَ مُعْتَكَفَهُ، وَإِنَّهُ أَمَرَ بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، أَرَادَ الاِعْتِكَافَ فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ، فَأَمَرَتْ زَيْنَبُ بِخِبَائِهَا فَضُرِبَ، وَأَمَرَ غَيْرُهَا مِنْ أَزْوَاجِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) بِخِبَائِهِ فَضُرِبَ، فَلَمَّا صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْفَجْرَ، نَظَرَ فَإِذَا الأَخْبِيَةُ، فَقَالَ: « آلْبِرَّ تُرِدْنَ؟ ». فَأَمَرَ بِخِبَائِهِ فَقُوِّضَ، وَتَرَكَ الاِعْتِكَافَ فِى شَهْرِ رَمَضَانَ، حَتَّى اعْتَكَفَ فِى الْعَشْرِ الأَوَّلِ مِنْ شَوَّالٍ. {الحديث: ٢٧٧٧ = ٢٧٦١ فم. تجريد/٢، لاپەڕە: ٣٠٧، زنجیرە: ٣٨، رقم: ٢٠٢٩، ٢٠٣٣، ٢٠٣٤، ٢٠٤١، ٢٠٤٥. أبو داود. صوم: ٢٤٦٤. ترمذى. صوم: ٧٩١. نسائى. مساجد: ٧٠٨}:

عائیشە (خودای لێ رازی بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەستووری وابوو، کە دەیویست خەڵوە بکێشێ، لە مزگەوتا، نوێژی بەیانی دەکردو دەچووە ناو خەڵوەخانەکەیەوە، جارێکیان لەدەی دوایی رەمەزاندا ویستی خەڵوەبکێشێ، جا فەرمانی کرد چاتۆڵەکەیان لەناو مزگەوتا بۆ هەڵدا، زەینەبی خێزانیشی گاڵیدا چاتۆڵەکەی خۆیان بۆ هەڵدا، ژنەکانی تریشی هەروا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە نوێژی بەیانی کرد چاتۆڵەکانی بینی، ناو مزگەوتەکەیان داگیرکردبوو، جا فەرمووی: (ئایا مەبەستتان کردنی کردەوەی چاکەیە، یا بۆ چاو لێکەرییەو هیچی تر؟ ئەنجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی کرد چاتۆڵەکەی ئەویان خستو

لایان برد، وە لەو ڕەمەزانەدا خەڵوەی نەکێشا، وە لەدەی یەکەمی مانگی شەشەڵانا خەڵوەی کێشا). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٦، ژمارە: ١٤٦١}.

## ٥٠١) خەڵوەکێشان لەدەی یەکەمو لەدەی ناوەڕاستی مانگی ڕەمەزانا.
(٢٧٥٣ - ٢٧٧١)

### باب: إعْتِكَافُ العَشْرِ الأوَّلِ، وَالعَشْرِ الأوْسَطِ

٦٣٢- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الأَوَّلَ مِنْ رَمَضَانَ، ثُمَّ اعْتَكَفَ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ فِى قُبَّةٍ تُرْكِيَّةٍ عَلَى سُدَّتِهَا حَصِيرٌ. قَالَ: فَأَخَذَ الْحَصِيرَ بِيَدِهِ فَنَحَّاهَا فِى نَاحِيَةِ الْقُبَّةِ، ثُمَّ أَطْلَعَ رَأْسَهُ، فَكَلَّمَ النَّاسَ، فَدَنَوْا مِنْهُ، فَقَالَ: « إِنِّى اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الأَوَّلَ، أَلْتَمِسُ هَذِهِ اللَّيْلَةَ، ثُمَّ اعْتَكَفْتُ الْعَشْرَ الأَوْسَطَ، ثُمَّ أُتِيتُ فَقِيلَ لِى: إِنَّهَا فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَمَنْ أَحَبَّ مِنْكُمْ أَنْ يَعْتَكِفَ، فَلْيَعْتَكِفْ »، فَاعْتَكَفَ النَّاسُ مَعَهُ، قَالَ: « وَإِنِّى أُرِيتُهَا لَيْلَةَ وِتْرٍ، وَأَنِّى أَسْجُدُ صَبِيحَتَهَا فِى طِينٍ وَمَاءٍ ». فَأَصْبَحَ مِنْ لَيْلَةِ إِحْدَى وَعِشْرِينَ، وَقَدْ قَامَ إِلَى الصُّبْحِ، فَمَطَرَتِ السَّمَاءُ، فَوَكَفَ الْمَسْجِدُ، فَأَبْصَرْتُ الطِّينَ وَالْمَاءَ، فَخَرَجَ حِينَ فَرَغَ مِنْ صَلاَةِ الصُّبْحِ، وَجَبِينُهُ وَرَوْثَةُ أَنْفِهِ فِيهِمَا الطِّينُ وَالْمَاءُ، وَإِذَا هِىَ لَيْلَةُ إِحْدَى وَعِشْرِينَ مِنَ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ. {الحديث: ٢٧٦٣ = ٢٧٤٧ فم. تجريد البخاري/٢/٣٠٤، رقم: ٩٢٣ = ٢٠١٦، ٦٦٩، ٨١٣، ٨٣٦، ٢٠١٨، ٢٠٢٧، ٢٠٣٦، ٢٠٤٠. أبو داود. صلاة: ٨٩٤، ٨٩٥، ٩١١. نسائي. تطبيق: ١٠٩٤. تحفة الأشراف: ٤٤١٩}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دە شەوی یەکەمی ڕەمەزاندا، لە مزگەوت خەڵوەی کێشا، لەپاشا لە دە شەوی ناوەڕاستیشا خەڵوەی کێشا، لەناو چاتۆڵەیەکی لباد دا بوو، حەسیرێك پەردەی دەرگاکەی بوو، فەرمووی: جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی، حەسیرەکەی هەلگرتو لە گۆشەیەکی چاتۆڵەکەوە دووری خستەوە، ئینجا، لە دەرگای چاتۆڵەکەوە سەری کێشاو قسەی لەگەڵ خەلکەکە کرد، ئەوانیش لێی نزیك بوونەوە، فەرمووی: (مـن کە لەدەی یەکەما خەڵوەم کێشا منەیی شەوی

لەیلەتولقەدرم دەرکردو بۆ ئەو شەوە دەگەڕام، هەروەها لەدەی ناوەڕاستیشدا، کەچی جوبرائیل هات بۆلامو فەرمووی: کە ئەو شەوە لەدەی دوایی دایە، کەواتە هەر کەسەتان حەزدەکەن کە ئەم دە شەوەی دواییەیش خەڵوە بکێشن ئەوا بابیکێشن). ئیتر مەردومەکەش لەگەڵ پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) ئەو دە شەوەی تریش خەڵوەیان کێشایەوە لەناو مزگەوتا. فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (وە لە خەوما نیشانم درا کە شەوی بەڕێز (لەیلەتولقەدر) شەوێکی تاك دەبێ، وە لە بەیانییەکەیدا کوڕنووش لەناو قوڕاوو باراناودا دەبەم، جا وارێکەوت شەوی بیستو یەك باران باری، مزگەوتەکە دلۆپەی کرد، بەچاوی خۆم ئاوو قوڕاوەکەم دی، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە لەنوێژی بەیانی بووەوە، چووە دەرەوە تەوێڵو سەری لووتی ئاوو قوڕیان پێوە بوو، وە خەوەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هاتەدی، جا کە تەماشامان کرد ئەو شەوە شەوی بیستو یەك بوو، لە دە شەوی دوایی رەمەزان). {تاج/٢/١٢٤، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ١٣٩٨ ج/٤}.

## ٥٠٢) خەڵوەکێشان لەدەی دوایی مانگی رەمەزانا. (٢٧٧٢ - ٢٧٧٨)
## باب: إعْتِكَافُ الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ

٦٣٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَعْتَكِفُ الْعَشْرَ الأَوَاخِرَ مِنْ رَمَضَانَ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ، ثُمَّ اعْتَكَفَ أَزْوَاجُهُ مِنْ بَعْدِهِ. {الحديث: ٢٧٧٦ = ٢٧٦٠ فم. تجريد/٢/٣٠٧، رقم: ٩٢٧ = ٢٠٢٦. أبو داود. صوم: ٢٤٦٢. تحفة الأشراف: ١٦٥٣٨}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) لە ژیانیدا، کردبووی بە دەستوور، لەدەی دوایی رەمەزانا، لەناو مزگەوتا خەڵوەی دەکێشا، هەتا ئەو کاتەی خودا بردیەوە بۆلای خۆی ئەمەی تەرك نەکرد. بۆیە لەپاش خۆشی ژنەکانیشی لە مزگەوتا خەڵوە دەکێشن). {تاج/٢/١٥٤، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ١٤٥٩ ج/٤}.

**٥٠٣) خۆماندوو كردن بەخودا پەرستييەوە لەدەی دوايی مانگی رەمەزاندا.**

**(٢٧٧٩ - ٢٧٨٠) باب: الإجْتِهَادُ فِي العَشْرِ الأوَاخِرِ**

٦٣٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا دَخَلَ الْعَشْرُ، أَحْيَا اللَّيْلَ وَأَيْقَظَ أَهْلَهُ، وَجَدَّ، وَشَدَّ الْمِئْزَرَ. {الحديث: ٢٧٧٩ = ٢٧٦٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٩٢٦ = ٢٠٢٤. أبو داود. صلاة: ١٣٧٦. نسائى. قيام الليل: ١٦٣٨}:

عائيشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە هاوسەرەكانی بێ) فەرمووی: دەستووری پێغەمبەر وابوو، كەدەی دوايی رەمەزان دەهات، خۆی گورج دەكردەوە بۆ خواپەرستیو، بەشەو نوێژو دەوری قورئانو يادی خودا، زوربەی شەوی خۆيی ئاوەدان دەكردەوە، وە كەسوكاری خۆشی خەبەر دەكردەوە بۆ هەمان مەبەست). {تاج/٢، زنجيرە: ٥١، ژمارە: ١٣٩٣، رياض/١، زنجيرە: ١١، ژمارە: ٩٩ + تەجريدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/١، ژمارە: ٦، لاپەڕە: ٢٠}.

**٥٠٤) لەدەی دوايی رەمەزاندا گەڕان بۆ شەوی لەيلەتولقەدر دەست پێ دەكا.**

**(٢٧٥٧ - ٢٧٥٢) باب: في ليلة القدر وَتحرّيها في العَشْرِ الأوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ**

٦٣٥- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الْتَمِسُوهَا فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ - يَعْنِى لَيْلَةَ الْقَدْرِ - فَإِنْ ضَعُفَ أَحَدُكُمْ أَوْ عَجَزَ فَلاَ يُغْلَبَنَّ عَلَى السَّبْعِ الْبَوَاقِى ». {الحديث: ٢٧٥٧ = ٢٧٤١ فم}:

ئيبنو عومەر (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لە شەوەكانی دەی دوايی رەمەزاندا بگەڕێن بۆ شەوی لەيلەتولقەدر، بەتايبەتی لە شەوی بيستو يەكو بيستو سێو بيستو پێنجو بيستو حەوتدا، ئەگەر بێ هێز بوون يا بۆتان نەكرا ئەم دە شەوە ئاوەدان بكەنەوە ئەوا حەوت شەوەكەی هەرە دوايی لەكيس خۆتان مەدەن).

### ٥٠٥) شەوی لەیلەتولقەدر شەوی بیستو یەکی مانگە.

لە ژمارە (٦٣٢)دا رابورد، فەرموودەکەی ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ).

### ٥٠٦) شەوی لەیلەتولقەدر شەوی بیستو سێیە. (٢٧٥٣ - ٢٧٧١)
### باب: ليلة القدر ليلة ثلاث وَعِشْرِينَ

٦٣٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أُنَيْسٍ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « أُرِيتُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ ثُمَّ أُنْسِيتُهَا، وَأَرَانِى صُبْحَهَا أَسْجُدُ فِى مَاءٍ وَطِينٍ »، قَالَ: فَمُطِرْنَا لَيْلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ، فَصَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَانْصَرَفَ وَإِنَّ أَثَرَ الْمَاءِ وَالطِّينِ عَلَى جَبْهَتِهِ وَأَنْفِهِ. قَالَ: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُنَيْسٍ يَقُولُ: ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ. {الحديث: ٢٧٦٧ = ٢٧٥١ فم} :

عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (شەوی لەیلەتولقەدریان پێ گوتم، بەڵام لەپاشا لەبیریان بردمەوە، وە لەخەونا دیتم کە نوێژی بەیانی ئەو شەوە دەکەم، لەناو ئاوو قوڕدا کوڕنووش دەبەم).

فەرمووی: جا لەشەوی بیستو سێدا باران باری، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژیی نوێژی بەیانی بۆمان کردو گەڕایەوە، تەماشامان کرد کە شوێنەواری ئاوو قوڕاو بە تەوێڵیو بە لووتیەوە دیاربوو، کە ئەوە چەسپاندی کە خەونەکەی پێغەمبەر هاتۆتەدیو شەوی لەیلەتولقەدری ئەو ساڵە شەوی بیستو سێ بووە!

بوسری کوڕی سەعید دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس، لەجیاتی (لَيْلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ) دەیفەرموو: (ثَلاَثَ وعِشْرِينَ).

**روونکردنەوە:**

١ -خەونەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتنە دییەکەی لە شەوی بیستو سێ دا، بەڵگەی ئەوەیە کە شەوی لەیلەتولقەدر بیستو سێ بووە.

٢ - خوێندنەوەی (ثەلاثە وە عیشرینە) یا (ثەلاثین وە عیشرینە) بابەتێکی نەحوییە، پەیوەندی بە رێزمانی عەرەبییەوە هەیە، کە بابەتێکە لە

بابەتەکانی حەزفی موضاف، ئەگەر (ثەلاثە وە عیشرینە) بێ، لە شێوەی (وَجَاءَ رَبُّكَ)ە وایە، ئەگەر (ثَلاَثٍ وعِشرين) بێ، کە ثەلاثە مەجرووری تە نویندارێ، لەشێوەی (يُرِيدُ الآخِرَةِ) وایە، بە ژێری تێی (الآخِرَةِ) واتە: (مُطِرْنَا لَيلَةَ ثَلاَثٍ وَعِشْرِينَ).

٣ عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسی ئەنصاری صەحابەیە، یەکێ بوو لەو کۆمەڵەی کە بە فەرمانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوون بتەکانی هۆزی بەنی سەلەمەیان شکان، ئامادەی ئوحودو مەڵبەندەکان و شەڕگاکانی دوای ئوحود بووە، جارێ عەرزی حەزرەتی کرد: قوربان من لەو بیابانەی خۆم دابەزیوم، سوپاس بۆ خودا لەوێ نوێژەکانم دەکەم، بەڵام حەزدەکەم کە شەوێکم لەم مانگە پیرۆزە بۆ دیاری بکەی، هەتا بێم ئەو شەوە لەم مزگەوتەی تۆدا نوێژبکەم و خەریکی خواپەرستی بم؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) شەوی بیستو سێی رەمەزانی بۆ دیاریکرد. کاتێ ئەبو قەتادە دەمرێ، لەپاشا نزیکەی پازدە شەو، عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس نەخۆش دەکەوێ، ئوم بەنینی کچی ئەبو قەتادە دێ بۆ سەردانی عەبدوڵڵا و، لەپاشا پێی دەڵێ: (مامە! سڵاوم بگەیەنە بە باوکم!).

ئیبنو یونس دەفەرموێ: عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس بەرەو دوو قیبلەکە نوێژی کردووە. بوخاری دەفەرموێ: جا بیری کوڕی عەبدوڵڵا، مانگە رێیەکی بڕی، چوو بۆلای عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیس، بۆ وەرگرتنی یەك تاقە فەرموودە. لە فتح الباريدا لە سەرەتای شەرحی فەرموودەی ژمارە: ٧٨دا، لە كتاب العلم يدا، دەفەرموێ: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ژنەوتم کە پیاوێ هەیە فەرموودەیەکی لەلاهەیە، کە لە پێغەمبەری بیستووە، جا وشترێکم کڕی و تفاقی سەفەرم خست، یەك مانگ بەڕێوە بووم، هەتا گەیشتمە لای لەشام، کە تەماشام کرد ئەو پیاوە عەبدوڵڵای کوڕی ئونەیسە، بەدەرکەوانەکەیم گوت: پێی بڵێ کە جابیر وا لەدەرگا، داوای ئەوە دەکات کە بتبینێ، گوتی: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا؟ گوتم: بەڵێ. جا هاتە دەرەوە دەستی کردە ملم، جا پێم گوت: بیستوومە

كـه فەرموودەيـەكى پێغەمبـەرت والـەلا، كـە لـە پێغەمبـەرت بيسـتووە، مەترسـيم هـەبوو كـە لـەپێش ئـەوەدا ئـەو فەرموودەيـە لـەتۆ ببيسـتم بمـرم، بۆيـە هـاتووم. ئەويش فەرموودەكەى گێڕايەوە بۆى، فەرمووى: بيستم لە پێغەمبەر دەيفەرموو: « يُحْشَرُ اللهُ النَّاسُ يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ حُفَـاةً عُـرَاةً غُـرْلاً ». قُلْـتُ يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ النِّسَـاءُ وَالرِّجَالُ جَمِيعًا يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ قَالَ -صلى الله عليه وسلم- « يَـا عَائِشَـةُ الأَمْـرُ أَشَدُّ مِنْ أَنْ يَنْظُرَ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ ». سالّى پەنجاو چوارى كۆچى لەشام دەمـرىّ، (رەزاو رەحمەتى خوداى لىّ بىّ).

### ٥٠٧) لەشەوانى بيستو دوو وبيستو چوارو بيستو شەشدا، بۆ شەوى لەيلەتولقەدر بگەڕێن. (٢٧٥٣ - ٢٧٧١)

### بابٌ: التَمِسُوهَا فِي التَّاسِعَةِ وَالسَّابِعَةِ وَالخَامِسَةِ

٦٣٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: اعْتَكَفَ رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) الْعَشْرَ الأَوْسَطَ مِنْ رَمَضَانَ يَلْتَمِسُ لَيْلَةَ الْقَدْرِ قَبْلَ أَنْ تُبَانَ لَهُ، فَلَمَّا انْقَضَـيْنَ أَمَرَ بِالْبِنَاءِ فَقُوِّضَ، ثُمَّ أُبِينَتْ لَهُ أَنَّهَا فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، فَأَمَرَ بِالْبِنَـاءِ فَأُعِيـدَ، ثُـمَّ خَـرَجَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّهَا كَانَتْ أُبِينَتْ لِى لَيْلَةُ الْقَدْرِ، وَإِنِّى خَرَجْتُ لأُخْبِرَكُمْ بِهَا، فَجَاءَ رَجُلاَنِ يَحْتَقَّانِ مَعَهُمَا الشَّيْطَانُ فَنُسِّيتُهَا، فَالْتَمِسُوهَا فِـى الْعَشْـرِ الأَوَاخِـرِ مِـنْ رَمَضَانَ، الْتَمِسُوهَا فِى التَّاسِعَةِ، وَالسَّابِعَةِ، وَالْخَامِسَةِ ». قَالَ: قُلْتُ: يَـا أَبَـا سَـعِيدٍ إِنَّكُـمْ أَعْلَمُ بِالْعَدَدِ مِنَّا، قَالَ: أَجَلْ نَحْنُ أَحَقُّ بِـذَلِكَ مِـنْكُمْ، قَـالَ: قُلْـتُ: مَـا التَّاسِـعَةُ وَالسَّـابِعَةُ وَالْخَامِسَةُ؟ قَالَ: إِذَا مَضَتْ وَاحِدَةٌ وَعِشْرُونَ، فَالَّتِى تَلِيهَا ثِنْتَيْنِ وَعِشْرِينَ، فَهْـىَ التَّاسِـعَةُ. فَإِذَا مَضَتْ ثَلاَثٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِى تَلِيهَا السَّابِعَةُ، فَإِذَا مَضَى خَمْسٌ وَعِشْرُونَ فَالَّتِى تَلِيهَـا الْخَامِسَةُ. {الحديث: ٢٧٦٦ = ٢٧٥٠ فم}:

ئەبو سەعيدى خورى (رەزاى خوداى لىّ بىّ) فەرمووى: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بىّ) لـەناو مزگـەوتا خانۆچـكەيەكى دروسـت كـردو، لـەدەى ناوەڕاسـتى رەمـەزانا، خـەلّوەى تياكێشا، بۆ شەوى لەيلەتولقەدر دەگەڕا، بەلّكوو رێى تێى بكـەوىّو بـەخوا پەرسـتى ئاوەدانى بكاتەوە، ئەمەيش بەرلەوە بوو، كە ئەم شـەوەى بـۆ ديـارى بكـرىّ، جا كە

دەشەوەکە تەواو بوو، فەرمانی کرد خەڵوەگاکەیان تێکدا، ئەوجا بۆی دیاریکرا، کە شەوی لەیلەتولقەدر دەکەوێتە دەی دوایی مانگەوە، جا فەرمانی کرد خانۆچکە (خەڵوەخانە)کەیان لەناو مزگەوتا دروست کردەوە بۆی، لەپاشا چووە دەرەوە بۆ ناو خەڵکەکەو فەرمووی: (ئەی موسوڵمانینە! شەوی لەیلەتولقەدرم بۆ دیاری کرا، جا دەرچووم کە ئەم هەواڵەتان پێ بڵێم، لەوکاتەدا دوو زەلام پەیدا بوون، کردیان بەدەمە قاڵێ، هەرکەسەیان لافی ئەوەی لێ دەدا کە خۆی لەسەر هەقە، شەیتانیشیان لەگەڵدا بوو، وەك پیشەی هەمیشەی خۆی، دەیویست ئاگری ئاژاوەکە خۆش بکا، ئیتر بەهۆی ئەم بارە ناهەموارەوە، ئەم هەواڵەم لەبیر برایەوە! جا بگەڕێن بۆ ئەم شەوە بەرێزە لەدەی دوایی رەمەزانا، بەتایبەتی لە نۆهەمو لە حەوتەمو لە پێنج هەما).

راوی دەفەرموێ: گوتم: ئەی ئەبو سەعید! ئێوە لە ئێمە باشتر لەم جۆرە ژمارەیە دەزانن، فەرمووی: بەڵێ چۆن دەڵێی وایە. فەرمووی پێم گوت: کەواتە مەبەست لە نۆهەمو حەوتهەمو پێنجهەم لەم فەرموودەیەدا چییە؟ فەرمووی: کە شەوی بیستو یەك رۆیشت، شەوی بیستو دوو دێت، ئەوە نۆهەمە، چونکە ئەگەر مانگ سیی تەواو بێ نۆ شەوی ماوە، بۆیە پێی دەڵێن نۆهەم، کە شەوی بیستو سێ رۆیشت، لەدوایەوە شەوی بیستو چوار دێت، کە شەوی حەوتەمە، کە شەوی بیستو پێنج رۆیشت لەدوایەوە شەوی بیستو شەش دێت، کە شەوی پێنجەمە، چونکە ئەگەر مانگ سیی تەواو بێ پێنج شەوی دەمێنێ!).

**روونکردنەوە:**

راجیاییەکی زۆر هەیە لەبارەی شەوی لەیلەتولقەدرەوە هەندێ دەفەرموێ:

١ -دوورنییە، کە هەر شەوێ بگری لە ساڵ، ئەو شەوە خۆی بێو لەیلەتولقەدر بێو، لەسەر ئەم فەرمایشتە شەوی لەیلەتولقەدر، تایبەت نییە بە مانگی رەمەزانەوە، کەواتە هەموو مانگێ، بایەخی تەواو بدرێ بەدەی دوایی مانگو بە شەوە تاکەکانی جێگەی خۆیەتی.

٢ -شەوی لەیلەتولقەدر تایبەتە بە شەوەکانی مانگی رەمەزانەوە، لە سەرەتاوە، تا کۆتایی، کەواتە: جێگەی خۆیەتی، کە هەموو شەوێکی رەمەزان بەخوا پەرستی زیندوو بکاتەوە.

٣ شەوی حەڤدەی رەمەزانە.

٤ شەوی بیستو سێیە.

٥ یەکەم شەوە لەدەی کۆتایی، واتە: شەوی بیستو یەك.

٦ -شەوی بیستو چوارە.

٧ -شەوی بیستو حەوتە. کاربەمە دەکرێ ئێستا.

٨ -دەکەوێتە تاکەکانی دەی کۆتایی رەمەزانەوە، واتە: سالّی واهەیە شەوی بیستو یەکە سالّی واهەیە شەوی بیستو پێنجە سالّی واهەیە شەوی بیستو حەوتە، سالّی وا هەیە شەوی بیستو نۆیە. حافظی عەسقەلانی دەفەرموێ: ئەمە بەهێزترینی فەرمایشتەکانە.

٩ دەخولێتەوە لەشەوەکانی دەی کۆتاییدا، وادەبێ رێکەوتی شەوە تاکەکان دەکا، سالّی وا دەبێ رێکەوتی شەوە جووتەکان دەکا، واتە لەبیستو یەکی مانگەوە، هەتا شەوی سیی رەمەزان هەر شەوێ بگری، دوور نییە کە شەوی لەیلەتولقەدر بێ.

١٠ -شەوەکانی نیوەی دووەمی رەمەزان.

### ٥٠٨) شەوی لەیلەتولقەدر شەوی بیستو حەوتە. (٢٧٥٣ - ٢٧٧١)

### بابٌ: ليلة الْقَدْرِ ليلة سَبْعٍ وَعِشْرِينَ

٦٣٨- عَنْ زِرِّ بْنِ حُبَيْشٍ قَالَ: سَأَلْتُ أُبَيَّ بْنَ كَعْبٍ (رضى الله عنه) فَقُلْتُ: إِنَّ أَخَاكَ ابْنَ مَسْعُودٍ يَقُولُ: مَنْ يَقُمِ الْحَوْلَ يُصِبْ لَيْلَةَ الْقَدْرِ، فَقَالَ: رَحِمَهُ اللَّهُ، أَرَادَ أَنْ لاَ يَتَّكِلَ النَّاسُ، أَمَا إِنَّهُ قَدْ عَلِمَ أَنَّهَا فِى رَمَضَانَ، وَأَنَّهَا فِى الْعَشْرِ الأَوَاخِرِ، وَأَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ. ثُمَّ حَلَفَ لاَ يَسْتَثْنِى أَنَّهَا لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشْرِينَ، فَقُلْتُ: بِأَىِّ شَىْءٍ تَقُولُ ذَلِكَ يَا أَبَا

الْمُنْذِرِ؟ قَالَ بِالْعَلاَمَةِ - أَوْ بِالآيَةِ - الَّتِى أَخْبَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهَا تَطْلُعُ يَوْمَئِذٍ لاَ شُعَاعَ لَهَا. {الحديث: ٢٧٦٩ = ٢٧٥٣ فم}:

زیڕی کوڕی حوبەیش (رەزای خودای لیٚ بیٚ) فەرمووی: پرسیارم کرد لە ئوبەیی کوڕی کەعب، گوتم: ئیبنو مەسعوودی برادەرت دەڵێ: هەرکەسێ سەرانسەری ساڵ شەو نوێژبکا، ئەوسا تووشی لەیلەتولقەدر دەبێ. ئەویش گوتی: (رەحمەتی خودای لیٚ بیٚ)، ئەوە مەبەستی ئەوەیە، کە موسوڵمانان پشتیان سارد نەبێتەوەو تەنیا بەکردنی شەونوێژی دەی دوایی رەمەزان پشت نەبەستن، ئەگینا ئەو باش باش دەزانێ کە ئەو شەوە دەکەوێتە رەمەزانەوە، وە لەدەی دواییش دایە، وە شەوی بیستو حەوتیشەوە، لەپاشا بەبێ پەروا سوێندی خوارد، بەبێ ئەوە کە سێو دووی لێ بکا، لەسەر ئەوە کە ئەو شەوە شەوی بیستو حەوتە. منیش پێم گوت: ئەی ئەبول مونزیر! بەچیا وا دەڵێی؟ گوتی: بەو نیشانەیەدا، یا بەو بەڵگەیەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی گوتووین: ئەو رۆژە کە خۆرهەڵ دێت تیشکی نییە).
{تاج/٢/١٣٦، زنجیرە: ٥٢، ژمارە: ١٤٠٠}.

## پوختەی بڕیارەکانی نامەی خەڵوەکێشان

١ - خەڵوەکێشان سوننەتێکی گەورەیە، پێغەمبەرو هاوسەرەکانیو هاوەڵە بەڕێزەکانیو زۆرینەی زانایانو خواناسان ماوەیەکی زۆر لە مزگەوتا خەڵوەیان کێشاوە.

٢ - پێناسەیەکی کورتو پوختی خەڵوەکێشان بە کوردی پەتی ئەوەیە: (مانەوە بە لەشی پاکەوە لەناو مزگەوتا بە نیازی خواپەرستی).

٣ - خەڵوەکێشان لە مانگی رەمەزانا بە تایبەتی سوننەتێکی دامەزراوی گەورەیە، بەتایبەتی لەدەی دوایی رەمەزانا، بەتایبەتی تر لە شەوی بیستو حەوتی رەمەزانا.

٤ لە رەمەزانا گەڕان بەدوای شەوی لەیلەتولقەدردا زۆر سوننەتە، واباشە ئەو شەوانەی کە موسوڵمان بە شوێن لەیلەتولقەدردا دەگەڕێ، لە مزگەوتا خەڵوە بکێشێ هەتا بەیانی.

٥ خەڵوەکێشان یاساو شێوازو مەرجو چۆنیەتی تایبەتی خۆی هەیە، لە کتێبەکانی شەریعەتدا، بەجوانی روونکراونەتەوە.

٦ - إحیای شەوی لەیلەتولقەدرو شەوی هەینیو شەوەکانی دەی دوایی مانگی قوربان، مەرج نییە کەهەر لە مزگەوتا بێ، لە ماڵیشەوە دەبێ، لە دەشتو دەرو سەر کارو پیشەیش دەبێ، وەك شوان لەلای ران بێ، یا کەسێ لەسەفەردا بێ، لە ئوتێلابێ، لە شەمەندەفەردا بێ، لە فرۆکەدا بێ، لە کەشتیدا بێ دەبێ، بەڵام لەم کاتانەدا پێی ناگوترێ (إعتکاف).



## نووســـــەر نوێنـــــەری چـــاخی خۆیـــــەتی
## بــــــــەزمانی رۆژ، گوفتوگۆیـــــــــەتی

حەزدەکەم (بەیارمەتی خودای گەورە) هەڵگرانی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە خوێنەران و بە ئاشقانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بناسم، هەتا ببێ بەهۆی خۆشەویستی و پەیوەندی پتەوو متمانەی تەواو، لەنێوان هەردوولادا، بە ئومێدی شاد بوون بە رەزامەندیی خوداو پێغەمبەر، هەروا بەهیوای دوعاو نزای باشی ئێوەی بەڕێزو ئازیزو خۆشەویست.

بەڵێ پێناسەیەکی کورت بۆ ئەم کۆمەڵە پیرۆزە ئەمەیە: ئەم زاتانە هەموو لەخودا ترس و زاناو داناو بێ هەواو خاکی و سەلارو سەنگین و هێمن بوون، پۆلە فریشتەی خودا بوون لەبەرگی ئادەمیزاددا، شەیتان شەرمی لێ دەکردن، هەموو زیرەك و هۆشیارو زرنگ و زەین روون بوون، هەموو لێبڕاو بوون بۆ خودا، خۆیان تەرخان کردبوو بۆ خزمەتی سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو راست و دروست و راستاڵ و راستگۆ بوون، شەیدای شەریعەتی خودا بوون، بەموو لە شەریعەت لایان نەدەدا، هەموو تەوێڵ نوورانی، چارە چارەی زانای رەببانی، دڵ رووناك، نیاز پاك، سروشت چاك و پاك، بەرچاو روون، هێمن و بێوەی، دوور لە شەڕو شۆڕو دەبدەبەی، وەك کۆتری بێوەیی ناو حەرەم وابوون!).

هەموو تەمەنی خۆیان لەڕێگەی خزمەت کردنی دیندا سەرف دەکرد، زوربەی ژیانیان لە خزمەتی قورئان و لە سێبەری مزگەوت و لە گۆشەی قوتابخانەو فێرگا ئیسلامییەکاندا دەبردە سەر، بەرگی بەڕێزی زانایانیان دەپۆشی، مێزەر تاجی سەر سەریان بوو، مەندیلی سپی بێگەرد، نیشانەی دڵی رووناك و دەروونی پاکی بێگەردیان بوو، لەسەر بەرزی و سەلاریدا وێنەی چیا سەربەرزەکانی کوردستان وابوون، کە بەفر بەهاران لوتکەکەیان دادەپۆشی!!

هەموو خاوەنی ریش‌و سیواك‌و بەرماڵ‌و سیمای پیاو چاكان بوون، تەوێڵیان وەك جێ مۆر، شوێنەواری سەجدەی پێوە دەدرەوشایەوە، زیكرو یادی خودا پیشەی هەمیشەیان بوو، زمانیان هەموو كاتێ بەیادی خودا تەڕو پاراو بوو، بەڕۆژ سوار چاكی مەیدان‌و بەشەو مۆم‌و سۆفیلكەی سەر بەرماڵ بوون، بەواتەی وشە پەروەردەی ناو مزگەوت‌و مینبەرو میحراب بوون.

هەموو زمان پاك، شێوە شیرین، روخسار نوورین، زوربەی كات بەرۆژ بەرۆژوو بوون‌و بەشەو سەرگەرمی شەو نوێژو قورئان خوێندن‌و فەرمووده لەبەركردن بوون، بەهیچ جۆرێك تێكەڵاوی كۆڕی دنیا پەرستان نەدەبوون، بە هاوڕێیەتی پیاوی خراپ تەنگە نەفەس دەبوون، هەناسەیان بۆ موسوڵمان شیفاو دەرمان بوو، بەراستی دەتگوت: (پۆلە پەپوولەی ناو گوڵ‌و گوڵزارن، یا پۆلە فریشتەی ناو بەهەشتی بەرینن!). هەیانبوو سەد هەزار حەدیثی لەبەربوو!!

سەد ساڵ لە خزمەتیاندا دابنیشتیتایە، نە درۆیەكت لێ دەبیستن، نەغەیبەتێ، نە قسەیەكی بێ شەرعی، نە كارێكی ناڕەوا، نەكارێكی پێچەوانەی سوننەتت لێ دەبینین، بگرە قسەی بێ سوودیشت لێ نەدەبیستن، نووری ئیمان‌و نووری قورئان‌و نووری سوننەت‌و نووری عیلم‌و زانست‌و نوورو تیشكی تەقوا، وا دڵ‌و دەروون‌و هەست‌و چاوی رۆشن كردبونەوە، وا هەست‌و هۆش‌و بیری رووناك كردبوونەوە، دەتگوت: هەموو كاتێ دۆزەخ‌و بەهەشت وا لەبەرچاویان، هەیان بوو فریشتە قسەی لەگەل دەكرد، زۆرینەیان كەراماتی گەورە گەورەو خەواریقی عەجیبیان لێ دەردەكەوت، هەیان بوو لە خەویشدا لەخوا غافڵ نەبوو، بەخزمەت پێغەمبەر دەگەیشتن، بەخزمەت خوا دەگەیشتن، پرسیاری شەریعەتیان لێ دەكردن، دەگێڕنەوە ئیمامی ئەحمەد، لەخەوندا عەرزی خودا دەكا، كەچی شتێ زۆر باش بەندە لەخودای خۆی نزیك دەكاتەوە. دەفەرموێ: (خوێندن‌و دەوركردنەوەو خەتمەی قورئان، با لەمەعناكەیشی تێ نەگات).

هەیان بوو مانگە رێیەك دەڕۆیشت بەدوای وەرگرتنی یەك فەرمووده‌دا {بڕوانە: ژینامەی عەبدوڵلای کوڕی ئونەیس، لەدوا فەرمووده‌ی ژمارە: ٦٣٦ لەپێشەوە}.

کەناوی خۆشەویستیان دەهێنا (دروودی خودای لەسەر بێ) موچڕکە بە لەشیانا دەهات، ڕەنگیان دەگۆڕا، فرمێسك لەچاویان دەباری، ناخیان وەك شۆڕەبی دەلەرزیو دەهەژا، هەموو خاوەنی مەقامو جێگەو کۆڕی زانستو خاوەنی مەجلیسو کۆڕی پەخشی زانست بوون!

گەرچی لە ماڵو سامانا، زۆرتریان هەژارو کەم دەست بوون، بەڵام بەدڵو دەروون داراو دەوڵەمەند بوون، ئیمامی نەوەوی (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) لە زوهدو تەقوادا کەم مانەند بوو، لە زانستی فەرموودەدا دەریای بێ پەی بوو، گوزەرانێکی زۆر سادەی هەبوو، مانگانەکەی خۆی کە لە سەرۆکی مەشیخەی دارول حەدیث، لە دیمەشق، دەستی دەکەوت دەیکرد بەخێر، خۆی بەوە دەژیا، کە باوکی لەنەواوە بۆی دەهێنا، وە بەسەدان کەرامەتو خەواریقی لێ بینراوە. بەڕاستی ئەهلی حەدیث هەموو مەشرەب سەخی بوون، پارووییەك نانیان ببوایە، لەگەڵ فەقێو زاناو میوانو هەژاردا دەیانخوارد، بە دەیانو بەسەدان فەقێو زاناو فێرخواز لە ئەڵقەی تەدریسیاندا بەهرەمەند دەبوون، هەتا میرو فەرمانڕەواکانیش وەك خەڵکانی تر، ئامادەی کۆڕی زانستیان دەبوونو سوودو بەهرەیان لە عیلمو زانستیان وەردەگرتو لە خزمەتیاندا بەچۆکدا دەهاتن. بەڵام خوانەکا ئەوان بەوە بەقەد زەڕەیێ لە خۆیان بایی ببن، یا مەیلی دنیایان تازە ببێتەوە.

خۆشەویستیی خواو خۆشەویستیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وا دڵی غەزا کردبوون، جێگەی خۆشەویستی دنیای تیادا نەدەبۆوە!

بەڵێ هەرکەس لەسەر ئەم شێوە پەسەندە نەبووبێ، خاوەنی ئاوا تۆمارگایەکی پاكو پیرۆز نەبووبێ، قەت قەت پێشەوایانی فەرموودە، حەدیثو فەرموودەیان لێ وەرنەگرتووە!

بەڵكوو بەبێ شەك و گومان كە چاودێری نهێنی خوایی، رابەریی و رێنمایی ئەوانی كردووە، وە هەمیشە رێنمایی و دەسگیرۆیی یەزدانی رۆڵی هەرە گەورەی بووە، لە نەخشە كێشان و سەرپەرشتی كردن و پەروەردەو پێگەیاندنی نەتەوەی ئیسلاما، هەروەك چۆن بە ئایەتی: {إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ} موژدەی سەركەوتن و پاراستنی قورئانی پیرۆزی داوەو هەمیشە لەهەموو كات و شوێنێكا سوپایەكی گەورە لە قورئان پەروەران و هەڵگرانی ئاڵای قورئان، دەیپارێزن و خزمەتی دەكەن و پەخشەوەی دەكەن و فێری خەڵكی دەكەن و راڤەو تەفسیری دەكەن و چاپی دەكەن و دەیخوێنن و دەوری دەكەنەوە، هەروەهایش موژدەی پاراستن و گەشەكردن و كاریگەری و رۆڵ و پەخشەوە بوونی سوننەتیشی لەچەند ئایەتێك و لەچەند فەرموودەیەكا داوەو بەڵێنی گەورەی بە سوننەت پەروەران داوە، وەك دەفەرموێ: {وَاذْكُرْنَ مَا يُتْلَى فِي بُيُوتِكُنَّ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ وَالْحِكْمَةِ} و {مَّنْ يُطِعِ الرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ اللَّهَ} و {فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ} و {وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانتَهُوا}.

بۆیە بە دڵنیاییەوە دەڵێین: (ئەو گشتە كۆمەڵ و دامەزراوو هەڵگرانی سوننەتە، كە لە زەمینەی واقیعدا، وان لەبەرچاو، كارێكی سادەی رێكەوتیی نین، بەڵكوو ئەوانە دەسگاو دامەزراوو رێكخراوانێكن، لە هەل و مەرجێكی خوداییداو لەژێر چاودێری نهێنی و ئاشكاری خودای داناو زانادا، رەخساون و پەیدا بوون و هەتا رۆژی قیامەتیش بەردەوام دەبن و هەردەبن و هەر دەمێنن و هەر لەگەشە كردنیشدا دەبن، ئومێد دەكەم كە ئێمەی هەژارو كەم ئایەو مایەیش لە خاك و پای ئەم كۆمەڵە پیرۆزەدا حەشر بكرێین و لەپرشی پیت و فەڕی ئەوانمان بەربكەوێ. ئامین.

ئەوەی كە جێگەی سەرنجە، هەروەك هۆی داخ و خەمە، ئەوەیە، كە لەم رۆژگارەی ئێمەدا، كۆمەڵێ پەیدا بوون، بەناوی پابەند بوون بە سوننەتەوە، دژایەتی فیقەو چوار مەزهەبەكە دەكەن بە بۆچوونی چەوتی ئەم جۆرە بەڕێزانە: (هەتا لە فیقەو شەرع دوورتر بكەویتەوەو زیاتر دژایەتی مەزهەب بكەی تۆ

سـەلەفی تـری!!). وە زۆربـەی ئـەم بەڕێزانـەیش لاوی بـێ ئـەزموون و کۆلکـە خوێنەرانی سەر بەلایەنەکانن، پێشەکی عەرزی ئەم ئازیزانەی خۆم دەکەم، کە زانـا گەورەکانی فەرمووده، کە ئەمان ئەو فەرموودانە دەکەن بە بەڵگە بۆ خۆیان و لافی ئەوە لێ دەدەن کە بەهۆی ئەو فەرموودانەی ئەوانەوە، کاریان بـە مەزهـەب نـەماوە، کە ئەم زانا گەورانـە خۆیـان پابەنـد بـوون بەیـەکێ لەچوار مەزهەبەکەوە، قسەی ڕاستتر ئەوەیە کە بوخاری و موسلیم و تەرمـەزی و ئـەبو داوودو نەسائی و بەیهەقی شافیعی مەزهـەب بـوون، وە ئـەم زانـا گەورانـەی تـریش، کـە هەریـەکێکیان بگریـت حوججەتن لە سوننەتدا، ئەمانیش و هەموو فەرموودەزانە گەورەکانی تـریش، سـەر بەیـەکێ لەچوار مەزهەبەکـە بـوون، وەك ئیمـامی مالیـك و ئیمـامی ئەحمـەدو دارە قوطنی و ئیمامی سیوطی و ذەهەبی و مونذیـری و نـەوەوی و ئیبنـو حیببـان و ئیبنـو خوزەیمەو طەبەرانی.... وتاد.

**تکای تایبەت:**

بەڕێزان! ئازیزان! ئەی لاوە خوێن گەرمەکان! لەپاش خودای گـەورەو سـەروەر، ئێوەن جێگەی ئومێدی گەورەی گەلی موسوڵمان، ئێوە چـینی نـوێی گـەلی ئیسلامن، چینی ئایندەی ئاوەدانکەرەوەی ناو مزگەوت و سەر مینبەر و ناو میحـرابن، ئاگامـان لـە خـوێنی گەشـی ئێـوە هەیـە، کـە لـە سەرانسـەری جیهانـدا، بەدەسـتی نۆکـەرانی ماسۆنییەت و صەلیبییەت و صەهیونییەت، بەخوڕزم دەڕژێ!

ئـازیزان! بـزانن چـینی دێـرین، خـواه نـاخواه، جێگـەتان بـۆ چـۆڵ دەکـەن، ئەمانەتتان تەسلیم دەکەن، لەژێر خاکا، هەوار هەڵدەدەن، لەوێوە چاو دەبڕنە ئێوە، کە ئایا وەك پێویست بە ئەرکی سەرشانی خۆتان هەڵدەستن و پەیامەکە دەگەیـەنن، بە ئەنجام یانا؟ خۆشەویستەکان! جگەر گۆشەکان، ئازیزەکانمان!! ئامان سـەد ئامـان، دەستمان دامەنی مەردانەتان، بە هەڵە لە کارەکە حاڵی مەبن، لەشت بەپەلە مـەبن، پابەند بون بە مەزهەب دژی سەلەفییەت نییە، بەڵام دووبەرەکی نانەوەو تێکدانی یەك ڕیزی موسوڵمانان گەورەترین تاوانە، خوا پـەنامان بـدا لەشـتی وا، لاوە خـوێن

گەرمەکان! باش باش بزانن، ئەو لایەنانەی کە ئێستا بە چەندین ناوەوە، لە گۆڕەپاندا، لە وڵاتی ئێمەدا، سەرگەرمی کارنو خۆیان بەیەکەم بەرپرسی وڵات دەزانن، ئەم لایەنانە زوو یا درەنگ دەڕۆنو مەیدان چۆڵ دەکەن، وەك پێشینەکانی خۆیان دەبن بە بەشێ لە مێژووی ئەم کوردستانە پیرۆزە، چاکیان وەك چاکیانو خراپیان وەك خراپیان، بەڵام (بە دڵنیاییەوە دەڵێم) ئەوەی کە دەمێنێ، لە گۆڕەپانی تێکۆشانو خەباتو کوردایەتیو مەردایەتیدا، بەس مەلای مەردو مزگەوتو ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، ئەم سێ لایەنە پیرۆزە هەتا هەتایە، لەگەڵ کوردستانو گەلی کوردستانا دەمێننو بەرگری لەم ملەتە ستەمدیدەیە دەکەنو، لەکاتی تەنگانەو مەینەتداو، لەکاتی خۆشیو ناخۆشیدا، دەستی لێ بەرنادەنو دەبن بەقەڵای قایم بۆ دینو دونیای ئەم گەلی کوردستانە، جا ئالەم روانگەیەوە، بۆ پەند وەرگرتن لە پەندەکان، ئەم حەقیقەتان بۆ راگوێز دەکەم لە پەڕاوی (یادگارەکانی باوکم لە حوکمەتەکەی مەلیك مەحموودی حەفید)، بۆ پشتگیری ئەوەی کە دەوران دەگۆڕێو بەس ئەهلی ئیمان پارێزەری گەلی ئێمەن: (... لە شەستەکاندا، من خۆم لەگەڵ فەوجی یەك، لیوای چواری سەر بەفیرقەی دوو بووم، تقدّمیان کرد بۆسەر ناوچەی باطووفە، کەوا لە قەزای زاخۆ، لەوێ گوندی فەلەو مەسیحی زۆرە، جاشكو جوروشكو مەوالی، بە قیادەی ئاغاو سەرۆك عەشرەتەکان، لە کوردو عەرەب، یاریدەی سوپایان دەدا لەم غەزایەدا، بە فیعلی پیاوەکانی حوکومەتی دەسەڵاتی عێراق بە کوردو عەرەبیەوەو حوکومەتی عێراق بەگشت هێزەکانی خۆیەوە، بەناوی بەرگری لە یەکێتیی خاكو گەلی عێراقو پاککردنەوەی وڵات، لە چەتەو رێگرو ناپاكو خائینان، بەم ناوەوە سەراسەری کوردستانیان کردبوو بە گۆمی خوێن، رۆژ تا ئێواریێ هۆکارەکانی راگەیاندنی میری، برووسکەی پشتگیری ئاغاو کوێخاو سەرۆك هۆزەکانو بەڕێوەبەری ناحیەو قەزاو قوتابخانەو رێکخراوو نەقابەو لایەنەکانی دەخوێندەوەو دەستخۆشییان لە میری دەکردو جنێویان دەدا و نەفرینیان لە یاخیبوان دەکرد!

جا لەهەل و مەرج و بارودۆخێکی ئاواداو، بگرە گەلێ لەمەیش ئاڵۆزترو خراپتر، من خۆم شایەت حاڵ و عەیان بووم و بەچاوی خۆم دیومە کە میری و چڵکاو خۆرەکانی میری، چی زوڵم و زۆرو کوشت و بڕو ڕەشە کوژییەکیان ئەنجام دەدا، بۆ مێژوو دەڵێم: زۆر لە کاربەدەستانی گەورەو ئەفسەرو سەرۆك جاش و سەرۆك هۆزو کوردە چڵکاو خۆرەکانی خۆمان، بۆ شەڕەکە، لە عەرەبەکان شێرەترو متحمس تر بوون، بەهەر بیانوویەك مەودایان بوایە، خۆیان دەکرد بە عەرەب و حاشایان لە کوردایەتی دەکرد، بۆ نموونە: دەیگوت: من سیّدم ئەصڵم عەرەبە، هەبوو ژنی عەرەب بوو، بوو بوو بە عەرەب، هەبوو سەر بە عەشیرەتێ بوو، ناوی عەشیرەتەکەی لە عەرەبییەوە نزیك بوو، بەو فێڵە هەموو عەشیرەتەکەیی دەکرد بە عەرەب، وەك: ساڵەیی، دەیکرد بە (صالحی)و خاڵتی، دەیکرد بە (خالیدی! گوایە لەنەوەی خالیدی کوڕی وەلیدن، هەمووشمان دەزانین، کە ئیمامی خالید نەوەی نەبووەو وەجاخ کوێر بووە، ئاغای وا هەبوو، جاشی زۆری هەبوو، بە قۆنتەرات لوتکەو چیاو شوێنە سەختەکانی، لە پێشمەرگە پاك دەکردەوەو ئاڵای پێشمەرگەکانی دەدڕاندو ئاڵای سوپای لەجێگەی هەڵ دەکرد! بەرابەر بە چنگێ پوول و پارەو بەوپەڕی بێ ئابڕوییەوە ئەم مژدە خۆشەی لە ئێسگەی بەغداوە پەخش دەکردەوە!

تەنانەت عەرەبە بەویژدانەکان، لەم خۆفرۆشییەی ئەم زۆڵە کوردانە ئەوەندە بێزار بوون، کردبوویان بە شیعرو دەیانگوت:

لاَ تَقْتُـــــلِ الحَيَّــــــةَ وَالعَقْرَبَــــــا

بَــــلِ اقْتُــــلِ الكُـــرْدِي الَّـــذِي إِسْــتَعْرَبَا!!

بە کوردی و کورتی و کورت و پوخت: (هەلپەرستان و مادده پەرستان، هەموو سەردەمێ، هەرچڵکاو خۆریی ئیش و پیشەیان بووە، ئەهلی مەعنەوییاتیش، ژیان و مردنیان لەگەڵ گەلی خۆیان بووە!).

جاپاش ئەمە، كاتێ فەوجی یەك لیوای چوار، لەگەڵ هێزێكی تێكەڵ، لەجاشو مۆالیو چلكاوخۆر، لە كوردو عەرەب، بەرەو گوندەكانی دەڤەری باطووفە، بەناوی (تَحْرِيرُ القُرى)وە، هێرشیان دەست پێكرد، بەیارمەتی فرۆكو تۆپو تانك، ئەوەی لەم شیعرانەدا تۆمارم كردووە زۆر بەزیادەوە رووی دەداو بەچاوی سەر دەبینرا:

بـــــابۆت بەیانكـــــەم هێرشـــــی دوژمـــــن
كـــــە دەیكـــــردە ســـــەر گونـــــدێكی هـــێمن
لەهـــــەر چـــــوار لاوە لەگـــــەڵ بـــــەیانا
ئـــــاگر دەبـــــارێ بەســـــەر ســـــەریانا
وەك مـــــۆم دەســـــووتا دارو بـــــەردی دێ
وەك گـــــزرە دەكـــــەوت: تـــــەرمی نێرومـــــێ!!
بیســـــت بیســـــت و ســـــیی ســـــیی، عـــــەموودی اعـــدام
ریزدەكـــــرا بـــــۆ لاو، بەئـــــەمری صـــــەددام

جا ئالەم بارودۆخە خوێناوییەدا، بەچاوی سەر ئەم راستییانەم دەدی: كە سوپا دەگەیشتە دێیەكی مەسیحی، ژنو ئیختیارو قەشەكەیان دەهاتن بە پیریانەوە، بەخێرهاتنێكی گەرمی سوپایان دەكردو دەیانگوت: ئێمە موسوڵمان نینو لەئێوە نین، ئێمە فەلەین، مەسیحین، دێكەمان مەسووتێنن، كوڕو پیاوەكانمان مەكوژن، لەهەمان كاتا نانو ئاوو خواردنی باشیان بۆ ئامادە كردبوونو پاش ئەوە ئامیر فەوجو زابتەكانی، لەسەر شایەتی سەرۆك جاشە كوردەكانی ناوچەكە، باوەڕیان پێ دەكردن، ئالآی سپییان دەدانێو وازیان لێ دەهێنانو هەواڵیان دەدا بە فڕۆكو تۆبخانەیش كە تەقەیان لێ نەكەن!!

زۆرینەی كات ئەفسەرەكان داوای دیاریو عەرەقیان لە قەشەكە دەكرد، ئەویش هانی خەڵكی دیكەی دەدا، عەرەقێكی زۆریان بۆ دەهێنان، ئامیر فەوجەكەمان، كەناوی عقید/ مجید سبع بوو، كە هەر لەو دەڤەرەدا كوژرا، زابتێكی زۆر حەقانی

بوو، جارێ کە عەرەقەکەی بە عەدالەت، بەسەر ئەفسەرەکانا دابەش کرد من نزیکەی پێنج بوتڵم بەرکەوت!!

خۆ نەشت دەوێرا بڵێیت: بابە! منو عەرەقیان نەگوتووە، چونکە هەر لەوێدا دایان دەنای بە (متمّرِد)و گوللە بارانیان دەکردی، بەڵام چیم لێکرد، ئەوە بابمێنێ بۆ جێگەی خۆی!

بەڵام کاتێ سوپاو پێوەندەکانی دەگەیشتنە گوندێ، مزگەوتو مەلاو قورئانو کوردی موسوڵمانی لێ بوایەو، خەڵکەکەی کوردی موسوڵمانی رەشو رووت بوایە، ئیتر قوڕی بۆ دەگێڕایەوە، وە نێریان لێ دەبڕی، ماڵ بە ماڵو هۆدە بەهۆدە، بە بیانووی ئەوەی نەبادا، یاخی تیابێ، دەیاندایە بەرگوللەو شەستیرو بۆمبا، خانووەکانیان هەموو دەسووتاند، تالانیان دەکردن، لەپێشا بەرماڵو بەڕەو قاڵیو مافووری مزگەوتەکەیان فەرهوود دەکردو ئەوسا دەیان سووتاند، ئەوسا ماڵی مەلا هەروا، زۆرجار مەلاکەشیان دەکوشت، ئەوسا هەموو گوندەکە هەروا، وە ئەوەی تیایا بوو، لە پارەو لە خشڵی ژنانو لە ئاڵتوونو لە ماڵاتو ئاژەڵو گاو گۆتاڵو کەرو هێسترو ماین دەیانبرد، هەتا هەنگو دارو دەستەكو شتی واشیان دەدزی، تەنانەت دەستارو گوریسو هۆڕو رەشکەو شمەکی وردەی ناو ماڵیشیان دەدزیو فەرهوود دەکرد، وە پێیان دەگوت: (غَنَائِمُ العُصَاةِ)! ئەوەی کە لە کووەیت کردیان، لە کوردستانی خۆمان لەوەو پێش زۆر بە وردی ئەنجامیان دابوو، وە راهێنانو مەشقیان لەسەر کردبوو!!

کاتێ غەزا تەواو دەبوو، وە دەکەوتنە سەرخۆ دەتبینی سەری موعەسکەرەکە، یەك پارچە چرە دووکەڵی بەزو دووگی ئاژەڵی سەربڕاوی تالانیو فەرهوودی گوندە کوردە وێرانکراوەکان بوو، مامۆستا مەلا عەزیزی گانی هەمزەیی، کە بەڕاستی کوردێکی مەردو موسوڵمانێکی پاكو مەلایەکی خواناسی داناو زاناو ئازاو حەقانی بوو، لە دەڤەری (پیرە مەگرون - زێوێ) کاتێ رەفزی کرد لەم جۆرە گۆشتە بخوا، دایان بە مەحکەمەی شورە، بە رەئیس مەحکەمەکەی گوت: (من مەلام، ئیمامی

عەسکەریم، چۆن تۆ من مەحکەمە دەکەی لەسەر ئەوە کە لە گۆشتی مانگایەکی فەرهوودم نەخواردووە، کە خاوەنەکەی پیرێژنێکی کوردی داماو بوو، من خۆم تەرجەمەم بۆ دەکرد، کە لە ئامیر فەوجەکەمان دەپاڕایەوەو دەیگوت: خواشکەبەمو ئەو مانگایە، کە خۆمو دووکچی هەتیومی پێ بەخێو دەکەم، سەری مەبڕن بمدەنەوە!!). سەرۆکی دادگا، سالێکی سیجن کرد، گوایە ئەم کارە، رەفزی ئەوا میری عەسکەرییەو تەئییدی مەعنەوییە بۆ متمرّدین!!

جاتوخوا وەرن با لەسەر وەزنو کێشی: (مَا أشْبَهَ اللَّيْلَةَ بِالبَارِحَةِ = ئەم شەویش برای دوێ شەوە) ئەم شیعرانە بە سۆزەوە بخوێنینەوە، کە بەندە لەم چەشمەندازەوە گوتوومەو ئێستاش دەڵێم:

بە کوردی پەتی، رەسەنی رەوان
گشت کەس تێی بگا بەبێ تەرجەمان
وشەی ناسک و نازداری کوردی
دەهۆنم دەیکەم بە شیعری وردی
دەیچنم دەیکەم، بەنیشان دەیدەم
لەیەخەی مەردێ، بەدەست و بەدەم
دریغی نەکا لە خزمەتی کورد:
هی دین و دنیای، لەسەرخۆ ورد ورد!
وەک خاڵ و نامی و ئاغای سەجادی
ئەحمەدی خانی و، خانای قوبادی
لە خانمانیش وەکوو خانزادی
مەردانی خوابوون، زیندووبێ یادی!
وەک مەلیک مەحموود، مەلای بەرزانی
لە رەگەزی مێش، وەک حەپسە خانی
ئەی گەلی کوردم! من بەقوربانتم
ئاشق بەدین و خاک و زبانتم،،
بێ کەسێ وەک من، بۆیە بێ نازی
دەنا بۆ جوانی دەڵێی نازنازی!
گەر جوانیی زمان بەپێی خاک بێ
دەبێ بۆ جوانی، کوردی تاک بێ

★★★

ئەمن وەک بازێ باڵی رزابێ
هێزی فڕینی بەرزی نەمابێ
لەجێی تیر پیری تیری لێ دابێ
بەلام نەرووخاو ورەی پێ مابێ
بەدەنگی پڕسۆز، لەرزۆک و بێ هێز
بەلام کاریگەر، خەماوی و بەپێز
نەک جارێ، سەد جار، بەدڵ و بەدەم
بە گوێی گەردوونا، ئەم جارە دەدەم:
(کوردە! لەتاو تۆ ژیانم تاڵە
بەشەوو بەڕۆژ، تۆم لە خەیاڵە)
هەرچی دەبێژم بۆیە وا کاڵە
لەبەر بێ کەسیت حاڵم بێ حاڵە!!
بووی بەگۆی مەیدان، رۆژگاری نامەرد
پێت دەکا شەقێن، بەدارشەقی بەرد
رۆژێ ئینگلیزو، رۆژێ ئەمریکا
رۆژێ کوردی خۆت، یاریت پێ دەکا
هەروا سێ قۆڵی: عەرەب، تورک، عەجەم
خوێنت دەمژن، وەک زالووی ناو دەم!!
کەسێ شک نابەم، بتدەمە دەستی
جگە لەو خوایەی تۆ دەیپەرستی
شانۆی کەساسیت هەزار لۆغانە
ناسۆری ژینت، داستان داستانە
وەرە داستانی وڵاتی سووتاو
لە گۆشەیەکۆ بخەینە بەرچاو
بیکەین بە یادگار: رووداو بەرووداو
بۆ پەندو ئامۆژ، نەک بۆ چاو وڕاو
پێنج هەزار گوندی قەشەنگی رازاو
نوغرۆ بوون: یەک یەک، نۆغرۆیێ تەواو
هەتا گۆڕستان، هەتا کانی و ئاو
بە دەستی بەعسی، سەرتاپا سووتاو
جێگەیان وێنەی، جێ خاڵی کوتراو
رەش دەکاتەوە، لە دوور لەبەرچاو
ئای چەندەم دیوە، دێهاتی رماو

مزگـــــەوتی بەســــەر میحرابــــیّ تـــــەپاو
شارۆچـــکەی نەخشـــین، ســـەیرانگای نەخشـــاو
لــــە تەماشـــــایان، تێرنـــــەدەبوو چـــاو
هـــەرلا ســـەیردەكەی هـــەر شـــوێنەو رووخـــاو
وڵاتـــــی وێــــران، گـــەلی بـــەش خـــوراو
وەی چـــەندەم دیـــوە كـــوردی چـــاو بەســـراو
پـــا پـــەتی و ســـەر رووت، كەســـاس و دامـــاو
نەكـــەس دەیناســـــین، نەنیشـــــان، نـــەناو
بـــیّ ســـەرو شـــوێن بـــوون، وەك پـــۆری خـــوراو
ئـــای چـــەندەم دیـــوە، كـــوردی وێنـــەی خـــۆم
بـــرزاو بـــە قەســـفی مـــیراج و فـــانتۆم
مێگـــو باجـــەرو ســـیخۆو فـــانتۆم
بـــەبرام بڵـــێم، منـــیش تـــەنیا خـــۆم
ئـــەوان ســـیّ قـــۆڵی: عـــەرەب، تـــورك، عەجـــەم
خـــاوەن جـــەیش و جـــاش، مـــن بـــە جەیشـــی خـــەم
ئـــاخ چـــەندەم دیـــوە گـــەورە كچـــی دیـــل
ئـــــەنفالكراوی، بـــــاركراو لـــــەزیل!!
ســـێلاوی ئەشـــكی، لافـــاوی قەنـــدیل
لەچـــكیّ لەســـەری، لـــە چەشـــنی مەنـــدیل
جەلـــەی كردبـــوون، جاشـــێكی زەلیـــل
دەیـــبرد بـــۆ ئاغـــای، لـــەباتی بـــەرتیل
تكـــــای بـــــەردەوام، لەخزمـــــەتتانا
گۆڕەكـــەم دووربـــیّ بـــەپێی تـــەوانا
لـــە گـــۆڕو كـــۆڕی ناپاكـــانی گـــەل
نـــەییّ بەســـەرما، بێگـــەنی خەرگـــەل
گۆڕەكـــەم دووربـــیّ لێـــرە تـــا ئەســـمان
لـــە گـــۆڕی كـــوردی بـــیّ دیـــن و ئیمـــان

نوری فارس حمه خان

٢٠٠٩/٦/٣



# ١٠- نامەی حەج (كِتَابُ الحَجِّ)

{بڕوانە: تاجول ئوصول، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٧٨، لاپەڕە: ١٦٠ لە ژمارە: ١٤٧٠ وە هەتا ژمارە: ١٧٥٥، لە زنجیرە: ٧٨ وە هەتا زنجیرە: ١٤٤ + تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٢ هەتا زنجیرە: ٣٥ لە ژمارە: ٧٢٨ وە هەتا ژمارە: ٨٧٠ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەكەم، لە زنجیرە: ١٥٨ وە هەتا زنجیرە: ١٨٦ لە لاپەڕە: ٣٨٩ هەتا ٤٧٠}.

## ٥٠٩) حەج لە تەمەنا یەك جار فەرزە (٣٢٤٤)

٦٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: خَطَبَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ، فَحُجُّوا »، فَقَالَ رَجُلٌ: أَكُلَّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَسَكَتَ، حَتَّى قَالَهَا ثَلَاثًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَوْ قُلْتُ: نَعَمْ، لَوَجَبَتْ، وَلَمَا اسْتَطَعْتُمْ »، ثُمَّ قَالَ: ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ ». {الحديث: ٣٢٤٤ = ٣٢٣٣ ف.م = فم = فتح الملهم. نسائي. مناسك الحج: ٢٦٤٤. تحفة الأشراف: ٢٦٤٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێكی بۆماندا، فەرمووی: (ئەی خەڵكینە! خودای گەورە حەجی داناوە لەسەرتان، دەی حەج بكەن). پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا هەموو ساڵێ؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەنگی نەكرد، تا سێ جار پیاوەكە ئەم پرسیارەی كردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بڵێم بەڵێ: ئەوا هەموو ساڵێ حەج فەرز دەبێ لەسەرتانو بۆشتان ناكرێ) ئەنجا فەرمووی: (كاتێ من وازم لەئێوە هێنا، ئێوەیش واز لەمن بهێننو كەمن لە شتێكم نەكۆڵییەوە ئێوەیش لێی مەكۆڵنەوە، مەبادا سەربكێشێ بۆ پێچەوانەی مەبەست. چونكە نەتەوەكانی پێش

ئێوە، لەبەرئەوە لەناوچوون، چونکە پرسیاری زۆریان لە پێغەمبەرەکانیان دەکردو زۆر لەدژیان دەوەستان، ئەوەی گوتم بیکەن چەندەی لە تواناتانا هەیە بیکەن، بەڵام ئەوەی کە گوتم مەیکەن توخنی مەکەون!). {ریاض/٣/١٨٦، رقم: ١٣٧٢} + {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٧٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

لەم فەرموودە پیرۆزەدا یاسایەکی گەورەو گرنگی شەرعی واتیادا، بە هەزاران نموونەی هەیە لە شەرعا، وەك نوێژ کە فەرمان کراوە بەکردنی، بەپێی تەوانا، کاتیو ژمارەیو ژمارەی رکاتەکانی دەگۆڕێ، بۆ نموونە، بۆ نیشتەجێیی بێ مەهانە، ئەبێ هەموو رۆژێ، لەپێنج کاتی دیاریکراودا حەڤدە رکات بکات، بەڵام بۆ رێبوار، یا بۆ نەخۆش، دەتوانێ لەسێ کاتدا بیکا، یا بە یازدە رکات بیکات، وە هەروەها رۆژوو، وە هەروەها دەستنوێژ، مەسەلا نەیدەتوانی هەموو ئەندامەکانی دەستنوێژ بشۆرێ، با چەندیان دەتوانێ با ئەوانە بشۆرێ، هەروەها لەزۆر شتی تردا.

## ٥١٠) گەورەیی خێرو پاداشی حەجو عەمرە. (٣٢٧٦ - ٣٢٨٠)
## بابٌ: ثَوابُ الحَجِّ والعُمْرَةِ

٦٤٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الْعُمْرَةُ إِلَى الْعُمْرَةِ كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُمَا، وَالْحَجُّ الْمَبْرُورُ لَيْسَ لَهُ جَزَاءٌ إِلاَّ الْجَنَّةُ ». {الحديث: ٣٢٧٦ = ٣٢٦٥ ف.م = فم = فتح الملهم. تجريد = مختصر صحيح البخاري/كوردی مجلد/٢ ص٢٢٨، رقم: ٨١٩ = ١٧٧٣ فتح الباری}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم عەمرە هەتا ئەو عەمرە، برێتیی گوناهی نێوانی هەردوکیان دەکەوێ، حەجی قەبووڵیش هەر بەهەشتە پاداشتیو بەس). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ١٤٧١}.

٦٤١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَتَى هَذَا الْبَيْتَ، فَلَمْ يَرْفُثْ وَلَمْ يَفْسُقْ، رَجَعَ كَمَا وَلَدَتْهُ أُمُّهُ ». {الحديث:

٣٢٧٨ = ٣٢٦٧ ف.م. تجريد/٢/١٦٠، رقم: ٧٣٢ = ١٥٢١، ١٨١٩، ١٨٢٠ فتح الباري. ترمذي. حج: ٨١١. نسائي. حج: ٢٦٢٦. ابن ماجة. مناسك: ٢٨٨٩. تحفة الأشراف: ١٣٤٣١}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (هەرکەسێ بۆ خودا، حەجێ، یا عەمرەیێ بکا، لەکاتی کردنی ئەو حەجە، یا ئەو عەمرەیە، پارێز لە کەیف کردن لەگەڵ ژندا بکاو، گورێز لە هەرزەگۆییو قسەی پڕوپووچ بکاو، گوناه نەکا، ئەوە وەك ئەو رۆژە کە لەدایك بووە، ئاوا لە گوناه پاك دەبێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٨، ژمارە: ١٤٧٠ + ریاض/٣/٩٣٣، زنجیرە: ٢٣٣}:

## ٥١١) باسی رۆژی حەججی ئەکبەر (٣٢٧٤)
## بابٌ: فِي يَوْمِ الحَجِّ الأكْبَرِ

٦٤٢- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه ) قَالَ: بَعَثَنِى أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ فِى الْحَجَّةِ الَّتِى أَمَّرَهُ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَبْلَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ فِى رَهْطٍ يُؤَذِّنُونَ فِى النَّاسِ يَوْمَ النَّحْرِ: لاَ يَحُجُّ بَعْدَ الْعَامِ مُشْرِكٌ، وَلاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ عُرْيَانٌ، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: وكَانَ حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ يَقُولُ: يَوْمُ النَّحْرِ يَوْمُ الْحَجِّ الأَكْبَرِ مِنْ أَجْلِ حَدِيثِ أَبِى هُرَيْرَةَ. {الحديث: ٣٢٧٤ = ٣٢٦٣ فم = فتح الملهم. تجريد البخارى/١/٢٤٦، رقم: ٢٣٤ = ٣٦٩، ١٦٢٢، ٣١٧٧، ٤٣٦٣، ٤٦٥٥، ٤٦٥٦، ٤٦٥٧ فتح البارى. أبو داود. مناسك: ١٩٤٦. نسائى. حج: ٢٩٥٧. تحفة الأشراف: ٦٦٢٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەو حەجەدا کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەبوبەکری کردبوو بەسەرداری حەج، کە بەر لەحەجی ماڵئاوایی بوو، لەو حەجەدا ئەبوبەکر منی لەگەڵ دەستەیەکی تردا نارد، رۆژی جەژن ئەم جاڕەمان دا: (ئیتر لەمساڵ بەدواوە بت پەرستو هاوبەش پەیداکەر نەیەن بۆ حەج، وە کەسیش نابێ بە رووتی تەوافی بەیت بکا). (تاج/٢، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ١٥٥١).

ئیبنو شیهاب (واته: ئیمامی زوهری) دەفەرموێ: لەبەر ئەم فەرموودەیەی ئەبو هورەیرە، حەمیدی کوڕی عەبدوڕەحمان، کە ئەم فەرموودەیەی بۆ مـن گێڕاوەتـەوە دەیفـەرموو: ڕۆژی جـەژن، کـە یەکـەم ڕۆژی هـەدیو قوربـانی سـەربڕینە، ڕۆژی حەجی ئەکبەرە.

**ڕوونکردنەوە:**

١.بۆ ژیینامەی زوهری بڕوانە فەرموودەی ژمارە (٢٠٢).

٢. مەبەست لەڕۆژی حەجی ئەکبەر چییەو واتای چییە؟ بەدوو واتا، واتاکراوە،

**یەکەم:** بەواتای ڕۆژە گەورەکەی حەج، لەسەر ئەم واتایە، ئەم چەند رایە هەیە:

١.مەبەسـت یەکـەم ڕۆژی جەژنـە، کـە یەکـەم ڕۆژی قوربـانی سـەربڕینو هـەدی (دیاری) بەیت سەربڕینە، ئەم فەرمایشتە بەهێزە، لەسەر ئەم فەرمایشتە ڕۆژە بچکۆلەکەی حەج، ڕۆژی عەرەفەیە.

٢. مەبەست ڕۆژی عەرەفەیە، کە ڕۆژی نـۆی مانگـە، چونکە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (الْحَجُّ عَرَفَةُ = حەج برێتییە لە ڕۆژی عەرەفە).

٣. مەبەست هەموو ڕۆژەکانی حەجە.

**دووەم:** بەواتای حـەجی گەورەترو حـەجی هـەرە گـەورە، لەسـەر ئـەم واتایـەیش ئـەم چەند فەرمایشتە هەیە:

١.مەبەست لە (يَـوْمِ الحـج الأكـبر) حـەجی ئاساییە، مەبەسـت لـە (الحـج الأصـغر)یش عەمرەیە.

٢. حــەجی ئەکبــەر ئــەو حەجەیــە کــە لەســەر شـێوەی قـیران بکـرێ، حــەجی ئەصغەریش حەجی ئیفرادە.

٣. هەندێ دەفەرموون: (حەجی گەورەتر ئەو حەجەیە کە پێغەمبەر کردی).

٤.هەنـدێ تـر دەفـەرموون: ئـەو حەجەیـە کـە ڕۆژی عەرەفەکـەی ڕێکـەوتی ڕۆژی هەینی بکا. رای تریش هەیە.

**سێههم**: کاتی عهمره کهیه، وه ئایا، له ڕۆژێکا، یا له حهفتهیهکا، یا له مانگێکا، یا له ساڵێکا، دروسته چهند عهمره بکرێ؟ وه حوکمو بڕیاری عهمره چییه، فهرزه یا سوننهته؟

ئیمامی نهوهوی له شهرحی صهحیحی موسلیما، لهباسی (باب: فَضْلُ الحج والعمرة)یدا، له ڕوونکردنهوهی فهرموودهی ژماره: (٣٢٧٦ = ٣٢٨٠)دا دهفهرموێ:

١. عهمره لای شافیعیو جهماوهری زانایان فهرزه، بهڵام ئیمامی مالیكو ئیمامی ئهبو حهنیفهو کهسانی تریش، دهفهرموون: عهمره سوننهته، واجیب نییه.
٢. مهزههبی شافیعیو ڕای جهماوهری زانایانی ئیسلام، سهبارهت به دووبارهکردنهوهی عهمره، له لایهنی یهك کهسهوه ئاوایه: دووبارهکردنهوهی عهمره، چهند جارێ، لهیهك ساڵا سوننهته.
٣. مهزههبی ئیمامی مالیك: کردنی زیاتر لهیهك عهمره له ساڵێکا، ناباشهو نا پهسهندهو مهکرووهه.
٤.ههندێ دهفهرموون: (لهیهك مانگا دهبێ یهك عهمره بکا).
٥. ئیمامی عهسقهلانی له فهتحولباریدا، لهسهرهتای (کتاب العمرة)دا، دهفهرموێ: (وفي حديث الباب دَلاَلَةٌ عَلَى اسْتِحْبَابِ الاِسْتِكْثَارِ مِنَ الاِعْتِمَارِ.........مِنْ غَيْرِ تَقْيِيدٍ).
٦. ههروا ئیمامی نهوهوی له ههمان شوێندا دهفهرموێ: (بزانه که ههموو ڕۆژێ لهساڵ کاته بۆ عهمرهو عهمرهی تیادا دروسته، مهگهر بۆ کهسێ خهریکی کردنی حهج بێ، ئهوه عهمرهی دانامهزرێ، ههتا حهجهکهی تهواو نهکا. له مهزههبی ئێمهدا، ههرکاتێو ههر ڕۆژێ عهمره بکهی دادهمهزرێو سوننهتهو کهراههتو ناباشی نییهو جیاوازی له نێوانی ڕۆژی عهرهفهو ڕۆژانی جهژنو باقی مهندهی ڕۆژهکانی تری ساڵدا نییه، مهگهر بۆ کهسێ خهریکی کارهکانی حهج بێ.

٧. لەپاش ئەمەو وەك لە شوێنەکانی تردا باس کراوە دەڵێم: (دووبارە کردنەوەی عەمرە چەند جارێ، لەیەك ڕۆژا، یا لەیەك حەفتەدا، یا لەیەك مانگا، یا لەیەك ساڵا، خێرێکی گەورەیەو دەبێ بەهۆی پاداشتی گەورە، تەنانەت ئەگەر لەیەك ڕۆژدا دە عەمرە بکا، یا کەمتر، یا زیاتر، زۆر باشەو پەسەندەو تاعەتێکی زۆر جوانو پەسەندە).

ئێستا لەکاتی حەجدا، یا لەکاتی جێبەجێ کردنی عەمرەدا لە غەیری مانگەکانی حەجدا، لەسەر فەتوای زانا ئایینیەکان، لەیەك ڕۆژدا، بۆ کەسێ حەڵاڵ بێو لە حەجدا نەبێ، چەندین عەمرە، یەك لەدوایەك ئەنجام دەدرێو عەمەل لەسەر ئەمەیە.

## ٥١٢) باسی گەورەیی ڕۆژی عارفە. (٣٢٧٥)

## بابٌ: فَضْلُ يَوْمِ عَرَفَةَ

٦٤٣- عَنْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: «مَا مِنْ يَوْمٍ أَكْثَرَ مِنْ أَنْ يُعْتِقَ اللَّهُ فِيهِ عَبْدًا مِنَ النَّارِ مِنْ يَوْمِ عَرَفَةَ، وَإِنَّهُ لَيَدْنُو ثُمَّ يُبَاهِي بِهِمُ الْمَلاَئِكَةَ فَيَقُولُ: مَا أَرَادَ هَؤُلاَءِ؟». {٣٢٧٥ = ٣٢٦٤ ف.م. نسائی. حج: ٣٠٠٣. ابن ماجة. مناسك: ٣٠١٤. تحفة الأشراف: ١٦١٣١}:

عائیشە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هیچ ڕۆژێ وەك ڕۆژی عەرەفە، خودای گەورە بەندەکانی خۆی لە ئاگری دۆزەخ ئازاد ناکا بەزۆری، بەرە بەرە لەم ڕۆژەدا، لافاوی ڕەحمەتو سۆزی خودا، لە بەندە باشەکانی خۆی نزیك دەبێتەوەو دەڕژێ بەسەریانا، تەنانەت خودای گەورە شانازی دەکا بەسەر فریشتەکاندا، بە حاجیانەوەو دەفەرموێ: ئەمانە چییان دەوێ کەوا ماڵو مناڵو وڵاتی خۆیان بەجێ هێشتووەو ئاوا خۆیان ماندووو شەکەت کردووە؟).

## ٥١٣) ريبوار لەكاتی سواربووندا، کەبچێ بۆ سەفەری حەج، یا بۆ سەفەری تر، چی بڵێ باشە؟ (٣٢٦٢ - ٣٢٦٤)

## بابٌ: ما يقولُ إذا ركبَ إلى سفرِ الحجِّ وغيرِه

٦٤٤- عَنْ عَلِيٍّ الأَزْدِيَّ (رضى الله عنه ) أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنه ) عَلَّمَهُمْ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا اسْتَوَى عَلَى بَعِيرِهِ خَارِجًا إِلَى سَفَرٍ، كَبَّرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: « سُبْحَانَ الَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ. اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِى سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِى السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِى الأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِى الْمَالِ وَالأَهْلِ ». وَإِذَا رَجَعَ قَالَهُنَّ. وَزَادَ فِيهِنَّ: « آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ ». {الحديث: ٣٢٦٢ = ٣٢٥١ فم. أبو داود. جهاد: ٢٥٩٩. ترمذى. دعوات: ٣٤٤٧. تحفة الأشراف: ٧٣٤٨} :

عەلی ئەل‌ئەزدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عومەر (خودایان لێ رازی بێ) فێری ئەمەی دەکردن: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ دەردەچوو بۆ سەفەر، کە لەسەر پشتی وشترەکەی رێك دادەنیشت، سێ‌جار لەسەر یەك دەیفەرموو: (اللّهُ أكْبَر) دوا ئەوە دیفەرموو: (سُبْحَانَ الَّذِى سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ. اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِى سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى، وَمِنَ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى، اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ، اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِى السَّفَرِ، وَالْخَلِيفَةُ فِى الأَهْلِ، اللَّهُمَّ إِنِّى أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ، وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِى الْمَالِ وَالأَهْلِ) واتە: ئەو کەسەی ئەمەی بۆ ئێمە رام کردووە خوایەکی بێ نەنگو بێ گەردە، ئەمە لە سایەی رەحمەتی ئەووەیە، دەنا ئێمە دەرەقەتی ئەمە نەدەهاتین، بێ گومان شەلە باوانو کوێرە باوان، پەناو پاسارمان هەر لای خودایەو، بە داماوی دەچینە بەردەستی خۆی! خودایە! لەم سەفەرەماندا خێرو چاکەو تەقواو لەخودا ترسانمان بەنسیب بفەرموو، هەروەها کارێکیش کە جێگەی رەزامەندی تۆبێ، خودایە! ئەم سەفەرەمان بۆ ئاسان بفەرموو، وەتەنگی زەویمان بۆ بکێشەو رێگەی دوورمان بۆ نزیك بکەرەوە، خودایە! هاوڕێی پارێزەری تەواو هەر تۆی لەسەفەردا،

خـۆتیش چاودێری کـەس‌و کارمـانی، لـەکاتی ئـەم سـەفەرەماندا، کـە ئیمـە لێیـان دابڕاوین!

پەروەردگارم! پەنا دەگرم بەتۆ لە ڕەنج‌و مەینەتی ڕێگەو بان‌و سـەفەر، وە لـە چوونەوە بەسەر دیمەنی خراپ‌و حاڵی ناخۆشی خەماویی ماڵ‌و منداڵ‌و خێزاندا، وە لەوەیش کە بەپەستی‌و دڵتەنگی، لەم سەفەرەیەم بگەڕێمەوە).

فـەرمووی: کاتـێ دەشـگەڕایەوە هـەر ئـەم وشانەی دەخوێنـد، بـەڵام ئەمـەی لێ زیـاتر دەکـردن: (آيِبُـونَ تَـائِبُونَ عَابِـدُونَ لِرَبِّنَـا حَامِـدُونَ): ئـەوا بەپشـتی خـودا دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەوەمان، لە گوناهەکانمان پەشیمانین، بـەردەوام بەنـدەیی ساخ، بـۆ خـودای پـەروەردگارمان دەکـەین‌و لـە سـوپاس‌و ستایشـی درێغـی ناکـەین). {ریاض/٢٥/٣، زنجیرە: ١٧٠، ژمارە: ٩٧٢}.

### ٥١٤) سەفەری ژن بۆ حەج لەگەڵ مرۆڤی خۆیی دا (٣٢٤٥ - ٣٢٦١)

### بابٌ: سفر المرأة إلى الحجّ مع ذي محْرَم

٦٤٥- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنـه ) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم): « لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَنْ تُسَافِرَ سَفَرًا يَكُونُ ثَلاَثَـةَ أَيَّـامٍ فَصَاعِدًا، إِلاَّ وَمَعَهَا أَبُوهَا، أَوِ ابْنُهَا، أَوْ زَوْجُهَا، أَوْ أَخُوهَا، أَوْ ذُو مَحْرَمٍ مِنْهَا ». {الحديث: ٣٢٥٧ = ٣٢٤٦ ف.م = فتح الملهم. تجريد/٢/٢٤٦ رقم: ٨٥١ = ١٨٦٤، ٥٨٦، ١١٨٨، ١١٩٧، ١٩٩٢، ١٩٩٥. أبو داود. مناسك: ١٧٢٦. ترمذي. رضاع: ١١٦٩}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (دروست نییە بۆ ژن (ئەگەر باوەڕی ساخی بـە خوداو بـە ڕۆژی دوایـی هەیە کە بچێ بۆ سـەفەری وا، کـە سـێ ڕۆژە ڕێ بـێ یـا زیـاتر، مەگـەر بەمـەرجێ، باوکی، یا کوڕی، یا مێردی، یا برای، یا کەسێکی خۆیی (مـەحرەم)ی لـەو سـەفەرەدا لەگەڵ بێ).

٦٤٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُسَافِرُ مَسِيرَةَ يَوْمٍ إِلاَّ مَعَ ذِى مَحْرَمٍ ». {الحديث: ٣٢٥٤ = ٣٢٤٣ ف.م. تجريد/١/٥٢٣، رقم: ٥٤٩ = ١٠٨٨. تحفة الأشراف: ١٤٣٢٣}:

ئـەبو هـورەيرە (رەزای خـودای لێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەويسـت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (ئەو ژنـەی بـاوەڕی تـەواوی بـە خـوداو بـەرۆژی دوایـی هەیـە، دروست نییە بۆی کە بەبێ کەسێکی خۆیی (واتـە: مـەحرەم) بچـێ بـۆ سـەفەرێ، کـە رۆژە رێیێ، یا زیاتر، دووربێ).

٦٤٧- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) يَخْطُبُ يَقُولُ: « لاَ يَخْلُوَنَّ رَجُلٌ بِامْرَأَةٍ إِلاَّ وَمَعَهَا ذُو مَحْرَمٍ، وَلاَ تُسَافِرِ الْمَرْأَةُ إِلاَّ مَعَ ذِى مَحْرَمٍ ». فَقَامَ رَجُلٌ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِى خَرَجَتْ حَاجَّةً، وَإِنِّى اكْتُتِبْتُ فِى غَزْوَةِ كَذَا وَكَذَا، قَالَ: « انْطَلِقْ فَحُجَّ مَعَ امْرَأَتِكَ ». {الحديث: ٣٢٥٩ = صحيح مسلم بِشَرْحِ الإِمَامِ النَّوَوِىِّ، تخريج الشيخ خليل مَأْمُون شيحا = ٣٢٤٨ ف.م. تجريد/٣/٣٥٥، رقم: ١٢٣١ = ٣٠٠٦، ١٩٦٢، ٣٠٦١، ٥٢٣٣. تحفة الأشراف: ٦٥١٤}:

ئیبنـو عـەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: لـە پێغەمبـەرم بیست وتـاری دەدا، دەیفـەرموو: (نابـێ پیـاوو ژنـی بیـانی بەتـەنها، دوو بـەدوو، لەشوێنێکا کۆببنـەوە، مەگەر ژنەکە خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ، ئافرەتیش نابێ بچێ بۆ سەفەری دوور مەگەر خۆیی (مەحرەم)ی لەگەڵدا بێ). پیاوێ هەستا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! مـن خـۆم بـۆ ئـەو غەزایـە نـاونووس کـراوم‌و ژنەکەشـم چـووە بـۆ حـەج؟! فەرمووی: (دەی خۆشت برۆ لەگەڵ ژنەکەتا بۆ حەج). {بڕوانە: تەجرید/٢، ژمارە: ٨٥١ بە کوردی}.

## ٥١٥) حەجی مناڵ، ئەو کەسەشی حەجی پێ دەکا خێری دەکا (٣٢٤٠ - ٣٢٤٠)
## باب: حَجُّ الصَّبِيِّ وَأَجْرُ مَنْ حَجَّ بِهِ

٦٤٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): لَقِىَ رَكْبًا بِالرَّوْحَاءِ فَقَالَ: « مَنِ الْقَوْمُ »؟ قَالُوا: الْمُسْلِمُونَ. فَقَالُوا: مَنْ أَنْتَ؟ قَالَ: «رَسُولُ اللَّهِ

))، فَرَفَعَتْ إِلَيْهِ امْرَأَةٌ صَبِيًّا فَقَالَتْ: أَلِهَذَا حَجٌّ؟ قَالَ: « نَعَمْ، وَلَكِ أَجْرٌ ». {الحديث: ٣٢٤٠ = ٣٢٢٩ ف.م. أبو داود. مناسك: ١٧٣١. نسائى. مناسك الحج: ٢٦٤٦ تحفة الأشراف: ٦٣٣٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە ڕەوحا کە نزیکەی چل میلێ لە مەدینەوە دوورە، پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشت بە کۆمەڵە سوارێ، نەیناسین، لێی پرسین: ئێوە کێن؟ گوتیان: موسوڵمانین، ئەی تۆ کێی؟ فەرمووی: موحەممەدی پێغەمبەری خودام، جا ئافرەتێ منداڵێکی خۆی هەڵبڕی‌و نیشانی پێغەمبەری داو گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئایا حەج بۆ ئەم منداڵە دەبێ؟ فەرمووی: (بەڵێ بۆی دەبێ، وە بۆتۆش پاداشی باش هەیە لەسەر ئەوە کە حەجی پێ دەکەی، چونکە مامۆستای خێر وەك خێرکەر وایە). {تاج/١، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ١٤٩١}.

## ٥١٦) حەجکردن لەجیاتی کەسێ کە خۆی توانای سواری نەبێ. (٣٢٣٨ - ٣٢٣٩)

## باب: الحَجُّ عَمَّنْ لاَ يَسْتَطِيعُ الرُّكُوب

٦٤٩- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: كَانَ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ رَدِيفَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَجَاءَتْهُ امْرَأَةٌ مِنْ خَثْعَمَ تَسْتَفْتِيهِ، فَجَعَلَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهَا، وَتَنْظُرُ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصْرِفُ وَجْهَ الْفَضْلِ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ فَرِيضَةَ اللَّهِ عَلَى عِبَادِهِ فِى الْحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِى شَيْخًا كَبِيرًا لاَ يَسْتَطِيعُ أَنْ يَثْبُتَ عَلَى الرَّاحِلَةِ. أَفَأَحُجُّ عَنْهُ؟ قَالَ: « نَعَمْ ». وَذَلِكَ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ. {الحديث: ٣٢٣٨ = ٣٢٢٧ ف.م. تجريد/٢/١٥٧، ژمارە: ٧١٨ = ١٥١٣، ١٨٥٤، ١٨٥٥، ٤٣٩٩، ٦٢٢٨. أبو اود. منا سك: ١٨٠٩. نسائى. حج: ٢٦٣٣. تحفة: ٥٦٧٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، فەضلی برام لە پاشکۆی پێغەمبەردا بوو، لەوکاتەدا، ژنێ لە هۆزی خەثعەم هات، پرسیاری هەبوو، فەزڵ دەستی کرد بە تەماشا کردنی ژنەکە، ژنەکەیش دەستی کرد

به تەماشاكردنی فەزڵ، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی نا بەڕووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، تا ڕێگەی تەماشا كردنی بگرێ، ژنەكە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! حەج كە فەرزی خودایە لەسەر بەندەكانی، كەوتۆتە سەر باوكم، لە حاڵێكا كە پیرە مێردێكی ئیختیاری وایە، خۆی بەسەر وڵاخەوە ناگرێ، جا ئایا مرۆڤی پەككەوتووی وا حەجی لەسەر ەمێنێ؟ وە ئاشكرایە، ئەگەر حەجی لەسەر دەمێنێ، كەخۆی ناتوانێ حەج بكا، ائایا دەبێ كە من لەباتی خۆی حەجی بۆ بكەم؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئا، حەجی لەسەر دەمێنێ، وە دەیشبێ كە تۆ حەجی بۆ بكەی، یا كەسێ تر حەجی بۆ بكا). ئەم پرسیارو وەڵامەیش لەكاتی حەجی ماڵاواییدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم بەهرانە لەم فەرموودەیە وەردەگیرێن:

١. حەج فەرزە.

٢. كاتێ حەج لەسەر كەسێ پێویست بوو، ئەگەر لەبەر هۆیەكی ڕەوا خۆی نەیدەتوانی حەج بكا، دەبێ وەكیل حەجێ بگرێ، حەجی بۆ بكا، وەكیل حەج دروستە پیاو بێ یا ژن بێ، ئەگەر خۆی نەیكرد كەسوكاری هەڵ دەستن بەهەمان شت.

٣. فەزڵی كوڕی عەباس، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، برای هەقی ئیبنو عەباسە، لەیەك باوكو دایكن، كوڕی گەورەی ئیمامی عەباسە، لە غەزای مەككەو غەزای حونەینا لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕێز لینان لە پاشكۆی خۆیەوە سواری كردبوو، لەكاتی شۆردنی تەرمی پیرۆزی پێغەمبەردا، عەلیو فەزڵو ئوسامەی كوڕی زەید شۆردیان، هەر ئەوانیش تەرمەكەیان داهێڵایە ناو گۆڕەكەوە، عەلی تەرمەكەی دەشۆردو فەزڵ ئاوەكەی دەكرد بە دەستیدا، فەزڵ پیاوێكی جوانی، قژ جوانی سپیلكەی قۆز بوو، زۆر كەس فەرموودەیان لێیەوە گێڕاوەتەوە، وەك عەبدوڵلای برایو ئەبو

هورەیرەو تەنانەت عەباسی باوکیشی یەك فەرموودەی لەوەوە گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی ژنی بۆ هێناو، خۆی مارەیەکەیشی دا، یەك کچی لەدوا بەجێ ما، ناوی ئوم کولثووم بوو، شووی کرد بە حەسەنی کوڕی عەلی، لەپاش ئەو شووی کرد بە ئەبو مووسای ئەشعەری، راجیاییەکی زۆر هەیە لەبارەی مێژووی مەرگیەوە، وا دەردەکەوێ کە ئیبنو عەبباسی برای، ئەم فەرموودەیەی لە فەزڵی برایەوە وەرگرتووە). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ١٤٨٥}.

**٥١٧) چۆنێتی ئیحرام دابەستنی ژنی بێنوێژو ژنی زەیستان** (٢٩٠٠ - ٢٩٠١)

**بابٌ: فِي الحَائِضِ وَالنُّفَسَاءِ إِذَا أَرَادَتَا الإِحْرَامَ**

٦٥٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: نُفِسَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ بِمُحَمَّدِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ بِالشَّجَرَةِ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَبَا بَكْرٍ يَأْمُرُهَا أَنْ تَغْتَسِلَ وَتُهِلَّ. {الحديث: ٢٩٠٠ = ٢٨٨٤ ف.م = فم. أبو داود. مناسك: ١٧٤٣. ابن ماجة. مناسك: ٢٩١، تحفة الأشراف: ١٧٥٠٢}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەسمائی کچی عومەیس، کە هاوسەری ئەبوبەکری صەدیق بوو، لە حەجی ماڵ ئاواییدا، لە نزیك درەختەکەی ذولحەیفە، موحەمەدی کوڕی ئەبوبەکری بوو، کاتێ پێغەمبەریان لە حاڵەکەی ئاگادار کردەوە، فەرمانی کرد بە ئەبوبەکری مێردی، کەپێی بڵێ، خۆی بشۆرێو ئیحرامی حەج دابەستێ.

**٥١٨) باسی نیشانەی کاتو وادەو شوێنی دابەستنی ئیحرامی حەجو عەمرە** (٢٧٩٥ - ٢٨٠٢)

**باب: فِي المَوَاقِيتِ فِي الحَجِّ وَالعُمْرَةِ**

٦٥١- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: وَقَّتَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَهْلِ الْمَدِينَةِ ذَا الْحُلَيْفَةِ وَلأَهْلِ الشَّامِ الْجُحْفَةَ، وَلأَهْلِ نَجْدٍ: قَرْنَ الْمَنَازِلِ، وَلأَهْلِ

الْيَمَنِ: يَلَمْلَم، قَالَ: « فَهُنَّ لَهُنَّ وَلِمَنْ أَتَى عَلَيْهِنَّ مِنْ غَيْرِ أَهْلِهِنَّ، مِمَّنْ أَرَادَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ، فَمَنْ كَانَ دُونَهُنَّ فَمِنْ أَهْلِهِ، وَكَذَا فَكَذَلِكَ حَتَّى أَهْلُ مَكَّةَ يُهِلُّونَ مِنْهَا ». {الحديث: ٢٧٩٥ = ٢٧٧٩ فم. تجريد/٢/١٦٠، رقم: ٧٣٣ = ١٥٢٤، ١٥٢٦، ١٥٢٩، ١٥٣٠، ١٨٤٥. أبو داود. حج: ١٧٣٨. نسائی. حج: ٢٦٥٧ تحفة الأشراف: ٥٧٣٨}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زولحولەیفە، کە ئێستا ناوداره بە بیری عەلی، ئەو شوێنەی دیاری کردووە بۆ جێگەی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە، وە بۆ خەڵکی شامیش جوحفە، وە بۆ خەڵکی نەجدیش قەرنولمەنازیل، وە بۆ خەڵکی یەمەنیش یەلەملەم، وە فەرمووی: (ئەم شوێنانە جێگەی ئیحرام دابەستنن بۆ ئەو کەسانەی کە دێن بۆ حەج و عەمرە، لە خەڵکی ئەم وڵاتانەو لە خەڵکی ئەو وڵاتانەی تریش کە بەسەر ئەم شوێنانەدا دێن بۆ حەج و عەمرە، وە کەسێ لەم شوێنانەی کە ناومان هێنان نزیکتر بوو، ئەوە جێگەی ئیحرام دابەستنی لەو شوێنەوەیە کە خەڵکی ئەوێیەو لەو شوێنەوەیە کە لێیەوە دەکەوێتە ڕێ! ئیتر هەروا بەم پێ و دانە، هەتا نزیکتر بێ جێگە ئیحرام دابەستنەکەشی نزیکترە، تەنانەت خەڵکی مەککە، لەناو مەککەوە ئیحرام دادەبەستن). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ١٤٩٦}.

٦٥٢- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ: أَنَّهُ سَمِعَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضی الله عنهما) يُسْأَلُ عَنِ الْمُهَلِّ؟ فَقَالَ: سَمِعْتُ (أَحْسِبُهُ رَفَعَ إِلَى النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: مُهَلُّ أَهْلِ الْمَدِينَةِ مِنْ ذِي الْحُلَيْفَةِ، وَالطَّرِيقُ الآخَرُ الْجُحْفَةُ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الْعِرَاقِ مِنْ ذَاتِ عِرْقٍ، وَمُهَلُّ أَهْلِ نَجْدٍ مِنْ قَرْنٍ، وَمُهَلُّ أَهْلِ الْيَمَنِ مِنْ يَلَمْلَمَ ». {الحديث: ٢٨٠٢ = ٢٧٨٦ فم}:

ئەبو زوبەیر فەرمووی: بیستم لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) پرسیاری لێکرا، لەبارەی جێگەی ئیحرام دابەستنەوە، فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە زولحولەیفەیە، لە ڕێگەی تری مەدینەشەوە شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە جوحفەیە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی عێراقیش زاتوعیرقە، کە چل و دوو میل لە

مەککەوە دوورە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی نەجد قەرنە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی یەمەن لە یەلەملەمەوەیە).

**ڕوونکردنەوە:**

ئەبو زوبەیر گومانی بۆ پەیدا بوو بوو، کە جابیر ئەم فەرموودەیەی لە پێغەمبەر بیستووە، یانا؟ لەگەڵ ئەوەیشا فەرمووی: وادەزانم کە جابیر فەرمووی لە پێغەمبەرم بیست، دەیفەرموو: شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە زولحولەیفەیە، لە ڕێگەی تری مەدینەشەوە شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی مەدینە جوحفەیە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی عێراقیش زاتوعیرقە، کە چڵو دوو میل لە مەککەوە دوورە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی نەجد قەرنە، شوێنی ئیحرام دابەستنی خەڵکی یەمەن لە یەلەملەمەوەیە).

## ٥١٩) بۆنی خۆش بۆ ئیحرامدار لەپێش ئیحرام دابەستندا (٢٨١٦ - ٢٨٣٦)
## باب: الطِيبُ للمُحْرِمِ قَبْلَ أنْ يُحْرِمَ

٦٥٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: طَيَّبْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِى لِحُرْمِهِ حِينَ أَحْرَمَ، وَلِحِلِّهِ حِينَ أَحَلَّ، قَبْلَ أَنْ يَطُوفَ بِالْبَيْتِ. {الحديث: ٢٨١٨ = ٢٨٠٢ ف.م. تجريد/٢/١٦٤، رقم: ٧٣٩ = ١٥٣٩، ١٧٥٤، ٥٩٢٢، ٥٩٢٨، ٥٩٣٠. أبو داود. مناسك: ١٧٤٥. نسائي. حج: ٢٦٨٤. تحفة الأشْرَاف: ١٧٥١٨}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لە هاوسەرە پاکیزەکانی) فەرمووی: بۆخۆم بۆنی خۆشم دەدا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام بەستندا، بەڵام لەپێش ئەوەدا کە ئیحرام ببەستێو بەرگی ئیحرام لەبەر بکا، وە هەروەها بۆ ئیحرام شکاندنیش، لەپاش ڕەجمی شەیتانو سەرتاشین، لەپێش ئەوەدا، کە تەوافی بەیت بکا، بۆنی خۆشم لە پێغەمبەر دەدا). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٥}.

٦٥٤- عَنْ عَائِشَةُ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَأَنِّى أَنْظُرُ إِلَى وَبِيصِ الْمِسْكِ فِى مَفْرِقِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ مُحْرِمٌ. {الحديث: ٢٨٢٤ = ٢٨٠٨ فم. تجريد/١/٢٠٣، رقم: ١٨٩ = ٢٧١، ١٥٣٨، ٥٩١٨، ٥٩٢٣. نسائي. مناسك: ٢٦٩٤، أبو داود. مناسك: ١٧٤٦}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێستاش هەر لەبەر چاومە کە چۆن شوێنی جیاکردنەوەی مووی سەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لە ناوەڕاستا مووەکەی سەری دەکرد بەدوو بەشەوە، بریسکەی میسکەکەی پێوە بوو، کە لەپێشی ئیحرام بەستندا لێی دابوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٥}.

## ٥٢٠) میسك بۆن خۆشترین بۆنی خۆشه (٥٨٤٢ - ٥٨٤٥)
## باب: المسْكُ؟ أطيَبُ الطِيب

٦٥٥- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ذَكَرَ امْرَأَةً مِنْ بَنِى إِسْرَائِيلَ حَشَتْ خَاتَمَهَا مِسْكًا، وَالْمِسْكُ أَطْيَبُ الطِّيبِ. {الحديث: ٥٨٤٣ = ٥٨٣٥ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ژنێ هەبوو لەنەوەی ئیسرائیل بوو، لە ڕەگەزی جوولەکە بوو، کورتە باڵا بوو، ویستی لەنێوانی دوو ژنی باڵا بەرزا بڕوا، جووتێ پانی بەرزی دارینی لەپێکرد، ئەموستیلەیەکی زێڕی ناوبۆشی پڕکرد لە میسك و دەرگای میسك تێخنینەکەی داخست کە دیارە میسك بۆن خۆشترین بۆنی خۆشە، جا لەسەر ئەوحاڵە لەنێوانی دوو ژنە باڵا بەرزەکەدا، دەستی کرد بە ڕۆیشتن، وەك ئەوان باڵای بەرز بوو، لەبەرئەوە کەس نەیناسیەوە کە ئەوە ژنە باڵا کورتەکەیە لەکاتی تێپەڕبوونەکەیدا، بەدەستی ئاوا ئاماژەی کرد). شوعبە، بۆ ڕوونکردنەوەی ئاماژەی ژنەکە بەدەستی، دەستی خۆی ڕاوەشان، کە ئاوایکردووە.

**روونكردنەوە:**

١.گەرچی میسك، لە دەردراوەكان (ئیفرازات)ی لەشی جۆرە ئاسكێكە، كەپێی دەگوترێ: (غَزَالُ المِسْك: ئاسكی میسك) بەلاَم دادەنرێ بە پاكو هەلگرتنو بەكارهێنانو كڕینو فرۆشتنی دروستە، چونكە كۆمەلێ فەرموودەی ساخ لەم بارەیەوە هەیە.

٢. ئافرەت بەتایبەتی ژنی مێردار، ئەگەر بۆ مەبەستی دروست، بەم جۆرە فێلّە رەوایەو بەم جۆرە حیلە شەرعییە، كەموكورتی خۆی داپۆشێ رەوایەو دروستەو گوناهی ناگا، بەلكوو خێریشە، چونكە خۆی لەبەرچاوی مێردەكەی شیرین دەكاو ناشهێلێ كە خەلك غەیبەتی بكەن، بەلاَم شتی وا لەبەر فیزو دەعیەو تەفرە دانو شتی تری وا نادروستەو تاوانە.

### ٥٢١) باسی داری عوودو كافوور (٥٨٤٢ - ٥٨٤٥)
### باب: الألُوَّةُ وَالكَافُورُ

٦٥٦- عَنْ نَافِعٍ قَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ (رضى الله عنهما) إِذَا اسْتَجْمَرَ اسْتَجْمَرَ بِالأَلُوَّةِ غَيْرِ مُطَرَّاةٍ، وَبِكَافُورٍ يَطْرَحُهُ مَعَ الأَلُوَّةِ ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا كَانَ يَسْتَجْمِرُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٥٨٤٥ = ٥٨٣٨ فم}:

نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ عەبدوللاَی كوڕی عومەر، بۆنی خۆشی بەكاردەهێنا، گەلێ جار بەدار عوودی رووت خۆی بۆنخۆش دەكرد، بۆنی خۆشی تری تێكەل نەدەكرد، گەلێ جاریش بە كافوری ئامێتەی دار عوود خۆی بۆنخۆش دەكردو دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوا خۆی بۆنخۆش دەكرد).

**روونكردنەوە:**

نافیعی كوڕی سەرجیس (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) تابیعییە، هاوەلّی زۆری پێغەمبەری دیوە، ئازادكراوی ئیبنو عومەر بوو، فەقێشی بوو، فەرموودەی زۆری لەوەوە گێڕاوەتەوە، لە بنەڕەتدا خەلكی مەغریبە، لە غەزایەكا د یل كراو بەرپشكی ئیبنو عومەر كەوت، لە خزمەتی ئیبنو عومەردا بوو تا كاتی مەرگی، زانستو

فەرموودەیەکی زۆری لە ئیبنو عومەر وەرگرت، عومەری کوڕی عەبولعەزیز، کاتێ جێنشین بوو، ناردی بۆ میصر، هەتا خەڵکەکەی لە شەریعەتو سوننەتی پێغەمبەردا شارەزا بکا، وە لەومەودایەدا ڕۆڵێکی جوانی بینی، زۆربەی فەرموودە زانە گەورەکان گێڕانەوەیان لێوە ئەنجام داوە، لەکۆی گێڕانەوەکانیا هەڵەی لێ نەبینراوە، ناسراوە بە نافیعی فەقیە، بوخاری دەفەرموێ: (دروستترین رشتەی فەرموودە: مالیکە، لە نافیعەوە، لە ئیبنو عومەرەوە). عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیفەرموو: (نافیع بەهرەو خەڵاتی خوای گەورەیە، بەخشیوێتی بە ئێمەی گەلی ئیسلام). بەهێزترین را ئەوەیە کە ساڵی سەدو حەڤدەی کۆچی لە مەدینە، مەرگ بوو بەمیوانی (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای گەورەی لێ بێ).

### ٥٢٢) باسی ڕێحانە. (٥٨٤٢ - ٥٨٤٥)
### باب: في الريحان

٦٥٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ عُرِضَ عَلَيْهِ رَيْحَانٌ فَلاَ يَرُدُّهُ، فَإِنَّهُ خَفِيفُ الْمَحْمِلِ طَيِّبُ الرِّيحِ ». {الحديث: ٥٨٤٤ = ٥٨٣٧ فم. أبو داود. ترجُّل: ٤١٧٢. نسائی. زينة: ٥٢٧٤. تحفة الأشراف: ١٣٩٤٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەرکەسێ ڕێحانە، یا هەر بۆنێکی خۆشی پێشکەش کرا، دەستی پێوە نەنێو وەری بگرێ، چونکە سەرەڕای بۆنە خۆشەکەی هەڵگرتنیشی ئاسانو خۆشە). {تاج/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٢٩٢٣}.

### ٥٢٣) ئیحرام دابەستن لەلای مزگەوتەکەی ذولحولەیفە. (٢٨٠٨ - ٢٨٠٩)
### باب: الإحرام من عند مسجد ذى الحليفة

٦٥٨- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ أَنَّهُ سَمِعَ أَبَاهُ يَقُولُ: بَيْدَاؤُكُمْ هَذِهِ الَّتِى تَكْذِبُونَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا! مَا أَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلاَّ مِنْ عِنْدِ الْمَسْجِدِ، يَعْنِى ذَا الْحُلَيْفَةِ. {الحديث: ٢٨٠٩ = ٢٧٩٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٤١ = ١٥٤١. نسائی: حج: ٢٥٥٨. أبو داود. حج: ١٧٧١. ترمذی. حج: ٨١٨}:

سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بیستم لەباوکم دەیفەرموو: ئەم بەیدایەی کە ئێوە بەدرۆ دەڵێن پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ ئیحرامی دابەست، شتی وانییە، چونکە بەبێ گومان کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەلای مزگەوتەکەی زولحولەیفەدا ئیحرامی دابەستو بەرگی ئیحرامی پۆشی).

## ٥٢٤) کاتی ئیحرام دابەستن، ئەوکاتەیە کە وڵاخەکەی ڕێك هەڵ دەستێتە سەرپێ (٢٨١٠ - ٢٧٩٤)

## باب: الإِهْلاَلِ حِينَ تَنْبَعِثُ الرَّاحِلَةُ

٦٥٩- عَنْ عُبَيْدِ بْنِ جُرَيْجٍ أَنَّهُ قَالَ لِعَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ رَأَيْتُكَ تَصْنَعُ أَرْبَعًا لَمْ أَرَ أَحَدًا مِنْ أَصْحَابِكَ يَصْنَعُهَا. قَالَ: مَا هُنَّ يَا ابْنَ جُرَيْجٍ؟ قَالَ: رَأَيْتُكَ لاَ تَمَسُّ مِنَ الأَرْكَانِ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ. وَرَأَيْتُكَ تَلْبَسُ النِّعَالَ السِّبْتِيَّةَ، وَرَأَيْتُكَ تَصْبُغُ بِالصُّفْرَةِ، وَرَأَيْتُكَ إِذَا كُنْتَ بِمَكَّةَ أَهَلَّ النَّاسُ إِذَا رَأَوُا الْهِلاَلَ، وَلَمْ تُهْلِلْ أَنْتَ حَتَّى يَكُونَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ، فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ: أَمَّا الأَرْكَانُ فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَمَسُّ إِلاَّ الْيَمَانِيَيْنِ، وَأَمَّا النِّعَالُ السِّبْتِيَّةُ فَإِنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَلْبَسُ النِّعَالَ الَّتِى لَيْسَ فِيهَا شَعَرٌ، وَيَتَوَضَّأُ فِيهَا، فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَلْبَسَهَا. وَأَمَّا الصُّفْرَةُ فَإِنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَصْبُغُ بِهَا فَأَنَا أُحِبُّ أَنْ أَصْبُغَ بِهَا، وَأَمَّا الإِهْلاَلُ، فَإِنِّى لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُهِلُّ حَتَّى تَنْبَعِثَ بِهِ رَاحِلَتُهُ. {الحديث: ٢٨١٠ = ٢٧٩٤ فـم. تجريد/١، رقم: ١٢٨ = ١٦٦، ١٥١٤، ١٥٥٢، ١٦٠٩، ٢٨٦٥، ٥٨٥١. أبو داود. حج: ١٧٧٢. نسائي. طهارة: ١١٧}:

عوبەیدی کوڕی جورەیج، بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەری فەرموو: ئەی باوکی عەبدورەحمان! دەبینم کەتۆ چوارشت دەکەی نابینم کە زۆرینەی هاوەڵانی پێغەمبەر، لە برادەرانی تۆ، کە ئەو چوار شتە بکەن، هۆی ئەمە چییە؟ فەرمووی: ئەی کوڕی جورەیج! مەبەستت کام چوار شتەیە؟ عەرزیم کرد: دەتبینم لەکاتی تەوافی کابەدا، لەچوار گۆشەکەی کابە، تەنیا ئەو دوو گۆشەیە دەست پیادەهێنیو ماچیان دەکەی کە ناودارن بەدوو گۆشە یەمانییەکان، کە بریتین لە گۆشەی

حەجەرولئەسوەدو گۆشەی یەمانی، دوو گۆشەکەی تر کە پێیان دەگوترێ: دوو گۆشە شامییەکان نەماچیان دەکەیتو نەدەستیان پیادا دەهێنی، دەیشت بینم سۆلی سەبتیش لەپێ دەکەی، کە بەسۆلی چەرمی خۆشەکراوی بێ کوڵکو موو دەگوترێ، هەروا دەیشت بینم کە مووی خۆتو پۆشاکی خۆت بەڕەنگی زەرد رەنگ دەکەی، مەردومیش لە مەککە، کە مانگی نوێی قوربانیان دی، ئیتر ئیحرامی حەج یا عەمرە دادەبەستنو بەرگی ئیحرام لەبەردەکەن، کەچی تۆ کاتێ لە مەککە دەبی، هەتا رۆژی هەشتەمی مانگی قوربان، کە ناودارە بە رۆژی تەروییە، ئیحرام دانابەستیو، کە رۆژی تەروییە هات ئەوجا ئیحرام دادەبەستی، جا عەبدوللای کوڕی عومەر فەرمووی: دەبا بۆت روون بکەمەوە کە بۆ وا دەکەم: من بۆیە بەس دەست دەهێنم بە دوو گۆشە یەمانییەکانی کابەداو تەنیا ئەو دوو گۆشەیە ماچ دەکەم، چونکە نەمدیوە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەم دوو گۆشەیە گۆشەکانی تری کابە ماچ بکا، یا دەستیان پیادا بهێنێ، وە پێغەمبەریشم بەچاوی خۆم دیوە کە سۆلی سەبتی لەپێ دەکرد وە دەستنوێژی پێیەوە دەگرت، بۆیە منیش حەزدەکەم کە ئەو جۆرە سۆلە لەپێ بکەم، چونکە بتپەرستەکان زۆرتر سۆلی چەرمی خاویان لەپێ دەکرد، بەکارهێنانی رەنگی زەردیش لەبەرئەوەیە، کەمن خۆم دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رەنگی زەردی بەکاردەهێنا، لەبەرئەوە منیش حەزدەکم ئەو رەنگە بەکاربهێنمو لەوەدا پێغەمبەر بکەم بەسەر مەشق بۆ خۆم، مەسەلەی ئیحرام دابەستنیش ئەوەی من دیومە، ئەمەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ ئیحرامی دادەبەست، کەوڵاخەکەی لەژێریدا هەڵدەستایە سەرپێو بەرەو مینا دەکەوتە رێ، بۆیە منیش وادەکەمو لەو کاتەدا ئیحرام دادەبەستمو حەج لەخۆم فەرز دەکەمو ئیتر دەست دەکەم بە لەبەیکە کردن!).

## ٥٢٥) دابەستنی حەج لەناو مەککەدا. (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)

## باب: فِي الإِهْلاَلِ بِالحَجِّ مِنْ مَكَّةَ

٦٦٠- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْنَا مُهِلِّينَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِحَجٍّ مُفْرَدٍ، وَأَقْبَلَتْ عَائِشَةُ بِعُمْرَةٍ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِسَرِفَ عَرَكَتْ عَائِشَةُ حَتَّى إِذَا قَدِمْنَا طُفْنَا بِالْكَعْبَةِ وَالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَحِلَّ مِنَّا مَنْ لَمْ يَكُنْ مَعَهُ هَدْىٌ، قَالَ: فَقُلْنَا: حِلُّ مَاذَا؟ قَالَ: الْحِلُّ كُلُّهُ، قَالَ: فَوَاقَعْنَا النِّسَاءَ، وَتَطَيَّبْنَا بِالطِّيبِ، وَلَبِسْنَا ثِيَابَنَا، وَلَيْسَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ عَرَفَةَ إِلاَّ أَرْبَعُ لَيَالٍ، ثُمَّ أَهْلَلْنَا يَوْمَ التَّرْوِيَةِ، ثُمَّ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى عَائِشَةَ، فَوَجَدَهَا تَبْكِى، فَقَالَ: «مَا شَأْنُكِ؟» قَالَتْ: شَأنِى أَنِّى قَدْ حِضْتُ وَقَدْ حَلَّ النَّاسُ وَلَمْ أَحْلِلْ، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَالنَّاسُ يَذْهَبُونَ إِلَى الْحَجِّ الآنَ، فَقَالَ: « إِنَّ هَذَا أَمْرٌ كَتَبَهُ اللَّهُ عَلَى بَنَاتِ آدَمَ فَاغْتَسِلِى ثُمَّ أَهِلِّى بِالْحَجِّ ». فَفَعَلَتْ، وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهَرَتْ طَافَتْ بِالْكَعْبَةِ، وَالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، ثُمَّ قَالَ: « قَدْ حَلَلْتِ مِنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ جَمِيعًا ». فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى أَجِدُ فِى نَفْسِى أَنِّى لَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ حَتَّى حَجَجْتُ، قَالَ: « فَاذْهَبْ بِهَا يَا عَبْدَ الرَّحْمَنِ فَأَعْمِرْهَا مِنَ التَّنْعِيمِ ». وَذَلِكَ لَيْلَةَ الْحَصْبَةِ. {الحديث: ٢٩٢٩ = ٢٩١٣ فم. أبو داود. حج: ١٧٨٥. نسائى. حج: ٢٧٦٢. تحفة الإشراف: ٢٩٠٨}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا، كەوتینە ڕێ، لە شوێنی تایبەت ئیحرامی حەجمان بەجیا دابەست، بەڵام عائیشە بەس ئیحرامی عەمرەی دابەست، كەوتینەڕێ هەتا گەیشتینە سەریف، كە دەمیل لە مەككەوە دوورە، لەوێ عائیشە كەوتە سەر بێنوێژی، جا كاتێ گەیشتینە مەككە، لەوێ تەوافی بەیتمان كردو تەوافی صەفاو مەڕوەمان كرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان كرد: كە هەركەسێ لەئێوە دیاریی بەیتی پێ نییە، با ئیحرامەكەی بشكێنێ). فەرمووی: گوتمان: قوربان بەم ئیحرام شكاندنە چیمان بۆ حەڵاڵ دەبێ، لەوەی كە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە، لێمان قەدەغە بووە؟ فەرمووی: (هەموو شتێكتان بۆ حەڵاڵ دەبێتەوە، وەك پێش ئیحرام دابەستن).

جابیر فەرمووی: جا هەمانبوو حەڵاڵو هاوسەری خۆی لەگەڵدا بوو، وەك لەوەو پێش دروست بوو لەگەڵ حەڵاڵو هاوسەری خۆی، هەروا بۆنی خۆشمان دا لەخۆمانو جلو بەرگی ئاسایی خۆمان لەبەرکردەوەو بەرگی ئیحرامەکەمان دانا، هەمووی چوار شەومان مابوو بۆ شەوی عەرەفە، لەپاشا لە رۆژی هەشتی مانگا، کەپێی دەگوترێ رۆژی تەروییە، ئیحرامی حەجمان دابەستو بەرگی ئیحراممان پۆشیو دەستمانکرد بە لەبەیکە کردن!

لەپاشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچێ بۆلای عائیشەی هاوسەری، دەبینێ کە عائیشە دەگری، پێی دەفەرموێ: (چیتە خێرە کەوا دەگری؟) دەڵێ: ئەوەبوو من کەوتمە سەر بێنوێژیو خەڵك لەم ماوەیەدا، عەمرەیەکیان ئەنجامداو ئیحرامیان شکاند، ئێستایش ئەوەتا ئیحرامی حەجیان دابەستووەو دەڕۆن بۆ کێوی عەرەفە بۆ حەج، منیش نە عەمرەم کردو نە ئیحرامم شکاندو نە تەوافی بەیتم ئەنجامدا، ئابۆ ئەمە دەگریم.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە شتێکی خوا کردەو خودا نووسیویەتی لەچارەی کچانی ئادەمو سووچی تۆی تیا نییە، دەی خۆت بشۆرەو غوسلی سوننەتی ئیحرام دابەستن ئەنجام بدەو ئیحرامی حەج دابەستەو هەرچی حاجی دەیکا تۆیش بیکە، بەڵام تەوافی بەیت مەکە، تاپاك دەبیتەوە) عائیشەیش وایکردو هەموو مەڵبەندو وێستگاو کردارەکانی حەجی ئەنجامدا، لەمینا لە بێنوێژییەکەی پاکەوە بوو، ئەوسا تەوافی کابەی ئەنجام دا، هەروا سەعیی نێوانی صەفاو مەڕوەی ئەنجامدا. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە عائیشەی فەرموو: (ئێستا تۆ لە حەجو عەمرەکەت بوویتەوە). عائیشە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! من ئەوە بووە بەگرێ لەدڵما کەبەر لە ئەنجامدانی حەج تەوافی بەیتم ئەنجام نەدا، هەروا سەعیی نێوانی صەفاو مەڕوە، بەهۆی ئەمەوە واهەست دەکەم کە لەچاو خەڵکی تردا من بەجێماوم؟!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ قەرەبوو و دڵدانەوەی عائیشە، بە عەبدوڕەحمانی برای عائیشەی فەرموو: (ئەی عەبدوڕەحمان! عائیشەی خوشکت ببە، لە تەنعیمەوە عەمرەیەکی پێ بکە). ئەم گفتوگۆو داستانی عەمرە کردنەی عائیشە لە تەنعیمەوە، لەشەوی حەصبەدا بوو. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ١٥٣٨ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧ + زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦١٧}.

## ٥٢٦) تەلبییە کردن. (٢٨٠٣ - ٢٨٠٧)
## بابٌ: التَّلْبِيَةُ

٦٦١- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ رَاحِلَتُهُ قَائِمَةً عِنْدَ مَسْجِدِ ذِى الْحُلَيْفَةِ أَهَلَّ فَقَالَ: « لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ ». قَالُوا: وَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ يَقُولُ: هَذِهِ تَلْبِيَةُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ: قَالَ نَافِعٌ: كَانَ عَبْدُ اللَّهِ، يَزِيدُ مَعَ هَذَا: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ. {الحديث: ٢٨٠٣ = ٢٧٨٧ فم. تجريد/٢، ژمارە: ٧٤٤ = ١٥٤٩ فتح البارى}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جاران کە وڵاخەکەی سەری دەخستە سەرکێوی بەیدا، لەلای مزگەوتەکەی زولحولەیفە رادەوەستا، ئەنجا ئیحرامی دادەبەست، واتە: نییەتی چوونە ناو حەجی دەهێنا بەگوتنی ئەم گوتەیە، دەیفەرموو:

{لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ} واتە:

پەروەردگارا! هەمیشە کەمەری بەندەگیم بەستوە بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی تۆ، تۆ بێ چوونو بێ هاوەڵی، سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، وە بەخششو نازو بەهرەو نیعمەتو دارایىو پاشایىو خاوەنیی، هەر لەخۆت دێو هەر لە خۆت جوانە، بێ چوونىو بێ هاوەڵی تۆ ئاشکراو نمایانە).

دەفەرموون: جاران عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەیفەرموو: ئەمە شێوەی تەلبییە کردنـی پێغەمبـەر خـۆی بـوو. فـەرمووی: نـافیع فـەرمووی: عەبـدوڵڵا ئەمـەی دواوەیشی لەم تەلبییـە پـتر دەکـرد، وەك پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بـەم وشـانەی پێشەوە ئیحرامـی دەبەسـتو ئەمەیشـی لێ پـتر دەکـرد: {لَبَّيْـكَ اللَّهُـمَّ لَبَّيْـكَ لَبَّيْـكَ وَسَعْدَيْكَ وَالْخَيْرُ بِيَدَيْكَ، لَبَّيْكَ وَالرَّغْبَاءُ إِلَيْكَ وَالْعَمَلُ} . واتە:

پـەروەردگارا! ئـەی خـودای مـن! مـن هەمیشـە ملکەچـم بـۆ جێبـەجێکردنی فەرمانی تۆ، تا خۆ شنوودییو ڕەزامەندیی تۆ دەردەست بکەم، چاکە بەدەسـتی تـۆ، ئومێدی هەرە گەورەم بـە لوتـفو کـەرەمی تۆیـە، هـەرکردەوەیێ کـە تـۆ پەسـەندی نەکـەی مایـە پـووچو فیڕۆیـە). {تـاج/٢، زنجـیرە: ٨٨، ژمـارە: ١٥٢٠، ج/٤ = چـاپی چوارەم} .

### ٥٢٧) ئیحرام دابەستنی حەجو عەمرە بەیەکەوە. (٣٠١٣ - ٣٠٢٢)

### باب: في التلبية بالعمرة والحجّ

٦٦٢- عَنْ أنس (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) أَهَلَّ بِهِمَا جَمِيعًا: « لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا، لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّـا ». {الحـديث: ٣٠١٨ = ٣٠٠٤ ف.م. بخاري. مغازي: ٤٣٥٣، ٤٣٥٤. أبو داود. مناسك: ١٧٩٥. نسائي. حج: ٢٧٢٨} :

ئیمـامی ئەنـەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: بـۆ خـۆم گـوێم لێبـوو، لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لـە حـەجی ماڵاوایـیدا، ئیحرامـی حـەجو عـەمرەی بەیەکـەوە دابەسـتو فـەرمووی: نێتمـە ئیحرامـی عـەمرەو حـەج دادەبەسـتم بـۆ تـۆ ئـەی خودایە). {تاج/٢، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ١٥٣٣، ١٥٢٢} .

٦٦٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « وَالَّـذِي نَفْسِي بِيَـدِهِ لَـيُهِلَّنَّ ابْـنُ مَـرْيَمَ بِفَـجِّ الرَّوْحَـاءِ حَاجًّـا أَوْ مُعْتَمِـرًا أَوْ لَيَثْنِيَنَّهُمَـا ». {الحديث: ٣٠٢٠ = ٣٠٠٦ فم} :

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، کە خودای گەورەو باڵا دەسە، عیسای کوڕی مەریەم، کاتێ لە ئاخر زەمانا، لەکۆتایی رۆژگارا، لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە بۆسەر زەوی، ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە بەردەوامەو ئەویش کاری پێ دەکا، تەنانەت لە فەججورەوحاوە، کە ناوی شوێنێکە، لە بەینی مەککەو مەدینەدا، شەش میل لە مەدینەوە دوورە، تەنانەت عیسا، کاتێ دێتە خوارەوە دەچێ بۆ حەجو عەمرە، لە فەججورەوحا ئیحرامی حەج، یا ئیحرامی عەمرە، یا هەردووکیان پێکەوە دادەبەستێو حەجو عەمرە وەك موسوڵمانان ئەنجام دەدا). {بڕوانە: تاج/٥، لاپەڕە: ٦٣٩، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٥٦٢٧ هەتا ژمارە: ٥٦٣٢. ج/٤ بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیەی ئێرە}.

## ٥٢٨) حەجکردن بەجیا بەبێ عەمرە. (٢٩٨٤ - ٢٩٨٦)
## باب: فِي إِفْرَادِ الْحَجِّ

٦٦٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: أَهْلَلْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْحَجِّ مُفْرَدًا (وَفِي رِوَايَةٍ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَهَلَّ بِالْحَجِّ مُفْرَدًا. {الحديث: ٢٩٨٤ = ٢٩٧٠ فم}:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی:** لە خزمەت پێغەمبەردا، لە حەجی ماڵاواییدا، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا، نیێتی حەجمان، بەجیا بەبێ عەمرە دابەست. لەگێڕانەوەیەکا: پێغەمبەری خودا، (دروودی خودای لەسەر بێ) حەجی بەتەنها کرد، واتە: حەجی بەتەنیا، بەجیا بەبێ عەمرە کرد).

٦٦٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَفْرَدَ الْحَجَّ. {الحديث: ٢٩١٣ = ٢٨٩٧ ف.م}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەری خودا** (دروودی خودای لەسەر بێ)، حەجی بەجیا، بەبێ عەمرە کرد).

## ٥٢٩) كردنی حەج و عەمرە بەیەكەوە. (٢٩٨٤ - ٢٩٨٦)

## بابٌ: القِرانُ بيْنَ الحجّ والعُمْرة

٦٦٦- عَنْ بَكْرٍ بن عبدالله عَنْ أَنسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يُلَبِّى بِالْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ جَمِيعًا، {قَالَ بَكْرٌ} : فَحَدَّثْتُ بِذَلِكَ ابْنَ عُمَرَ فَقَالَ: لَبَّى بِالْحَجِّ وَحْدَهُ، فَلَقِيتُ أَنسًا، فَحَدَّثْتُهُ بِقَوْلِ ابْنِ عُمَرَ فَقَالَ أَنَسٌ: مَا تَعُدُّونَنَا إِلاَّ صِبْيَانًا! سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجًّا ». {الحديث: ٢٩٨٥ – ٢٩٧١ ف.م} :

بەكری كوڕی عەبدوڵلا فەرمووی: ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاوایيدا، بۆخۆم گوێم لێبوو، لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئیحرامی حەج و عەمرەی بەیەكەوە دابەست و فەرمووی: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجّاً: نیێتمە عەمرەو حەجم پێكەوە دابەست بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم!).

بەكر فەرمووی: جا ئەم فەرموودەیەی ئەنەسم باسكرد بۆ ئیبنو عومەر، كە ئەنەس دەفەرموێ لە حەجی ماڵاوایيدا پێغەمبەر عەمرەو حەجی پێكەوە دابەست، ئیبنو عومەر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو حەجەدا، بەس حەجی بەتەنیا دابەست. لەوەدوا كە گەیشتمەوە بە ئیمامی ئەنەس، عەرزم كرد، فەرموودەكەی تۆم گێڕایەوە بۆ ئیبنو عومەر، كەچی ئەو وەهای گوت؟ ئەنەس فەرمووی: دیارە لەئێوە وایە، كە ئەوكاتە من منداڵكار بووم، لەبەرئەوە زەبتی چۆنێتیی ئیحرام دابەستنی پێغەمبەرم نەكردووە، من ئەوكاتە تەمەنم بیست ساڵ بوو، پیاوێ كامڵ بووم، من بۆخۆم لە پێغەمبەرم بیست، لەكاتی ئیحرام دابەستندا، فەرمووی: (لَبَّيْكَ عُمْرَةً وَحَجّاً: نیێتمە عەمرەو حەجم پێكەوە دابەست بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم!).

**ڕوونكردنەوە:**

١- لە فەتحولمولهیمدا، لە ڕاڤەی ئیهلالدا، لە فەرموودەی ژمارە: (٢٧٨٨)دا، دەفەرموێ: (قَوْلُهُ: أَهَلَّ، إلخ: أى رَفَعَ صَوْتَهُ بِالتَّلْبِيَةِ، وَنَوَى أَحَدَ النُسُكَيْنِ، أَوْ بِهِمَا)

بڕوانە ژمارە: (٢٩٤٨) هەتا ژمارە: (٢٩٥٢) لە شەرحی نەوەوی لەسەر صەحیحی موسلیم.

٢- بۆ تەئویلی ئەو جیاوازییەی کە لەنێوانی ئەم کۆمەڵە فەرموودەو چەندین فەرموودەی تردا هەیە، کە ئایا حەجەکەی پێغەمبەر لەسەر شێوەی إفراد بووە، یا لەسەر شێوەی قیران بووە، یا لەسەر شێوەی تەمەتتوع بووە، نەوەوی ئاوا تەئویلی دەکا: ڕێگەی جەمع لەنێوانی ئەم فەرموودانەدا ئاوایە: لەسەرەتاوە موفرید بووە، لەپاشا بووە بە قارین، مەبەستیش لە تەمەتتوع تەمەتتوعی لوغەوییە، کە مەبەست لێی (إِنْتِفَاع وإِرْتِفَاقە)، چونکە قارینیش وەك موتەمەتتیع سوود لە تێکەڵکردنی حەجو عەمرە دەبینێو یەك کردار لەجیاتی هەردوکیان دەکا.

**٥٣٠) حەج لەسەر شێوەی تەمەتتوع، کە ئەوەیە ئیحرامی عەمرە ببەستێو تەواوی بکاو لەهەمان ساڵا حەجیش بکا.** (٢٩٥٣ - ٢٩٧١)

**بابٌ: فِي مُتْعَةِ الحَجِّ**

٦٦٧- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضى الله عنه) قَالَ: تَمَتَّعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَلَمْ يَنْزِلْ فِيهِ الْقُرْآنُ، قَالَ رَجُلٌ بِرَأْيِهِ، مَا شَاءَ. {الحديث: ٢٩٦٨ = ٢٩٥٤ فم. تجريد/٢، ژمارە: ٧٥٧ = ١٥٧١، ٤٥١٨. تحفة الأشراف: ١٠٨٥٠}:

لە تەجریدی بوخاریدا دەفەرموێ: موطەڕریف فەرمووی: لەسەرە مەرگا، عیمرانی کوڕی حوصەین، (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی پێم: فەرموودەیەکت پێ دەڵێم، هیوایە کە خودا بیکا بە مایەی بەهرە بۆت: لە خزمەت پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ) تەمەتتوعی حەجمان کردووە، وە هەتا خۆشی کۆچی دوایی کرد ئەم کارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، نە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش مەرگیدا یاساخی کردبوو، وە نە قورئان قەدەغەی کردبوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ١٥٣٦ = مسلم. حج: ٢٩٦٤}.

لەگێڕانەوەی تەجریددا ئاوایە:

عیمرانــی کــوڕی حوصــەین (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فــەرمووی: ئایــەتی پشــوودانو حەسانەوە، لەنێوانی عـەمرەو حەجدا، کـە نـاودارە بـە ئایـەتی تەمـەتتوعی حـەج، لەنامـەی پـیرۆزی خـوادا هـاتووە، ئێمـە خۆمـان لەگـەڵ حـەزرەت خۆیـدا، عـەمرەو حەجمان لەسەر ئەو شێوەیە کەوا لە ئایەتەکەدا کردووە، وە هەتا حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆچی دوایی کرد، ئەم کارە لەسەر ئەم شێوەیە وەك خۆی مابوو، وە نـە قورئان قەدەغەی کردبوو، وە نە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یاساخی کردبوو، ئیتر هەنـدێ کـەس (وەك ئیمـامی عومـەر، یـا ئیمـامی عوسمـان) لـەلای خۆیـەوە، بـە بۆچوونی خۆی شتێ بڵێ، کە جیابێ لەم شێوەیەی کەمن لـەم فەرموودەیـەدا روونم کردەوە، ئەوە لەبەرئەوەی بەڕای خۆیەتی بایەخی نییە.

٦٦٨- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: تَمَتَّعَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَتَمَتَّعْنَا مَعَهُ. {الحديث: ٢٩٦٩ = ٢٩٥٥ ف.م = فم}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خـودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجەکەیدا، کە لەپاش کۆچکردن کردی، کە ناودارە بە حەجی مـاڵاوایی، کە لەپاش کۆچ تـەنها ئـەو حەجـەی کـردووە، کـە لەسـاڵی دەی کۆچیدا کـردی، کـە نزیکـەی سـەد هـەزار موسوڵمان، لـە خزمەتیـدا، حـەجیان ئەنجامـدا، جـا عیمـران فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لـەو حەجـەدا تەمـەتتوعی ئەنجامـدا، وە ئێمەیش لە خزمەتیدا، لەو حەجەدا تەمەتتوعمان ئەنجامدا).

٦٦٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَدِمْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَنَحْنُ نَقُولُ: لَبَّيْكَ بِالْحَجِّ، فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نَجْعَلَهَا عُمْرَةً. {الحديث: ٢٩٤٠ = ٢٩٢٥ فم. بخاري. حج: ١٥٧٠. تحفة الأشراف: ٢٥٧٥}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵێ (ڕەزای خودایـان لێ بـێ) فـەرمووی: لەحـەجی ماڵاواییـدا، کـە چووین بۆ حەج، لە شوێنی ئیحرام دابەستن دەمـانگوت و ئـاوا ئیحرامـمان دابەسـت:

(نیێتمە ئیحرامی حەجم بۆ تۆ دابەست ئەی خودایە!). بەلام لەوەدوا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێمان کرد، کە بیکەین بە عەمرە.

## ٥٣١) کەسێ بە حەج ئیحرامی دابەستبێ‌و دیاری (هەدی)ی بەیتی پێ بێ (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)

## باب: مَنْ أَحْرَمَ بِالحَجِّ وَمَعَهُ الهَدْيُ

٦٧٠- عَنْ مُوسَى بْنُ نَافِعٍ قَالَ: قَدِمْتُ مَكَّةَ مُتَمَتِّعًا بِعُمْرَةٍ قَبْلَ التَّرْوِيَةِ بِأَرْبَعَةِ أَيَّامٍ، فَقَالَ النَّاسُ: تَصِيرُ حَجَّتُكَ الآنَ مَكِّيَّةً، فَدَخَلْتُ عَلَى عَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ فَاسْتَفْتَيْتُهُ؟ فَقَالَ عَطَاءٌ: حَدَّثَنِى جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيُّ أَنَّهُ حَجَّ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَامَ سَاقَ الْهَدْىَ مَعَهُ، وَقَدْ أَهَلُّوا بِالْحَجِّ مُفْرَدًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَحِلُّوا مِنْ إِحْرَامِكُمْ، فَطُوفُوا بِالْبَيْتِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَقَصِّرُوا وَأَقِيمُوا حَلاَلاً حَتَّى إِذَا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ فَأَهِلُّوا بِالْحَجِّ، وَاجْعَلُوا الَّتِى قَدِمْتُمْ بِهَا مُتْعَةً ». قَالُوا: كَيْفَ نَجْعَلُهَا مُتْعَةً وَقَدْ سَمَّيْنَا الْحَجَّ؟ قَالَ: « افْعَلُوا مَا آمُرُكُمْ بِهِ، فَإِنِّى لَوْلاَ أَنِّى سُقْتُ الْهَدْىَ، لَفَعَلْتُ مِثْلَ الَّذِى أَمَرْتُكُمْ بِهِ، وَلَكِنْ لاَ يَحِلُّ مِنِّى حَرَامٌ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْىُ مَحِلَّهُ»، فَفَعَلُوا. {الحديث: ٢٩٣٧ = ٢٩٢١ ف.م. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٨٣، ژمارە: ٧٥٦ = ١٥٦٨. تحفة الأشراف: ٢٤٩٠}:

موسای کوڕی نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆ حەج، لەسەر شێوەی حاجی موتەمەتتیع، کاتێ گەیشتمە مەککە، عەمرەم ئەنجامدا لەپێش ڕۆژی تەروییەدا بەچوار ڕۆژ، خەڵکەکە گوتیان: حەجەکەت بوو بە حەجێکی مەککەیی، پاداشی کەمە، چونکە ئەرکی کەمە، جا منیش بوو بەگرێ لەدڵماو چووم بۆ خزمەتی زانای پایە بەرز: عەتای کوڕی ئەبو ڕەباحو لەم لایەنەوە پرسیارم لێی کرد؟

عەتاء فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری گێڕایەوە بۆم فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) وشتری دیاریی بەیتی لەگەڵ خۆی برد، من خۆم لە خزمەتیدا چووم بۆ حەج، لەو حەجەدا حەجکاران بەس

ئیحرامی حەجیان بەجیا دابەستبوو، لەسەر شێوەی ئیفراد، کە برێتییە لە کردنی حەج بەتەنها بەبێ عەمرە، جا کاتێ گەیشتینە مەککە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهاوەڵانی خۆی فەرموو: (ئەوەی لەئێوە حەیوانی دیاریی بەیتی نیشانە نەکردووە، با حەجەکەی هەڵوەشێنێتەوەو بیکا بە عەمرە، لەسەر ئەم شێوەیە: تەوافی بەیتو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە بکاو مووی سەری کورت بکاتەوە، ئیتر کردارەکانی عەمرە تەواو، ئیتر لەوەپاش لەم ماوەیەدا بەبێ ئیحرام لە مەککە بمێنێتەوە، هەتا ڕۆژی تەروییە، کە ڕۆژی هەشتەمی مانگی قوربانە، جا ئەوانەی کە لەسەر ئەم شێوە ئیحرام دەشکێنن ئەوسا سەرلەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەج بەجیا دابەستنەوە، وە ئەو حەجەی کە بەتەنها، لەپێش هاتنتان بۆ مەککە ئیحرامیتان بەستبوو لەسەر ئەم شێوەیەی باسکرا بیکەن بە عەمرە، وە لەم ماوەیەدا هەتا ڕۆژی تەروییە پشوو وەرگرنو بیکەن بە حەسانەوە).

حاجیان فەرموویان: چۆن بیکەین بە عەمرەو پشوو وەرگرین، خۆ ئێمە لەسەرەتاوە ناوی حەجمان لێ ناوەو نێتی حەجمان هێناوە، کەواتە ئیتر چۆن بیکەین بە عەمرە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من چیتان پێ دەڵێم بەبێ چەندو چوون بیکەن، خۆشم لەبەرئەوە نەبێ کە ئاژەڵی دیاری بەیتم لەگەڵ خۆم هێناوە دەنا هەمان شتم دەکرد کە بەئێوە دەڵێم بیکەن، بەڵام ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە لەمن قەدەغە بوون، بۆم ڕەواو حەڵاڵ نابنەوە، هەتا ئاژەڵە دیارییەکانم نەگەنە جێگەی دیاریکراوی خۆیانو کاتی سەربڕینیان نەیەت، کە ئەوەیە لە ڕۆژی دەی قوربانا لە مینا سەرببڕێنو بدرێن بە پێشیاوان).

ئەنجا ئێمەش وەك حەزرەت فەرمووی، ئەوانەمان کە دیاریی بەیتیان پێ نەبوو، تەوافی بەیتو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەمان کردو مووی سەرمان کورت کردەوەو ئیحرامماں شکاندو چووینە لای ژنی خۆمانو وەك جاران جلو بەرگی ئاساییمان پۆشییەوە، وە تاقی ئێوارەی ڕۆژی تەروییە، سەرلەنوێ لەناو مەککەوە ئیحرامی حەجمان دابەستەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ١٥٢٧ + ژمارە: ١٥١٨، زنجیرە: ٨٧}.

## ٥٣٢) سڕینەوەی ئیحرام شكاندنی حەج و كردنی بەعەمرە، وە فەرمانكردن بە تەواوكردنی حەج. (٢٩٤٨ - ٢٩٥٢)

## باب: نَسْخُ التَّحَلُّلِ مِنَ الإِحْرَامِ وَالأَمْرُ بِالتَّمَامِ

٦٧١- عَنْ أَبِي مُوسَى (رضى الله عنه) قَالَ: قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ مُنِيخٌ بِالْبَطْحَاءِ فَقَالَ: « بِمَا أَهْلَلْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ أَهْلَلْتُ بِإِهْلاَلِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: « هَلْ سُقْتَ مِنْ هَدْىٍ؟ » قُلْتُ: لاَ. قَالَ: « فَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ ثُمَّ حِلَّ »، فَطُفْتُ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَبِالْمَرْوَةِ، ثُمَّ أَتَيْتُ امْرَأَةً مِنْ قَوْمِى فَمَشَطَتْنِى وَغَسَلَتْ رَأْسِى، فَكُنْتُ أُفْتِى النَّاسَ بِذَلِكَ فِى إِمَارَةِ أَبِى بَكْرٍ، وَإِمَارَةِ عُمَرَ (رضى الله عنهما)، فَإِنِّى لَقَائِمٌ بِالْمَوْسِمِ، إِذْ جَاءَنِى رَجُلٌ فَقَالَ: إِنَّكَ لاَ تَدْرِى مَا أَحْدَثَ أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ فِى شَأْنِ النُّسُكِ، فَقُلْتُ: أَيُّهَا النَّاسُ مَنْ كُنَّا أَفْتَيْنَاهُ بِشَىْءٍ فَلْيَتَّئِدْ، فَهَذَا أَمِيرُ الْمُؤْمِنِينَ قَادِمٌ عَلَيْكُمْ، فَبِهِ فَائْتَمُّوا، فَلَمَّا قَدِمَ، قُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَا هَذَا الَّذِى أَحْدَثْتَ فِى شَأْنِ النُّسُكِ؟ قَالَ: إِنْ نَأْخُذْ بِكِتَابِ اللَّهِ، فَإِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ: ( وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ) وَإِنْ نَأْخُذْ بِسُنَّةِ نَبِيِّنَا محمد (صلى الله عليه وسلم) فَإِنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَحِلَّ حَتَّى نَحَرَ الْهَدْىَ. {الحديث: ٢٩٥٠ = ٢٩٣٥ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٤٨ = ١٥٥٩، ١٥٦٥، ١٧٢٤، ١٧٩٥، ٤٣٤٦، ٤٣٩٧. نسائى. حج: ٢٧٣٧ تحفة الأشراف: ٩٠٠٨}:

**ئەبو مووسا** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **لەساڵی دەی كۆچیدا، ناردمی بۆ یەمەن، كردمی بەسەركارو بەرپرسی سەر هۆزەكەی خۆم، جا ساڵی حەجی ماڵاوایی چووم بۆ حەج، كە چوومە بەرەوە پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **لە بەطحاء (ئەبطەح = بەطحاء = موحەصصەب = تەحصیب = حەصبە = خەیفی بەنی كینانە — تاج/٢، ژمارە: ١٦١٧ ج/٤) دابەزی بوو، لەسەرەتای حەجەوە بوو، فەرمووی: (ئیحرامت چۆن دابەستووە؟) گوتم: ئاوا ئیحرامم دابەستووە: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **چۆن ئیحرامی دابەستووە منیش وەك ئیحرام بەستنەكەی ئەو ئیحرامم دابەست. فەرمووی: (ئاژەڵی دیاری بەیتت هێناوە لەگەڵ خۆت، كە لەشەرعا پێی دەگوترێ: هەدیی بەیت؟). گوتم: نەء، پێم نییە.**

فەرمووی: (دەی کەواتە مادەم دیاریی بەیتت لەگەڵ خۆت نەهێناوە، بڕۆ تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەڕوە بکە، ئەوجا ئیحرام بشکێنەو تەمەتتوعو خۆشی وەربگرە). منیش وامکرد، فەرمانەکانی پێغەمبەرم بەجێهێناو ئەوجا ئیحرامم شکاندو چووم بۆلای ژنێ لە خزمانی خۆم، کە خۆیی (مەحرەم)م بوو، قژەکەمی بۆ شانە کردمو سەری بۆ دۆزیمو پاك شۆردی بۆم. ئیتر ئاوا لەسەر ئەم شێوەیەی باسمکرد، فەتوام بۆ حاجیان دەدا، کە ئەوەی دیاریی بەیتی پێ نەبێ دەتوانێ حەجەکەی بکا بە عەمرەو لەوەدوا ئیحرام بشکێنێ تا ڕۆژی تەروییە، ئەوسا حەج دابەستێتەوە لەسەر شێوەی تەمەتتوعو حەسانەوەو پشوودان، لەسەردەمی فەرمانڕەواییو جێنشینی ئەبوبەکردا، هەتا سەردەمی فەرمانڕەواییو جێنشینیی عومەر بەردەوام بووم لەسەر ئەم فەتوا دانە، جا ساڵێ لەکاتی حەجدا، لە مەڵبەندێ لە مەڵبەندەکانی کۆبوونەوەی حاجیان، وەك جاران ئەم فەتوایەم دەدا، لەم کاتەدا پیاوێ هات بۆلام، گوتی: تۆ کە ئەم فەتوایە دەدەیو بەردەوامی لەسەری، ئاگات لەوەنییە، کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان، عومەری کوڕی خەتاب، لەم بارەیەوە چی دەفەرمویو ڕای چۆنە، جا منیش بە خەڵکەکەم گوت: ئەی موسوڵمانینە! ئەوەی کە من فەتوای تەمەتتوعم بۆی داوە، با پەلەنەکاو چاوەڕوان بکا هەتا فەرمانڕەوای موسوڵمانان تەشریف دێنێ، ئەو چی فەرموو پەیڕەوی ئەو بکەن، جا کاتێ عومەر کە فەرمانڕەوای موسوڵمانان بوو هات، عەرزیم کرد: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! لەسەر چی بنیاتێ ڕێگریی لە حەج لەسەر شێوەی حەسانەوەو تەمەتتوع دەکەی؟ فەرمووی: من ئیحرام ناشکێنمو ڕام وانییە، چونکە شتی وا پێچەوانەی نامەی خوداو سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێ)، ئەوەتا قورئان، کە نامەی خودای گەورەو سەروەرە بەدەق دەفەرموێ: {وَأَتِمُّواْ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلّهِ} واتە: ئەی موسوڵمانەکان! حەجو عەمرەتان کە دەست پێکرد، تەواویان بکەن، وە هەر بۆ خودا ئەنجامیان بدەن).

خۆ ئەگەر کار بە سوننەتی پێغەمبەریش بکەین، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) کە حەجی دابەست، ئیتر ئیحرامی نەشکان، هەتا ئاژەڵە دیاریی بەست (حەرەم)ی سەربڕی). {بڕوانە: تاج/٢، لاپەڕە: ١٨٨، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ١٥٢٧، چ/٤}.

٦٧٢- عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَتِ الْمُتْعَةُ فِى الْحَجِّ لأَصْحَابِ مُحَمَّدٍ (صلى الله عليه وسلم) خَاصَّةً. {الحديث: ٢٩٥٥ = ٢٩٤١ ف.م. نسائى. حج: ٢٨٠٨. ابن ماجة. مناسك: ٢٩٨٥. تحفة الأشراف: ١١٩٩٥}:

ئەبو زەڕ (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (پشودانو حەسانەوە لە حەجا، کە ناسراوە لە زاراوی یاسا نامەی خوادا بە موتعەی حەج، تەنیا تایبەت بوو بۆ هاوەڵانی پێغەمبەرو بەس.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: مەبەستی ئەبو زەڕ ئەوە بووە کە حەج فەسخ بکرێو بکرێ بە عەمرە، وەك لە حەجی ماڵاواییدا هاوەڵانی پێغەمبەر، بە فەرمانی پێغەمبەر، ئەوەیان کردو ئەوانەی دیاری بەیتیان پێ نەبوو، حەجەکەیان هەڵوەشانەوەو کردیان بە عەمرە، ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: مەبەستی ئەبو زەڕ ئەوەیە کە ئەم جۆرە فەسخە تایبەت بووە بە هاوەڵانەوە، دەنا مەبەستی ئەبو زەڕ ئەوە نییە کە کردنی حەج لەسەر شێوەی تەمەتتوع پووچو نادروستە، کە تەمەتتوع یەکێکە لەسێ شێوە کارەکانی کردنی حەجو عەمرە کە بەکۆی را کاری پەسەندە.

### ٥٣٣) دیاری بەیت مەرجە بۆ جووتکار (قارن) واتە: کەسێ حەجو عەمرە بخاتە پاڵ یەكو بەیەکەوە بیانکات. (٢٩٧٩ - ٢٩٨٣)
### بابٌ: الهَدْيُ فِي القِرَانِ بَيْنَ الحَجّ وَالعُمْرَةِ

٦٧٣- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) خَرَجَ فِى الْفِتْنَةِ مُعْتَمِرًا، وَقَالَ: إِنْ صُدِدْتُ عَنِ الْبَيْتِ صَنَعْنَا كَمَا صَنَعْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)،

فَخَرَجَ فَأَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَسَارَ حَتَّى إِذَا ظَهَرَ عَلَى الْبَيْدَاءِ الْتَفَتَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: ((مَا أَمْرُهُمَا إِلاَّ وَاحِدٌ. أُشْهِدُكُمْ أَنِّي قَدْ أَوْجَبْتُ الْحَجَّ مَعَ الْعُمْرَةِ))، فَخَرَجَ حَتَّى إِذَا جَاءَ الْبَيْتَ طَافَ بِهِ سَبْعًا وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا، لَمْ يَزِدْ عَلَيْهِ وَرَأَى أَنَّهُ مُجْزِئٌ عَنْهُ، وَأَهْدَى.

{الحديث: ٢٩٧٩ = ٢٩٦٥ ف.م. بخاري. حج: ١٦٢٩، ١٦٤٠، ١٦٩٣، ١٧٠٨، ١٧٢٩، ١٨٠٦، ١٨٠٧، ١٨٠٨، ١٨١٠، ١٨١٢، ١٨١٣، ٤١٣٠، ٤١٨٤، ٤١٨٥. نسائي. حج: ٢٧٤٥}:

**نافيع** (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەکاتی ئاژاوەکەی کە حەجاج هات بۆ کوشتاری عەبدوڵلای کوڕی زوبەیر، کە پەنای بردبووە بەربەیت، لەو سەردەمەدا عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەرچوو بچێت بۆ عەمرە، فەرمووی: ئەگەر قەدەغە کرام لە تەوافی بەیت، کاتی خۆی کە قەدەغەیان کردین، کە لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ عەمرە، لەساڵی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەدا، ئەوکاتە چیمان کرد ئێستەیش هەمان شت دەکەین‌و ئیحرامەکەمان دەشکێنین، وەك لە خزمەت پێغەمبەرا، ساڵی حودەیبییە ئیحرامی عەمرەکەمان شکاند.

جا لەمەدینەوە کەوتە ڕێ‌و نیێتی عەمرەی هێناو ڕۆیشت هەتا گەیشتە زولحولەیفە، لەوێ دەنگی بە لەبەیکە کردن بەعەمرە بەرزکردەوە، ئەوجا کەوتە ڕێ هەتا گەیشتە بەیداء، ڕووی کردە هاوڕێکانی خۆی‌و فەرمووی: کاروباری حەج‌و عەمرە وەك یەکە لەوەدا، کە دروستە ئیحرام بشکێنرێ، لەکاتی قەدەغەکردن (ئیحصار)دا، ئێوە بە شایەت بن کەوا ئیحرامی حەجیشم دابەست لەگەڵ عەمرەکەدا، وە حەجیشم لەسەر خۆم پێویست کرد، وە دیاریشی لەگەڵ خۆی برد بۆ بەیت، ئاژەڵە دیارییەکانی لە قەدید کڕی، ئەوجا ڕۆیشت هەتا گەیشتە بەیت‌و حەوت تەوافی بەیتی کردو حەوت جار سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەی تەواوکرد، لەوەزیاتری نەکرد، بەڵام کردارەکانی تری حەجی تەواوکرد، لەو ماوەیەدا نە ئاژەڵە دیارییەکانی سەربڕی، وە نە ئیحرامی شکان بەکردنی شتێ لەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە قەدەغە دەبن، وە نە سەری تاشی، وە نە مووی سەری

کورت کردەوە، هەتا رۆژی جەژن، ئەوجا ئاژەڵە دیارییەکانی سەربڕیو سەری خۆی تاشی، وە باوەڕی وابوو کە بەتەوافی یەکەم، تەوافی حەجو عەمرەی جێبەجێ کردووە. وە گوتی: پێغەمبەر خۆشی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاوەهای کردووە). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ١٥٦٥ + تاج/٥، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩، چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونکردنەوە:**

دیاریی بەیت، کە پێشی دەگوترێ: دیاریی خانەی خودا، جیایە لە قوربانی، دیاریی (هەدی)ی بەیت بەو ئاژەڵە دەگوترێ کە بەدیاری، لەبەر رەزای خودا، دەبرێ بۆ هەژارانی ناو شاری مەککەو بۆ هەژارانی ناو سنووری بەست (حەرەم)ی مەککە، جا ئیتر لەسەر شێوەی نەزرو ئاهـ بێ، یا لەسەر شێوەی خێر بێ، هەدیی بەم واتایە: کاتەکەی کاتی قوربانییە، وە دەبێ لەناو سنووری بەست (حەرەم)ی مەککەدا سەربڕێو بدرێ بە هەژارانی ئەوێ، هەدیی بەواتای تریش هاتووە وەك (دِمَاءُ الجَبَرَانَاتِ وَالمَحْظُورَاتِ) ئەوە کاتی تایبەتی نییە، بەڵام جێگەی تایبەتی هەیە.

## ٥٣٤) دیاریی خانەی خودا بۆ حەساوە (**متمتّع**). (٢٩٧٢ - ٢٩٧٣)
## باب: الهَدْيُ فِي المُتْعَةِ

٦٧٤- عَنْ سَالِمِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ قَالَ: تَمَتَّعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ وَأَهْدَى، وَسَاقَ مَعَهُ الْهَدْىَ مِنْ ذِى الْحُلَيْفَةِ، وَبَدَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَهَلَّ بِالْعُمْرَةِ، ثُمَّ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَتَمَتَّعَ النَّاسُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ، فَكَانَ مِنَ النَّاسِ مَنْ أَهْدَى فَسَاقَ الْهَدْىَ، وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ يُهْدِ، فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ قَالَ لِلنَّاسِ: « مَنْ كَانَ مِنْكُمْ أَهْدَى، فَإِنَّهُ لاَ يَحِلُّ مِنْ شَىْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى يَقْضِىَ حَجَّهُ. وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْكُمْ أَهْدَى فَلْيَطُفْ بِالْبَيْتِ وَبِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، وَلْيُقَصِّرْ وَلْيَحْلِلْ، ثُمَّ لِيُهِلَّ بِالْحَجِّ. وَلْيُهْدِ، فَمَنْ لَمْ يَجِدْ هَدْيًا فَلْيَصُمْ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ فِى الْحَجِّ، وَسَبْعَةً إِذَا رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ». وَطَافَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ قَدِمَ مَكَّةَ فَاسْتَلَمَ الرُّكْنَ أَوَّلَ شَىْءٍ، ثُمَّ خَبَّ

ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ مِنَ السَّبْعِ، وَمَشَى أَرْبَعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ رَكَعَ حِينَ قَضَى طَوَافَهُ بِالْبَيْتِ عِنْدَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ سَلَّمَ فَانْصَرَفَ فَأَتَى الصَّفَا فَطَافَ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعَةَ أَطْوَافٍ، ثُمَّ لَمْ يَحْلِلْ مِنْ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ حَتَّى قَضَى حَجَّهُ، وَنَحَرَ هَدْيَهُ يَوْمَ النَّحْرِ، وَأَفَاضَ فَطَافَ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ حَلَّ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ حَرُمَ مِنْهُ، وَفَعَلَ مِثْلَ مَا فَعَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَنْ أَهْدَى وَسَاقَ الْهَدْيَ مِنَ النَّاسِ. {الحديث: ٢٩٧٢ = ٢٩٥٨ ف.م. تجريد/٢/٢١٤، رقم: ٧٩٨ = ١٦٩١، ١٨٠٥. نسائي. حج: ٢٧٣١ تحفة الأشراف: ٦٨٧٨}:

سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەحمەتو ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، عەمرەو حەجی بەیەکەوە کرد، لەسەر شێوەی قیران، وە ئاژەڵی دیاری بەیتیشی لە زولحولەیفەوە لەگەڵ خۆی برد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێشەوە ئیحرامی بە حەج دابەست، ئەوسا عەمرەیشی تێکەڵکرد، لەکاتی تێکەڵکردنی عەمرەکە بە حەجەکەوە، دیسان دەستی کردەوە بە تەلبییە کردن، بەڵام ئەمجارە تەلبییەی بە حەجو عەمرە بەسەر یەکەوە ئاوا دەکرد: دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ بِعَمْرَةٍ وَ حَجَّةٍ مَعاً) واتە: نیێتمە ئیحرامی عەمرەو حەجم پێکەوە دابەست بۆ تۆ ئەی خودایە!

جا حەجکاران هەیان بوو ڕێك وەك پێغەمبەر حەجو عەمرەیان کرد، چونکە هەیان بوو ئاژەڵی دیاریی خانەی خودای لەگەڵ خۆی لە میقاتەوە هێنابوو، وە هەیان بوو ئاژەڵی دیاریی خانەی خودای لەگەڵ خۆی نەهێنا بوو، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشتە مەککە، بە مەردومەکەی فەرموو: (هەرکەسێ لە ئێوە ئاژەڵی دیاریی بەیتی لەگەڵ خۆی هێناوە، ئەوە دەبێ بەردەوام بێ لەسەر ئیحرامەکەی‌و ئیحرام نەشکێنێ، هەتا حەجەکەی تەواو دەکا، چونکە هیچ شتێ لەوانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەکەیەوە لێی قەدەغە بووە، هەتا حەجەکەی تەواو نەکا، ئەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەکەیەوە لێی قەدەغە بووە، هەتا حەجەکەی تەواو نەکا، ئەوشتانەی بۆ ڕەوا نابێتەوە، بەڵام هەرکەسێ لەئێوە دیاری بەیتی لەگەڵ خۆی نەهێناوە، با تەوافی بەیت‌و تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە بکاو

مووی سەری کورت بکاتەوەو ئیتر ئیحرام بشکێنێ، لەپاشا لەرۆژی تەرویيەدا ئیحرامی حەج ببەستێتەوە، بەڵام ئەوانەی کە ئیحرام دەشکێنن دەبێ دیاری بەیت سەربڕن، جا ئەگەر ئەمانە دیاریی بەیتیان بۆ پەیدا نەکرا، ئەوا دەبێ سێ رۆژ لە رۆژانی کاتی کردنی حەجەکە بەڕۆژووبن‌و حەوت رۆژیش کە گەڕانەوە بۆناو کەسوکاریان).

جا پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گەیشتە ناو شاری مەککە، تەوافی قودومی ئەنجامدا، بەم شێوەیە: لەپێش هەموو شتێکا، لەوێوە دەستی کرد بەم تەوافە: دەستی هێنا بە گۆشە (روکن)ی حەجەرولئەسوەدداو ماچی کردو سێ‌جار بە هەڕاکردن‌و چوار جار بە رۆیشتنی ئاسایی هەڵسووڕا بە گردی خانەی خواداو، کاتێ تەوافەکەی بەیتی تەواوکرد، رۆیشت بۆ مەقامی ئیبراهیم (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) وە مەقامی خستە بەینی خۆی‌و بەینی بەیتەوەو دوو رکات سوننەتی نوێژی تەوافی کرد، ئەوجا سڵاوی دایەوە، ئەوجا رۆیشت‌و چوو بۆ صەفاو حەوت جار تەوافی صەفاو مەروەیشی کرد، ئیتر بە بەرگی ئیحرامەوە مایەوەو ئیحرامی نەشکان هەتا حەجەکەی تەواو کرد، وە لەو ماوەیەدا ئەوەی کە بەهۆی ئیحرام دابەستنەوە لێی قەدەغە بوو بوو، وەك خۆیان مانەوە هەتا حەج تەواو بوو، وە رۆژی جەژن ئاژەڵە دیارییەکانی بەیتی سەربڕی، کە سەرجەم سەد وشتر بوون، ئەنجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وشترەکەی بوو، رۆیشت بۆ بەیت‌و تەوافی ئیفاضەی کرد، ئەوجا ئیحرامی شکاندو ئەوەی کە لێی قەدەغە بوو بوو، هەمووی رەوا بوونەوە بۆی وەك جاری جارانی.

هەموو ئەو کەسانەی کە دیاریی خانەی خودایان هێنابوو لەگەڵ خۆیان، پێغەمبەری خودا، لە حەجەکەیدا چیکرد، ئەوانیش هەمان شتیان کرد. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ١٦٢٥ چ/٤ + ژمارە: ١٦١٠ + ژمارە: ١٥٦٧ + ژمارە: ١٥٥٦ + ١٥٥٥ + ١٥٤٢}.

## ٥٣٥) كردنى حەج بە پاشكۆى عەمرە. (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)

## بابٌ: فِي إِرْدَافِ الحَجِّ عَلَى العُمْرَةِ

٦٧٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي عَامِ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ، حَتَّى قَدِمْنَا مَكَّةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَلَمْ يُهْدِ فَلْيَحْلِلْ، وَمَنْ أَحْرَمَ بِعُمْرَةٍ وَأَهْدَى فَلاَ يَحِلُّ حَتَّى يَنْحَرَ هَدْيَهُ، وَمَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ فَلْيُتِمَّ حَجَّهُ »، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَحِضْتُ فَلَمْ أَزَلْ حَائِضًا حَتَّى كَانَ يَوْمُ عَرَفَةَ وَلَمْ أُهْلِلْ إِلاَّ بِعُمْرَةٍ. فَأَمَرَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ أَنْقُضَ رَأْسِى، وَأَمْتَشِطَ، وَأُهِلَّ بِحَجٍّ، وَأَتْرُكَ الْعُمْرَةَ، قَالَتْ: فَفَعَلْتُ ذَلِكَ، حَتَّى إِذَا قَضَيْتُ حَجَّتِى. بَعَثَ مَعِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ أَبِى بَكْرٍ وَأَمَرَنِى أَنْ أَعْتَمِرَ مِنَ التَّنْعِيمِ مَكَانَ عُمْرَتِى الَّتِى أَدْرَكَنِى الْحَجُّ وَلَمْ أَحْلِلْ مِنْهَا. {الحديث: ٢٩٠٣ = ٢٨٨٧ ف.م. تجريد/١/ ٢١٦، رقم: ٢٠٨ = ٣١٧}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاكیزەكانی بێ) دەفەرموێ: لە خزمەتی حەزرەتدا، لە ساڵی حەجی ماڵاواییدا، لە مەدینەوە دەرچووین بۆ مەككە بۆ حەج، هەمان بوو لە میقات تەنیا نێتی ئیحرام دابەستنی عەمرەی هێنا، وەهەمان بوو تەنیا نێتی ئیحرام دابەستنی حەجی هێنا، تا گەیشتینە مەككە،، پێغەمبەر (دروودی خوداى لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەو كەسانەی كە ئیحرامیان بە عەمرە بەستووەو دیاریی خانەی خودایان پێ نییە، با عەمرەكەیان تەواو بكەنو ئیتر ئیحرام بشكێنن، بەڵام ئەوانەی كە دیاریی خانەی خودایان واپێو ئیحرامیان بەعەمرە بەستووە، با ئیحرام نەشكێنن، هەتا حەجیش تەواو دەكەن، ئەوسا لەرۆژی جەژنا، لەپاش سەربڕینی دیاریی بەیت ئیحرام بشكێنن، ئەو كەسانەیشی كە ئیحرامیان تەنیا بە حەج بەستووەو دیاریی بەیتیان واپێ با حەجەكەیان تەواوبكەن).

عائیشە فەرمووی: كاتێ گەیشتینە سەریف، لەوێ من بێنوێژ كەوتمو سووڕی مانگانەم بۆ هاتو هەتا رۆژوی عارفە بەبێ نوێژیی مامەوە، وە تەنیا ئیحرامم بە عەمرە دابەست، جا پێغەمبەر (دروودی خوداى لەسەر بێ) فەرمانی پێم كرد، كە قژە

سەرەکەم هەڵوەشێنمەوەو شانەی بکەمو عەمرەکەم واز لێ بهێنمو ئیحرام بەحەج دابەستم، وە منیش وەهام کرد، هەتا حەجەکەمم تەواو کرد، جا لەسەر داوای خۆم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەبدورەحمانی کوڕی ئەبوبەکری، برامی، لەگەڵ دا ناردم، چووم بۆ تەنعیم، کە نزیکترین خاکی حیللە لە خاکی حەرەمەوە، لەوێ ئیحرامم بە عەمرە دابەست، لەجیاتی ئەو عەمرەیەی کە بۆم تەواو نەکرا، چونکە ئەگەر ئەو عەمرەیەم تەواو بکردایە فریای کردارەکانی حەج نەدەکەوتم). {بڕوانە: تەجرید/٢، ژمارە: ٢٠٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧، زنجیرە: ٩٢، ژمارە: ١٥٣٨ + تاج/٢، زنجیرە: ٩٩، ژمارە: ١٥٦٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ١٥٥٠}.

## ٥٣٦) مەرج دانان لە حەجو عەمرەدا. (٢٨٨٣ - ٢٨٩٣)
## بَابٌ: الإشْتِراطُ فِي الحَجِّ وَالعمْرَة

٦٧٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَنَّ ضُبَاعَةَ بِنْتَ الزُّبَيْرِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ أَتَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: إِنِّي امْرَأَةٌ ثَقِيلَةٌ، وَإِنِّي أُرِيدُ الْحَجَّ، فَمَا تَأْمُرُنِي؟ قَالَ: « أَهِلِّي بِالْحَجِّ وَاشْتَرِطِي أَنَّ مَحِلِّي حَيْثُ تَحْبِسُنِي »، قَالَ: فَأَدْرَكَتْ. {الحديث: ٢٨٩٧ = ٢٨٨١ ف.م. نسائى. حج: ٢٧٦٦. ابن ماجة. مناسك: ٢٩٣٨ تحفة: ٥٧٥٤}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ضوباعەی کچی زوبەیری کوڕی عەبدولموتتەلیب، کە کچی مامی پێغەمبەرە، چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەمەوێ بچم بۆ حەج، بەڵام نەخۆشی باری لەشی گران کردووم، دەترسم لەرێ تەواو نەخۆشکەوم، جا چارم چییە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بڕۆ بۆ حەجو مەرج دابنێو بڵێ: ئەی خودایە! خۆت ئاگات لە حاڵمە، لەهەر شوێنێ تۆ نەخۆشت خستم لەوێ ئیحرام دەشکێنم). فەرمووی: زوباعە چوو بۆ حەجو حەجەکەی تەواو کردو ئیحرامی نەشکاند، زوباعە ژنی میقدادی کوڕی ئەسوەد بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٩ — ش/د/ت/ن. بخاری. نکاح: ٥٠٨٩ = تەجرید/١١/٥، ژمارە: ١٧٤٩}.

## ٥٣٧) کەسێ جبەی لەبەردا بێو بۆنی خۆشی لەخۆی دابێو لە ئیحرام دابێ
(٢٧٨٣ - ٢٧٩٤)

## باب: مَنْ أَحْرَمَ وَعَلَيْهِ جُبَّةٌ وَأَثَرُ الخلُوق

٦٧٧- عَنْ يَعْلَى بْنِ مُنْيَةَ ( رضى الله عنه) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ عَلَيْهِ جُبَّةٌ وَعَلَيْهَا خَلُوقٌ، أَوْ أَثَرُ صُفْرَةٍ فَقَالَ: كَيْفَ تَأْمُرُنِى أَنْ أَصْنَعَ فِى عُمْرَتِى؟ قَالَ: وَأُنْزِلَ عَلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) الْوَحْيُ، فَسُتِرَ بِثَوْبٍ، وَكَانَ يَعْلَى يَقُولُ: وَدِدْتُ أَنِّى أَرَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ نَزَلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ، قَالَ: فَقَالَ: أَيَسُرُّكَ أَنْ تَنْظُرَ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) وَقَدْ أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ؟ قَالَ: فَرَفَعَ عُمَرُ طَرَفَ الثَّوْبِ فَنَظَرْتُ إِلَيْهِ لَهُ غَطِيطٌ (قَالَ وَأَحْسِبُهُ قَالَ) كَغَطِيطِ الْبَكْرِ. قَالَ: فَلَمَّا سُرِّىَ عَنْهُ: قَالَ: « أَيْنَ السَّائِلُ عَنِ الْعُمْرَةِ؟ اغْسِلْ عَنْكَ أَثَرَ الصُّفْرَةِ - أَوْ قَالَ- : أَثَرَ الْخَلُوقِ، وَاخْلَعْ عَنْكَ جُبَّتَكَ، وَاصْنَعْ فِى عُمْرَتِكَ مَا أَنْتَ صَانِعٌ فِى حَجِّكَ ». {الحديث: ٢٧٩٠ = ٢٧٧٥ ف.م. تجريد/٢، لاپەڕە: ١٦٢، رقم: ٧٣٨ = ١٥٣٦، ١٧٨٩، ١٨٤٧، ٤٣٢٩، ٤٩٨٥}:

یەعلای کوڕی مونیە، کە مونیە ناوی دایکیەتی، ناوی باوکی ئومەییەیە، یەعلا فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە جیعرانە بوو، کە یەکێکە لە جێگەی دابەستنی ئیحرام، کە دەکەوێتە خاکی حیللەوە، لەنێوانی طائیفو مەککەدایە، لە مەککەوە نزیکترە، لەوێ لە جیعرانە، کاتێ پێغەمبەر، لەناو کۆمەڵێ لە هاوەڵانی دابوو، ئیحرامی عەمرەی دابەستبوو، ساڵی هەشتی کۆچی بوو، پیاوێ ریشو قژی خۆی لەبۆنی خۆشی، بەخەلووق، کە بۆنێکە بە زەعفەران دەگیرێتەوە، زەرد کردبوو، وە جبەیەکی لەبەردا بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی کرد: ئەی رەوانەکراوی خودا! ئیحرامی عەمرەم دابەستووەو بەم شێوەیەشم کە دەمبینی؟ جا فەرمانت چییە پێم؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تاوێ بێ دەنگ بوو، ئەوجا سرووش (نیگا = وەحی)ی بۆهات، ئیمامی عومەر (رەزای خودای لێ بێ) پۆشاکێکی وەك پەردە کوللە دا بەسەر پێغەمبەردا، یەعلا دەیفەرموو: خۆزگەم لەکاتی هاتنی سرووشا بۆ پێغەمبەر، پێغەمبەرم دەدی، ئیمامی عومەر بە

یەعلا دەفەرموێ: ئایا حەزدەکەی لەم حاڵەتەدا، تەماشای رووی پێغەمبەر بکەی کە سرووشی بۆ هاتووە؟ یەعلا فەرمووی: بەڵێ، جا عومەر گۆشەیەکی پەردەکەی بەرزەوەکرد، منیش سەرم کرد بەژێریدا تەماشام کرد: وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر قورسی باری هاتنی سرووشیی، رووی سوور هەڵگەڕا بوو، وەك خەوتووی هەناسە سوار بوو، پرخە پرخی دەهات، وەك پرخە پرخی جوانە وشتر، پاشان بەرە بەرە فەرامۆشی بۆ هاتو ئەو دۆخە قورسە بەریداو باری لەشی سووك بوو، وەهاتەوە سەر باری باری ئاسایی خۆی، ئەوجا فەرمووی: (ئەوەی کە لەبارەی عەمرەوە پرسیاری هەبوو، کوا لەکوێیە؟).

جا پیاوەکەیان هێنا بۆ خزمەتی، فەرمووی پێی: (سێجار ئەم بۆنە خۆشە بشۆرە کەداوتە لەخۆت) یا فەرمووی: (بۆنی ئەم خەلە قوقە لەخۆت داشۆرەوە جبەکەشت لەبەرت داکەنە، عەمرەیش لەم لایەنەوە وەك حەج وایە، لەبەرئەوە لەمەوپێش لە حەجەکەتا چیت کردووە، ئێستاش لە عەمرەکەتا هەمان شت بکە).

{تاج/٢/١٧٤، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ١٥٠١ چ/٤}.

**روونکردنەوە:**

یەعلای کوڕی ئومەیەی تەمیمی هاوەڵی پێغەمبەرە، لەرۆژی ئازادکردنی مەککەدا ئیسلام بوو، پیاوێکی دەوڵەمەندی زۆر سەخی بوو، ئامادەی غەزای تائیفو حونەینو تەبووك بووە، لە خزمەتی پێغەمبەردا. نۆزدە فەرموودەی هەیە، لە موقەددیمەی فەتحولباریدا دەفەرموێ: سێ فەرموودەی لە بوخاری پیرۆزدا هەیە، یەکێکیان ئەم فەرمودەیەی ئێرەیە کە لە موسلیمیشدا هەیە، واتە: موتتەفەقو عەلەیهییە، کە صەفوانی کوڕی لەوەوە دەیگێڕێتەوە، یەعلا پیاوێکی ناوداری لێهاتوو بوو، لەبەرئەوە لەکاتی حوکمڕانی هەرچوار جێنشینەکانی پێغەمبەردا، رۆڵی گەورەی بینیوە، ئەبوبەکر کردی بەکاربەدەستی سەر حلوان لەکاتی جەنگی ریددەدا، لەسەردەمی عومەردا بوو بەکارمەند لەسەر هەندێ لە وڵاتی یەمەن، لەسەردەمی عوسمانیشدا بوو بەکاربەدەستی عوسمان لەسەر سەنعاء،

ئەو ساڵەی کە عوسمان شەهید کرا هات بۆ حەج، زۆر لەدژی بکوژانی عوسمان خەباتی گێڕا، لەگەڵ عائیشەدا ئامادەی جەنگی ئەل-جەمەل بوو، ئەو حوشترەی کە لەو جەنگەدا لەژێر حەزرەتی عائیشەدا بوو، کە شەڕەکە بەناوی ئەو وشترەوە ناوی دەرکرد، ناوی عەسکەر بوو، یەعلا بەدوو سەد لیرەی زێڕ کڕی‌و دای بە عائیشە، لەو رووداوە دڵتەزێنەدا سواری بوو! لەپاشا لەگەڵ ئیمامی عەلی دا، ئامادەی شەڕی صەفین بوو، لەم شەڕەدا لەساڵی (٣٨)ی کۆچیدا شەهیدکرا (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

## ٥٣٨) ئیحرامدار چی جۆرە بەرگێ لەبەر ناکا. (٢٧٨٣ - ٢٧٩٤)

## باب: ما يجتنبُ المحرمُ مِنَ اللّباس

٦٧٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَجُلاً سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): مَا يَلْبَسُ الْمُحْرِمُ مِنَ الثِّيَابِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَلْبَسُوا الْقُمُصَ، وَلاَ الْعَمَائِمَ، وَلاَ السَّرَاوِيلاَتِ، وَلاَ الْبَرَانِسَ، وَلاَ الْخِفَافَ، إِلاَّ أَحَدٌ لاَ يَجِدُ النَّعْلَيْنِ، فَلْيَلْبَسِ الْخُفَّيْنِ، وَلْيَقْطَعْهُمَا أَسْفَلَ مِنَ الْكَعْبَيْنِ، وَلاَ تَلْبَسُوا مِنَ الثِّيَابِ شَيْئًا مَسَّهُ الزَّعْفَرَانُ وَلاَ الْوَرْسُ ». {الحديث: ٢٧٨٣ = ٢٧٦٧. ف.م. تجريد/٢، رقم: ١٠٨ = ٣٦٦، ١٥٤٢، ١٨٤٢، ٥٧٩٤. بخاری. حج: ١٥٤٢، ٥٨٠٣. أبو داود. حج: ١٨٢٤. نسائي. حج: ٢٦٧٣. ابن ماجة. حج: ٢٩٢٩ تحفة الأشراف: ٨٣٢٥}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەرگی ئیحرام چییە بۆ کەسێ لە ئیحرامدا بێ؟ فەرمووی: کراس‌و مێزەرو دەرپێ‌و کڵاو‌و خوف لەبەرنەکا، ئەگەر کەسێ جووتێ سۆڵی دەست نەکەوت ئەوا با جووتێ خوف، لەخوار قاپەڕە قەڵەوە ببڕێتەوە، ئەوجا لەپێیان بکا، وە هەربەرگێ زەعفەران‌و وەرسی پێوەبێ لەبەری مەکەن. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٣، ژمارە: ١٥٠٠}.

٦٧٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ يَخْطُبُ يَقُولُ: « السَّرَاوِيلُ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ الإِزَارَ، وَالْخُفَّانِ لِمَنْ لَمْ يَجِدِ النَّعْلَيْنِ ». يَعْنِي الْمُحْرِمَ. {الحديث: ٢٧٨٦ = ٢٧٧٠ ف.م. بخاری. حج: ١٥٤٢}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەرۆژی عەرەفەدا، لەکێوی عەرەفە، لە حەجی مالآواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وتارێکی دا، تیادا فەرمووی: (کەسێ لە ئیحرامدا بێو پەشتە ماڵ (إزار = بەرکۆش)ی، دەست نەکەوێ کە بیپێچێ بەلای خوارووی لەشیەوە، با دەرپێ لەپێ بکا، وە هەروەها ئەگەر سۆل (نەعل)ی دەست نەکەوت، با جووتێ پێلآو لەپێ بکا).

## ٥٣٩) راوکردن بۆ ئیحرامدار. (٢٨٣٧ - ٢٨٥٢)

## باب: في الصَّيْدِ لِلْمُحْرِمِ

٦٨٠- عَنِ الصَّعْبِ بْنِ جَثَّامَةَ اللَّيْثِيِّ (رضى الله عنه): أَنَّهُ أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِمَارًا وَحْشِيًّا، وَهُوَ بِالأَبْوَاءِ أَوْ بِوَدَّانَ، فَرَدَّهُ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ: فَلَمَّا أَنْ رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَا فِي وَجْهِي، قَالَ: « إِنَّا لَمْ نَرُدَّهُ عَلَيْكَ إِلاَّ أَنَّا حُرُمٌ ». {الحديث: ٢٨٣٧ = ٢٨٢١ فم. تجريد/٢، لاپەرە: ٢٤٠، رقم: ٨٣٩ = ١٨٢٥، ٢٥٧٣، ٢٥٩٦ فتح الباري. ترمذى. حج: ٨٤٩. نسائى. حج: ٢٨١٨. تحفة الأشراف: ٤٩٤٠}:

عەبدوڵلای کوڕی عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئیحرامدا بوو، صەعبی کوڕی جەثثامە (رەزای خودای لێ بێ) کەرە کێوییەکی سەربڕاوی بۆهێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دایەوە بەسەریداو وەری نەگرت لێی، ئەوکاتە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئەبواء بوو، کەناوی کێوێکە، یا لەوەددان بوو کەناوی شوێنێکە وا لەنزیکی جەحەفەوە، ئەبواء لەوەددان لە جەحەفەوە نزیکترە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سەیری کرد، صەعب ئەم وەرنەگرتنەی پێ ناخۆش بوو، وە بەم بۆنەیەوە رووی گرژبوو، دڵی دایەوەو پۆزشی بۆ هێنایەوەو عوزرخوایی بۆ کردو پێی فەرموو: (لەبەرئەوەی کەواین لە ئیحرامدا بۆیە ئەم نێچیرەت لێ وەرناگرین، دەنا لێمان وەردەگرتی).

**روونكردنەوە:**

صەعبى كوڕى جەثثامە (رەزاى خوداى لێ بێ) لەوەددان نیشتەجێ بوو، کەوا لە وڵاتی حیجاز، کە لەم فەرموودەیەدا ناوبراوە، دایکی ناوی فاخیتەی خوشکی ئەبو سوفیانی کوڕی حەربە، لە (فتح الملهم)دا دەفەرموێ: دایکی ناوی زەینەبی کچی حەربی کوڕی ئومەییەیە، لەکاتی موئاخاتا، کە پێغەمبەر پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی موسڵمانانا، دوو دوو کردنی بەبرای یەکتری، پەیمانی برایەتی بەست لەنێوانی صەعبو عەوفی کوڕی مالیکدا، ئامادەی ئازادکردنی وڵاتی ئیستەخر بووە، دەڵێن: لەپاش ئازادکردنی ئیستەخر، جارچی جاڕدەدا: کەوا جەجاڵ هەڵساوە! کە دەگەن بە صەعب (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (شتی وا نییە، چونکە بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیستووە دەیفەرموو: جەجاڵ هەڵناسێ هەتا خەڵك باسی پشت گوێ دەخەن). صەعب چەند فەرموودەیەکی تەندروستی گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، راستتر ئەوەیە کە لە ئاخرو ئۆخری جێنشینی ئیمامی عومەردا مردووە، (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەموو هاوەڵە بەڕێزو نازدارەکانی پێغەمبەر بێ).

٦٨١- عَنْ طَاوُسٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَدِمَ زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ فَقَالَ لَهُ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ يَسْتَذْكِرُهُ: كَيْفَ أَخْبَرْتَنِى عَنْ لَحْمِ صَيْدٍ أُهْدِىَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ حَرَامٌ؟ قَالَ: قَالَ: أُهْدِىَ لَهُ عُضْوٌ مِنْ لَحْمِ صَيْدٍ، فَرَدَّهُ. فَقَالَ: « إِنَّا لاَ نَأْكُلُهُ، إِنَّا حُرُمٌ ». {الحديث: ٢٨٤٢ = ٢٨٢٦ فـم. نسـائى. حـج: ٢٨٢١. تحفـة الأشـراف: ٥٧٠٠}:

تاووس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: زەیدی کوڕی ئەرقەم تەشریفی هات، عەرزیم کرد، ئایا لەیادتە، کە چۆن ئەو هەواڵەت گێڕایەوە بۆم، کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرگی ئیحرامدا بوو، گۆشتی نەچیریان بەدیاری هێنا بوو بۆی؟ زەید فەرمووی: (پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئێمە شتی وا ناخۆین، چونکە ئیحرامدارین واین لەبەرگی ئیحرامدا).

**ڕوونکردنەوە:**

یەکێ تر لە فەقێو شاگردە ناودارەکانی عەبدوڵڵای کوری عەبباس طاووسی کوڕی کیسانە، بەرەگەز فارسە، گێڕانەوەی لەهەر چوار عەبدوڵڵاکانەوە ئەنجام داوە، هەروا لە ئەبو هورەیرەو عائیشەو زەیدی کوڕی ثابیتو زەیدی کوڕی ئەرقەم، لە چینی دووەمی موسوڵمانانە، کە پێیان دەگوترێ پەیڕەوان (تابعین) بەخزمەت پەنجا کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر گەیشتووە، ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: باوەڕم وایە کە تاووس بەهەشتییە). ئیبنو حیببان دەیفەرموو: (طاووس یەکێکە لە خواناسە گەورەکانی خەڵکی یەمەنو یەکێکە لە گەورە پیاوانی پەیڕەوان (تابعین) چل حەجی کردووە، نزاو پاڕانەوەی زۆر گیرا بوو، ئیبنو عویەینە دەفەرموێ: ئەم سێ کەسە دوورە پارێز ترین کەس بوون لە دەسەڵات، ئەبو زەڕ لەسەردەمی خۆیدا، ثەوری لەسەردەمی خۆیدا، طاووس لەسەردەمی خۆیدا. لە مەککە مردووە عەشاماتو جەماوەرێکی زۆر شوێن تەرمەکەی کەوتن، چەند بۆچوونێ سەبارەت بە مەرگی هەیە، لە دەوروبەریساڵی سەدو شەشی کۆچیدا مردووە. بڕوانە: تەجریدی بوخاری بەرگی یەکەم فەرموودەی ژمارە: ٨٣ = ٩٨ فتح، بۆ ژیینامەی عەطای کوڕی ئەبو رەباح، کە ئەویش فەقێو شاگردی ئیبنو عەبباس بووە. (رەزاو رەحمەتی خودا لەهەمووان بێ).

## ٥٤٠) کەسێ لە ئیحرامدا نەبێو بێ ئیحرام بێو نەچیر بگرێو بەشی کەسێکی لێ بدا کە ئیحرامدار بێ. (٢٨٣٧ - ٢٨٥٢)

## باب: في لَحمِ الصَّيْدِ للمُحْرِمِ يصيدُهُ الحَلالُ

٦٨٢- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ ( رضى الله عنه) قَالَ: خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَاجًّا، وَخَرَجْنَا مَعَهُ، قَالَ: فَصَرَفَ مِنْ أَصْحَابِهِ فِيهِمْ أَبُو قَتَادَةَ فَقَالَ: « خُذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ حَتَّى تَلْقَوْنِي، فَأَخَذُوا سَاحِلَ الْبَحْرِ، فَلَمَّا انْصَرَفُوا قِبَلَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَحْرَمُوا كُلُّهُمْ إِلاَّ أَبَا قَتَادَةَ فَإِنَّهُ لَمْ يُحْرِمْ، فَبَيْنَمَا هُمْ يَسِيرُونَ إِذْ رَأَوْا حُمُرَ وَحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ، فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلُوا فَأَكَلُوا مِنْ لَحْمِهَا، قَالَ: فَقَالُوا: أَكَلْنَا لَحْمًا

وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ؟ قَالَ: فَحَمَلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِ الأَتَانِ، فَلَمَّا أَتَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّا كُنَّا أَحْرَمْنَا، وَكَانَ أَبُو قَتَادَةَ لَمْ يُحْرِمْ، فَرَأَيْنَا حُمُرَ وَحْشٍ، فَحَمَلَ عَلَيْهَا أَبُو قَتَادَةَ، فَعَقَرَ مِنْهَا أَتَانًا، فَنَزَلْنَا فَأَكَلْنَا مِنْ لَحْمِهَا، فَقُلْنَا: نَأْكُلُ لَحْمَ صَيْدٍ وَنَحْنُ مُحْرِمُونَ، فَحَمَلْنَا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا، فَقَالَ: « هَلْ مِنْكُمْ أَحَدٌ أَمَرَهُ أَوْ أَشَارَ إِلَيْهِ بِشَيْءٍ ؟». قَالَ: قَالُوا: لاَ. قَالَ: « فَكُلُوا مَا بَقِيَ مِنْ لَحْمِهَا ». {الحديث: ٢٨٤٧ = ٢٨٣١ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٨٣٨ = ١٨٢٢، ١٨٢١، ١٨٢٣، ١٨٢٤، ٢٥٧٠، ٢٨٥٤، ٢٦١٤، ٤١٤٩، ٥٤٠٦، ٥٤٠٧، ٥٤٩٠، ٥٤٩١، ٥٤٩٢}:

ئەبو قەتادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە خزمەت پێغەمبەردا (دروودی خوای لەسەر بێ) لە مەدینەو دەوروبەریەوە، بەرەو مەککە، لەکاتی غەزای حودەیبییەدا، دەرچووین بەمەبەستی عەمرە، جا پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) کۆمەڵێکی لە هاوەڵانی خۆی جیاکردەوە، کە ئەبو قەتادە یەکێ بوو لەو کۆمەڵەیە، فەرمووی پێیان: (ئێوە بەری دەریا بگرن هەتا دەگەنەوە بەخۆم، ئیتر ئێمەیش بەرەو ڕێگەی دەریا، ڕووەو مەککە ڕۆیشتین‌و ئەو ئەرکەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) پێی سپاردین ئەنجاممان داو کاتێ بەرەو پێغەمبەرو یارانی گەڕاینەوە، هاوڕێکانم هەموویان ئیحرامی عەمرەیان دابەست تەنیا من نەبێ، من ئیحرامم دانەبەست، جا لەڕێ بڕکەیێ کەرە کێویمان تووش بوو، من بە ئەسپەکەم هەڵمەتم بردە سەریان‌و دێڵە کەرێکم لێ کوشتن، جا هەموو دابەزین‌و دەستمانکرد بە خواردن لە گۆشتەکەی، دوایی بوو بە مقۆ مقۆیان‌و گوتیان: چۆن شتی وا دەبێ، ئێمە لای خۆی لە ئیحرامدا بووین، چۆن دەبێ گۆشتی نەچیری ڕاوکراو بخۆین؟ ئەبو قەتادە دەفەرموێ: جا ئەوەی مابوو لەگۆشتی کەرە کێوییەکە هەڵیان گرت‌و کاتێ چوونە خزمەتی پێغەمبەر، عەرزیان کرد: قوربان! ئێمە لە ئیحراما بووین، بەڵام ئەبو قەتادە ئیحرامی دانەبەستبوو، بڕکەیێ کەرە کێویمان بینی، ئەبو قەتادە نیشتە سەریان، دێڵە کەرێکی لێ کوشتن، ئێمەیش دابەزین‌و لە گۆشتەکەیمان خواردو گوتمان: شتی وا چۆن دەبێ، ئێمە ئیحرامدارین، چۆن دەبێ گۆشتی

نەچیری راوکراو بخۆین؟ ئەوەتا ئەوەی مابوو لە گۆشتەکەی لەگەڵ خۆمان هێناومانە.

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئایا کەسێ لەئێوە پێی گوت کە بنیشێتە سەری، یا سەبارەت بەو نێچیرانە ئاماژەیەکی بۆ ئەبو قەتادە دەکرد؟) گوتیان: نەء. فەرمووی: (دەی ئەوەیشی کەماوە لە گۆشتەکەی بیخۆن).

## ٥٤١) کەسێ لە ئیحرامدا بێ بۆی هەیە کام جانەوەرێ بکوژێ (٢٨٥٣ - ٢٨٦٨)
## بابٌ: مَا يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ مِنَ الدَّوَّابِ

٦٨٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ قَالَ: « خَمْسٌ فَوَاسِقُ يُقْتَلْنَ فِى الْحِلِّ وَالْحَرَمِ: الْحَيَّةُ وَالْغُرَابُ الأَبْقَعُ وَالْفَارَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ، وَالْحُدَيَّا ». {الحديث: ٢٨٥٤ = ٢٨٣٨ ف.م} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم پێنج جانەوەرە لەڕادە دەرچوون‌و زیانیان لە ئەندازە بەدەرە، لەبەرئەوە چ لە خاکی بەست (حەرەم)و چ لە خاکی نابەسمت (حیلل)دا دەکوژرێن، لەلایەن ئیحرامدارو لەلایەنی بێ ئیحرامەوە: ئەوانیش مارو قەلە بازەڵەو مشك‌و سەگی نهێنی گری گازگرو کۆلارەن). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ١٥٠٨} .

٦٨٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « خَمْسٌ لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ قَتَلَهُنَّ فِى الْحَرَمِ وَالإِحْرَامِ: الْفَارَةُ، وَالْعَقْرَبُ، وَالْغُرَابُ، وَالْحِدَأَةُ، وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ ». {الحديث: ٢٨٦٠ = ٢٨٤٤ ف.م} :

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێنج جۆرە جانەوەر هەن، هەرکەسێ بیان کوژێ گوناهی ناگات، خۆی لەناو سنووری بەستی مەککەدا بیانکوژێ، یان لە دەرەوەی سنووری بەستی مەککەدا بیانکوژێ گوناهی ناگا وە خۆی لە ئیحرامدا بێ‌و بیانکوژێ‌و یابێ ئیحرام بێ‌و بیانکوژێ دیسان گوناهی ناگات، ئەو پێنج جانەوەرەیش ئەمانەن: مشك‌و دووپشك‌و قەلە بازەڵەو کۆلارەو سەگی گازگر). {تاج/١، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ١٥٠٨ چاپی چوارەم} .

## ٥٤٢) کەڵەشاخ گرتن بۆ ئیحرامدار. (٢٨٧٩ - ٢٨٨٠)
## باب: الحَجَامَةُ للمُحْرِم

٦٨٥- عَنِ ابْنِ بُحَيْنَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) احْتَجَمَ بِطَرِيقِ مَكَّةَ وَهُوَ مُحْرِمٌ، وَسَطَ رَأْسِهِ. {الحديث: ٢٨٧٨ = ٢٨٦٢ ف.م تجريد البخارى/٢، رقم: ٨٤٤ = ١٨٣٦ طرفه في: ٥٦٩٨. نسائى. حج: ٢٨٥. ابن ماجه. طب: ٣٤٨١. تحفة الأشراف: ٩١٥٦}:

ئیبنو بوحەینە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەربێ) لە ئیحرامدا بوو، لە لەحیی جەمەل بوو، کە جێگەیەکە وا لەنێوان مەدینەو مەککەدا، بەڵام لە مەدینەوە نزیکترە لەوێ کەڵەشاخی لە ناوەڕاستی سەری خۆی گرت، لەبەر ئازارێ کە لەسەریدا بوو، کە بە عەرەبی پێی دەگوترێ (شقیقە).

## ٥٤٣) تیماری چاوی ئیحرامدار. (٢٨٧٩ - ٢٨٨٠)
## باب: مُداوة المحرم عَيْنَيْه

٦٨٦- عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ أَبَانِ بْنِ عُثْمَانَ حَتَّى إِذَا كُنَّا بِمَلَلٍ اشْتَكَى عُمَرُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ عَيْنَيْهِ، فَلَمَّا كُنَّا بِالرَّوْحَاءِ اشْتَدَّ وَجَعُهُ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانَ بْنِ عُثْمَانَ يَسْأَلُهُ؟ فَأَرْسَلَ إِلَيْهِ أَنِ اضْمِدْهُمَا بِالصَّبِرِ فَإِنَّ عُثْمَانَ (رضى الله عنه) حَدَّثَ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى الرَّجُلِ إِذَا اشْتَكَى عَيْنَيْهِ وَهُوَ مُحْرِمٌ ضَمَّدَهُمَا بِالصَّبِرِ. {الحديث: ٢٨٧٩ = ٢٨٦٣ ف.م}:

لە نوبەیهی کوڕی وەهبەوە، فەرمووی: لەگەڵ ئەبمانی کوڕی عوسماندا دەرچووین، لە ڕێگە کە گەیشتینە مەلەل، عومەری کوڕی عوبەیدوڵلا چاوەکانی دەستیان کرد بەژانکردن، جا کاتێ کە گەیشتینە ڕەوحا، ئێشەکەی تەواو سەخت بوو، یەکێکی نارد بۆلای ئەبانی کوڕی عوسمان لەم بارەیەوە لێی پرسی، ئەویش وەڵامی بۆ ناردەوە: کە بە نیونمەکی تاڵی شاری بیپێچە، چونکە عوسمان (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: پرسیارکرا لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەگەر کەسێ لە ئیحرامدا

بێو چاوی ئێشا چی بکا؟ فەرمووی: (بەتاڵی شاری بیپێچێت). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ١٥١٣ — م/د/ت/ن}.

**روونکردنەوە:**

کورتو پوخت: بەکارهێنانی دەرمان، ئەگەر بۆ تیمارو چارەسەر بێو بۆنی خۆش نەبێ، بەپێی پێویست دروستە).

## ٥٤٤) ئیحرامدار بۆی هەیە سەری خۆی بشۆرێ. (٢٨٨١ - ٢٨٨٢)
## باب: غَسْلُ المُحْرِمِ رَأسَهُ

٦٨٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ حُنَيْنٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ وَالْمِسْوَرِ بْنِ مَخْرَمَةَ (رضى الله عنهم): أَنَّهُمَا اخْتَلَفَا بِالأَبْوَاءِ فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ: يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، وَقَالَ الْمِسْوَرُ: لاَ يَغْسِلُ الْمُحْرِمُ رَأْسَهُ، فَأَرْسَلَنِى ابْنُ عَبَّاسٍ إِلَى أَبِى أَيُّوبَ الأَنْصَارِيِّ (رضى الله عنه) أَسْأَلُهُ عَنْ ذَلِكَ، فَوَجَدْتُهُ يَغْتَسِلُ بَيْنَ الْقَرْنَيْنِ وَهُوَ يَسْتَتِرُ بِثَوْبٍ قَالَ: فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَقَالَ: مَنْ هَذَا؟ فَقُلْتُ: أَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ حُنَيْنٍ، أَرْسَلَنِى إِلَيْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عَبَّاسٍ أَسْأَلُكَ كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَغْسِلُ رَأْسَهُ وَهُوَ مُحْرِمٌ؟ فَوَضَعَ أَبُو أَيُّوبَ يَدَهُ عَلَى الثَّوْبِ فَطَأْطَأَهُ حَتَّى بَدَا لِى رَأْسُهُ، ثُمَّ قَالَ لإِنْسَانٍ يَصُبُّ: اصْبُبْ، فَصَبَّ عَلَى رَأْسِهِ، ثُمَّ حَرَّكَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ ثُمَّ قَالَ: هَكَذَا رَأَيْتُهُ (صلى الله عليه وسلم) يَفْعَلُ. {الحديث: ٢٨٨١ = ٢٨٦٥ ف.م، تجريد/٢، رقم: ٨٤٦ = ١٨٤٠ فتح البارى. أبو داود. حج: ١٨٤٠ز نسائى. حج: ٢٦٦٤. تحفة الأشراف: ٣٤٦٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی حونەین (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس‌و میسوەری کوڕی مەخرەمە، (رەزای خودایان لێ بێ)، لە ئەبواء بوو بە راجیاییان، ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی ئەوەی هەیە کە سەری خۆی بشۆرێ، میسوەر دەیفەرموو: ئیحرامدار مافی ئەوەی نییە کە سەری خۆی بشۆرێ. جا ئیبنو عەبباس منی نارد بۆ خزمەتی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری، کە گەیشتمە خزمەتی، تەماشام کرد، لەبەینی دوو شاخەی چەرخی بیرەکەدا خۆی دەشۆرێ، بە

جلكێ پەردەی بۆ کرابوو، منیش لەم دیو پەردەکەوە سلاوم لێکرد، فەرمووی: ئەوە کێیە؟ گوتم: منم عەبدوڵلای کوڕی حونەینم، ئیبنو عەبباس ناردوومی بۆ خزمەتی جەنابت، کە لێت بپرسم: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ئیحرامدا بوایە، چۆن چۆنی سەری خۆی دەشۆرد؟ ئەبو ئەییوب ئەوکاتە خۆی لە ئیحرامدا بوو، جا دەستی خۆی لەسەر پەردەکە دانا، کەمێ پەردەکەی دانەواند، هەتا سەری لەمنەوە دەرکەوت، ئەوجا بە مرۆڤێکی فەرموو، کە ئاوی دەکرد بەسەریا: (ئادەی ئاو بکە بەسەرما) ئەویش ئاوەکەی کرد بەسەریدا، ئەوجا ئەبو ئەییوب بە هەردوو دەستی خۆی، قژی خۆی هەلگلۆفتو لەپێشە سەریەوە دەستەکانی برد بۆ پشتە سەری‌و لەوێوە هێنانیەوە بۆ پێشەوە، وە فەرمووی: بەچاوی خۆم دیم کە پێغەمبەری خودا خۆی دەشۆردو لە ئیحرامدا بوو، وە هەروەها پێغەمبەرم دی لەو خۆشۆردنەدا، سەری خۆی ئاوا هەڵ دەگلۆفت، کەمن ئێستا لەبەرچاوی تۆ کردم. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ١٥١٢}.

### ٥٤٥) تۆڵە (فید)یەی سەر ئیحرامدار. (٢٨٦٩ - ٢٨٧٦)

### باب: في الفدْيَة على المُحْرِم

٦٨٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْقِلٍ قَالَ: قَعَدْتُ إِلَى كَعْبٍ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ، فَسَأَلْتُهُ عَنْ هَذِهِ الآيَةِ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ). فَقَالَ كَعْبٌ: نَزَلَتْ فِيَّ، كَانَ بِي أَذًى مِنْ رَأْسِي، فَحُمِلْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَالْقَمْلُ يَتَنَاثَرُ عَلَى وَجْهِي، فَقَالَ: « مَا كُنْتُ أُرَى أَنَّ الْجَهْدَ بَلَغَ مِنْكَ مَا أَرَى، أَتَجِدُ شَاةً؟». فَقُلْتُ: لاَ، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: (فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ)، قَالَ: «صَوْمُ ثَلاَثَةِ أَيَّامٍ أَوْ إِطْعَامُ سِتَّةِ مَسَاكِينَ، نِصْفَ صَاعٍ طَعَامًا لِكُلِّ مِسْكِينٍ»، قَالَ: فَنَزَلَتْ فِيَّ خَاصَّةً، وَهْيَ لَكُمْ عَامَّةً. {الحديث: ٢٨٧٥ = ٢٨٥٩ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٨٣٧ = ١٨١٥، ١٨١٤، ١٨١٦، ١٨١٧، ٦٨٠٨، ١٨١٨، ٤١٥٩، ٤١٦٠، ٤١٩١، ٤٥١٧، ٥٦٦٥، ٥٧٠٣، ١٨١٦. ترمذي. تفسير: ٢٩٧٣}:

عەبدوڵلای کوڕی مەعقیل فەرمووی: کەعبی کوڕی عوجرە لە مزگەوتەکەی کووفە بوو، سەبارەت بەم ئایەتە پرسیارم لێی کرد، کە دەفەرموێ: {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ} . کەعب فەرمووی: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە من بووم، بردمیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر، ئەسپێ لەسەرم هەڵدەوەری لەبەر زۆری، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (نەمزانی کە ئاوا بەدەست ئەم جرو جانەوەرەی سەرتەوە پەرێشانی، ئایا مەڕێ، یا بزنێکت هەیە کە سەری ببڕیت؟). گوتم: نەء، جا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە دابەزی: {فَفِدْيَةٌ مِّن صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ} . واتە: دەی ئەگەر کەسێ لەئێوە، لە ئیحراما بوو، نەخۆش کەوت، یا ئازارێ لەسەریا بوو، وە بەهۆی ئەو نەخۆشینەوە، یا بەهۆی ئەو ئازارەوە سەری خۆی تاشی بەناچاری، ئەوە لەسەریەتی تۆڵەیێ (واتە: فیدیەیێ) بدا لەباتی ئەو سەر تاشینەی، کە ئەو تۆڵەیەیە بریتییە لە ڕۆژووی سێ ڕۆژ، یا خواردەمەنی شەش هەژار، یا ئاژەڵێ سەر ببڕێو دابەشی بکا بەسەر هەژارانا).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ڕوونکردنەوەی چۆنێتیی جێبەجێکردنی ئایەتەکە، بەمنی فەرموو: (یا سێ ڕۆژ بەڕۆژوو بە، یا خواردەمەنی شەش هەژار بدە، هەر هەژمارەی نیومەن خۆراکی پێ بدە). چونکە من نەم بوو کە ئاژەڵێ سەر ببڕم.

کەعب فەرمووی: ئەم ئایەتە {فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَى سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ وَعَلَى الَّذِينَ يُطِيقُونَهُ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ فَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَهُوَ خَيْرٌ لَّهُ وَأَن تَصُومُوا خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ} : بەهۆی منەوە هاتە خوارەوەو ئەم دۆخەی من بوو بەهۆی هاتنی، بەڵام بڕیارو حوکمەکەی بە تێکڕایی بۆ هەمووتانە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٥، ژمارە: ١٦٥٠} .

**ڕوونکردنەوە:**

کەعبی کوڕی عوجرە (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوەڵی پێغەمبەر بوو، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە گێڕاوەتەوە، هۆی هاتنی ئەم ئایەتە پیرۆزە بوو، کە ئێستا

خوێندرایەوە، ئامادەی رۆژی حودەیبییە بوو، وە ئەم داستانی سەرتاشینەی لەو رۆژەدا بوو. {تاج. ژمارە: ١٦٥٠}.

لە شەڕێکا دەستێکی پەڕی، لە کووفە نیشتەجێ بوو، خەڵکی مەدینەو کووفە، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، بەهێزتر را ئەوەیە کە ساڵی پەنجاو سێ لە مەدینە مردووە، لە تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵیدا.

**٥٤٦) کەسێ لە ئیحرامدا بێو بمرێ چی لێ دەکرێ** (٢٨٨٣ - ٢٨٩٣)
**باب: في المُحْرِمِ يَمُوتُ ما يُفعَلُ بِه**

٦٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم): خَرَّ رَجُلٌ مِنْ بَعِيرِهِ، فَوُقِصَ، فَمَاتَ. فَقَالَ: « اغْسِلُوهُ بِمَاءٍ وَسِدْرٍ، وَكَفِّنُوهُ فِى ثَوْبَيْهِ، وَلاَ تُخَمِّرُوا رَأْسَهُ فَإِنَّ اللَّهَ يَبْعَثُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ مُلَبِّيًا ». {الحديث: ٢٨٨٨ = ٢٨٧٢ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٦٠٨ = ١٢٦٥، ١٢٦٦، ١٢٦٧، ١٢٦٨، ١٨٣٩، ١٨٥١. أبو داود. جنائز: ٣٢٣٨. ترمذى. حج: ٩٥١. نسائى. جنائز: ١٩٠٣. تحفة الأشراف: ٥٥٨٢}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە حەجی ماڵاواییدا، لە کێوی عەرەفە، لە خزمەتی پێغەمبەردا بوو، لە وشترەکەی کەوتە خوارەوە، ئەستۆی شکاو مرد، ئەم پیاوە کە بەرەوە بوو لە ئیحرامدا بوو، پێغەمبەر خۆشی لە ئیحرامدا بوو، فەرمووی (درוودی خودای لەسەر بێ): (بە ئاوو مۆرد پاك بیشۆرن، لە دوو لۆ جلەکەی بەری خۆیدا کفنی بکەن، بەڵام حەنووتو بۆنی خۆشی لێ مەدەنو سەریشی بە کفنەکەی دامەپۆشن، چونکە رۆژی قیامەت کە خودا زیندووی دەکاتەوە، بە بەرگی ئیحرامەوە زیندووی دەکاتەوەو وەك حاجیان لەببەیکە دەکات). {تاج/١، زنجیرە: ٢٠٦، ژمارە: ١٠٨٠}.

حەنووت: بۆنێکی گیراوەیە، تایبەتە بە مردووەوە.

## ٥٤٧) شەو مانەوە لە ذى طەواو خۆشۆردن بۆ رۆیشتنە ناو شاری مەککە (٣٠٢٦ - ٣٠٣٣)

## باب: المبيت بذي طوى، والإغتسال قبل دخول مكّة

٦٩٠- عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ لاَ يَقْدَمُ مَكَّةَ إِلاَّ بَاتَ بِذِى طَوًى حَتَّى يُصْبِحَ وَيَغْتَسِلَ، ثُمَّ يَدْخُلُ مَكَّةَ نَهَارًا، وَيَذْكُرُ عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ فَعَلَهُ. {الحديث: ٣٠٣٤ = ٣٠٢١ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٤٦ = ١٥٥٣، ١٥٥٤، ١٥٧٣، ١٥٧٤ز أبو داود. حج: ١٨٦٥. تحفة الأشراف: ٧٥١٣}:

نافیع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کاتێ ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە زولحولەیفە نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوسا فەرمانی دەدا: وشترەکەییان کۆپان دەکرد بۆی، ئەوجا سوار دەبوو، جا کە بەباشی لەسەر پشتی وشترەکەی ژێری خۆی دەگرتو رێك دادەمەزرا لەسەر پشتی، بەسەر وشترەکەوە قیت دادەنیشتو رووی دەکردە رووگەی پیرۆز، ئیتر دەستی دەکرد بە لەبەیکە کردنو بەینە بەینە بەبێ پسان تەلبییەی دەکرد، هەتا دەگەیشتە خاکی حەرەمو ئەوجا بە ئەرکەکانی تری حەجەوە خەریك دەبوو، کەمتر دەیپەرژایە سەر تەلبییە، ئەوجا دەچوو بۆ زوطەوا، کە ئێستا پیی دەگوترێ: (بئـر الزاهـر = بیری زاهیر)لەوێ شەو دەمایەوە هەتا بەیانی، جا کاتێ لەوێ نوێژی بەیانی دەکرد، ئەوسا خۆی دەشۆرد، ئەوجا لە رۆژدا دەڕۆیشتە ناو مەککە، بەقسەی ئیبنو عومەر، پێغەمبەر خۆشی (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم سێ شتەی ئاوا بەرودوا دەکرد).

## ٥٤٨) رێگۆڕین لەکاتی رۆیشتنە ناو مەککەو مەدینەو لەکاتی دەرچوون لێیان (٣٠٣٠ - ٣٠٣٢)

## باب: دخول مكة والمدينة منْ طَرِيقٍ والخُرُوج منْ طَرِيق

٦٩١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَخْرُجُ مِنْ طَرِيقِ الشَّجَرَةِ وَيَدْخُلُ مِنْ طَرِيقِ الْمُعَرَّسِ وَإِذَا دَخَلَ مَكَّةَ دَخَلَ مِنَ الثَّنِيَّةِ الْعُلْيَا

وَيَخْرُجُ مِنَ الثَّنِيَّةِ السُّفْلَى. {الحديث: ٣٠٣٠ = ٣٠١٨ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٥٨ = ١٥٧٦. أبو داود. حج: ١٥٧٦}:

ئيبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕێگەی ئەل-شەجەرەوە لە مەدینە دەردەچوو، لە ڕێگەی ئەل-موعەرریسەوە دەگەڕایەوە بۆی، کە دەچوو بۆ مەککەش لە ثەنییەتول عولیاوە دەڕۆیشتە ناوی، وە لە ثەنییەتول سوفلاشەوە لێی دەردەچوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٣، ژمارە: ١٥٤٠، ١٥٣٩}.

## ٥٤٩) دابەزین لە مەککە بۆ حاجی. (٣٢٨١ - ٣٢٨٣)
## باب: في النذول بمكة للحاجّ

٦٩٢- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدِ بْنِ حَارِثَةَ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَتَنْزِلُ فِى دَارِكَ بِمَكَّةَ؟ قَالَ: « وَهَلْ تَرَكَ لَنَا عَقِيلٌ مِنْ رِبَاعٍ أَوْ دُورٍ؟». وَكَانَ عَقِيلٌ وَرِثَ أَبَا طَالِبٍ هُوَ وَطَالِبٌ، وَلَمْ يَرِثْهُ جَعْفَرٌ وَلاَ عَلِىٌّ شَيْئًا لأَنَّهُمَا كَانَا مُسْلِمَيْنِ، وَكَانَ عَقِيلٌ وَطَالِبٌ كَافِرَيْنِ. {الحديث: ٣٢٨٢ = ٣٢٧٠. تجريد/٢، رقم: ٧٦١ = ١٥٨٨، ٣٠٥٨، ٤٢٨٢، ٦٧٦٤. أبو داود. حج: ٢٠٠٨، ٢٩١٠. تحفة الأشراف: ١١٤}:

ئوسامەی کوڕی زەیدی کوڕی حاریثە (ڕەزای خودایان لێ بێ) گوتی: لەکاتی ئازادکردنی شاری مەککەدا، گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! سبەینێ کە گەیشتینە ناو شاری مەککە، لەکوێ دادەبەزی، ئایا بارگەکەت لە خانووەکەی مەککەتا، دەخەیتو ئەوێ ەکەیت بە بنەو بارەگای خۆت؟ فەرمووی: (جا بۆچی عەقیل هیچ خانوبەرەی بۆ ئێمە هێشتۆتەوە، هەتا تیا دابەزین؟).

ئەوجا فەرمووی: (نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێ، وە نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپوور لەهیچ امیان وەرناگرن. {تاج/٢، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٩٦٠}.

بە زوهرییان گوت: ئەی کێ کەلەپوورو میراتەکەی ئەبو طالیبی برد بۆ خۆی؟ فەرمووی: عەقیلو طالیب بردیان، هەرچی لە ئەبو طالیبی باوکیان بەجێما، بوو

به کەلەپوورو میراتی ئەوان! چونکە ئەبو طالیبی باوکیان لەسەر ئایینی هۆزەکەی مردو موسوڵمان نەبوو، عەقیلو طالیبیش ئەوکاتە ناموسوڵمان بوونو لەسەر ئایینی ئەو بوون، بەلاّم جەعفەری کوڕیو ئیمامی عەلی کوڕی، لەبەرئەوەی ئەوکاتە موسوڵمان بوون، میراتیان لە ئەبو طالیبی باوکیان نەبرد). {تاج/٤، ژمارە: ٤٦٢٥ + زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩١٣}.

**ڕوونکردنەوە:**

جەعفەرو عەلیو عەقیلو طالیب هەرچواریان برابوون، هەق ئامۆزای پێغەمبەر بوون، چونکە کوڕی ئەبو طالیبی مامەی بوون، کە هەق برای باوکیو دایکی عەبدوڵلاّی باوکی پێغەمبەر بوو، جەعفەر دە ساڵ لە عەلی گەورەتر بوو، عەقیلیش دە ساڵ لە جەعفەر گەورەتر بوو، طالیبیش دە ساڵ لە عەقیل گەورەتر بوو، واتە: طالیب یەکەم بوو، عەقیل دووەم، سێیەم: جەعفەر، چوارەم: عەلی.

طالیبیان لە غەزای بەدردا، بێ سەرو شوێن بوو، موسوڵمان نەبوو، جەعفەریان لە کۆچکارە پێشینەکان بوو، کۆچی کرد بۆ وڵاتی حەبەشە، لە غەزای خەیبەردا گەڕایەوە، بۆ خزمەت پێغەمبەر لە مەدینە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (نازانم بەکام لەم دوو موژدەیە شادمانترم، بەهاتنی جەعفەر، یا بە ئازادکردنی خەیبەر!).

ناوداره بە جەعفەری تەییار، واتە: جەعفەری باڵدار، چونکە لە غەزای مۆتەدا، لە وڵاتی شام، لە شەڕ لەگەڵ سوپای ڕۆمدا، کە شەهید کرا، هەردوو دەستی پەڕی، وە تەرمەکەی بە شەهیدی کە دۆزرایەوە، زیاتر لە نەوەد سەرە ڕمو دەمە شیرو جێگە تیری پێوە بوو، لەوەدوا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (جەعفەرم دی لە بەهەشتا لەگەڵ فریشتەکانا، بەدوو باڵ دەفڕی!).

لە فەرموودەیەکی تردا، پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئیمشەو جەعفەرم پێ گەیشت، لەناو پۆلێ فریشتەدا بوو، هەردوو باڵی خەڵتانی خوێن بوو).

جەعفەر برای باوكو دایكی ئیمامی عەلی بوو، دەڵێن: بیستو شەشەم كەس بووە كە موسوڵمان بووە، پێغەمبەر پێی فەرموو: (هەم شێوەی شیرینتو هەم رەفتاری جوانت لەخۆم دەچێ!).

جەعفەر هەژارانی زۆر خۆش دەویست، خزمەتی زۆری دەكردن، بەدەستی خۆی نانو ئاوی بۆ دادەنانو لەلایان دادەنیشتو قسەو گوفتوگۆی لەگەڵدا دەكردن، پێغەمبەریش ناوی نابوو: (باوكی هەژاران!). لەكاتی موئاخاتدا (لەكاتی برایەتی بەستندا) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جەعفەری كرد بە برای موعازی كوڕی جەبەل، نەجاشی پادشای حەبەشەو تاقمەكەی لەسەر دەستی جەعفەردا موسوڵمان بوون، كاتێ جەعفەر هاتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ناوچەوانی ماچ كرد. ئیمامی جەعفەر دەوری چل ساڵ ژیاوە، لەساڵی هەشتی كۆچیدا، لە غەزای مۆتەدا شەهید بوو. {بڕوانە: تاج/٣، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٣٣٥٢ هەتا ژمارە: ٣٣٥٦ + تاج/٤، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ٤٦٤٠، ٤٦٤١، ٤٦٤٢. چ/٤}.

عەقیل درەنگ موسوڵمان بوو، لەساڵی ئازادكردنی مەككەدا ئیسلام بوو، چەند فەرموودەیەكی گێڕاوەتەوە، لە بوخاریدا فەرموودەی نییە، زانایەكی رەگەز ناس بوو، لە مزگەوتەكەی مەدینەدا، قاڵیچەیەكی دادەخستو لەپاش نوێژ لەسەری دادەنیشتو خەڵك لە دەوری كۆمەڵ دەبوون، فێری زانستی رەگەز ناسی دەكردن، پیاوێكی وەڵام ئامادە بوو، وەڵامەكانی دەمكوتكەر بوو، لە عەلی برای جیاوە بوو، لەگەڵ موعاوییەی نەیاری عەلی بوو، دەڵێن: رۆژێ، موعاوییە دەڵێ: (عەقیل دەزانێ من بۆی لە عەلی برای باشترم بۆی، بۆیە لەگەڵ ئێمەدایەو وازی لە عەلی برای هێناوە!). عەقیل (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: (قسەی راستت دەوێ، براكەم بۆ ئایینم، بۆ من لەتۆ باشترە، وە تۆ بۆمن بۆ جیهانم لەو باشتری بۆم، وە من ئێستا دوای دنیا كەوتووم، بەڵام لەخوا داوادەكەم كە ئاخرم بەخێر بگێڕێ!).

عەقیل (ڕەزای خودای لێ بێ) لەسەرەتای جێنشینی یەزیدی كوڕی موعاوییەوە مردووە.

ئیبنو عەبدولبەر، لە ئیستیعابا، دەفەرموێ: خۆم فەرموودەیەكم گێڕاوەتەوە:

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەبو یەزید! من لەبەر ئەم دوو هۆیە، دووجار تۆم خۆش دەوێ، جارێ لەبەرئەوە کەتۆ خزممی، جارێکیش لەبەرئەوە کە دەزانم ئەبو تالیبی مامەم تۆی زۆر خۆش دەویست (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

ئەمیرولموئمینین ئیمامی عەلی، هەق ئامۆزای پێغەمبەرە، زاوای پێغەمبەرە، مێردی فاتیمەی کچیەتی، باوکی حەسەن‌و حوسەینە، بەپێی پەیمانی برایەتی (المؤاخاة) عەلی بوو بەبرای پێغەمبەر، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (تۆ لە دنیاو قیامەتدا برای منی!). یەکێ بوو لەو دە کەسەی کە پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی پێیان دابوو، خەلیفەی چوارەم بوو، پیاوێکی زاهیدی دنیا نەویستی خوا پەرست بوو، هەتا بڵێی زاناو داناو هەقانی بوو، هەتا بڵێی رۆشنبیرو رەوانبێژ بوو، کتێبی نەهجولبەلاغەکەی بەڵگەی ئەم گوتەیەیە، لەهەموو جەنگ‌و غەزاکاندا، لە خزمەت پێغەمبەردا بوو، جگە لە غەزای تەبووك، زۆر بە منداڵی موسوڵمان بووە، لە ماڵی پێغەمبەردا پەروەردە بووە، لە پێغەمبەرەوە (٥٨٦) فەرموودەی گێڕاوەتەوە، بیستیان پەسەندی شەیخەینە، بوخاریش بەبێ موسلیم نۆی تریانی لە صەحیحی بوخاریدا گێڕاوەتەوە، موسلیمیش بەبێ بوخاری پازدەی تریانی گێڕاوەتەوە کەواتە (٢٩) فەرموودەی لە بوخاریدا هەیە، وە (٣٥) فەرموودەی لە موسلیمدا هەیە، سەرجەمی فەرموودەکانی لە صەحیحەیندا، دەکاتە: ٢٠ + ٩ + ١٥ = ٤٤ چل‌و چوار فەرموودە. پێنج ساڵ جێنشینی (خەلافەتی) کردووە، بە شەهیدی مردووە، تەمەنی شەست‌و سێ ساڵ بووە، لە شەوی یەکشەممە، لە نۆزدەی رەمەزانی ساڵی چلی کۆچیدا، لە کووفە وەفاتی کردووە، پیاوێکی گەنم رەنگ بوو، سەرو ریشی پاك سپی بوو بوون، چوار شانەیەکی تێکسمڕاو بوو، دەتوت: مانگی چواردەیە، تەنیا خۆی لەناو یارانی پێغەمبەردا، ناوی عەلی کوڕی ئەبو طالیبە، بەڵام لەناو فەرموودە گێڕەوەکاندا هەشت کەسی تر بەم ناوە هەیە. {تاج/٣، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٣٢٨٨ هەتا ژمارە : ٣٣١١. چاپی چوارەم + تجرید/٢، ژمارە: ٧٦١ + مختصر صحیح مسلم ژمارە: ٣٦ لە پێشەوە رابورد}..

## ٥٥٠) راكردنو رۆیشتنی ناو تەوافی بەیت. (٣٠٣٧ - ٣٠٤٩)
## باب: الرملُ فِي الطَّوافِ وَالسَّعْي

٦٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ إِذَا طَافَ فِي الْحَجِّ وَالْعُمْرَةِ أَوَّلَ مَا يَقْدَمُ، فَإِنَّهُ يَسْعَى ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ بِالْبَيْتِ، ثُمَّ يَمْشِي أَرْبَعَةً، ثُمَّ يُصَلِّي سَجْدَتَيْنِ، ثُمَّ يَطُوفُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠٣٨ = ٣٠٢٥ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٧٧ = ١٦١٦، ١٦٠٣، ١٦٠٤، ١٦١٧، ١٦٤٤، + أبو داود. حج: ١٨٩٣. نسائي. حج: ٢٩٤١ تحفة الأشراف: ٨٤٥٣}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، کاتێ دەچوو بۆ حەج یا بۆ عەمرە، کاتێ دەگەیشتە ناو مەککە، لەپێشا تەوافی قودومی لەسەر ئەم شێوەیە ئەنجام دەدا: سێجار بەهەڕاکردن هەڵ دەسووڕا بە دەوری بەیتداو، چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی، هەڵ دەسووڕا بە دەوریدا، ئینجا دوو ركات نوێژی سوننەتی تەوافی دەكرد. ئینجا تەوافی نێوانی سەفاو مەڕوەشی دەكرد). {تاج/٢، لاپەڕە: ١٩٧، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ١٥٤٢، ج/٤}.

٦٩٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَمَلَ مِنَ الْحَجَرِ الأَسْوَدِ، حَتَّى انْتَهَى إِلَيْهِ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ. {الحديث: ٣٠٤٢ = ٣٠٢٩ ف.م. ترمذي. حج: ٨٥٧. نسائي. حج: ٢٩٤٤. تحفة الأشراف: ٢٥٩٤}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەچاوی خۆم لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەرم بینی، لەكاتی تەوافی بەیتا، لە حەجەرو ئەسوەدەوە بۆ حەجەرول ئەسوەد سێجار بە هەڕاكردنو نەرمە غار هەڵسووڕا بەدەوری بەیتاو، چوار جاریش بە ڕۆیشتنی ئاسایی هەڵ دەسووڕا بەدەوریدا).

٦٩٥- عَنْ أَبِي الطُّفَيْلِ قَالَ: قُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَرَأَيْتَ هَذَا الرَّمَلَ بِالْبَيْتِ ثَلاَثَةَ أَطْوَافٍ وَمَشْيَ أَرْبَعَةِ أَطْوَافٍ أَسُنَّةٌ هُوَ؟ فَإِنَّ قَوْمَكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ سُنَّةٌ، قَالَ: فَقَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا قَوْلُكَ صَدَقُوا وَكَذَبُوا؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدِمَ مَكَّةَ فَقَالَ الْمُشْرِكُونَ: إِنَّ مُحَمَّدًا وَأَصْحَابَهُ لاَ يَسْتَطِيعُونَ أَنْ يَطُوفُوا بِالْبَيْتِ مِنَ الْهُزَالِ، وَكَانُوا يَحْسُدُونَهُ، قَالَ: فَأَمَرَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ

يَرْمُلُوا ثَلاَثًا وَيَمْشُوا أَرْبَعًا، قَالَ: قُلْتُ لَهُ: أَخْبِرْنِى عَنِ الطَّوَافِ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ رَاكِبًا، أَسُنَّةٌ هُوَ؟ فَإِنَّ قَوْمَكَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُ سُنَّةٌ، فَقَالَ: صَدَقُوا وَكَذَبُوا، قَالَ: قُلْتُ: وَمَا قَوْلُكَ صَدَقُوا وَكَذَبُوا؟ قَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَثُرَ عَلَيْهِ النَّاسُ، يَقُولُونَ: هَذَا مُحَمَّدٌ، هَذَا مُحَمَّدٌ، حَتَّى خَرَجَ الْعَوَاتِقُ مِنَ الْبُيُوتِ، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لاَ يُضْرَبُ النَّاسُ بَيْنَ يَدَيْهِ، فَلَمَّا كَثُرَ عَلَيْهِ رَكِبَ، وَالْمَشْىُ وَالسَّعْىُ أَفْضَلُ.
{الحديث: ٣٠٤٤ = ٣٠٣١ ف.م}:

ئەبو طوفەیل فەرمووی: گوتم بە ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەرێ پێم نافەرمووی ئەم سێجار هەڕاکردن‌و چوار جار ڕۆیشتن بە ڕۆیشتنی ئاساییە، بەدەوری بەیتا، لەکاتی تەوافا، ئایا ئەمە سوننەتە یانا؟

بەقسەی خزمانی تۆبێ ئەوە سوننەتی پێغەمبەرەو پێغەمبەر وایکردووە، فەرمووی: قسەکەیان نیوەی ڕاستەو نیوەی درۆیە؟ فەرمووی: ئەوەی کە دەڵێن: پێغەمبەر وایکردووە، ئەوە ڕاستە، بەلاّم ئەوەی کە دەڵێن: ئەمە سوننەتێکی دامەزراوە لەکاتی کردنی هەموو تەوافێکا، ئەوە درۆیە!! بەپێی ئەم ڕوونکردنەوەیە: ساڵی عەمرەتولقەزا، کە پێغەمبەر تەشریفی هات بۆ عەمرە، کە گەیشتە مەککە، هاوبەش پەیداکەرەکان لە حەسوودیدا، گوتیان: موحەممەدو هاوەڵەکانی، لەرزوتای مەدینە لەڕو لاوازی کردوون، ناتوانن تەافی بەیت ئەنجام بدەن، جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) تەنیا ئەو ساڵە فەرمانی کرد بە هاوڕێیانی، کە لەسێ سەری پێشەوەی تەوافدا، بە لۆقەو نەرمە غار بڕۆن‌و چالاکی‌و هێزی خۆیان نیشانی دوژمن بدەن، تا چاوترسێنیان بکەن‌و چوار سەرەکەی تری تەوافیش بە ڕۆیشتنی ئاسایی تەواو بکەن، دەی کە ئێستا ئەو مەبەستە نەماوە، پێویست بە هەڕاکردن ناکا لەسێ سەری یەکەما، چونکە هۆکەی نەماوە، کە پێشاندانی هێزە بۆ چاو ترسێنی دوژمن، ئەنجا عەرزیم کرد: خزمانی تۆ دەفەرموون، کە تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە بەسواری سوننەتە، تۆ بۆ ئەمە دەفەرمووی چی، ئایا شتی وا سوننەتە یانا؟ فەرمووی: ئەم قسەشیان هەندێکی ڕاستەو هەندێکی درۆیە، عەرزیم کرد: چۆن چۆن؟ فەرمووی: لە حەجی

مالاواییـدا، پێغەمبـەر (درووودی خـودای لەسـەر بـێ) لـەکاتی سـەعی نێـوانی سـەفاو مـەڕوەدا، خەڵکێکی زۆر کەڵەکەیان لێکرد، دەیانگوت: ئەمە موحەممەدە، ئەمـە موحەممـەدە، تەنانەت گەورە کچەکانیش لەماڵ دەرچوو بوونو هاتبوون، پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەر بێو سەرو ماڵو منـاڵو هەسـتو نەست، گشتی بـەقوربانی گـەردی بەرپێی دێنیکەرانی ئاستانەی گۆڕی پیرۆزی بـێ) عـادەتی وا نـەبوو، کـە وەك میرو ئاغا، بە لێدانو بە پاڵ، دڕ بە خەڵك بدرێ لەبەردەمیەوەو ڕێگەی بۆ چۆڵ بکرێ، جا لە ناچاریدا کە خەڵکەکە ئاوا کەڵەکەیان لێکـرد، سـواری وڵاخەکـەی بـوو، هـەتا خەڵکەکە چاویان لە کردارەکانی بێو بیانکەن بەسەر مەشق، کەواتـە: ئـەو قسـەیان راستە، کە دەڵێن: پێغەمبەر بەسواری وڵاخ سەعی نێوانی سـەفاو مـەڕوەی کـردووە، بەڵام ئەوەی کە دەڵێن: ئەمە سوننەتە ئەوە وانییە، چونکە پێغەمبەر، کە لەسەعی نێوانی سەفاو مەڕوەدا سواری وڵاخ بوو، بۆ ئەوە نەبوو کە ئەوە سوننەتە، بـەڵکوو لەبەر ناچاری بوو، وە لەبەر ئەو عوزرە بوو کە بەیان کرا، کەواتە: ڕۆیشتن بـەپێو هەڕاکردن بەپێ لە نێوانی سەفاو مەڕوەدا سوننەتە، نەوەك سوار بوونی وڵاخ، وەك ئەو خەڵکە بە هەڵە وا دەڵێن). {بڕوانە ژمارە: ٣٠٦٤ لە صەحیحی موسلیم} .

**ڕوونکردنەوە:**

١. نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەمـەی کـە ئیبنـو عـەبباس دەفـەرموێ ڕەمـل (هـەڕاکردن) لەسـێ سـەری پێشـەوەی تـەوافا سـوننەت نییـە، ئەمـە مەزهـەبی خۆیەتی، بەڵام هەموو زاناکان، لە سەحابەو تـابیعینو دوای ئـەوان، رایـان وایـە کە ڕەمل لەم سێ تەوافەدا سوننەتە، بەڵام ئەوەی کـە دەفـەرموێ تـەواف بـەپێ سوننەتە، نەوەك بەسواری، ئەمە بەکۆی دەنگ وایەو قسەکەی ئیبنـو عـەبباس لەم مەسەلەیەدا تەواوە، چونکە زاناکان دەفەرموون: تەواف بەسـواری دروسـتە، بەڵام بەپێ ئەنجام بدرێ باشترە، مەگەر لەبەر ناچاری.

٢. ئـەبو طـوفـەیل، نـاوی عـامیری کـوڕی واثیلـەی لـەیثـیـە، سـاڵی شـەڕی ئوحـود لـەدایك بـووە زیـاتر لەسـەد سـاڵ ژیـاوە، دواتـرین کـەس بـووە لـە هـاوەڵانی پێغەمبەر کە مردووە، هەواداری ئیمامی عەلی بوو، فریای هەشت ساڵ لە ژیـانی

پێغەمبەر کەوتووە، واتە: کە پێغەمبەر مردووە ئەو هەشت ساڵان بووە، لەهەموو نەبەردەکانا لەگەڵ ئیمامی عەلیدا بووە، لە کووفە دادەنیشت، کە ئیمامی عەلی شەهید بوو لە مەککە نیشتەجێ بوو، لەوێش مرد، گەلێ جار دەیفەرموو: لەوانەی کە پێغەمبەریان دیوە، بەس من ماوم لەسەر رووی زەوی). پیاوێکی هۆشمەندو شاعیرێکی بەهرەمەند بوو، (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ).

## ٥٥١) ماچکردنی بەردە رەشەکە لەکاتی تەواف دا. (٣٠٥٦ - ٣٠٦١)

## باب: استلام الركنين اليمانِيَيْن في الطَّواف

٦٩٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ سَرْجِسَ قَالَ: رَأَيْتُ الأَصْلَعَ  يُقَبِّلُ الْحجَرَالأسود ، وَيَقُولُ: وَاللَّهِ إِنِّى لأُقَبِّلُكَ وَإِنِّى أَعْلَمُ أَنَّكَ حَجَرٌ، وَأَنَّكَ لاَ تَضُرُّ وَلاَ تَنْفَعُ، وَلَوْلاَ أَنِّى رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَبَّلَكَ مَا قَبَّلْتُكَ. {الحديث: ٣٠٥٦ = ٣٠٤٣ ف.م، تجريد/٢، رقم: ٧٦٧ = ١٥٩٧، ١٦٠٥، ١٦١٠}:

عەبدوڵڵای کوڕی سەرجیس فەرمووی: ئیمامی عومەرم بینی، حەجەرولئەسوەدی ماچ دەکردو دەیفەرموو: بەخودا من کە ماچت دەکەم، لەهەمان کاتا دەزانم کە تۆ بەردێکیت نە زیان دەبەخشیتو نە بەهرەو سوود، بەڵام ئەوەندە هەیە من خۆم بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە کە تۆی ماچ کردووە، بۆیە منیش ماچت دەکەم ئەگینا ماچم نەدەکردیت). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ١٥٤٧ + تجرید/٢، ژمارە: ٧٧٥}.

## ٥٥٢) دەستهێنان بە حەجەرولئەسوەدو بەهەردوو گۆشە یەمانییەکانو بە مولتەزەمدا سوننەتە. (٣٠٥٠ – ٣٠٥٥)

## باب: استلام الركنين اليمانِيَيْن فِي الطَّوف

٦٩٧- عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: مَا تَرَكْتُ اسْتِلاَمَ هَذَيْنِ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِىَ وَالْحَجَرَ مُذْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَلِمُهُمَا فِى شِدَّةٍ وَلاَ رَخَاءٍ. {الحديث: ٣٠٥٣ = ٣٠٣٩ ف.م. تجريد/٢، رقم: ٧٧٣ = ١٦٠٦، ٦١١١. نسائى. حج: ٢٩٥٢، تحفة/٢/٨١٥}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەوکاتەوە کە بەچاوی خۆم پێغەمبەرم دیوە، لەکاتی تەوافی بەیتدا، دەستی هێناوە بەم دوو گۆشە یەمانییەی بەیتاو بە بەردە ڕەشەکەداو ماچی کردوون، لەوکاتەوە منیش لەکاتی تەوافی بەیتا، وازم لە دەست پیاهێنانو ماچکردنی ئەم دوو گۆشە یەمانییەو حەجەرولئەسوەد نەهێناوە، لەکاتی دەور چۆڵیو دەور قەرەباڵغیدا، ئەمانەم ئەنجامداوە). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٩٥}.

٦٩٨- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: لَمْ أَرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَلِمُ غَيْرَ الرُّكْنَيْنِ الْيَمَانِيَيْنِ. {الحديث: ٣٠٥٥ = ٣٠٤١ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: نەمدیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بێجگە لەدوو گۆشە یەمانییەکانی بەیت، هیچ گۆشەیەکی تری ماچ بکات).

**ڕوونکردنەوە:**

بەیت، یاماڵی کەعبە چوار گۆشەی هەیە، دوانیان پێیان دەگوترێ: دوو گۆشە یەمانییەکان کە گۆشەی حەجەرولئەسوەدو گۆشەی یەمانییە، کە لەڕووی یەمەنەوەیە، دوو گۆشەکەی تریش پێیان دەگوترێ: دوو گۆشە شامییەکان، کە بریتین لە گۆشەی شامیو گۆشەی عێراقی. مولتەزەمیش ئەو شوێنەیە لە دیواری کەعبە، کە تەوافکار دەستی پیادەهێنێو باوەشی پیادەکاو ماچی دەکا، کە دەکەوێتە نێوانی حەجەرولئەسوەدو دەرگاکەی کەعبەوە، پێشی دەگوترێ حەطیم، گۆشەی شامی بۆیە پێی دەگوترێ شامی، چونکە لە جیهەتی شامەوەیە، گۆشەی عێراقیش لەڕووی عێراقەوەیە.

## ٥٥٣) تەواف بەسواری. (٣٠٦٢ - ٣٠٦٧)

## باب: الطَّوافُ عَلى الرَّحلَة

٦٩٩- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: طَافَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْبَيْتِ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ عَلَى رَاحِلَتِهِ يَسْتَلِمُ الْحَجَرَ بِمِحْجَنِهِ لأَنْ يَرَاهُ النَّاسُ وَلِيُشْرِفَ وَلِيَسْأَلُوهُ، فَإِنَّ النَّاسَ غَشُوهُ. {الحديث: ٣٠٦٣ = ٣٠٤٩ فم}:

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەحەجی ماڵاواییدا،** بەسواری وشترەکەی خۆی، تەوافی بەیتی دەکرد، وە بەگۆچانەکەی دەستی دەهێنا بە گۆشەی حەجەرولئەسوەددا، بۆئەوەی حاجیەکان بیبینن‌و بیکەن بەسەر مەشق بۆخۆیان‌و چاویان لێی بێ، هەتا پرسیاری لێ بکەن، چونکە خەڵکەکە گەمارۆیان دابوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ١٥٤٨} :

## ٥٥٤) تەواف بەسواری لەبەر مەهانەی ڕەوا
## بابٌ: الطَّوَافُ راكِباً لِعُذْرٍ

٧٠٠- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: شَكَوْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنِّى أَشْتَكِى، فَقَالَ: « طُوفِى مِنْ وَرَاءِ النَّاسِ وَأَنْتِ رَاكِبَةٌ ». قَالَتْ: فَطُفْتُ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَئِذٍ يُصَلِّى إِلَى جَنْبِ الْبَيْتِ، وَهُوَ يَقْرَأُ بِ (الطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ ). {الحديث: ٣٠٦٧ = ٣٠٥٣. أبو داود. حج: ١٨٨٢. نسائى. حج: ٢٩٢٧ + تجريد/١، رقم: ٢٨٤ = ٤٦٤، ١٦١٩، ١٦٢٦، ١٦٣٣، ٤٨٥٣} :

ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) فەرمووی: لە حەجی ماڵاواییدا، سکاڵای حاڵم لەلای حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد: کە نەخۆشم، ناتوانم بەپێ تەواف بکەم؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (لەپاش خەڵکەکەوە بەسواری وشترەکەت تەواف بکە)، جامنیش وامکرد، لەوکاتەدا کە من تەوافم دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژی نوێژی بەیانی بۆ مەردومەکە دەکرد، لە تەنیشتی کەعبەوە، سوورەتی (وَالطُّورِ وَكِتَابٍ مَسْطُورٍ) لەو نوێژەدا دەخوێند. {تاج/٢، زنجیرە: ٩٤، ژمارە: ١٥٤٢} .

## ٥٥٥) تەوافی نێوانی سەفاو مەڕوەو فەرمایشتی خودای گەورە: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّه} {٣٠٦٨ - ٣٠٧٣}

## باب: الطواف بين الصَّفَا وَالمَرْوَة وقولُهُ تعالى: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّه}

٧٠١- عَنْ عُرْوَةَ قَالَ: قُلْتُ لِعَائِشَةَ (رضي الله عنها): مَا أَرَى عَلَيَّ جُنَاحًا أَنْ لاَ أَتطَوَّفَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، قَالَتْ: لِمَ؟ قُلْتُ: لأَنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَقُولُ: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ) الآيَةَ. فَقَالَتْ: لَوْ كَانَ كَمَا تَقُولُ لَكَانَ: ((فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَنْ لاَ يَطَّوَّفَ بِهِمَا)). إِنَّمَا أُنْزِلَ هَذَا فِي أُنَاسٍ مِنَ الأَنْصَارِ كَانُوا إِذَا أَهَلُّوا، أَهَلُّوا لِمَنَاةَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، فَلاَ يَحِلُّ لَهُمْ أَنْ يَطَّوَّفُوا بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ، فَلَمَّا قَدِمُوا مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) لِلْحَجِّ ذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ، فَلَعَمْرِي مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ مَنْ لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. (وفي رواية): مَا أَتَمَّ اللَّهُ حَجَّ امرىء ولا عمرته لَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠٦٩، ٣٠٦٨ = ٣٠٥٥، ٣٠٥٤ فم = ف.م = فتح الملهم. تجريد/٢، رقم: ٧٨٤ = ١٦٤٣، ١٧٩٠، ٤٤٩٥، ٤٨٦١}:

عوروە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بە عائیشەم گوت (ڕەزای خودای لێ بێ): بەخودا وادەزانم ئەگەر من، یا هەرکەسێ، لەکاتی حەجو عەمرەدا، نەیشگەڕێ لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا، گوناهی ناگاو حەجو عەمرەکەی تەواوە؟ فەرمووی: بۆ؟ گوتم: چونکە خودای گەورە دەفەرموێ:

{إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا}:

واتە: صەفاو مەڕوە لە دروشمەکانی خودان، جا هەرکەسێ حەجی کرد، یا عەمرەی کرد، گوناهی لەسەر نییە، کە بگەڕێ لەنێوانی ئەم دووەدا).

عائیشەیش فەرمووی لە وەڵاما: هەرکەسێ لەنێوانی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆ نەکاو، سەعیی بەینی صەفاو مەڕوە حەوت جار نەکا، ئەوە خودا نە حەجی تەواو دەکاو نە عەمرەی، چونکە ئەگەر وەك تۆ دەڵێیت ئاوابێ، دەبێ ئایەتەکە وابێ: {فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن لاَيَطَّوَّفَ بِهِمَا}. واتە: (گوناهی ناگا کە لە ناوەند یانا هاتوچۆ نەکا).

دەزانی بۆچی ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیەی کە هەیە، هاتە خوارەوە: چونکە لەپێشا یاریدەدەران (ئەنصار) لەسەردەمی نەزانیدا، لەپێش ئیسلام بوونیاندا، جاران ئیحرامی حەجیان بۆ بتێ دادەبەست کە ناوی مەنات بوو، کە موسوڵمانان ناویان نا: مەناتی طاغیة: واتە: مەناتی سەرکەش، چونکە خەڵکێکی ئێجگار زۆری گومڕا کردبوو، ئەم بوتە لەلای موشەللەلا بوو، کەناوی شوێنێکە وا لە نزیکی قەدیدەوە، جا ئەوانەی کە ئیحرامی حەجیان بۆ ئەم بتە سەرکەشە دەبەست، ئیتر دووره پارێزیان لە تەوافی صەفاو مەڕوە دەگرت، هەتا توخنی بتەکانی خەڵکی مەککە نەکەون، کە ناویان ئیسافو نائیلە بوو، ئیساف لەسەر تەپۆڵکەی صەفا بوو، وە نائیلە لەسەر تەپۆڵکەی مەڕوە بوو، جا کاتێ یاریدەدەران ئیسلام بوون، لەم بارەیەوە پرسیاریان لە پێغەمبەر کرد، ئەوکاتەی کە لەخزمەتیدا لە مەدینەوە هاتن بۆ حەج، ئەم باسو خواسەیان عەرزی کرد، کە ئێمە جاران حاڵمان وابوو، ئێستا چی بکەین؟؟ ئیتر بەم بۆنەیەوە، خودای دوره، یەزدانی مەزن، ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ فَمَنْ حَجَّ الْبَيْتَ أَوِ اعْتَمَرَ فَلاَ جُنَاحَ عَلَيْهِ أَن يَطَّوَّفَ بِهِمَا وَمَن تَطَوَّعَ خَيْرًا فَإِنَّ اللّهَ شَاكِرٌ عَلِيمٌ — سورة البقرة/ ١٥٨}.

عائیشە فەرمووی: وەکی تریش ئەوەتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەکردارو گوتار، تەوافو هەڵسووڕانی نێوانی صەفاو مەڕوەی کردووە بە دەستوور، دەی بەگیانی خۆم! خودا حەجی ئەوکەسە تەواو ناکا، کە تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوە ئەنجام نەدا). لە فەرموودەی ژمارە (٣٠٦٨)دا ئەم رستەیەی دواوە ئاوایە: خودا حەجو عەمرەی ئەوکەسە تەواو ناکا، کە تەوافی بەینی صەفاو مەڕوە نەکا).

**روونکردنەوە:**

عوروەی کوڕی زوبەیر، کچەزای حەزرەتی ئەبوبەکری صەدیقە، فەقێی عائیشەی پووری بووە، زانایەکی گەورەیە، هەمیشە لەگەڵ کۆمەڵێ زانای تردا، ئامادەی کۆڕی زانستی عائیشەی پووری دەبوون، کە عائیشە لەماڵی خۆیدا، لە مەدینە دەیبەست، بۆ پەخشی زانستو راگەیاندنی فەرموودەکانی پێغەمبەرو

تەفسیری ئایەتەکانی قورئان، عوروە یەکێکە لە پێشەوا هەرە ناوداره رێزداره مەزنەکانی پەیڕەوان، کە پێیان دەگوترێ: (تابعین: چینی دووەمی موسوڵمانان) یەکێکە لە حەوت مەلا گەورەکانی جیهانی ئیسلامی، کە لەزاراوی شەرعدا ناودارو ناسراون بە (فوقەهای سەبعە = حەوت شەریعەت زانەکان) کە ئەم زاتانەن: ١- عوروە ٢- سەعیدی کوڕی موسەییب ٣- عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە ٤- قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق ٥- سلێمانی کوڕی یەسار ٦- خاریجەی کوڕی زەیدی کوڕی ثابیت ٧- سالمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر.

عوروە، دایکی ناوی ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیقە، کە خوشکی باوکیی عائیشەیە، خاوەنی ئەم شانازییانەیە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوایەتی، مێردی پووریەتی، ئەبوبەکر باپیریەتی، زوبەیر باوکیەتی، ئەسماء دایکیەتی، عائیشە پوریەتی خوشکی دایکیەتی، ساڵی بیستی کۆچی لەدایکبووە، لە نەوەدو چوار مردووە، کۆمەڵەی فەرمووده زانەکان فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە. واتە: جێگەی متمانەی ئەوانە، کەواتە: لە پیاوانی صەحیحی بوخاریو موسلیمە، لەناو پەیرەوان (تابعین)دا، عوروەی کوڕی زوبەیر ناوی تریان تیادا نییە، بۆ زێدە بەهرەو شارەزا بوون بڕوانە: {تاج/٣، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٣١٢، ٣٣١٩ — مەزناهی زوبەیری کوڕی عەوام + ژمارە: ٣ لە تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم + ژمارە: ٣٤٩ = ٦٠٢ + ژمارە: ٧٥ تەجرید + تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، چ/٤، ژیاننامەی خاتوو عائیشە + ریاچ/١، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + تاج/١٠، زنجیرە: ٩٧ ژمارە: ٥٥٣٩ چ/٤}.

## ٥٥٦) تەوافی سەفاو مەڕوە حەوت سەری بەیەك تەواف دادەنرێ (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)

## باب: الطَّوَافُ بالصَّفَا والمَرْوَةِ سَبْعاً وَاحداً

٧٠٢- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: لَمْ يَطُفِ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَلاَ أَصْحَابُهُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ إلاَّ طَوَافًا وَاحِدًا. {الحديث: ٢٩٣٤ = ٢٩١٨ ف.م. أبو داود. حج: ١٨٩٥. نسائي. حج: ٢٩٨٦ تحفة الأشراف: ٢٨٠٢}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: پێغەمبەرو ئەو هاوەڵانەی کە لە حەجەکەیانا قارین بوون، یەك تەوافیان ئەنجامدا، بۆ سەعی نێوانی صەفاو مەڕوە، هەم لەجیاتی عەمرەکەیانو هەم لەجیاتی حەجەکەیان، بەڵام موتەمەتتیعەکان، دوو تەوافو دوو سەعیان ئەنجامدا، تەوافو سەعێ بۆ عەمرەکەیانو تەوافو سەعێ بۆ حەجەکەیان.

## ٥٥٧) چی پێویستە لەسەر کەسێ لە ئیحرامی حەجدا بێ، کاتێ دەگاتە ناو مەککە، لەبارەی تەوافی بەیتو سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەوە (٢٩٨٧ - ٢٩٩٠)

## باب: مَايلْزَمُ مَنْ أحْرَمَ بِالحَجِّ ثُمَّ قَدِمَ مَكَّةَ مِنَ الطَّوَافِ وَالسَّعْيِ

٧٠٣- عَنْ وَبَرَةَ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا عِنْدَ ابْنِ عُمَرَ فَجَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: أَيَصْلُحُ لِي أَنْ أَطُوفَ بِالْبَيْتِ قَبْلَ أَنْ آتِيَ الْمَوْقِفَ، فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: فَإِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: لاَ تَطُفْ بِالْبَيْتِ حَتَّى تَأْتِيَ الْمَوْقِفَ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: فَقَدْ حَجَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَطَافَ بِالْبَيْتِ قَبْلَ أَنْ يَأْتِيَ الْمَوْقِفَ. فَبِقَوْلِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَحَقُّ أَنْ تَأْخُذَ أَوْ بِقَوْلِ ابْنِ عَبَّاسٍ إِنْ كُنْتَ صَادِقًا؟. وفي رواية قال: رَأَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَحْرَمَ بِالْحَجِّ وَطَافَ بِالْبَيْتِ وَسَعَى بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ. {الحديث: ٢٩٨٧ = ٢٩٧٣ فم}:

وەبەرە فەرموی: لەلای ئیبنو عومەر دانیشتبووم، پیاوێ هات بۆلای، پێی گوت: من خەریکی کردنی حەجمو هاتوومەتە ناو مەککەوە، ئایا دروستە بۆم کە تەوافی بەیت بکەم، پێش ئەوە کە بچم بۆ وەستان لەکێوی عەرەفە، کە بەم تەوافە دەگوترێ تەوافولقودوم؟ ئیبنو عومەر، لە وەڵامیا فەرموی: بەڵێ. پیاوەکە گوتی: ئەی بۆچی هەمان پرسیارم لە ئیبنو عەبباس کرد، کەچی ئەو دەفەرموێ: هەتا وەستان لەکێوی عەرەفە تەواو نەکەی تەوافی بەیت مەکە؟ ئیبنو عومەر فەرموی: (پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵاواییدا، کە گەیشتە ناو مەککە تەوافی قودومی ئەنجامدا، پێش ئەوە کەبچێ بۆ ئێستگای ڕاوەستان لە چیای

عەرەفە، دەی ئەگەر تۆ راستت دەوێ کامیان حەقترە: بەقسەی پێغەمبەر بکەی، یا بەقسەی ئیبنو عەبباس؟

لە گێڕانەوەیەکا، کە ژمارەکەی لە صەحیحی موسلیما (٢٩٨٨): بەچاوی خۆمان پێغەمبەرمان بینی، ئیحرامی حەجی دابەستو تەوافول قودومی کرد، سەعی نێوانی صەفاو مەڕوەی ئەنجامدا، دەی رێبازی خوداو رێبازی پێغەمبەری خودا شایانترە کە تۆ پەیڕەوی بکەی، هەتا رێبازی ئەمو ئەو، ئەگەر تۆ راست دەکەی).

٧٠٤- عَنْ عَمْرِو بْنِ دِينَارٍ قَالَ: سَأَلْنَا ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) عَنْ رَجُلٍ قَدِمَ بِعُمْرَةٍ فَطَافَ بِالْبَيْتِ وَلَمْ يَطُفْ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ أَيَأْتِى امْرَأَتَهُ؟ فَقَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَطَافَ بِالْبَيْتِ سَبْعًا وَصَلَّى خَلْفَ الْمَقَامِ رَكْعَتَيْنِ وَبَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ سَبْعًا وَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ. {الحديث: ٢٩٨٩ = ٢٩٧٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٢٥٠ = ٣٩٥، ١٦٢٣، ١٦٢٧، ١٦٤٥، ١٦٤٧، ١٧٩٣. نسائي. حج: ٢٩٣٠، ٢٩٦٠. ابن ماجة. مناسك: ٢٩٥٩ تحفة الأشراف: ٧٣٥٢}:

عەمری کوڕی دینار (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە ئیبنو عومەرمان پرسی: پیاوێ لەکاتی کردنی عەمرەدا، تەوافی بەیت بکا، بەڵام هاموشۆ (سەعی)ی نێوانی صەفاو مەڕوە نەکا، ئایا دروستە کە لەگەڵ ژنەکەی دروست ببێ، یا بچێتە لای حەڵاڵو هاوسەری خۆی؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە تەشریفی برد بۆ مەککە حەوتجار بەدەوری بەیتدا هەڵسووڕا، وە لەپشتی مەقامی ئیبراهیمەوە دوو رکات نوێژی تەوافی کرد، وە حەوت جاریش لە ناوەندی صەفاو مەڕوەدا هاتوچۆی کرد، ئەنجا ئیبنو عومەر بۆئەوەی کە بەباشی بزانین کە ئەمە یاسای رەسای ئایینەو پەیڕەوی کردنی مەبەستە، ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ}. واتە: لە راستیدا، پێغەمبەری خودا، رابەرو سەرمەشقێکی هەرە جوانە بۆ ئێوە، وە شایانی ئەوەیە کە ئێوە چاوی لێ بکەنو، هەنگاو بە هەنگاوو بست بەبست شوێنی بکەون). {تاج/٢، رقم: ١٥٥٥}.

## ٥٥٨) چوونه ناو ماڵی کابەو نوێژکردنو نزاکردن لەناویدا.
## باب: في دُخُول الكَعْبَة وَالصَّلاة فِيهَا وَالدُّعَاء

٧٠٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ الْفَتْحِ فَنَزَلَ بِفِنَاءِ الْكَعْبَةِ، وَأَرْسَلَ إِلَى عُثْمَانَ بْنِ طَلْحَةَ فَجَاءَ بِالْمِفْتَحِ فَفَتَحَ الْبَابَ، قَالَ: ثُمَّ دَخَلَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) وَبِلاَلٌ وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ وَعُثْمَانُ بْنُ طَلْحَةَ، وَأَمَرَ بِالْبَابِ فَأُغْلِقَ، فَلَبِثُوا فِيهِ مَلِيًّا، ثُمَّ فَتَحَ الْبَابَ، قَالَ عَبْدُ اللَّهِ: فَبَادَرْتُ النَّاسَ فَتَلَقَّيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) خَارِجًا، وَبِلاَلٌ عَلَى إِثْرِهِ، فَقُلْتُ لِبِلاَلٍ: هَلْ صَلَّى فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: أَيْنَ؟ قَالَ: بَيْنَ الْعَمُودَيْنِ تِلْقَاءَ وَجْهِهِ، قَالَ: وَنَسِيتُ أَنْ أَسْأَلَهُ كَمْ صَلَّى {الحديث: ٣٢١٨ = ٣٢٠٧ فم. تجريد/٢، رقم: ٢٨٨ = ٤٦٨، ٣٩٧، ٥٠٤، ٥٠٥، ٥٠٦، ١١٦٧، ١٥٩٨، ١٥٩٩، ٢٩٨٨، ٤٢٨٩، ٤٤٠٠. أبو داود. حج: ٢٠٢٣. نسائي. مساجد: ٦٩١}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ساڵی ئازادکردنی مەککە، تەشریفی هات، لە حەوشەی مزگەوت دابەزی، ناردی بەشوێن عوثمانی کوڕی طەلحەدا، کە کلیلداری کەعبە بوو، کلیلەکانی بۆ هێناو فەرمانی پێکرد، دەرگاکەی کەعبەی کردەوە بۆی، ئەوجا پێغەمبەرو بیلالو ئوسامەی کوڕی زەیدو عوثمانی کوڕی طەلحە چوونە ناو ژووری کابەوە، ئەوجا فەرمانی کرد، دەرگاکە داخرا، تاوێ لەناویدا مانەوە، ئەوجا دەرگاکە کرایەوەو هاتنە دەرەوە. عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرمووی: من خۆم گورج لەپێش خەڵکەکەدا، کە هاتنە دەرەوە چووم بەپیریانەوە، لەپێشا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە دەرەوە، دوا بەدوای ئەو بیلال هاتە دەرەوە، لە بیلالم پرسی: ئایا پێغەمبەر نوێژی لەناو ماڵی کەعبەدا کرد؟ فەرمووی: ئا، نوێژی تیاکرد. گوتم: لەکوێدا؟ فەرمووی: لەنێوانی دوو کۆڵەکە یەمانیەکاندا، دەرگاکەی خستە پشتیەوەو رووی کردە دیوارەکەی بەرابەری، بەینی خۆیو دیوارەکە سێ باڵ (ذراع) بوو.

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: لەدەستم چوو، لە بیلال بپرسم کە چەند رکاتی تیادا کرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ١٧١٨، ١٧١٧، ١٧١٩}.

٧٠٦- عَنِ ابْنُ جُرَيْجٍ قَالَ: قُلْتُ لِعَطَاءٍ: أَسَمِعْتَ ابْنَ عَبَّاسٍ يَقُولُ: إِنَّمَا أُمِرْتُمْ بِالطَّوَافِ، وَلَمْ تُؤْمَرُوا بِدُخُولِهِ؟ قَالَ: لَمْ يَكُنْ يَنْهَى عَنْ دُخُولِهِ، وَلَكِنِّي سَمِعْتُهُ يَقُولُ: أَخْبَرَنِي أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رضى الله عنه) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمَّا دَخَلَ الْبَيْتَ دَعَا فِي نَوَاحِيهِ كُلِّهَا، وَلَمْ يُصَلِّ فِيهِ حَتَّى خَرَجَ، فَلَمَّا خَرَجَ رَكَعَ فِي قُبُلِ الْبَيْتِ رَكْعَتَيْنِ، وَقَالَ: هَذِهِ الْقِبْلَةُ، قُلْتُ لَهُ: مَا نَوَاحِيهَا أَفِي زَوَايَاهَا؟ قَالَ: بَلْ فِي كُلِّ قِبْلَةٍ مِنَ الْبَيْتِ. {الحديث: ٣٢٢٤ = ٣٢١٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٢٥١ = ٣٩٨، ١٦٠١، ٣٣٥١، ٣٣٥٢، ٤٢٨٨. نسائي. حج: ٢٩١٧. تحفة الأشراف: ٩٦}:

ئیبنو جورەیج دەفەرموێ: بە عەطام گوت: تۆ کە شاگردی ئیبنو عەبباس بووی لێیت بیستووە کە بفەرموێ: ئێوە تەنیا فەرمانی ئەوەتان پێکراوە کە تەوافی بەیت بکەن، فەرمانی ئەوەتان پێ نەکراوە کە بچنە ناوی؟ عەطاء فەرمووی: ئیبنو عەبباس پێشگیری نەدەکرد لە چوونە ناوی، بەڵام ئەوەم لێی بیستووە کە دەیفەرموو: ئوسامەی کوڕی زەید هەواڵی بەمندا، کە ڕۆژی ئازادکردنی مەککە، کە ناودارە بە فەتحی مەککە، کە پێغەمبەرو کۆمەڵێ لە هاوەڵانی، چوونە ناو ماڵی بەیتەوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو هەموو لایەکی ناو کابەدا، نزای کردو لەخودا پاڕایەوە، بەڵام بەپێی ئاگاداری من کە لە ئوسامەی کوڕی زەیدم وەرگرتووە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی لەناویدا نەکردووە، هەتا دێتە دەرەوە، کە دێتە دەرەوە بەرەو رووی رووگە (موقابیلی قیبلە = کەعبە = بەیت) دوو رکات نوێژی سوننەت دەکات، وە دەفەرموێ: (ئەمە رووگەی موسوڵمانانە، ئەو قیبلەیە کە لە نوێژو هەندێ کاتی تایبەتدا موسوڵمانان رووی تێ دەکەن). عەرزیم کرد: مەبەست لە لایەکانی گۆشەکانیەتی؟ فەرمووی: نەء، بەڵکوو مەبەست هەموو رووەکانی بەیتە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ١٧١٧ هەتا ژمارە: ١٧٢٠}.

## ٥٥٩) حەجی مالآوایی = حەجەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (٢٩٤٢ - ٢٩٤٧)

## باب: في حجّة النبيّ {صلى الله عليه وسلم}

٧٠٧- عَنْ جَعْفَرِ بْنِ مُحَمَّدٍ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما)، فَسَأَلَ عَنِ الْقَوْمِ حَتَّى انْتَهَى إِلَيَّ فَقُلْتُ: أَنَا مُحَمَّدُ بْنُ عَلِيِّ بْنِ حُسَيْنٍ، فَأَهْوَى بِيَدِهِ إِلَى رَأْسِي فَنَزَعَ زِرِّى الأَعْلَى، ثُمَّ نَزَعَ زِرِّى الأَسْفَلَ، ثُمَّ وَضَعَ كَفَّهُ بَيْنَ ثَدْيَيَّ، وَأَنَا يَوْمَئِذٍ غُلاَمٌ شَابٌّ فَقَالَ: مَرْحَبًا بِكَ يَا ابْنَ أَخِي سَلْ عَمَّا شِئْتَ، فَسَأَلْتُهُ وَهُوَ أَعْمَى، وَحَضَرَ وَقْتُ الصَّلاَةِ فَقَامَ فِي نِسَاجَةٍ مُلْتَحِفًا بِهَا، كُلَّمَا وَضَعَهَا عَلَى مَنْكِبِهِ رَجَعَ طَرَفَاهَا إِلَيْهِ مِنْ صِغَرِهَا، وَرِدَاؤُهُ إِلَى جَنْبِهِ عَلَى الْمِشْجَبِ فَصَلَّى بِنَا. فَقُلْتُ: أَخْبِرْنِي عَنْ حَجَّةِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ بِيَدِهِ، فَعَقَدَ تِسْعًا. فَقَالَ: إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَثَ تِسْعَ سِنِينَ لَمْ يَحُجَّ، ثُمَّ أَذَّنَ فِي النَّاسِ فِي الْعَاشِرَةِ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَاجٌّ فَقَدِمَ الْمَدِينَةَ بَشَرٌ كَثِيرٌ، كُلُّهُمْ يَلْتَمِسُ أَنْ يَأْتَمَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَيَعْمَلَ مِثْلَ عَمَلِهِ، فَخَرَجْنَا مَعَهُ حَتَّى أَتَيْنَا ذَا الْحُلَيْفَةِ فَوَلَدَتْ أَسْمَاءُ بِنْتُ عُمَيْسٍ مُحَمَّدَ بْنَ أَبِي بَكْرٍ (رضى الله عنه)، فَأَرْسَلَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): كَيْفَ أَصْنَعُ؟ قَالَ: « اغْتَسِلِي وَاسْتَثْفِرِي بِثَوْبٍ وَأَحْرِمِي »، فَصَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْمَسْجِدِ ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ، حَتَّى إِذَا اسْتَوَتْ بِهِ نَاقَتُهُ عَلَى الْبَيْدَاءِ نَظَرْتُ إِلَى مَدِّ بَصَرِي بَيْنَ يَدَيْهِ مِنْ رَاكِبٍ وَمَاشٍ، وَعَنْ يَمِينِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَعَنْ يَسَارِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَمِنْ خَلْفِهِ مِثْلَ ذَلِكَ، وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَ أَظْهُرِنَا وَعَلَيْهِ يَنْزِلُ الْقُرْآنُ، وَهُوَ يَعْرِفُ تَأْوِيلَهُ، وَمَا عَمِلَ بِهِ مِنْ شَيْءٍ عَمِلْنَا بِهِ، فَأَهَلَّ بِالتَّوْحِيدِ: « لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ ». وَأَهَلَّ النَّاسُ بِهَذَا الَّذِي يُهِلُّونَ بِهِ، فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَيْهِمْ شَيْئًا مِنْهُ وَلَزِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَلْبِيَتَهُ. قَالَ جَابِرٌ (رضى الله عنه): لَسْنَا نَنْوِي إِلاَّ الْحَجَّ، لَسْنَا نَعْرِفُ الْعُمْرَةَ، حَتَّى إِذَا أَتَيْنَا الْبَيْتَ مَعَهُ. اسْتَلَمَ الرُّكْنَ، فَرَمَلَ ثَلاَثًا وَمَشَى أَرْبَعًا، ثُمَّ نَفَذَ إِلَى مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ عَلَيْهِ السَّلاَمُ فَقَرَأَ: (وَاتَّخِذُوا مِنْ مَقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى) فَجَعَلَ الْمَقَامَ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْبَيْتِ. (فَكَانَ أَبِي يَقُولُ، وَلاَ أَعْلَمُهُ

ذَكَرَهُ إلاَّ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَقْرَأُ فِى الرَّكْعَتَيْنِ (قُلْ هُوَ اللَّـهُ أَحَدٌ) وَ (قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ)، ثُمَّ رَجَعَ إِلَى الرُّكْنِ فَاسْتَلَمَهُ، ثُمَّ خَرَجَ مِنَ الْبَابِ إِلَى الصَّفَا، فَلَمَّا دَنَا مِنَ الصَّفَا قَرَأَ: (إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِنْ شَعَائِرِ اللَّهِ ) أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللَّهُ بِهِ، فَبَدَأَ بِالصَّفَا فَرَقِىَ عَلَيْهِ، حَتَّى رَأَى الْبَيْتَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَوَحَّدَ اللَّهَ وَكَبَّرَهُ، قَالَ: « لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ، ثُمَّ دَعَا بَيْنَ ذَلِكَ قَالَ مِثْلَ هَذَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ نَزَلَ إِلَى الْمَرْوَةِ حَتَّى إِذَا انْصَبَّتْ قَدَمَاهُ فِى بَطْنِ الْوَادِى سَعَى حَتَّى إِذَا صَعِدَتَا مَشَى حَتَّى أَتَى الْمَرْوَةَ، فَفَعَلَ عَلَى الْمَرْوَةِ كَمَا فَعَلَ عَلَى الصَّفَا، حَتَّى إِذَا كَانَ آخِرُ طَوَافِهِ عَلَى الْمَرْوَةِ قَالَ: لَوْ أَنِّى اسْتَقْبَلْتُ مِنْ أَمْرِى مَا اسْتَدْبَرْتُ لَمْ أَسُقِ الْهَدْىَ، وَجَعَلْتُهَا عُمْرَةً، فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ لَيْسَ مَعَهُ هَدْىٌ فَلْيَحِلَّ، وَلْيَجْعَلْهَا عُمْرَةً، فَقَامَ سُرَاقَةُ بْنُ مَالِكِ بْنِ جُعْشُمٍ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلِعَامِنَا هَذَا أَمْ لأَبَدٍ؟ فَشَبَّكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَصَابِعَهُ وَاحِدَةً فِى الأُخْرَى وَقَالَ: « دَخَلَتِ الْعُمْرَةُ فِى الْحَجِّ، مَرَّتَيْنِ، لاَ بَلْ لأَبَدٍ أَبَدٍ »، وَقَدِمَ عَلِىٌّ مِنَ الْيَمَنِ بِبُدْنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَوَجَدَ فَاطِمَةَ (رضى الله عنها) مِمَّنْ حَلَّ وَلَبِسَتْ ثِيَابًا صَبِيغًا، وَاكْتَحَلَتْ، فَأَنْكَرَ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَتْ: إِنَّ أَبِى أَمَرَنِى بِهَذَا، قَالَ: فَكَانَ عَلِىٌّ يَقُولُ بِالْعِرَاقِ: فَذَهَبْتُ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُحَرِّشًا عَلَى فَاطِمَةَ لِلَّذِى صَنَعَتْ، مُسْتَفْتِيًا لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِيمَا ذَكَرَتْ عَنْهُ، فَأَخْبَرْتُهُ أَنِّى أَنْكَرْتُ ذَلِكَ عَلَيْهَا، فَقَالَ: صَدَقَتْ صَدَقَتْ، مَاذَا قُلْتَ حِينَ فَرَضْتَ الْحَجَّ؟ قَالَ: قُلْتُ: اللَّهُمَّ إِنِّى أُهِلُّ بِمَا أَهَلَّ بِهِ رَسُولُكَ، قَالَ: فَإِنَّ مَعِىَ الْهَدْىَ، فَلاَ تَحِلُّ، قَالَ: فَكَانَ جَمَاعَةُ الْهَدْىِ الَّذِى قَدِمَ بِهِ عَلِىٌّ مِنَ الْيَمَنِ، وَالَّذِى أَتَى بِهِ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) مِائَةً، قَالَ: فَحَلَّ النَّاسُ كُلُّهُمْ وَقَصَّرُوا، إلاَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) وَمَنْ كَانَ مَعَهُ هَدْىٌ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ التَّرْوِيَةِ تَوَجَّهُوا إِلَى مِنًى، فَأَهَلُّوا بِالْحَجِّ وَرَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَصَلَّى بِهَا الظُّهْرَ وَالْعَصْرَ وَالْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ وَالْفَجْرَ، ثُمَّ مَكَثَ قَلِيلاً حَتَّى طَلَعَتِ الشَّمْسُ وَأَمَرَ بِقُبَّةٍ مِنْ شَعَرٍ تُضْرَبُ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَسَارَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَلاَ تَشُكُّ قُرَيْشٌ إلاَّ أَنَّهُ وَاقِفٌ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ كَمَا كَانَتْ

قُرَيْشٌ تَصْنَعُ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَجَازَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى أَتَى عَرَفَةَ، فَوَجَدَ الْقُبَّةَ قَدْ ضُرِبَتْ لَهُ بِنَمِرَةَ، فَنَزَلَ بِهَا، حَتَّى إِذَا زَاغَتِ الشَّمْسُ أَمَرَ بِالْقَصْوَاءِ فَرُحِلَتْ لَهُ، فَأَتَى بَطْنَ الْوَادِى، فَخَطَبَ النَّاسَ وَقَالَ: « إِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِى شَهْرِكُمْ هَذَا، فِى بَلَدِكُمْ هَذَا، أَلاَ كُلُّ شَىْءٍ مِنْ أَمْرِ الْجَاهِلِيَّةِ تَحْتَ قَدَمَىَّ مَوْضُوعٌ، وَدِمَاءُ الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعَةٌ، وَإِنَّ أَوَّلَ دَمٍ أَضَعُ مِنْ دِمَائِنَا دَمُ ابْنِ رَبِيعَةَ بْنِ الْحَارِثِ - كَانَ مُسْتَرْضِعًا فِى بَنِى سَعْدٍ فَقَتَلَتْهُ هُذَيْلٌ - وَرِبَا الْجَاهِلِيَّةِ مَوْضُوعٌ وَأَوَّلُ رِبًا أَضَعُ، رِبَانَا رِبَا عَبَّاسِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَإِنَّهُ مَوْضُوعٌ كُلُّهُ، فَاتَّقُوا اللَّهَ فِى النِّسَاءِ فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ، وَلَكُمْ عَلَيْهِنَّ أَنْ لاَ يُوطِئْنَ فُرُشَكُمْ أَحَدًا تَكْرَهُونَهُ، فَإِنْ فَعَلْنَ ذَلِكَ فَاضْرِبُوهُنَّ ضَرْبًا غَيْرَ مُبَرِّحٍ وَلَهُنَّ عَلَيْكُمْ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ، وَقَدْ تَرَكْتُ فِيكُمْ مَا لَنْ تَضِلُّوا بَعْدَهُ إِنِ اعْتَصَمْتُمْ بِهِ: كِتَابَ اللَّهِ، وَأَنْتُمْ تُسْأَلُونَ عَنِّى فَمَا أَنْتُمْ قَائِلُونَ؟ قَالُوا: نَشْهَدُ أَنَّكَ قَدْ بَلَّغْتَ وَأَدَّيْتَ وَنَصَحْتَ، فَقَالَ بِإِصْبَعِهِ السَّبَّابَةِ يَرْفَعُهَا إِلَى السَّمَاءِ وَيَنْكُتُهَا إِلَى النَّاسِ: اللَّهُمَّ اشْهَدْ، اللَّهُمَّ اشْهَدْ ثَلاَثَ مَرَّاتٍ. ثُمَّ أَذَّنَ ثُمَّ أَقَامَ، فَصَلَّى الظُّهْرَ، ثُمَّ أَقَامَ فَصَلَّى الْعَصْرَ، وَلَمْ يُصَلِّ بَيْنَهُمَا شَيْئًا. ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى أَتَى الْمَوْقِفَ فَجَعَلَ بَطْنَ نَاقَتِهِ الْقَصْوَاءِ إِلَى الصَّخَرَاتِ وَجَعَلَ حَبْلَ الْمُشَاةِ بَيْنَ يَدَيْهِ، وَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى غَرَبَتِ الشَّمْسُ، وَذَهَبَتِ الصُّفْرَةُ قَلِيلاً حَتَّى غَابَ الْقُرْصُ، وَأَرْدَفَ أُسَامَةَ خَلْفَهُ، وَدَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). وَقَدْ شَنَقَ لِلْقَصْوَاءِ الزِّمَامَ حَتَّى إِنَّ رَأْسَهَا لَيُصِيبُ مَوْرِكَ رَحْلِهِ وَيَقُولُ بِيَدِهِ الْيُمْنَى: أَيُّهَا النَّاسُ السَّكِينَةَ السَّكِينَةَ، كُلَّمَا أَتَى حَبْلاً مِنَ الْحِبَالِ أَرْخَى لَهَا قَلِيلاً حَتَّى تَصْعَدَ حَتَّى أَتَى الْمُزْدَلِفَةَ، فَصَلَّى بِهَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ، بِأَذَانٍ وَاحِدٍ وَإِقَامَتَيْنِ، وَلَمْ يُسَبِّحْ بَيْنَهُمَا شَيْئًا، ثُمَّ اضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى طَلَعَ الْفَجْرُ فَصَلَّى الْفَجْرَ حِينَ تَبَيَّنَ لَهُ الصُّبْحُ بِأَذَانٍ وَإِقَامَةٍ. ثُمَّ رَكِبَ الْقَصْوَاءَ حَتَّى أَتَى الْمَشْعَرَ الْحَرَامَ، فَاسْتَقْبَلَ الْقِبْلَةَ، فَدَعَاهُ، وَكَبَّرَهُ، وَهَلَّلَهُ، وَوَحَّدَهُ، فَلَمْ يَزَلْ وَاقِفًا حَتَّى أَسْفَرَ جِدًّا، فَدَفَعَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ، وَأَرْدَفَ الْفَضْلَ بْنَ عَبَّاسٍ - وَكَانَ رَجُلاً حَسَنَ الشَّعْرِ أَبْيَضَ وَسِيمًا - فَلَمَّا دَفَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّتْ بِهِ ظُعُنٌ يَجْرِينَ، فَطَفِقَ الْفَضْلُ يَنْظُرُ إِلَيْهِنَّ،

فَوَضَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَدَهُ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ فَحَوَّلَ الْفَضْلُ وَجْهَهُ إِلَى الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ، فَحَوَّلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَدَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ عَلَى وَجْهِ الْفَضْلِ يَصْرِفُ وَجْهَهُ مِنَ الشِّقِّ الآخَرِ يَنْظُرُ، حَتَّى أَتَى بَطْنَ مُحَسِّرٍ فَحَرَّكَ قَلِيلاً، ثُمَّ سَلَكَ الطَّرِيقَ الْوُسْطَى، الَّتِي تَخْرُجُ عَلَى الْجَمْرَةِ الْكُبْرَى، حَتَّى أَتَى الْجَمْرَةَ الَّتِي عِنْدَ الشَّجَرَةِ فَرَمَاهَا بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ، يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ مِنْهَا، مِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ. رَمَى مِنْ بَطْنِ الْوَادِي. ثُمَّ انْصَرَفَ إِلَى الْمَنْحَرِ فَنَحَرَ ثَلاثًا وَسِتِّينَ بِيَدِهِ، ثُمَّ أَعْطَى عَلِيًّا فَنَحَرَ مَا غَبَرَ وَأَشْرَكَهُ فِي هَدْيِهِ، ثُمَّ أَمَرَ مِنْ كُلِّ بَدَنَةٍ بِبَضْعَةٍ فَجُعِلَتْ فِي قِدْرٍ فَطُبِخَتْ، فَأَكَلاَ مِنْ لَحْمِهَا، وَشَرِبَا مِنْ مَرَقِهَا. ثُمَّ رَكِبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَفَاضَ إِلَى الْبَيْتِ فَصَلَّى بِمَكَّةَ الظُّهْرَ فَأَتَى بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ يَسْقُونَ عَلَى زَمْزَمَ، فَقَالَ: « انْزِعُوا بَنِي عَبْدِ الْمُطَّلِبِ، فَلَوْلاَ أَنْ يَغْلِبَكُمُ النَّاسُ عَلَى سِقَايَتِكُمْ لَنَزَعْتُ مَعَكُمْ »، فَنَاوَلُوهُ دَلْوًا فَشَرِبَ مِنْهُ. {الحديث: ٢٩٤١ = ٢٩٢٦. أبو داود. حج: ١٩٠٥. ابن ماجة. حج: ٣٠٧٤. تحفة الأشراف: ٢٥٩٣}:

له جەعفەری کوڕی موحەممەدەوە، لە باوکیەوە، (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: چووین بۆلای جابیری کوڕی عەبدوڵلا، (ڕەزای خودایان لێ بێ) کوێر بوو بوو، یەکە یەکە دەیپرسی: ئەمە کێیەو ئەوە کێیە، تا سەرە هاتە سەر من، گوتم: من موحەممەدی کوڕی عەلی کوڕی حوسەینم، کەوام گوت، دەستی هێنا بەسەر سەرماو دەستی هێنایە خوارەوە بۆ سینگو بەرۆکمو دوگمەی سەرەوەو دوگمەی خوارەوەی ترازاندمو لەپی هێنا بە سینگما بۆ موبارەکیو گوتی: خۆش هاتی ئەی برازای خۆشەویستم! پرسیارت چییە بیکە، منیش ئەو حەلە کوڕێکی لاو بووم، ئینجا کاتێ نوێژ داهات هەڵسا نوێژی بۆ کردین، تەیلەسانێکی لەبەردا بوو، پێچابووی لەخۆیەوە، لەبەر بچووکی کەدەیدا بەسەر شانیا چمکەکانی هەڵدەکشانەوە بۆلای خۆی، پەشتە ماڵ (ریداء)ەکەشی لە تەنیشتیەوە بەسەر سێ پایەکەوە بوو، جا کەنوێژی بۆ کردین، لەپاشا لێم پرسی، گوتم: باسی حەجەکەی پێغەمبەرم بۆ بکە، (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ)، جا نۆ پەنجەی خۆی ژماردو گوتی: پێغەمبەر

(دروودی خودای لەسەر بێ) نۆ ساڵ مایەوە لە مەدینە، لەو ماوەیەدا حەجی نەکرد، جا لەساڵی دەهەمدا جاڕیدا بەناو مەردومدا کە: ئەمساڵ پێغەمبەر، (دروودی خودای لەسەر بێ)، دەچێ بۆ حەج ئیتر عەشاماتێکی گەلێ زۆر هاتن بۆ مەدینە، وە هەموویان دەیانویست کە پەیڕەوی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بکەنو چاو لەو بکەنو ئەو هەرچی کرد لە حەجەکەیا، ئەوانیش بیکەن، ئەنجا لە خزمەتی حەزرەتدا، (دروودی خودای لەسەر بێ)، کەوتنە ڕێو ڕۆیشتن تا گەیشتنە زولحولەیفە، لەوێ ئەسمای کچی عومەیس، موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیقی بوو، وە هەواڵی نارد بۆلای پێغەمبەر، (دروودی خودای لەسەر بێ) کە حاڵم وایە، زەیستانم چی بکەمو چۆن بکەم؟ فەرمووی: (خۆت بشۆرەو ناواخنێ بۆ خۆت بکەو تۆپەوانەیێ بۆ وانێکەکەت بکەو خوێنەکەی پێ بەربەست بکەو ئیحرام دابەستە.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ لە مزگەوتەکەدا نوێژی عەصری کرد، ئەنجا سواری وشترەکەی بوو، کە وشترە مێنگەیێ بوو، ناوی قەصوا بوو، چونکە سەری گوێی قرتابوو، ئەوجا ڕۆیشت تا بەسواری سەرکەوتە سەرکێوی بەیداو، لەوێ بەهەر چوار لادا تەماشام کرد تا چاوم بڕی دەکرد هەر سوارە بوو، وە هەر پیادە بوو، لەدەوری حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆی لەناومانا بوو پەیتا پەیتا قورئانی بۆ دەهاتە خوارێ، ئیتر ئەو خۆی هەرچی بکردایە ئێمەیش لەشوێن ئەوەوە ئەوەمان دەکرد، ئینجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم وشە پیرۆزەیە، کە دروشمی یەزدان پەرستییەو نیشانەی یەکتایی خودایە، بەم وشە پیرۆزە ئاوا ئیحرامی حەجی دابەستو نیەتی هێنا:

{لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ، لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ لَبَّيْكَ، إِنَّ الْحَمْدَ وَالنِّعْمَةَ لَكَ وَالْمُلْكَ، لاَ شَرِيكَ لَكَ}.

واتە: پەروەردگارا! هەمیشە کەمەری بەندەگیم بەستووە بۆ جێبەجێکردنی فەرمانی تۆ، تۆ بێ چوونو بێ هاوەڵی، سوپاسو ستایش هەر بۆ تۆیە، وە

بەخشش‌و نازو بەهرەو نیعمەت‌و دارایی‌و پاشایی‌و خاوەنیی، هەر لەخۆت دێ‌و هەر لەخۆت جوانە، بێ چوونی‌و بێ هاوەڵی تۆ ئاشکراو نمایانە).

خەڵکەکەی تریش ئابەمەی کە خۆیان ئیحرامی پێ دادەبەستن ئیحرامیان دابەست، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)، لێی نەگرتن‌و رەخنەی نەبوو، وەڵێ خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) هەر لەسەر تەلبییە کردنەکەی خۆی بەردەوام بوو.

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشا تەنیا هەر نیازی حەجمان هەبوو، خەیاڵی عەمرەمان نەبوو، چونکە لەوەوپێش لە رۆژانی حەجدا عەمرەمان نەدەکرد، تا ئەو حەلە کە لەخزمەتی حەزرەتدا چووینە بەیت‌و لەوێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی هێنا بە گۆشەی حەجەرول ئەسوەداو ماچی کردو سێ‌جار بە هەڕاکردن‌و چوار جار بەڕۆیشتنی ئاسایی هەڵسووڕا بەگردی خانەی خوادا، کە بەم کارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: تەوافی بەیت. ئەنجا رۆیشت بۆ مەقامی ئیبراهیم (دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوێندەوە:

{وَاتَّخِذُواْ مِن مَّقَامِ إِبْرَاهِيمَ مُصَلًّى} واتە: وەپێمان گوتن: مەقامی ئیبراهیم بکەن بەجێگە نوێژ بۆ خۆتان‌و ئەو شوێنە پیرۆزەیە بکەن بە نوێژگاو نوێژی سوننەتی تیا بکەن، ئەنجا مەقامی خستە بەینی خۆی‌و بەینی بەیمتەوەو دوو رکات سوننەتی نوێژی تەوافی کردو لە رکاتی یەکەمداو لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، سوورەتی (قُلْ يَا أَيُّهَاالكَافِرُونَ)ەی خوێند، وە لە رکاتی دووەمدا لەپاش خوێندنی سوورەتی فاتیحە، سوورەتی (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَد)ی خوێند (مەقامی ئیبراهیم = جێ پای حەزرەتی ئیبراهیم، ئەو بەردەیە، کە حەزرەتی ئیبراهیم لەسەری دەوەستا لەکاتی دروستکردنی بەیتدا - وەرگێڕ).

ئەنجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گەڕایەوە بۆسەر حەجەرول ئەسوەدو دیسانەوە دەستی پیا هێنایەوە، ئەنجا لە دەرگای نزیك صەفاوە، کە پێی دەگوترێ: (باب الصَّفَا = دەرگای سەفا) دەرچوو، رۆیشت بۆ صەفا، کە لە صەفا نزیك بوویەوە

ئەم ئایەتەی خوێندەوە: {إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ} واتە: تەپۆڵكەی صەفاو تەپۆڵكەی مەڕوە، هاموشۆ لە نێوانیانا، لەكاتی حەجو عەمرەدا، نیشانەو دروشمی بەندەیی خودان). وە فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (بەوەیان دەست پێ بكەن كە خودا پێشی خستووە، ئەنجا دەستی كرد بە تەوافی صەفاو سەركەوتە سەر تەپۆڵكەی صەفا تا خانووی كەعبەی لێوە دەركەوت. جا رووی كردە رووگەو شایەتمانی هێناو ئەڵلاهو ئەكبەری كردو فەرمووی:

{لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ، أَنْجَزَ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ} واتە: هەر خودا خودایەو تاكو تەنیایە، بێ هاوەڵو بێ چوونە، خاوەنی موڵكو پادشاییو دەستەڵاتو سەڵتەنەتە، هیچی لەدەست دەرناچێو تەواناى هەموو شتێكی هەیە، هەر خودا خودایە، بەڵێنەكەی خۆی هێنایە دی، وە بەندەكەی خۆی، كە موحەممەدە سەرخست، وە ئەو كۆمەڵانەی كە لە رۆژی غەزای خەندەقا گەلەكۆمەیان لە ئیسلام كردبوو، خۆی بەتەنها شكاندنیو ژێری خستن!).

وە سێجار حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم یادو زیكرەی خوێند، وە لەبەینی ئەم سێ جارەیشدا دەپاڕایەوەو دوعاو نزای تری دەكرد.

ئەنجا داپەڕی بۆ مەڕوە كە پێی نایە ناو شیوەكەوە پێی هەڵگرتو خێرا رۆیی، تا گەیشتە هەورازەكە، ئینجا بە ئاسایی رۆیشت تا چووە سەر مەڕوە، وە لەسەر صەفا چیكرد لەسەر مەڕوەش هەمان شتی دووبارە كردەوە، تا دوا تەوافی لەسەر مەڕوە تەواو بوو، فەرمووی: (تازە لەدەستم چوو، ئەگینا دیاریی بەیتم لەگەڵ خۆم نەدەهێنا، وە دەمكرد بە عەمرە، جا هەركەسەتان كە دیاریی پێ نییە با ئیحرام بشكێنێو بیكا بە عەمرە، سوراقەی كوڕی مالیكیش هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە هەر بۆ ئەمساڵ وایە، یاخود هەتا هەتایە هەروا دەمێنێ؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پەنجەكانی خۆی تێك پەڕاندو دووجار فەرمووی: (عەمرە تێكەڵی حەج بوو ئاوا هەتا هەتایە!).

عەلیش (خودای لێ رازی بێ) لە یەمەنەوە وشتری دیاریی بەیتی هێنا بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ). عەلی کە هات روانی وا فاتیمە (رەزای خودای لێ بێ) ئیحرامی شکاندووەو جلی رەنگاویی پۆشیوەو چاوی رشتووە، جا گوتی: ئەمە چییە؟ فاتیمەیش فەرمووی: باوکم فەرموویەتی وابکەم. گوتی: کاتێ عەلی لە عێراق بوو دەیفەرموو: جا چووم بۆلای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هەتا هانی بدەم لە فاتیمە، کە بۆوای کردووە، وە بۆ ئەو قسەیەش کە گوتی باوکم فەرموویەتی کە وابکەم هەر لێم پرسی، وە عەرزیشم کرد کە من ئەوکارەی ئەوم پێ خۆش نییە، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (فاتیمە راست دەکا، من خۆم پێم گوتووە، تۆ کە ئیحرامی حەجت دابەست چیت گوت، چۆن نیێتت هێنا؟) گوتم: گوتم ئەی خودایە! ئەوا نییەتی حەجم هێنا، لەسەر ئەو نییەتەی کە پێغەمبەری تۆ دەیهێنێ.

فەرمووی: (دە تۆ ئیحرام مەشکێنە، چونکە من دیاریی بەیتم پێیە).

فەرمووی: ئەو دیارییەی کە عەلی لە یەمەنەوە هێنابووی، لەگەڵ ئەو دیارییەدا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ خۆی هێنابووی، سەرجەم سەد وشتر بوون.

گوتی: ئیتر خەلکەکە هەموو ئیحرامیان شکاندو مووی سەریان کورت کردەوە، پێغەمبەرو ئەو کەسانە نەبێ کە دیاریی بەیتیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، جا لەرۆژی تەروییەدا کە دەکاتە رۆژی هەشتەمی مانگی نۆمینە، بەرەو مینا جمانو ئیحرامی حەجیان دابەست، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوار بوو، وە نوێژی نیوەرۆو عەصرو شێوانو خەوتنانو بەیانیی لەوێ کرد، ئینجا لەوێ کەمێ مایەوە تا خۆرهەڵهات، وە فەرمانی دا کە لە نەمیرە دەوارێکی بۆ هەڵدەن، جا کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەوتەرێ، قورەیش وایان دەزانی کە پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) وەك سەردەمی نەزانی خۆیان لە مەشعەرولحەرام دەوەستێ، بەڵام پێغەمبەر لەوێ رەت بوو، وە نەوەستاو رۆیشت هەتا چووە نزیکی عەرەفە، سەیری کرد لە نەمیرە دەواریان بۆ هەڵداوە، جا لەوێ دابەزی، وە لەوێ مایەوە تا خۆر لایدا.

ئەوجا فەرمانی کرد، قەصوایان بۆ کۆپان کردو چوو بۆ ناو شیوەکەو لەوێ وتارێکی داو فەرمووی: (خوێنو سەرو ماڵو نامووستان لە یەکتریی زۆر زۆر حەرامەو ناڕەوایە، هەروەك چۆن شکاندنی ڕێزی ئەم ڕۆژە پیرۆزەتان، لەم مانگە پیرۆزەتانا، لەم شارە پیرۆزەتانا زۆر زۆر حەرامو ناڕەوایە ئاوا، ئاگاداربن! کەوا هەرچی کاروباری سەردەمی نەزانییە، پووچەو بەتاڵەو بێ بایەخە، خوێنی سەردەمی نەزانی بەتاڵە، وە یەکەم خوێن، لە خوێنی کەسوکاری خۆم، کەبە بەتاڵو بێ بایەخی دادەنێم، خوێنی کوڕەکەی ڕەبیعەی کوڕی حاریسە، کە لەناو هۆزی بەنی سەعددا درابوو بە دایەن، وە هۆزی هوزەیل دەیکوژن. وە سوودی سەردەمی نەزانی هەمووی پووچو بەتاڵە، وە یەکەم سوودیش، لە سوودی کەسوکاری خۆم، کە بەتاڵی دەکەمەوە، سوودی عەبباسی کوڕی عەبدولموتتەلیبە، ئەو سوودە هەمووی پووچو بەتاڵە، وە دەربارەی ئافرەتانیش لەخودا بترسنو بێ دادیی و ناهەقییان لێ مەکەنو ڕەفتارتان جوان بێ لەگەڵیانا، چونکە ئەوان ئەمانەتو سپاردەی خودای گەورەن لەلای ئێوەی پیاوان، دەی پیاو گریمان ئەگەر خیانەتیش بکا، نابێ خیانەت لە سپاردەو ئەمانەتی خودای خۆی بکا! وە ئەوان لەسەر فەرموودەی خوداو بەپێی قسەی شەریعەتی ئیسلام، کە شەریعەتی ئەوە، بۆتان حەڵاڵ بوونو دێنە باخەڵتانو دەچنە لایان. وە مافی ئێوە لەسەر ئەوان ئەوەیە: کە ئەوکەسە کە ئێوە حەزی لێ ناکەن، نەیهێننە سەر بەڕەتانو نەهێڵن بێتە ماڵتان، جا ئەگەر شتی وایان کرد کە بەدڵی ئێوە نەبوو، ئەوا هەتا دەتوانن چاو پۆشییان لێ بکەنو بە نەرمو نیانی لەگەڵیاندا ڕەفتار بکەن، وە بەبێ هۆیەکی ڕەوا تەلاقیان مەدەن، بەڵام ئەگەر بەم شێوە شیرینەیش چاریان نەکرا، ئەوا شەریعەت ڕێگەتان دەدا، کە بە ئاسپایی لێیان بدەن.

وە مافی ئەوانیش لەسەر ئێوە ئەوەیە کە بەباشیو بەپێی باوی ناو وڵاتی خۆتان، ڕۆژیو خۆراكو بەرگو پۆشاکیان پێ بدەن، وەکی هاوسەری هاوشانی خۆتان، تا هەست بە هاوسەر کەمی نەکەن!

وەمن یاسایەکی رەسای رێکو پێکی وەهام لەپاش خۆم بۆ بەجێ هێشتوون، ئەگەر بێتو پەیرەوی بکەن، لەناو خۆتانا، هەتا هەتایە، جارێکی تر سەرتان لێ ناشێوێو سەرگەردان نابن، ئەویش ئەم قورئانەیە کە نامەی خودایە.

وە ئێوە لەدوا رۆژدا، لەبارەی منەوە پرسیارتان لێ دەکرێ، ئایا من بە ئەرکی سەرشانی خۆم هەڵساوم‌و یاسا نامەی خودام بەئێوە راگەیاندووە یانا، جا ئێوە سەبارەت بەم پرسیارە وەڵامتان چی دەبێ؟

گوتیان: شایەتی دەدەین کە تۆ کۆتاییو درێغ یت نەکردووە، تەبلیغی خۆتت کردووەو ئەرکی سەرشانی خۆتت بەجێ هێناوەو ئامۆژگاری خێری ئێمەت کردووە!

جا حەزرەت (صەلاتو سەلام‌و دروودی خودای گەورەی لەسەر بێ) سێ‌جار پەنجەی دۆشاو مژەی خۆی هەڵبڕی بۆ ئاسمان‌و داینەواندەوە بۆناو خەڵکەکەو هەموو جارێکیش لەگەڵ ئەم ئاماژەیەدا دەیفەرموو: (خودایە! تۆ بەشایەت بە!).

ئینجا فەرمانی دا بانگ دراو قامەت کراو نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین‌و فەرمانی کردەوە: قامەت کرایەوەو نوێژی عەسریشی بە (جەمع) بۆ کردین، وە لە بەینیانا هیچ نوێژی تری نەکرد. ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سواری وشترەکەی بوو، رۆیشت تا گەیشتە ئێستگاکەی خۆی لە عەرەفات، جا رووی وشترەکەی، کە ناوی قەصواء بوو، کردە تاوێرە بەردەکانی داوێنی کێوی جەبەلوڕەحمە، کە ئەم چیای رەحمەتە خۆی وا لە ناوەڕاستی خاکی عەرەفاتدا، وە کۆمەڵی حاجییە پیادەکانی خستە بەردەمی خۆیەوە، وە رووی کردە رووگە (قیبلە).

ئیتر لەوێدا راوەستا تا خۆر ئاوابوو، جا ئوسامەی خستە پاشکۆی خۆیەوەو داپەڕی بۆ موزدەلیفە، هەوسارەکەی قەسواشی وا گورج کردبۆوە، تەنانەت سەری قەسوا دەیدا لە قەڵپووزی کۆپانەکەی، وە بەدەستی راستیشی ئاماژەی دەکردو دەیفەرموو: (خەڵکینە! لەسەرخۆبن، خەڵکینە هێواش، ئارامی بپارێزن). بەڵام کە دەگەیشتە تەپکەو ماسۆڵکە لێ، کەمێ جڵەوەکەی بۆ قەسواء شل دەکرد، تا سەردەکەوتە سەری، جا رۆیشت تا تەشریفی گەیشتە موزدەلیفە، جا لەوێ نوێژی

شێوانو خەوتنانی بە جەمعە تەئخیر کرد بەیەك بانگو بەدوو قامەت، وەهیچ نوێژی سوننەتی لە بەینیاندا نەکرد، ئینجا تەشریفی خەوت هەتا شەبەقی دا.

جا کە بەیانیی تەواوی دا، فەرمانی دا، بانگ دراو قامەت کراو نوێژی بەیانی بۆ کردین، ئەنجا سواری قەسوا بۆوەو رۆیشت تا گەیشتە مەشعەرولحەرام، جا رووی کردە رووگەو لە خودا پاڕایەوەو ئەڵلاهو ئەکبەرو تەلیلەی کردو ناوی خودای تاكو تەنیای هێنا.

وە لەوێ راوەستا تا تەواو دنیا رووناك بووەوە، جا لەپێش خۆرکەوتندا، کەوتەڕێ بۆ مینا، وە فەزڵی کوڕی عەبباسی مامی خستە پاشکۆی خۆی، فەزڵیش پیاوێکی قژ جوانی سپیلکەی شۆخو قۆز بوو، جا لەوکاتەدا، کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) کەوتەڕێ، تاقمێ ژن لەناو کەژاوەدا دایان بەلایدا، فەزڵیش دەستی کرد بە تەماشا کردنیان، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی نا بەڕووی فەزڵەوەو بەرچاوی گرت، فەزڵیش رووی وەرچەرخان بەولاداو لەولاوە تەماشای دەکردن!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی لەولاوە گواستەوە بۆ لایەکەی ترو نایەوە بەڕووی فەزڵەوە، تا بەرچاوی بگرێتەوەو تەماشا نەکا. ئیتر حەزرەت رۆیشت تا گەیشتە ناو شیوی موحەسسیر، لەوێ تۆزێ خێرا لێی خوڕیو رێگەی ناوەڕاستی گرت، کە دەچێ بەسەر کۆگای گەورەدا، جا رۆیشت تا گەیشتە لای کۆگا بەردەکە، کەوا لەلای درەختەکەدا، وە حەوت بەردی بۆ فڕێدا، بەردەکان وەك بەردێ وابوون کە بە پەلەپیتکە دەهاوێژرێ، گشت جارێ کە بەردێکی تێ دەگرت ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، لەناو شیوەکەوە بەردەکانی تێ ددەگرت.

ئینجا رۆیشت بۆ کوشتنگا (مەنحەر: کوشتارگە)کەو لەوێ بەدەستی خۆی شەستو سێ وشتری سەربڕی، ئەنجا چەقۆکەی دا بە عەلیو عەلیش باقی مەندەی وشترە دیارییەکانی حەزرەتی سەربڕی، وە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەلی کرد بە هاوبەشی خۆی لەم وشترە دیارییانەدا، ئینجا فەرمانی دا، لە گۆشتی هەر وشترێ پارچەیەکیان هێناو خستیانە ناو مەنجەڵێکەوە، کوڵانیانو خۆیو عەلی لە

گۆشتەکەیان خواردو لە ئاوی مەرگەکەیان خواردەوە، ئینجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوار بوو، ڕۆیشت بۆ بەیتو تەوافی ئیفازەی کرد، وە نوێژی نیوەڕۆی لە مەککە کرد. جا چوو بۆلای بەنی عەبدولموتتەلیب، کە لەسەر بیری زەمزەم ئاویان دەدا بە حاجیان، فەرمووی: (ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب! ئاو هەلگۆزنو بیدەن بە حاجییانو بە مەردوم، نەبادا خەڵك وا تێبگەن کە ئاو هەلگۆزینیش بەشێکە لە کردارەکانی حەج، وە لەم حاڵەدا زۆرتان بۆ بهێنن و ڕێگەتان نەدەن کە بە ئاسایی ئاو بدەن بە حاجیان، نەبادا ئەمە ڕوویدا ئەگینا ئەم ئیشەی ئێوە ئەوەندە کارێکی جوانو پەسەندە منیش ئاوم هەڵ دەگۆست لەگەڵتانا، جا ئەوانیش سەتڵێ ئاویان بۆیبرد، حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) لێی خواردەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ١٦٢٥ ج/٤ + فیقهی ئاسان/١، زنجیرە: ١٧٦، لاپەڕە: ٤٣٣ — حەجەکەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)}.

### ٥٦٠) تەلبییەو تەکبیر کردن لەکاتی ڕۆیشتن لە میناوە بۆ عەرەفە (٣٠٨٣ - ٣٠٨٦)
### باب: التلبية والتكبير في الغُدُوِّ مِنْ مِنى إلى عرفة

٧٠٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: غَدَوْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَاتٍ، مِنَّا الْمُلَبِّى وَمِنَّا الْمُكَبِّرُ. {الحديث: ٣٠٨٣ = ٣٠٧٠ ف.م = فم = فتح الملهم. أبو داود. حج: ١٨١٦. تحفة الأشراف: ٧٢٧١}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لەخزمەت پێغەمبەر خۆیدا، (درودی خودای لەسەر بێ) لە میناوە سەر لەبەیانی دەرچووین بەرەو عەرەفات، هەمان بوو تەلبییەی دەکردو هەمان بوو ئەڵڵاهو ئەکبەری دەکرد).

٧٠٩- عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ أَبِى بَكْرٍ الثَّقَفِىِّ (رضى الله عنه) أَنَّهُ: سَأَلَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ وَهُمَا غَادِيَانِ مِنْ مِنًى إِلَى عَرَفَةَ، كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ فِى هَذَا الْيَوْمِ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ فَقَالَ: كَانَ يُهِلُّ الْمُهِلُّ مِنَّا فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ: وَيُكَبِّرُ الْمُكَبِّرُ مِنَّا فَلاَ يُنْكَرُ عَلَيْهِ. {الحديث: ٣٠٨٥ = ٣٠٧٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٥٠٦ = ٩٧٠، ١٦٥٩ فتح البارى. نسائى. حج: ٣٠٠٠}:

موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری ئەل-ثەقەفی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە حەجێکا لە خزمەتی ئەنەسی کوڕی مالیکا بووین، لەڕۆژی عەرەفەدا، سەر لەبەیانی لەو کاتەدا، کە لەخزمەتیدا، خەریك بووین دەردەچووین لە میناوە بۆ عەرەفات، عەرزیم کرد: لەم ڕۆژانی مینایەدا، کاتێ ئێوە لە خزمەتی پێغەمبەردا دەبوون چیتان دەکرد؟ فەرمووی: هەمان بوو تەلیلەی دەکردو، هەمان بوو (الله اکبر)ی دەکردو هەمان بوو تەلبییەی دەکردو هەمان بوو تەسبیحاتی دەکرد، کەسیش ڕەخنەی لەکەس نەدەگرت، نەیان دەگوت ئەمەیان بکەنو ئەوەیان مەکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ١٥٦٨ ج/٤}.

### ٥٦١) باسی ڕاوەستان لە خاکی عەرەفاتو فەرمایشتی خودای گەورە: {ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ}. (٢٩٤٢ - ٢٩٤٧)

### باب: في الوقوف بعرفة و قوله تعالى: {ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ}

٧١٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ قُرَيْشٌ وَمَنْ دَانَ دِينَهَا، يَقِفُونَ بِالْمُزْدَلِفَةِ، وَكَانُوا يُسَمَّوْنَ الْحُمْسَ/ وَكَانَ سَائِرُ الْعَرَبِ يَقِفُونَ بِعَرَفَةَ، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلاَمُ، أَمَرَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ نَبِيَّهُ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَأْتِيَ عَرَفَاتٍ، فَيَقِفَ بِهَا، ثُمَّ يُفِيضَ مِنْهَا، فَذَلِكَ قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: (ثُمَّ أَفِيضُوا مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ) {الحديث: ٢٩٤٥ = ٢٩٣٠ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٤٠ = ٢٥٢٠، ١٦٦٥ فتح البارى + تجريد/٢، رقم: ٧٩٠ = ١٦٦٤. أبو داود. حج: ١٩١٠. نسائى. حج: ٣٠١٢. تحفة الأشراف: ١٧١٩٠}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران هۆزی قوڕەیشو ئەوانەی لەسەر ئایینی قوڕەیش بوون، لە ڕۆژی عەرەفەدا، لە موزدەلیفە ڕادەوەستان، وە پێیان دەگوتن (حومس) کە کۆی (أحمس)ی عەرەبییە، واتە: دلێرەکان، عەرەبەکانی تریش لە عەرەفە ڕادەوەستان، کە لە دەرەوەی خاکی بەست (حەرەم)ە، جا کاتێ ئایینی پیرۆزی ئیسلام هات، خودای گەورەو سەروەر، فەرمانی کرد بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە لەخاکی بەست (حەرەم) دەرچێو لە موزدەلیفە نەوەستێو وەك خەڵکانی تر بڕوات بۆ خاکی عەرەفات، لەوێ ڕاوەستێو لەپاشا لەوێوە داپەڕنو

بڕۆن بۆ موزدەلیفەو مەشعەرولحەرامو مینا، وەك خودا لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {ثُمَّ أَفِيضُواْ مِنْ حَيْثُ أَفَاضَ النَّاسُ – بەقەرە/١٩٩} واتە: ئێوەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەر لەخاکی عەرەفاتدا راوەستنو هەر لەوێشەوە داڕژێنو وەرنە خوارەوە بۆ موزدەلیفەو، کاتێ لەلای مەشعەرولحەرامدا یادو زیکری خوداتان کرد، ئینجا لەوێوە هەڵ بڕژێنە خوارەوە بۆ مینا).

٧١١- عَنْ جُبَيْرِ بْنِ مُطْعِمٍ (رضى الله عنه) قَالَ: أَضْلَلْتُ بَعِيرًا لِى، فَذَهَبْتُ أَطْلُبُهُ يَوْمَ عَرَفَةَ، فَرَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَاقِفًا مَعَ النَّاسِ بِعَرَفَةَ فَقُلْتُ: وَاللَّهِ إِنَّ هَذَا لَمِنَ الْحُمْسِ فَمَا شَأْنُهُ هَا هُنَا؟ وَكَانَتْ قُرَيْشٌ تُعَدُّ مِنَ الْحُمْسِ. {الحديث: ٢٩٤٧ = ٢٩٣٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩٠ = ١٦٦٤. نسائى. حج: ٣٠١٣. تحفة الأشراف: ٣١٩٣}:

جوبەیری کوڕی موتعیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: وشترێکم ون بوو بوو، ڕۆژی عارفە بوو، چووم بۆی بگەڕێم، بینیم پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەخاکی عەرەفات وەستا بوو، کە عەرەفات وا لە دەرەوەی خاکی حەرەم، لەبەرئەوە سەرم سوڕما، چونکە پێغەمبەر قوڕەیشییە، قوڕەیشیش بە خۆیان دەگوت: حومس، لەبەرئەوە لە ڕۆژی عەرەفەدا، نەدەچوون بۆ عەرەفەو لە خاکی حەرەم دەرنەدەچوون، لە موزدەلیفە دەوەستان، جا عەجەب مامو گوتم چ عەجەب پێغەمبەر لێرە وەستاوە، خۆ بەخوا ئەویش لە حومسەکانە).

**ڕوونکردنەوە:**

جوبەیر لە پیاو ماقوڵانی قوڕەیش بوو، نوێنەری قوڕەیش بوو، کە هاتە خزمەت حەزرەت بۆ بەردانی دیلەکانی غەزای بەدر، لەکاتی ئازادکردنی مەککەدا موسوڵمان بوو، زانایەکی ڕەگەز ناس بوو، لە ئەبوبەکری صدیقەوە فێری زانستی بنەچە ناسیو ڕەگەز ناسی بوو بوو، شەست فەرموودەی هەیە، نۆیان لە بوخاریدان، ئەم فەرموودەیەی ئێرەی پەسەندی هەردوو پیری بوخاریو موسلیمە. لە مەدینە لەساڵی پەنجاو چواری کۆچیدا مردووە، لەسەردەمی جێنشینیی موعاوییەدا.

## ٥٦٢) ڕۆیشتن له عەرەفاتەوە بۆ میناو نوێژ کردن له موزدەلیفه. (٣٠٨٧ - ٣١٠٣)
## باب: في الإفاضة من عرفة، والصلاة بالمزدلفة

٧١٢- عَنْ كُرَيْبٌ: أَنَّهُ سَأَلَ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ (رضى الله عنه): كَيْفَ صَنَعْتُمْ حِينَ رَدِفْتَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَشِيَّةَ عَرَفَةَ؟ فَقَالَ: جِئْنَا الشِّعْبَ الَّذِى يُنِيخُ النَّاسُ فِيهِ لِلْمَغْرِبِ، فَأَنَاخَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَاقَتَهُ وَبَالَ - وَمَا قَالَ أَهْرَاقَ الْمَاءَ - ثُمَّ دَعَا بِالْوَضُوءِ فَتَوَضَّأَ وُضُوءًا لَيْسَ بِالْبَالِغِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ الصَّلاَةَ؟ فَقَالَ: « الصَّلاَةُ أَمَامَكَ »، فَرَكِبَ حَتَّى جِئْنَا الْمُزْدَلِفَةَ فَأَقَامَ الْمَغْرِبَ، ثُمَّ أَنَاخَ النَّاسُ فِى مَنَازِلِهِمْ وَلَمْ يَحُلُّوا حَتَّى أَقَامَ الْعِشَاءَ الآخِرَةَ فَصَلَّى، ثُمَّ حَلُّوا، قُلْتُ: فَكَيْفَ فَعَلْتُمْ حِينَ أَصْبَحْتُمْ؟ قَالَ: رَدِفَهُ الْفَضْلُ بْنُ عَبَّاسٍ، وَانْطَلَقْتُ أَنَا فِى سُبَّاقِ قُرَيْشٍ عَلَى رِجْلَىَّ. {الحديث: ٣٠٩٠ = ٣٠٧٧ فـم. تجريد/١، رقم: ١١٣ = ١٣٩، ١٨١، ١٦٦٧، ١٦٦٩، ١٦٧٢. أبو داود. حج: ١٩٢٥. نسائى. حج: ٣٠٢٤ تحفة الأشراف: ١١٥} :

كورەیب (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: له ئوسامەی کوڕی زەیدم پرسی، (ڕەزای خودایان لێ بێ) تۆ خۆت له پاشکۆی پێغەمبەرەوە سوار بوو بوویت، ئەو ئێوارەی کە عەرەفەتان بەجێ هێشتو ڕۆیشتن بۆ موزدەلیفه، چیتان کرد؟؟

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی ماڵئاواییدا، لە ئێوارەی عەرەفەدا، لە عەرەفاتەوە گەڕایەوەو کەوتەڕێو بەرەو موزدەلیفە ڕۆیشت، ئێمەیش لە خزمەتیدا ڕۆیشتین، هەتا گەیشتینە ڕێچکەکانی حاجیان، کە پێیان دەگوترێ: (شیعەبی حاجیان) شیعب واته: ڕێچکەی قەد شاخ، جا لەوێ خەڵکەکە دابەزینو وشترەکانیان ییخ دا، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) دابەزیو وشترەکەیی ییخ داو، گمێزی کرد (کورەیب فەرمووی: ئوسامە بەدەق فەرمووی گمێزی کرد، وە نەیفەرموو سەراوی کرد، بۆیە منیش دەقی قسەکەی ئەوم گوتەوە) ئەوسا داوای ئاوی دەستنوێژی کردو دەستنوێژێکی سووکەڵەی گرت، منیش عەرزیم کرد: قوربان! لێرە نوێژی شێوان دەکەی؟ فەرمووی: (نەء، نوێژ وا لەپێشمانەوە لەولاترە).

ئـەوجا سـوار بـووەوەو ئێمـەیش ڕۆیشـتین هـەتا گەیشـتینە موزدەلیفـە لـەوێ پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دابـەزیو دەسـتنوێژێکی تێـرو تەسـەلی گـرت، ئـەوجا قامەتی نوێژی شێوان کرا، لەوێ بەجەمعە تەئخیر (کۆکردنەوەی پاشخراو) نوێـژی شێوانی بۆمان کرد، ئینجا هەرکەسە لە جێگەی خۆی وشتری خۆی یـیخ دا، بـەڵام بارو بنەیان نەخست، هەتا قامەت کرا بۆ نوێژی خەوتنانو نوێژی خەوتنانیشی بە جەماعەت بۆ کردین، ئەوجا بارو بنەیان خست.

عـەرزیم کـرد: باشـە کاتـێ بـەیانی دا چـیتان کـرد؟ ئوسـامە فـەرمووی: کـە کەوتەڕێ بۆ مەشعەرولحەرام، لەپاش نوێژی سبەینێ، فەزلی کوڕی عەبباسی خستە پاشکۆی خۆی، منیش لەگەڵ ئەوانەدا، کە زوو بەزوو ڕۆیشتن بـۆ ڕەجمـی شـەیتان، بەپێ ڕۆیشتم). {بڕوانە: تجرید/٢، ژمارە: ٧٤٢ + تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤}.

### ٥٦٣) شێوەی چۆنێتیی دەرچوون لە عەرەفە بەرەو موزدەلیفە (٣٠٨٧ - ٣١٠٣)
### باب: صفة السَّيْرِ في الدَّفْعِ مِنْ عَرَفَةَ

٧١٣- عَنْ عروة قَالَ: سُئِلَ أُسَامَةُ، وَأَنَا شَاهِدٌ (أَوْ قَالَ: سَأَلْتُ أُسَامَةَ بْنَ زَيْدٍ) (رضى الله عنهما) وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَرْدَفَهُ مِنْ عَرَفَاتٍ: كَيْفَ كَانَ يَسِيرُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ أَفَاضَ مِنْ عَرَفَةَ؟ قَالَ: كَانَ يَسِيرُ الْعَنَقَ، فَإِذَا وَجَدَ فَجْوَةً نَصَّ. {الحديث: ٣٠٩٤ = ٣٠٨١ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩١ = ١٦٦٦، ٢٩٩٩، ٤٤١٣. نسائي. حج: ٣٠١٨}:

عوروە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆم دانیشتبووم، لە خزمەت ئوسامەی کوڕی زەیدا، (ڕەزای خودایان لـێ بێ) کـە لێیـان پرسـی، یـا فـەرمووی بـۆ خـۆم لـە ئوسـامەی کـوڕی زەیدم پرسی: لە حـەجی ماڵاوایـیدا، ئەوکاتـەی کـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لـە عەرەفاتـەوە دەرچـوو بـۆ موزدەلیفـە، کـە بـەم کـردارە لـە زاراوی شـەرعی پـیرۆزدا دەگوترێ (دەفع) یا (إفاضة) لەم کاتەدا، لەڕێ چۆن دەڕۆیشت؟ فـەرمووی: بـەڕەوت وشترەکەی ژێری لێ دەخوڕی، ئەگەر بواریشی دەست بکەوتایە، وشترەکەیی تاودەدا).

فـەرمووی: لـەم حەجـەدا، پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لـە عەرەفـەوە بـەرەو موزدەلیفە کەوتەڕێ، ئوسامەی سوار کرد لە پاشکۆی خۆیەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٧٧ + تەجرید/٢، ژمارە: ٧٩٢ + ژمارە: ٧٩٥ + ٧٩٦}.

## ٥٦٤) نوێژی شێوانو خەوتنان لە موزدەلیفە
## باب: فِي صَلاَةِ المَغْرِبِ وَالعِشَاءِ بِالمزدَلِفَةِ

٧١٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: جَمَعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ، بِجَمْعٍ لَيْسَ بَيْنَهُمَا سَجْدَةٌ، وَصَلَّى الْمَغْرِبَ ثَلاَثَ رَكَعَاتٍ، وَصَلَّى الْعِشَاءَ رَكْعَتَيْنِ. فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُصَلِّى بِجَمْعٍ كَذَلِكَ حَتَّى لَحِقَ بِاللَّهِ. {الحديث: ٣٠٩٩ = ٣٠٨٦ فم. نسائى. حج: ٣٠٢٩. تحفة الأشراف: ٧٣٠٩}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) شـەوی دەفع لە عەرەفاتەوە بۆ مینا، نوێژی شێوانو خەوتنانی کۆکردەوەو بـە جەمعـە تـەئخیر، لـە موزدەلیفـە، ئـەو دوو نوێـژەی بـە کۆمـەڵی بۆمـان کـرد، نوێـژی سـوننەتی لـە بەینیانـدا نـەکرد، شـێوانی بەسـێ ڕکـات کـردو کـورتی نـەکردەوە، بـەڵام نوێـژی خەوتنانی، بە قەصرو جەمع بە دوو ڕکات کـرد بۆمـان. دەسـتووری ئیبنـو عومـەر وابوو، هەتا گەیشتەوە بەدیـداری خـودای گـەورە، لـە حەجـدا، ئـەم دوو نوێـژەی لـە جەمع (واتە: لە موزدەلیفە) لەسـەر ئـەم شـێوە دەکـرد کـە باسمـان کـرد). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٨٠ + ١٥٧٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

لەبەر یەکێ لەم دوو بۆنەی ناونانە، یـا لەبـەر هـەردوو بۆنەکـە بـە موزدەلیفـە دەگـوترێ: جـەمع، واتـە: کۆبوونـەوە چـونکە ئـادەمو حـەوواء، کاتـێ لـە بەهەشـت دەرکـران، لـەوێ یـەکیان گرتـەوە، یـا لەبەرئەوەیـە: چـونکە لـەوێ لـەکاتی حەجـدا نوێژی شێوانو خەوتنان کۆدەکرێنەوە.

## ٥٦٥) كردنی نوێژی شێوانو خەوتنان لە موزدەلیفە بەیەك قامەت (٣٠٨٧ - ٣١٠٣)
## باب: صَلاَةُ المغربِ والعشاءِ بالمزدلفَة بإقامةٍ واحدَة

٧١٥- عَنْ سَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍقَالَ: أَفَضْنَا مَعَ ابْنِ عُمَرَ حَتَّى أَتَيْنَا جَمْعًا فَصَلَّى بِنَا الْمَغْرِبَ وَالْعِشَاءَ بِإِقَامَةٍ وَاحِدَةٍ، ثُمَّ انْصَرَفَ فَقَالَ: هَكَذَا صَلَّى بِنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي هَذَا الْمَكَانِ. {الحديث: ٣١٠٣ = ٣٠٩٠ فم. أبو داود. حج: ١٩٣٠. ترمذي. حج: ٨٨٨. نسائی. صلاة: ٤٨٢. تحفة الأشراف: ٧٠٥٢}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێوارەی شەوی عەرەفە، کە لە عەرەفەوە جماین بۆ مینا، لە خزمەتی ئیبنو عومەردا کەوتینە ڕێ، کاتێ گەیشتینە موزدەلیفە لەوێ ئیبنو عومەر، بە جەمعە تەئخیر، نوێژی شێوانو خەوتنانی بە کۆمەڵی بۆ کردین، بەیەك قامەت، لە سەرەتای جەماعەتی نوێژی شێوانەوە قامەت کراو بەس، ئیبنو عومەر خۆی بەرنوێژییەکەی بۆمانکرد، لەپاشا جێ نوێژەکەی بەجێ هێشتو فەرمووی: ئا بەم شێوەیە، لەم شوێنەدا کە موزدەلیفەیە، لە حەجی مالاواییدا، پێغەمبەر خۆی ئەم دوو نوێژەی بەم شێوەیە بەیەك قامەت بۆ کردینو قامەتیان بۆ نوێژی خەوتنان نەکرد. بۆ ژیننامەی سەعیدی کوڕی جوبەیر، بڕوانە تەجریدی بوخاری بەرگی پێنجەم، چاپی یەکەم، ژمارە: ١٨٣٣. ڕوونکردنەوە.

## ٥٦٦) کردنی نوێژی بەیانی، لە موزدەلیفە، بە تاریكو لیڵەکە (٣١٠٤ – ٣١٠٥)
## بابٌ: التغليس بصَلاَةِ الصُّبْحِ بالمُزْدَلفَة

٧١٦- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رضى الله عنه) قَالَ: مَا رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) صَلَّى صَلاَةً إِلاَّ لِمِيقَاتِهَا إِلاَّ صَلاَتَيْنِ، صَلاَةَ الْمَغْرِبِ وَالْعِشَاءِ بِجَمْعٍ، وَصَلَّى الْفَجْرَ يَوْمَئِذٍ قَبْلَ مِيقَاتِهَا. {الحديث: ٣١٠٤ = ٣٠٩١ فم. بخاری/٢، رقم: ٧٩٥ = ١٦٨٣، ١٦٧٥، ١٦٨٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: نەمدیوە کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچ نوێژێ لەکاتی ئاسایی خۆیدا نەکا، جگە لەم دوو نوێژە:

یەکەم: نوێـژی شێوانو خـەوتنانی لـە موزدەلیفـە بەیەکـەوە بـە کۆکردنـەوەی دواخراو کردو نوێژی شێوانی دواخست تا کاتی نوێژی خەوتنان.

دووەم: ئەو ڕۆژە، نوێژی بەیانیشی لەپێش کاتی ئاسایی خۆیدا کردو بە تاریکو لێڵەکە لەگەڵ شەبەقدا کردی تا زوو بڕوا بۆ مەشعەرولحەرام. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٤، ژمارە: ١٥٨٠} .

## ٥٦٧) ڕۆیشتن لە موزدەلیفەوە بۆ مینا بەشەو بۆ ژنی گرانەڕۆ (٣١٠٦ - ٣١١٧)
## بابٌ: الإفاضَةُ مِنْ جَمْعٍ بلَيْلٍ للمَرْأَةِ الثقيلَةِ

٧١٧- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتِ: اسْتَأْذَنَتْ سَوْدَةُ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْلَةَ الْمُزْدَلِفَةِ تَـدْفَعُ قَبْلَـهُ، وَقَبْـلَ حَطْمَـةِ النَّـاسِ - وَكَانَـتِ امْـرَأَةً ثَبِطَـةً. (يَقُولُ الْقَاسِمُ: وَالثَّبِطَةُ الثَّقِيلَةُ ). قَالَتْ: فَأَذِنَ لَهَـا ، فَخَرَجَـتْ قَبْـلَ دَفْعِـهِ، وَحَبَسَـنَا حَتَّـى أَصْبَحْنَا ، فَدَفَعْنَا بِدَفْعِهِ، وَلأَنْ أَكُونَ اسْـتَأْذَنْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) كَمَـا اسْتَأْذَنَتْهُ سَوْدَةُ فَأَكُونَ أَدْفَعُ بِإِذْنِهِ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ مَفْرُوحٍ بِهِ. {الحديث: ٣١٠٦ = ٣٠٩٣ فم. تجريد/٢ ، رقم: ٧٩٤ = ١٦٨١. تحفة الأشراف: ١٧٤٧٣} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەودەی دایکی موسوڵمانان، ئافرەتێکی قەبەی گرانەڕۆ بـوو، لەبەرئـەوە شـەوی موزدەلیفـە، داوای لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە ڕێگەی پێبدا، کە بەشەو لە موزدەلیفەوە بڕوات بۆ مینا لەگەڵ لازە بوونو بێ هێزەکانا، بەرلەوە کە خەڵکەکە بیکەن بە قەرەباڵغیو جەنجاڵی، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەوەی پێدا، جا سەودە لەپێش ئـەوەدا کـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەربچێ، ئەو دەرچوو بۆ مینا، بەڵام ئێمـە لـە موزدەلیفـە گلمـان خـوارد هەتا ڕۆژمان لێ بۆوە، ئەوجا کە پێغەمبەر بەڕێکەوت، ئێمەیش لەگەڵ ئەودا بـەڕێ کەوتین، خۆزگەم منیش کاتی خـۆی، وەك سـەودە، بـۆ ئەمـە مۆڵـەتم لـە پێغەمبـەر وەردەگرتو ئێستا لەکاتی حـەج کردنـدا، لـە شـەوی موزدەلیفـەدا ئـەوەم جێبـەجێ دەکرد، لەسەر ئەو ڕێپێدانەی ئەو، بەڕاستی شت نییـە کـە وەك ئـەو مۆڵەتـە پـێم خۆش بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ١٥٨٣، ١٥٨٤} .

قاسمی کوڕی موحەممەدی کوڕی ئەبوبەکری صەدیق، کە برازای حەزرەتی عائیشەیە، فەرمووی: وشەی (ثَبِطَةٌ) کە لەدەقی عەرەبییەکەدا هاتووە، بە واتا (ثَقِیلَةٌ)یە، واتە: قورس‌و گرانەڕۆ.

## ٥٦٨) پێشخستنی ژنان لە موزدەلیفە
## بابٌ: تَقدِیمُ الظَّعْنِ مِنْ مُزْدَلِفَة

٧١٨- عَنِ عَبْدُ اللَّهِ مَوْلَى أَسْمَاءَ قَالَ: قَالَتْ لِي أَسْمَاءُ وَهْيَ عِنْدَ دَارِ الْمُزْدَلِفَةِ: هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: لاَ، فَصَلَّتْ سَاعَةً، ثُمَّ قَالَتْ: يَا بُنَيَّ هَلْ غَابَ الْقَمَرُ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَتْ: ارْحَلْ بِي، فَارْتَحَلْنَا حَتَّى رَمَتِ الْجَمْرَةَ، ثُمَّ صَلَّتْ فِي مَنْزِلِهَا، فَقُلْتُ لَهَا: أَيْ هَنْتَاهْ لَقَدْ غَلَّسْنَا، قَالَتْ: كَلاَّ أَيْ بُنَيَّ إِنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَذِنَ لِلظُّعُنِ. {الحديث: ٣١١٠ = ٣٠٩٧ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٩٣ = ١٦٧٩. تحفة الأشراف: ١٥٧٢٢}:

عەبدوڵڵای مەولای ئەسمای کچی ئەبوبەکری صەدیق، (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: شەوی موزدەلیفە، کە شەوی جەژنی قوربانە، کە پێی دەگوترێ: شەوی جەمع، چونکە نوێژی شێوان‌و خەوتنان لەوێ کۆدەکرێنەوە، لە خزمەتی ئەسماءدا بووم، خەریکی ئەنجام دانی حەج بوو، لە موزدەلیفە دابەزی بوو، هەستا تاوێ دەستی کرد بە نوێژ کردن، پاشان پێی فەرمووم: ڕۆڵەکەم! ئا بزانە مانگ ئاوا بووە؟ گوتم: نەء، دیسان تاوێ تریش دەستی کردەوە بەشەو نوێژ، دیسان فەرموویەوە: ئایا مانگ ئاوا بوو؟ گوتم: بەڵێ. فەرمووی: کەواتە بارکەن بابڕۆین بۆ ڕەجمی شەیتانی گەورە، جا کەوتینەوە ڕێگەو ڕۆیشتین هەتا ڕەجمی شەیتانی کرد، لە کۆگا بەردەکەی عەقەبە، کە پێی دەگوترێ: (جمرة العقبة: الجمرة الكبرى: کۆگا بەردەکەی عەقەبە) ئینجا ئەسماء گەڕایەوە بۆ هەوارەکەی مینای، وە لەوێ نوێژی بەیانی کرد، منیش پێم گوت: خانم! وا دەزانم زوو ڕۆیشتین لە موزدەلیفەوە بۆ بەردە باران کردنی شەیتان، هەروا زوویش گەڕاینەوە لە ڕەجمی شەیتانەوە بۆ هەواری مینامان؟ فەرمووی: کوڕی شیرینم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی ژنانی داوە،

که بەشەو لە موزدەلیفەوە بکەونەڕێ بۆ مینا، وە بەر لە جەنجاڵی و قەرەباڵغی، رەجمی شەیتان ئەنجام بدەن و نوێژی بەیانی لە مینا بکەن، بۆیەکا منیش وەهام کرد.

## ٥٦٩) پێشخستنی زەبوونەکان لە موزدەلیفە. واتە: لازەبوون (زەعیف)ەکان لە پێشەوە دەڕۆن بۆ مینا

## باب: تقديم الضُّعفاءِ مِنْ مُزْدَلِفَةَ

٧١٩- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: بَعَثَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى الثَّقَلِ أَوْ قَالَ فِى الضَّعَفَةِ مِنْ جَمْعٍ بِلَيْلٍ. {الحديث: ٣١١٣ = ٣١٠١ فم. بخارى. حج: ١٦٧٧، ١٦٧٨، ١٨٥٦. أبو داود. حج: ١٩٣٩. نسائى. حج: ٣٠٣٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەگەڵ بارگەکەدا، یا فەرمووی: لەگەڵ زەبوونەکاندا، کە شەوی موزدەلیفە لە پێشەوە ناردنی بۆ مینا، منیشی لەگەڵ ئەواندا بەشەو نارد. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٥، ژمارە: ١٥٨٤}.

٧٢٠- عَنِ سَالِمَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ يُقَدِّمُ ضَعَفَةَ أَهْلِهِ، فَيَقِفُونَ عِنْدَ الْمَشْعَرِ الْحَرَامِ بِالْمُزْدَلِفَةِ بِاللَّيْلِ، فَيَذْكُرُونَ اللَّهَ مَا بَدَا لَهُمْ، ثُمَّ يَدْفَعُونَ قَبْلَ أَنْ يَقِفَ الإِمَامُ، وَقَبْلَ أَنْ يَدْفَعَ، فَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ مِنًى لِصَلاَةِ الْفَجْرِ وَمِنْهُمْ مَنْ يَقْدَمُ بَعْدَ ذَلِكَ، فَإِذَا قَدِمُوا رَمَوُا الْجَمْرَةَ، وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَقُولُ: أَرْخَصَ فِى أُولَئِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣١١٧ = ٣١٠٥ فم. بخارى: ١٦٧٦}:

سالمی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: دەستووری باوکم وابوو، کە دەچوو بۆ حەج، شەوی جەژن، لازەبوونەکانی کەسوکاری خۆی پێش دەخست، لە موزدەلیفەوە دەچوون بۆ مەشعەرولحەرام، کە کێوێکە وا لە داوێنی موزدەلیفەوە، وە لەوێ وەستانی مەشعەرولحەرامیان لەشەودا ئەنجام دەداو نزاو پاڕانەوەو یادی خودایان دەکرد، ئەوەندەی دەیانویست، ئەوجا بەر لە راوەستانی میر حەج و لەپێش دەرچوونی ئەودا، دەکەوتنە ڕێ بۆ مینا، بۆ بەردە

بناران كردن (رەجم)ی شەیتان، جا هەیانبوو كە دەگەیشتە مینا، كاتی نوێژی بەیانی بوو، هەیان بوو كە دەگەیشتنە ئەوێ كاتی نوێژی بەیانی نەمابوو، كە دەگەیشتنە جێ رەجمی شەیتانیان دەكرد، گەڵێ جار لەپێش خۆركەوتنا رەجمی شەیتانیان دەكرد).

ئیبنو عومەر دەیفەرموو: پێغەمبەر خۆی، (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەم جۆرە كەسانە مۆڵەتی ئەمەی داوە).

**٥٧٠) تەلبییە كردنی حاجی بەردەوامە هەتا یەكەم رۆژی جەژن رەجمی شەیتانی گەورە دەكا، كەوا لە عەقەبە.** (٣٠٧٦ - ٣٠٨٢)

**باب: تلبية الحاج حتى يَرْمِيَ جَمْرَةَ العَقَبَة**

٧٢١- عَنِ عَطَاءٌ عَن ابْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) أَرْدَفَ الْفَضْلَ مِنْ جَمْعٍ قَالَ: فَأَخْبَرَنِي ابْنُ عَبَّاسٍ أَنَّ الْفَضْلَ أَخْبَرَهُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) لَمْ يَزَلْ يُلَبِّي حَتَّى رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ. {الحديث: ٣٠٧٧ = ٣٠٦٣ فم. أبو داود. حج: ١٨١٥. ترمذي. حج: ٩١٨. نسائي. حج: ٣٠٥٥}:

عەتاء (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەحەجی ماڵاواییدا، ئوسامەی كوڕی زەید لە پاشكۆی پێغەمبەرەوە سواربوو لە كێوی عەرەفەوە هەتا موزدەلیفە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە موزدەلیفەوە هەتا مینا، فەزڵی كوڕی عەبباسی خستە پاشكۆی خۆی، ئیبنو عەبباس فەرمووی: هەردووكیان: ئوسامەو فەزڵ دەیانفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو ماوەیەشدا هەر سەرگەرمی (لَبَّيْكَ) كردن بوو، هەتا رەجمی شەیتانی تەواو كرد، لە كۆگا بەردەكەی جەمرەتولعەقەبە، لەرۆژی یەكەمی جەژندا، ئیتر وازی لە تەلبییە هێنا). {بڕوانە: ژمارە: ٧١٢}.

**٥٧١) لەناو شیوەکەوە بەرد فڕێ ئەدرێ بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە، وە لەگەڵ فڕەدانی هەموو بەردێکا ئەڵلاهو ئەکبەر دەکا (٣١١٨ - ٣١٢٣)**

**باب: رَمْىُ جَمْرَةِ الْعَقَبَةِ مِنْ بَطْنِ الْوَادِى وَالتكبير مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ**

٧٢٢- عَنِ الأَعْمَشِ قَالَ: سَمِعْتُ الْحَجَّاجَ بْنَ يُوسُفَ يَقُولُ وَهُوَ يَخْطُبُ عَلَى الْمِنْبَرِ: أَلِّفُوا الْقُرْآنَ كَمَا أَلَّفَهُ جِبْرِيلُ، السُّورَةُ الَّتِى يُذْكَرُ فِيهَا الْبَقَرَةُ، وَالسُّورَةُ الَّتِى يُذْكَرُ فِيهَا النِّسَاءُ، وَالسُّورَةُ الَّتِى يُذْكَرُ فِيهَا آلُ عِمْرَانَ، قَالَ: فَلَقِيتُ إِبْرَاهِيمَ فَأَخْبَرْتُهُ بِقَوْلِهِ، فَسَبَّهُ، وَقَالَ: حَدَّثَنِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ يَزِيدَ أَنَّهُ كَانَ مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ فَأَتَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ فَاسْتَبْطَنَ الْوَادِىَ، فَاسْتَعْرَضَهَا فَرَمَاهَا مِنْ بَطْنِ الْوَادِى بِسَبْعِ حَصَيَاتٍ يُكَبِّرُ مَعَ كُلِّ حَصَاةٍ، قَالَ: فَقُلْتُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ إِنَّ النَّاسَ يَرْمُونَهَا مِنْ فَوْقِهَا، فَقَالَ: هَذَا وَالَّذِى لاَ إِلَهَ غَيْرُهُ مَقَامُ الَّذِى أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ. {الحديث: ٣١١٩ = ٣١٠٧ فم. تجريد/٢، رقم: ٨١٢ = ١٧٤٧، ١٧٤٨، ١٧٤٩، ١٧٥٠. أبو داود. حج: ١٩٧٤. ترمذى. حج: ٩٠١. نسائى. حج: ٣٠٧٠. ابن ماجة. مناسك: ٣٠٣٠ تحفة الأشراف: ٩٣٨٢}:

ئەعمەش (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ حەجاجی کوڕی یوسفی ئەلثەقەفی، وتاری دەدا، گوێم لێ بوو، لەکاتی وتارەکەدا، لەسەر دوانگە دەیگوت: ئایەتەکانی قورئان لەگەڵ یەکتریدا، لەپاڵ یەکا دابنێن، لەسەر شێوەی ریزکردنی حەزرەتی جوبرائیل، وەك پێغەمبەر لە ژیانیدا چەسپاندوویەتی، بەڵام مەڵێن: سوورەتی بەقەرە، واتە: سوورەتی چێل، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کە باسی مانگای تیاکراوە، هەروا مەڵێن: سوورەتی نیساء، واتە: سوورەتی ژنان، بەڵکوو بڵێن: ئەو سوورەتەی کە باسی ژنانی واتیادا، هەروا سوورەتی ئالی عیمران!

ئەعمەش فەرمووی: جا کاتێ بەخزمەتی ئیبراهیمی نەخەعی گەیشتم، قسەکەی حەجاجم بۆی گێڕایەوە، ئەویش جمێنی بە حەجاج دا، چونکە زۆردارو ستەمکار بوو، ئەوجا فەرمووی: عەبدورەحمانی کوڕی یەزید، قسەی بۆ کردووم، فەرمووی: لەخزمەت عەبدوڵلای کوڕی مەسعووددا چووم بۆ حەج، کاتێ چووین بۆ رەجمی کۆگا بەردەکەی عەقەبە، لەناو شیوەکەوە، لە خوارەوە بۆ سەرەوە، لە تەنیشتی کۆگا بەردەکەوە، بەردی فڕێ دەدا بۆی، حەوت بەردی بەرودوا تێ گرت،

لەگەڵ هەموو بەردێکا ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد،، عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەرزی ئیبنو مەسعوودم کرد: ئەی باوکی عەبدوڕەحمان! هەندێ کەس لەلای سەرووی شیوەکەوە بەردی بۆ فڕێ دەدەن؟ ئەویش فەرمووی: بەخودای تاک‌و تەنیا، ئائەم جێگەیە، کەمن ڕەجمی شەیتانم لێیەوە کرد، ئەو جێگەیەیە کە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕەجمی شەیتانی لێیەوە کرد، لەکاتی حەجەکەیدا، کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە، کە ئەو سوورەتەیە زوربەی یاساو دەستوورەکانی حەج‌و عەمرەی واتیادا، کەواتە: دروستە بگوترێ: سوورەتی بەقەرە، یا سوورەتی نیساء.... تاد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ١٥٩١} :

٧٢٣- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ يَزِيدَ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ لَبَّى حِينَ أَفَاضَ مِنْ جَمْعٍ فَقِيلَ: أَعْرَابِيٌّ هَذَا؟! فَقَالَ عَبْدُ اللَّهِ: أَنَسِيَ النَّاسُ أَمْ ضَلُّوا؟! سَمِعْتُ الَّذِى أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ سُورَةُ الْبَقَرَةِ يَقُولُ فِى هَذَا الْمَكَانِ: « لَبَّيْكَ اللَّهُمَّ لَبَّيْكَ ». {الحديث: ٣٠٨٠ = ٣٠٦٧ فم} :

عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزید (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ لە موزدەلیفە دەرچوو بۆ ڕەجمی شەیتان، تەلبییەی دەکردو دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللهُمَّ لَبَّيْكَ). هەندێ کەس بەتەوسەوە پێیان گوت: دیارە ئەمە عەرەبی دەشتەکییە، بۆیە دەستووری لەببەیکە کردن نازانێ، کاتی تەلبییە کردن تەواو بووە؟ کە ئەم ڕەخنەیە گەیشتەوە بە ئیبنو مەسعوود، بەم شێوەیە ڕەددی دایەوەو فەرمووی: چ عەجەب وازوو ئەم خەڵکە ئەم سوننەتەیان لەبیر چوو، یا خوانەخواست سەریان لێ شێواوە؟! من لەخۆمەوە شتی وا ناکەم، لەمەدا پەیڕەوی پێغەمبەر دەکەم، چونکە بەگوێی خۆم بیستم لە پێغەمبەر خۆی، (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سوورەتی بەقەرەی بۆ هاتووە، کە زۆرینەی یاساو ڕێساکانی حەج‌و عەمرە وان لەم سوورەتەدا، من لە پێغەمبەرم بیست لە حەجەکەیدا، لەم شوێن‌و کاتەدا، تەلبییەی دەکردو دەیفەرموو: (لَبَّيْكَ اللُّمَّ لبيك).

### ٥٧٢) ڕەجمی جەمرەتولعەقەبە لەڕۆژی جەژندا بەسواری وڵاخ (٣١٢٤ - ٣١٢٦)
### باب: رمي جمرة العقبَة يَوْمَ النحْرِ على الرَّاحِلَة

٧٢٤- عَنِ جَابِر (رضى الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَرْمِى عَلَى رَاحِلَتِهِ يَوْمَ النَّحْرِ. وَيَقُولُ: « لِتَأْخُذُوا مَنَاسِكَكُمْ، فَإِنِّى لاَ أَدْرِى لَعَلِّى لاَ أَحُجُّ بَعْدَ حَجَّتِى هَذِهِ ». {الحديث: ٣١٢٤ = ٣١١٢ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ڕۆژی جەژنی قوربان پێغەمبەرم دی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری وڵاخەکەی، ڕەجمی شەیتانی دەکردو دەیفەرموو: (یاساو دەستوورو کردارو گفتارەکانی حەج ئەمانەن کەمن لەبەر چاوی ئێوە ئەنجامیان دەدەم لەم حەجەدا، دەی ئێوەش لەمنەوە وەریان بگرن‌و فێریان ببن‌و کارو ڕەفتیان پێ بکەن، چونکە من نازانم لەوانەیە حەجی ترم بەنصیب نەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ١٥٩٢}.

### ٥٧٣) ئەندازەی بەردی ڕەجمی شەیتان (٣١٢٧)
### بابٌ: قدر حصَى الجمار

٧٢٥- عَنْ جَابِرَ (رضى الله عنه) قَالَ: رَأَيْتُ رسولَ اللّه (صلى الله عليه وسلم) رَمَى الْجَمْرَةَ بِمِثْلِ حَصَى الْخَذْفِ. {الحديث: ٣١٢٧ = ٣١١٥}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرم بینی ڕەجمی کۆگا بەردەکەی دەکرد، بەردەکان بەقەد چەوی بەلەپیتکە دەبوون!

### ٥٧٤) کاتی ڕەجمی شەیتان. (٣١٢٨ - ٣١٢٩)
### وَقْتُ الرَّمْي

٧٢٦- عَنْ جَابِرِ (رضى الله عنه) قَالَ: رَمَى رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْجَمْرَةَ يَوْمَ النَّحْرِ ضُحًى، وَأَمَّا بَعْدُ ذلك، فَإِذَا زَالَتِ الشَّمْسُ. {الحديث: ٣١٢٨ = ٣١١٦ فم. بخارى: ٣٠٦٥. أبو داود. حج: ١٩٧١}:

**جابير** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەرۆژی یەکەمی جەژنا، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کەشەیتانی جەمرەتولعەقەبەی بەردەباران کرد، کات چێشتەنگاو بوو، بەلام ڕۆژەکانی تر لەپاش نیوەڕۆ شەیتانی سەنگەسار دەکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٧، ژمارە: ١٥٩٣}.**

**٥٧٥) ژمارەی ئەو بەردانەی کە ڕەجمی شەیتانیان پێ دەکرێ، دەبێ تاك بن** (٣١٣٠)
**باب: رَمْيُ الجِمَارِ تَوٌّ**

**٧٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): «الاِسْتِجْمَارُ تَوٌّ وَرَمْيُ الْجِمَارِ تَوٌّ، وَالسَّعْىُ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ تَوٌّ، وَالطَّوَافُ تَوٌّ، وَإِذَا اسْتَجْمَرَ أَحَدُكُمْ فَلْيَسْتَجْمِرْ بِتَوٍّ». {الحديث: ٣١٣٠ = ٣١١٨ فم}:**

**جابیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ: (جارەکانی تارات گرتن بە بەرد سوننەتە تاك بن، وەك سێ‌جار، یا پێنج جار، ژمارەی ئەو بەردانەی کە لەکاتی ڕەجمی شەیتانا، فڕێ دەدرێن بۆ کۆگا بەردەکان دەبێ تاك بن، کە هەرجارەی حەوت وردە بەردە، ڕاکردنی نێوان صەفاو مەڕوە تاکە، تەوافی بەیت تاکە، ئەگەر کەسێکیش لەئێوە بە بەرد تاراتی گرتو بە بەرد خۆی پاك کردەوە لەکاتی سەراوا، با ژمارەی بەردەکان تاك بێ).**

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەس موسلیم گێڕاویەتەوە، کەسی تر دەری نەهێناوە.

**٥٧٦) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئیحرام شکاندنی حەجەکەی، سەری خۆی تاشی.** (٣١٣٩ - ٣١٤٢)
**باب: حلق النبي {صلى الله عليه وسلم} في حَجّه**

**٧٢٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَلَقَ رَأْسَهُ فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ. {الحديث: ٣١٣٨ = ٣١٢٦ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٧ = ١٧٢٦، ٤٤١٠، ٤٤١١. أبو داود. حج: ١٩٨. تحفة الأشراف: ١٤٥٦}:**

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجەکەیدا، کە لەساڵی حەجی ماڵاواییدا ئەنجامی دا، لەپاش تەواوکردنی کردارەکانی حەج، بۆ ئیحرام شکاندن سەری خۆی تاشی). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١١١ + زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ١٥٩٦}.

## ٥٧٧) سەرتاشینو مووی سەر کورتکردنەوە. (٣١٣١ - ٣١٣٨)

## باب: في الحلق والتقصير

٧٢٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ، قَالَ: « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ، قَالَ « اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُحَلِّقِينَ ». قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلِلْمُقَصِّرِينَ. قَالَ: « وَلِلْمُقَصِّرِينَ ». {الحديث: ٣١٣٥ = ٣١٢٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٩ = ١٧٢٨ فتح الباري. تحفة الأشراف: ١٤٩٠٤}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆئەوەی** موسوڵمانان حاڵی بکا، کە لەپاش حەجو عەمرە، سەرتاشین خێرترە لەسەر کورتکردنەوە، فەرمووی: (خودایە! لەو کەسانە خۆشبە، کە لەپاش تەواوکردنی حەجو عەمرە سەری خۆیان دەتاشن). یارانیش فەرموویان: قوربان ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەش کە لەپاش حەجو عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دیسان فەرموویەوە: (خودایە! لەو کەسانە خۆش بە، کە لەپاش حەجو عەمرە سەری خۆیان دەتاشن). دیسانەوە یارانی پێغەمبەر عەرزیان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەجو عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە؟ بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سێ بارە فەرموویەوە: (خودایە! لەوکەسانە خۆشبە، کە لەپاش حەجو عەمرە سەری خۆیان دەتاشن).

هەمدیسانەوە عەرزی پێغەمبەریان کردەوە: ئەی پێغەمبەری خودا! داوای لێخۆشبوون لەخودا بکە بۆ ئەو کەسانەیش کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورمت دەکەنەوە؟ ئەوجا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دوعای لێخۆشبوونی بۆ ئەوانیش کردو فەرمووی: (خودایە! لەو کەسانەیش خۆشبە کە لەپاش حەج و عەمرە، مووی سەریان کورت دەکەنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٥}.

### ٥٧٨) لەپێشا ڕەجمی شەیتان، ئەوجا ئاژەڵ سەربڕین، ئەنجا سەرتاشین، لەسەر تاشینا لای ڕاست پێش دەخرێ. (٣١٣٩ - ٣١٤٢)

### باب: الرمي ثمَّ النحر ثمَّ الحلْقُ، والبدايةُ بالحلْقِ بالجانب الأيْمن

٧٣٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَمَى جَمْرَةَ الْعَقَبَةِ ثُمَّ انْصرَفَ إِلَى الْبُدْنِ فَنَحَرَهَا، وَالْحَجَّامُ جَالِسٌ، وَقَالَ بِيَدِهِ عَنْ رَأْسِهِ فَحَلَقَ شِقَّهُ الأَيْمَنَ فَقَسَمَهُ فِيمَنْ يَلِيهِ ثُمَّ قَالَ: « احْلِقِ الشِّقَّ الآخَرَ »، فَقَالَ: « أَيْنَ أَبُو طَلْحَةَ »؟ فَأَعْطَاهُ إِيَّاهُ. {الحديث: ٣١٤١ = ٣١٢٩ فم. تجريد/١، رقم: ١٣١ = ١٧١، ١٧٠. أبو داود. حج: ١٩٨١. ترمذى. حج: ٩١٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجەکەیدا، ڕۆژی یەکەمی جەژن، ڕۆیشت بۆ میناو چوو بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبەو حەوت بەردی بۆ فڕێ داو، ئەوجا هاتەوە بۆ بارەگاکەی خۆی لە میناو، لەوێ وشترە دیارییەکانی خانەی خودای سەربڕی، سەرتاشەکە دانیشتبوو، وە بەدەستی ئاماژەی بۆ سەرتاشەکە کرد، کە لای ڕاستی سەری بتاشێ، ئەویش لای ڕاستی سەری تاشی، فەرمانی فەرموو دابەشیان کرد بەسەر عەشاماتەکەی دەوریدا، ئەوجا پێی فەرموو: (لای چەپی سەریشم بتاشە) ئەویش تاشی، جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەبو طەلحە کوانێ؟) جا قژە سەرە تاشراوەکەی داپێی). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٦ + زنجیرە: ١٠٨، ژمارە: ١٥٩٦}.

له فەتحولولهیمدا دەفەرموێ: (ئەبو حەنیفە (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەلای سەرتاشێ سەرمم تاشی، سەرتاشەکە ئەم سێ هەڵەیەی لێم گرت، کاتێ دانیشتم بەرەو رووگە نەبووم، گوتی: رووەو قیبلە دانیشە، لای چەپم تێ کرد کە بیتاشێ، گوتی: بەلای راست دەست پێ بکە، کاتێ سەری تاشیم ویستم بڕۆم، گوتی: قژە سەرەکەت بنێژەو لە شوێنێکی گونجاودا بیشارەوە، منیش گەڕامەوەو ناشتمو هەرسێ شتەکەم بەگوێ کرد!!).

**٥٧٩) کەسێ لەپێش ئاژەڵ سەربڕینا سەری بتاشێ، یا ئاژەڵە دیارییەکە سەربڕێ لەپێش رەجمی شەیتانا.** (٣١٤٣ - ٣١٥١)

**باب: مَنْ حلَقَ قَبْلَ النَّحْرِ أَوْ نحرَ قبْلَ الرَّمْيِ**

٧٣١- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) قَالَ: وَقَفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى رَاحِلَتِهِ، فَطَفِقَ نَاسٌ يَسْأَلُونَهُ: فَيَقُولُ الْقَائِلُ مِنْهُمْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى لَمْ أَكُنْ أَشْعُرُ أَنَّ الرَّمْىَ قَبْلَ النَّحْرِ، فَنَحَرْتُ قَبْلَ الرَّمْيِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَارْمِ وَلاَ حَرَجَ ». قَالَ وَطَفِقَ آخَرُ يَقُولُ: إِنِّى لَمْ أَشْعُرْ أَنَّ النَّحْرَ قَبْلَ الْحَلْقِ، فَحَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَنْحَرَ، فَيَقُولُ: « انْحَرْ وَلاَ حَرَجَ ». قَالَ: فَمَا سَمِعْتُهُ يُسْأَلُ يَوْمَئِذٍ عَنْ أَمْرٍ مِمَّا يَنْسَى الْمَرْءُ وَيَجْهَلُ مِنْ تَقْدِيمِ بَعْضِ الأُمُورِ قَبْلَ بَعْضٍ وَأَشْبَاهِهَا إِلاَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « افْعَلُوا ذَلِكَ وَلاَ حَرَجَ ». {الحديث: ٣١٤٤ = ٣١٣٢ فم. تجريد/١، رقم: ٧٣ = ٨٣، ١٢٤، ١٧٣٦، ١٧٣٧، ١٧٣٨، ٦٦٦٥. أبو داود. حج: ٢٠١٤. ترمذي. حج: ٩١٦. تحفة الأشراف: ٨٩٠٦}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودا لەخۆیو باوکی بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجی مالاواییدا، لەمینا، بەسواری وشترەکەی ژێری راوەستا، هەتا موسوڵمانان پرسیاری لێ بکەن، لەبارەی رێو رەسمی حەجەوە، پرسیار کەرێ گوتی: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من نەمزانی کە رەجمی شەیتان لەپێش ئاژەڵ سەربڕینایە، لەبەرئەوە ئاژەڵەکەم سەربڕی لەپێش رەجمی شەیتانا؟ فەرمووی: (بڕۆ رەجمی شەیتان بکە، قەیناکا).

فەرمووی: یەکێ تر گوتی: من نەمزانی کەسەر بڕینی ئاژەڵی دیاری والەپێش سەرتاشینەوە، لەبەرئەوە سەرمم تاشی لەپێش سەربڕینی ئاژەڵەکەدا؟ فەرمووی: (ئاژەڵەکەت سەربڕە قەیناکا).

عەبدوڵلا فەرمووی: ئیتر ئەو رۆژزە، هەرچییان لێی دەپرسی، سەبارەت بەو شتانە کە مرۆڤ لەبیری چوو بوو، یا نەیزانیبوو، ئایا پێش و پاشی خستبوو، یا شتێ وا، دەمبیست لێی لە وەڵامیانا دەیفەرموو: (بیکەن قەیناکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١١١، ژمارە: ١٦٠٦ م}.

٧٣٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَتَاهُ رَجُلٌ يَوْمَ النَّحْرِ وَهُوَ وَاقِفٌ عِنْدَ الْجَمْرَةِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّى حَلَقْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِىَ فَقَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ ». وَأَتَاهُ آخَرُ، فَقَالَ: إِنِّى ذَبَحْتُ قَبْلَ أَنْ أَرْمِىَ، قَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ »، وَأَتَاهُ آخَرُ فَقَالَ: إِنِّى أَفَضْتُ إِلَى الْبَيْتِ، قَبْلَ أَنْ أَرْمِىَ، قَالَ: « ارْمِ وَلاَ حَرَجَ »، قَالَ: فَمَا رَأَيْتُهُ سُئِلَ يَوْمَئِذٍ عَنْ شَىْءٍ إِلاَّ قَالَ: « افْعَلُوا وَلاَ حَرَجَ». {الحديث: ٣١٥٠ = ٣١٣٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣}:

عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) رۆژی جەژن، لەلای جەمرەتول عەقەبە وەستابوو، بۆ وەڵامی پرسیاری حاجیان، گوێم لێ بوو پیاوێ هاتە خزمەتی لێی پرسی، گوتی: قوربان! من لەپێش ئەوەدا رەجمی شەیتان بکەم، سەرم تاشی؟ فەرمووی: (قەیناکە بڕۆ رەجمی شەیتان بکە) حاجییەکی تر هات بۆ خزمەتی، عەرزی کرد: قوربان! من بەرلەوە بەرد فرێ بدەم بۆ کۆگا بەردەکەی عەقەبە، ئاژەڵەکەم سەربڕی؟ فەرمووی: (قەیناکە بڕۆ بەردی بۆ فرێ بدە). حاجییەکی تر هاتە خزمەتی، گوتی: قوربان! من بەرلە رەجمی شەیتان رۆیشتم تەوافول ئیفاضەم ئەنجامدا؟ فەرمووی: (قەیناکە بڕۆ بۆ بەردە باران (رەجمی شەیتان). فەرمووی: ئەوەی کەمن ئەو رۆژە لە پێغەمبەرم بینی ئەمەبوو: پرسیاری هەرچی لێ دەکرا، لەم جۆرە پرسیارانە، هەر دەیفەرموو: (بیکەن قەیناکا).

## ٥٨٠) نیشانەكردنی دیاریی خانەی خودا لەكاتی ئیحرام دابەستندا (٣٠٠٦ - ٣٠٠٨)

## باب: تَقْليدُ الهَدْيِ وإشْعارُهُ عِنْدَ الإحْرام

٧٣٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الظُّهْرَ بِذِى الْحُلَيْفَةِ، ثُمَّ دَعَا بِنَاقَتِهِ فَأَشْعَرَهَا فِى صَفْحَةِ سَنَامِهَا الأَيْمَنِ وَسَلَتَ الدَّمَ، وَقَلَّدَهَا نَعْلَيْنِ، ثُمَّ رَكِبَ رَاحِلَتَهُ، فَلَمَّا اسْتَوَتْ بِهِ عَلَى الْبَيْدَاءِ أَهَلَّ بِالْحَجِّ. {الحديث: ٣٠٠٦ = ٢٩٩٢ فم. أبو داود. حج: ١٧٥٢. ترمذى. حج: ٩٠٦. نسائى. حج: ٢٧٧٢. تحفة الأشراف: ٦٤٥٩} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نوێژی نیوەڕۆی لەبیری عەلی (ذولحولةيفة) كرد، ئەوجا داوای كرد وشترێ لە وشترە دیارییەكانی ماڵی خودایان بۆ هێنا، لەسەر ئەم شێوەیە نیشانەی كرد: بە تیغ لای ڕاستی دووگی تەرەكاندەوەو خوێنەكەی هەڵسوی لەلا دووگی، وە جووتێ سۆلی كرد بە گەردن بەند بۆیو وەك گوڵەنگ هەڵی واسین بە گەردنیاو، ئەمەیش بۆئەوەیە تا خەڵك بزانن كە ئەوە دیاری بەستەو دەستی بۆ نەبەنو هەركەسێ هەوەجێی پێی هەیە با شوێنی بكەوێ بۆ كاتی سەربڕین، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سواری وڵاخەكەی ژێری بووەوە، كە وشترە مێنگەیێ بوو، ناوی قەصواء بوو، ڕۆیشت تا بەسواری سەركەوتە سەر كێوی بەیداء، ئەوجا ئیحرامی حەجی دابەستو نیێتی هێنا). {تاج/٢، ژمارە: ١٦٥٨، زنجیرە: ١٢٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١١٩، ژمارە: ١٦٣٢} .

## ٥٨١) كەسێ بێ ئیحرام بێ. دیاریی دەنێرێو نیشانەی دەكا (٣١٨١ - ٣١٩٤)

## باب: البعث بالهَدْيِ وتَقْليدُها وهُوَ حلالٌ

٧٣٤- عَنْ عَمْرَةَ بِنْتِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ: أَنَّ ابْنَ زِيَادٍ كَتَبَ إِلَى عَائِشَةَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ قَالَ: مَنْ أَهْدَى هَدْيًا حَرُمَ عَلَيْهِ مَا يَحْرُمُ عَلَى الْحَاجِّ حَتَّى يُنْحَرَ الْهَدْىُ، وَقَدْ بَعَثْتُ بِهَدْيِى فَاكْتُبِى إِلَىَّ بِأَمْرِكِ. قَالَتْ عَمْرَةُ: قَالَتْ عَائِشَةُ: لَيْسَ كَمَا قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ. أَنَا فَتَلْتُ

قَلاَئِدَ هَدْيِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِيَدَيَّ ثُمَّ قَلَّدَهَا رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) بِيَدِهِ ثُمَّ بَعَثَ بِهَا مَعَ أَبِى، فَلَمْ يَحْرُمْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَىْءٌ أَحَلَّهُ اللَّهُ لَهُ حَتَّى نُحِرَ الْهَدْىُ. {الحديث: ٣١٩٢ = ٣١٨١ فـم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٠ = ١٧٠٠، ١٦٩٦، ١٦٩٨، ١٦٩٩، ١٧٠١، ١٧٠٢، ١٧٠٣، ١٧٠٤، ١٧٠٥، ٢٣١٧، ٥٥٦٦. نسائى. حج: ٢٧٩٢}:

عەمرەی كچی عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەبدوڵڵای كوڕی زیاد، كاغەزی نووسی، بۆ عائیشە: كە عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس دەفەرموێ: گوایە هەركەسێ ئاژەڵی دیاریی بنێرێ بۆ هەژارانی بەستی مەككە، ئیتر ئەوەی كە لەكاتی حەجكردنا، لە حاجی حەرام دەبێ، وەك بۆنی خۆشو جیماعو جلی دووراوو سەرتاشین، لەویش حەرام دەبێ، هەتا ئاژەڵە دیارییەكەی لە كاتو جێگەی خۆیدا سەردەبڕێ، ئەوسا چی لێ قەدەغە بووە، لەو ماوەیەدا، بۆی ڕەوا دەبێتەوە؟ دەی من ئاژەڵی دیاریی خۆمم ناردووە بە حاجیاندا بۆ مەككەو خۆشم نەچووم بۆ حەج، جا تۆ لەم بارەیەوە چی لێ دەزانی بۆمی بنووسە. عەمرە فەرمووی: عائیشە فەرمووی: ئەمە وانییە وەك ئیبنو عەبباس دەڵێ، چونكە من بەدەستی خۆم، ملوانكەكانی ئاژەڵە دیارییەكانی پێغەمبەرم هۆندۆتەوە، ئەوجا پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی خۆی ئەو ملوانكانەی دەكردە ملی وشترە دیارییەكانی، وە لەو ساڵەدا كە ئەبوبەكری باوكم میر حەج بوو، بە باوكما ناردنی بۆ هەژارانی مەككە، ئیتر لەو ماوەیەدا كە پێغەمبەر خۆی لە مەدینە بوو، ئەوەی كەخوا بۆی حەلاڵ كردبوو، بەهۆی ناردنی ئەو ئاژەڵە دیارییانەوە لێی قەدەغە نەبوو بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٩}.

**ڕوونكردنەوە:**

ئەم عەبدوڵڵای كوڕی زیادە ئیمامی حوسەینی كوڕی عەلی شەهید كرد، موعاوییە زیادی باوكی ئەم عەبدوڵڵایەی كرد بە برای خۆیو كچێكی خۆی لە كوڕێكی ئەم زیادە مارەكردو كردی بە میری سەر كووفەو بەصرە، ئەم زیادە

ناسـراوه بـه زيـادى كـوڕى بـاوكى! لەسـاڵى پـەنجاو سـێى كۆچـيدا، لەسـەردەمى جێنشينى موعاوييەدا مردووه، راستتر ئەوەيە كە ئەم زيادە لەم بارەيەوە، كاغـەزى نووسى بۆ عائيشە نەوەك عەبدوڵڵاى كوڕى.

٧٣٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: أَهْدَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَـرَّةً إِلَـى الْبَيْـتِ غَنَمًـا فَقَلَّـدَهَا. {الحـديث: ٣١٩٠ = ٣١٧٩. تجريـد/٢، رقـم: ٨٠٠ - مكرر} :

**عائيشە** (ڕەزاى خوداى لێ بێ) **فەرمووى: ساڵێ، پێغەمبەر** (دروودى خوداى لەسەر بێ) **ئـاژەڵى وردە (بزنو مەڕ)ى، بەديارىى بەيت نـارد بـۆ هـەژارانى مەككەو بـۆ نيشانە گوڵـەنگێكى كردە مليان).**

## ٥٨٢) سواربوونى وشترى ديارىى بەيت دروستە (٣١٩٥ - ٣٢٠٢)
## بابٌ: ركوب البدنة

٧٣٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَأى رَجُلاً يَسُوقُ بَدَنَةً فَقَالَ: ارْكَبْهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّهَا بَدَنَـةٌ، فَقَـالَ: « ارْكَبْهَـا وَيْلَـكَ»، فِى الثَّانِيَـةِ أَوْ فِـى الثَّالِثَـةِ. {الحـديث: ٣١٩٥ = ٣١٨٤ فم. أبـو داود. مناسـك: ١٧٦٠. نسائى. حج: ٢٧٩٨} :

**ئەبو هورەيرە** (ڕەزاى خوداى لێ بێ) **فەرمووى: پێغەمبەر** (دروودى خوداى لەسەر بێ) **پياوێكى دى، وشترى ديارى بەيتى لێ دەخوڕى، فەرمووى: (سوارى بە) گوتى: ئـاخر چـۆن سـوارى بم ئەمە وشترى ديـاريى مەككەيـە؟ جـارێ دووانـى تـر، پێغەمبـەر** (دروودى خوداى لەسەر بێ) **هەمان شتى پێ فەرموو، پياوەكەيش هەمان وەڵامى دايـەوە، جـا لـەدواجارى دووەم، يـا لـەدوا جـارى سـێيەم، پێغەمبـەر** (دروودى خوداى لەسەر بێ) **پێـى فـەرموو: (خانـە خـراپ سوارى بە، بڕيارى شەرع من دەيزانم يا تۆ!).** {تاج/٢، زنجيرە: ١٢٨، ژمارە: ١٧٠٠}.

٧٣٧- عَنِ أَبي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَمِعْتُ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) سُـئِلَ عَـنْ رُكُوبِ الْهَدْيِ فَقَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « ارْكَبْهَا بِـالْمَعْرُوفِ

إذَا أُلْجِئْتَ إِلَيْهَا حَتَّى تَجِدَ ظَهْرًا ». {الحديث: ٣٢٠١ = ٣١٩٠ فم. أبو داود. مناسك: ١٧٦١. نسائى. حج: ٢٨٠١. تحفة الأشراف: ٢٨٠٨}:

ئەبو زوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ لە جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەبارەی سواربوونی وشتری دیاریی بەیتەوە، پرسیارکرا، کە ئایا شتی وا دروستە یانا؟ گوێم لێ بوو، جابیر فەرمووی: بەگوێی خۆم گوێم لە پێغەمبەر بوو، لە وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارەدا، دەیفەرموو: (ئەگەر ناچار بووی، ئەوا بەشێوەیەکی ڕەوا، سواری ببە، هەتا وڵاخی سواریی ترت دەست دەکەوێ، ئیتر لەو دابەزەو سواری وڵاخەکەی تر بە کەهی دیاری بەستی مەککە نییە).

**٥٨٣) ئاژەڵی دیاریی ئەگەر پێش ئەوەی بگاتە جێگەی خۆی پەکی کەوت، سەر دەبڕێ بۆ خەڵك.** (٣٢٠٣ - ٣٢٠٥)

**باب: ما عطب من الهدْي قبْلَ محلّه**

٧٣٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَنَّ ذُؤَيْبًا أَبَا قَبِيصَةَ حَدَّثَهُ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَبْعَثُ مَعَهُ بِالْبُدْنِ ثُمَّ يَقُولُ: « إِنْ عَطِبَ مِنْهَا شَىْءٌ فَخَشِيتَ عَلَيْهِ مَوْتًا فَانْحَرْهَا ثُمَّ اغْمِسْ نَعْلَهَا فِى دَمِهَا ثُمَّ اضْرِبْ بِهِ صَفْحَتَهَا، وَلاَ تَطْعَمْهَا أَنْتَ وَلاَ أَحَدٌ مِنْ أَهْلِ رُفْقَتِكَ ». {الحديث: ٣٢٠٣ = ٣١٩٢ فم}:

ئیبنو عەباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ذوئەیب، کە ناسراوە بە ئەبو قوبەیصە، (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆیگێڕامەوە:فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وشتری دیاری بەیتی لە مەدینەوە، بەمنا نارد، بۆ هەژارانی بەست، وە فەرمووی پێم: (ئەگەر لەڕێ لێیان پەکی کەوتو مەترسی مردنت لێی کرد، ئەوە لەوێ سەری ببڕە کە پەکی دەکەوێو سۆلەکەی گەردنی داکەنەو بە خوێنەکەی ڕەنگی بکەو بیدە لەلا ورگیو لا دووگەکانی بە خوێنەکەی سووربکەو هەرتاکێکی لەسەرلا دووگێکی دابنێ، هەتا بزانن کە ئەوە ئاژەڵی دیاری بەیتەو ماڵی هەژاران و پێ شیاوانە، وە خۆتو هاوڕێکانت کە لە کاروانەکەدا لەگەڵتان لێی مەخۆن!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٩، ژمارە: ١٧٠٢}.

## ٥٨٤) هاوبەشی لە دیاریی بەستدا. (٣١٧٢ - ٣١٧٩)
## باب: الاشتراكُ في الهَدْيِ

٧٣٩- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رضى الله عنهما) قَالَ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نَشْتَرِكَ فِي الإِبِلِ وَالْبَقرِ، كُلُّ سَبْعَةٍ مِنَّا فِي بَدَنَةٍ. {الحديث: ٣١٧٣ = ٣١٦١ فم} :

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: لە خزمەت حەزرەتدا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەرچووینو حەجمان دابەست، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمانی پێمان کرد: کە هەر حەوت کەسێ، بە هاوبەشی، وشترێ، یان ڕەشەوڵاخێ، لە باتی هەدیی سەر ببڕین). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ١٥٩٤}.**

## ٥٨٥) دیاریی بەیتو قوربانی لە ڕەشەوڵاخ. (٣١٧٢ - ٣١٧٩)
## باب: الهَدْيُ مِنَ البَقَرِ

٧٤٠- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رضى الله عنهما) قَالَ: ذَبَحَ رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ عَائِشَةَ بَقَرَةً يَوْمَ النَّحْرِ. {الحديث: ٣١٧٨ = ٣١٦٦ فم} :

**جابیری کوڕی عەبدوڵلا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە ڕۆژی جەژنی قوربانا، ڕەشە وڵاخێکی لەجیاتی دیاریی خانەی خودا، بۆ عائیشەی هاوسەری سەربڕی). {بڕوانە ژمارە: ٢٩١٠ = شەرحی موسلیم + تەجرید/١، ژمارە: ١٩٨ = ٢٩٤ فتح الباری}.**

## ٥٨٦) وا سوننەتە وشتر بەپێوە سەربڕرێو دەستی چەپی بەچەماوەیی ببەسترێ. (٣١٨٠)
## باب: نَحْرُ البُدْنِ قِياماً مُقَيَّدَةً

٧٤١- عَنْ زِيَادِ بْنِ جُبَيْرٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ أَتَى عَلَى رَجُلٍ وَهُوَ يَنْحَرُ بَدَنَتَهُ بَارِكَةً فَقَالَ: ابْعَثْهَا قِيَامًا مُقَيَّدَةً سُنَّةَ نَبِيِّكُمْ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣١٨٠ = ٣١٦٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٠٤ = ١٧١٣. أبو داود. حج: ١٧٦٨. تحفة الأشراف: ٦٧٢٢} :

زیادی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) پیاوێکی بینی، وشترێکی قوربانی پیخ دابوو، خەریك بوو سەری دەبڕیو دەیکرد بە قوربانی بۆ خۆی، ئیبنو عومەر پێی فەرموو: هەڵیسێنەوە سەرپێو دەستی چەپی لە ئەژنۆیا بچەمێنەوەو بە پەتێ بیبەستە بە قۆڵیەوە، چونکە یاساو دەستووری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وابوو، لەسەر ئەو شێوەیە وشتری قوربانیو دیاریی بەیتو وشتری تری سەردەبڕی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٩، ژمارە: ١٦٠٠، ١٦٠١}.

### ٥٨٧) گۆشتو کۆپانو پێستی ئاژەڵی دیاری دەکرێ بەخێر (٣١٦٧ - ٣١٧١)

### باب: الصدقة بلحوم الهدى وجلالها وجُلُودها

٧٤٢- عَنْ عَلِيّ (رضى الله عنه) قَالَ: أَمَرَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا، وَأَنْ لاَ أُعْطِىَ الْجَزَّارَ مِنْهَا، وَقَالَ: « نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا ». {الحديث: ٣١٦٧ = تجريد/٢، رقم: ٨٠١ = ١٧٠٧، ١٧١٦، ١٧١٦م، ١٧١٧، ١٧١٨، ٢٢٩٩. أبو داود. حج: ١٧٦٩. ابن ماجه. أضاحى: ٣١٥٧. تحفة الأشراف: ١٠٢١٩}:

عەلی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێ کردم، کە رابوەستم بەسەر وشترە دیارییەکانی بەیتیەوە، کە سەد وشتر بوون، سەرپەرشتیان بکەم، وە گۆشتو پێستەو جلو کۆپانەکانیان گشتی ببەخشمەوە، وە هیچیان لێ نەدەم بە قەسابەکە لەباتی قەسابییەکەی، بەڵام لەجیاتی پشکی ئاسایی قەیناکا کە بەشی بدەم، فەرمووی: (خۆمان شتێکی تری دەدەینێ لەباتی قەسابییەکەی!!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ١٦٠٢ + زنجیرە: ١٢٧، ژمارە: ١٦٥٥}.

### ٥٨٨) تەوافی ئیفاضە لە یەکەم ڕۆژی جەژندا سوننەتە (٣١٥٢ - ٣١٥٣)

### باب: طواف الإفاضة يَوْمَ النَّحْرِ

٧٤٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) أَفَاضَ يَوْمَ النَّحْرِ، ثُمَّ رَجَعَ فَصَلَّى الظُّهْرَ بِمِنًى. قَالَ نَافِعٌ: فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُفِيضُ يَوْمَ النَّحْرِ ثُمَّ

يَرْجِعُ فَيُصَلِّى الظُّهْرَ بِمِنًى، وَيَذْكُرُ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَعَلَهُ. {الحديث: ٣١٥٢ = ٣١٤٠ فم. بخاري. حج: ١٧٣٢. أبو داود. حج: ١٩٩٨. تحفة الأشراف: ٨٠٢٤}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، لە حەجی ماڵاواییدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپاش ڕەجمی شەیتان، تەوافی بەیتی کرد، کە پێی دەگوترێ: (طوافُ الإِفَاضَةِ) ئەوجا گەڕاوە بۆ میناو لەوێ نوێژی نیوەڕۆی کرد، نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عومەریش لە ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربانا تەوافی ئیفازەی دەکرد، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ هەوارەکەی لە مینا، لەوێ لە مینا نوێژی نیوەڕۆی دەکرد، وە دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی وای دەکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٣، ژمارە: ١٦١١}.

## ٥٨٩) هەرکەسێ تەوافی قودومی کرد دەتوانێ ئیحرام بشکێنێ.(٢٠٠٦ - ٢٠٠٨)

## باب: مَنْ طافَ بالبَيْتِ فَقَدْ حَلَّ

٧٤٤- عَنْ ابْنُ جُرَيْجٍ: أَخْبَرَنِى عَطَاءٌ قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ يَقُولُ: لاَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ حَاجٌّ، وَلاَ غَيْرُ حَاجٍّ، إِلاَّ حَلَّ، قُلْتُ لِعَطَاءٍ: مِنْ أَيْنَ يَقُولُ ذَلِكَ؟ قَالَ: مِنْ قَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى: (ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ). قَالَ: قُلْتُ: فَإِنَّ ذَلِكَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ، قَالَ: كَانَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رضى الله عنه) يَقُولُ: هُوَ بَعْدَ الْمُعَرَّفِ وَقَبْلَهُ، وَكَانَ يَأْخُذُ ذَلِكَ مِنْ أَمْرِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ أَمَرَهُمْ أَنْ يَحِلُّوا فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ. {الحديث: ٣٠١٠ = ٢٩٩٦ فم. بخاري. مغازي: ٤٣٩٦}:

ئیبنو جورەیج (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەطای شاگردی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی پێم دا، فەرمووی: جاران ئیبنو عەبباس دەیفەرموو: هەر موسوڵمانێ تەوافی قودوم ئەنجام بدا، حاجی بێ، یا عەمرەکەر، ئیتر بۆی هەیە کە ئیحرام بشکێنێ!!

ئیبنو جورەیج دەفەرموێ: عەرزی عەطام کرد: ئەمە چۆن وا دەڵێ، خۆ کەس ئەم گوتەیەی ئەوی نەگوتووە؟ عەطا فەرمووی: لەم ئایەتەوە وەری گرتووە، کە

دەفەرموێ: { ثُمَّ مَحِلُّهَا إِلَى الْبَيْتِ الْعَتِيقِ – حج/٣٣} واتە: ئاژەڵی دیاری خانەی خودا، پێویستە لە جێگەی دیاریکراوی خۆیدا سەرببڕێ کەناو بەستی مەککەیە).
ئیبنو جورەیج دەفەرموێ: منیش عەرزی عەطام کرد: بەڵام ئەوە لە دوا وەستانە لە عەرەفە؟ فەرمووی: ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەیفەرموو: لەپاش وەستانی عەرەفەو لەپێش وەستانی عەرەفەیشدا دەبێ! وە ئەم فەتوایەی خۆی لەو فەرمانەی پێغەمبەرەوە وەرگرتووە، کە لە حەجی مالاوایيدا فەرمانی کرد بەوانەی کە دیاریی بەیتیان پێ نییە، حەجەکەیان فەسخ بکەنەوەو بیکەن بە عەمرە، تەوافی قودووم بکەن‌و ئیحرام بشکێنن). {بڕوانە ئەم ژمارانە لە پێشەوە: ٧٠٧، ٦٧٠}. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧}.

**ڕوونکردنەوە:**

لە شەرحەکانی وا لەبەردەستا، دەفەرموێ: نەوەوی (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئەگەر بەپێی ئەم فەتوایەی ئیبنو عەبباس بێ، حاجی لەپاش تەوافی قودوم، بەتەواوی ئیحرام دەشکێنێ‌و ژن‌و بۆنی خۆش‌و هەموو شتێکی تری بۆ حەلاڵ دەبێتەوە، وە لەوەدوا باقی مەندەی کردارەکانی تری حەج تەواو دەکا، وەك وەستانی عەرەفەو... تاد. بەڵام ئەمە بە پێچەوانەی مەزهەبی جەماوەری زانایانی ئیسلامەوەیە، چونکە ئیحرام شکاندنی تەواو، لەسەر ڕێڕەوی پیرۆزی ئەوان دەبێ لەپاش وەستانی عەرەفەو ڕەجمی شەیتان‌و تەوافی زیارەو سەر تاشین بێ. جا ئومێدەکەم ئەم جۆرە جیاوازییە، لەنێوانی زاناکانا نەبێ بەمایەی سەر لێشێوان بۆ خوێنەواران‌و مامۆستایان. لە ڕاستیدا گەرچی ئەم قسەیەی ئیبنو عەبباس، تەئویلی زۆر هەڵ دەگرێ، وەبێ حیکمەت نییە، وە شەرعی خودای پێ دەوڵەمەند دەبێ، بەڵام بەشێوەی گشتی، هەمیشە ڕای جەماوەری زانایان، بۆ ئێمە مانان، سازترو گونجاو ترو لەبارترو بێگەردترە.

**٥٩٠) حاجی جووتکار (قارن) واته: کەسێ حەجو عەمرە بخاتە پاڵ یەكو بەیەکەوە بیانکات، ئەوە یەك تەوافو یەك هاتوچۆ (سعی)ی بەسە، هەم بۆ حەجەکەیو هەم بۆ عەمرەکەی. (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)**

**باب: يكفي القارن طوافٌ واحدٌ للحج والعمرة**

٧٤٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضي الله عنها): أَنَّهَا حَاضَتْ بِسَرِفَ فَتَطَهَّرَتْ بِعَرَفَةَ، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يُجْزِئُ عَنْكِ طَوَافُكِ بِالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ عَنْ حَجِّكِ وَعُمْرَتِكِ ». {الحديث: ٢٩٢٦ = ٢٩١٠ فم}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: لەخزمەتی حەزرەتدا،** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ساڵی** حەجی ماڵاوایی، کە دەرچووین بۆ حەج، کە گەیشتینە سەریف، لەوێ بێنوێژ کەوتمو سووڕی مانگانەم بۆ هات، وە لەچیای عەرەفە، لە بێنوێژیی پاك بوومەوە، وە یەکەم ڕۆژی جەژن تەوافی ئیفازەم ئەنجامدا، کە پێشی دەگوترێ: تەوافی روکن، وە هەروەها هاتوچۆی نێوان سەفاو مەڕوەشم ئەنجامدا، جا لەبەرئەوەی کەمن لەو حەجەدا قارین (جووتکار) بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەم تەوافی بەیتەتو ئەم تەوافی نێوانی صەفاو مەڕوەیەت، کە لەم ڕۆژی یەکەمی جەژنەدا ئەنجامت دان، برێتی حەجەکەتو برێتی عەمرەکەت دەکەون). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ١٠٠، ژمارە: ١٥٦٧ + ژمارە: ٢٩٠٢، ٢٩٠٥، ٢٩٠٦، ٢٩١١، ٢٩١٤ شرح صحيح مسلم + ٢٩١٣، ٢٨٩٠، ٢٨٩٨، ٢٨٩٥ فم = فتح الملهم شرح صحيح مسلم}. لە ژمارە (٢٩٠٢ ش.م = شرح صحيح مسلم للنووی، بە دەق عائیشە دەفەرموێ: (فَقَدِمْتُ مَكَّةَ وَأَنَا حَئِض، وَلَمْ أَطُفْ بِالْبَيْتِ، وَلاَ بَيْنَ الصَّفَا وَالْمَرْوَةِ = واتە: کە گەیشتینە مەککە، من بێنوێژ بووم، لەبەرئەوە تەوافی بەیتو تەوافی صەفاو مەڕوەم نەکرد) لە ژمارە: ٢٩٢٩ یشدا بەدەق دەفەرموێ: (فَفَعَلَتْ وَوَقَفَتِ الْمَوَاقِفَ حَتَّى إِذَا طَهرَتْ طَافَتْ بِالْكَعْبَةِ وَالصَّفَا وَالْمَرْوَةِ: واتە: ئیتر عائیشە تەوافی بەیتو تەوافی سەفاو مەڕوەی نەکرد، وە نییەتی حەجی هێناو هەموو کردارەکانی حەجی کرد، هەتا ڕۆژی یەکەمی جەژن لە بێنوێژی پاکەوە بوو، ئەوجا تەوافی بەیتو تەوافی سەفاو مەڕوەی کرد).

## ٥٩١) جووتكار (قارن)كەی ئیحرام دەشكێنێ (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)
## باب: متى يحلُّ مَنْ أحْرَمَ بِحَجٍ وَعمْرَة

٧٤٦- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَامَ حَجَّةِ الْوَدَاعِ، فَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ وَعُمْرَةٍ، وَمِنَّا مَنْ أَهَلَّ بِالْحَجِّ، وَأَهَلَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالْحَجِّ، فَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِعُمْرَةٍ فَحَلَّ، وَأَمَّا مَنْ أَهَلَّ بِحَجٍّ أَوْ جَمَعَ الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ فَلَمْ يَحِلُّوا حَتَّى كَانَ يَوْمُ النَّحْرِ. {الحديث: ٢٩٠٩ = ٢٨٩٣ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٥١ = ١٥٦٢ فتح الباري، ٤٤٠٨. أبو داود. حج: ١٧٧٩. نسائي. حج: ٢٧١٥. ابن ماجة. حج: ٢٩٦٥. تحفة الأشراف: ١٦٣٨٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەساڵی حەجی ماڵاواییدا، لە مەدینەوە لە خزمەت پێغەمبەردا، لە مانگەکانی حەجا، بەرەو مەککە، بەنیازی حەج و عەمرە کەوتینەڕێ، لەسەر ئەم سێ شێوەیە ئیحراممان بەست: هەمان بوو ئیحرامی حەج و عەمرەی بەسەر یەکەوە بەستبوو، هەمان بوو بەس ئیحرامی حەجی بەستبوو، پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بەس ئیحرامی حەجی بەستبوو، جا ئەوانەی کە تەنیا ئیحرامی عەمرەیان بەستبوو، وە دیاریی بەستیان پێ نەبوو، کە گەیشتنە مەککە، عەمرەکەیان تەواو کردو ئیحرامیان شکان، بەڵام ئەوانەی کە تەنیا ئیحرامی حەجیان دابەستبوو، لەگەڵ ئەوانەدا کە ئیحرامی حەج و عەمرەیان بەسەر یەکەوە دابەستبوو، ئیحرامیان نەشکاند، هەتا یەکەم ڕۆژی جەژن لەپاش ڕەجم و تەواف و سەربڕین ئیحرامیان شکاند). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٩، ژمارە: ١٥٢٨ + ژمارە: ١٥٢٧}.

## ٥٩٢) وچانگرتن لە موحەصەب. لەرۆژی نەفراو نوێژکردن لەوێ. (٣١٥٤ - ٣١٦٣)
## باب: نزول المُحَصَّبِ يَوْمَ النَّفْرِ والصَّلاة بِه

٧٤٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ كَانُوا يَنْزِلُونَ الأَبْطَحَ. {الحديث: ٣١٥٤ = ٣١٤٢ فم}:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: جاران پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ)**و ئەبوبەکرو عومەر لە ئەبطەح دادەبەزینو ڕۆژی نەفر، ئەو ڕۆژەی کە حاجیان لە میناوە دەگەڕێنەوە بۆ مەککە، نوێژی عەصریان لە ئەبطەح کرد).** {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦١٩}.

**٧٤٨- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: نُزُولُ الأَبْطَحِ لَيْسَ بِسُنَّةٍ، إِنَّمَا نَزَلَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَنَّهُ كَانَ أَسْمَحَ لِخُرُوجِهِ إِذَا خَرَجَ.** {الحديث: ٣١٥٦ = ٣١٤٤ فم}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: دابەزین لە ڕۆژی نەفردا، لە ئەبطەح سوننەت نییە، ڕاستە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە ڕۆژی نەفردا لەوێ دابەزی، بەڵام ئەوە لەبەرئەوە نەبوو کە خودی دابەزین لەوێ سوننەتبێ، بەڵکوو ئەوە لەبەرئەوە بوو، کە کۆڵی خۆیان سووك بکەنو بنەو بارگەو شمەکە قورسەکانیان لەوێ دابنێنو لەپاش نوێژی خەوتنان، سەرخەوێ لەوێ بشکێننو ئەوجا بڕۆن بۆ تەوافی بەیتو تەوافی ماڵاوایی بکەنو بگەڕێنەوە بۆلای بنەو بارگەکەیانو باقی شەو لەوێ بمێننەوەو دەمەو بەیان لە ئەبطەحەوە، بە کۆمەڵی پێکەوە بە ئاسانی دەرچن بۆ مەدینەو بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆیان).**

**ئەمە پوختەی قسەی شەرحەکانە، بۆ واتای ئەم فەرموودەیە.**

**٧٤٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَنَحْنُ بِمِنًى: نَحْنُ نَازِلُونَ غَدًا بِخَيْفِ بَنِى كِنَانَةَ حَيْثُ تَقَاسَمُوا عَلَى الْكُفْرِ، وَذَلِكَ إِنَّ قُرَيْشًا وَبَنِى كِنَانَةَ تَحَالَفَتْ عَلَى بَنِى هَاشِمٍ وَبَنِى الْمُطَّلِبِ أَنْ لاَ يُنَاكِحُوهُمْ وَلاَ يُبَايِعُوهُمْ حَتَّى يُسْلِمُوا إِلَيْهِمْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، يَعْنِى بِذَلِكَ الْمُحَصَّبَ.** {الحديث: ٣١٦٢ = ٣١٥٠ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٦٢ = ١٥٩٠، ١٥٨٩، ٣٨٨٢، ٤٢٨٤، ٤٢٨٥، ٧٤٧٩. أبو داود. حج: ٢٠١١. تحفة الأشراف: ١٥١٩٩}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: هێشتا لەمینا بووین، کە خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی پێمان، کاتێ ویستی بگەڕێتەوە بۆ مەککە: (خوا حەزکا**

سبەینێ لە خەیف، لە قۆقزاییەکەی بەنی کینانە قۆناخ دەگرین (واتە: لە موحەصصەب – تەحصیب – حەصبە - بەطحاء) واتە: لەو شوێنەدا کە کاتی خۆی، دوژمنەکانی ئیسلام پەیمانیان بەست لەسەر کوفر، لەوێ قوناخ دەگرین‌و دەچین بۆ تەوافی مالاّوایی، کە ئەم رووداوەیش ئاوا بوو، کاتی خۆی کافرەکانی قورەیش‌و بەنی کینانە، لەو جێگایەدا، لەدژی بەنی هاشم‌و بەنی موتتەلیب، کە پارێزگاری پێغەمەریان دەکرد، گەلە کۆمەیان لێ کردن‌و لە دژیان بوون بەیەك‌و سوێندیان بۆ یەکتری خواردبوو لەسەر ئەمە: هەتا بەنی هاشم‌و بەنی موتتەلیب، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەدەن بە دەستیانەوە، بۆئەوەی بیکوژن، نەژن‌و ژنخوازییان لەگەڵ بکەن‌و نە سەوداو مامەڵە). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦٢٣}.

**٥٩٣) لە شەوەکانی مینادا، ئاو گێڕو شوان‌و ئەمانە دروستە شەو لە مەککە بمێننەوە.** (٣١٦٤ - ٣١٦٥)

**باب: في البيتوتة ليالي منى بمكّة لأهل السّقاية**

٧٥٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ الْعَبَّاسَ بْنَ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ (رضى الله عنه) اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يَبِيتَ بِمَكَّةَ لَيَالِىَ مِنًى مِنْ أَجْلِ سِقَايَتِهِ فَأَذِنَ لَهُ. {الحديث: ٣١٦٤ = ٣١٥٢ فم. بخارى. حج: ١٧٤٥. أبو داود. مناسك: ١٩٥٩}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) داوای مۆڵەتی لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرد، کە ڕێگەی بدا شەوەکانی مینا لە مەککە بمێنێتەوە، لەبەر ئاودان بە حاجیان، ئەویش ڕێگەی مانەوەی دا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٠٦، ژمارە: ١٥٩٠}.

٧٥١- عَنْ بَكْرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الْمُزَنِيِّ قَالَ: كُنْتُ جَالِسًا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ عِنْدَ الْكَعْبَةِ، فَأَتَاهُ أَعْرَابِيٌّ فَقَالَ: مَا لِى أَرَى بَنِى عَمِّكُمْ يَسْقُونَ الْعَسَلَ وَاللَّبَنَ، وَأَنْتُمْ تَسْقُونَ النَّبِيذَ؟ أَمِنْ حَاجَةٍ بِكُمْ، أَمْ مِنْ بُخْلٍ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: الْحَمْدُ لِلَّهِ، مَا بِنَا حَاجَةٍ، وَلاَ بُخْلٍ، قَدِمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى رَاحِلَتِهِ وَخَلْفَهُ أُسَامَةُ، فَاسْتَسْقَى فَأَتَيْنَاهُ بِإِنَاءٍ مِنْ

نَبِيذٍ، فَشَرِبَ. وَسَقَى فَضْلَهُ أُسَامَةَ وَقَالَ: « أَحْسَنْتُمْ وَأَجْمَلْتُمْ كَذَا فَاصْنَعُوا »، فَلاَ نُرِيدُ تَغْيِيرَ مَا أَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣١٦٦ = ٣١٥٤ فم. أبو داود. مناسك: ٢٠٢١}:

بەکری کوڕی عەبدوڵڵای موزەنی فەرمووی: لە خزمەتی ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دانیشتبووم، لەلای کەعبەدا، جا عەرەبێکی دەشتەکی هات، گوتی: ئەوە بۆچی دەبینم ئامۆزاکانتان شەربەتی هەنگوینو شیر دەدەن بەخەڵك، کەچی ئێوە خۆشاو دەدەن بە خەڵك، ئایا ئەمە لەبەر نەبوونیتانە، یا لەبەر پیسکەییتانە؟ ئیبنو عەبباسیش فەرمووی: لە سایەی خوداوە نە نەبووینو نە پیسکەو رژدو رەزیلین، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەسواری وڵاخەکەی تەشریفی هات، وە ئوسامەی لە پاشکۆدا بوو، وە داوای خواردنەوەی کرد، ئێمەش جامێ خۆشاومان بۆ هێنا، جا خۆی لێی خواردەوەو بەرماوەکەی خۆی دا بە ئوسامە، وە فەرمووی: (ئافەرین بۆ خۆتان، باش دەکەن، هەروا بکەن).

جا ئێمەیش نامانەوێ لە قسەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچین، یا فەرمانەکەی بگۆڕین. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ١٧١٤}.

## ٥٩٤) لایە لەپاش تەواوکردنی حەجو عەمرە چەند شەو لە مەککە دەمێنێتەوە. (٣٢٨٤ - ٣٢٨٨)

## باب: إقامة المُهاجِرِ بِمكَّةَ بَعْدَ قضاءِ الحج والعُمْرَة

٧٥٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ حُمَيْدٍ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ عَبْدِ الْعَزِيزِ يَقُولُ لِجُلَسَائِهِ: مَا سَمِعْتُمْ فِي سُكْنَى مَكَّةَ؟ فَقَالَ السَّائِبُ بْنُ يَزِيدَ: سَمِعْتُ الْعَلاَءَ - أَوْ قَالَ: الْعَلاَءَ بْنَ الْحَضْرَمِيِّ - قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يُقِيمُ الْمُهَاجِرُ بِمَكَّةَ بَعْدَ قَضَاءِ نُسُكِهِ ثَلاَثًا ». {الحديث: ٣٢٨٥ = ٣٢٧٣ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٢١ = ٣٩٣٣. ترمذي. حج: ٩٤٩. نسائي. تقصير الصلاة: ١٤٥٢}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی حومەید فەرمووی: گوێم لێ بوو، عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، بە سائیبی کوڕی یەزیدی فەرموو، کە یەکێ بوو لە دانیشتووانی

لای: لەبارەی ماوە لە مەککەدا، لەپاش تەواوکردنی حەج و عەمرە شتێکت ژنەوتووە؟ فەرمووی: ژنەوتم لە عەلای حەزرەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: لایە (واتە: لاوەکی: کەسێ کە خەڵکی مەککە نەبێ) لەپاش تەواوکردنی کردارەکانی حەج و عەمرە، مافی ئەوەی هەیە کە سێ شەوی تر لە مەککە بمێنێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ١٦٤١} .

**ڕوونکردنەوە:**

عەلای حەزرەمی (ڕەزای خودای لێ بێ) ناوی عەبدوڵڵای کوڕی عیماد بوو، عەلاء چەند برایەکی هەبوو، یەکێکیان ناوی عەمری حەزرەمی بوو، یەکەم کوژراوی شەڕی ئیسلام و ناموسوڵمانان بوو، بە ناموسوڵمانی موسوڵمانێ کوشتی،ماڵەکەی یەکەم تالانی بوو، کە دەست موسوڵمانان کەوت و پێنج یەکی لێ دەرکرا، ئەوە بوو بەهۆی شەڕی بەدر، لەناو پەڕاوەکانی فوتوحاتا مەشهوورە: کە عەلا نزا گیرا بووە، چەند وشەو نزای تایبەتی خوێندووەو بەسەر دەریادا بەپێ، وەك سەر زەوی ڕۆیشتووە!

پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) عەلای کرد بە سەرکاری سەر وڵاتی بەحرەین، لەسەردەمی جێنشینیی ئەبوبەکرو عومەردا هەر بەردەوام بوو لەسەر کارەکەی، تا لەساڵی چواردەدا فەرمانی هەقی بەجێهێنا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا (ڕەزای خوا لە هەموویان بێ).

## ٥٩٥) کەس بڵاوەی لێ نەکا، هەتا تەوافی ماڵاوایی نەکا (٣٢٠٦ - ٣٢١٦)

## باب: لا ينفِرَنَّ أحدٌ حتّى يطوف بالبيْت للوَداع

٧٥٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ النَّاسُ يَنْصَرِفُونَ فِى كُلِّ وَجْهٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَنْفِرَنَّ أَحَدٌ، حَتَّى يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِ بِالْبَيْتِ ». {الحديث: ٣٢٠٦ = ٣١٩٥ فـم. تجريد/٢، رقم: ٨١٦ = ٣٢٩، ١٧٦١، ١٧٦٠، ١٧٥٥. أبو داود. مناسك: ٢٠٠٢. ابن ماجة. مناسك: ٣٠٧٠. تحفة الأشراف: ٥٧٠٣} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران موسوڵمانان کە حەجو عەمرەیان تەواو دەکرد، ئیتر بەهەر چوارلادا بڵاوەیان لێ دەکرد، تا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەس بڵاوەی لێ نەکا تا تەوافی ماڵاوایی لە بەیت نەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢١، ژمارە: ١٦٤٢}.

## ٥٩٦) ئافرەتێ لەکاتی تەوافی ماڵئاواییدا بێنوێژبێ (٣٢٠٨ - ٣٢١٦)
## باب: المرأة تحيضُ قبلَ أنْ تُودِّعَ

٧٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: حَاضَتْ صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَىٍّ بَعْدَ مَا أَفَاضَتْ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَذَكَرْتُ حِيضَتَهَا لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَحَابِسَتُنَا هِيَ؟ ». قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا قَدْ كَانَتْ أَفَاضَتْ وَطَافَتْ بِالْبَيْتِ ثُمَّ حَاضَتْ بَعْدَ الإِفَاضَةِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) « فَلْتَنْفِرْ ». {الحديث: ٣٢٠٩ = ٣١٩٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٢١٣ = ٣٢٨، ٣١٩، ٣١٧، ٣١٦، ٣٠٥، ٤٤٠١}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: صەفییەی کچی حویەی، شەوی نەفر، کە حاجیان بڵاوەی لێ دەکەن و هەرکەسەیان دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، ئەو بێنوێژ بوو، منیش عەرزی پێغەمبەرم کرد: صەفییە بێنوێژەو تەوافی وەداعی نەکردووە، چارچییە؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خوا بکا ماتڵمان نەکا باشە، یەکی گەڕانەوەمان نەخا باشە؟) منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! تەوافول ئیفازەی کردووە، کە روکنی حەجەو پێشی دەگوترێ (طواف الزيارة) ئەوسا کەوتۆتە سەر بێنوێژی؟ ئەویش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەبا بکەوێتە رێ لەگەڵمان، مادام تەوافی فەرزی بەجێ هێناوە، تەوافی ماڵئاوایی بۆ ئەو نەشی کات قەیناکات). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ١٦٢٤}.

٧٥٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: أُمِرَ النَّاسُ أَنْ يَكُونَ آخِرُ عَهْدِهِمْ بِالْبَيْتِ، إِلاَّ أَنَّهُ خُفِّفَ عَنِ الْمَرْأَةِ الْحَائِضِ. {الحديث: ٣٢٠٧ = ٣١٩٦ فم. راجع رقم: ٧٥٣ المتقدم}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: جـاران موسـوڵمانان کـە حـەج‌و عەمرەیان دەکرد، ئیتر بەهەر چوار لادا بڵاوەیـان لێ دەکـرد، هـەتا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمانی پێیـان کـرد: (کـەس بـڵاوەی لێ نـەکا، هـەتا تـەوافی مـاڵاوایی لەبەیت نەکا). بەڵام ئەوەنـدە هەیـە بـۆ ژنـی بێنوێـژ، بـۆ بارسووکی چاوپۆشـی لـە تەوافی ماڵاوایی کراوە، ئەگەر نەشیکا قەیناکا).

## ٥٩٧) کردنی عەمرە لە مانگەکانی حەجا ڕەوایە (٢٩٩٩ - ٣٠٠٥)

## باب: فِي إِبَاحَةِ الْعمرة فِي شُهُورِ الْحَجّ

٧٥٦- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضـى الله عنهمـا) قَـالَ: كَـانُوا يَـرَوْنَ أَنَّ الْعُمْـرَةَ فِـى أَشْهُرِ الْحَجِّ، مِنْ أَفْجَرِ الْفُجُورِ فِى الأَرْضِ، وَيَجْعَلُونَ الْمُحَرَّمَ صَفَراً، وَيَقُولُونَ إِذَا بَرَأَ الدَّبَرْ، وَعَفَـا الأَثَرْ، وَانْسَلَخَ صَـفَرْ، حَلَّتِ الْعُمْـرَةُ لِمَـنِ اعْتَمَـرْ. فَقَـدِمَ النَّبِـىُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) وَأَصْحَابُهُ صَبِيحَةَ رَابِعَةٍ مُهِلِّينَ بِالْحَجِّ، فَأَمَرَهُمْ أَنْ يَجْعَلُوهَا عُمْرَةً، فَتَعَاظَمَ ذَلِـكَ عِنْـدَهُمْ، فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَىُّ الْحِـلِّ؟ قَـالَ: « الْحِـلُّ كُلُّـهُ ». {الحديث: ٢٩٩٩ = ٢٩٨٥ فـم. تجريد/٢، رقم: ٧٥٣ = ١٥٦٤. نسائى. مناسك: ٢٨١٢. تحفة الأشراف: ٥٧١٤} :

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) دەفـەرموێ: لەسـەردەمی نەزانیـدا، قـوڕەیش‌و ئەوانەی کـە لەسـەر ئایینـە پووچـەکەی قـوڕەیش بـوون، وایـان دانـابوو کـە کردنـی عەمرە، لە مانگەکانی حەجدا، کـە شەشـەڵان‌و نـاو جـەژنان‌و قوربـانن، لـە گوناهـە هەرە گەورەکانەو لەوە خراپتر رووی نەداوە لەسەر روی زەوی!

وەجـێ گۆڕکێیـان بـە مانگـە حەرامـەکان دەکـرد، کـە پێیـان دەگـوترێ ئەشهورولحوروم، کە چوار مانگن، کە ڕەجـەب‌و ناوجـەژنان‌و نۆمینـەو موحـەڕەمن، کە ڕەجەبیان بە تەنیایەو دەکەوێتە پێش شەعبانەوە، ئەوسێ مانگەکەی تریشیان بەسەر یەکەوەن، دەچوون مانگی موحەڕەمیان ناودەنا صەفەرو بە مانگی حەڵاڵیان دائـەناو، بـە پێچەوانەیشـەوە مـانگی سـەفەریان ناودەنـا ناموحـەڕەم‌و بـە مـانگی حەرامیان دائەنا، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا بەم کرداره دەگوترێ (نەسیئ). جا لەپاش ئەم جێ گۆڕکێیـە، ئـاوا کـاتی کردنـی عـەمرەیان دیـاری دەکـردو دەیـانگوت:

کاتێ زامو ناوکە ڕێژی پشتی ولاخی ژێر حاجیان، لەپاش تەواوکردنی حەج سارێژ بوو، وە شوێنەواری کاروانی حاجیان کوێرەوە بوو، وە مانگی موحەڕەم، کە ئەوان ناویان نابوو سەفەر تەواو بوو، ئەوحەلە هەرکەسێ کە بیەوێ عەمرە بکا، عەمرەی بۆ دروست بوو).

جاکاتێ لە حەجی مالاوایيدا، کە پێغەمبەرو هاوڕێکانی (دروودی خودای لەخۆیو ڕەزای خودا لە هاوڕێکانی بێ) لە بەیانی ڕۆژی چوارەمی مانگی نۆمینە (قوربان)دا هاتن بۆ مەککە، ئیحرامی حەجیان بەستبوو، ئیتر پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردن، کە حەجەکەیان بکەن بە عەمرە، لەپاشا کە عەمرەکەیان تەواوکرد ئیحرام بشکێنن، بەلام ئەوان ئەم کارە زۆر گەورەو گران بوو لەسەر شانیان، چونکە ئەوان لەوەو پێش شتی وایان نەدیبوو، وە کردنی عەمرەیان لە مانگەکانی حەجدا بە گوناهێکی گەورە دادەنا، ئەنجا کە بەباشی لە باسەکە تێگەیشتن گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! بەم ئیحرام شکاندنە چیمان بۆ حەلاڵ دەبێتەوە، لەو شتانەی کە بەهۆی ئیحرام بەستنەوە لێمان قەدەغە بوو بوون؟ فەرمووی: (هەموو شتێکتان بۆ ڕەوا دەبێتەوە وەك جاران، تا کاتێ ئیحرامی حەج دادەبەستنەوە!). {تاج/٢، زنجيره: ١٢٠، ژمارە: ١٦٣٨ + تاج/٢، زنجیره: ٨٧، ژمارە: ١٥١٨، لاپەڕە: ٣٨٢}.

## ٥٩٨) بەهرەی عەمرە لەمانگی ڕەمەزاندا. (٣٠٢٨ - ٣٠٢٩)
## باب: فَضْلُ العُمْرَةِ فِي رَمَضَانَ

٧٥٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِـيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لِامْرَأَةٍ مِن الأَنْصَارِ يُقَالُ لَهَا أُمُّ سِنَانٍ: « مَا مَنَعَكِ أَنْ تَكُونِى حَجَجْتِ مَعَنَا »؟ قَالَتْ: نَاضِحَانِ كَانَا لأَبِى فُلاَنٍ - زَوْجِهَا - حَجَّ هُوَ وَابْنُهُ عَلَى أَحَدِهِمَا، وَكَانَ الآخَرُ يَسْقِى عَلَيْهِ غُلاَمُنَا، قَالَ: « فَعُمْرَةٌ فِى رَمَضَانَ تَقْضِى حَجَّةً، أَوْ حَجَّةً مَعِى ». {الحديث: ٣٠٢٨ = ٣٠١٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٥٠ = ١٨٦٣ ، ١٧٨٢. نسائى. صوم: ٢١٠٩}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجی ماڵاوایی کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە حەجەکەی گەڕایەوە، ژنێکی ئەنصاری هەبوو، ناوی ئوم سینان بوو، پێی فەرموو: (دایکی سینان بۆچی نەهاتیت بۆ حەج لەگەڵ ئێمە؟) ژنەکەیش گوتی: باوکی منداڵەکان دوو وڵاخی ئاو کێشی هەبوو، خۆیو کوڕەکەی بەسواری یەکێکیان لەگەڵ تۆدا چوون بۆ حەج، ئەویتریشیان خولامەکەمان ئاوی پێ دەکێشاو ئاوی پێ هەڵ دەگۆزی بۆ ئاودانی دێبەرەکەمان، لەبەرئەوە پێم نەکرا ئەم ساڵ لەگەڵ تۆدا بێم بۆ حەج. فەرمووی: (دەبزانن کە عەمرەیێ لە مانگی ڕەمەزانا خۆی دەدا لەحەجێ) یا فەرمووی: (خێری حەجێکی هەیە کە لەگەڵ مندا بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٧، ژمارە: ١٦٢٩}.

**ڕوونکردنەوە:**

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیێ لەسەر کۆمەڵێ بەهرە:

١) کە کرداری باش لەکاتی باشا، یا لەشوێنی باشا، یا لەگەڵ پیاو چاکانا، خێرو پاداشی زیاترە، لەکاتو شوێنی ئاسایی. وەك عەمرە لە ڕەمەزانا، یا سەڵاوات لەشەوی هەینیدا، یا نوێژ لە مزگەوتی حەرامو مزگەوتەکەی پێغەمبەرا (دروودی خودای لەسەر بێ).

٢) بەڵام گەرچی عەمرە لە ڕەمەزانا خێری حەجێکی هەیە، بەڵام حەجی فەرز یا نەزر لەکۆڵ ناخا، لەبەرئەوە ئەگەر کەسێ چەندین عەمرەیش لە ڕەمەزانا بکا، مادەم حەجی فەرزی لەسەربێ، برێتی حەجە فەرزەکەی ناکەوێ.

**٥٩٩) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند حەجی کردووە؟ (٣٠٢٣ - ٣٠٢٧)**
**باب: كَمْ حَجَّ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم؟**

٧٥٨- عَنْ أَبِى إِسْحَاقَ قَالَ: سَأَلْتُ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ: كَمْ غَزَوْتَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: سَبْعَ عَشْرَةَ، قَالَ: وَحَدَّثَنِى زَيْدُ بْنُ أَرْقَمَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَزَا تِسْعَ عَشْرَةَ، وَأَنَّهُ حَجَّ بَعْدَ مَا هَاجَرَ حَجَّةً وَاحِدَةً حَجَّةَ الْوَدَاعِ، قَالَ أَبُو إِسْحَاقَ: وَبِمَكَّةَ أُخْرَى. {الحديث: ٣٠٢٥ = ٣٠١١ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٢٣ = ٣٩٤٩}:

**ئەبو ئیسحاق فەرمووی: لە زەیدی کوڕی ئەرقەمم پرسی** (ڕەزای خودای لێ بێ)**: چەند غەزات لەگەڵ پێغەمبەردا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کردووە؟ فەرمووی: حەڤدە غەزام لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کردووە. فەرمووی: زەیدی کوڕی ئەرقەم خۆی هەواڵی پێم داوە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نۆزدە غەزای کردووە، وە یەك حەجیشی کردووە لەپاش کۆچکردن لە مەککەوە بۆ مەدینە، کە ئەویش حەجی ماڵاواییە. ئەبو ئیسحاق فەرمووی: کاتێ لە مەککە بوو، بەرلەوە کە کۆچ بکا بۆ مەدینە حەجی تری کردووە.**

**ڕوونکردنەوە:**

**١.لە سونەتی تەرمەزیدا، جابیر دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **سێ حەجی کردووە، دوو حەج پێش کۆچو حەجێ پاش کۆچ.**

**٢. ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەر لەکۆچ سێ حەجی کردووە (ابن ماجةء الحاكم).**

**٣. ئیبنو جەوزی دەفەرموێ: حەجێ زۆری بێ شوماری کردووە.**

**٤.عەسقەلانی دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لە مەککە بەر لەکۆچ، حەجی نەفەوتاوە، بەتایبەتی لە مەوسیمەکانی حەجدا بانگەشەی ئیسلامی بڵاو دەکردەوە.**

**٦٠٠) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چەند عەمرەی کردووە؟** (٣٠٢٣ – ٣٠٢٧)

**باب: كَمْ إعْتَمَرَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم**

**٧٥٩-** عَنْ أَنَس (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّه (صلى الله عليه وسلم) اعْتَمَرَ أَرْبَعَ عُمَرٍ كُلُّهُنَّ فِى ذِى الْقَعْدَة، إلاَّ الَّتى مَعَ حَجَّتِه عُمْرَةً منَ الْحُدَيْبيَة، أَوْ زَمَنَ الْحُدَيْبيَة فى ذى الْقَعْدَة، وَعُمْرَةً منَ الْعَام الْمُقْبِلِ فِى ذِى الْقَعْدَة، وعُمْرَةً منْ جِعْرَانَةَ حَيْثُ قَسَمَ غَنَائِم حُنَيْنٍ فِى ذِى الْقَعْدَة، وَعُمْرَةً مَعَ حَجَّتِه. {الحديث: ٣٠٢٣ = ٣٠٠٩ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٢٢ = ١٧٧٨، ١٧٧٩، ١٧٨٠، ٣٠٦٦، ٤١٤٨}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوار عەمرەی کردووە، هەر چواریانی لە مانگی ناوجەژنان (ذیلقه عدة)دا کردووە، تەنیا ئەوەیان نەبێ کە لەگەڵ حەجە فەرزەکەی کردی، ساڵی حەجی ماڵاوایی، عەمرەیەکی تریان لەکاتی ڕێکەوتنەکەی حودەیبییەدا بوو، لە مانگی ناوجەژناندا بوو، هەرچەند کافرەکان ڕێگەیان نەدان کە تەواوی بکەن، بەڵام دادەنرێ بە عەمرەیێ، ئەمەیان لە ساڵی شەشی کۆچیدا بوو، عەمرەیەکی تریان لەساڵی ئاییندەدا بوو، ئەمە عەمرەی دووهەمی بوو، وە لەساڵی حەوتەمی کۆچیدا بوو، وەپێی دەگوترێ: عەمرەتولقەزا، وە ئەویش هەر لەمانگی ناوجەژناندا بوو، عەمرەیەکی تریان لەکاتی غەزای حونەیندا بوو، لە جیعرانەوە ئیحرامی بەست بۆی، ئەمیش هەر لەمانگی ناوجەژناندا بوو، لەوکاتەدا کردی کە تاڵانەکەی غەزای حونەینی دابەشکرد، ئەمە عەمرەی سێیەم بوو، لەساڵی هەشتەما بوو، کە ساڵانی ئازادکردنی مەککە بوو، عەمرەکەی تریشیان کە چوارەمە ئەوەبوو کە لەگەڵ حەجە فەرزەکەیدا کردی، ئەمە هەر چوار عەمرەکە). {تاج/٢، زنجیره: ١١٨، ژماره: ١٦٣١}.

### ٦٠١) ئیحرام شکاندن لەپاش تەواوکردنی عەمرە بە کورتکردنەوەی مووی سەر. (٣٠١١ - ٣٠١٢)

### بابٌ: فِي التَّقْصِيرِ فِي العَمْرَةِ

٧٦٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ: أَنَّ مُعَاوِيَةَ بْنَ أَبِى سُفْيَانَ (رضى الله عنهم) أَخْبَرَهُ قَالَ: قَصَّرْتُ عَنْ {رأس} رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِمِشْقَصٍ وَهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. أَوْ رَأَيْتُهُ يُقَصَّرُ عَنْهُ بِمِشْقَصٍ وَهُوَ عَلَى الْمَرْوَةِ. {الحديث: ٣٠١١ = ٢٩٩٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٨١٠ = ١٧٣٠}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی داپێم: گوتی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەمرەی کرد، لەپاش تەواوکردنی عەمرەکە، من بەدەمە پەیکانێکی پانکۆڵە، مووی سەریم کورت کردەوە، لەوکاتەدا لەسەر مەڕوە بوو، یا موعاوییە فەرمووی: پێغەمبەرم بینی

لەپاش تەواوکردنی عەمرە، بەدەمە پەیکانێکی پانکۆڵە، لەسەر تەپۆڵکەی مەڕوە، مووی سەریان کورت دەکردەوە بۆی!!).

### ٦٠٢) ژنی بێنوێژ عەمرە دەگێڕێتەوە. (٢٩٠٢ - ٢٩٤١)
### بابٌ: قَضاءُ الحائضِ العُمْرَة

٧٦١- عَنْ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: يَصْدُرُ النَّاسُ بِنُسُكَيْنِ، وَأَصْدُرُ بِنُسُكٍ وَاحِدٍ؟ قَالَ: « انْتَظِرِي فَإِذَا طَهَرْتِ، فَاخْرُجِي إِلَى التَّنْعِيمِ فَأَهِلِّي مِنْهُ، ثُمَّ الْقَيْنَا عِنْدَ كَذَا وَكَذَا. (قَالَ: أَظُنُّهُ قَالَ: غَدًا)، وَلَكِنَّهَا عَلَى قَدْرِ نَصَبِكِ أَوْ قَالَ: نَفَقَتِكِ ». {الحديث: ٢٩١٩ = ٢٩٠٣ فـم. تجريد/٢، رقم: ٨٢٦ = ١٧٨٦، ١٧٨٤، ٢٩٨٥}:

حەزرەتی عائیشە، هاوسەری پێغەمبەر، دایکی بڕواداران، فەرمووی: گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو خەڵکە هەموو حەجو عەمرەیان کردووە، تەنیا من نەبێ، کە هەر حەجم کردووە؟ فەرمووی: (چاوەڕوانبە هەرکاتێ لە بێنوێژیی پاکەوە بووی، لەگەڵ ئەوڕەحمانی برات بڕۆ بۆ تەنعیم، جا لەوێ ئیحرامی عەمرە دابەستە، لەباتی ئەو عەمرەیەی کە خەڵکەکە کردوویانە، جا بۆ سبەینێ وەرەوە بۆلامان بۆ ئەبتەح).

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەوجا فەرمووی: (ئەوەیش بزانە، کەمیو زۆری پاداش بەپێی ماندوو بوونە) یا فەرمووی: (کەمیو زۆری پاداشەکەت بەپێی ئەو خەرجییە دەبێ کە سەرفی دەکەی).

### ٦٠٣) گوتەی کەسێ لە سەفەری حەج، یا سەفەری تر بگەڕێتەوە. (٣٢٦٥ - ٣٢٦٨)
### باب: ما يقُولُ إذا قفل مِنْ سفر الحجّ وغيْره

٧٦٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِذَا قَفَلَ مِنَ الْجُيُوشِ أَوِ السَّرَايَا أَوِ الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ إِذَا أَوْفَى عَلَى ثَنِيَّةٍ أَوْ فَدْفَدٍ، كَبَّرَ ثَلاَثًا، ثُمَّ قَالَ: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ، وَهُوَ

عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ: آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ، لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ وَعْدَهُ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ، وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ». {الحديث: ٣٢٦٥ = ٣٢٥٤ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٢٨ = ١٧٩٧، ٢٩٩٥، ٣٠٨٤، ٤١١٦، ٦٣٨٥}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ لە غەزا، یا لەگەڵ سوپادا، یا لەگەڵ پەلێ غەزاکارا، یا لە حەج، یا لە عەمرە دەگەڕایەوە، لەڕێ لەسەر هەموو بەرزاییەكو قوتکەو تەپۆڵکەیێ کە سەردەکەوتە سەری، بە دەنگێکی بیستراو، لەپێشا سێجار ئەڵلاهو ئەکبەری دەکرد، ئەوجا دەیفەرموو: « لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ وَحْدَهُ أَنْجَزَ وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الأَحْزَابَ وَحْدَهُ ».

واتە: تەنیا خودا خودایەو بەس، بێ هاوەڵە، سامانو دارایىو پاشایی، لە راستیدا، هەر بۆئەوە، سوپاس هەر بۆئەوە، ئەو زاتە توانای هەموو شتێکی هەیە، گەڕاینەوە، تەوبەکارین، خواپەرستین، کوڕنووش بەرین، هەمیشە سوپاسگوزارین بۆ پەروەردگارمان، بەڵێنەکەی خودا راست دەرچوو، بەندەکەی خۆی کە موحەممەدە سەرخست، بەتەنیا خودا خۆی ئەو کۆمەڵانەی کە گەلەکۆمەیان لە ئیسلام کردبوو تێکشکاند). {تاج:٥، زنجیرە: ٧٣، ژمارە: ٥٠٨٩ ج/٤}.

## ٦٠٤) وچانگرتنو نوێژکردن لە ذول حولەیفە، کاتێ لە حەج یا لە عەمرە دەگەڕێتەوە. (٣٢٦٩ - ٣٢٧٣)

## باب: التعريس والصلاة بذي الْحُلَيْفَة إذا صدر من الحج والعُمْرَة

٧٦٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِى بِذِى الْحُلَيْفَةِ فَصَلَّى بِهَا. قَالَ: وَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يَفْعَلُ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٢٦٩ = ٣٢٥٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣٤ = ١٥٣٢}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کاتێ گەڕایەوە لەحەجی مالاوایی، لە زیخەڵانەکەی وا لە زولحولەیفە، کە ناودارە بە (بَطْحَاءِ مُبَارَكَةٍ = زیخەڵانی فەڕدار) لەوێ وشترەکەی ییخ دەداو وچانێکی گرتو

شەو لەوێ مایەوە هەتا بەیانیو نوێژی بەیانی لەوێ کرد، ئەوجا کەوتەڕێ، بۆ ماڵەوە، بۆ مەدینە، ئەمەی بۆیە دەکرد، هەتا لەشەوا لەناکاوا نەکا بەماڵاو بەو شەوە ماڵو مناڵ رانەچەنێنێ.

نافیع دەیفەرموو: ئیبنو عومەر خۆشی هەمان شتی دەکرد.

**روونکردنەوە:**

١. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی ئیحرام دابەستنیشا هەمان شتی دەکرد، لەم بەطحایە دەمایەوەو نوێژی لێ دەکرد بڕوانە: ئەم ژمارانە لە پێشەوە: ٦٥١، ٦٥٢، ٦٥٨، ٦٦١. جا دروستە کە مەبەست هەم کاتی چوونو هەم کاتی گەڕانەوەبێ.

٢. زول حولەیفە، ئێستا ناوی بیری عەلییە، لەنێوانی مەدینەو مەککەدایە، لە مەدینەوە نزیکەی پێنج میل دوورە، کە نزیکەی بیست هەزار گەزە بە گەزی ئاسنی ئەمڕۆ، بەڵام لە مەککەوە زۆر دوورە (١٩٨) سەدو نەوەدو هەشت میل دوورە، مزگەوتێکی لێیە ناسراوە بە (مسجد الشجرة). بیرێکی لێیە ناوی بیری عەلییە، بەڵام ئەم عەلییە عەلی کوڕی ئەبو طالیب نییە. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ١٥١٦، ١٥١٨}.

٧٦٤- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ إِذَا صَدَرَ مِنَ الْحَجِّ أَوِ الْعُمْرَةِ أَنَاخَ بِالْبَطْحَاءِ الَّتِى بِذِى الْحُلَيْفَةِ الَّتِى كَانَ يُنِيخُ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٢٧١ = ٣٢٦٠ فم. بخارى. حج: ١٧٦٥}:

نافیع فەرمووی: عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) کاتێ لە حەج یا لەعەمرە دەگەڕایەوە، لە زیخەڵانەکەی وا لەزول حولەیفە، وچانێکی دەگرت، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوێ وچانی دەگرت. {بڕوانە ژمارەی پێش ئەم ژمارەیە}.

٧٦٥- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) أُتِىَ وَهُوَ فِى مُعَرَّسِهِ مِنْ ذِى الْحُلَيْفَةِ فِى بَطْنِ الْوَادِى، فَقِيلَ: إِنَّكَ بِبَطْحَاءَ مُبَارَكَةٍ. قَالَ مُوسَى: وَقَدْ أَنَاخَ بِنَا سَالِمٌ بِالْمُنَاخِ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِى كَانَ عَبْدُ اللَّهِ يُنِيخُ بِهِ يَتَحَرَّى مُعَرَّسَ رَسُولِ اللَّهِ

(صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ أَسْفَلُ مِنَ الْمَسْجِدِ الَّذِى بِبَطْنِ الْوَادِى، بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ وَسَطًا مِنْ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٢٧٣ = ٣٢٦٢ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٣٧ = ١٥٣٥. أبو داود. مناسك: ٢٠٤٤. نسائى. حج: ٢٦٦٠}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لە موعەڕڕەس، لە زولحولەیفە، لەناو شیوی عەقیقا، لە خەوندا، پێی گوترا: تۆ وایت لەناو شیوێکی زیخەلاناوی پیرۆزدا).

مووسای کوڕی عوقبە، کە ئەم فەرموودەیە لە سالمەوە دەگێڕێتەوە، کە سمالیش لە عەبدوڵلای کوڕی عومەری باوکیەوە دەیگێڕێتەوە، ئەم مووسایە فەرمووی: سالم لەو هەوارەدا وچانی پێمان دەگرت، کەوا لەلای ئەو مزگەوتەدا، کە عەبدوڵلای باوکی لەوێ وچانی دەگرت، کە ئەو مزگەوتەی ئەو سەردەمە هەبوو، لەناو شیوەکەدا بوو، کە پێی دەگوترێ شیوی عەقیق، جێگە هەوارەکە دەکەوتە نێوانی ئەو مزگەوتەو نێوانی ڕێگەکە لەبەری قیبلەوە، لەناوەڕاستی ئەم دوانەدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٩١، ژمارە: ١٥٣٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

موعەررەس ئەو هەوارگەیە، کە پێغەمبەر خۆی لەوێ دابەزیوە بۆ وچان، چوار میل لە مەدینەوە دوورە، گوتەی هەرە دروست ئەوەیە، کە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەهەردوو سەرەوە، کە چووە بۆ مەککەو کە لە مەککە گەڕاوەتەوە، لەو هەوارگەیە وچانی گرتووە.

**٦٠٥) کردنی مەککە بە بەستێکی ڕیزداری وا کەڕاوی تیا نادروستە. بڕینی دارو درەخت نادروستە. هەڵگرتنەوەی شتی ونبوو، بەنیازی خواردنی نادروستە.**

**(٣٢٨٩ - ٣٢٩٣) باب: في تحريم مكّة وصيدها طوشجرها ولُقطتها**

٧٦٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: لَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَكَّةَ، قَامَ فِى النَّاسِ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ حَبَسَ عَنْ مَكَّةَ الْفِيلَ وَسَلَّطَ عَلَيْهَا رَسُولَهُ وَالْمُؤْمِنِينَ، وَإِنَّهَا لَنْ تَحِلَّ لأَحَدٍ كَانَ قَبْلِى،

وَإِنَّهَا أُحِلَّتْ لِى سَاعَةً مِنْ نَهَارٍ، وَإِنَّها لَنْ تَحِلَّ لأَحَدٍ بَعْدِى، فَلاَ يُنَفَّرُ صَيْدُهَا، وَلاَ يُخْتَلَى شَوْكُهَا، وَلاَ تَحِلُّ سَاقِطَتُهَا إِلاَّ لِمُنْشِدٍ، وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ، فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ، إِمَّا أَنْ يُفْدَى، وَإِمَّا أَنْ يُقْتَلَ، فَقَالَ الْعَبَّاسُ: إِلاَّ الإِذْخِرَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَإِنَّا نَجْعَلُهُ فِى قُبُورِنَا وَبُيُوتِنَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): إِلاَّ الإِذْخِرَ، فَقَامَ أَبُو شَاهٍ - رَجُلٌ مِنْ أَهْلِ الْيَمَنِ – فَقَالَ: اكْتُبُوا لِى يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اكْتُبُوا لأَبِى شَاهٍ »، قَالَ الْوَلِيدُ: فَقُلْتُ لِلأَوْزَاعِىِّ: مَا قَوْلُهُ: اكْتُبُوا لِى يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ قَالَ: هَذِهِ الْخُطْبَةَ الَّتِى سَمِعَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٢٩٢ = ٣٢٨١ فم. تجريد/١، رقم: ٩٢ = ١١٢، ٢٤٣٤، ٦٨٨٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: كاتێ خودای گەورە، مەككەی ئازادكرد لەسەر دەستی پێغەمبەردا، (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مەردومەكەدا هەڵسایەوە وتارێكی فەرموو، سوپاسو ستایشێكی جوانی خودای كرد، ئەوجا فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر، مەككەی پاراست لە دەستدرێژی خاوەن فیلەكان، كە ئەبرەهەو لەشكرەكەی بوون، كە هاتبوون بۆ رووخاندنی كەعبە، وەك لە قورئانا لە سوورەتی فیلدا باسكراوە، وە بەپشتیوانی خودا، پێغەمبەری خوداو موسوڵمانەكان لەرۆژی ئازادكردنی (فەتح)ی مەككەدا، زاڵبوون بەسەر گرتنی ئەم شارەدا، بەڵام باش باش بزانن كە ئەم شارە نە لەپێش مندا، وەنە لەپاش من بۆ كەس رەوا نەبینراوەو رەوا نابینرێ، كە رێزی بشكێنیو شەڕو شوڕی تیابكا، ئاگاداربن تەنانەت بۆ منیش بۆ ماوەیەكی كەم لەو رۆژەدا كوشتاری تیا رەوا بوو، باش ئاگاداربن ئا ئێستا لەم دەمەدا شارێكی بەرێزو قەدەغەیە، كەوابوو نە نەچیری دەرەوێنرێتەوە، وە نەدڕكو داڵو گیاو گوژەی پاكۆ دەدرێ، وە نەشتی داكەوتووی هەڵدەگیرێتەوە، مەگەر بۆ كەسێ كە ناونیشانی هەڵبدا، هەتا خاوەنەكەی پەیدا ببێو بیباتەوە، وە هەركەسێ كەسێكی كوژرا، ئەوا خۆی لەیەكێ لەم دوو بڕیارە سەرپشكە: یا خوێن وەربگرێ، یا تۆڵەی بۆ دەسەندرێو لەجیاتی كوژراوەكەی بكوژەكە دەكوژێتەوە).

عەبباسی مامەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە عەبباس بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تەنیا گیای سوڕناتك (إِذْخَر)ی لێ

دەرچێ، چونکە ئەم گیایە بۆ سەرگرتنی سەری گۆڕیچەی گۆڕو بۆ پڕکردنەوەی کونو بۆشایی نێوانی خشتو تەختە بەردەکانی سەر ئەڵحەدەکەو بۆ سووتەمەنی ناوماڵو بۆ پەردووی سەر دارەڕاو شتی وا بەکاری دەهێنین؟ پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (باشە، تەنیا گیای سوڕناتکی لێ دەرچێ).

جا پیاوێکی یەمەنی، کە پێیان دەگوت ئەبو شاه، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمان بفەرموو بە هاوەڵەکانت کە بۆم بنووسنەوە؟ حەزرەتیش (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بینووسن بۆ ئەبو شاه).

وەلیدی کوڕی موسلیم، کە کەسی سێیەمە، لە پیاوانی رشتە (سەنەد)ی ئەم فەرموودەیە دەفەرموێ: عەرزی مامۆستاکەی خۆمم کرد، بۆ ئەم فەرموودەیە، کە ئیمامی ئەوزاعییە: ئەبو شاه مەبەستی چییە کە دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆم بنووسنەوە؟ فەرمووی: مەبەستی ئەبو شاه ئەوە بووە، کە ئەم وتارەی کە لە پێغەمبەری بیستووە بۆی بنووسنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ١٧٠٣}.

٧٦٧- عَنْ جَابِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يَحِلُّ لأَحَدِكُمْ أَنْ يَحْمِلَ بِمَكَّةَ السِّلاَحَ ». {الحديث: ٣٢٩٤ = ٣٢٨٣ فم}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (دروست نییە بۆ کەستان لە مەککەدا چەك هەڵبگرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ١٧٠٤}.

## ٦٠٦) چوون بۆ مەککە بەبێ ئیحرام بەستن دروستە چونکە پێغەمبەر خۆی لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا وایکردووە. (٣٢٩٥ - ٣٢٩٩)

## باب: دُخُولُ النَّبيِّ {صلى الله عليه وسلم} مكَّةَ غيْر مُحْرِم يوْمَ الفتْح

٧٦٨- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ الأَنْصَارِيِّ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ مَكَّةَ، (وَقَالَ قُتَيْبَةُ دَخَلَ يَوْمَ فَتْحِ مَكَّةَ) وَعَلَيْهِ عِمَامَةٌ سَوْدَاءُ بِغَيْرِ إِحْرَامٍ. {الحديث: ٣٢٩٦ = ٣٢٨٥ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلای ئەنصاری (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: لەڕۆژی ئازادکردنی مەککەدا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەهاتە ناو شاری مەککەوە، مێزەرێکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، چونکە لەوکاتەدا لەبەرگی ئیحرامدا نەبوو. {تاج/٢، زنجیره: ١٣١، ژماره: ١٧٠٩}.

٧٦٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ مَكَّةَ عَامَ الْفَتْحِ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ فَلَمَّا نَزَعَهُ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ: ابْنُ خَطَلٍ مُتَعَلِّقٌ بِأَسْتَارِ الْكَعْبَةِ، فَقَالَ: « اقْتُلُوهُ ». {الحديث: ٣٢٩٥ = ٣٢٨٤ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٤٧ = ١٨٤٦، ٣٠٤٤، ٤٢٨٦، ٥٨٠٨}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (خودای لێ ڕازای بێ) فەرمووی: لەساڵی ئازادکردنی مەککەدا، کاتێ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) هاتە ناو شاری مەککەوە، کڵاو زریەیەکی لەسەردا بوو، کە کڵاو زریەکەی داکەند، لەوکاتەدا پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئیبنو خەطەل ئەو دوشمنە پیسە، دامێنی کەعبەی گرتووەو پەنای بردۆتە بەربەیت لەترسانا، جا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بیکوژن ئامانی مەدەن) جا نەضلەی کوڕی عوبەید، بەهاوکاری سەعیدی کوڕی حورەیث کوشتی، چونکە کاتی خۆی لە ئیسلام وەرگەڕا بوو، وە موسوڵمانێکی بەناڕەوا کوشتبوو، وە خوسپو هەجوی پێغەمبەریشی دەکرد). {تاج/٢، زنجیره: ١٣١، ژماره: ١٧٠٨}.

## ٦٠٧) باسی حیجری ئیسماعیلو دەرگاکەی کابە (٣٢٢٧ - ٣٢٣٧)
## باب: في جَدْرِ الكعبةِ وبَابِها

٧٧٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْجَدْرِ أَمِنَ الْبَيْتِ هُوَ؟ قَالَ: نَعَمْ، قُلْتُ: فَلِمَ لَمْ يُدْخِلُوهُ فِى الْبَيْتِ؟ قَالَ: « إِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرَتْ بِهِمُ النَّفَقَةُ، قُلْتُ: فَمَا شَأْنُ بَابِهِ مُرْتَفِعًا؟ قَالَ: « فَعَلَ ذَلِكِ قَوْمُكِ لِيُدْخِلُوا مَنْ شَاءُوا، وَيَمْنَعُوا مَنْ شَاءُوا وَلَوْلاَ أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ فِى الْجَاهِلِيَّةِ، فَأَخَافَ أَنْ

تُنْكِرَ قُلُوبُهُمْ لَنَظَرْتُ أَنْ أُدْخِلَ الْجَدْرَ فِي الْبَيْتِ، وَأَنْ أُلْزِقَ بَابَهُ بِالأَرْضِ ». {الحديث: ٣٢٣٦ = ٣٢٢٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٧٥٩ = ١٥٨٤، ٧١٤٣. تحفة الأشراف: ١٦٠٠٥}:

عائيشه (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پرسیارم کرد لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ): ئایا حیجری ئیسماعیل لە بنەڕەتدا بەشێکە لە ماڵی بەیت یانا؟ فەرمووی: (بەڵێ بەشێکە لەماڵی بەیت). عەرزیم کرد: ئەی بۆچی ئێستا نەخراوەتەوە سەر بەیت؟ فەرمووی: (چونکە گەلی تۆ کاتێ کە کابەیان دروست کردەوە دەستیان کورت بوو، لەبەرئەوە نەیان توانی کە کابە لەسەر بناغەکەی حەزرەتی ئیبراهیم دروست بکەنەوە، ئەو ماوەیە کەپێی دەگوترێ حیجری ئیسماعیل بەجێما).

گوتم: ئەی بۆچی دەرگای کابە بەرزە؟ فەرمووی: (گەلی تۆ کە هۆزی قوڕەیشە، بۆیە وا لەبەرزی دەرگای کابەیان دروست کردووە، هەتا بەئارەزووی خۆیان کێیان ویست کە بچێتە ناوی ڕێگەی پێ بدەن‌و کێیان نەویست نەهێڵن بچێتە ناوی، لەبەرئەوە نەبێ کە گەلی تۆ هێشتا نۆ موسوڵمانن‌و دەترسم لەدڵەوە پێیان ناخۆش بێ، دەنا حیجرم دەخستەوە سەر بەیت‌و دەرگاکەیشم لەسەر زەوی دادەنا، نەوەك وەك ئێستای ئاوا بە بەرزەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ١٧٢١، ١٧٢٠، ١٧٢٢}.

## ٦٠٨) رووخانی ماڵی کابەو دروستکردنەوەی (٣٢٢٧ - ٣٢٣٧)

## باب: فِي نَقْضِ الكَعْبَةِ وَبِنَائِهَا

٧٧١- عَنْ عَطَاءٍ قَالَ: لَمَّا احْتَرَقَ الْبَيْتُ زَمَنَ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ حِينَ غَزَاهَا أَهْلُ الشَّامِ، فَكَانَ مِنْ أَمْرِهِ مَا كَانَ، تَرَكَهُ ابْنُ الزُّبَيْرِ حَتَّى قَدِمَ النَّاسُ الْمَوْسِمَ يُرِيدُ أَنْ يُجَرِّئَهُمْ، أَوْ يُحَرِّبَهُمْ عَلَى أَهْلِ الشَّامِ، فَلَمَّا صَدَرَ النَّاسُ قَالَ: يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَشِيرُوا عَلَيَّ فِي الْكَعْبَةِ أَنْقُضُهَا ثُمَّ أَبْنِي بِنَاءَهَا، أَوْ أُصْلِحُ مَا وَهَى مِنْهَا؟ قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: فَإِنِّي قَدْ فُرِقَ لِي رَأْيٌ فِيهَا، أَرَى أَنْ تُصْلِحَ مَا وَهَى مِنْهَا، وَتَدَعَ بَيْتًا أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهِ، وَأَحْجَارًا أَسْلَمَ النَّاسُ عَلَيْهَا، وَبُعِثَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم). فَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ: لَوْ كَانَ أَحَدُكُمُ احْتَرَقَ بَيْتُهُ مَا رَضِيَ حَتَّى يُجِدَّهُ فَكَيْفَ بَيْتُ رَبِّكُمْ؟ إِنِّي مُسْتَخِيرٌ رَبِّي ثَلاَثًا، ثُمَّ عَازِمٌ عَلَى أَمْرِي فَلَمَّا مَضَى الثَّلاَثُ أَجْمَعَ رَأْيَهُ عَلَى أَنْ يَنْقُضَهَا، فَتَحَامَاهُ النَّاسُ أَنْ يَنْزِلَ بِأَوَّلِ

النَّاسِ يَصْعَدُ فِيه أمْرٌ مِنَ السَّمَاءِ، حَتَّى صَعِدَهُ رَجُلٌ، فَـألْقَى مِنْـهُ حِجَارَةً فَلَمَّا لَمْ يَرَهُ النَّاسُ أصَابَهُ شَيْءٌ تَتَابَعُوا فَنَقَضُوهُ حَتَّى بَلَغُوا بِهِ الأرْضَ، فَجَعَلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ أعْمِدَةً فَسَتَّرَ عَلَيْهَا السُّتُورَ حَتَّى ارْتَفَعَ بِنَاؤُهُ. وَقَالَ ابْنُ الزُّبَيْرِ إنِّي سَمِعْتُ عَائِشَةَ تَقُولُ إنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لَوْلاَ أنَّ النَّاسَ حَدِيثٌ عَهْدُهُمْ بِكُفْرٍ، وَلَيْسَ عِنْدِي مِنَ النَّفَقَةِ مَا يُقَوِّي عَلَى بِنَائِهِ، لَكُنْتُ أدْخَلْتُ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ خَمْسَ أذْرُعٍ. وَلَجَعَلْتُ لَهَا بَابًا يَدْخُلُ النَّاسُ مِنْهُ، وَبَابًا يَخْرُجُونَ مِنْهُ »، قَالَ: فَأنَا الْيَوْمَ أجِدُ مَا أُنْفِقُ، وَلَسْتُ أخَافُ النَّاسَ. قَالَ: فَزَادَ فِيهِ خَمْسَ أذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ حَتَّى أبْدَى أُسًّا نَظَرَ النَّاسُ إلَيْهِ، فَبَنَى عَلَيْهِ الْبِنَاءَ، وَكَانَ طُولُ الْكَعْبَةِ ثَمَانِي عَشْرَةَ ذِرَاعًا، فَلَمَّا زَادَ فِيهِ اسْتَقْصَرَهُ، فَزَادَ فِي طُولِهِ عَشْرَ أذْرُعٍ، وَجَعَلَ لَهُ بَابَيْنِ، أحَدُهُمَا يُدْخَلُ مِنْهُ، وَالآخَرُ يُخْرَجُ مِنْهُ، فَلَمَّا قُتِلَ ابْنُ الزُّبَيْرِ كَتَبَ الْحَجَّاجُ إلَى عَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ يُخْبِرُهُ بِذَلِكَوَيُخْبِرُهُ أنَّ ابْنَ الزُّبَيْرِ قَدْ وَضَعَ الْبِنَاءَ عَلَى أُسٍّ نَظَرَ إلَيْهِ الْعُدُولُ مِنْ أهْلِ مَكَّةَ، فَكَتَبَ إلَيْهِ عَبْدُ الْمَلِكِ: إنَّا لَسْنَا مِنْ تَلْطِيخِ ابْنِ الزُّبَيْرِ فِي شَيْءٍ أمَّا مَا زَادَ فِي طُولِهِ فَأقِرَّهُ، وَأمَّا مَا زَادَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ فَرُدَّهُ إلَى بِنَائِهِ وَسُدَّ الْبَابَ الَّذِي فَتَحَهُ، فَنَقَضَهُ وَأعَادَهُ إلَى بِنَائِهِ. {الحديث: ٣٢٣٢ = ٣٢٢١ فم}:

عەطاء (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: کاتێ خەڵکی شام، لەسەردەمی یەزیدی کوڕی موعاییەدا، هێرشیان هێنایە سەر مەککەو ئەوەی روویدا رووی‌داو کەعبە سووتاو درایە بەرمەنجەنیق‌و بەهۆی مردنی یەزیدەوە، لەشکرەکە گەڕانەوە بۆ شام، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر، کرا بەخەلیفە لەسەر وڵاتی حیجاز، جا ئیبنو زوبەیر کابەی بە سووتاوی هێشتەوە، هەتا کاتی وەرزی حەج، هەتا خەڵکی وڵاتان بزانن کە بەنی ئومەییە چی بێ ڕێزییەکیان بە بەیتی قیبلەی موسوڵمانان کردووە، تا تووڕەیان بکا لەخەڵکی شام، کاتێ خەڵکەکە ویستیان بگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، ئیبنو زوبەیر راوێژی پێیان کردو فەرمووی: (ئەی خەڵکینە! راوێژ بە ئێوە دەکەم، لەبارەی کابەوە، ئایا تێکی بدەم‌و پاشان دروستی بکەمەوە، یا هەر ئەوەی کە رووخاوە چاکی بکەمەوەو بەس، ئێوە دەڵێن چی؟ ئیبنو عەبباس فەرمووی: من دیدێکم بۆ دەرکەوتووە، لەبارەی ئەم کارەوە، بەدیدو بۆچوونی من واباشە ئەوەی

كه رووخاوه چاكى بكەيتەوەو دەسكارى زياترى نەكەى واز لەبەيت بێنە يا لەسەر ئەو حاڵە بمێنىٚ كە لەسەرەتاوە موسوڵمانان تيا موسوڵمان بوون، بەردەكانى وەك يادگارى ئەو سەرەتاى ئيسلامەتييە بمێننو تا بزانرىٚ كە ئەو بارودۆخەى كەعبەى تيابووە لەسەرەتاى پێغەمبەرايەتى پێغەمبەرەوە چۆن بووە. بەڵام ئيبنو زوبەير بەمە قاييل نەبوو، بۆيە گوتى: گريمان كەسىٚ لەئێوە خانووەكەى بسووتىٚ، جگە لەتازە كردنەوەى بەهيچى تر رازى دەبىٚ؟ دەى بەيت خانووى پەروەردگارمانە، ئەو شايانترە كە تازەى بكەينەوە؟ من سىٚ رۆژ داواى بەرچاو روونى لەم بارەيەوە لەخوداى خۆم دەكەم، دوائەوە چيم بۆ روون بووە، بەبىٚ سىىو دوو دەيكەمو بڕيارى كۆتايى دەدەم، جاكە سىٚ رۆژەكە تەواو بوو، بڕيارى ئێجگاريدا كە بيڕووخێنىٚ، خەڵكەكە دەترسان، كەس نەيدەوێرا دەست بكا بەرووخاندنى، لەوە دەترسان كە يەكەم كەس، ئەگەر بچێتە سەركابە بۆ رماندنى، بەڵايىٚ لە ئاسمانەوە بۆى دابەزىٚو بيفەوتێنىٚ!!

تا پياوىٚ زاتى دايە بەرخۆىو سەركەوتە سەر بەيتو دەستى كرد بەهەڵوەشاندنى بەردەكانىو بەرديٚكى لىٚ فڕێدايە خوارەوەو هيچ رووى نەدا، كە خەڵكەكە بينييان پياوەكە هيچى لىٚ نەهات ئەوانيش دەستيان كرد بە تێكدانىو هەتا سەر زەوييەكە رووخانديانو تەختيان كرد.

جا لەبەرئەوە كە نوێژ خوێنان بەبىٚ قيبلە نەمێننەوە، ئيبنو زوبەير كۆمەڵىٚ كۆڵەكەى بەدەورى شوێنى كابەدا داچەقاندو پەردەى تێوە پێچان، هەتا خەڵكەكە جێگەى كابە بزانن، هەتا خانووى بەيت بەرزەوە بوو، ئەوسا كۆڵەكەو پەردەكانيان لابرد، هەروا ئيبنو زوبەير بۆ پشتيوانى ديدو بۆچوونى خۆى سەبارەت بەرِمانى خانووى كابەو چاككردنەوەى، فەرمووى: لە عائيشەى پوورمم بيستووە دەيفەرموو: پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بىٚ) دەيفەرموو: (لەبەرئەوە نەبىٚ كە خەڵكەكە نوٚ موسوڵمانن‌و دەترسم لەدڵەوە پێيان ناخۆش بىٚو لەهەمان كاتا ئێستا لەم رۆژەمدا، پارەو پوولى ئەوەيشم نييە كە بەيت تێك بدەمو دروستى بكەمەوە، ئەگەر

لەبەر ئەم دوو هۆیە نەبوایە بەیتم تێك دەداو دروستم دەکردەوەو پێنج گەزم دەخستە سەری، وە دوو دەرگایشم بۆی دروست دەکرد، لە یەکێکیانەوە خەڵك دەچوونە ژوورەوەو لەویتریانەوە دەردەچوون!)

ئیبنو زوبەیر بۆ زێدە پشتگیری لە هەڵوێستی خۆی گوتی: دەی ئێستا من ئەم دوو مەترسییەم نییە، چونکە پارەو پوولی ئەوەم هەیە، مەترسیشم لە خەڵکەکە نەماوە، چونکە سەردەمی نۆ موسوڵمانەتی تەواو. فەرمووی: جا ئیبنو زوبەیر خانووی بەیتی رووخاندو کاتێ دروستی کردەوە، پێنج باڵ (ذراع)ی لە حیجری ئیسماعیل خستە سەری، لە حیجردا گەڕان بۆ بناغەکانی ئیبراهیم، کە دۆزییانەوە پێشانی خەڵکەکەیان داو ئەوجا دیواری زیادەکەیان لەسەر ئەو بناغەیە بەرزەوە کرد، لەپێشا بەرزیی کەعبە هەژدە باڵ بوو، کەلە رووبەرەکەیان زیادکردو لە حیجریان خستە سەری، بەرزییەکە کەم دەهاتە بەرچاو نزم دەینواند، لەبەرئەوە ئیبنو زوبەیر دەباڵی تر دیوارەکانی بەرزەوە کرد، وە دوو دەرگای بۆ دروست کرد، یەکێکیان بۆ چوونە ژوورەوە، ئەویتریان بۆ لێوە دەرچوون.

جاکاتێ حەججاج عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیری کوشت، نامەی نووسی بۆ عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، کە جێنشین بوو، وە هەواڵی ئەم گۆڕانکاریەی کابەی پێ راگەیاند، کە ئیبنو زوبەیر کردبووی، وە ئەویشی پێ راگەیاند، کە ئیبنو زوبەیر کاتێ بناغەی کابەی داناوە، لەسەر بناغەکانی ئیبراهیم دایناوەتەوەو بۆ ئەمە پیاو ماقوڵانی مەککەی کردووە بەشایەتو پرسو رای پێ کردوون، بەڵام عەبدولمەلیك بەوە رازی نەبوو، نامەی نووسی بۆ حەججاجو تیادا نووسی: ئێمە بەرین لەم دەستکاریە چەپەڵەی کە ئیبنو زوبەیر لە بەیتا کردوویەتیو کارمان بەم چەپەڵکاریەی ئەو نییە، ئەوەندە هەیە ئەوەی کە لەبەرزییەکەی زیادی کردووە باوەك خۆی بمێنێ، وەلێ ئەوە کە لەحیجر خستوویەتە سەر رووبەری کاعبە، ئەوە بڕووخێنەو بیبەرەوە سەر بناغەکەی جارانی، وە ئەو دەرگایەی کە ئیبنو زوبەیر زیادی کردووە دایخە. جا حەججاجیش رووخاندیو بردیەوە سەر

دۆخی جارانی. {بڕوانه: ژماره: ٨ كه لهپێشهوه رابورد، بۆ تێگهیشتن لهم فهرموودهیه}.

٧٧٢- عَنْ أَبِى قَزَعَةَ: أَنَّ عَبْدَ الْمَلِكِ بْنَ مَرْوَانَ بَيْنَمَا هُوَ يَطُوفُ بِالْبَيْتِ، إِذْ قَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ ابْنَ الزُّبَيْرِ حَيْثُ يَكْذِبُ عَلَى أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، يَقُولُ: سَمِعْتُهَا تَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَا عَائِشَةُ لَوْلاَ حِدْثَانُ قَوْمِكِ بِالْكُفْرِ لَنَقَضْتُ الْبَيْتَ حَتَّى أَزِيدَ فِيهِ مِنَ الْحِجْرِ، فَإِنَّ قَوْمَكِ قَصَّرُوا فِى الْبِنَاءِ ». فَقَالَ الْحَارِثُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِى رَبِيعَةَ: لاَ تَقُلْ هَذَا يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ فَأَنَا سَمِعْتُ أُمَّ الْمُؤْمِنِينَ تُحَدِّثُ هَذَا. قَالَ: لَوْ كُنْتُ سَمِعْتُهُ قَبْلَ أَنْ أَهْدِمَهُ لَتَرَكْتُهُ عَلَى مَا بَنَى ابْنُ الزُّبَيْرِ. {الحديث: ٣٢٣٥ = ٣٢٢٤ فم}:

ئهبو قهزهعه (رهحمهتی خودای لێ بێ) فهرمووی: گوێم لێبوو عهبدولمهلیكی كوڕی مهڕوان، تهوافی بهیتی دهكردو دهیگوت: خوا بچێ بهگژی عهبدوڵلای كوڕی زوبهیرا، بۆ خۆیو بۆ درۆی كه بهدهم دایكی بڕوادارانهوه دهیكا، بهدرۆی خۆی دهڵێ: گوێم له حهزرهتی عائیشه بوو دهیفهرموو: پێغهمبهر (دروودی خودای لهسهر بێ) فهرمووی پێم: (ئهی عائیشه! ئهگهر لهبهرئهوه نهبێ كه گهلی قوڕهیشی تۆ نۆ موسوڵمانن‌و دهترسم لهدلهوه پێیان ناخۆش بێ، چونكه هیشتا كهم‌و زۆر بیرو باوهڕی كۆنی سهردهمی نهزانی كاریان لێ دهكا، ئهگینا بهیتم تێك دهداو ههندێكم لهزهوی حیجری ئیسماعیل دهخسته سهری، چونكه هۆزی تۆ كاتێ خانووی بهیتیان دروست كردهوه، دهستیان كورت بوو، لهبهرئهوه له رووبهری بهیتیان كهم كردهوه).

جا كه عهبدولمهلیك، ئهم بوختانهی بۆ ئیبنو زوبهیر كرد، حاریثی كوڕی عهبدوڵلای كوڕی ئهبو رهبیعه، كه پیاوێكی زۆر باوهڕپێكراو بوو، به عهبدولمهلیكی گوت: وا مهڵێ، ئهی فهرمانڕهوای موسوڵمانان! چونكه من بهخودی خۆم ئهم فهرمایشتهم لهزاری دایكی باوهڕداران حهزرهتی عائیشه بیستووه، كهواته ئیبنو زوبهیر راستی كردووه، درۆی نهكردووه. عهبدولمهلیك گوتی: خۆزگه ئهمهم لهپێش ئهوهدا ببیستایه، كه بهیتم تێك دا، ئهوكاته نهمدهرووخان‌و لهسهر ئهو شێوهیهی كه ئیبنو زوبهیر دروستی كردبوو دهمهێشتهوه).

### ٦٠٩) كردنی مەدینە بە بەستێكی ڕێزداری وا كەڕاوو شكاری تیا قەدەغە بێو بڕینی دارو درەختی قەدەغە بێو نزاو پاڕانەوەی باش بۆی (٣٣٠٠ - ٣٣٢٢)

### باب: تحْرِمُ المدينةِ وصيْدها وشجرِها والدُّعاءُ لها

٧٧٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ زَيْدِ بْنِ عَاصِمٍ (رضى الله عنـه) أَنَّ رَسُولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ إِبْرَاهِيمَ حَرَّمَ مَكَّةَ، وَدَعَا لأَهْلِهَا، وَإِنِّى حَرَّمْتُ الْمَدِينَـةَ كَمَا حَـرَّمَ إِبْرَاهِيمُ مَكَّةَ، وَإِنِّى دَعَوْتُ فِى صَاعِهَا وَمُدِّهَا بِمِثْلَىْ مَا دَعَـا بـه إِبْـرَاهِيمُ لأَهْـلِ مَكَّـةَ ».
{الحديث: ٣٣٠٠ = ٣٢٨٨ فم}:

عەبدوڵڵای كوڕی زەیدی كوڕی عاصیم (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (حەزرەتی ئیبراهیم (سڵاوی خودای لێ بێ) بەفەرمانی خودا مەككەی كردووە بە حەرەمو بەستێكی ئەمینو هێمنو، قەدەغەی كردووە كەكاری ناشایستەی تیادا بەرپابكرێ، وە دووعاو نزای باشیی كردووە بۆ دانیشتوانی، وەمنیش بە فەرمانی خودا مەدینەم حەرام كردووەو كردوومە بە بەستو حەرەم، هەروەك چۆن ئیبراهیم مەككەی حەرام كردووەو كردوویەتی بە بەستو حەرەم، وە من دووعاو نزای پیتو فەڕم كردووە بۆ مەنو مشتی مەدینە، بۆ عەیارەو ئەندازەی كێشانو پێوانی، دوو قاتی ئەو دووعاو نزایەی كە ئیبراهیم كردوویەتی بۆ مەككە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٢}.

٧٧٤- عَنْ بن أبي وقاص (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنِّى أُحَرِّمُ مَا بَيْنَ لاَبَتَىِ الْمَدِينَةِ أَنْ يُقْطَعَ عِضَاهُهَا أَوْ يُقْتَلَ صَيْدُهَا وَقَالَ: الْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، لاَ يَدَعُهَا أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا إِلاَّ أَبْدَلَ اللَّهُ فِيهَا مَنْ هُوَ خَيْرٌ مِنْهُ، وَلاَ يَثْبُتُ أَحَدٌ عَلَى لأْوَائِهَا وَجَهْدِهَا إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ».
{الحديث: ٣٣٠٥ = ٣٢٩٣ فم}:

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (من لەم پەڕی مەدینەوە هەتا ئەوپەڕی مەدینەم حەرام كردووە، لەخڕە بەرداوییەكەی ئەم پەڕییەوە، تا خڕەبەردایيەكەی ئەوپەڕیم كردووە بە بەستو حەرەمو قەدەغەو پاوان، دڕكو داڵو دارو درختی نابڕێ، نێچیری ڕاو

ناكرێو ناكوژرێ). وه فەرمووشی: (ئەگەر ئەو خەڵكە دەیانزانی كە مەدینە چەندە باشە بۆ نیشتەجێ بوونیان، كەسێ مەدینەی جێ نەدەهێشت، هەركەسێ مەدینە بەجێ بهێڵێ، لەبەرئەوەی كە ئارەزووی لەوێ نەمابێ، مسۆگەر كە خودا بەلەو باشتر جێگەی پڕدەكاتەوە لەمەدینە، هەركەسێ خۆی رابگرێ، لەبەر زەبرو ئەركی مەدینەداو ئارام بگرێ لەسەر كەم دەستیو شتی وا، لەرۆژی قیامەتا خۆم دەبم بەتكاكار، یا شایەت بۆی).

٧٧٥- عَنْ عَامِرِ بْنِ سَعْدٍ: أَنَّ سَعْدًا (رضى الله عنه) رَكِبَ إِلَى قَصْرِهِ بِ(الْعَقِيقِ) فَوَجَدَ عَبْدًا يَقْطَعُ شَجَرًا أَوْ يَخْبِطُهُ، فَسَلَبَهُ، فَلَمَّا رَجَعَ سَعْدٌ جَاءَهُ أَهْلُ الْعَبْدِ فَكَلَّمُوهُ أَنْ يَرُدَّ عَلَى غُلاَمِهِمْ أَوْ عَلَيْهِمْ مَا أَخَذَ مِنْ غُلاَمِهِمْ، فَقَالَ: مَعَاذَ اللَّهِ أَنْ أَرُدَّ شَيْئًا نَفَّلَنِيهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبَى أَنْ يَرُدَّ عَلَيْهِمْ. {الحديث: ٣٣٠٧ = ٣٢٩٥ فم}:

سەعدی كوڕی ئەبو وەققاص (خودای لێ رازی بێ) سواربوو، چوو بۆ كۆشكەكەی لە عەقیق، تەماشای كرد كەوا خولامێ دار دەبڕێ، جا سەعد رووتی كردەوە، لەپاشا خاوەنی خولامەكە هاتە لای سەعدو داوای لێكرد كە جلكو بەرگی خولامەكە بداتەوە پێی، ئەو جلكو بەرگەی كە بردبووی بۆ خۆی، سەعدیش گوتی: پەنادەگرم بەخودا لەوە كە هەڵەی وابكەم: ئەو تالانییەی كە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رەوای دیوە بۆ من، من نەمەوێو بچم بیدەمەوە بەكابرا! وه هیچی پێ نەدانەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٠، ژمارە: ١٧٣٥}.

٧٧٦- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اللَّهُمَّ اجْعَلْ بِالْمَدِينَةِ ضِعْفَىْ مَا بِمَكَّةَ مِنَ الْبَرَكَةِ ». {الحديث: ٣٣١٣ = ٣٣٠١ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٩ = ١٨٨٥. تحفة الأشراف: ١٥٥٩}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودایە! دوو قاتی مەككە پیتو فەڕ بخەرە مەدینەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ١٧٤٢}.

٧٧٧- عَنْ إِبْرَاهِيمَ التَّيْمِيِّ عَنْ أَبِيهِ قَالَ: خَطَبَنَا عَلِيُّ بْنُ أَبِي طَالِبٍ (رضى الله عنه) فَقَالَ: مَنْ زَعَمَ أَنَّ عِنْدَنَا شَيْئًا نَقْرَأُهُ إِلاَّ كِتَابَ اللَّهِ وَهَذِهِ الصَّحِيفَةَ، (قَالَ وَصَحِيفَةٌ مُعَلَّقَةٌ فِي قِرَابِ سَيْفِهِ) فَقَدْ كَذَبَ، فِيهَا أَسْنَانُ الإِبِلِ وَأَشْيَاءُ مِنَ الْجِرَاحَاتِ، وَفِيهَا: قَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « الْمَدِينَةُ حَرَمٌ مَا بَيْنَ عَيْرٍ إِلَى ثَوْرٍ فَمَنْ أَحْدَثَ فِيهَا حَدَثًا، أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً. وَذِمَّةُ الْمُسْلِمِينَ وَاحِدَةٌ، يَسْعَى بِهَا أَدْنَاهُمْ، وَمَنِ ادَّعَى إِلَى غَيْرِ أَبِيهِ أَوِ انْتَمَى إِلَى غَيْرِ مَوَالِيهِ، فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يَقْبَلُ اللَّهُ مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفًا وَلاَ عَدْلاً ». {الحديث: ٣٣١٤ = ٣٣٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٩٥ = ٣٥٠٨، ٦٠٤٥ + تجريد/٢، رقم: ٨٥٦ = ١٨٧٠، ٣١٧٢، ٣١٧٩، ٦٧٥٥، ٧٣٠٠}:

ئیبراهیمی تەمیمی فەرمووی: باوکم فەرمووی: عەلی کوڕی ئەبو تالیب، وتارێکی بۆماندا، فەرمووی: هەرکەسێ گومانی وابێ، کە ئێمە، کە کەس و کاری پێغەمبەرین، نامەو نووسراوێکی تایبەتیمان لەلا هەیە، کە بەس خۆمان دەیخوێنین و لەلای خەڵکی ترنییە، هەرکەسێ گومانی وابکا درۆدەکا، ئێمەش کە ئال و بەیتی پێغەمبەرین، وەك سەرجەمی موسوڵمانانی تر بەگشتی، بەس قورئانی پیرۆزمان لەلا هەیە، کە نامەی خودایە، بەڵام لە سوننەتی پێغەمبەر، ئێمەیش وەك موسوڵمانانی تر، هەندێ فەرموودەمان لەلا هەیە، بەڵام بڕیارەکەی بۆ هەموانە نەك هەر بۆ خۆمان، وەك ئەم چەند فەرموودەیە، کە لەم تۆمارەدا نووسیومنەتەوە (فەرمووی: تۆمارێکی پێچراوە بوو، لەناو هەبگەی شمشێرەکەیدا دایناببوو بۆ پاراستنی، نەبادا بفەوتێ) ئەوجا عەلی فەرمووی: ئەمانە لەم تۆمارەدا نووسراون: تەمەنی ئەو وشترانەی دەدرێن بەخوێنداو چەند شتێ تر سەبارەت بەخوێنی زام و زامکاری. وە ئەمەیشی واتیادا: (مەدینە لە نێوانی چیای عەیرەوە هەتا چیای ثەور بەستە) (واتە: حەرەمە، بە فەرمانی شەرع کۆمەڵێ کاری تیا نادروستە کە لەشوێنانی تر، بەپێی مەرجی دیاریکراو دروستن). جا هەرکەسێ کارێکی ناڕەوای تیادا بەرپا بکا، یا پیاو خراپێکی تیادا پەنابدا، یا کارێکی

ناشایستەی تازە قەڵاّی تیادا بکا بەباو، لەعنەتو نەفرەتی خوداو نەفرەتو لەعنەتی هەموو فریشتەکانو لەعنەتو نەفرینی هەموو مرۆڤەکانی لێ بێ، لەڕۆژی قیامەتدا خودا نە فەرزو نە سوننەتی لێ قەبووڵ ناکا، لەئەستۆ گرتنی پەیمان بۆ موسوڵمانان وەك یەکە، هەموو موسوڵمانێ مافی ئەوەی هەیە کە پەیمانی ئەمان بەکافرانو بەبێ بڕوایان، بە پێی یاسا نامەی خودا بدا، هەرە خوارینەکەیان مافی ئەمان پێدانی هەیە، بەهەر کافرێ بیەوێ ئامانی پێبدا، وە هەرکەسێ حاشا لەباوکی خۆی بکاو خۆی بکا بەنەتەوەی پیاوێکی تر، یا حاشا بکا لە ئازادکەرانی خۆیو کەسانی تر بکا بە ئاغای ئازادکەری خۆی، لەعنەتو نەفرینی خوداو فریشتەکانو هەموو مرۆڤەکان لەو جۆرە کەسانەبێ، لە قیامەتدا نەتەوبەیان لێ قەبووڵ دەکرێ، نە تۆڵەو برێتیو کەفارەتیان لێ وەردەگیرێ). {تاج/١، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ١١٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٣٩، ژمارە: ١٧٣٣}.

**٧٧٨**- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يُؤْتَى بِأَوَّلِ الثَّمرِ فَيَقُولُ: « اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِى مَدِينَتِنَا وَفِى ثِمَارِنَا، وَفِى مُدِّنَا، وَفِى صَاعِنَا، بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ، ثُمَّ يُعْطِيهِ أَصْغَرَ مَنْ يَحْضُرُهُ مِنَ الْوِلْدَانِ. {الحديث: ٣٣٢٢ = ٣٣١٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جاران کە نۆبەرەی میوەو بەروبوومیان دەهێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەری دەگرتو دەیفەرموو: « اللَّهُمَّ بَارِكْ لَنَا فِى مَدِينَتِنَا وَفِى ثِمَارِنَا وَفِى مُدِّنَا وَفِى صَاعِنَا بَرَكَةً مَعَ بَرَكَةٍ »: خودایە! پیتو فەڕو پیرۆزیی بڕێژە بەسەر شارەکەمانا، بەسەر بەروبوومو میوەهاتمانا، بەسەر ئەیارەو مشتو مەنماندا، جار لەگەڵ جارا پتر پیتو فەڕ بڕێژە بەسەر ئەمانەمانا). ئەوجا بچکۆلەترین منداڵ کە لەوێ بوو بانگی دەکردو ئەو نۆبەرەیەی دەدایە دەستی). {تاج/٥، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٥١٠٧}.

**٦١٠) هاندانو شێرەكردنی موسوڵمانان لەسەر دانیشتنو نیشتەجێبوون لەشاری مەدینەدا وە ئارامگرتن لەسەر ئەركو زەحمەتی (٣٣٢٣ – ٣٣٣٦)**

**بابٌ: الترغيب في سكْنَى المدشينةِ والصَّبر علَى لأوائها**

٧٧٩- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ مَوْلَى الْمَهْرِىِّ: أَنَّهُ جَاءَ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِىَّ (رضى الله عنه) لَيَالِىَ الْحَرَّةِ، فَاسْتَشَارَهُ فِى الْجَلاَءِ مِنَ الْمَدِينَةِ وَشَكَا إِلَيْهِ أَسْعَارَهَا وَكَثْرَةَ عِيَالِهِ، وَأَخْبَرَهُ أَنْ لاَ صَبْرَ لَهُ عَلَى جَهْدِ الْمَدِينَةِ وَلأْوَائِهَا فَقَالَ لَهُ: وَيْحَكَ لاَ آمُرُكَ بِذَلِكَ، إِنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « لاَ يَصْبِرُ أَحَدٌ عَلَى لأْوَائِهَا فَيَمُوتَ إِلاَّ كُنْتُ لَهُ شَفِيعًا أَوْ شَهِيدًا يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِذَا كَانَ مُسْلِمًا ». {الحديث: ٣٣٢٦ = ٣٣١٤ فم}:

ئەبو سەعیدی مەولای ئەلمەهری فەرمووی: چووم بۆلای ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) لەڕۆژانی ڕەشی كوشتارە سامناكەكەی (ئەلحەررە)دا، راوێژی ئەوەم پێی كرد، كەلە مەدینە باربكەمو بچم بۆ شوێنێ تر، وە سكاڵای ئەوەم لەلای كرد كەلە مەدینە گرانییەو منیش كۆشێ خێزانم هەیەو منداڵم زۆرە، لەبەرئەوە ناتوانم خۆم رابگرم لەبەر باری ژیانی سەختی مەدینەداو رۆژگاری ناهەموار تەنگی پێ هەڵچنیوم. ئەویش فەرمووی پێم: هاوار لەخۆت! من رێگەی شتی وات نیشان نادەمو بۆ شتی وا هانت نادەم، چونكە من خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم (درودی خودای لەسەر بێ) بیستووە دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ خۆی رابگرێ، لەبەر ئەركو ئازاری گوزەرانی مەدینەدا، هەتا دەمرێ لەوێ بمێنێ، لەڕۆژی قیامەتا خۆم دەبم بە تكاكار (یا بەشایەت) بۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ١٧٥١، لاپەڕە: ٣١٣} + {بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم فەرموودەیە، بڕوانە: تەجریدی بوخاری/ كوردی. بەرگی سێیەم، لاپەرشە: ٣٣٦، ژمارە: ١٢١٣ = ٢٩٥٩ + بەرگی یەكەم لاپەڕە: ٩٧ ژیننامەی ئەسماء، ژمارە: ٧٥ + تاج/٥، لاپەڕە: ٥٦٧، زنجیرە: ٩٧، ژمارە: ٥٥٣٩. چاپی چوارەم + ریاض/١، لاپەڕە: ١٨٦، زنجیرە: ٢٥، ژمارە: ٢٠٢ + ژمارە: ١٨٩ لەپێشەوە رابورد تەسەلسول: ٦٤}.

٧٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ وَهْىَ وَبِيئَةٌ، فَاشْتَكَى {أَبُو بَكْرٍ} وَاشْتَكَى بِلاَلٌ، فَلَمَّا رَأَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَكْوَى أَصْحَابِهِ

قَالَ: « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ، وَصَحِّحْهَا، وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا وَحَوِّلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ ». {الحديث: ٣٣٢٩ = ٣٣١٧ فم}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کە کۆچمان کرد بۆ مەدینە، ئەوسا کە ناسازترین وڵاتی خودا ئەوێ بوو، شیوی بوطحان جمەی دەهات لە سییاناوو چڵکاو، ئەبوبەکرو بیلال نەخۆش کەوتنو تووشی پەتا بوونو ئاوو هەوای ئەوێیان پێ نەکەوت، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەستی کرد بە سکاڵای هاوڕێیانی فەرمووی: « اللَّهُمَّ حَبِّبْ إِلَيْنَا الْمَدِينَةَ كَمَا حَبَّبْتَ مَكَّةَ أَوْ أَشَدَّ وَصَحِّحْهَا وَبَارِكْ لَنَا فِي صَاعِهَا وَمُدِّهَا وَحَوِّلْ حُمَّاهَا إِلَى الْجُحْفَةِ »:

واتە: ئەی خودایە! مەدینەیشمان لەلا خۆشەویست بکە وەك مەککە، یاخود خۆشەویستتریش، خوایە! سازگاری بفەرموو، ئاوو هەوایەکی سازگاری پێ ببەخشە وە تەندروستیو لەشی ساغ بدە بە دانیشتوانی، ئەی خودایە! پیتو فەڕو بەرەکەت بڕێژە بەسەر مەنو مشتو مێوەو دانەوێڵەمانا، وە ناسازییو ناساغییەکەشی بگوێزەرەوە بۆ جوحفە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٢، ژمارە: ١٧٤٢}.

## ٦١١) تاعوونو جەجاڵ ناچنە ناو مەدینە (٣٣٣٧ - ٣٣٣٨)
## باب: لا يدخل المدينة الطاعون ولا الدجال

٧٨١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه (صلى الله عليه وسلم): « عَلَى أَنْقَابِ الْمَدِينَةِ مَلَائِكَةٌ لاَ يَدْخُلُهَا الطَّاعُونُ وَلاَ الدَّجَّالُ ». {الحديث: ٣٣٣٧ = ٣٣٢٥ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٥ = ١٨٨٠، ٧٣١، ٧١٣٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەسەر هەموو کوچەو شەقامێکی مەدینە فریشتە راوەستاون، ئێشکی دەگرن، لەبەرئەوە نە تاعوونو نە جەجاڵ ناچنە ناوی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨}.

## ٦١٢) مەدینە چەپەڵەکانی رەهەنە دەکا. (٣٣٣٩ - ٣٣٤٤)

## باب: المدينة تنفي خبثها

٧٨٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « يَأْتِي عَلَى النَّاسِ زَمَانٌ يَدْعُو الرَّجُلُ ابْنَ عَمِّهِ وَقَرِيبَهُ: هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، هَلُمَّ إِلَى الرَّخَاءِ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لاَ يَخْرُجُ مِنْهُمْ أَحَدٌ رَغْبَةً عَنْهَا، إِلاَّ أَخْلَفَ اللَّهُ فِيهَا خَيْرًا مِنْهُ، أَلاَ إِنَّ الْمَدِينَةَ كَالْكِيرِ تُخْرِجُ الْخَبِيثَ، لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَنْفِيَ الْمَدِينَةُ شِرَارَهَا كَمَا يَنْفِي الْكِيرُ خَبَثَ الْحَدِيدِ ». {الحديث: ٣٣٣٩ = ٣٣٢٧ فم} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (مەردوم دەکەونە رۆژگارێکی واوە، خەڵك بەرەو ئەو وڵاتانە دەجمێن کە هەرزانیو خۆش گوزەرانییان لێیە، پیاو ئامۆزاو خزمی خۆی بانگ دەکاو پێی دەڵێ: ئەگەر هەرزانیو خۆش گوزەرانیت دەوێ وەرە بۆ فیسارە وڵات لەوێ هەرزانییە، بەڵام خەڵکی مەدینە، ئەگەر لە حاڵەکە حاڵی ببن، مەدینە باشترە بۆ ئەوان هەتا ئەو جۆرە وڵاتانە، چونکە لەسەرێکەوە کەم دەرامەتی ناهێڵێ تووشی ئاژاوەی ماڵو ئاشووبی خۆش گوزەرانی زۆر ببنو، لەسەرێکی تریشەوە شانازیی هاوسایەتیی گۆڕی پیرۆزی پێغەمبەریان پێ دەبڕێ! سوێندم بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، هەرکەسێ لەبەر حەز لێ نەمان مەدینە چۆڵ بکاتو بڕوا بۆ شوێنانی تر، خودا بە لەو باشتر جێگەی پڕدەکاتەوە، ئاگاداربن کە شاری مەدینە، وەك چۆن مووشە دەمەو کوورەی زەڕەنگەرو ئاسنگر ژەنگو چڵکی زێڕو زیوو ئاسن لادەبات، مەدینەش ئاوەها گەندەڵەکانی ناوی رەهەنە دەکا، بەتایبەتی بەر لەقیامەت ئەم رەهەنە کردنە روودەدات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ١٧٢٧، ١٧٢٨ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤١، ژمارە: ١٧٣٨، ١٧٣٨م + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ١٧٥٠}.

٧٨٣- عَنْ جَابِرِ بْنِ سَمُرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « إِنَّ اللَّهَ تَعَالَى سَمَّى الْمَدِينَةَ طَابَةَ ». {الحديث: ٣٣٤٤ = ٣٣٣٢ فم} :

جابیری کوڕی سەمووره دەفەرموێ: له پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: (خودای گەوره خۆی مەدینەی ناوناوه (طابه) واته: شارێکی خۆش‌و باش‌و پاك‌و سازگارو خاوەنی دانیشتوانی باش‌و خاس). {تاج/٢، زنجیره: ١٣٨، ژماره: ١٧٢٦}.

**٦١٣) هەرکەسێ بیەوێ بۆ خەڵکی مەدینه خراپ بێ، خودا وەك خوێی ناو ئاو دەیتوێنێتەوه.** (٣٣٤٥ - ٣٣٥٠)

**باب: مَنْ أرادَ أهْلَ المدِينَةِ بِسُوءٍ أذابه اللّهُ**

٧٨٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَـنْ أَرَادَ أَهْلَهَـا بِسُـوءٍ - يريـد المدينـة - أَذَابَـهُ اللَّـهُ كَمَـا يَـذُوبُ الْمِلْحُ فِـى الْمَـاءِ ». {الحديث: ٣٣٤٥ – ٣٣٣٣ فم}:

ئـەبو هـورەیره (ڕەزای خـودای لـێ بـێ) دەفـەرموێ: خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەفەرموێ: (ئەوەی بیەوێ بۆ دانیشتوانی مەدینه خراپ بێ، خودا وەك خـوێی نـاو ئاو دەیتوێنێتەوه). {تاج/٢، زنجیره: ١٤١، ژماره: ١٧٤١}.

**٦١٤) هاندان لەسەر مانەوه له مەدینەدا، بەتایبەتی لەو کاتانەدا که وڵاتی تری پڕ خێرو خۆشی ئازاد دەکرێن.** (٣٣٥١ - ٣٣٥٢)

**باب: الترغيب في المَقامِ بِالمَدِينَةِ عِنْدَ فَتحِ الأمْصَارِ**

٧٨٥- عَنْ سُفْيَانَ بْنِ أَبِى زُهَيْرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « يُفْتَحُ الْيَمَنُ، فَيَأْتِى قَوْمٌ يَبُسُّونَ، فَيَتَحَمَّلُونَ بِأَهْلِيهِمْ وَمَـنْ أَطَـاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُـمْ لَـوْ كَـانُوا يَعْلَمُـونَ، ثُـمَّ يُفْتَحُ الشَّـامُ، فَيَـأْتِى قَـوْمٌ يَبُسُّـونَ فَيَتَحَمَّلُـونَ بِأَهْلِيهِمْ، وَمَنْ أَطَاعَهُمْ، وَالْمَدِينَةُ خَيْرٌ لَهُمْ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ، ثُمَّ يُفْتَحُ الْعِـرَاقُ فَيَـأْتِى قَـوْمٌ يَبُسُّـونَ فَيَتَحَمَّلُـونَ بِـأَهْلِيهِمْ وَمَـنْ أَطَـاعَهُمْ، وَالْمَدِينَـةُ خَيْـرٌ لَهُـمْ لَـوْ كَـانُوا يَعْلَمُـونَ ». {الحديث: ٣٣٥١ = ٣٣٣٩ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٦٠ = ١٨٧٥}:

سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: بەگوێی خۆم گوێم لـه پێغەمبەری نازدارو خۆشەویست بـوو (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفـەرموو: (یەمـەن ئـازاد دەکرێ‌و دەبـێ بـه وڵاتـی ئیسلام، جا زۆر کـەس بـەگورجی دێنـەوه بـۆ مەدینـەو

کەس‌وکاری خۆیان‌و ئەوانەی کە بەگوێیان بکەن هەڵیان دەگرن‌و دەیانبەن بۆ یەمەن، لەبەر زۆری رزق‌و رۆژی‌و ژیواری خۆش‌و باشی ئەوێ، بەڵام ئەگەر بزانن مەدینەمان گەلێ باشترە، وە شامیش هەروەها، وە عێراقیش هەروەها، کە ئازاد دەکرێن، خەڵك لە مەدینەوە روودەکەنە ئەوێ، ئەگەر بزانن مەدینەیان باشترە).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ١٧٤٦}:

**روونکردنەوە:**

سوفیانی کوڕی ئەبو زوهەیر (ڕەزای خودای لێ بێ) هاوڕێی پێغەمبەرە، لەپیاوانی صەحیحی بوخاری‌و صەحیحی موسلیمە، ئەزدییە، لەهۆزی ئەزدی شەنووئەیە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرو سائیبی کوڕی یەزید، فەرموودەیان لەوەوە گێڕاوەتەوە، ئەوەیش نیشانەی ئەوەیە کە سوفیان هاوەڵێکی شکۆمەندی پێغەمبەر بووە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو.

### ٦١٥) مەدینە لەوپەڕی خۆشی‌و باشیدا دەبێ کە دانیشتوەکانی بەجێی دەهێڵن. (٣٣٥٣ - ٣٣٥٤)

### بابٌ: فِي الْمَدِينَةِ حِينَ يَتْرُكُهَا أَهْلُهَا

٧٨٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « يَتْرُكُونَ الْمَدِينَةَ عَلَى خَيْرِ مَا كَانَتْ لاَ يَغْشَاهَا إِلاَّ الْعَوَافِي - يُرِيدُ عَوَافِيَ السِّبَاعِ وَالطَّيْرِ -، ثُمَّ يَخْرُجُ رَاعِيَانِ مِنْ مُزَيْنَةَ يُرِيدَانِ الْمَدِينَةَ يَنْعِقَانِ بِغَنَمِهِمَا فَيَجِدَانِهَا وَحْشًا، حَتَّى إِذَا بَلَغَا ثَنِيَّةَ الْوَدَاعِ خَرَّا عَلَى وُجُوهِهِمَا ». {الحديث: ٣٣٥٣ = ٣٣٤٢ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەدینە لەوپەڕی خۆشی‌و باشیدا دەبێ کە دانیشتوەکانی بەجێی دەهێڵن، وا چۆڵ دەبێ کەس سەری پیادا ناکا، مەگەر مەل‌و مۆرو جانەوەری مووشەکەر، کە بۆ ملۆمووش‌و مووشە کردن دەچن بۆ هەوارە کۆن‌و شوێنی چۆڵ بوو!

وە دواترین کەسیش کە لە وڵات دەردەکرێن‌و دەبرێن دوو شوانی موزەینەیی دەبن، دەیانەوێ کە بچن بۆ مەدینە، دەنگ لە رانەکەیان دەکەن‌و پیرکە دەکەن بە ناویانا، جا کە دەچن تەماشا دەکەن مەدینە چۆڵ‌و هۆڵ‌و سامناك‌و چۆلەکە بکوژی تیانییە، جا لەمەدینە دەردەچن‌و دەڕۆن دەگەنە ثەنییەتولویداع، لەوێ بەسەر دەما دەکەون‌و خرپ دەمرن!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٣، ژمارە: ١٧٤٩}.

٦١٦) لەنێوانی گۆڕەکەم‌و دوانگەکەما باخێکە لە باخەکانی بەهەشت(٣٣٥٥ - ٣٣٥٧)

٧٨٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا بَيْنَ بَيْتِي وَمِنْبَرِي رَوْضَةٌ مِنْ رِيَاضِ الْجَنَّةِ، وَمِنْبَرِي عَلَى حَوْضِي ». {الحديث: ٣٣٥٥ – ٣٣٤٥ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لەنێوانی گۆڕەکەم‌و مینبەرەکەما، باخێکە لە باخەکانی بەهەشت، بارانی رەحمەتی لێ دەبارێ، خۆشی لەو کەسەی کە لەم شوێنە پیرۆزەی مزگەوتەکەما بەتایبەتی، تاعەت‌و خواپەرستی جوان دەکا، وە ئەم دوانگەیەی ئێستاکەشم، کە ئێستا لە بۆنەکانا وتاری لەسەر دەدەم، لەسەر حەوزی کەوثەرم کەوا لەبەهەشتا، وەك ئێستاکەی خۆی دادەنرێتەوە بۆم، لەبەهەشتیشا وەك ئێستام لەسەری دادەنیشم‌و، پێشوازی لە هاتووانی ئۆمەتم دەکەم، کەبۆ نۆشین لەئاوی حەوزی کەوسەر دێن بۆ سەری). {تاج/١، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٣ + تاج/٥، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٥٦٧٥}.

٦١٧) کێوی ئوحود ئێمەی خۆش دەوێ‌و ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ.
(٣٣٥٨ - ٣٣٦٠) باب: أُحُدٌ جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ

٧٨٨- عَنْ أَنَسِ بن مالك (رضى الله عنه) قَالَ: نَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى أُحُدٍ فَقَالَ: « إِنَّ أُحُدًا جَبَلٌ يُحِبُّنَا وَنُحِبُّهُ ». {الحديث: ٣٣٦٠ = ٣٣٤٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٧١٣ = ١٤٨١، ١٨٧٢، ٣١٦١، ٣٧٩٤، ٤٤٢٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای چیای ئوحودی کردو فەرمووی: (چیای ئوحود، لەسەر ڕاستی، نەك مەجازی، ئێمەی خۆش دەوێو ئێمەیش ئەومان خۆش دەوێ!). {تاج/٣، زنجیرە: ١٠٣، ژمارە: } .

## ٦١٨) تەنیا بۆ ئەم سێ مزگەوتە سەفەر دەکرێ (٣٣٦١ - ٣٣٦٩)

## باب: لا تُشَدُّ الرِّحَالُ إلى ثلاثةِ مَسَاجِدَ

٧٨٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) يَبْلُغُ بِهِ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُشَدُّ الرِّحَالُ إلاَّ إِلَى ثَلاَثَةِ مَسَاجِدَ: مَسْجِدِى هَذَا، وَمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَسْجِدِ الأَقْصَى ». {الحديث: ٣٣٦١ = ٣٣٤٩ فم. تجريد/٢، رقم: ٥٨٦ = ١١٨٩}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بۆ ئەم سێ مزگەوتە نەبێ سەفەر ناکرێ: بۆ ئەم مزگەوتەی من کەوا لە مەدینەو بۆ مەسجیدولحەرام لە مەککەو بۆ مەسجدولئەقصا لە قودس). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٢} .

## ٦١٩) خێرو گەورەیی نوێژکردن لەم دوو مزگەوتە پیرۆزەدا کە هەردووکیان بەستو حەرەمنو پێیان دەگوترێ: الحرمين: دوو بەستەکە، کە مەسجیدولحەرامو مزگەوتەکەی پێغەمبەرن. (٣٣٦١ - ٣٣٦٩)

## باب: فَضْلُ الصَّلاَةِ بِمَسْجِدَىِ الحَرَمَيْنِ الشَّرِيفَيْنِ

٧٩٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رسول الله (صلى الله عليه وسلم): « صَلاَةٌ فِى مَسْجِدِى هَذَا أَفْضَلُ مِنْ أَلْفِ صَلاَةٍ فِيمَا سِوَاهُ إِلاَّ الْمَسْجِدَ الْحَرَامَ ». {الحديث: ٣٣٦٢ = ٣٣٥٠ فم. تجريد/٢، رقم: ٥٨٧ = ١١٩٠}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (تەنیا مەسجیدولحەرامی لێ دەرچێ، یەك نوێژ لەم مزگەوتەی مندا، خێرترە لە هەزار نوێژی شوێنانی تر). {تاج/١، زنجیرە: ١١٥، ژمارە: ٦٩٤ چاپی چوارەم} .

**٦٢٠) ئەو مزگەوتەی کە لەبناغەوە لەسەر تەقوا دانراوە.** (٢٣٧٣ - ٢٣٧٤)
**باب: بيان المسجد الّذى أسّس على التّقوى**

٧٩١- عَنْ أَبِى سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ قَالَ: مَرَّ بِى عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ. قَالَ: قُلْتُ لَهُ: كَيْفَ سَمِعْتَ أَبَاكَ يَذْكُرُ فِى الْمَسْجِدِ الَّذِى أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: قَالَ أَبِى: دَخَلْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى بَيْتِ بَعْضِ نِسَائِهِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَىُّ الْمَسْجِدَيْنِ الَّذِى أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى؟ قَالَ: فَأَخَذَ كَفًّا مِنْ حَصْبَاءَ فَضَرَبَ بِهِ الأَرْضَ ثُمَّ قَالَ: « هُوَ مَسْجِدُكُمْ هَذَا - لِمَسْجِدِ الْمَدِينَةِ – قَالَ: فَقُلْتُ: أَشْهَدُ أَنِّى سَمِعْتُ أَبَاكَ هَكَذَا يَذْكُرُهُ». {الحديث: ٢٣٧٣ = ٣٣٦٢ فم}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان فەرمووی: عەبدورەحمانی کوڕی ئەبو سەعیدی خودری هات بۆلام، پێیم گوت: چۆنت لە ئەبو مووسای باوکت بیستووە، کە باسی ئەم مزگەوتە بکا، کە خودای گەورە لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کردووە، کە دەفەرموێ: {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ – التوبة/ ١٠٨} : واتە: یەزدانی مەزن، بەخۆشەویستی خۆی حەزرەتی موحەممەد دەفەرموێ: ئەو مزگەوتەی کە لەسەفەری کۆچتا پێش ئەوەی بگەیتە مەدینە، لە خاکی قوباء دروستت کرد، کە هەر لەسەرەتاوە بناغەی لەسەر تەقواو ترسی خودا دانراوە، ئەوە شایانی ئەوەیە کەتۆ ئەی خۆشەویست! تاعەتو نوێژی تیابکەی...)؟

فەرمووی: باوکم فەرمووی پێم: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی یەکێ لە هاوسەرەکانی بوو، کە چووم بۆ خزمەتی. عەرزیم کرد: ئەی خۆشەویستی خودا! مەبەست لەم مزگەوتەی کە لەم ئایەتەدا باسکراوە کام مزگەوتەیە؟ ئەویش بۆ زیادە جەخت کردنو تەئکید لەسەر وەڵامەکەی، مشتێ چەوی هەڵگرتو دای بە زەوی مزگەوتەکەی خۆیدا، کەوا لە مەدینەو فەرمووی: (مەبەست لەو مزگەوتە، کە خودا لە وەسفیدا دەفەرموێ: {لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى} ئەم مزگەوتەی ئێوەیە، کەوا لە مەدینەو ئێوەی هاوەڵانی من بە گەرمی ئاموشۆی دەکەن).
{تاج/٤، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٣٩٠٩، ٣٩١٠. چاپی چوارەم}.

**روونكردنەوە:**

دوو راوو بۆچوون هەیە، سەبارەت بە مەبەست لەو مزگەوتەی کە لەم ئایەتەدا باسی کراوە، جەماوەر دەفەرموون مەبەست مزگەوتەکەی قوبائە، بە پێی ئەم فەرموودەیەیش مزگەوتی مەدینەیە، دەتوانرێ ئەم دوو بۆچوونە یەك بخرێن، لەسەر ئەم شێوەیە: هەموو مزگەوتێ کە بناغەی لەسەر نیاز پاکیو بە مەبەستی خواپەرستی دروستکرابێ شایانی ئەوەیە کە نوێژو خواپەرستی باشی تیا بکرێ.

## ٦٢١) گەورەیی مزگەوتەکەی قوباء. (٣٣٧٥ - ٣٣٨٣)

## باب: فِي مَسْجِدِ قُبَاءَ وَفَضْلِه

٧٩٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَـأْتِى مَسْجِدَ قُبَـاءٍ، رَاكِبًـا وَمَاشِيًا فَيُصَلِّى فِيـهِ رَكْعَتَيْنِ. {الحديث: ٣٣٧٦ = ٣٣٦٥. تجريد/٢، رقم: ٥٨٨ = ١١٩١، ١١٩٣، ١١٩٤، ٧٣٢٦}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: جاران پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جاروبار بە سواریو جاروبار بەپێ دەچوو بۆ مزگەوتی قوباء، دوو رکات نوێژی سوننەتی تیادەکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٦٩٧ ج/٤}.

٧٩٣- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما): كَانَ يَأْتِى قُبَاءً كُلَّ سَبْتٍ، وَكَانَ يَقُولُ: رَأَيْتُ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) يَأْتِيهِ كُلَّ سَبْتٍ. {الحديث: ٣٣٨١ = ٣٣٧٠ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەستووری وابوو، هەموو شەممەیێ، بەپێ یا بەسواری ولاخ دەچوو بۆ مزگەوتەکەی قوباء، وە دەیفەرموو: دیومە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەموو شەممەیێ ئاوای دەکرد). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٦، ژمارە: ٦٩٧}.

## پوختەی فەرموودەکانی نامەی حەج:

١. حەج لە تەمەنا یەك جار فەرزە، هەروا عەمرەیش لە تەمەنا یەك جار فەرزە، بەلام حەجی زۆرو عەمرەی زۆر زۆر سوننەتە.

٢. حەج یەکێکە لەو پەرستشانەی کە مرۆڤ لە گوناه پاك دەکاتەوە، وەك ئەو رۆژەی لەدایك دەبێ.

٣. مەبەست لەڕۆژی حەجی ئەکبەر له ژمارە/٦٤٢دا روونکراوەتەوە.

٤.حەج کاتی تایبەتی هەیە، بەڵام عەمرە کاتی تایبەتی نییە (بڕوانە: ٦٤٢).

٥. ڕۆژی عەرەفە ڕۆژی عافواتی گشتییە (بڕوانە: ٦٤٣)

٦. نزای سەرەتای سەفەرو گەشتو گوزاری ڕەوا (بڕوانە: ٦٤٤).

٧. سەفەری ژن بۆ حەج، یادەبێ لەگەڵ خۆییدابێ، یا لەگەڵ کۆمەڵێکا بێ، کە لەسەرو ماڵو نامووسی خۆی بێ ترس بێ.

٨. منداڵ حەجی بۆ هەیە، وە ئەو حەجە خێری هەیە، بەڵام بری حەجی فەرز ناکەوێ، کە گەورە بوو، توانای هەبوو حەجی لەسەرە.

٩. حەجکردن لەجیاتی کەسێکی تر (بڕوانە: ژمارە: ٦٤٩)

١٠. بۆنی خۆش بۆ حاجیو عەمرەکار، لەکاتی کردنیاندا نادروستە.

١١. سەربڕینی ئاژەڵی دیاری بەیت خێرێکی گەورەیە (بڕوانە: ٦٧٣).

١٢. عەمرە لەکاتی حەجدا دروستە، بەمەرجێ لە ئیحرامی حەجدا نەبێ، بەڵام ئیحرامدار بەس (قارن) بۆی هەیە عەمرە بکا لەگەڵ حەجەکەیدا.

١٣. ڕاو حەرامە بۆ حاجیو عەمرەکار.

١٤. هەندێ جانەوەری زیانەخورۆ، بۆ هەموو کەسێ دروستە لەهەموو کاتو لەهەموو شوێنێکا بیکوژێ.

١٥. تیمارو دەرمانکردن لەکاتی حەجا دروستە لەبەر پێویستی.

١٦. خۆشۆردنو جلو بەرگ شۆردن دروستە.

١٧. گەورەیی عەمرە لە ڕەمەزانا.

١٨. پێغەمبەر چەند حەجو چەند عەمرەی کردووە (بڕوانە: ٧٥٨، ٧٥٩).

١٩. ڕێزی دوو بەستە پیرۆزەکە: مەککەو مەدینە.

٢٠.چوونە ناو مەککە بەبێ ئیحرام دروستە.

٢١. نیشتەجێبوون لەمەدینە زۆر پەسەندە.

٢٢. چەند شتێ کە تایبەتن بە مەککەو مەدینەو کابەو مینبەرەکەی پێغەمبەرو مزگەوتی قوباو چیای ئوحودو سێ مزگەوتەکە.



# ١١- نامەی ژنهێنان (كتَابُ النِّكَاحِ)

{بڕوانـە: تـاجول ئوصـول في أحاديـث الرسـول، بـەرگی دووەم، زنجـیرە/٢٢ هـەتا كۆتایی بەرگ. چاپی چوارەم لە ژمارە: ٢٠٣٤ هەتا ژمـارە: ٢٢٨٥ + تجریـد البخـاری = مختصر صحیح البخاری/٥، لەژمارە: ١٧٤٣ هەتا ١٧٨٥ + فیقهی ئاسـان/٢، زنجـیرە: ٢٥٥، لاپەڕە: ٦٧٢ هەتا زنجیرە: ٣٠١، لاپەڕە: ٨٢٦}.

## ٦٢٢) هاندان لەسەر ژنهێنان (٣٣٨٤ - ٣٣٩٢)
## باب: الترغيب في النكاح

٧٩٤- عَنْ عَلْقَمَةَ (رضى الله عنه) قَـالَ: كُنْـتُ أَمْشِـى مَـعَ عَبْـدِ اللَّـهِ بِمِنًـى فَلَقِيَـهُ عُثْمَانُ (رضى الله عنهما)، فَقَامَ مَعَهُ يُحَدِّثُهُ فَقَالَ لَـهُ عُثْمَـانُ: يَـا أَبَـا عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ: أَلاَ نُزَوِّجُكَ جَارِيَةً شَابَّةً؟ لَعَلَّهَا تُذَكِّرُكَ بَعْضَ مَا مَضَى مِنْ زَمَانِكَ، قَالَ: فَقَالَ عَبْـدُ اللَّـهِ: لَـئِنْ قُلْتَ ذَاكَ، لَقَدْ قَالَ لَنَا رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم): « يَـا مَعْشَـرَ الشَّـبَابِ مَـنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمُ الْبَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ، وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ، وَمَنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَعَلَيْـهِ بِالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لَهُ وِجَاءٌ ». {الحديث: ٣٣٨٤ = ٣٣٧٣ فم. تجريـد/٢، رقـم: ٨٧٨ = ١٩٠٥، ٥٠٦٥، ٥٠٦٦. أبو داود. نكاح: ٢٠٦٤. ترمذي. نكـاح: ١٠٨١. نسـائي. صـيام: ٢٢٣٩. تحفة الأشراف: ٩٤١٧}:

عەلقەمە (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: لـە مینـا، لـە خزمـەتی عەبـدوڵڵای كـوڕی مەسعووددا دەڕۆیشتم، عوسمانی كوڕی عەففانی پێ گەیشت (ڕەزای خودایان لێ بێ) لەگەڵیدا ڕاوەستا، دەستیان كرد بە گفتوگۆ، عوسمان كەبینی ئیبنو مەسعوود پەرپووتە پێـی فـەرموو: ئـەی بـاوكی عەبـدوڕەحمان! بـا كچـێكی گـەنجت بـۆ بهێـنین؟ بەشـكم سەردەمی لاوی خۆتت بۆ نوێ بكاتەوە! فەرمووی: ئیبنو مەسعوودیش بـە ئیمـامی عوسمانی فەرموو: ئەمـەی تـۆ فـەرمووت تـەواوە، ڕێكـی ڕێنماییـەكانی پێغەمبـەرە، چونكە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بە ئێمەی دەفەرموو: (ئەی دەسـتەی لاوان! ئـەی

گەلی جوانان! هەرکەسەتان تەوانایی سەرجێییو ژنداریيو هاوسەرگیریی هەیە، باژن بهێنێ، چونکە هاوسەرگرتن چاوی مرۆڤ تێردەکاو داوێنی لە تاوان دەپارێزێو دەبێ بەهۆی داوێنپاکی.

ئەو کەسەیشی کەلە کێشیا نییە هاوسەر بگرێ، با بەرۆژووبێ، چونکە رۆژوو دەیخەسێنێو دڵی دەمرێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٤}.

**روونکردنەوە:**

١.ئەم رشتەیە: ئیمامی ئەعمەش لە ئیبراهیمی نەخەعییەوە، لە عەلقەمەوە، لە ئیبنو مەسعوودە، یەکێکە لە رشتە (سەنەدە) هەرە ساخو دروستەکان.

٢. ئەم فەرمووده‌یە موتتەفەقو عەلەیهییە، شێخی بوخاریش گێڕاویەتەوە، ژمارەکانی فەرمووده‌کە لەسەرەتای فەرمووده‌کەوە نووسراون، کە یەکەم ژمارەیان لە بوخاریدا (١٩٠٥)ە.

٣. ئیمامی ئەعمەش، ناوی سولەیمانی کوڕی میهرانە، کەسناوی (واتە: کونیەی) ئەبو موحەممەدە، لە بنەڕەتدا خەڵکی (طبرستا)ە، لە گوندێکی ئەوێ لەدایك بووە کە ناوی (دوباوەند)ە، چوار هەزار فەرمووده‌ی هەیە، کتێبی نەبوو، هەمووی لەبەربوو، زۆر فەصیحو رەوانبێژ بوو، هەرگیز لەحنی نەدەکرد، لەحن ئەوەیە کەقسە بەغەیری عەرەبیی فەصیح بکەی، یا هەڵەی زمانەوانی لە گفتوگۆدا بکەی!

ئەعمەش ئیمامی ئەنەسی دیوە، لە مەککەو لە واسیط، بەڵام راجیایی هەیە لەوەدا، کە فەرمووده‌ی ئەوی گێڕابێتەوە یانا. کەواتە تابیعییە، تابیعی موسوڵمانێکە لەچینی دووەمی گەلی ئیسلام بێ، پێغەمبەری نەدیبێ، بەڵام هاوەڵی پێغەمبەری دیبێ. بەکوردی بە تابیعین دەگوترێ: شوێنکەوتوان، یا پەیڕەوان.

ئەعمەش ئەم زاتانە مامۆستای بوون، واتە: شێخی بوون، شێخی راوی، یا موحەددیث، ئەو کەسەیە کە فەرمووده‌ی لێ وەردەگیرێو کەسێ تر لەنێوانی ئەوو شاگردەکەدا نییە، وەك ئەم نموونەیە لەم رشتەیەدا: ١- بوخاری. ٢- ئەبو وەلید. ٣-

شوعبە. ٤- ئەعمەش. ٥- ئیبراهیم. ٦- عەلقەمە. ٧- ئیبنو مەسعوود، لەم رشتە حەوتینەیەدا: بوخاری شاگردو فەقێی ئەبو وەلیدە، ئەبو وەلید شێخو مامۆستای بوخارییە، شوعبە مامۆستای مامۆستاکەی بوخارییە، واتە: شێخی شێخەکەیەتی، وە هەروەها پیاوانی تری رشتەکە هەتا سەر ئیبنو مەسعوود. ئەعمەش فەرموودەی لەم زاتانە وەرگرتووە: ئەبو وائیلو مەعروورو موجاهیدو ئیبراهیمی نەخەعیو تەیمیو شەعبی، ئەم زاتانەو خەڵکێکی زۆری تر شێخی ئەعمەش بوونو مامۆستای راستەوخۆی بوون. کۆمەڵێ مامۆستاو فەرموودەزانی گەورە گەورەیش فەقێو شاگردی ئیمامی ئەعمەش بوون، راستەوخۆ فەرموودەیان لە ئەعمەش وەرگرتووە، وەك: سوبەیعیو سوفیانی کوڕی عویەینە.

یەحیای کوڕی قەططان دەفەرموێ: (ئەعمەش سۆفیلکەیەکی وابوو، بەردەوام لەڕیزی یەکەمی نوێژی جەماعەتدا ئامادە بوو، زانایەکی پایە بەرزی ئیسلام بوو). وەکیع دەفەرموێ: (ئەعمەش نزیکەی حەفتا ساڵ ئەڵڵاهو ئەکبەری یەکەمی جەماعەتی نەفەوتاوە!). شوعبە پێی دەگوت: موصحەف، واتە: وەك موصحەف راستو بێگەردە، پێیان دەگوت: (سَيِّدُ المحدِّثِين). واتە: گەورەی فەرموودە زانەکان، بۆنی شیعەیی لێ دەهات، جاروبار تەدلیسی دەکرد، ئەعمەد موفتی سەردەمی خۆی بوو، پیاوێکی هەژاری کەمدەستی سابیری زاهیدی واریع بوو، گوێی بەدنیا نەدەدا، قەت دەرماڵی دەوڵەمەندو دەسڵاتدار نەدەچوو، بۆ ئیشی دنیایی، پیاوێکی خاوەن وەرع، زانا بە قورئان، دوورە پارێز لە دەسەڵاتو دەستەڵاتداران بوو، زانایەکی فەرائیز زان بوو.

ئیبنولـەدینی دەفەرموێ: (ئەم شەش کەسە، عیلمو زانستیان بۆ ئۆمەتی موحەممەد لە فەوتان پاراست: ١- عەمری کوڕی دینار لە مەککە. ٢- ئیمامی زوهری لەمەدینە. ٣و٤- ئەبو ئیسحا سوبەیعیو ئەعمەش لە کووفە. ٥و٦- قەتادەو یەحیای کوڕی ئەبو کەپیر لە بەصرە).

ئیمامی ئەعمەش (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) لەساڵی شەستی کۆچیدا لەدایك بووە، لەسەدو چلو هەشتدا مردووە، هەشتاو هەشت ساڵ ژیاوە، راجیایی هەیە لەساڵی

لەدایکبوونیو مردنیدا، مامۆستا فەرمووده زانە گەورەکان، کە ناسراون بە ئەلجەماعە، فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە، لە پەڕاوی (تهذیب التهذیب)ا، دانراوی ئیبنو حەجەری عەسقەلانی هێمای (ع - سلیمان)ی بۆ دانراوە، واتە: سولەیمانی کوڕی مەهران، کە ناسراوە بە ئەعمەش لە پیاوانی ئەم شەش پەڕاوەیە، کە ناسراون بە: ١- صحیح البخاری. ٢- صحیح مسلم. ٣- سنن أبی داود. ٤- جامع الترمذي. ٥- المجتبي للنسائي. ٦- ئیبنو ماجه.

خودایە! بە بەرەکەتی ئەم مانگی رەمەزانە، شادمان بفەرموو بە دیداری ئەم پیاوە موبارەکانەو لەگەڵ ئەوانا حەشرو نەشرمان بفەرموو. ٣ رەمەزانی ساڵی/١٤٣٠ك = ٢٠٠٩/٨/٢٤ز، بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم لاپەڕە:٥٢، ژمارە: ٣٠ = ٣٢ فتح الباری.

٧٩٥- عَنْ أَنسٍ (رضى الله عنه): أَنَّ نَفَرًا مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) سَأَلُوا أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ عَمَلِهِ فِي السِّرِّ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ أَتزَوَّجُ النِّسَاءَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ آكُلُ اللَّحْمَ، وَقَالَ بَعْضُهُمْ: لاَ أَنَامُ عَلَى فِرَاشٍ، فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ فَقَالَ: « مَا بَالُ أَقْوَامٍ قَالُوا كَذَا وَكَذَا؟! لَكِنِّى أُصَلِّى وَأَنَامُ، وَأَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأَتزَوَّجُ النِّسَاءَ، فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّى ». {الحديث: ٣٣٨٩ = ٣٣٧٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٤٣ = ٥٠٦٣. نسائی. نکاح: ٣٢١٧. تحفة/٣٣٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چەند کەسێ، لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوون بۆ ماڵی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبارەی پەرستشو عیبادەتی پێغەمبەرەوە، کە لەماڵەوە رۆژانە دەیکرد، پرسیاریان لێیان کردن. کە پێیان گوترا: پەرستشی پێغەمبەر چەندەو چۆنە، وەك بڵێی بەکەمی بزانن وابوو، جا گوتیان ئێمە لەکوێو پێغەمبەر لەکوێ، ئەو خودا لە گوناهی بەرودوای خۆش بووە. جا لەئەنجاما هەندێکیان گوتیان: من کلا دەبم لە ژنو ژن ناهێنم، هەندێکی تریان گوتیان: منیش گۆشت ناخۆمو دەبم بەزاهیدو خۆشی دنیا تەرك دەکەم، هەندێکی تریشیان گوتیان: منیش لەسەر نوێن نانووم گوایە ئەم جۆرە شتەیان بەخواپەرستی دانا!

جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کاتێ بەمەی زانی، هات بۆلایانو فەرمووی: (ئەوە ئێوە وەها وەها دەڵێنو ئەم جۆرە قسانە دەکەن! دەسا بەوخودایە من لەئێوە زیاتر لەخودا دەترسمو لەئێوە زیاتر تەقوای دەکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، من بەش بەحاڵی خۆم شەونوێژ دەکەمو بەشی خۆیشم دەخەومو رۆژووش دەگرمو رۆژووش ناگرمو سەرەرای ئەمانەیش ژنیش دەهێنم، جا ئەمە رێگەو رێبازو رەوشتو رەفتاری منە، ئەوەی لێی لابداو پەیرەوی نەکا لەمن نییەو بە پەیرەوی تەواوی ئایینی من دانانرێ، گەرچی بە موسوڵمان دادەنرێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٥}.

٧٩٦- عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: رَدَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى عُثْمَانَ بْنِ مَظْعُونٍ التَّبَتُّلَ، وَلَوْ أَذِنَ لَهُ لاَخْتَصَيْنَا. {الحديث: ٣٣٩٠ = ٣٣٧٩. تجريد/٥، رقم: ١٧٤٤ = ٥٠٧٤، ٥٠٧٣. نسائي. نكاح: ٣٢١٤. ترمذي. نكاح: ١٠٨٣. ابن ماجة. نكاح: ١٨٤٨. تحفة الأشراف: ٣٨٥٦}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوسمانی کوڕی مەزعوون ویستی لێ ببڕێ بۆ خوداو، واز لەدنیا بهێنێو بەرەبەنی بژیو ژن نەهێنێ، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) رێگەی ئەوەی نەدا، خۆ ئەگەر پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئەوە رێگەی ئەوی بدایە، ئێمەیش خۆمان دەخەسانو تەرکی دنیاو ژنهێنانمان دەکردو سەرمان دەکردە خواپەرستی هەتا مردن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٢، ژمارە: ٢٠٣٩، ج/٤}.

## ٦٢٣) باشترین بەهرەی جیهان ئافرەتی باشە (٣٦٢٢ - ٣٦٢٨)
## باب: خير متاع الدُّنيا المَرْأَةُ الصَّالحَةُ

٧٩٧- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رضى الله عنهما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ ». {الحديث: ٣٦٢٨ = ٣٦٢٤ فم. نسائي. نكاح: ٣٢٣٢. ابن ماجة. نكاح: ١٨٥٥. تحفة الأشراف: ٨٨٤٩}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەم جیهانە هەمووی هەر ڕابواردنەو خۆشییەکەی نیوە چڵەو پێنجو دوو ڕۆژێکە، باشترین هۆی ڕابواردنو خۆشگوزەرانی ڕەوا ئافرەتی باشە). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥١ فم}.

## ٦٢٤) مارەکردنی ژنی دیندار. (٣٦٢٠ - ٣٦٢١)

## باب: في نكاح ذات الدِّين

٧٩٨- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « تُنْكَحُ الْمَرْأَةُ لأَرْبَعٍ: لِمَالِهَا وَلِحَسَبِهَا وَلِجَمَالِهَا وَلِدِينِهَا، فَاظْفَرْ بِذَاتِ الدِّينِ تَرِبَتْ يَدَاكَ». {الحديث: ٣٦٢٠ = ٣٦١٦ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٥٠ = ٥٩٠. نسائى. نكاح: ٣١٩٦. تحفة الأشراف: ٥٩١٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (وابـاوە لـەناو خـەڵکا، کـە ژن، لەبـەر ئـەم چوارشـتە مـارە دەکـرێو دەخـوازرێ: لەبەرئەوە کە ماڵی هەیە، یا لەبەرئەوە کە خانەدانـە، یـا لەبەرئـەوە کەجوانـە، یـا لەبەرئـەوە کـە بـە ئایینـەو بەدینـە. جـا ئـەی ژنخـوازی هۆشمەنـد! تـۆ ئـافرەتی ئایینداری بەدین بهێنەو لەکیس خۆتی مەدە، تا دەستە شکێن نـەبیت!!). {تـاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٠}.

## ٦٢٥) خواستنی کچ (٣٦٢٠ - ٣٦٢١)

## باب: فِي نِكَاحِ الْبِكْرِ

٧٩٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما): أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وَتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ أَوْ قَالَ: سَبْعَ بَنَاتٍ، فَتَزَوَّجْتُ امْرَأَةً ثَيِّبًا، فَقَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَا جَابِرُ تَزَوَّجْتَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: نَعَمْ. قَالَ: « فَبِكْرٌ أَمْ ثَيِّبٌ؟ ». قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّبٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ، أَوْ قَالَ: تُضَاحِكُهَا وَتُضَاحِكُكَ؟ ». قَالَ: قُلْتُ لَهُ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ هَلَكَ وَتَرَكَ تِسْعَ بَنَاتٍ، وَإِنِّى كَرِهْتُ أَنْ آتِيَهُنَّ، أَوْ أَجِيئَهُنَّ بِمِثْلِهِنَّ،

فَأَحْبَبْتُ أَنْ أَجِيءَ بِامْرَأَةٍ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ وَتُصْلِحُهُنَّ. قَالَ: فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْ قَالَ لِي خَيْـرًا».
{الحديث: ٣٦٢١ = ٣٦١٧ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٥١ = ٢٠٩٧، ٢٨٦١، ٤٠٥٢، ٢٤٠٦، ٢٣٠٩، ٢٧١٨، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٥، ٥٢٤٩، ٥٢٤٧، ٥٣٦٧}:

**جابیری کوڕی عەبدوڵڵا** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **دەفەرموێ: عەبدوڵڵای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهیدبوو، کە کوژرا نۆ، یا فەرمووی: حەوت خوشکی سەرو قنگی منالکاری بەسەردا بەجێهێشتم، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا. جا لە غەزایەکا، لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم، فەرمووی پێم: (ئەی جابیر! ژنت هێناوە؟) عەرزیم کرد: بەڵێ، فەرمووی: (چیت هێناوە: کچ یا بێوەژن؟!) عەرزیم کرد: نەء، کچم نەهێناوە، بێوەژنێکم هێناوە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەی بۆچی کچت نەهێنا، پێکەوە گەمەو دەستبازی بکەن) یا فەرمووی: (پێکەوە بەزمو پێکەنین سازبدەن؟) منیش عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی کە عەبدوڵڵای باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، کەمرد نۆ کچ یا حەوت کچی بەسەردا بەجێهێشتم، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا کە کارامەبێ، ماڵو مێردی دیبێ، وەك خۆیان کۆڵیو دەسەوسان نەبێ، هەتا بتوانێ سەرپەرشتییان بکا!!**

**جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **راو بۆچوونەکەمی پەسەندکرد، لەبەرئەوە نزای باشی بۆم کردو فەرمووی: (دەی خودا لێتی پیرۆز بفەرموێ) یا فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **قسەی خێری بۆم کرد.** {تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٣ + تاج/٣، زنجیرە: ٥٠، لاپەڕە: ٧٠١، ژمارە: ٣٤٨٠، ٣٤٨١ + زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٣٤٨٢ + ژمارە: ٨٤٧ کە لەدواوە دێ}.

## ٦٢٦) خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە (٣٤٤٠ - ٣٤٤٩)
## باب: لا يخطبُ علَى خطبة أخيه

٨٠٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ شُمَاسَةَ أَنَّهُ سَمِعَ عُقْبَةَ بْنَ عَامِرٍ (رضى الله عنـه) عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، فَلاَ يَحِلُّ

لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَبْتَاعَ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلاَ يَخْطُبَ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَذَرَ ». {الحديث: ٣٤٤٩ = ٣٤٣٩}:

عەبدورەحمانی کوڕی شوماسە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: گوێم لە عوقبەی کوڕی عامیر بوو، (رەزای خودای لێ بێ) لەسەر دوانگە (مینبەر) دەیفەرموو: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (موسوڵمان برای موسوڵمانە، کەواتە دروست نییە بۆ موسوڵمان کە سەودا لەسەر سەودای برای ئایینی خۆی بکا، مەگەر بەمەرجێ خوازبێنیکەری پێشوو وازبێنێ، یا کڕیاری پێشوو دەست هەڵبگرێ و شتەکەی نەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٤ + زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٠٦٥ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**ڕوونکردنەوە:**

عوقبەی کوڕی عامیر (رەزای خودای لێ بێ) لە پیاوانی صەحیحەینە، واتە: هەم لە بوخاریداو هەم لە موسلیمدا فەرموودەی لێوە دەرهێنراوە، پەنجاو پێنج فەرموودەی هەیە، لە صەحیحی بوخاریدا هەشت فەرموودەی هەیە، والی موعاوییە بوو لەسەر وڵاتی میسر، ساڵی پەنجاو هەشتی کۆچی لەمیسر مردووە. {بڕوانە: ژمارە: ١٤٣ لەپێشەوە رابورد، بڕوانە: تەجرید/٣ ژمارە: ٢٣٩ = ٣٧٥ فتح الباري}.

## ٦٢٧) تەماشاکردنی ژن بۆ کەسێ کە بیەوێ بیخوازێ (٣٤٧٠ - ٣٤٧١)
## باب: النظر إلى المرأة لمن يريد التزويج

٨٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً مِنَ الأَنْصَارِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « هَلْ نَظَرْتَ إِلَيْهَا فَإِنَّ فِي عُيُونِ الأَنْصَارِ شَيْئًا »؟ قَالَ: قَدْ نَظَرْتُ إِلَيْهَا، قَالَ: « عَلَى كَمْ تَزَوَّجْتَهَا؟». قَالَ: عَلَى أَرْبَعِ أَوَاقٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « عَلَى أَرْبَعِ أَوَاقٍ؟! كَأَنَّمَا تَنْحِتُونَ الْفِضَّةَ مِنْ عُرْضِ هَذَا الْجَبَلِ! مَا عِنْدَنَا مَا نُعْطِيكَ، وَلَكِنْ عَسَى أَنْ نَبْعَثَكَ فِي بَعْثٍ تُصِيبُ مِنْهُ »، قَالَ: فَبَعَثَ بَعْثًا إِلَى بَنِي عَبْسٍ، بَعَثَ ذَلِكَ الرَّجُلَ فِيهِمْ. {الحديث: ٣٤٧١ = ٣٤٦١ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: لەخزمەتی پێغەمبەردا بووم** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پیاوێ هاتە خزمەتی، گوتی: ژنێکی ئەنصاریم خواستووە، پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پێی فەرموو: (ئایا سەیریت کردووە؟) گوتی: نەء، فەرمووی: (دەبڕۆ تەماشای بکە، چونکە لەچاوی ئەنصار (یاریدەران)دا شتێ هەیە، چاویان بچووکە، یا تۆزێ شینە). (هەندێ دەڵێن: چاویان کز بووە، هەندێ تر دەڵێن: چاویان گچکە بووە، هەندێ تر دەڵێن: چاو شین بوو). پیاوەکە هاتەوە گوتی: چووم تەماشایم کرد، فەرمووی: (لەسەر چەندێ مارەت کردووە؟) گوتی: لەسەر چوار ئۆقیە زیو، کە هەمووی دەکاتە سەدو شەست درەم، وادیارە پیاوەکە بەم بۆنەیەوە داوای کۆمەکیو یارمەتی لە پێغەمبەر کردووە، بۆیە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **ناڕەزایی دەربڕیو پێی فەرموو: (لەسەر چوار ئۆقیە زیو؟! دەڵێی ئێوە ئەم زیوە لەلاقەدی ئەو کێوە بەلێشاو دادەتەراشن، بۆیە وازێدەڕەوی تیادەکەن! شتێکی وامان لانییە کەپێتی بدەم، بەڵام نائومێدیشت ناکەین، سا بەڵکوو لەگەڵ پەلێ غەزاکارا بتنێرین بۆ غەزایێ، لەو غەزایەدا شتێکت بەربکەوێ!). فەرمووی: جا دەستەیێ غەزاکاری نارد بەرەو هۆزی بەنی عەبس، ئەو پیاوەیشی نارد لەگەڵیان، دەسکەوتێکی چنگ کەوت). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦٢}.**

## ٦٢٨) را وەرگرتنو پرسو راکردن بە بێوەژنو بەکچ لەکاتی شووکردنیاندا (٣٤٥٨ - ٣٤٦٣)

## بابٌ: إِسْتِمَارُ الأَيِّمِ والبِكْرِ فِي النِّكَاحِ

٨٠٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله تعالى عنه) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تُنْكَحُ الأَيِّمُ حَتَّى تُسْتَأْمَرَ، وَلاَ تُنْكَحُ الْبِكْرُ حَتَّى تُسْتَأْذَنَ »، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ: وَكَيْفَ إِذْنُهَا؟ قَالَ: « أَنْ تَسْكُتَ ». {الحديث: ٣٤٥٨ = ٣٤٤٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٦٢ = ٥١٣٧، ٦٩٤٩، ٦٩٤٦، ٦٩٦٨. نسائي. نكاح: ٣٢٦٧. تحفة الأشراف: ١٥٤٢٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: بێوەژن مارە ناکرێت تا گفتی لێ وەرنەگیرێ، کچیش نادرێ بەشوو تا مۆڵەتی لێ وەرنەگیرێ) گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! جا چۆن بزانین کە رازییە یانا، چونکە کچ شەرمنە، ڕووی نایەت کەباسی مۆڵەتو شتی وابکا؟ فەرمووی: (کە قسەی نەکردو رەخنەی نەبوو، واتای وایە کە قایلە!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١، بڕوانە: مختصر صحیح البخاری، بەرگی/٥، لاپەڕە: ١٧٦٢ بۆ تێگەیشتنی تەواو لە ناوەڕۆکو مەبەستی ئەم فەرموودەیە}.

٨٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الأَيِّمُ أَحَقُّ بِنَفْسِهَا مِنْ وَلِيِّهَا، وَالْبِكْرُ تُسْتَأْذَنُ فِى نَفْسِهَا، وَإِذْنُهَا صُمَاتُهَا ». {الحديث: ٣٤٦١ = ٣٤٥١ فم. نسائى. نكاح: ٣٢٦٠. أبو داود. نكاح: ٢٠٩٨. ترمذى. نكاح: ١١٠٨. تحفة/ ٦٥١٧}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بێوەژن (بۆ مارەبڕینی خۆی) خۆی زیاتر مافی هەیە تا هەقدارەکەی، هەقدار واتە: وەلی، کچیش بۆ مارەبڕینی خۆی لەکەسێ، پرسی پێ دەکرێو رای وەردەگیرێ، جا ئەگەر لەبەر شەرمو شتی وا قسەی نەکردو بەشێوەیێ لەشێوەکان نارەزایی دەرنەبڕیو بێدەنگ بوو لەکاتی را وەرگرتنەکەدا ئەوە واتای وایە کە رازییە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣١، ژمارە: ٢٠٨١}.

## ٦٢٩) مەرجی مارەبڕین (٣٤٥٧)
## باب: الشروط في النكاح

٨٠٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ أَحَقَّ الشَّرْطِ أَنْ يُوفَى بِهِ مَا اسْتَحْلَلْتُمْ بِهِ الْفُرُوجَ ». {الحديث: ٣٤٥٧ = ٣٤٤٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٣١ = ٢٧٢١، ٥١٥١. أبو داود. نكاح: ٢٠٣٩. ترمذى. نكاح: ١١٢٧. نسائى. نكاح: ٣٢٨١. تحفة الأشراف: ٩٩٥٣}:

**عوقبەی کوڕی عامیر** (ڕەزای خودای لێ بێ) **دەفەرموێ: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕەواترین مەرجێ کە شایەنی ئەوەبێ جێبەجێی بکەن، ئەو مەرجانەن کە ژنتان لەخۆتان پێیان حەلاڵکردووە، وەك مارەیی‌و ژێوارو گوزەران لەگەڵیان بەپێی شەرع).

## ٦٣٠) بەشوودانی ژن، یا کچی منالّ. (٣٤٦٤ - ٣٤٦٧)
## باب: تزويج الصَّغيرةِ

٨٠٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِستٍّ سِنِينَ، وَبَنَى بِى وَأَنَا بِنْتُ تِسْعِ سِنِينَ. قَالَتْ: فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، فَوُعِكْتُ شَهْرًا فَوَفَى شَعْرِى جُمَيْمَةً، فَأَتَتْنِى أُمُّ رُومَانَ وَأَنَا عَلَى أُرْجُوحَةٍ، وَمَعِى صَوَاحِبِى فَصَرَخَتْ بِى، فَأَتَيْتُهَا وَمَا أَدْرِى مَا تُرِيدُ بِى، فَأَخَذَتْ بِيَدِى فَأَوْقَفَتْنِى عَلَى الْبَابِ، فَقُلْتُ: هَهْ هَهْ. حَتَّى ذَهَبَ نَفَسِى فَأَدْخَلَتْنِى بَيْتًا، فَإِذَا نِسْوَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ، فَقُلْنَ: عَلَى الْخَيْرِ وَالْبَرَكَةِ، وَعَلَى خَيْرِ طَائِرٍ، فَأَسْلَمَتْنِى إِلَيْهِنَّ، فَغَسَلْنَ رَأْسِى، وَأَصْلَحْنَنِى، فَلَمْ يَرُعْنِى إِلاَّ وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ضُحًى، فَأَسْلَمْنَنِى إِلَيْهِ. {الحديث: ٣٤٦٤ = ٣٤٥٤ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥١٥ = ٣٨٩٤، ٣٨٩٦، ٥١٣٣، ٥١٣٤، ٥١٥٦، ٥١٥٨، ٥١٦٠. تحفة الأشراف: ١٦٨٠٩}:

**عائیشە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: تەمەنم شەش ساڵ بوو، کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) مارەی کردم، کاتێ کە گواستمیەوە نۆ ساڵ بووم. فەرمووی: لەپاشا کۆچمان کرد بۆ مەدینە، جارێ تووشی لەرزو تایەکی سەختی وابووم، قژم رووتایەوە، لەپاشا قژەکەم هاتەوەو پەلکۆلەیەکی پەیدا کردەوە دەیدا لەناو شانم، ئەوا جارێ وام لەناو جۆلانەیەکا، لەگەڵ چەند دەستە خوشکێکی خۆما، گەمەو دیلانێمان دەکرد، هەر ئەوەندەم زانی ئوممو ڕۆمانی دایکم هاتە لام‌و بانگی کردم، منیش چووم بۆلای، نەیشم دەزانی چی لێم دەوێ‌و بۆچی بانگم دەکا، ئیتر دەستی گرتم‌و بردمی، تا گەیشتینە بەردەرگای ماڵی خۆمان، لەوێدا تۆزێ ڕایوەستاندم، لەبەر ماندوێتی هەناسەم سوار بوو بوو، هەناسەبڕکێم بوو، تا نەختێ پشووم

بەبەردا هاتەوە، لەبەر خۆمەوە دەمگوت: هە، هە، هە. جا دایکم نەختێ ئاوی هەڵگرتو ئاوەکەی هەڵسوی لە دەموچاوو سەرو چاوم، ئینجا بردمیەماڵەوە، کە چوومە ژوورەوە گوتیان: لەسەر خێرو خۆشی، لەسەر بەختی باش، ئیتر دایکم منی دایە دەستی ئەوان، ئەوانیش سەریان شۆردمو نەختێ ڕێکیان خستم، ئیتر ئاگام لەهیچ نەبوو، کاتێکم زانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەکاتی چێشتەنگاودا خۆی کرد بە ماڵاو دایچەڵەکانم. ئەوسا ژنەکان منیان دایە دەستیو هەر ئەوکاتە لەو شوێنەدا، لە ماڵی خۆمان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدەستی گرتمو لێم بوو بە زاوا، ئەوحەلە تەمەنم نۆ ساڵ بوو. {تاج/٣، زنجیرە: ٣٧، ژمارە: ٣٤٣٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٠٦٧}.

**٦٣١) سوننەتە کەنیزەك (ئەمەتە) ئازاد بکرێو دوایی مارەبکرێ(٤٦٤١ - ٤٦٤٥)**
**باب: عِتْقُ الأمَةِ وَتَزْوِيجُهَا**

٨٠٦- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) غَزَا خَيْبَرَ، قَالَ: فَصَلَّيْنَا عِنْدَهَا صَلاَةَ الْغَدَاةِ بِغَلَسٍ، فَرَكِبَ نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَرَكِبَ أَبُو طَلْحَةَ، وَأَنَا رَدِيفُ أَبِى طَلْحَةَ، فَأَجْرَى نَبِيُّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى زُقَاقِ خَيْبَرَ، وَإِنَّ رُكْبَتِى لَتَمَسُّ فَخِذَ نَبِىِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَانْحَسَرَ الإِزَارُ عَنْ فَخِذِ نَبِىِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَإِنِّى لأَرَى بَيَاضَ فَخِذِ نَبِىِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا دَخَلَ الْقَرْيَةَ قَالَ: « اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ »، قَالَهَا ثَلاَثَ مَرَّاتٍ، قَالَ: وَقَدْ خَرَجَ الْقَوْمُ إِلَى أَعْمَالِهِمْ فَقَالُوا: مُحَمَّدٌ وَاللَّهِ! (قَالَ عَبْدُ الْعَزِيزِ: وَقَالَ بَعْضُ أَصْحَابِنَا: مُحَمَّدٌ وَالْخَمِيسُ). قَالَ وَأَصَبْنَاهَا عَنْوَةً، وَجُمِعَ السَّبْىُ، فَجَاءَهُ دِحْيَةُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَعْطِنِى جَارِيَةً مِنَ السَّبْىِ؟ فَقَالَ: اذْهَبْ فَخُذْ جَارِيَةً، فَأَخَذَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَىٍّ، فَجَاءَ رَجُلٌ إِلَى نَبِىِّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ أَعْطَيْتَ دِحْيَةَ صَفِيَّةَ بِنْتَ حُيَىٍّ سَيِّدِ قُرَيْظَةَ وَالنَّضِيرِ؟. مَا تَصْلُحُ إِلاَّ لَكَ، قَالَ: « ادْعُوهُ بِهَا »، قَالَ: فَجَاءَ بِهَا، فَلَمَّا نَظَرَ إِلَيْهَا النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: خُذْ جَارِيَةً مِنَ السَّبْىِ غَيْرَهَا، قَالَ: وَأَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، فَقَالَ لَهُ ثَابِتٌ يَا أَبَا حَمْزَةَ مَا أَصْدَقَهَا؟

قَالَ: نَفْسَهَا، أَعْتَقَهَا وَتَزَوَّجَهَا، حَتَّى إِذَا كَانَ بِالطَّرِيقِ جَهَّزَتْهَا لَهُ أُمُّ سُلَيْمٍ، فَأَهْدَتْهَا لَهُ مِنَ اللَّيْلِ، فَأَصْبَحَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَرُوسًا، فَقَالَ: « مَنْ كَانَ عِنْدَهُ شَيْءٌ فَلْيَجِئْ بِهِ »، قَالَ: وَبَسَطَ نِطَعًا، قَالَ: فَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالأَقِطِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالتَّمْرِ، وَجَعَلَ الرَّجُلُ يَجِيءُ بِالسَّمْنِ فَحَاسُوا حَيْسًا، فَكَانَتْ وَلِيمَةَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٦٤١ = ٤٦٢٩ فم. تجريد/١، رقم: ٢٣٥ = ٣٧١، ٦١٠، ٩٤٧، ٢٢٢٨، ٢٢٣٥، ٢٨٨٩، ٢٨٩٣، ٢٩٤٣، ٢٩٤٤، ٢٩٤٥، ٢٩٩١، ٣٠٨٥، ٣٠٨٦، ٣٣٦٧، ٣٦٤٧، ٤٠٨٣، ٤٠٨٤، ٤١٩٧، ٤١٩٨، ٤١٩٩، ٤٢٠٠، ٤٢٠١، ٤٢١١، ٤٢١٢، ٤٢١٣، ٥٠٨٥، ٥١٥٩، ٥١٦٩، ٥٣٨٧، ٥٤٢٥، ٥٥٢٨، ٥٩٦٨، ٦١٨٥، ٦٣٦٣، ٦٣٦٩، ٧٣٣٣. نسائي. نكاح: ٣٣٨٢. أبو داود. خراج وفيئ}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوپای ئامادەكردو بەرەو خەیبەر كەوتەڕێ، تاریكو لێڵەكە لەپاڵ قەلای خەیبەردا نوێژی بەیانیمان كرد، ئەوجا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سواری ولاخەكەی بۆوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ولاخەكەی خۆی بەناو كووچەو كۆلانەكانی خەیبەردا غاردەدا، منو ئەبو طەلحەی زڕبابم لەنزیكی پێغەمبەرەوە بووین، من لەپاشكۆی ئەبو طەلحەدا بووم، تەنانەت كەشكەژنۆم لەپاشكۆی ئەبو طەلحەوە دەیدا لەڕانی پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) جا لەئەنجامی ولاخ تاودانو جەنجالیو پالە پەستۆدا رانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) رووت بوو، تەنانەت من بەچاوی خۆم سپیدەی رانی پێغەمبەرم بینی.

كاتێ پێغەمبەرو سوپاكەی هەلڕژانە ناو گوندەكەوە، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (اللَّهُ أَكْبَرُ خَرِبَتْ خَيْبَرُ إِنَّا إِذَا نَزَلْنَا بِسَاحَةِ قَوْمٍ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ): ئەللاهوئەكبەر، وێران بوو خەیبەر، لەراستیدا ئێمە هەركاتێ بۆ هۆزێ بچینە مەیدان، ئیتر ئەو تۆقیوانە بەیانی رۆژی رەشیانە!) وە ئەم فەرمایشتەی سێجار دووبارە كردەوە، كە ئیقتیباسە لەم ئایەتە پیرۆزە: {فَإِذَا نَزَلَ بِسَاحَتِهِمْ فَسَاءَ صَبَاحُ الْمُنْذَرِينَ – ٣٧/١٧٧}. واتە: كاتێ تۆڵەی سەختی خودا بەردەرگا بەهۆزی بیبڕوا

دەگریٚو، لەهەموو لاوە گەمارۆیان دەدا، ئیتر ئەو گەلە تۆقیوانە سەر لەبەیانی رۆژی رەشیانە). فەرمووی: لەولایشەوە جوولەکەکان ئاگایان لەم هەڵمەتە نەبوو، سەر لەبەیانی وەك رۆژانی تر وەدەرکەوتن بۆسەر مەزراو ئیش‌و کاری رۆژانەی خۆیان، لەپڕ لووتیان تەقی بەلووتی لەشکری ئیسلاما، جا هاواریان لێ هەڵساو گوتیان: ئای! ئەمە موحەممەدو لەشکرەکەیەتی، هاتوون بۆسەرمان.

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قەڵای خەیبەرمان بەزەبری بازوو، لەچنگی دوژمن رزگارکرد. کاتێ ژنە دیلەکان کۆکرانەوە، دەحیەی کەلبی هاتە خزمەتی حەزرەت، عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! لەم ژنە تالانییانە کەنیزەکێکم پێ بدە، فەرمووی: (بڕۆ کەنیزەکێ ببە). دەحیە پیاوێکی قۆز بوو، زۆرجاران جوبرەئیل لە شێوەی ئەودا دەهات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)و سرووشی بۆ دەهێنا، دەحیە چوو صەفییەی کچی حویەیی برد بۆ خۆی، بەڵام پیاوێ هات گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! صەفییەی کچی حوییەی، کە خانمی ژنانی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەضیرە داوتە بە دەحیە، چۆن شتی وا دەگونجێ، ئەو خانمە خانەدانە بۆ کەسی تر دەست نادا، مەگەر بۆ تۆی پێغەمبەری خودا!).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئادەی دەحیە بانگ کەن ئەو ژنە بهێنێ). دەحیە هاتەوەو صەفییەی هێنایەوە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشای صەفییەی کرد، بە دەحیەی فەرموو: (بڕۆ لەو ژینگە لە بەتاڵانی گیراوانە کەنیزەکێکی تر بەرە بۆخۆت).

فەرمووی: ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) صەفییەی ئازادکردو مارەی کرد بۆ خۆی، ثابیتی بەنانی بە ئیمامی ئەنەسی فەرموو: ئەی باوکی حەمزە! چی کرد بەمارەیی بۆی؟ فەرمووی: خودی خۆی کرد بەمارەیی بۆی، لەپێشا لەباتی مارەیی ئازادی کردو ئەوسا مارەی کرد لەخۆی، جاکاتێ گەڕانەوە بۆ مەدینە، لەڕێگە شەوێ، ئومموسولەیمی دایکم تەدارەکی بووکی بۆ صەفییە خست‌و جیازیی بووکی

بۆ كردو كردی بە بووكو پێشكەشی كرد بە پێغەمبەر، بۆ بەیانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زاوا بوو، ئەوسا فەرمووی: (هەركەسێ خۆراكی هەیە بابچێ بیهێنێ).

نانی شاییەكەی برێتی بوو لەوە، كە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی كرد، سفرەیەكیان راخست، ئیتر هەرکەس لەلای خۆیەوە هەنێ خورما، یا رۆن، یا قاوت، یا كەشكی هێناو هەڵیان رشتە سەریو كردیان بەخورماو رۆنو كەشكو رۆنو قاوتو رۆنو دەستیان كرد بە نۆشكردنی، ئیتر هەرئەوە نانی شاییەكەی بوو). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٤٦، ژمارە: ٤٤٦٣}.

**روونكردنەوە:**

١.خەیبەر قەڵایەكی قایم بوو، بەدەستی هۆزی جوولەكەوە بوو، جێگەی هۆزی بەنی قورەیظەو بەنی نەضیر بوو، لەخۆرهەڵاتی باكوری مەدینەوەیە، شەش قۆناغ لە مەدینەوە دوورە، باخە خورمای زۆر بوو، ساڵی حەوتی كۆچی ئازادكرا.

٢. ئەبو طەلحە مێردی ئوممو سولەیمی دایكی ئەنەسی كوڕی مالیكە، كە نۆكەری پێغەمبەر بوو، ناوی زەیدی كوڕی سەهلی ئەنصارییە، ئامادەی شەوی پەیمانی عەقەبە بووە، یەكێكە لە (نوقەباكان)ی ئەو پەیمانە، نەوەدو دوو فەرموودەی هەیە، بوخاری سیانیانی گێڕاوەتەوە، ئەنەس زڕ كوڕی بوو، لەپاش مەرگی پێغەمبەر، ئەبو طەلحە چل ساڵ لەسەر یەك بەڕۆژوو بوو، بەس لەدوو جەژنەكانا رۆژووی دەشكان. ئەبو تەلحە خەزرەجییە، لەهەموو غەزەواتەكانی پێغەمبەردا ئامادە بووە، پێغەمبەر لە وەسفی دلێری ئەودا دەفەرموێ: (تەنها دەنگی ئەبو تەلحە لەناو سوپادا لەسەد پیاو باشترە) لەڕۆژی شەڕی حونەیندا بیست پیاوی لە بێبڕواكان كوشتو چەكو كەلوپەلەكانیانی گشت بە تاڵان گرت، لە شەڕو غەزاكاندا خۆی دەكرد بە سوپەرو پەردە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە دەیفەرموو: (ئەی پێغەمبەری خودا! رۆحم دەكەم بە قوربانی رۆحی

تـۆ). {بڕوانـه: تەجریـدی بوخـاری ژمـارە: ٦١٧ = ١٢٨٥ فـتح البـاری + تـاج/٣، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٣٤٧٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨٢، ژمارە: ١٩٥٢}.

٣. شەوی عەقەبە:

أ/ عەقەبەی یەکەم لەکاتی حەجدا، شەش کەس لە خەڵکی مەدینـە، واتـە: لـە ئەنصار، لەمینا، لە عەقەبە، ئیسلام بوون، هەر شەشیان لە هۆزی ئەوس بـوون، کە گەڕانـەوە بـۆ مەدینـە بـوون بـە نوێنـەری ئیسلامو هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی بانگەشـەی ئیسـلامیاندا، جـا لـەپاش سـاڵێ لـەم سـەرەتایە، دیسـان لـە وەرزی حەجـدا، لەهـەمان شـوێنی سـاڵی پێشوودا دوازدە پیـاو لـە ئەنصـار، کـە دەیـان خـەزرەجیو دوانیـان ئەوسـی بـوون پـەیمانی عەقەبـەی یەکـەمیان لەگـەڵ پێغەمبەردا بەست، کە پەیمانێ بوو لـە چەشـنی ئـەو پەیمانـەی کە پێغەمبـەر لەژیانیـدا، لـە ژنـانی وەردەگـرت، کـە ئەمـە پوختەکەیـەتی: (عوبـادەی کـوڕی صامیت کە خۆی یەکێ بووە لە ئەندامانی ئـەم پەیمانـە، دەفـەرموێ: دەسـتەیێ لەیارانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لـەدەوری بـوون، فـەرمووی پێیـان: پـەیمانم لەگەڵدا ببەستن لەسەر ئەوە: کە هاوبەش (شـەریك) بـۆ خـودا دانـەنێنو دزیو حیـزی نەکـەنو دەسـپاكو داوێنپـاك بـنو منـداڵی خۆتـان لەبـەر نـەبوونی نەکوژنو لەخۆتانەوە لە خوتو خـۆڕایی بوختیـان هەڵنەبەسـتن، وە لـەکردنی چاکەو پیاوەتیو مەردایـەتی سەرپێچی نەکـەنو لاریتـان نـەبێ لـەکاری خێـر) عوبادە دەفەرموێ: پێغەمبەر موژدەی بەهەشتی دا بـەو کەسـەی کـە پابەنـدبێ بەم پەیمانەو بیباتـە سـەر، بەنـدەکانی ئـەم پەیمانـە لـەم ئایەتـەدا هاتووە، کـە پـەیمانی لـە ژنـان پـێ وەردەگیرێ، کـە دەفـەرموێ: {يَـا أَيُّهَـا النَّبِـيُّ إِذَا جَـاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَى أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْـرِقْنَ وَلَـا يَـزْنِينَ وَلَـا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْـدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِـنَّ وَلَـا يَعْصِـينَكَ فِـي مَعْـرُوفٍ فَبَـايِعْهُنَّ وَاسْـتَغْفِرْ لَهُـنَّ اللَّـهَ إِنَّ اللَّـهَ غَفُـورٌ رَّحِيمٌ – ٦٠/١٢}. {بڕوانـه تـاجول ئوصول بەکوردی، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ٨، لاپـەڕە: ٤٠، ژمـارە: ٥٥ + ٦٠، هـەروا

تەجریدی بوخاری بەکوردی، بەرگی یەکەم ژمارە: ١٨ = ١٨، ٣٨٩٢، ٣٨٩٣ فتح الباری، هەروا مسلم. حدود، ژمارە: ٤٤٣٦. ترمذی. حدود: ١٤٣٩. نسائی. بیعه: ٤١٨٩ + تاج/٣، زنجیرە: ١٠١، ژمارە: ٢٤٠٠}.

ب/ پەیمانی عەقەبەی دووەم: لەساڵی سیازدەی رەوانەکردنی (بیعثەت)ی پێغەمبەردا، لەکاتی حەجدا، لەشەوی دوازدەی مانگی قوربانـدا، لەلای جەمرەی یەکەم لەمینا، حەفتاو سێ پیاوو دوو ژن، لە موسوڵمانانی مەدینـە، پەیمانیانـدا بـە پێغەمبـەر، کـە بەسـەرو بـەماڵ پارێزگـاریی لـەخۆیو ئایینەکـەی بکـەن، لـەدوا وەرگرتنـی ئـەم پەیمانـە، پێغەمبـەر دوازدە نـەقیبی بۆدانـان، نۆیـان لـە خـەزرەجو سیانیان لە ئەوس بوون.

٤.صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب (ڕەزای خودای لێ بێ) بـە رەگـەز لـە جوولەکـەی بەنی نەضیرە، لەنەوەی حەزرەتی هاروونی برای حـەزرەتی مووسایە (سڵاوی خودا لەسەر پێغەمبەری خۆمانو ئەوان بێ) لە غەزای خەیبەردا یەخسیر کـرا، چۆنێتی شووکردنی بـە پێغەمبـەر لـە فەرموودەکـەدا باسـکرا، مێردەکـەی لـەم جەنگەدا کوژرا، لەپاش إستبرای شەرعی، بە پاکبوونەوە، لە بێنوێژی، پێغەمبەر ئازادی کردو مارەی کرد لەخۆی، ساڵی حەوتی کۆچی بوو، صەفییە خـاتوون دە فـەرموودەی گێڕاوەتـەوە، یـەك فـەرموودەی لـە بوخاریـدا هەیـە، صـەفییە زۆر هێمنو بەرێزو سەلارو هۆشمەندو جوان بوو، پێغەمبەری زۆر خـۆش دەویسـت، لەسـەرە مـەرگا عـەرزی پێغەمبـەری کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! سـوێندم بەخودا حەزدەکەم کە ئەم ئێشو ئازارەی تـۆ بەمنـەوە بوایـە، نـەوەك بـەتۆوە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (راست دەکەیت!).

قسە دەگاتەوە بە دایە صەفییە خان کە حـەزرەتی خـاتوو عائیشـەو حـەزرەتی خاتوو حەفصە دەڵێن: صەفییە بنەجووە، ئێمە لەو باشترین، ئێمە ئـامۆزاو خزمـی پێغەمبەرین، ئەو کچە جوولەکەیە، ئەویش لەداخا دەست دەکا بەگریان، پێغەمبەر دەچێ بەسـەریا، دەڕوانـێ دەگـری، دەفـەرموێ: (ئـەوە بۆچـی دەگـری؟) دەفـەرموێ

حەفصـەی ژنـتو عائیشـەی ژنـت پـێم دەڵـێن: خۆیـان خانـەدانو مـن کچـە جوولەکـەمو تانـەی بنـەجوویيم لێ دەدەن. پێغەمبـەر دەفـەرموێ: دەبـوو پێـت بگوتنایـە: منـێ کـە بـاوکم هـاروون بـێو مامـەم مووسـا بـێو مێـردم موحەممەد پێغەمبەر بێ، ئیتر چۆن ئێوە لەمن باشتر دەبن).

تەمەنی صەفییە حەڤدە ساڵ بووە کە شووی کردووە بە پێغەمبەر، دەوری سێ ساڵ لەلای پێغەمبەر دەمێنێو پێغەمبەر وەفات دەکا، لەتەمەنی شەست ساڵیدا، لە مانگی رەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچیدا، لە سەردەمی موعاوییەدا خاتوو صەفییە گیانی پاکی سپارد (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ). {بڕوانـە: تـاج/٢، زنجـیرە: ٤٠، ژمـارە: ٢١٢٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٤١، ژمارە: ٣٤٤٤ + تاج/٤، زنجیرە: ٩٠، ژمارە: ٤٦١١ هەتا: ٤٦١٤ چ/٤}.

٨٠٧- عَنْ أَبِي مُوسَى الأشعري (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): فِي الَّذِي يُعْتِقُ جَارِيَتَهُ ثُمَّ يَتَزَوَّجُهَا: « لَهُ أَجْرَانِ ». {الحديث: ٣٤٨٤ = ٣٤٧٩ فم. تجريد/١، رقم: ٨٢ = ٩٧، ٢٥٤٤، ٢٥٤٧، ٢٥٥١، ٣٠١١، ٣٤٦٤، ٥٠٨٣. أبو داود. ناح: ٢٠٥٣. نسائى. نكاح: ٣٣٤٥. تحفة الأشراف/٩١٠٨}:

ئـەبو مووسـای ئەشعەری (رەزای خودای لـێ بێ) دەفـەرموێ: سـەبارەت بـە پاداشـی ئـەو کەسەی کـە کـەنیزەکێکی وای هـەبێ کـە دروسـت بـێ مـارەی بکـا، بـەجوانی تـەمێی بکاو، فێری خوێندەواریو زانستی بکا، ئینجا ئازادی بکاو مارەی بکا بۆ خۆی، وە مەبەستی لەم کارەیش ساخ رەزامەندی خودابێ، ئەوەی وابکـا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئـەوە دوو پاداشـتی بـۆ هەیـە). {بڕوانـە: ژمـارە: ٣٩٩فـم} کـە لەپێشەوە لە ژمارە (٢١)ی ئەم پەڕاوە پیرۆزەدا رابورد.

## ٦٣٢) ژن بەژن (٣٤٥٠ – ٣٤٥٦)

## باب: نِكَاحُ الشِّغَارِ

٨٠٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الشِّغَارِ. وَالشِّغَارُ أَنْ يُزَوِّجَ الرَّجُلُ ابْنَتَهُ عَلَى أَنْ يُزَوِّجَهُ ابْنَتَهُ، وَلَيْسَ بَيْنَهُمَا صَدَاقٌ. {الحديث: ٣٤٥٢ = ٣٤٤٢ فم}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی دەکرد لەژن بـەژن، ژن بـەژنیش وەك ئـەوە کـە دوو پیـاو بەکچی خۆیـان ژن بـەژن بکەن بەبێ مارەیی {تاج/٢، زنجیرە: ٥٩، ژمـارە: ٢٢٠٧، ٢٢٠٨ بڕوانـە: بخاری. چیـل: ٦٩٦٠}.

## ٦٣٣) سیغەکردن نادروستە. (٣٣٩٦ - ٣٤٢١)

## باب: فِي نِكَاحِ المُتْعَةِ

٨٠٩- عَنْ قَيْسٍ قَالَ: سَمِعْتُ عَبْدَ اللَّهِ بن مسعود (رضى الله عنه) قَـالَ: كُنَّـا نَغْـزُو مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَيْسَ لَنَا نِسَاءٌ، فَقُلْنَا: أَلاَ نَسْتَخْصِي؟ فَنَهَانَـا عَـنْ ذَلِكَ، ثُمَّ رَخَّصَ لَنَا أَنْ نَنْكِحَ الْمَرْأَةَ بِالثَّوْبِ إِلَى أَجَلٍ، ثُمَّ قَرَأَ عَبْدُ اللَّهِ: ( يَـا أَيُّهَـا الَّـذِينَ آمَنُوا لاَ تُحَرِّمُوا طَيِّبَـاتِ مَـا أَحَـلَّ اللَّـهُ لَكُـمْ وَلاَ تَعْتَـدُوا إِنَّ اللَّـهَ لاَ يُحِـبُّ الْمُعْتَـدِينَ ). {الحديث: ٣٣٩٦ = ٣٣٨٥ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٦٥٦ = ٤٦١٥، ٥٠٧١، ٥٠٧٥. تحفـة الأشراف/ ٩٥٣٨}:

قەیس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: بیستم لـە عەبـدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: گەڵێ جار وادەبـوو، لەخزمـەت پێغەمبـەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) دەچووین بـۆ غـەزا، ژنمـان لەگـەڵ خۆمـان نـەدەبرد، جـا بۆئـەوەی کـە لـەم ڕووەوە تووشـی تـاوان نـەبین و دووربـین لەداوێنپیسـی، عـەرزی پێغەمبـەرمان کـرد: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ڕێگـەمان پـێ بـدە خۆمـان دەخەسـێنین، نـەبادا شـەیتان ختـە ختەمان بدا، ئەویش ڕێگەی ئەوەی پێ نەداین، بەڵام لەوەدوا، پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێماندا، کەبۆ ناچاری ژن سیغە بکـەین، لەسـەر جل و بـەرگ و شـتی تریش، بۆماوەیەکی نـاوبراو، وەك ڕۆژێ، مانگێ، ساڵێ. ئـەنجا ئیبنـو مەسـعوود بـۆ پشتیوانی ڕای خۆی، لـەبارەی دروسـت بـوونی ژن سـیغەکردنەوە، ئـەم ئایەتـەی بـە بەڵگە هێنایەوەو خوێندیەوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تُحَرِّمُواْ طَيِّبَاتِ مَا أَحَلَّ اللّهُ لَكُمْ وَلاَ تَعْتَدُواْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ - سورة المائدة / ٨٧}.

واتە: ئەی موسوڵمانینە! لە یاسای خودای گەورە دەرمەچن، ئەو شتە پاكو خۆشانە، چ خۆراك بن، چ حەڵاڵو هاوسەر، چ شتی تر، كە خودا ڕەوای دیوە بۆتانو خۆی بۆی حەڵاڵ كردوون، لەخۆتانەوە لەسەر خۆتانی حەرام مەكەن، سنوورەكانی خودا مەبەزێنن، لە ڕاستیدا خودا ئەوانەی خۆش ناوێ، كە بەناڕەوا سنوورەكانی یاسانامەی خودا دەبەزێنن).

٨١٠- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا نَسْتَمْتِعُ بِالْقُبْضَةِ مِنَ التَّمْرِ وَالدَّقِيقِ الأَيَّامَ، عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبِى بَكْرٍ، حَتَّى نَهَى عَنْهُ عُمَرُ (رضى الله عنه) فِى شَأْنِ عَمْرِو بْنِ حُرَيْثٍ. {الحديث: ٣٤٠٢ = ٣٣٩١ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیو لەسەردەمی جێنشینیی ئەبوبەكردا، بەچنگێ خورما، یا بەمشتێ ئارد، بۆماوەی چەند ڕۆژێكی دیاریكراو، ژنمان سیغە دەكرد، هەتا كاتی سەردەمی ئیمامی عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) ئیتر ئەو پێشگیریی كرد لەژن سیغەكردن، لەكاتی چیرۆكی ژن سیغەكردنەكەی عەمری كوڕی حورەیثدا).

**ڕوونكردنەوە:**

١. عەمری كوڕی حورەیث هاوەڵی پێغەمبەرە، لەسەردەمی پێشەوا عومەری كوڕی خەتابا، ژنێ سیغەدەكاو سكی پڕدەكا، كاتێ ئەم باسو خواسە دەگاتەوە بە عومەر، ئیتر نەیی لەژن سیغەكردن دەكا.

٢. سیغەكردن بۆ ئەم سەردەمە زۆر مەترسیدارە، بەتایبەتی شیعە دەتوانن بیكەن بەداوو تۆڕو ڕاوی لاوی سوننی پێ بكەن، وەك ڕاوە سوێسكە، بەتایبەتی هی كاربەدەستان، كەهەر بەناو موسوڵمانن، یا سوننین.

٣. بۆ ڕوونكردنەوەو ساخكردنەوەی ئەم باسە ئاڵۆزە بڕوانە:

أ/ تاجول ئوصول بەكوردی، بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ١٩٩، زنجیرە: ٦، ژمارە: ٣٨٣٤، ٣٨٣٥ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٢٠٩ هەتا ژمارە: ٢٢١٢. چاپی چوارەم.

ب/ فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم زنجیرە: ٢٩٨ — باسی سیغەکردن (نكاح المتعـه = مارەکردن بۆ رابواردن = مارەبڕینی کاتی = ژنهێنـان بـۆ ماوەیـەکی دیـاریکراو) وەك بۆ حەفتەیێ، یا مانگێ، یا ساڵێ، یا دەساڵ، یا کەمتر یازیـاتر، بەمـەرجێك ماوەکـەی دیاری کرابێ.

ج/ فتح الملهم شەرحی حەدیثی ژمـارە: ٣٣٨٥ هـەتا ٣٤١٠ فـم هـەروا فـتح البـاری شرح صحیح البخاری ژمارە: ٤٦١٥، ٥٠٧١، ٥٠٧٥.

د/ موسوڵمانێ گێڕایەوە، گوتی: کوڕێکی قۆزمان لەگەڵدا بـوو، بـۆ ئـیش‌و کـاری پەساپۆرت، چووین بـۆ فەرمانگـەی پەسـاپۆرت لـە تـاران، ئیشـەکەمان چـەند رۆژێ هاموشۆی دەویست، لە فەرمانگەکە، هۆدەیەك هەبوو نزیکـەی پـازدە پیـاوو دووسـێ ئافرەتی لێ بوو، گوتی: یەکێ لە ژنەکان زۆر جوان‌و بەرچاوی‌و لەبلەبان بـوو، زۆری بۆ کوڕە کەشخەکەی هاوڕێی ئێمە هێنـابوو، کـە سـیغەی لەگەڵـدا بکـا، وە بەئاشـکرا دەیگوت: شتێ کـە حـەلاڵ‌و زولاڵ بـێ شـەرمی نـاوێ، مـن بەشـانازییەوە دەڵـێم: کـە لەگـەڵ ئـەم کۆمەڵـە پیـاوەی کـەوان لـەم هۆدەیـەدا، لەگـەڵ هەموویانـدا سـیغەم کردووەو هاوسەری کاتیم لەگەڵدا ئەنجام داون!!

### ٦٣٤) لابردن‌و سڕینەوەی مارەبڕینی کاتی‌و نادروستکردنی (٣٣٩٦ - ٣٤٢١)
### باب: نَسْخُ نِكَاحِ المتعَةِ وَتَحْرِيمُهَا

٨١١- عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رضـى الله عنـه): أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) نَهَى عَنْ مُتْعَةِ النِّسَاءِ يَوْمَ خَيْبَرَ وَعَنْ أَكْلِ لُحُومِ الْحُمُرِ الإِنْسِيَّةِ. {الحـديث: ٣٤٢١ = ٣٤٠٦ فم. تجريد/٤، رقـم: ١٥٧٤ = ٤٢١٦، ٥١١٥، ٥٥٢٣، ٦٩٦١. ترمـذى. نكـاح: ١١٢١. نسائى. نكاح: ٣٣٦٥. ابن ماجة. نكاح: ١٩٦١. تحفة الأشراف: ١٠٢٦٣}:

ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیب (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە رۆژی غەزای خەیبەردا، جڵەوگیریی لەم دوو شتەکرد: لەژن سـیغەکردن‌و لەخواردنی گۆشتی کەری ماڵی. {تاج/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٢١٠. چاپی چوارەم}.

٨١٢- عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ سَبْرَةَ: أَنَّ أَبَاهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَتْحَ مَكَّةَ قَالَ: فَأَقَمْنَا بِهَا خَمْسَ عَشْرَةَ (ثَلاَثِينَ بَيْنَ لَيْلَةٍ وَيَوْمٍ)، فَأَذِنَ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي مُتْعَةِ النِّسَاءِ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَرَجُلٌ مِنْ قَوْمِي وَلِي عَلَيْهِ فَضْلٌ فِي الْجَمَالِ، وَهُوَ قَرِيبٌ مِنَ الدَّمَامَةِ، مَعَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنَّا بُرْدٌ، فَبُرْدِي خَلَقٌ، وَأَمَّا بُرْدُ ابْنِ عَمِّي فَبُرْدٌ جَدِيدٌ غَضٌّ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِأَسْفَلِ مَكَّةَ أَوْ بِأَعْلاَهَا فَتَلَقَّتْنَا فَتَاةٌ مِثْلُ الْبَكْرَةِ الْعَنَطْنَطَةِ، فَقُلْنَا لها: هَلْ لَكِ أَنْ يَسْتَمْتِعَ مِنْكِ أَحَدُنَا؟ قَالَتْ: وَمَاذَا تَبْذُلاَنِ؟ فَنَشَرَ كُلُّ وَاحِدٍ مِنَّا بُرْدَهُ، فَجَعَلَتْ تَنْظُرُ إِلَى الرَّجُلَيْنِ وَيَرَاهَا صَاحِبِي تَنْظُرُ إِلَى عِطْفِهَا. فَقَالَ إِنَّ بُرْدَ هَذَا خَلَقٌ، وَبُرْدِي جَدِيدٌ غَضٌّ، فَتَقُولُ: بُرْدُ هَذَا لاَ بَأْسَ بِهِ. ثَلاَثَ مِرَارٍ أَوْ مَرَّتَيْنِ ثُمَّ اسْتَمْتَعْتُ مِنْهَا فَلَمْ أَخْرُجْ حَتَّى حَرَّمَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٤٠٦ = ٣٣٩٥ فم}:

رەبیعی کوڕی سەبرە فەرمووی: باوکم لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشداریی کردووە لە ئازادکردن (فەتح)ی مەککەدا، باوکم فەرمووی: لەمەککە پازدە رۆژ ماینەوە (بە شەوو رۆژەکانیەوە، کە دەکەنە سیی، نیوەی شەوو نیوەی رۆژ) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو رۆژانەدا، رێگەی پێماندا کە ژن سیغە بکەین. جا منو ئامۆزایەکم، بەنیازی سیغەکردن چووین بۆ خوارووی مەککە، یا فەرمووی: بۆ سەرووی مەککە، من لەجوانیدا بەسەر ئەودا هەم بوو، بگرە ئەو ناجوانو ناشیرین بوو، سەرو بالآ پۆشمان پێ بوو، بالآ پۆشەکەی من کۆن بوو، بەلآم بالآ پۆشی ئامۆزاکەم تازەو نفتو نۆ بوو، جا لەوێ، تووشمان بوو بەتووشی جوانە کچێکەوە، دەتگوت جوانە وشتری گەردن بەرزی بالآ عەرعەرییە، جا روومان لێنا کە سیغەمان لەگەڵ بکاو پێمان گوت: ئایا دەتەوێ لەگەڵ یەکێکمانا شووی کاتی بکەی؟! ئەویش گوتی: بەڵێ، بەلآم چیم پێ دەدەن، ئەگەر سیغە لەگەڵ یەکێکتانا بکەم؟ ئێمەیش هەرکەسەمان بالآ پۆشەکەی خۆی بۆ والآ کردەوەو پیشانی دا، ئەویش دەستی کرد بە تەماشاکردنی خۆمانو سەیرکردنی بالآ پۆشەکانمان، من لە ئامۆزاکەم لاوتر بووم، بالآ پۆشەکەی ئەو لە هینەکەی من باشتر بوو، لەبەرئەوە

دامابوو كه كاممان پەسەند بكا، تا بەرە بەرە هاوڕێكەم هەستی كرد، كه تەماشای ئەو ناكاو تەماشای ئەم لاولای ئەو دەكا، كه منم، بۆیه ئامۆزاكەم پێی گوت: بالاّ پۆشی ئەمه كۆنەیه، بالاّ پۆشەكەی من تازەو نفتو نۆیه لەكیس خۆتی مەدەو لەگەڵ من ڕێكەوە، نەك ئەو، ئەویش سێ جار، یا دووجار گوتی: نا، بالاّ پۆشی ئەم پیاوە خراپ نییه. ئیتر لەگەڵ مندا ڕێكەوتو سیغەم لەگەڵ داكرد، بەڵام تەنیا سێ ڕۆژ لەگەڵیدا مامەوە، چونكه بەرلەوە له مەككه دەرچین، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سیغەی نادروست كرد).

**ڕوونكردنەوە:**

١. له بەكوردی كردنی ئەم فەرموودەیەدا سوود لەهەموو گێڕاوەكانی وەرگیراوە، لەگەڵ پەراوێزێ كه لەسەر ئەم ژمارەیه.
٢. ئەم فەرموودەیه له ئەفرادی موسلیمه، له بوخاریدا نییه.
٣. سەبرەی كوڕی مەعبەدی جوهەنی، هاوەڵی پێغەمبەرە لەمەدینه، لەذی مەڕوە نیشتەجێ بوو، روبەیعی كوڕی فەرموودەكانی دەگێڕێتەوە، ئامادەی خەندەق بووە لەگەڵ غەزاكانی پاشیدا، بوخاری به تەعلیق فەرموودەی ئەو ڕاگوێزدەكا، بەڵام موسلیمو خاوەن سوننەكان بەرشتەی پەیوەست فەرموودەكانی ئەو دەگێڕنەوە، فروستادەی عەلی بوو، بۆلای موعاویه لەشام، هەتا پەیمان لەخەڵكی شام وەربگرێ بۆ عەلی.

٨١٣- عَنْ سَبْرَةَ الْجُهَنِيُّ (رضى الله عنه): أَنَّهُ كَانَ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنِّى قَدْ كُنْتُ أَذِنْتُ لَكُمْ فِى الاِسْتِمْتَاعِ مِنَ النِّسَاءِ وَإِنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَ ذَلِكَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَمَنْ كَانَ عِنْدَهُ مِنْهُنَّ شَىْءٌ فَلْيُخَلِّ سَبِيلَهَا، وَلاَ تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا ». {الحديث: ٣٤٠٨ = ٣٣٩٧ فم} :

له تاجدا ئەم فەرموودەیه ئاوایه:

سەبرەی جوهەنی (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەبەینی گۆشەی حەجەرول ئەسوەدو دەرگای كابەدا، پێغەمبەرم دی، لەوێ ڕاوەستابوو، لەكاتی حەجی

مالاوایيدا، دەيفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): خەلكينە! ئەی موسولمانینە! لەمەوپێش ئەوە بوو خۆم ڕێگەم پێ دابوون، کەژن سیغە بکەن. واتە: ژن بۆ ماوەیەکی دیاریکراو مارە بکەن، بەلام لەم کاتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت خودا ئەوەی حەرام کردووە، ئیتر لەئێستاوە، هەرکەسێ یەکێکی لەم ژنانە لەلا هەیە، با بەرەلای بکا، وە هەرچیشتان پێیان داوە، هیچیان لێ مەسەندنەوە (م/د/ن). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٦٠، ژمارە: ٢٢١٢. چاپی چوارەم}.

**٦٣٥) کەسێ لە ئیحرامدا بێ نە ژن مارە دەبڕێو نە خوازبێنی دەکا** (٣٤٣٢ - ٣٤٣٩)

**باب: النهى عَنْ نِكَاحِ الْمُحْرِمِ وَخِطْبَتِه**

٨١٤- عَنْ نُبَيْهِ بْنِ وَهْبٍ: أَنَّ عُمَرَ بْنَ عُبَيْدِ اللَّهِ أَرَادَ أَنْ يُزَوِّجَ طَلْحَةَ بْنَ عُمَرَ بِنْتَ شَيْبَةَ بْنِ جُبَيْرٍ، فَأَرْسَلَ إِلَى أَبَانِ بْنِ عُثْمَانَ يَحْضُرُ ذَلِكَ، وَهُوَ أَمِيرُ الْحَجِّ، فَقَالَ أَبَانٌ: سَمِعْتُ عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ (رضى الله عنه) يَقُولُ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَنْكِحُ الْمُحْرِمُ، وَلاَ يُنْكَحُ، وَلاَ يَخْطُبُ ». {الحديث: ٣٤٣٢ = ٣٤٢١ فم}:

نوبەیهی کوڕی وەهب فەرمووی: عومەری کوڕی عوبەیدوللا، لە ئیحرامی حەجدا بوو، ویستی کچێکی شەیبەی کوڕی جوبەیری کوڕی عوثمانی حەجەبی، کەناوی ئوممولحەمید بوو، مارە ببڕێ لە طەلحەی کوڕی خۆی، ئەو سالە ئەببانی کوڕی عوثمانی کوڕی عەففان مێر حەج بوو، جا عومەری کوڕی عوبەیدوللا منی نارد بەشوێن ئەببان‌دا، کە ئامادەی ئەم بۆنەی مارە بڕینە ببێ. کە چووم پێیم گوت، ئەببان فەرمووی: چۆن شتی وا دەبێ؟ لە باوکم بیست دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەو کەسەی لە ئیحرامدایە، نابێ نەژن مارەبکا بۆ خۆیو نەژن بەشووبداتو نەخوازبێنی ژن بکا). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥٠٩ — م/د/ت/ن}.

٨١٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) أَنَّهُ قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَيْمُونَةَ {وَهُوَ} مُحْرِمٌ. {الحديث: ٣٤٣٨ =٣٤٢٧ فم. تجريد/٢، رقم:٨٤٥ =١٨٣٧، ٤٢٥٨، ٤٢٥٩، ٥١١٤. ترمذى. حج: ٨٤٤. نسائى. حج: ٢٨٣٧. تحفة الأشراف: ٥٣٧٦}:

ئیبنـو عـەبباس (ڕەزای خودایان لـێ بـێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كاتـێ مەیموونەی هاوسەری مارەكرد لە ئیحرامدا بوو. {تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥١٠ — ش/د/ت/ن}.

٨١٦- عَنْ يَزِيدَ بْنِ الأَصَمِّ (رضى الله عنهما) قَالَ: حَدَّثَتْنِى مَيْمُونَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَزَوَّجَهَا وَهُوَ حَلاَلٌ، قَالَ: وَكَانَتْ خَالَتِى وَخَالَةَ ابْنِ عَبَّاسٍ. {الحديث: ٣٤٣٩ = ٣٤٢٨ فم}:

یەزیدی كوڕی ئەصەمم (ڕەزای خودایان لـێ بێ) فـەرمووی: مەیموونـەی كچی حاریـث (ڕەزای خودای لێ بێ) خۆی قسەی بۆ كردم، فەرمووی: كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) مـارەی كـردم لەسەریف بووین، وە هەردووكمان بێ ئیحرام بـووینو لـە ئیحرامـدا نـەبووین. یەزیـد فەرمووی: مەیموونە پووری منو پووری ئیبنو عەبباسـە، چونكە خوشـكی دایكمانـە. {بڕوانە: ژمارە: ١١٧ كە لەپێشەوە رابورد + تاج/٢، زنجیرە: ٨٥، ژمارە: ١٥١١ ج/٤}.

### ٦٣٦) كۆكردنەوەی پوورو برازا یا خوشكەزا، لە هاوسەری یەك پیاودا نادروستە

### (٣٤٢٢ - ٣٤٣١) باب: تحريم الجمع بين المرأة وعمتها أو خالتها

٨١٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ أَرْبَعِ نِسْوَةٍ أَنْ يُجْمَعَ بَيْنَهُنَّ: الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا وَالْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا. {الحديث: ٣٤٢٣ = ٣٤١٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٥٧ = ٥١٠٨. نسائى. نكاح: ٣٢٨٨. تحفة الأشراف: ١٣٨١٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نـەیی لـەوە كردووە كە ئەم چوار جۆرە ژنـە شـوو بكـەن بەسـەر یـەكتری: ڕێگری دەكـرد لـەوە: كەژن شووبكا بەسەر خوشكی باوكی، كە پێی دەگوترێ میمك، یـا شـووبكات بەسـەر خوشكی دایكی، كەپێی دەگوترێ پوور، وە هەروەها پوورو میمكیش نابێ شـووبكەن بەسـەر بـرازاو خوشـكەزای خۆیـان). {تـاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمـارە: ٢٠٧٣}. تێبینـی: شیعەكان شتی وا دەكەن. (وەرگێڕ)

### ٦٣٧) مارەیی ژنەكانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) (٣٤٧٢ - ٣٤٨١)
### باب: صِدَاقُ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم لِأَزْوَاجِهِ

٨١٨- عَنْ أَبِي سَلَمَةَ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّهُ قَالَ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): كَمْ كَانَ صَدَاقُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَتْ: كَانَ صَدَاقُهُ لأَزْوَاجِهِ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ أُوقِيَّةً وَنَشًّا، قَالَتْ: أَتَدْرِي مَا النَّشُّ؟ قَالَ: قُلْتُ: لاَ. قَالَتْ: نِصْفُ أُوقِيَّةٍ، فَتِلْكَ خَمْسُمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَهَذَا صَدَاقُ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لأَزْوَاجِهِ.

ئەبو سەلەمەی كوڕی عەبدوڕەحمان (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لە عائیشەم پرسی: مارەیی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كەدەیدا بە هەریەكێ لە ژنەكانی، چەند بوو؟ فەرمووی: مارەیی هەریەكێ لە ژنەكانی، دوازدە ئۆقیەو نیم بوو.

عائیشە فەرمووی پێم: دەزانیت نیم چەندە؟ گوتم: نەء، فەرمووی: نیو ئۆقیەیە، كە هەمووی دەكاتە پێنج سەد درەمی زیوینی ئەو سەردەمە، كە دەكاتە پەنجا لیرە (دینار)ی زێڕی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ).

### ٦٣٨) مارەبڕین لەسەر ناوكەیێ زێڕ، كە بایی پێنج درەم زیوە (٣٤٧٢ - ٣٤٨١)
### باب: النكاح عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ

٨١٩- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى عَلَى عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ (رضى الله عنه) أَثَرَ صُفْرَةٍ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي تَزَوَّجْتُ امْرَأَةً عَلَى وَزْنِ نَوَاةٍ مِنْ ذَهَبٍ قَالَ: « فَبَارَكَ اللَّهُ لَكَ، أَوْلِمْ وَلَوْ بِشَاةٍ ».
{الحديث: ٣٤٧٥ = ٣٤٦٥ فـم. بخاري. نكـاح: ٥١٥٥، ٦٣٨٦. ترمـذي. نكـاح: ١٠٩٤. نسائي. نكاح: ٣٣٧٢، ابن ماجة. نكاح: ١٩٠٧. تحفة الأشراف: ٢٨٨}:

ئەنەسی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شوێنەواری زەعفەرانی بەعەبدوڕەحمانی كوڕی عەوفەوە بینی، فەرمووی: (ئەم زەردییە چییە؟) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە ژنم هێناوە، مارەییەكەی ناوكەیێ زێڕە، كە بایی پێنج درەمی زیوینە. فەرمووی: (دەی خودا پیرۆزی بكا

لێت، ئەگەر مەڕێکت سەربڕیوە نانی شایی دروستکە). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٢٠٩٣}.

### ٦٣٩) فێرکردن لەباتی مارەیی دەبێ (٣٤٧٢ - ٣٤٨١)

### باب: التزويج على تعليم القرآن

٨٢٠- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رضى الله عنهما) قَالَ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ جِئْتُ أَهَبُ لَكَ نَفْسِي، فَنَظَرَ إِلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَصَعَّدَ النَّظَرَ فِيهَا وَصَوَّبَهُ، ثُمَّ طَأْطَأَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَأْسَهُ. فَلَمَّا رَأَتِ الْمَرْأَةُ أَنَّهُ لَمْ يَقْضِ فِيهَا شَيْئًا، جَلَسَتْ، فَقَامَ رَجُلٌ مِنْ أَصْحَابِهِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ لَمْ تَكُنْ لَكَ بِهَا حَاجَةٌ فَزَوِّجْنِيهَا، فَقَالَ: « فَهَلْ عِنْدَكَ مِنْ شَيْءٍ »؟ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَقَالَ: « اذْهَبْ إِلَى أَهْلِكَ فَانْظُرْ هَلْ تَجِدُ شَيْئًا »؟ فَذَهَبَ، ثُمَّ رَجَعَ فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ مَا وَجَدْتُ شَيْئًا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « انْظُرْ وَلَوْ خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ »، فَذَهَبَ ثُمَّ رَجَعَ. فَقَالَ: لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ وَلاَ خَاتِمًا مِنْ حَدِيدٍ، وَلَكِنْ هَذَا إِزَارِي. (قَالَ سَهْلٌ مَا لَهُ رِدَاءٌ ). فَلَهَا نِصْفُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا تَصْنَعُ بِإِزَارِكَ؟ إِنْ لَبِسْتَهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْهَا مِنْهُ شَيْءٌ، وَإِنْ لَبِسَتْهُ لَمْ يَكُنْ عَلَيْكَ مِنْهُ شَيْءٌ !» فَجَلَسَ الرَّجُلُ حَتَّى إِذَا طَالَ مَجْلِسُهُ قَامَ، فَرَآهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مُوَلِّيًا، فَأَمَرَ بِهِ فَدُعِيَ له، فَلَمَّا جَاءَ، قَالَ: « مَاذَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ »؟ قَالَ: مَعِي سُورَةُ كَذَا وَسُورَةُ كَذَا (عَدَّدَهَا). فَقَالَ: « تَقْرَؤُهُنَّ عَنْ ظَهْرِ قَلْبِكَ؟ » قَالَ: نَعَمْ. قَالَ: « اذْهَبْ فَقَدْ مَلَّكْتُكَهَا بِمَا مَعَكَ مِنَ الْقُرْآنِ ». {الحديث: ٣٤٧٢ = ٣٤٦٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٦٠ = ٥١٢١، ٢٣١٠، ٥٠٢٩، ٥٠٣٠، ٥٠٨٧، ٥١٢٦، ٥١٣٢، ٥١٣٥، ٥١٤١، ٥١٤٩، ٥١٥٠، ٥٨٧١، ٧٤١٧. فتح الباري}:

سەهلی کوڕی سەعد (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ژنێك هاتە لای پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! هاتووم خۆم ببەخشم بەتۆ، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) سەرتاپا تەماشای کردو، ئەنجا سەری دانەواندو هیچ قسەی نەکرد. ژنەکەیش کەڕوانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هیچی نەگوت

لەبارەیەوە، دانیشت. جا پیاوێ، کە لەیارانی پێغەمبەر بوو، هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر خۆت ناتەوێ لەمنی مارەبکە؟ فەرمووی: (ئایا هیچت هەیە کە بیکەی بە مارەیی بۆی؟ گوتی: نەبەخوا ئەی پێغەمبەری خودا! هیچم نییە کە بیکەم بە مارەیی. فەرمووی: (دەبڕۆ بۆماڵەوە بۆلای کەسوکارت، بزانە هیچت دەست دەکەوێ کە بیکەی بە مارەیی). پیاوەکە ڕۆیشتو هاتەوە گوتی: بەخوا هیچم دەست نەکەوت، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دە شتێك پەیدا بکە با ئەنگوستیلەیەکی ئاسنیش بێ بیکە بە مارەیی). پیاوەکە دیسان ڕۆیشتەوەو هاتەوەو گوتی: بەخودا ئەی پێغەمبەری خودا! ئەنگوستیلەی ئاسنیشم دەست نەکەوت، بەڵام ئەم تاقە بەرکۆشەم هەیە کەوا لەبەرما، نیوەی بۆ منو نیوەی بۆ ئەو لەباتی مارەیی؟ سەهل فەرمووی: پیاوەکە یەك بەرکۆشی هەبوو، ئاڵاندبووی بەلای خوارووی خۆیەوە، پەشتە ماڵی نەبوو کە دەئاڵێنرێ بەلای سەرووی لەشەوە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە بەوچی، خۆی یەك پارچەیە، هەربەشی بەری یەکێکتان دەکا، ئەگەر لەبەرتۆدا بێ هیچی بەر ئەو ناکەوێ، ئەگەر لەبەر ئەودا بێ هیچی بەرتۆ ناکەوێ، کەواتە ئەوە نابێ).

جا پیاوەکە تاوێکی باش دانیشت، هەڵسا ڕۆیشت پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوی لێ بوو، ناردی بەشوێنیدا، بانگی کردەوە، کەهات پێی فەرموو: (چیت لە قورئان لەبەرە؟) گوتی: ئەو سوورەتەو ئەو سوورەتەم لەبەرە، وە سوورەتەکانی ژمارد، فەرمووی: (ئایا ئەم سوورەتانە هەموویان بەباشی لەبەر دەخوێنی؟) گوتی: بەڵێ. فەرمووی: (دەبڕۆ ئەوا لەسەر ئەو قورئانەی کە لەبەرتە ئەم ژنەم کرد بەهی تۆ). لە گێڕانەوەیەکی تاجا: (ئەوا لەسەر ئەوە کە فێری ئەو قورئانەی بکەی، کە خۆت ئێستا لەبەرتە ئەم ژنەم مارەکرد لەتۆ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٢٠٩٩ + تاج/٢، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٠٧٠}.

### ٦٤٠) باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ} الآية (٣٦١٤ - ٣٦١٩)

### باب: فِي قَوْلِهِ تَعَالَى: {تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ} الآية

٨٢١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كُنْتُ أَغَارُ عَلَى اللاَّتِي وَهَبْنَ أَنْفُسَهُنَّ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَقُولُ: وَتَهَبُ الْمَرْأَةُ نَفْسَهَا؟! فَلَمَّا أَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: (تُرْجِى مَنْ تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِى إِلَيْكَ مَنْ تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ). قَالَتْ: قُلْتُ: وَاللَّهِ مَا أَرَى رَبَّكَ إِلاَّ يُسَارِعُ لَكَ فِى هَوَاكَ. {الحديث: ٣٦١٦، ٣٦١٧ = ٣٦١٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦٨٠ = ٤٧٨٨، ٤٧٨٧، ٥١١٣. نسائى. نكاح: ٣١٩٩ تحفة الأشراف: ١٦٧٩٩}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رقو قیزم لەو ژنانە دەبۆوە کە دەچوون خۆیان دەبەخشی بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەمگوت: خۆ ئافرەت دیاریو دەسەنەو شمەك نییە، چۆن خۆی دەبەخشێ؟! کاتێ ئەم ئایەتەیش هاتە خوارەوە: {تُرْجِي مَن تَشَاءُ مِنْهُنَّ وَتُؤْوِي إِلَيْكَ مَن تَشَاءُ وَمَنِ ابْتَغَيْتَ مِمَّنْ عَزَلْتَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكَ - أحزاب/ ٣٣/٥١}.

واتە: لەگەڵ ئەوەدا کەمن ئەم ژنانەم بۆ حەڵاڵ کردووی، وە ئێستا حەڵاڵو هاوسەرتن، تۆ خۆت سەرپشك بە، بە ئارەزووی خۆت لەگەڵیان هەڵسوکەوت بکەو، کامیان دوا دەخەیو درەنگ دەچیت بۆلای، گوناهت لەسەر نییە، وە کامیان بانگ دەکەیت بۆلای خۆتو لە نۆرە نووستنی شەوانەدا پێشی دەخەی بە ئارەزووی خۆتە، وە ئەو ژنەی کە کەنارت لێ گرتووە، وە لێی دوورکەوتوویتەوە، ئەگەر سەر لەنوێ ئاشتی کەیتەوە گوناهت ناگات).

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: (کە ئەم ئایەتە لەسەر ئەم شێوەیە هاتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر، کە ئەوەی بۆی دابین کردبوو، کە بەکەیفی خۆی، شەوانە لەلای هاوسەرەکانی بمێنێتەوە، نەوەك بەپێی قەسمو نۆرە شەوی خۆیان، کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە گوتم بە پێغەمبەر: وادەزانم، بەزەینم، خودا بە کەیفی دڵی تۆ دەجووڵێتەوەو بێ دڵێت ناکاو، زوو زوو هەوەسو ئارەزووت جێبەجێ دەکات!).

{بڕوانە: ئەم ژمارانە لە سوورەتی ئەحزاب، بەرگی چوارەم، لە (تاج الأصول في أحاديث الرسول) بە کوردی چاپی چوارەم، زنجیرە: ١٦، لاپەڕە: ٤١٦، ژمارە: ٤٠٤٨، ٤٠٤١، ٤٠٤٣، ٤٠٤٥، ٤٠٤٦، ٤٠٤٧، ٤٠٤٩، ٤٠٥٠، ٤٠٥٤ + تجريد/٤، لاپەڕە: ٤٧٣، ژمارە: ١٦٨١، ١٦٨٢، ١٦٨٣}.

## ٦٤١) ژن بەشوودان لەمانگی شەشەڵان (شَوَّال)دا (٣٤٦٨ - ٣٤٦٩)

## باب: التزويج في شوَّال

٨٢٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: تَزَوَّجَنِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى شَوَّالٍ، وَبَنَى بِى فِى شَوَّالٍ، فَأَىُّ نِسَاءِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ أَحْظَى عِنْدَهُ مِنِّى؟ قَالَ: وَكَانَتْ عَائِشَةُ تَسْتَحِبُّ أَنْ تُدْخِلَ نِسَاءَهَا فِى شَوَّالٍ. {الحديث: ٣٤٦٨ = ٣٤٥٨ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ ڕەوانەوەی ئەو بیروباوەڕە پووچەی سەردەمی نەزانی، گوایە ژنهێنانو ژن شووکردن، لەمانگی شەشەڵاندا ناباشەو بەدقوومە، عائیشە بۆ پووچکردنەوەی ئەم باوەڕە پووچە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمانگی شەشەڵاندا منی مارەکردو، هەر لەمانگی شەشەڵانیشدا منی گواستەوە، جاپێم بڵێن ئایا ژنەکانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کامیان وەکوو من نازی هەبوو لەلای؟ جا لەبەرئەوە عائیشە پێی خۆش بوو کە ژنان لە کەسوکاری خۆی لەمانگی شەشەڵانا ببرێن بە بووکی!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٧، ژمارە: ٢٠٦٨ ج/٤}.

## ٦٤٢) باسی نانی شایی‌و شیرینی خواردنەوەو شتی تری لەم بابەتە (٣٤٨٨ - ٣٤٩٤)

## باب: الوليمة في النكَاح

٨٢٣- عَنْ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: مَا أَوْلَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى امْرَأَةٍ مِنْ نِسَائِهِ أَكْثَرَ أَوْ أَفْضَلَ مِمَّا أَوْلَمَ عَلَى زَيْنَبَ، فَقَالَ ثَابِتٌ الْبُنَانِىُّ: بِمَا أَوْلَمَ؟ قَالَ أَطْعَمَهُمْ خُبْزًا وَلَحْمًا حَتَّى تَرَكُوهُ. {الحديث: ٣٤٩٠ = ٣٤٨٥ فم. تجريد/٥،

رقـــــم: ١٧٦٩ = ٥١٦٨، ٥١٦٧، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٦٢٣٨، ٦٢٣٩، ٦٢٧١، ٧٤٢١}:

**ئەنەس** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرموی: نـەم دیوە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بۆ کەسی تر لە ژنەکانی، نانی شایی وازۆرو واباش دروست بکا، وەك ئەو نانەی کە بۆشاییەکەی زەینەبی ژنی دروستی کردبوو. ثابیتی بەنانی فەرمووی: ئەی ئەنەس! نانی شاییەکەی زەینەب چی بوو؟ فەرمووی: تێری کردن لەنان و گۆشت تا پەڕیان لێی گرت).** {تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ٢١٢٥}.

٨٢٤- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: تَزَوَّجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَدَخَلَ بِأَهْلِهِ فَصَنَعَتْ أُمِّى أُمُّ سُلَيْمٍ حَيْسًا، فَجَعَلَتْهُ فِى تَوْرٍ فَقَالَتْ: يَا أَنَسُ اذْهَبْ بِهَذَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْ: بَعَثَتْ بِهَذَا إِلَيْكَ أُمِّى وَهِىَ تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ، وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: فَذَهَبْتُ بِهَا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ: إِنَّ أُمِّى تُقْرِئُكَ السَّلاَمَ. وَتَقُولُ: إِنَّ هَذَا لَكَ مِنَّا قَلِيلٌ (يَا رَسُولَ اللَّهِ)! فَقَالَ: « ضَعْهُ » ثُمَّ قَالَ: اذْهَبْ فَادْعُ لِى فُلاَنًا وَفُلاَنًا وَفُلاَنًا وَمَنْ لَقِيتَ »، وَسَمَّى رِجَالاً، قَالَ: فَدَعَوْتُ مَنْ سَمَّى، وَمَنْ لَقِيتُ. قَالَ: قُلْتُ لأَنَسٍ: عَدَدَ كَمْ كَانُوا؟ قَالَ: زُهَاءَ ثَلاَثِمِائَةٍ، وَقَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « يَا أَنَسُ! هَاتِ التَّوْرَ »، قَالَ: فَدَخَلُوا حَتَّى امْتَلأَتِ الصُّفَّةُ وَالْحُجْرَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِيَتَحَلَّقْ عَشَرَةٌ عَشَرَةٌ، وَلْيَأْكُلْ كُلُّ إِنْسَانٍ مِمَّا يَلِيهِ، قَالَ: فَأَكَلُوا حَتَّى شَبِعُوا، قَالَ: فَخَرَجَتْ طَائِفَةٌ، وَدَخَلَتْ طَائِفَةٌ حَتَّى أَكَلُوا كُلُّهُمْ، فَقَالَ لِى: يَا أَنَسُ ارْفَعْ، قَالَ: فَرَفَعْتُ، فَمَا أَدْرِى حِينَ وَضَعْتُ كَانَ أَكْثَرَ أَمْ حِينَ رَفَعْتُ؟ قَالَ: وَجَلَسَ طَوَائِفُ مِنْهُمْ يَتَحَدَّثُونَ فِى بَيْتِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَرَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) جَالِسٌ، وَزَوْجَتُهُ مُوَلِّيَةٌ وَجْهَهَا إِلَى الْحَائِطِ، فَثَقُلُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَخَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَلَّمَ عَلَى نِسَائِهِ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَمَّا رَأَوْا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَدْ رَجَعَ ظَنُّوا أَنَّهُمْ قَدْ ثَقُلُوا عَلَيْهِ، قَالَ: فَابْتَدَرُوا الْبَابَ، فَخَرَجُوا كُلُّهُمْ، وَجَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى أَرْخَى السِّتْرَ، وَدَخَلَ وَأَنَا جَالِسٌ فِى الْحُجْرَةِ، فَلَمْ

يَلْبَثْ إلاَّ يَسِيرًا حَتَّى خَرَجَ عَلَيَّ وَأُنْزِلَتْ هَـذِهِ الآيَـةُ، فَخَـرَجَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) وَقَرَأَهُنَّ عَلَى النَّاسِ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلاَّ أَنْ يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَـى طَعَـامٍ غَيْـرَ نَـاظِرِينَ إِنَـاهُ وَلَكِـنْ إِذَا دُعِيـتُمْ فَـادْخُلُوا، فَـإِذَا طَعِمْـتُمْ فَانْتَشِـرُوا وَلاَ مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ، إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْـتَحْيِي مِـنكُمْ وَاللَّـهُ لَـا يَسْـتَحْيِي مِـنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّـهِ عَظِيمًا). قَالَ الْجَعْدُ: قَالَ أَنَسُ: - أَنَا أَحْدَثُ النَّاسِ عَهْـدًا بِهَـذِهِ الآيَـاتِ - وَحُجِبْنَ نِسَـاءُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٤٩٣ = ٣٤٨٨ فم. تجريـد/٥، رقـم: ١٨٢١ = ٥٤٦٦، ٤٧٩١، ٤٧٩٢، ٤٧٩٣، ٤٧٩٤، ٥١٥٤، ٥١٦٣، ٥١٦٦، ٥١٦٨، ٥١٧٠، ٥١٧١، ٥٤٦٦، ٦٢٣٨، ٦٢٢٨، ٦٢٢٦، ٦٢٧١، ٧٤٢١}:

ئەنەسى كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەدینە زەینەبەی هێنا، جا شەوی زاوایی، بۆ بەیانی، ئوم سولەیمی دایکم، دۆو کەشکو ڕۆنی بەخورماو قاوتەوە دروست کردو کردیە قازانگێکەوەو فەرمووی: پێم: ئەی ئەنەس! ئەم خواردەمەنییە بەرە بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە پێی بڵێ: ئەم چێشتە دایکم ناردوویەتی بۆ تۆ، دایکم عەرزی سڵاوی هەبوو، عەرزی دەکردی: ئەمە لە ئێمەوە بۆ تۆ کەمە. منیش هەڵیم گرتو بردم بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وە عەرزیم کرد: دایکم عەرزی سڵاوی هەبوو لە خزمەتتا، عەرزیشی دەکردی: کە ئەمە لە ئێمەوە بۆ تۆ کەمە، دەبێ عوزرمان قەبووڵ بکەی! پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەوێدا داینێ) کە دامنا فەرمووی: (دە برۆ ئەو سێ کەسەم بۆ بانگ بکە) کە ناوی هێنان، وە فەرمووشی: (بەکێی تریش گەیشتی خوڵکیان بکە بۆ نانخواردنی شایی زەینەب).

ئەنەس فەرمووی: ئەوانەی کە پێغەمبەر ناوی هێنانو ئەوانەی کە پێیان گەیشتم بانگم کردنو خوڵکم کردن بۆ نانخواردن دەفەرموێ: عەرزی ئەنەسم کرد: ژمارەیان چەند کەس دەبوو؟ فەرمووی: سێ سەد کەسێ دەبوون. پێغەمبەر (درووودی

خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (ئەی ئەنەس! مەنجەڵەکە بێنە). منیش مەنجەڵەکەم هێنا بۆی، جا پیاوەکان هاتنە ژوورەوە هەتا هەیوانەکەوماڵەکە پڕبوون، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: دە کەس دە کەس ئەڵقە ببەستن، با هەرکەسەیشتان لەبەردەم خۆیەوە بخوات).

ئیتر تاقم تاقم بەرودوا دەهاتن‌و نانیان دەخوارد تا تێردەبوون، ئەنجا ئەوان دەردەچوون‌و تاقمێ تر دەهاتن، هەتا هەموویان نانیان خواردو تێر بوون. ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەمنی فەرموو: (ئەی ئەنەس! نانەکە بەزیادکەو مەنجەڵەکە لابەرە). فەرمووی: منیش وامکردو مەنجەڵەکەم لابرد، ئەوەی جێگەی سەرنج بوو، ڕوودانی ئەم موعجیزەیە بوو: نانە کەمەکە پیت‌و فەڕێکی وای تێ کەوت، نەمزانی کە لەپێشا هێنام زیاتر بوو، یا ئەوکاتەی کە بەزیادم کردو لام برد؟!

فەرمووی: جا کاتێ خەڵکەکە لەپاش نانخواردن بڵاوەیان لێکرد، چەند پیاوێ لەخزمەتی پێغەمبەردا، (دروودی خودای لەسەر بێ) مانەوەو، لەخزمەتیدا، لە ماڵەکەی خۆیدا دانیشتن‌و نەڕۆیشتن، زەینەبەی هاوسەریشی کە بووك بوو، لەوێ‌و دانیشتبوو، ڕووی کردبووە دیوارەکە، جا بەرە بەرە دانیشتنەکەیان پێغەمبەری سەخڵەت کرد، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەڵساو دەرچوو کۆڕەکەی چۆڵکرد، وە تەشریفی برد سڵاوی لە هاوسەرەکانی تری کرد، ئەوجا گەڕایەوە، جا پیاوەکان کە چاویان بە پێغەمبەر کەوت وا گەڕایەوە ئەوانیش هێشتا هەر دانیشتوون، هەستیان کرد کە بەم دانیشتنە ناوەختەیان پێغەمبەریان سەخڵەت کردووە، جا پەلاماری دەرگاکەیان داو هەموویان ڕۆیشتن، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتە ژوورەوەو پەردەی لەنێوانی من‌و خۆیدا دادایەوە، وەمن لەناو ماڵەکەدا دانیشتبووم، زۆری نەخایاند کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە هۆدەکەی خۆی دەرچوو هات بۆلای من، وە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەرچوو بۆناو یارانی‌و ئایەتەکەی بەسەریاندا خوێندەوە، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ

آمَنُوا لَا تَدْخُلُوا بُيُوتَ النَّبِيِّ إِلَّا أَن يُؤْذَنَ لَكُمْ إِلَى طَعَامٍ غَيْرَ نَاظِرِينَ إِنَاهُ وَلَكِنْ إِذَا دُعِيتُمْ فَادْخُلُوا فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَانتَشِرُوا وَلَا مُسْتَأْنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ يُؤْذِي النَّبِيَّ فَيَسْتَحْيِي مِنكُمْ وَاللَّهُ لَا يَسْتَحْيِي مِنَ الْحَقِّ وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَاعًا فَاسْأَلُوهُنَّ مِن وَرَاءِ حِجَابٍ ذَلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ وَمَا كَانَ لَكُمْ أَن تُؤْذُوا رَسُولَ اللَّهِ وَلَا أَن تَنكِحُوا أَزْوَاجَهُ مِن بَعْدِهِ أَبَدًا إِنَّ ذَلِكُمْ كَانَ عِندَ اللَّهِ عَظِيمًا — ٥٣/٣٣ - سورة الأحزاب}.

واتە: ئەی کەسانێ کە باوەڕتان هێناوە بەخوداو بە پێغەمبەری خودا! خودسەر خۆتان مەکەن بەناو ماڵەکانی پێغەمبەردا، مەگەر کاتێ کە ڕێگەتان پێ بدرێ بۆ نانخواردنو شتی وا، لەم حاڵەشدا، کاتێ بچن کە نانەکە پێگەیشتبێ، نەوەك لەپێشا بچن لەوێ چاوەنواڕ بکەن تانان پێدەگا، جا کاتێ خوڵك کران بڕۆن، کاتێ نانتان خوارد بڵاوەی لێ بکەن، وە لەوێ کۆڕی قسەی لێ دامەبەستنو زۆر مەمێننەوە، چونکە شتی وا ئازاری پێغەمبەر دەدا، پێغەمبەریش شەرمتان لێ دەکا، بۆیە قسە ناکا، بەڵام خودا لەشتی حەق شەرم ناکا، وە هەرکاتێ داوای شتێ دەکەن لە هاوسەرەکانی پێغەمبەر لەپشتی پەردەوە داوایان لێ بکەن، چونکە بەو شێوەیە باشترە بۆ دڵپاکی ئێوەیشو بۆ ئەوانیش، نابێ ئێوە ئازاری پێغەمبەر بدەن، یا ببن بەمایەی ئازار بۆی، هەروەك نابێ لەپاش خۆی ژنەکانی مارە بکەنەوە بۆ خۆتان، هەرگیز شتی وا نابێ، شتی وا ئەگەر بیکەن بەتاوانێکی گەورە دادەنرێ لەلای خودا. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

زەینەبی کچی جەحش، هاوسەری پێغەمبەر (درودی خودا لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەکانی بێ). دایکی ناوی ئومەیەی کچی عەبدول موتەلیبی کوڕی هاشیمە، کەواتە: زەینەب پوورزای پێغەمبەرە، لەپێش دا ژنی زەیدی کوڕی حاریثە بوو، کە زەید لەپێشدا زڕکوڕی پێغەمبەر بوو، کە زەید تەڵاقی دا شوویکرد بە پێغەمبەر ناوی (برّة) بوو، پێغەمبەر ناوی نا زەینەب، لەساڵی پێنجی کۆچیدا شووی کرد بە پێغەمبەر، تەمەنی زەینەب ئەوکاتە سیو

پێنج ساڵ بوو، ژنێکی خواناسی خوا پەرستی زۆر باش بوو، شەو نوێژی زۆری دەکرد، ڕۆژووی سوننەتی زۆری دەگرت، خێرکەرێکی گەورە بوو، ژنێکی دەست ڕەنگین بوو، کەوڵی خۆش دەکرد، مەشکەو کوندەی دەدووری‌و دەیفرۆشت‌و پارەکەی دەکرد بەخێر، وە دەیدا بەهەژاران، جارێ زەینەب بە سەفییەی هاوسەری پێغەمبەر دەڵێ: کچە جوو، لەسەرئەوە دەوری سێ مانگ پێغەمبەر دەنگی لێ دابڕی، زەینەب کەمێ کورتەباڵا بوو، یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو، کە لەدوا مردنی پێغەمبەر دەمرێ، کۆمەڵێ فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە، ئەم زاتانە فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی جەحش، کە برازای بووە، هەروەها ئوم حەبیبەی کچی ئەبو سوفیان‌و زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە، لە بوخاریدا دوو فەرموودەی هەیە، زەینەب کفنێکی بۆ خۆی ئامادە کردبوو، کاتێ کەوتە گیانەڵا گوتی: خۆم کفنێکم بۆ خۆم ئامادە کردووە، عومەریش کفنێکم بۆ دەنێرێ، لە یەکێکیانا بمنێژن‌و ئەوی تریان بکەن بەخێر!! ئەگەر دەتوانن کراسەکەی بەریشم بکەن بەخێر!!

داستانی شووکردنەکەی بە پێغەمبەر، وا لە سوورەتی ئەحزابا بە دوورو درێژی، لە تەمەنی پەنجا ساڵیدا، لەساڵی بیستی کۆچیدا، لەسەردەمی جێنشینی عومەردا کۆچی دوایی کرد، کە لەو ساڵەدا میسر ئازادکرا، بۆ زێدە زانیاری تر، سەبارەت بە ژیانی خاتوو زەینەب، بڕوانە ئەم شوێنانە: {فەرموودەی ژمارە: ١١٢١ مختصر صحيح البخاری، بەکوردی، بەرگی سێیەم، لاپەڕە: ٢٠٩ = ٢٦٦١ فتح الباری + فەرموودەی/٣، بەرگی/١، لاپەڕە: ١٢ + ژمارە: ٩٤ بەرگی/١، لاپەڕە: ١١٨ + ژمارە: ١٥٤ بەرگی/١، لاپەڕە: ١٧٠ + ژمارە: ٣٥٩ بەرگی/١، لاپەڕە: ٣٥٦ + ژمارە: ٦١٤ بەرگی دووەم لاپەڕە: ٣٩ + ژمارە: ٩٣١ بەرگی/٢، لاپەڕە: ٣٠٨ + ژمارە: ٩٣٥، بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٠ + ژمارە: ١٤٩٨ بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٨٤ + ژمارە: ١٤٩٩ بەرگی/٤، لاپەڕە: ١٨٥ + تاج/٣، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٣٤٤٣ + زنجیرە: ٣٥ + زنجیرە: ٣٦ + زنجیرە: ٣٧ + زنجیرە: ٣٨ + زنجیرە: ٤١ لە ژمارە: ٣٤٢٥ هەتا ٣٤٤٤. چاپی چوارەم} .

## ٦٤٣) وەڵامدانەوەی خوڵکی زەماوەند (٣٤٩٥ - ٣٥١١)

## باب: فِي إِجَابَةِ الدَّعْوَةِ فِي النكاح

٨٢٥- عَنْ نَافِعٍ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) كَانَ يَقُولُ عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا دَعَا أَحَدُكُمْ أَخَاهُ فَلْيُجِبْ عُرْسًا كَانَ أَوْ نَحْوَهُ ». {الحديث: ٣٤٩٩ = ٣٤٩٤ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧١ = ٥١٧٣، ٥١٧٩ فتح البارى. أبو داود. أطعمة: ٣٧٣٨ تحفة الأشراف: ٧٥٣٧}:

نافيع (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) گەلێ جار دەیفەرموو: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ کەسێکتان موسوڵمانێ، کە برای ئایینییەتی، بانگی کرد بۆسەر بۆنەیێ، وەك زەماوەندو شتی وا بابچێت بەدەنگیەوەو خوڵکەکەی قەبووڵ بکا). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٠، ژمارە: ٢١٢٢}.

٨٢٦- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا دُعِيَ أَحَدُكُمْ فَلْيُجِبْ، فَإِنْ كَانَ صَائِمًا فَلْيُصَلِّ، وَإِنْ كَانَ مُفْطِرًا فَلْيَطْعَمْ ». {الحديث: ٣٥٠٦ = ٣٥٠١ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر یەکێکتان خوڵك کران بۆسەر نانخواردنو شتی وا بابچێ، جا ئەگەر بەڕۆژوو بوو، مەرج نییە کە ڕۆژووەکەی بشکێنێ، بەڵکوو نزای باشیان بۆبکا بەسە، ئەگەر بەڕۆژوو نەبوو ئەوا با خۆراك بخوا، یا خواردنەوەی حەڵاڵ بخواتەوە).

٨٢٧- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه)، أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « شَرُّ الطَّعَامِ طَعَامُ الْوَلِيمَةِ، يُمْنَعُهَا مَنْ يَأْتِيهَا، وَيُدْعَى إِلَيْهَا مَنْ يَأْبَاهَا، وَمَنْ لَمْ يُجِبِ الدَّعْوَةَ، فَقَدْ عَصَى اللَّهَ وَرَسُولَهُ ». {الحديث: ٣٥١١ = ٣٥٠٥ فم. بخارى. نكاح: ٥١٧٦ (٥١٧٧). أبو داود. أطعمة: ٣٧٤٢}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەدترین نان نانی شاییو شیرینییە، کە بووە بەباو ئەوەی کەخۆی دەیەوێ بچێ بۆی ڕێگەی نادەن، وەك هەژاران، ئەوەی کەخۆی دەعیەی نایبا

خوڵکی دەکەن بۆسەری! ئەو کەسەشی خوڵك بکرێو نەچێ، ئەوە لەخوداو لە پێغەمبەری خودا یاخی دەبێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٩، ژمارە: ٢١١٦ ج/٤}.

## ٦٤٤) گوتەی کاتی سەرجێیی (٣٥١٩ - ٣٥٢٠)
## بَابٌ: مَا يَقُولُ عِنْدَ الجِمَاعِ

٨٢٨- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَوْ أَنَّ أَحَدَهُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِىَ أَهْلَهُ، قَالَ: بِاسْمِ اللَّهِ، اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا، فَإِنَّهُ إِنْ يُقَدَّرْ بَيْنَهُمَا وَلَدٌ فِى ذَلِكَ لَمْ يَضُرَّهُ شَيْطَانٌ أَبَدًا ». {الحديث: ٣٥١٩ = ٣٥١٤ فم، تجريد/٥، رقم: ١٧٦٨ = ٥١٦٥، ١٤١، ٣٢٧١، ٣٢٨٣، ٦٣٨٨، ٧٣٩٦. أبو داود. نكاح: ٢١٦١. ترمذى. نكاح: ١٠٩٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ یەکێ لەئێوە دەیەوێ بڕواتە لای خێزانی خۆی، ئەگەر لەوکاتەدا بڵێ: بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبِ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا: بەناوی خودا، ئەی خوایە! شەیتانمان لەکۆڵ بکەرەوەو شەیتان دوور بخەرەوە لەم ڕۆژیی خۆتە کەداوتە پێمان).

ئەوجا فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (هەرکەسەتان لەوکاتەدا لەکاتی دەستپێکردندا ئاوا بڵێ، ئەگەر لەوجارەدا منداڵ لەچارەیان نووسرابێ، هەرگیز شەیتان زیانی بۆی نابێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٠}.

**ڕوونکردنەوە:**

١. لە فەتحولباریدا دەفەرموێ: (پرسیارکراوە لە ئیمامی بوخاری (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ): ئەگەر کەسێ عەرەبی بەجوانی نەزانێ، دەتوانێ ئەم نزایە بە فارسی بڵێ؟ دەفەرموێ: بەڵێ). منیش دەڵێم: ئەمە بۆ هەموو دوعایەك هەروایە. (وەرگێڕ)

٢. کاتێ گوتنی ئەم نزایە سوننەتە کە دروستبوونەکە ڕەوابێ، تەنانەت ئەگەر نائومێدیش بن لەمناڵبوون ئەم نزایە سوننەتە، چونکە ڕزق گشتی ترە (ئەعەمترە) لە مناڵ.

٣. گوتنی ئەم نزایە بۆ ژنەکەیش لەهەمان کاتا سونسەتە.

٤.لە (غاية المأمول – شرح التاج الجامع للأصول) لەسەر باسی دەستووری سەرجێیی (آداب الوقاع)دا دەفەرموێ: ئەمانە دەستووری شەرعی سەرجێیین:

١.اعوذ بالله کردنو پەناگرتن بەخوا لەشەڕی شەیتان.

٢. بیسمیللا کردن لەپێش دروستبووندا.

٣. خۆداپۆشینو لەجێگەی دوور لەبەرچاوی خەڵك.

٤.نەزاکەت لەگەڵ ژنەکەو مۆڵەتدانی تا ئەویش کاری خۆی ئەنجام دەدا، بەتایبەتی ئەگەر پیاوەکە زووتر رەحەت ببێ.

٥. یاریو دەسبازی سازاو لەگەڵ دۆخەکەدا، بۆ بەردەوامی خۆشەویستی لەنێوانیانا.

٦. پارێز لەچوونە لا بەکۆم، یا لەکاتی بێنوێژیدا.

٧. قسەکردن لەکاتی جووتبووندا نا پەسەندە، مەگەر پەیوەندی بە دروستبوونەکەوە هەبێ، یا لەبەر ناچاری بێ.

٨. دەستکردنە ملو ماچکردنو مەمك گرتنو دەرپێ داکەندنو شتی وا هەمووی کاری پەسەندو داواکراوە.

٩. هەموو کارو گوتەیێ، کە لەم کاتەدا ببێ بەهۆی بەردەوامیی خۆشەویستیو لەززەتی حەلاڵ، گوتنو کردنی پەسەندە، چ لەلایەنی پیاوەکەوە، چ لەلایەنی ژنەکەوە.

١٠. گەلێ جار ژنەکە قسەی خۆشو کاری ئارەزوو بزوێن، لەگەڵ مێردەکەی دەکا، یا بەپێچەوانەوە، ئەوە نهێنی نێوانی خۆیانە، بلاوکردنەوەی ئەو رازو نهێنییە دوو بەدوويیە نادروستە.

## ٦٤٥) فەرمایشتی خودای گەورە: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ} (٣٥٢١ - ٣٥٢٣)
## بابٌ: فِي قَوْلِهِ تَعالَى: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ}

٨٢٩- عَنِ ابْنِ الْمُنْكَدِرِ سَمِعَ جَابرًا (رضى الله عنه) يَقُولُ: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ: إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِى قُبُلِهَا كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ: فَنزَلَتْ: ( نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ) {الحديث: ٣٥٢١ = ٣٥١٦ فم. بخاري. تفسير: ٤٥٢٧، ٤٥٢٨} :

ئیبنولمونکەدیر دەفەرموێ: بیستم لەجابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەیفەرموو: جوولەکەکان دەیانوت: ئەگەر پیاو لەلای پشتەوە بچێتە لای ژنی خۆی بەپێشی، ئەوە منداڵەکەی خێل دەبێ، جابۆ پووچکردنەوەی ئەم بیرو باوەڕە چەوتە. ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {نِسَآؤُكُمْ حَرْثٌ لَّكُمْ فَأْتُواْ حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ — بةقترة/٢/٢٢٣} :

واتە: ژنەکانتان کێڵگەن بۆ ئێوە، وەکوو زەوییەکەی لەبار بۆ تۆم تیاوەشاندن، دەی کێڵگەی خۆتان بکێڵن هەرچۆن دەتانەوێ، لەلاوە، یا لەپێشەوە، یا لەلای پشتەوە، بەمەرجێ بەپێش بێ، نەوەك بەکۆم). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٢ چ/٤} .

## ٦٤٦) ئەگەر ژن بەبێ هۆیەکی ڕەوا، خۆی نەدا بەدەستەوە بۆ ئیشی سەرجێیی (٣٥٢٤ - ٣٥٢٦)
## باب: في المرأةِ مِنْ فِراشِ زَوْجِهَا

٨٣٠- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا دَعَا الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ إِلَى فِرَاشِهِ، فَلَمْ تَأْتِهِ فَبَاتَ غَضْبَانَ عَلَيْهَا، لَعَنَتْهَا الْمَلاَئِكَةُ حَتَّى تُصْبِحَ ». {الحديث: ٣٥٢٤ = ٣٥٢٢ فم. تجريد/٣، رقم: ١٣٠٧ = ٣٢٣٧، ٥١٩٤ فتح. تحفة الأشراف: ١٢٨٩٧} :

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاو داوای سەرجێیی لەژنەکەی بکا، وە ژنەکەی بەبێ مەهانەیەکی ڕەوا ملی پێی نەدا، وە پیاوەکە لەسەرئەوە، ئەو شەوە لێی عاجزو نیگەران بوو، ئەو شەوە تا

بەیانی فریشتەكان لەعنەتو نەفرەت لەوژنە دەكەن). {تـاج/٢، زنجیرە: ٤٦، ژمـارە: ٢١٥٢}.

### ٦٤٧) دركاندنی رازو نهێنی ژن (٣٥٢٧ - ٣٥٢٨)

### بَابٌ: فِي نَشْرِ سِرِّ الْمَرْأَةِ

٨٣١- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ مِنْ أَشَرِّ النَّاسِ عِنْدَ اللَّهِ مَنْزِلَةً يَوْمَ الْقِيَامَةِ الرَّجُلَ يُفْضِى إِلَى امْرَأَتِهِ وَتُفْضِى إِلَيْهِ ثُمَّ يَنْشُرُ سِرَّهَا ». {الحديث: ٣٥٢٧ = ٣٥٢٤فم}:

ئـەبو سـەعیدی خـودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویێ: (ڕۆژی دوارۆژ لەلای خودا، كەس وەك ئـەو پیـاوە جێگـەی خـراپ نییـە، كـە لەگـەڵ ژنەكەیـدا سـەردەكەن بەیەكـداو، لەسـەرجێ باسـی سـەرجێیی‌و شـتی وادەكەن، كەچی دەچێ ئەو باس‌و خواسە بۆ خـەڵكی تـر دەگێڕێتـەوەو رازو نهێنـی ژنەكەی پەخش‌و بڵاودەكاتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٤٢}.

### ٦٤٨) ئەو بەندەیەی پەردەی خودای خۆی لەسەر خۆی هەڵ دەداتەوە.(٧٤١٠)

٨٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنـه) قَـالَ: سَـمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسلم) يَقُولُ: « كُلُّ أُمَّتِى مُعَافَاةٌ إِلاَّ الْمُجَاهِرِينَ، وَإِنَّ مِنَ الإِجْهَارِ أَنْ يَعْمَلَ الْعَبْدُ بِاللَّيْـلِ عَمَلاً، ثُمَّ يُصْبِحُ قَدْ سَتَرَهُ رَبُّهُ عزَّ وَجَلَّ فَيَقُولُ: يَا فُلاَنُ قَدْ عَمِلْتُ الْبَارِحَةَ كَذَا وَكَذَا، وَقَـدْ بَاتَ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، فَيَبِيتُ يَسْتُرُهُ رَبُّهُ، وَيُصْبِحُ يَكْشِفُ سِتْرَ اللَّهِ عَنْـهُ ». {الحديث: ٧٤١٠ = ٧٤٤٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٩٤٤ = ٦٠٦٩. تحفة الأشراف: ١٢٩١١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: بیسـتم لـە پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئۆمـەتی مـن هـەموویان بەرعـەفوو لێبـوردنی خـودا دەكـەون، مەگـەر ئەوانەیان كە سڕی خۆیان هەڵ دەماڵن، وەك ئـەوە كابرایەك لەشـەودا، یـا بەنـدەیێ بەشەو، كارێكی ناشیرین دەكا، وە خودا بۆی دەپۆشێ، كەچی كابرا بۆ بەیانی دەچێ تاوانی خۆی ئاشكرا دەكاو، دەیگێڕێتەوە بۆ ئەم‌و ئەوو دەڵێ: ئەی فیسار! مـن دوێ

شەو، ئیشێکی واوام کرد، لەگەڵ فلان‌و ئەو فلانا، ئارەقمان خواردەوە، یا قومارمان کرد مەسەلا!!

تەماشاکەن ئەو کابرایە خودا بەشەو پەردەی بۆدەکاو بە پەردەی رەحمەتی خۆی، گوناهەو نەنگی بۆ دەپۆشێ، کەچی ئەو بەندەیە، ئەوەندە بێ باك‌و بێ ئاگایە، دەچێ بەرۆژ پەردەی خودا، لەسەر نەنگ‌و شورەیی خۆی هەڵ دەداتەوە. (ریاچ/١، لاپەڕە: ٢١٥، زنجیرە: ٢٨، ژمارە: ٢٤١- ش = متفق علیە).

## ٦٤٩) ئاگربڕو پێشگیری لە سکبوون. (٣٥٢٩ - ٣٥٤٦)

٨٣٣- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه) قَالَ: ذُكِرَ الْعَزْلُ عِنْدَ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: وَمَا ذَاكُمْ؟ قَالُوا: الرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الْمَرْأَةُ تُرْضِعُ، فَيُصِيبُ مِنْهَا وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ مِنْهُ، وَالرَّجُلُ تَكُونُ لَهُ الأَمَةُ. فَيُصِيبُ مِنْهَا، وَيَكْرَهُ أَنْ تَحْمِلَ مِنْهُ، قَالَ: « فَلاَ عَلَيْكُمْ أَنْ لاَ تَفْعَلُوا ذَاكُمْ، فَإِنَّمَا هُوَ الْقَدَرُ ». قَالَ ابْنُ عَوْنٍ: فَحَدَّثْتُ بِهِ الْحَسَنَ فَقَالَ: وَاللَّهِ لَكَأَنَّ هَذَا زَجْرٌ. {الحديث: ٣٥٣٥ = ٣٥٣١ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا باسی خۆکێشانەوە (عەزل) کرا، فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): مەبەستتان لەخۆکێشانەوە چییە؟ گوتیان: پیاو هەیە ژنەکەی شیردەدا بەمناڵ‌و ژنەکەی مناڵبەبەرە، لەبەرئەوە کەکاتێ دەچێتەلای، هەتا ژنەکەی شفتەژێ نەکاو نەبێ بەسك، خۆی دەکێشێتە دواوەو تۆماوەکە لە دەرەوەی مناڵدان دەرێژێ، جاری واهەیە مێرد لەگەڵ هاوسەریدا وادەکا، جاری وایش هەیە ئاغا (سیّد) لەگەڵ کەنیزەك (ئەمەتە)ی خۆیدا وادەکا، چونکە ئەگەر ببێ بەمنداڵ، ئیتر کەنیزەکەکەی بۆنافرۆشرێ؟

پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (قەیناکەن ئەگەر وانەکەن! چونکە ئەوەی لەم کارەدا، کاریگەریی تەواوی هەیە، لە بوون‌و لەنەبوونی منالا، چارەنووسی خوداییە، نەك تۆماوی پیاو!!).

ئیبنو عەون (کە کەسی سێیەمە لە پیاوانی رشتەی ئەم فەرموودەیە، لەپاش ئیمامی موسلیم) دەفەرموێ: ئەم فەرموودەیەم باس کرد بۆ حەسەنی بەصری فەرمووی: بەخودا پێ دەچێ ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ سەرزەنیشت بێ لەکردنی ئەم کارە!

**روونکردنەوە:**

حەسەنی بەصری زانایەکی زۆر ناودارو ناسراوە، تابیعییە، زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەری دیوە، وەك عەلیو طەلحەو عائیشە، ناسراوە بە (حەسەنی بەصری) چونکە لە بەصرە نیشتەجێ بوو، لەپێش مەرگی ئیمامی عومەردا، بەدوو ساڵ لەدایك بووە، پیاوێکی رەوانبێژی قسە نەستەقی قسەزان بوو، کە باسی رۆژی دوایی دەکرد، لەتۆ وایە شتەکان بەچاو دەبینێو باسیان دەکا، زانایەکی شەرعزانی گەورە بوو، رەبیعی کوڕی ئەنەس دەفەرموێ: دە ساڵ، رەنگبێ پتریش، بە گەرمی هاموشۆی کۆڕی زانستی حەسەنی بەصریم دەکرد، رۆژ نەبوو کەشتێکی نوێی لێ نەبیستم!! ئەبو جەعفەر، واتە: ئەلباقیر، دەفەرموێ: (فەرمایشتی حەسەن رێك لە فەرمایشتی پێغەمبەران دەکا).

موحەممەدی کوڕی ئەسعەد دەفەرموێ: (حەسەن کەسایەتییەکی مەوسووعەیی بوو، زانا بوو، شەرعزان بوو، متمانە بوو، خواپەرستێکی سۆفیلکە بوو، زۆر زانا بوو، قسە رەوانو جوان خاسو قۆز بوو. عەبدوڵڵای کوڕی دەفەرموێ: باوکم کە مەرگ بوو بە میوانی تەمەنی لە دەوری هەشتاو هەشت ساڵیدا بوو، دوو حەجی کردووە.

٨٣٤- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: إِنَّ عِنْدِى جَارِيَةً لِى، وَأَنَا أَعْزِلُ عَنْهَا. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ ذَلِكَ لَنْ يَمْنَعَ شَيْئًا أَرَادَهُ اللَّهُ ». قَالَ فَجَاءَ الرَّجُلُ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الْجَارِيَةَ الَّتِى كُنْتُ ذَكَرْتُهَا لَكَ حَمَلَتْ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَنَا عَبْدُ اللَّهِ وَرَسُولُهُ ». {الحديث: ٣٥٤٢ = ٣٥٣٨ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرمویّ: پیاویّ پرسیاری كرد لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیكرد: من كەنیزێكم هەیە، كە دەڕۆمە لای خۆم دەكێشمەوە تا تۆماوەكە نەگاتە جێی خۆیو نەبێ بە مناڵ. فەرمووی پێی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو شتەی خواستی خوای لەسەر بێ، بەشتی وا ڕەت نابێتەوە). فەرمووی: جا لەپاش ماوەیێ، پیاوەكە هاتەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! كەنیزەكەكەم سكی پڕە. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (من پێغەمبەرو بەندەی خودام، لەخۆمەوە شت نالّێم، لەبەرئەوە قسەی من هەمیشە ڕاستە). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٣، ژمارە: ٢١٣٩}.

## ٦٥٠) چوونە لای ژنی مناڵبەبەر (٣٥٤٩ - ٣٥٥٢)

## باب: فِي الغِيلَةِ

٨٣٥- عَنْ جُدَامَةَ بِنْتِ وَهْبٍ أُخْتِ عُكَّاشَةَ (رضى الله عنهما) قَالَتْ: حَضَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى أُنَاسٍ وَهُوَ يَقُولُ: « لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَنْهَى عَنِ الْغِيلَةِ فَنَظَرْتُ فِى الرُّومِ وَفَارِسَ، فَإِذَا هُمْ يُغِيلُونَ أَوْلاَدَهُمْ، فَلاَ يَضُرُّ أَوْلاَدَهُمْ ذَلِكَ شَيْئًا ». ثُمَّ سَأَلُوهُ عَنِ الْعَزْلِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « ذَلِكَ الْوَأْدُ الْخَفِىُّ ». {الحديث: ٣٥٤٩ = ٣٥٤٦ فم}:

جودامەی كچی وەهبی (ئەلئەسرییە، خوشكی عوككاشەی كوڕی میحصەنی مەشهوور) (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بە دیارەوە بووم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو كۆمەڵێكا بوو، دەیفەرموو: (نیازم هەبوو كە ڕێگەی شفتەژێ نەدەم. واتە: ڕێگە نەدەم كە بچنە لای ژنی مناڵ بەبەر. بەڵام كە تەماشا دەكەم ڕۆمەكانو فارسەكان شتی وەها دەكەنو لەگەڵ ئەوەیشا زیان بەساوا شیرە خۆرەكانیان ناگا، لەبەرئەوە منیش ئەمەم قەدەغە نەكرد). لەپاشا لەبارەی عەزلەوە پرسیاریان لێ كرد (واتە: پێشگیری كردن لە دروستبوونی كۆرپەلە، لەكاتی جووتبووندا) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەوە زیندە بەچاڵكردنی پەنامەكییە).

**ڕوونكردنەوە:**

١.بڕوانە: ژینامەی وەكاشە، لەبەرگی پێنجەمی تەجریدی بوخاری، ژمارە: ١٨٧٦.

٢. جودامەی خوشكی وەكاشە، هاوەڵی پێغەمبەرە، لە مەككە ئیسلام بوو، پەیمانی بەست لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنی ئونەیسی كوڕی قەتادە بوو، لەگەڵ خزمانی خۆیدا، لەمەكە وە كۆچی كرد بۆ مەدینە، عائیشە فەرموودەی لێوە گێڕاوەتەوە.

## ٦٥١) سەرجێیی لەگەڵ ژنە تاڵانی دووگیان (٣٥٤٧ - ٣٥٤٨)

## بَابٌ: وَطْءُ الْحُبَالَى مِنَ السَّبْيِ

٨٣٦- عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم): أَنَّهُ أَتَى بِامْرَأَةٍ مُجِحٍّ عَلَى بَابِ فُسْطَاطٍ، فَقَالَ: « لَعَلَّهُ يُرِيدُ أَنْ يُلِمَّ بِهَا ». فَقَالُوا: نَعَمْ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ أَلْعَنَهُ لَعْنًا يَدْخُلُ مَعَهُ قَبْرَهُ، كَيْفَ يُوَرِّثُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ؟! كَيْفَ يَسْتَخْدِمُهُ وَهُوَ لاَ يَحِلُّ لَهُ؟! ». {الحديث: ٣٥٤٧ = ٣٥٤٣ فم}:

ئەبو دەرداء (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: لەغەزایەكا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەردەرگای ڕەشماڵێكەوە تێپەڕی، ژنێكی تازە دیلكراوی سك پڕی دی، كەپێو مانگی خۆی بوو، فەرمووی: (ڕەنگە خاوەنە نوێكەی چووبێتە لای لەسەر ئەم حاڵە؟) گوتیان: بەڵێ، فەرمووی: (خەریكبووم لەعنەتو نەفرینێكی وای لێ بكەم، كە پێیەوە بلكێو لەگەڵیا بچێتە ناو گۆڕەكەیەوە، ئەوە چۆن دەبێ، ئەگەر دەیكا بەمناڵی میراتبەری خۆی دروست نییە، چونكە وادیارە كە ئەم سكە لەو نییەو لەپیاوی پێشووە، خۆ ئەگەر دەشیكا بە بەندەو نۆكەری خۆی دیسان هەر دروست نییە، چونكە هەڵدەگرێو ڕێی تێ دەچێ كە ئەم ژنە تا شەش مانگی تریش ئەم سكە دانەنێ، لەم حاڵەدا ڕێی تێ دەچێ كە لەخۆی بێ، كەواتە دەبوو، بۆئەوەی كە تۆشی یەكێ لەم دوو بێ شەرعییە نەبێ، چاوەڕوانیی بكردایە تا كاتی پاكەوە بوونی مناڵدان، ئەویش لەكاتی وادا بەدانانی سكەكەیەتی).

٨٣٧- عَنْ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ (رضى الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَوْمَ حُنَيْنٍ بَعَثَ جَيْشًا إِلَى أَوْطَاسٍ فَلَقُوا عَدُوًّا فَقَاتَلُوهُمْ، فَظَهَرُوا عَلَيْهِمْ، وَأَصَابُوا لَهُمْ سَبَايَا، فَكَأَنَّ نَاسًا مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَحَرَّجُوا مِنْ غِشْيَانِهِنَّ، مِنْ أَجْلِ أَزْوَاجِهِنَّ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ فِى ذَلِكَ: ( وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ) أَىْ فَهُنَّ لَكُمْ حَلاَلٌ إِذَا انْقَضَتْ عِدَّتُهُنَّ. {الحديث: ٣٥٩٣ = ٣٥٨٩فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە ڕۆژی جەنگی حونەیندا، لەشکرێکی نارد بۆ دۆڵی ئەوتاس، لەگەڵ دوژمنا لە هۆزی بەنی هەزازین بەرەنگاری یەکتر بوون، بوو بەشەڕو کوشتار، لە ئەنجاما، لەشکری موسوڵمانان سەرکەوتن بەسەریانا، ژنانی ئەوانیان بەتاڵانی گرت، وەك بڵێی کەسانێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پارێزیان دەکرد لەچوونە لای ئەو ژنە تاڵانییانەو شتی وایان بەگوناه دادەنا، گوایە ژنی مێرددارن‌و چوونە لای ژنی مێرددار‌یش نادروستە، مەگەر بۆ مێردەکانیان، جا ئەم ئایەتە، سەبارەت بە بڕیاری ئەم بابەتە هاتە خوارەوە: {وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ النِّسَاءِ إِلاَّ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ - نساء/٤/٢٤}. واتە: ژنی مێرددار حەرامە بۆ غەیری میردەکەی، بەڵام ئەگەر ژنی مێرددار، مێردەکەیان بێ بڕوا بوو، وە لەجەنگا بەتاڵانی گیران، ئیتر مارە بڕینەکەیان هەڵ دەوەشێتەوە، لەپاش پاکەوە بوونی منداڵدانیان کە پێی دەگوترێ إستبراو الرَّحِم، دروستە ئاغا نوێکەی بچێتە لای. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٥، ژمارە: ٢١٤٧}.

## ٦٥٢) نۆرە شەوانە (قەسم) لەنێوانی هاوسەراندا (٣٦١٣)
## بابٌ: فِي الْقَسْمِ بَيْنَ النِّسَاءِ

٨٣٨- عَنْ أَنَسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: كَانَ لِلنَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) تِسْعُ نِسْوَةٍ، فَكَانَ إِذَا قَسَمَ بَيْنَهُنَّ لاَ يَنْتَهِى إِلَى الْمَرْأَةِ الأُولَى إِلاَّ فِى تِسْعٍ، فَكُنَّ يَجْتَمِعْنَ كُلَّ لَيْلَةٍ فِى بَيْتِ الَّتِى يَأْتِيهَا، فَكَانَ فِى بَيْتِ عَائِشَةَ، فَجَاءَتْ زَيْنَبُ، فَمَدَّ يَدَهُ إِلَيْهَا، فَقَالَتْ:

هَذِهِ زَيْنَبُ، فَكَفَّ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) يَدَهُ، فَتَقَاوَلَتَا حَتَّى اسْتَخَبَتَا وَأُقِيمَتِ الصَّلاَةُ، فَمَرَّ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه) عَلَى ذَلِكَ، فَسَمِعَ أَصْوَاتَهُمَا، فَقَالَ: اخْرُجْ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِلَى الصَّلاَةِ وَاحْثُ فِي أَفْوَاهِهِنَّ التُّرَابَ، فَخَرَجَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ عَائِشَةُ: الآنَ يَقْضِي النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) صَلاَتَهُ، فَيَجِيءُ أَبُو بَكْرٍ، فَيَفْعَلُ بِي وَيَفْعَلُ، فَلَمَّا قَضَى النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) صَلاَتَهُ، أَتَاهَا أَبُو بَكْرٍ، فَقَالَ لَهَا قَوْلاً شَدِيدًا، وَقَالَ: أَتَصْنَعِينَ هَذَا؟! {الحديث: ٣٦١٣ = ٣٦٠٩فم}:

ئەنەس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نۆ ژنی هەبوو، هەر ژنەی لەنۆ شەو یەك شەوی بەسەرە، بەڕیز بەردەكەوت، هەر شەوێ سەرەی ژنێ بوایە، تا نۆشەوی تر نۆرەی نەدەهاتەوە، هاوسەرەكانی پێغەمبەر، هەموو شەوێ، لەماڵی خاوەن نۆرەكە، كە پێغەمبەر شەو لەلای دەمایەوە، لەوێ هەموویان كۆدەبوونەوە، شەوێ پێغەمبەر لەماڵی عائیشە بوو، زەینەبیش هات، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستێكی بۆیبرد، عائیشە پێی گوت: ئەوە من نیم كە نۆرەی شەوی خۆمە، ئەوە زەینەبە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی گێڕایەوە، جا عائیشەو زەینەب بوو بەدەمە دەمێو قرە قرِیان، تا قامەتی نوێژی خەوتنان كرا، ئەبوبەكر هات بەسەریاناو گوێی لەم دەنگە دەنگەیان بوو، عەرزی پێغەمبەری كرد: قوربان! تۆ تەشریف بەرە بۆ نوێژەكەو قوڕبدە بەدەمی ئەمانەدا، پێغەمبەر دەرچوو بۆ نوێژ، عائیشەش گوتی: جا سەیری ئەم بەزمەكەن! ئێستا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژییەكەی بۆ تەواوكردن، ئەبوبەكری باوكم دێت بۆ گیانی من ئەوەی نەشێ پێم دەكا!!

جا كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەرنوێژییەكەی تەواوكرد، ئەبوبەكر هاتەوە بۆلای عائیشەی كچیو سەرزەنیشتێكی زۆری كردو پێی گوت: چۆن دەبێ تۆ شتی وا ناشایستە بكەی، تۆ ژنی پێغەمبەری خوداو كچی منی، دەبوو شتی وا لەتۆ نەوەشێتەوە؟!

**ڕوونکردنەوە:**

١. هەندێ لە ڕاڤەکەران دەفەرموون نوێژەکە نوێژی بەیانی بووە، شەڕە دەمێکە لەپێش نوێژی بەیانیدا بووە.

٢. بەندە لێرەدا ئەم تێبینیەم هەیە:

(گەلێ جار شتی وا دەبینین، کە بەدیمەن شتی وا بۆ پێغەمبەران‌و هاوسەرانیان جوان نییە، بەڵام دەبێ ئێمە هەمیشە لەم جۆرە ڕووداوە ناسك‌و شەرماوییانەدا، ئاڵای تەسلیم بوون هەڵبکەین‌و دروشممان: (أأنتم أعْلَمُ أمِ اللّهُ) و (اللّهُ أعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُ)وبێ، تەنانەت نابێ ئەم جۆرە فەرمووده ڕاست‌و ساخانەیش ئایەخ بکەین، بەبیانووی ئەوەی کەدەبن بە جێگەی ڕەخنەی گەورە لەپەیامی پێغەمبەر، کەواتە: ئایەخکردنی فەرموودەکە باشترە لەوە کە ئێمە دەرگای تانەو تەشەر بخەینە سەرپشت بۆ ناحەزی دەغەز لەدڵ!!

جا باشترین چارەسەر بۆ ئەم جۆرە دڵەڕاوکێیە ئەوەیە کە ئێمە داستانەکەی حەزرەتی خدری زیندەو حەزرەتی مووسا بکەین بە نموونەو سەرمەشق‌و بڵێین: زۆر شت لەشەریعەتا ڕووی دەرەوەی مەبەست نییەو پەندو ئامۆژیك‌و دانایی مەزنی واتیادا، کە ئێمە هەستی پێ ناکەین، هەروەك چۆن مووساو خدر لەسەفەرەکەیانا، کە لە سوورەتی کەهفدا باسکراوە، هەمیشە ڕایان پێچەوانەی یەکتر بوو، ئەوەتا ئەو شتانەی کە خدر دەیانکات، ئاشکرا ناهەقی‌و دژی هۆش‌و ئەقڵی ساخەو تەنانەت ئەوەندە زەق‌و ڕەقن، مووسایش کە پێغەمبەری خودایەو هەق وایە ئەم جۆرە شتانە لەو شاراوە نەبێ، تەنانەت ئەویش ڕەخنەی توند لە کارەکانی خدر تەسلیم دەبین‌و هەق دەدەین بەخدرو هەڵەی خۆمان بۆ دەردەکەوێ!

وەکی تریش ئەم هاوسەرانەی پێغەمبەریش هەر ئادەمیزاد بوون‌و سروشتی ئادەمیزادیی زاڵ بووە بەسەریاناو کەم تازۆر هەڵەی پێیان کردووە، لەبەرئەوە هەوێبارییان لەیەکتری کێشاوەو کەم تازۆر لەناو خۆیانا کێشەو بەرەیان دروست کردووە، بەڵام لەسایەی خوداوەو لەپیت‌و فەڕی هاوڕێتی پێغەمبەرەوە، زۆرینەی

کات، ئەو بارو دۆخ و کێشە خێزانییەش بەخێر گەڕاون بۆ ئیسلام و چەندین بڕیاری شەرعییان لێ وەرگیراوە).

## ٦٥٣) مافی شەومانەوە لەلای بووك، کچ بێ یا بێوەژن (٣٦٠٦ - ٣٦١٢)
## باب: الم قامُ عِنْدَ البِكْرِ وَالثَّيِّب

٨٣٩- عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لَمَّا تَزَوَّجَ أُمَّ سَلَمَةَ، أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا، وَقَالَ: « إِنَّهُ لَيْسَ بِكِ عَلَى أَهْلِكِ هَوَانٌ، إِنْ شِئْتِ سَبَّعْتُ لَكِ، وَإِنْ سَبَّعْتُ لَكِ سَبَّعْتُ لِنِسَائِى ». {الحديث: ٣٦٠٦ = ٣٦٠٢ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٧ = ٥٢١٣، ٥٢١٤. أبو اود. نكاح: ٢١٢٤. ترمذى. نكاح: ١١٣٩}:

ئوم سەلەمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرموی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) منی گواستەوە، سێ شەو لەلام مایەوە، ئەنجا فەرمووی: (وامەزانە کە لەبەرئەوە سێ شەو، دەمێنمەوە لەلات کەبێ قەدری لەلام، نەء، لەبەرئەوە نییە، تۆ ڕێزداری لەلام، بەڵام سوننەت وایە کە مێرد لەلای بووکی بێوەژنی سێ شەو بمێنێتەوە، خۆ ئەگەر حەزیش دەکەی بۆتی دەکەم بە حەوت شەو، بەڵام ئەوەندە هەیە ئەگەر بۆ تۆ بیکەم بە حەوت شەو، دەبێ بۆ ژنەکانی تریشم بیکەم بە حەوت شەو).

٨٤٠- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رضى الله عنه) قَالَ: إِذَا تَزَوَّجَ الْبِكْرَ عَلَى الثَّيِّبِ أَقَامَ عِنْدَهَا سَبْعًا، وَإِذَا تَزَوَّجَ الثَّيِّبَ عَلَى الْبِكْرِ أَقَامَ عِنْدَهَا ثَلاَثًا. قَالَ خَالِدٌ: وَلَوْ قُلْتُ إِنَّهُ رَفَعَهُ لَصَدَقْتُ، وَلَكِنَّهُ قَالَ: السُّنَّةُ كَذَلِكَ. {الحديث: ٣٦١١ = ٣٦٠٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٧٧ = ٥٢١٣، ٥٢١٣. أبو داود: نكاح: ٢١٢٤. ترمذى. نكاح: ١١٣٩. ابن ماجة. نكاح: ١٩١٦. تحفة الأشراف/٩٤٤}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر کچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ. خالید فەرمووی: ئەگەر بمەوێ ڕستەی (ئەنەس فەرمووی سوننەت وایە ئەگەر پیاو کچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای

بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر كچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ) بە مەعناو واتا ریوایەت بكەم، لەباتی ئەوەی كە بڵێم ئەنەس فەرمووی: (سوننەت وایە ئەگەر پیاو كچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر كچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ) دەڵێم: ئەنەس فەرمووی: پێغەمبەر فەرمووی: (ئەگەر پیاو كچی هێنا بەسەر بێوەژن، حەوت شەو لەلای بێ، ئەوسا بەسەرە نۆرە شەویان وەك یەك بۆ دابنێ، بەڵام ئەگەر بێوەژنی هێنا بەسەر كچ، سێ شەو لەلای بێ، ئینجا بەنۆرە وەك یەك نۆرە شەویان بۆ دابنێ).

چونكە ئەم دوو رستەیە یەك واتایان هەیە: چ بڵێی سوننەت وایە، چ بڵێی پێغەمبەر فەرمووی،، یەك شتە، كەواتە: گوتنی یەكێكیان، لەجێگەی ئەوی تریان، گێڕانەوە بەواتایە!!. {تاج/٢، زنجیرە: ٥١، ژمارە: ٢١٧٧}.

### ٦٥٤) دروستە ژن نۆرە شەوی خۆی ببەخشێ بەهەوێی خۆی (٣٦١٤ - ٣٦١٩)
### باب: هبة المرأةِ يَوْمَهَا للأخرى

٨٤١- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: مَا رَأَيْتُ امْرَأَةً أَحَبَّ إِلَيَّ أَنْ أَكُونَ فِي مِسْلاَخِهَا مِنْ سَوْدَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ، مِنِ امْرَأَةٍ فِيهَا حِدَّةٌ، قَالَتْ: فَلَمَّا كَبِرَتْ جَعَلَتْ يَوْمَهَا مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِعَائِشَةَ، قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ قَدْ جَعَلْتُ يَوْمِي مِنْكَ لِعَائِشَةَ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقْسِمُ لِعَائِشَةَ يَوْمَيْنِ، يَوْمَهَا وَيَوْمَ سَوْدَةَ. {الحديث: ٣٦١٤ = ٣٦١٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٧ = ٢٥٩٣، ٢٦٣٧، ٢٦٦١، ٢٦٨٨، ٢٨٧٩، ٤٠٢٥، ٤١٤١، ٤٦٩٠، ٤٧٤٩، ٤٧٥٠، ٤٧٥٧، ٥٢١٢، ٦٦٦٢، ٦٦٧٩، ٧٣٦٩، ٧٣٧٠، ٧٥٠٠، ٧٥٤٥}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆزگەم بەهیچ ژنێ نەبردووە كەمن لەجێگەی ئەوبم بە سەودەی كچی زەممە نەبێ، گەرچی كەمێ توندوتیژ بوو،

چونکە بەڕاستی ئافرەتێکی ڕەوشت بەرزو مەردو خودا پەرست بوو، سەودە (ڕەزای خودای لێ بێ) کاتێ پیربوو عەرزی پێغەمبەری کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! نۆرە ڕۆژی خۆم، کە تۆ دەمێنیتەوە لەلام دەیبەخشم بە عائیشە، چونکە من پیر بووم، نەبادا دڵت گەرد بگرێ لەمن، ئاواتی گەورەی من دڵڕاگرتنی تۆیەو ئەوەیە کە لەهەردوو جیهانا هاوسەری تۆبم!

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دوو ڕۆژی سەرە دادەنا بۆ عائیشە: ڕۆژەکەی عائیشە خۆیو ڕۆژەکەی سەودە). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٠، ژمارە: ٢١٧٥ چ/٤}.

## ٦٥٥) دانەنانی نۆرە شەو بۆ هەندێ ژن (٣٦١٤ - ٣٦١٩)
## باب: فِي تَرْكِ الْقَسْمِ لِبَعْضِ النِّسَاءِ

٨٤٢- عَنْ عَطَاءٌ قَالَ: حَضَرْنَا مَعَ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) جَنَازَةَ مَيْمُونَةَ زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِ(سَرِفَ) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: هَذِهِ زَوْجُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَإِذَا رَفَعْتُمْ نَعْشَهَا فَلاَ تُزَعْزِعُوا وَلاَ تُزَلْزِلُوا وَارْفُقُوا، فَإِنَّهُ كَانَ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تِسْعٌ، فَكَانَ يَقْسِمُ لِثَمَانٍ وَلاَ يَقْسِمُ لِوَاحِدَةٍ. قَالَ عَطَاءٌ: الَّتِى لاَ يَقْسِمُ لَهَا صَفِيَّةُ بِنْتُ حُيَىِّ بْنِ أَخْطَبَ. {الحديث: ٣٦١٨ = ٣٦١٤ فم. بخاری. نكاح: ٥٠٦٧. نسائی. نكاح: ٣١٩٦. تحفة الأشراف: ٣٦١٧}:

عەتاء فەرمووی: لەگەڵ ئیبنو عەبباسا، ئامادەی سەر تەرمی مەیموونەی هاوسەری پێغەمبەر بووین، کە پووری ئیبنو عەبباس بوو، خوشکی دایکی بوو، کە لەسەریف مردبوو، ئیبنو عەبباس فەرمووی: ئەمە تەرمی هاوسەری پێغەمبەرە، قەدری بزانن، کاتێ تەرمەکەی هەڵ دەگرن بەهێواشی هەڵی بگرنو لەقە لەقو جووڵە جووڵی پێ مەکەن، بەهێمنی بیبەن بۆسەر گۆڕستان، ئیبنو عەبباس فەرمووشی: پێغەمبەر نۆ ژنی هەبوو، بەڵام نۆرە شەوی بۆ هەشتیان دانابوو، بۆ یەکێکیان نۆرە شەوی بۆ دانەنابوو. عەطا فەرمووی: ئەو ژنەی کە نۆرە شەوی بۆ دانەنابوو صەفییەی کچی حویەیی کوڕی ئەخطەب بوو.

## ٦٥٦) كەسێ ژنێكی بیانی ئارەزووی جوولآن، بابڕواتە لای حەلآڵی خۆی، تابەوە كوڵوكۆی دەروونی خۆی بمرێنێ (٣٣٩٣ - ٣٣٩٥)

٨٤٣- عَنْ جَابِرِ بن عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَأَى امْرَأَةً فَأَتَى امْرَأَتَهُ زَيْنَبَ وَهِيَ تَمْعَسُ مَنِيئَةً لَهَا فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ: « إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، وَتُدْبِرُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ. فَإِذَا أَبْصَرَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ ». {الحديث: ٣٣٩٣ = ٣٣٨٢فتح الملهم = فم. أبو داود. نكاح: ٢١٥١. ترمذي. رضاع: ١١٥٨ تحفة الأشراف/ ٢٩٧٥}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنێكی دی، ئارەزووی جوولآ، جا ڕۆیشت بۆلای زەینەبی هاوسەری، زەینەب لەوكاتەدا خەریكبوو پێستەی خاوی خۆش دەكردو دایدەتاشی، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كە ئیشی شەرعی تەواوكرد، هاتەوە بۆناو هاوڕێیانی، فەرمووی: (ژن لەشێوەی شەیتانا دێو لەشێوەی شەیتانا پشت هەڵدەكاو بەدەنگو ڕەنگی ناسكو نازداریو جوانی، پیاو لەخشتە دەبا، جا ئەگەر یەكێكتان ژنێكی ئاوای دیو ئارەزووی جوولآ، بابڕواتە لای ژنەكەی خۆی، چونكە ئەوە كوڵوكۆی دڵی دادەمركێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٢٢٠٠}.

## ٦٥٧) سازانو گونجان لەگەڵ ژنو ئامۆژگاری خێر دەربارەیان (٣٦٢٩ - ٣٦٣٦)
## باب: في مُدَارَاةِ النِّسَاءِ وَالوصيَّةِ بِهِنَّ

٨٤٤- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَإِذَا شَهِدَ أَمْرًا فَلْيَتَكَلَّمْ بِخَيْرٍ أَوْ لِيَسْكُتْ، وَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْراً، فَإِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلاَهُ، إِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ، اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ خَيْرًا ». {الحديث: ٣٦٣٢ = ٣٦٢٨ فم، تجريد/٥، رقم: ١٧٧٢ = ٥١٨٥، ٦٠١٨، ٦٣٣٦، ٦١٣٨، ٦٤٧٥، ٥١٨٦، ٣٣٣١، ٥١٨٤. تحفة الأشراف: ١٣٤٣٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسێ بەڕاستی باوەڕی بەخوداو بەرۆژی دوایی هەیـە، کـە ئامـادەی سـەرکارێ بوو، با یاقسەی خێربکا، یا بێ دەنگ بێ، کە گوڵ نیـت دڕکیش مەبـە، کـە قسـەی خێر نـازانی، قسـەی شـەڕیش مەکە، ئامۆژگـاری بـێ لێتـان زۆر بـاش بـن بـۆ ژنـان، چونکە ژنـان لـە بنەڕەتـەوە لەپەراسووی بـاوە ئـادەم دروسـت کـراون، چونکە دایـە حەوا، لە پەراسووی چەپی باوە حەوا (واتە: باوە ئادەم) دروست کراوە، لـە لارتـرین شوێنی پەراسوو کە نووکەکەیەتی دروسـت کـراوە، واتـە: بـە سروشـت بـە چـەوتیو بەلاریو خواری دروست کراون، جا ئەگەر بتەوێ راستی بکەیتەوە راست نابێتـەوە، بەڵام دەشکێ، ئەگەر دەستیشی لێ نەدەی ئـەوا بـەلاری دەمێنێتـەوە، هەرچۆنێ بـێ بوونی لە نەبوونی باشترە، کەوابوو با راسپێریو وەسێت بێ لێتان زۆر باش بـن بـۆ ئافرەتان). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٥٨ + ریاچ/١، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٧٣}.

## ٦٥٨) با پیاوی موسوڵمان رق لەژنی موسوڵمان نەگرێ (٣٦٢٩ - ٣٦٣٦)

## باب: لا يَفْرِكْ مُؤمِنٌ مُؤْمِنَةً

٨٤٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَفْرَكْ مُـؤْمِنٌ مُؤْمِنَـةً، إِنْ كَـرِهَ مِنْهَـا خُلُقًـا رَضِـىَ مِنْهَـا آخَـرَ ». أَوْ قَـالَ « غَيْـرَهُ ». {الحديث: ٣٦٣٣ = ٣٦٢٩ فم = فتح الملهم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (نابێ مێردی موسوڵمان بێزار ببێ لـە هاوسـەری موسـوڵمانی خـۆیو بەچـاوی رقو کینە هەمیشە سەیری بکا، بەڵکوو دەبێ هەمیشە لایەنە چاکەکانی ئەوی لەبەرچاو بێ، گریمـان ئەگـەر خـوو رەوشـتێکی ئەویشـی بـەدڵ نـەبێ، رەفتـارێکی تـری ئـەوی بەدڵە، وەك ئەوە: دەمەوەرییەکەی ئـەوی بـەدڵ نییـە، بـەڵام منـاڵ پەروەرییەکـەی ئەوی بەدڵە!). پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) یا بەدەق ئـاوای فـەرموو وەك باسـکرا، یـا شتێکی لەم بابەتەی فەرموو. {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٥٩ ج/٤}.

## ٦٥٩) ئەگەر دایە حەوا گزیو ناپاکی لەباوە ئادەم نەکردایە، هەتا هەتایە هیچ ژنێ گزیو ناپاکیی لە مێردی خۆی نەدەکرد

## بابٌ: لَوْلاَ حَوَّاء لَمْ تَخُنْ أُنثى زَوْجَهَا

٨٤٦- عَنْ أبي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَوْلاَ بَنُو إِسْرَائِيلَ لَمْ يَخْبُثِ الطَّعَامُ، وَلَمْ يَخْنَزِ اللَّحْمُ، وَلَوْلاَ حَوَّاءُ لَمْ تَخُنْ أُنْثَى زَوْجَهَا الدَّهْرَ ». {الحديث: ٣٦٣٦ = ٣٦٣٢ فم = فتح الملهم، تجريد/٤، رقم: ١٣٣٨ = ٣٣٣٠، ٣٣٩٩. تحفة الأشراف: ١٤٧٠٣}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر لەبنەڕەتا بەهۆی جولەکەکانەوە نەبوایە، هەرگیز خواردەمەنی نەدەگەنیو گۆشت بۆگەن نەدەبوو، چونکە لەکاتی خۆیا خودا گەزۆو گۆشتی شەلاقەی بۆ ناردنو فەرمووی: لەم گۆشتو گەزۆیە بخۆن، بەلاّم لێیان پاشەکەوت مەکەن، کەچی ئەوان فەرمانەکەی خودایان شکانو لێیان هەلگرتن بۆ لەوەوپاش، ئیتر گۆشتو گەزۆکە گەنین، وە لەوەوە گەنینو ترشانی خۆراك داکەوتو هەتا ئەمڕۆ هەروایەو لەمەو پاشیش ئەم بارودۆخە بەردەوام دەبێ، وە ئەگەر بەهۆی دایکە حەوایشەوە نەبوایە هەتا هەتایە، هیچ ژنێ گزیو ناپاکی لەمێردی خۆی نەدەکرد، چونکە حەوا لە بەهەشتا ئادەمی فریوداو لەبەری درەختە قەدەغە کراوەکەی دەرخوارد داو، بوو بەهۆی ئەوەی کە لەبەهەشت دەرکران). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٦٠. ج/٤}.

## ٦٦٠) دەستووری گەڕانەوە لەسەفەرو ئاگادار کردنەوەی کەسوکار لەکاتو ساتی گەڕانەوە (٣٦٢٠ - ٣٦٢١)

## باب: مَنْ قَدِمَ مِنْ سَفَرٍ فَلاَ يَعْجَلْ بِالدُّخُولِ عَلَى أَهْلِهِ كَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ

٨٤٧- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى غَزَاةٍ، فَلَمَّا أَقْبَلْنَا، تَعَجَّلْتُ عَلَى بَعِيرٍ لِى قَطُوفٍ فَلَحِقَنِى رَاكِبٌ خَلْفِى فَنَخَسَ بَعِيرِى بِعَنَزَةٍ كَانَتْ مَعَهُ، فَانْطَلَقَ بَعِيرِى كَأَجْوَدِ مَا أَنْتَ رَاءٍ مِنَ الإِبِلِ، فَالْتَفَتُّ فَإِذَا أَنَا بِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « مَا يُعْجِلُكَ يَا جَابِرُ »؟ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ

إِنِّي حَدِيثُ عَهْدٍ بِعُرْسٍ، فَقَالَ: « أَبِكْرًا تَزَوَّجْتَهَا أَمْ ثَيِّبًا »؟ قَالَ: قُلْتُ: بَلْ ثَيِّب، قَالَ: « فَهَلاَّ جَارِيَةً تُلاَعِبُهَا وَتُلاَعِبُكَ ؟». قَالَ: فَلَمَّا قَدِمْنَا الْمَدِينَةَ، ذَهَبْنَا لِنَدْخُلَ فَقَالَ: « أَمْهِلُوا حَتَّى نَدْخُلَ لَيْلاً، كَيْ تَمْتَشِطَ الشَّعِثَةُ وَتَسْتَحِدَّ الْمُغِيبَةُ »، قَالَ: وَقَالَ: « إِذَا قَدِمْتَ فَالْكَيْسَ الْكَيْسَ ». {الحديث: ٣٦٢٥ = ٣٦٢١ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٨٥ = ٥٢٤٦، ٤٤٣، ١٨٠١، ٢٠٩٧، ٢٣٠٩، ٢٣٨٥، ٢٣٩٤، ٢٤٠٦، ٢٤٧٠، ٢٦٠٣، ٢٦٠٤، ٢٧١٨، ٢٨٦١، ٢٩٦٧، ٣٠٨٧، ٣٠٨٩، ٣٠٩٠، ٤٠٥٢، ٥٠٧٩، ٥٠٨٠، ٥٢٤٣، ٥٢٤٤، ٥٢٤٥، ٥٢٤٦، ٥٢٤٧، ٥٢٦٧، ٦٣٨٧. أبو داود. جهاد: ٢٧٧٨} :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جارێ لەخزمەت پێغەمبەردا چووین بۆ غەزایێ، کاتێ گەڕاینەوە، من وشترێکی سستم لەژێردا بوو، پەلەم لێ دەکرد، لەپشتمەوە وشتر سوارێکم پێ گەیشت، بەنەقیزەکەی ژەندی لە وشترەکەی ژێرمن، ئیتر وشترەکەم خێرایەکی وای لێ دەرچوو چۆنت دەوێ ئاوا، کە ئاوڕم دایەوە سوارەکە پێغەمبەر بوو، فەرمووی: (ئەوە بۆ وا پەلە پەل دەکەی ئەی جابیر!). گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! تازە زاوامو تازە ژنم هێناوە، فەرمووی: (ئایا کچت هێناوە یا بێوەژن؟) گوتم: بێوەژنێکم هێناوە،، فەرمووی: (ئەی بۆچی کچێکت نەهێناوە، پێکەوە گەمەو دەستبازی بکەن؟).

جابیر فەرمووی: کاتێ گەیشتینە ناو مەدینە ویستمان بچینەوە بۆ ماڵەوەمان، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کاتێ لەسەفەر دەگەڕێنەوە ئەگەر بەشەو دەگەیشتنەجێ، وابکەن کە لەپێشدا ئاگاداریان بکەنەوە، هەتا ژن قژە ئاڵۆسکاوەکەی خۆی شانە بکاو دەرمانی گەرماو بەکاربهێنێ بۆ لابردنی مووی زیادەی لەشی، کە لەبەر دووری لەمێرد پشتگوێی خستووە).

جابیر فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووشی: (ئەی جابیر! کە گەیشتیتە ماڵەوە ژیرو وریابەو مەبەستت پێکەوە نانی ماڵو مناڵو خێزانی ڕەحمەت بێ، نەوەك خۆشی کاتیو بەس!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤٧، ژمارە: ٢١٦٢، ٢١٦٣، ٢١٦٤، ٢١٦٥ + ژمارە: ٧٩٩ لەم کتێبە پیرۆزەیە کە لەپێشەوە رابورد}.

**پوختەی فەرموودەکانی فەرموودەکانی نامەی ژنهێنان و شووکردن:**

١. هاندان لەسەر ژنهێنان و شووکردن، کە شتی وا لە سوننەتی پێغەمبەران و هاوسەکانیانن.

٢. هاوسەری باش باشترین بەهرەی جیهانە.

٣. هاوسەری بەدین پەسەندە.

٤. هێنانی کچ، یا شووکردن بە کوڕ پەسەندە.

٥. خوازبێنی لەسەر خوازبێنی نادروستە.

٦. تەماشاکردنی هاوسەر، بۆ ژن و پیاو، لەپێش گرێدانی هاوسەریی سوننەتە.

٧. هاوسەریی دەبێ بەڕەزامەندیی هەموو لایەك بێ.

٨. بەشوودانی منالٚ (ژمارە: ٨٠٥).

٩. کارەکەری خۆ مارەکردن.

١٠. بڕیاری ژن بەژن و ژن بەژن چییە؟

١١. سیغە (هاوسەرێتی کاتی) دروست نییە.

١٢. هاوسەرگیریی کەسێ لە ئیحرامدابێ، یا ژنهێنان و ژن بەشوودانی (ژمارە: ٨١٤)

١٣. ئەو ژنانەی کە دروست نییە بەیەکەوە ژنی یەك پیاوبن.

١٤. مارەیی، چەندەو چی دەبێ و چییە؟

١٥. هەندێ یاساو ڕیچسای ژن و مێردی کەپەیوەندیان بە پێغەمبەرو ژنەکانیەوە هەیە.

١٦. لەهەموو کات و ساتێکا دروستکردنی هاوسەریی دروستە، جیاوازی لەنێوانی ڕۆژو هەفتەو مانگەکانا نییە.

١٧. قەبووڵی خوڵك و دەعوەت بۆسەر شایی و بۆنەی خۆش بەمەرجی خۆی، کەبێ شەرعی لێ نەبێ.

١٨. گوتەی کاتی دروستبوون و جووتبوون، بۆ هەردوولا.

١٩. سەرپێچی لەداوای مێرد، بۆکاری سەرجێیی.

٢٠. پۆشینی رازو نهێنی نێوانی ژن‌و مێرد واجبه.

٢١. هەوڵی پێشگیریی له دروستبوونی منالّ.

٢٢. شفته ژێو چوونەلای ژنی منالّ بەبەر.

٢٣. ژن تا حەیەی هەڵ نەیێ لەکەسێ تر نادروسته.

٢٤. سەرەو نۆرەی شەوانه لەنێوان چەند هەوێیەکا.

٢٥. سازان لەگەڵ هاوسەرو گوزەران کردن لەگەڵی بەباشه.

٢٦. هەنــدێ رووداوی ســەرنج راکێشــی نێـوانی هاوســەرەکانی پێغەمبــەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەوان بێ) .



# ١٢- نامەی تەڵاق (كتَابُ النكاحِ)

{بڕوانــە: تــاج الٲصــول بــەرگی/٢، زنجــیرە: ٦٢ لــە ژمــارە: ٢٢١٧ هــەتا ٢٢٨٦ + تەجریدی بوخاری = مختصر صحيح البخاری/٥ زنجیرە: ٧١ لە ژمارە: ١٧٨٦ هەتا ١٧٩٩ + فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم زنجیرە: ٢٧٤ هەتا زنجیرە: ٢٨٥}.

## ٦٦١) پیاو لە بێنوێژیدا ژنی خۆی تەڵاق بدا

٨٤٨- عَنْ نَافِعٍ: أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ وَهْىَ حَائِضٌ، فَسَأَلَ عُمَرُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، فَتِلْكَ الْعِدَّةُ الَّتِى أَمَرَ اللَّهُ أَنْ يُطَلَّقَ لَهَا النِّسَاءُ. فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ إِذَا سُئِلَ عَنِ الرَّجُلِ يُطَلِّقُ امْرَأَتَهُ وَهْىَ حَائِضٌ يَقُولُ: أَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا وَاحِدَةً أَوِ اثْنَتَيْنِ، إِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمَرَهُ أَنْ يَرْجِعَهَا ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَحِيضَ حَيْضَةً أُخْرَى، ثُمَّ يُمْهِلَهَا حَتَّى تَطْهُرَ، ثُمَّ يُطَلِّقَهَا قَبْلَ أَنْ يَمَسَّهَا، وَأَمَّا أَنْتَ طَلَّقْتَهَا ثَلاَثًا فَقَدْ عَصَيْتَ رَبَّكَ فِيمَا أَمَرَكَ بِهِ مِنْ طَلاَقِ امْرَأَتِكَ. وَبَانَتْ مِنْكَ. {الحديث: ٣٦٤١ = ٣٦٣٧ فم. تجريد/٥، زنجيرة: ٧١، رقم: ١٧٨٦ = ٥٢٥١، ٤٩٠٨، ٥٢٥٢، ٥٢٥٣، ٥٢٥٨، ٥٢٦٤، ٥٣٣٢، ٥٣٣٣، ٧١٦٠. نسائی. طلاق: ٣٥٥٩}:

نــافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فــەرمووی: عەبــدوڵڵای كــوڕی عومــەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ژنێكم لە بێنوێژیدا بوو یەك تەڵاقمدا، سەردەمی پێغەمبەر بوو، جا عومەری باوكم (ڕەزای خودای لێ بێ) بۆ ئـەم مەسـەلەیە لـە خۆشەویسـت (دروودی خودای لەسەر بێ) دەپرسێ، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (پێی بڵێ باژنەكەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر ركێفی خۆی، ئەوسا بیهێڵێتەوە لەلای خۆی تا لە بێنوێژییەكەی پاك دەبێتەوەو جارێكی تر دەكەوێتەوە سەر بێنوێژیو دیسان پاك دەبێتەوە، ئیتر ئەگەر ئارەزوو دەكا بابەجوانی ڕای بگرێ لای خۆیو ژنی خۆیەتی، ئەگەر ئارەزووش دەكا، بەرلەوەی لەوماوەیەدا بچێتە لای لەپاكی دووەما تەڵاقی بدا، ئەمە

کەژن لە پاکییەکا تەڵاق بدرێ کە مێردەکەی لەو پاکییەدا نەچووبێتە لای، ئەو حەیەو عیددەیەیە کە خودا لە قورئانا فەرمانی کردووە ە ژنی تیادا تەڵاق بدرێ، کە دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاء فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا الْعِدَّةَ وَاتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ - سورة الطلاق/ ٦٥/١}. واتە: ئەی پێغەمبەری خۆشەویست! بە موسوڵمانان بفەرموو: هەرکاتێ ویستتان ژن تەڵاق بدەن، با لەکاتێکدا تەڵاقیان بدەن، کە ماوەی عیددەیە، کەکاتی پاکی ژنانە لە بێنوێژیو زەیستانی، وە ژمارەی ڕۆژو کاتی عیددەکەیان ڕابگرن، وە بەردەوام لە خودای خۆتان بترسنو پارێز لەسەرپێچی لە فەرمانەکانی بکەن).

دەستووری ئیبنو عومەر وابوو، کاتێ پرسیاری لێ دەکرا، لەبارەی پیاوێکەوە کە ژنەکەی خۆی لە بێنوێژیدا تەڵاق داوە، دەیفەرموو: (ئەگەر تۆ ژنەکەتت یەك جار، یا دووجار تەڵاق داوە، ئەوە من خۆم شتی وام بەسەر هاتووەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێکردووم، کە ژنە لەبێنوێژیدا تەڵاق دراوەکەم بگێڕمەوە بۆ ژێر ڕکێفی خۆمو ئەوسا مۆڵەتی بدەم تا لەو بێنوێژییەی پاك دەبێتەوەو دیسان دەکەوێتەوە بێنوێژییەکی ترەوەو دیسان لەویش پاك دەبێتەوە، پاش ئەم ماوەیە پێش ئەوەی کە لەم ماوەیەدا بچمەلای، ئەگەر بمەوێ تەڵاقی بدەم، جائەگەر تۆیش یەك تەڵاق، یا دوو تەڵاقی ژنەکەتت لە بێنوێژیدا داوە، ئەوە ئەم فەرمانەی پێغەمبەر بەجێ بهێنەو وەك من بکە، خۆ ئەگەر سێ بەسێ لە بێنوێژیدا تەڵاقت داوە، ئەوە بەڕاستی بێ فەرمانی پەروەردگاری خۆتت کردووە، سەبارەت بە چۆنێتی تەڵاقدانی ژنەکەتو لەهەمان کاتا ژنەکەشت سێبەسێ تەڵاقی کەوتووە بەیەکجاری لێت جیابووەتەوە.

٨٤٩- عَنِ ابْنِ سِيرِينَ قَالَ: مَكَثْتُ عِشْرِينَ سَنَةً يُحَدِّثُنِي مَنْ لاَ أَتَّهِمُ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رضى الله عنهما) طَلَّقَ امْرَأَتَهُ ثَلاَثًا وَهِيَ حَائِضٌ فَأُمِرَ أَنْ يُرَاجِعَهَا، فَجَعَلْتُ لاَ أَتَّهِمُهُمْ وَلاَ أَعْرِفُ الْحَدِيثَ، حَتَّى لَقِيتُ أَبَا غَلاَّبٍ يُونُسَ بْنَ جُبَيْرٍ الْبَاهِلِيَّ. وَكَانَ ذَا ثَبَتٍ فَحَدَّثَنِي

أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عُمَرَ فَحَدَّثَهُ أَنَّهُ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ تَطْلِيقَةً وَهْيَ حَائِضٌ فَأُمِرَ أَنْ يَرْجِعَهَا، قَالَ: قُلْتُ: أَفَحُسِبَتْ عَلَيْهِ؟ قَالَ: فَمَهْ أَوَإِنْ عَجَزَ وَاسْتَحْمَقَ؟! {الحديث: ٣٦٤٦ = ٣٦٤٢ فم}:

ئیبنو سیرین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بیست ساڵی ڕێك مامەوە، کەسانێ کە جێگەی باوەڕم بوون‌و گومانم لە بارەیانەوە نەبوو، قسەیان بۆم دەکرد: کە ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) لە بێنوێژیدا، ژنەکەی خۆی سێ بەسێ تەڵاق داوەو پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی پێی کردووە کە بیگێڕێتەوە بۆلای خۆی، گەرچی لەم ماوەیەدا گومانم بۆ پەیدا نەبوو لە ڕاست‌و دروستیی قسەکەی ئەوان، بەڵام لەوە سەرسام بووم، کە چۆن چۆنی، لەپاش تەڵاقی سێ بەسێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بە ئیبنو عومەر کردووە کە ژنەکەی بگێڕێتەوە بۆ ژێر هاوسەریی خۆی؟ سەرم لەم قسەیە دەرنەدەچوو، هەتا ڕۆژێ گەیشتم بە ئەبو غەللاب، واتە: بە یونسی کوڕی جوبەیری ئەلباهیلی، کە پیاوێکی ڕاست‌و ڕەوان‌و متمانە پێکراو بوو، ئەو قسەی دۆغری لەم بارەیەوە بۆم کرد، فەرمووی: من لەم لایەنەوە پرسیارم لە ئیبنو عومەر خۆی کرد، فەرمووی پێم: کە یەك تەڵاقی ژنەکەمم لە بێنوێژیدا دابوو، نەوەك سێ تەڵاق، بۆیە پێغەمبەر فەرمانی پێم کرد بە گێڕانەوەی. ئەبو غەللاب فەرمووی: عەرزی ئیبنو عومەرم کرد: ئایا ئەو تەڵاقەی کە لە بێنوێژییەکەدا ئەنجامت دا، دانرا بە تەڵاقێ لەسەرت؟ فەرمووی: ئەی چۆن دانانرێ بە تەڵاقێ؟ هەر لەبەرئەوەی کەمن خۆم ئەو هەڵەیەم کردو نەمتوانی لەسەر شێوەی شەرعی ژنەکەم تەڵاق بدەم‌و ئەو بێ ئەقڵیەم کرد دانەنرێ لەسەرم بە تەڵاقێ، شتی وانییە، بەڵکوو دانرا بە تەڵاقێ لەسەرم.

**ڕوونکردنەوە:**

ئیبنو سیرین ناوی موحەممەدی کوڕی سیرینی ئەنصارییە، تابیعییە، ناسراوە بە خەوپەرژێنکار، پێشەوای ڕۆژگاری خۆی بووە، گێڕانەوەی زۆری هەیە، لەزۆر لە هاوەڵانەوە، پیاوێکی متمانەو ڕاستگۆ بوو، زۆر بە وەرع‌و بەتەقوا بوو، لە تەمەنی حەفتاو حەوت ساڵیدا لە بەصرە مردووە.

### ٦٦٢) تەلاقی سێبەسێ لەسەردەمی پێغەمبەردا (٣٦٣٧ - ٣٦٥٧)

### بابٌ: الطَّلاَقُ مِنَ الثَّلاَثِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ

٨٥٠- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: كَانَ الطَّلاَقُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَبِى بَكْرٍ وَسَنَتَيْنِ مِنْ خِلاَفَةِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) طَلاَقُ الثَّلاَثِ وَاحِدَةً، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: إِنَّ النَّاسَ قَدِ اسْتَعْجَلُوا فِى أَمْرٍ قَدْ كَانَتْ لَهُمْ فِيهِ أَنَاةٌ فَلَوْ أَمْضَيْنَاهُ عَلَيْهِمْ، فَأَمْضَاهُ عَلَيْهِمْ. {الحديث: ٣٦٥٨ = ٣٦٥٤ فم}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: جاران بەسەرینی پێغەمبەر خۆی و، لەسەردەمی جێنشینی ئەبوبەکردا، تەلاقی سێ تەلاقە یەك تەلاق بوو، تا دوو ساڵیش لەسەردەمی جێنشینیی عومەر ڕۆیشت ئەم حاڵە هەروا مابوو، لەپاشا عومەری کوڕی خەتاب فەرمووی: ئەم خەڵکە لەپێشدا لەم کارەدا، بەشێنەیی بوون و پشوو درێژ بوون، بەلاّم ئێستا سەریان تێکردووەو زۆر لێی بەپەلەن، کەوابوو با حوکم بکەین بە کەوتنی سێ تەلاقە، جا لەپاش ڕاوێژکردن لەگەڵ یارانیا بۆ ئەم مەسەلەیە، حوکمی کرد بە کەوتنی تەلاقی سێ تەلاقە). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٣، ژمارە: ٢٢٢٩}.

### ٦٦٣) ژنی تەلاقدراو، شوو بکاتەوەو مێردە تازەکەی بەرلەوە بچێتە لای، ئەویش تەلاقی بدا، دروست نییە کەشوو بکاتەوە بە مێردی یەکەمی (٣٥١٢ - ٣٥١٨)

### باب: فِي الرَّجُلِ يُطَلِّقُ إِمْرَأَتَهُ فَتَتَزَوَّجُ غَيْرَهُ وَلا يَدْخُلُ بِهَا، فَلَيْسَ لَهَا أَنْ تَرْجِعَ إِلَى الْأَوَّلِ

٨٥١- عَنِ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رِفَاعَةَ الْقُرَظِىَّ طَلَّقَ امْرَأَتَهُ فَبَتَّ طَلاَقَهَا، فَتَزَوَّجَتْ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، فَجَاءَتِ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ رِفَاعَةَ، فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلاَثِ تَطْلِيقَاتٍ فَتَزَوَّجْتُ بَعْدَهُ عَبْدَ الرَّحْمَنِ بْنَ الزَّبِيرِ، وَإِنَّهُ وَاللَّهِ مَا مَعَهُ إِلاَّ مِثْلُ الْهُدْبَةِ. وَأَخَذَتْ بِهُدْبَةٍ مِنْ جِلْبَابِهَا، قَالَ: فَتَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ضَاحِكًا، فَقَالَ: « لَعَلَّكِ تُرِيدِينَ أَنْ تَرْجِعِى إِلَى رِفَاعَةَ؟ لاَ حَتَّى يَذُوقَ عُسَيْلَتَكِ، وَتَذُوقِى عُسَيْلَتَهُ »، وَأَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ جَالِسٌ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، وَخَالِدُ بْنُ سَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ جَالِسٌ بِبَابِ الْحُجْرَةِ لَمْ يُؤْذَنْ لَهُ،

قَالَ: فَطَفِقَ خَالِدٌ يُنَادِي: أَبَا بَكْرٍ أَلاَ تَزْجُرُ هَذِهِ عَمَّا تَجْهَرُ بِهِ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ {الحديث: ٣٥١٢ = ٣٥٠٨ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٨٩ = ٥٢٦٠، ٢٦٣٩، ٥٢٦١، ٥٢٦٥، ٥٣١٧، ٥٧٩٢، ٥٨٢٥، ٦٠٨٤. ترمذى. نكاح: ١١١٨. تحفة الأشراف/١٦٤٣٦}:

**عائيشه** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: ژنەکەی ریفاعەی قورەظی هاتە خزمەتی پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنی ریفاعەی قورەظی بووم، سێ جاری جیاجیا تەلاقی دام، لەپاش جاری سێیەم کە دواجارە، شووم کردەوە بە ئەورەحمانی کوڕی زەبیری قورەظی، بەلام بەخودا چووکی ئەوڕحمان وەك پەتك وایە، جیماعی پێ ناکرێ، جا ژنەکە ریشووی کراسەکەی خۆی گرت و گوتی وەك ئەمە وایە! فەرمووی: جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **زەردەخەنەیێ گرتیو پێکەنیو فەرمووی: (رەنگ بێ بتەوێ بگەڕێیتەوە بۆلای ریفاعەی مێردی پێشووت، شتی وانابێ، هەتا ئەورەحمان چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ تۆدا نەچێژێو تۆش چێژ لەخۆشی جووتبوون لەگەڵ ئەورەحمان نەچێژێ، چونکە شووی دووەم ئەگەر وانەبێ، دانانرێ بەشووی دووەم، کە لەپاش تەلاقدانی مێردی دووەمو تەواوبوونی عیددەی ژنەکە، دەبێ بەهۆی دروستبوونی شووکردنەوە بەمێردی یەکەم).**

**لەکاتی ئەم گفتوگۆیەدا، ئەبوبەکری صەدیق لەخزمەت پێغەمبەردا، دانیشتبوو، چاوەڕوانی ئەوەی دەکرد کە رێگەی پێ بدرێ بچێتە ژوورەوە، جا لەوێوە خالید بانگی لە ئەبوبەکر دەکردو دەیگوت: ئەرێ ئەبوبەکر! ئەوە بۆ تەمێی ئەو ژنە ناکەی کە ئاوا بەڕاشکاوی ئەم قسە زەقو شەرماوییانە لەخزمەت پێغەمبەردا ئەکا؟!.** {تاج/٢، زنجيره: ٦٥، ژماره: ٢٢٣٦}.

٦٦٤) **باسی فەرمایشتی خودای گەورە: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ}**
(٣٦٦١ - ٣٦٦٤)

**بابٌ: في الحَرَامِ، وَقَوْلِهِ عَزَّ وَجَلَّ: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ} وَالاخْتِلافُ فِيهِ**

٨٥٢- عَنْ ابْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنه) قَالَ: إِذَا حَرَّمَ الرَّجُلُ عَلَيْهِ امْرَأَتَهُ فَهِيَ يَمِينٌ يُكَفِّرُهَا، وَلَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ). {الحديث: ٣٦٦٢ = ٣٦٥٨ فم. بخاري. تفسير: ٤٩١١، ٥٢٦٦، ٥٢٦٨. تجريد/١٧٠٩} :

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەگەر پیاو ژنی خۆی لەخۆی حەرام بکا، وەك ئەوە پێی بڵێ: (أَنْتِ عَلَيَّ حَرَامٌ: تۆ لەمن حەرامی) ئەوە لەلای ئیبنو عەبباس، نە دائەنرێ بە تەڵاق، نە دائەنرێ بەزیهار، نە دائەنرێ بە ئیلاء، بەڵكوو دائەنرێ بە سوێندی ئاسایی‌و كەفارەتی سوێندمی لەسەرەو بەس، دیارە ئیبنو عەبباس، بەڵگەی لەسەر ئەم ڕاو بۆچوونەی خۆی كرداری پێغەمبەرە، كە لەئایەتی {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ}ەدا دیاریكراوە، بۆیە فەرمووی: {لَقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ – ٣٣/ ئەحزاب/ ئایەتی: ٢١}. واتە: لەڕاستیدا، پێغەمبەری خودا، ڕابەرو سەرمەشقێكی جوانە بۆ ئێوە، شایانی ئەوەیە كە لەهەموو كارێكا، كە مەودای پەیڕەوی واتیادا، ئێوە بیكەن بە سەرمەشق‌و چاوی لێ بكەن‌و، هەنگاو بەهەنگاوو بست بەبست شوێنی بكەون!). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٦٨، ژمارە: ٢٢٤٩}.

٨٥٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يَمْكُثُ عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَيَشْرَبُ عِنْدَهَا عَسَلاً، قَالَتْ: فَتَوَاطَأْتُ أَنَا وَحَفْصَةُ، أَنَّ أَيَّتَنَا مَا دَخَلَ عَلَيْهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فَلْتَقُلْ: إِنِّي أَجِدُ مِنْكَ رِيحَ مَغَافِيرَ، أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، فَدَخَلَ عَلَى إِحْدَاهُمَا فَقَالَتْ ذَلِكَ لَهُ. فَقَالَ: « بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً عِنْدَ زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ، وَلَنْ أَعُودَ لَهُ ». فَنَزَلَ: (لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ) إِلَى قَوْلِهِ تعالى: (إِنْ تَتُوبَا) - لِعَائِشَةَ وَحَفْصَةَ -، (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) لِقَوْلِهِ: « بَلْ شَرِبْتُ عَسَلاً ». {الحديث: ٣٦٦٣ = ٣٦٥٩ فم. تجريد/٤، رقم: ١٧٠٩ = ٤٩١٢، ٥٢١٦، ٥٢٦٧،

٥٢٦٨، ٥٤٣١، ٥٥٩٩، ٥٦١٤، ٥٦٨٢، ٦٦٩١، ٦٩٧٢. أبـــو داود. أشـــربة: ٣٧١٤. نسائى. طلاق: ٣٤٢١}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خـودا لە هاوسەرەکانی بێ) فـەرمووی: گـەلێ جـار کـە پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) لـەماڵی زەینــەبی کچــی جــەحش، کــە هاوســەری بــوو، دەمایــەوە، شــەربەتی هــەنگوینی دەخواردەوە، جا مـن‌و حەفصـەی کچـی عومـەر، کـە ئـەویش وەك ئێمـە هاوسـەری پێغەمبەر بوو، قسـەمان کـرد بەیـەك‌و بڕیارمانـدا کـە فێڵـە ژنانەیـەکی لێ بکـەین‌و گوتمان: هەرکامێکمان لەپێشدا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلای با پێی بڵێـت: مـن بێنـی گیـای مـەغافیرت لێ دەکـەم، دیـارە کـە شـیلەی مـەغافیرت خـواردووە، کـە شیلەی دارێکـە بـە عـەرەبی پێـی دەڵـێن (عورفـوط) کـە تـامێکی شـیرین‌و بـۆنێکی ناخۆشی هەیە، زۆرجار هەنگ شیلەکەی دەمژێ، دواییش کە تەشـریفی هـات بـۆلای ئەویتریشمان ئەویش هەرواى پێ بڵێ.

جا کاتێ ئەم قسەیەمان عەرزی پێغەمبەر کرد، وایزانی کـە بەڕاسـت وادەڵـێین، بۆیــە فــەرمووی: (نەخــەیر، مــەغافیرم نــەخواردووە، بــەلاّم لــەلای زەینــەبی کچــی جەحشــی خێــزانم شــەربەتی هــەنگوینم خــواردووە، ســوێندم خــواردووە ئــیتر نایخۆمــەوە، ئــەم قســەیەی مــن بەکــەس مــەڵێ). جـا بـەم بۆنەیـەوە ئـەم ئایەتانـەی سەرەتای سوورەتی تەحریم دابەزین:

{يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَا أَحَلَّ اللَّهُ لَكَ تَبْتَغِي مَرْضَاتَ أَزْوَاجِكَ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ∴ قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ∴ وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا فَلَمَّا نَبَّأَتْ بِهِ وَأَظْهَرَهُ اللَّهُ عَلَيْهِ عَرَّفَ بَعْضَهُ وَأَعْرَضَ عَن بَعْضٍ فَلَمَّا نَبَّأَهَا بِهِ قَالَتْ مَنْ أَنبَأَكَ هَذَا قَالَ نَبَّأَنِيَ الْعَلِيمُ الْخَبِيرُ ∴ إِن تَتُوبَا إِلَى اللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ فَإِنَّ اللَّهَ هُوَ مَوْلَاهُ وَجِبْرِيلُ وَصَالِحُ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمَلَائِكَةُ بَعْدَ ذَلِكَ ظَهِيرٌ. تحريم/٦٦- ١-٤-).

پوختەی مەبەست لەم ئایەتانە:

(ئەی پێغەمبەر! شتێ کەخودا بۆ تۆ ڕەوای دیوە، لەخۆتەوە لەخۆتی حەرام مەکە، لەبەر خاتری دڵی هەندێ لە هاوسەرەکانت، خودا کەفارەتی سوێندی بۆ داناون، کەفارەتی سوێندەکەت بدەو حەلاڵی خودا لەخۆت حەرام مەکە، ئەو گفتوگۆو نهێنییەی کە لەنێوانی تۆو هەندێ لە هاوسەرەکانتا، لەم بارەیەوە ڕوویداو، هەندێ لەو گیروگرفتانەی کە ئەوان دروستیان کرد، کارێکی ناشایستە بوو، خودا تۆی لێی ئاگادار کردەوە، ئەی عائیشەو حەفسە! تەوبە بکەن لەخزمەت خوادا، چونکە ئێوە لەدڵەوە حەزتان لەشتێ بوو کە پێغەمبەری خودا حەزی لەوشتە نەبوو، کە حەرامکردنی هەنگوین بوو، ئەو نهێنییەی کە پێغەمبەر لەلای هەندێ لە ژنەکانی درکاندی، کە ئایەتی: (وَإِذْ أَسَرَّ النَّبِيُّ إِلَى بَعْضِ أَزْوَاجِهِ حَدِيثًا) ئاماژەی بۆدەکا، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر بوو کە فەرمووی: (نەخەیر، مەغافیرم نەخواردووە، بەلام لەلای زەینەبی خێزانم شەربەتی هەنگوینم خواردووە، سوێندم خواردووە ئیتر نایخۆمەوە، ئەم قسەیەی من بەکەس مەڵێ). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤١٧٨ ج/٤} + {بۆ زیادە ڕوونکردنەوە، فەرموو بڕوانە: تەجریدی بوخاری بە کوردی، بەرگی پێنجەم، ژمارە/١٧٩٠ = ٥٢٦٨ + تەجرید/١٧٠٩ = ٤٩١٢ بەرگی چوارەم، لاپەڕە: ٥٠٨}.

٨٥٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ، فَكَانَ إِذَا صَلَّى الْعَصْرَ دَارَ عَلَى نِسَائِهِ فَيَدْنُو مِنْهُنَّ، فَدَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ فَاحْتَبَسَ عِنْدَهَا أَكْثَرَ مِمَّا كَانَ يَحْتَبِسُ، فَسَأَلْتُ عَنْ ذَلِكَ فَقِيلَ لِى: أَهْدَتْ لَهَا امْرَأَةٌ مِنْ قَوْمِهَا عُكَّةً مِنْ عَسَلٍ، فَسَقَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْهُ شَرْبَةً. فَقُلْتُ: أَمَا وَاللَّهِ لَنَحْتَالَنَّ لَهُ، فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لِسَوْدَةَ، وَقُلْتُ: إِذَا دَخَلَ عَلَيْكِ، فَإِنَّهُ سَيَدْنُو مِنْكِ فَقُولِى لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَكَلْتَ مَغَافِيرَ؟. فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: لاَ، فَقُولِى لَهُ: مَا هَذِهِ الرِّيحُ؟ - وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَشْتَدُّ عَلَيْهِ أَنْ يُوجَدَ مِنْهُ الرِّيحُ - فَإِنَّهُ سَيَقُولُ لَكِ: سَقَتْنِى حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ، فَقُولِى لَهُ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ وَسَأَقُولُ ذَلِكَ لَهُ،

وَقُولِيهِ أَنْتِ يَا صَفِيَّةُ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى سَوْدَةَ قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: وَالَّذِى لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ لَقَدْ كِدْتُ أَنْ أُبَادِئَهُ بِالَّذِى قُلْتِ لِى وَإِنَّهُ لَعَلَى الْبَابِ فَرَقًا مِنْكِ، فَلَمَّا دَنَا رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَكَلْتَ مَغَافِيرَ، قَالَ: « لاَ ». قَالَتْ: فَمَا هَـذِهِ الرِّيحُ؟ قَالَ: « سَقَتْنِى حَفْصَةُ شَرْبَةَ عَسَلٍ »، قَالَتْ: جَرَسَتْ نَحْلُهُ الْعُرْفُطَ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَىَّ، قُلْتُ لَهُ مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَى صَفِيَّةَ، فَقَالَتْ بِمِثْلِ ذَلِكَ، فَلَمَّا دَخَلَ عَلَى حَفْصَةَ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلاَ أَسْقِيكَ مِنْهُ؟ قَالَ: « لاَ حَاجَةَ لِى بِهِ »، قَالَتْ: تَقُولُ سَوْدَةُ: سُبْحَانَ اللَّهِ، وَاللَّهِ لَقَدْ حَرَمْنَاهُ، قَالَتْ: قُلْتُ لَهَا: اسْكُتِى. {الحديث: ٣٦٦٤ = ٣٦٦٠ فم. أبو داود. أشربة: ٣٧١٥. ترمذى. أطعمة: ١٨٣١. تحفة الأشراف: ١٦٧٩٦}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) حەزی لە حەلْواو هەنگوین بوو، گەلێ جار لەپاش کردنی نوێژی عەصر دەچوو بۆلای هاوسەرەکانی، یەکە یەکە هەواڵی دەپرسین‌و سلاوی لێ دەکردن، ئەوجا دەچوو بۆلای یەکێکیان‌و لەلای وچانێکی دەگرت‌و خۆی لێ نزیك دەکردەوە، ماچ‌و مۆچ‌و شتی وای لەگەڵدا دەکرد، بەلام بەبێ جووتبوون‌و دروستبوون لەگەڵی. جا جارێ چووە هۆدەکەی حەفسەی هاوسەری، کە کچی عومەری کوڕی خەتاب بوو، زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا لەلای گلی خواردەوە، منیش دەماری هەوێباری گرتمی، کەپرسیم هۆی ئەم زیادە مانەوەی پێغەمبەر لەلای حەپسە چییە، پێیان گوتم: ژنێکی خزمی دووبەرەیێ هەنگوینی بەدیاری بۆ هێناوە، ئەویش شەربەتی لێ دروست دەکاو دەیدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەو هۆیەوە کەمێ لەلای دەمێنێتەوە، منیش گوتم: بەخودا دەبێ فێڵێکی وای لێ بکەین کەوازبێنێ لەم مانەوەی لای حەپسەیە.

جا بەسەودەی کچی زەمعەم گوت: شتێکی واهەیە، دیارە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلات پێی بڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆنی مەغافیرت لێ دێ، دەڵێی مەغافیرت خواردووە؟ ئەویش پێت دەفەرموێ: (نا، مەغافیرم نەخواردووە!) تۆیش پێی بڵێ: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟

پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) زۆر پێی زەحمەتە کە بۆنی ناخۆشی لێ بێت، لەبەرئەوە پێت دەڵێ: (ئەوە حەپسە شەربەتی هەنگوینی داوەپێم). تۆیش پێی بڵێ: ئای ئەوە هەنگەکەی جەویی درەختی عورفوتی هەڵمژیوە، کەپێی دەگوترێ مەغافیر، کاتێ هاتیش بۆلای من، منیش هەمان شتی پێ دەڵێم، وە تۆیش ئەی صەفییە! کاتێ لەسەرەی خۆتا پێغەمبەر هات بۆلات، هەمان قسەو پرسیارو گفتوگۆی لەگەڵ بکە. سەودە (کە یەکەم ژنی پێغەمبەر بوو، لەپاش مردنی خەدیجەی یەکەم هاوسەری) فەرمووی: بەو خوایەی کەهەر خۆی خوایە، لەترسی تۆ ئەی عائیشە! هەرکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە دەرگاکەوە هاتە ژوورەوە، ویستم یەکسەر قسەکەی تۆ پێت گوتم پێی بڵێم، بەڵام کە هاتە ژوورەوەو هاتە پێشەوەو لێم نزیکبۆوە گوتم پێی: ئەی پێغەمبەری خودا! مەغافیرت خواردووە؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیم کرد: ئەی ئەم بۆنە ناخۆشە چییە کەلێت دێ؟ فەرمووی: (حەفسەی خێزانم شەربەتی هەنگوینی دەرخوارد داوم). گوتم: دیارە کە هەنگەکەی مەغافیری هەڵمژیوەو کردوویەتی بە هەنگوین، کە شیلەی دارێکی دڕکاوییە حوشتر دەیخوات، بە عەرەبی پێی دەگوترێ: عورفوط (رەنگە بەکوردی بەو درەختە بگوترێ: مارگرە).

عائیشە فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەرەی خۆما هات بۆلام، منیش هەروام پێگوت، کاتێ لەسەرەی سەفییەشدا دەچێ بۆلای، سەفییەش هەروای پێ دەڵێ، کاتێ لەسەرەی حەفصەدا دەچێ بۆلای، حەفصە پێی دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خودا! با شەربەتێکی هەنگوینت بۆ بکەم. دەفەرموێ: (کارم پێی نییە). عائیشە فەرمووی: جا سەودە بەمنی گوت: سبحان الله! کارێکی باشمان نەکرد، هەنگوینمان لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) قەدەغە کردو لێمان حەرام کرد، منیش پێیم گوت: وسبە، با فێڵەکەمان ئاشکرا نەبێ!!

## ٦٦٥) پیاو ژنی خۆی بكا بەسەر پشكو خاترخۆی بكا ئەگەر دەیەوێ خۆی تەلاق بدا (٣٦٦٥ - ٣٦٨٠)

## بابٌ: تخيير الرَّجلِ إمرأتَهُ

٨٥٥- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: دَخَلَ أَبُو بَكْرٍ (رضى الله عنه) يَسْتَأْذِنُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَوَجَدَ النَّاسَ جُلُوسًا بِبَابِهِ، لَمْ يُؤْذَنْ لأَحَدٍ مِنْهُمْ. قَالَ: فَأُذِنَ لأَبِى بَكْرٍ (رضى الله عنه)، فَدَخَلَ، ثُمَّ أَقْبَلَ عُمَرُ (رضى الله عنه) فَاسْتَأْذَنَ، فَأُذِنَ لَهُ، فَوَجَدَ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) جَالِسًا حَوْلَهُ نِسَاؤُهُ وَاجِمًا سَاكِتًا. قَالَ: فَقَالَ: لأَقُولَنَّ شَيْئًا أُضْحِكُ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم). فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ لَوْ رَأَيْتَ بِنْتَ خَارِجَةَ سَأَلَتْنِى النَّفَقَةَ، فَقُمْتُ إِلَيْهَا، فَوَجَأْتُ عُنُقَهَا، فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَقَالَ: « هُنَّ حَوْلِى كَمَا تَرَى يَسْأَلْنَنِى النَّفَقَةَ »، فَقَامَ أَبُو بَكْرٍ إِلَى عَائِشَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، فَقَامَ عُمَرُ إِلَى حَفْصَةَ يَجَأُ عُنُقَهَا، كِلاَهُمَا يَقُولُ: تَسْأَلْنَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَا لَيْسَ عِنْدَهُ؟! فَقُلْنَ: وَاللَّهِ لاَ نَسْأَلُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) شَيْئًا أَبَدًا لَيْسَ عِنْدَهُ، ثُمَّ اعْتَزَلَهُنَّ شَهْرًا أَوْ تِسْعًا وَعِشْرِينَ، ثُمَّ نَزَلَتْ عَلَيْهِ هَذِهِ الآيَةُ: (يَا أَيُّهَا النَّبِىُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ) حَتَّى بَلَغَ (لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا). قَالَ: فَبَدَأَ بِعَائِشَةَ فَقَالَ: « يَا عَائِشَةُ إِنِّى أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْرًا أُحِبُّ أَنْ لاَ تَعْجَلِى فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِى أَبَوَيْكِ »، قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ؟ فَتَلاَ عَلَيْهَا الآيَةَ. قَالَتْ: أَفِيكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَىَّ؟ بَلْ أَخْتَارُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ، وَأَسْأَلُكَ أَنْ لاَ تُخْبِرَ امْرَأَةً مِنْ نِسَائِكَ بِالَّذِى قُلْتُ: قَالَ: « لاَ تَسْأَلُنِى امْرَأَةٌ مِنْهُنَّ إِلاَّ أَخْبَرْتُهَا إِنَّ اللَّهَ تعالى لَمْ يَبْعَثْنِى مُعَنِّتًا وَلاَ مُتَعَنِّتًا، وَلَكِنْ بَعَثَنِى مُعَلِّمًا مُيَسِّرًا ». {الحديث: ٣٦٧٤ = ٣٦٧١ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خودای لەسەر بێ) لەماڵەوە لەناو ژنەكانیدا دانیشتبوو، بەخەمگینی، خەڵكێكی زۆر لەبەردەرگای هۆدەكەی دانیشتبوون چاوەڕوانی ئەوەیان دەكرد كە ڕێگەیان پێ بدرێ بچن بۆ خزمەتی، لەوكاتەدا ئەبوبەكر (ڕەزای خودای لێ بێ) هات، داوای ڕێگە خوازی كرد كەبچێ بۆ خزمەت پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی ئەبوبەكر درا چووە ژوورەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر، لەپاشا عومەریش (ڕەزای خودای لێ بێ) هات، ڕێخوازی

کرد، ڕێگەی پێدرا، ڕوانی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەنێوانی ژنەکانیدا، بەخەمگینیو بەخامۆشی دانیشتووە، فەرمووی: جا ئەبوبەکر فەرمووی: بەخودا ئێستا شتێ دەڵێم پێغەمبەر دەهێنمە پێکەنین، فەرمووی: (ئەی پێغەمبەری خودا! خۆزگەم دەتبینی، ئەگەر حەبیبەی کچی خاریجەی کوڕی زەیدی خێزانم داوای ژێوارو نەفەقەی لێ دەکردم چۆن چۆنی بۆی هەڵ دەسامو ملم دەپڕواند!). جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەستی کرد بە پێکەنینو فەرمووی: (دەی ئەبینی واژنەکانم لە دەوروبەرمنو داوای ژیوار (نەفەقە)م لێ دەکەن).

جا ئەبوبەکر هەڵسا بۆ گیانی عائیشەی کچی، ملی هەڵووڵیو عومەریش هەڵسا بۆ گیانی حەپسەی کچی ملی هەڵ ووڵیو بۆ هەڕەشە دەیانگوت: ئەوە ئێوە داوای ژێواری نایاب لە پێغەمبەری خودا دەکەن، کە ژێواری وا کەشخە لەلای ئەو دەست ناکەوێ؟ ئەوانیش گوتیان: بەخودا ئێمە هەرگیز داوای شتێ ناکەین لە پێغەمبەری خوا، کە لەکێشیدا نەبێ.

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆماوەی مانگێ یا بیستو نۆ ڕۆژ لە ژنەکانی کەناری گرتو هاموشۆی نەدەکردن، لەپاشا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: {يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَاجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ∴ وَإِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الْآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنكُنَّ أَجْرًا عَظِيمًا - سورة الأحزاب/٣٣ — ٢٨/٢٩}. واتە:

ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو بە هاوسەرەکانت: ئەگەر حەزتان وا لەسەر خۆشیو ڕابواردنی ئەم جیهانە بێ بەقایە: ئەوا شتی وا لەلای من دەست ناکەوێ، کەواتە: بفەرموون وەرن هەتا لەسەر شێوەیەکی جوان، بەبێ دڵ ئێشانو ناخۆشی، هەقی شەرعی خۆتان پێ بدەمو تەڵاقتان بدەم، هەتا بڕۆن بەڕێی خۆتانەوە ئەگەر ئەوەشتان ناوێو حەزتان لەوەیە کە بەژنێتیو حەڵاڵو هاوسەری پێغەمبەری خودا ڕازیبنو بیکەن بەهۆی ڕەزای خوداو پێغەمبەرو بەمایەی بەشی باشی خانەی وایی، ئەوە کارێکی زۆر جوانە، لەبەرئەوە خودای گەورە، ئامادەی کردووە بۆ ئێوە

(كە هەمووتان ئافرەتی خاس‌و باش‌و چاكەكارو خێرخوان) پاداشتێكی گەورەی وا كە دونیاو چی واتیا، لەچاوی ئەودا، بەهیچ دەچێ!). فەرمووی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەپێش پێشدا لە عائیشەوە دەستی كرد بەڕاگەیاندنی ئەم فەرمانی خودایە، پێی فەرموو: (ئەی عائیشە! شتێكت بۆ باس دەكەم، حەزناكەم كەپەلە پەلی تیابكەی، بڕیاری لەسەر مەدە هەتا پرس‌وڕا بە باوك‌و دایكت نەكەی! عائیشە عەرزی دەكا: ئەی پێغەمبەری خودا! بفەرموو ئەوە چییە؟ پێغەمبەریش ئایەتەكانی خوێندەوە بۆی. عائیشە كە لەحاڵەكە حاڵی بوو، عەرزی پێغەمبەر دەكا: بۆ ئەمە پرس‌وڕا بەدایك‌و باوكم بەم، كە گوایە تۆ هەڵ ببژێرم یانا؟ شتی وا پرسی پێ ناوێ، چونكە من خواستم لەسەر ڕەزای خوداو ڕەزای پێغەمبەرەوە لەوەیشە مەبەستم پایەی بەرزی ماڵی دواییە!!

ئەوجا عائیشە عەرزی حەزرەت دەكا: (وە داوات لێ دەكەم كەئەم وەڵامەی من بەهیچ كام لەژنەكانی ترت نەڵێی، با ئەوان چاولەمن نەكەن!!).

بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم داوایەی عائیشەی ئایەخ كردو پێی فەرموو: (بە پێچەوانەوە هەركامێكیان داوای ئەوەم لێ بكا، كە وەڵامی تۆ چی بووە، من وەڵامەكەی تۆی پێ دەڵێم، چونكە خوای گەورە كەمنی كردووە بە پێغەمبەرو ڕەوانەی كردووم بۆسەر خەڵك، بۆئەوە ڕەوانەی نەكردووم كەتوندڕەوو توندو تیژبم، بەڵام بۆئەوە ڕەوانەی كردووم كەببم بە مامۆستایەكی ئاسانكار، كەواتە كار لەژنەكانی ترم گران ناكەم‌و ئەوەی ئاسانكاری بێ لەم لایەنەوە بۆیان دەكەم). {تاج/٤، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٤٠٤١}.

٨٥٦- عَنْ مَسْرُوقٍ قَالَ: مَا أُبَالِي خَيَّرْتُ امْرَأَتِي وَاحِدَةً أَوْ مِائَةً أَوْ أَلْفًا، بَعْدَ أَنْ تَخْتَارَنِي، وَلَقَدْ سَأَلْتُ عَائِشَةَ (رضى الله عنها)، فَقَالَتْ: قَدْ خَيَّرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَفَكَانَ طَلاَقًا؟ {الحديث: ٣٦٦٩ = ٣٦٦٦ فم. بخاري. طلاق: ٥٢٦٣}:

مەسرووق دەفەرموێ: گریمان یەك، یاسەد، یا هەزارجار ژنی خۆم بكەم بەسەرپشك كە تەڵاقی خۆی بەدەستی خۆی بێ، بەمەرجێ هەموو جارێ تەڵاقی

نەوێو من هەڵبژێرێ، دەربەستی ئەوەنیم، چونکە بۆ ئەم پرسە لە عائیشەم پرسی، فەرمووی: کاتی خۆی کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئێمەی لەم بارەیەوە کرد بەسەرپشكو ئێمەیش تەڵاقمان نەویستو پێغەمبەرمان هەڵبژارد لەبەرئەوە دانەنرا بەتەڵاق.

## ٦٦٦) باسی فەرمایشتی خوای گەورە: {وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ} (٣٦٦٥ - ٣٦٨٠)

## باب: في قَوْلِهِ تَعَالَى: {وَإِن تَظَاهَرَا عَلَيْهِ}

٨٥٧- عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رضى الله عنهما) قَالَ: مَكَثْتُ سَنَةً وَأَنَا أُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَنْ آيَةٍ فَمَا أَسْتَطِيعُ أَنْ أَسْأَلَهُ هَيْبَةً لَهُ، حَتَّى خَرَجَ حَاجًا، فَخَرَجْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا رجَعَ فَكُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ، عَدَلَ إِلَى الأَرَاكِ لِحَاجَةٍ لَهُ، فَوَقَفْتُ لَهُ حَتَّى فَرَغَ، ثُمَّ سِرْتُ مَعَهُ فَقُلْتُ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ مَنِ اللَّتَانِ تَظَاهَرَتَا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مِنْ أَزْوَاجِهِ؟ فَقَالَ: تِلْكَ حَفْصَةُ وَعَائِشَةُ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنْتُ لأُرِيدُ أَنْ أَسْأَلَكَ عَنْ هَذَا مُنْذُ سَنَةٍ، فَمَا أَسْتَطِيعُ هَيْبَةً لَكَ، قَالَ: فَلاَ تَفْعَلْ مَا ظَنَنْتَ أَنَّ عِنْدِى مِنْ عِلْمٍ فَسَلْنِى عَنْهُ، فَإِنْ كُنْتُ أَعْلَمُهُ أَخْبَرْتُكَ. قَالَ: وَقَالَ عُمَرُ: وَاللَّهِ إِنْ كُنَّا فِى الْجَاهِلِيَّةِ مَا نَعُدُّ لِلنِّسَاءِ أَمْرًا، حَتَّى أَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى فِيهِنَّ مَا أَنْزَلَ، وَقَسَمَ لَهُنَّ مَا قَسَمَ، قَالَ: فَبَيْنَمَا أَنَا فِى أَمْرٍ أَأْتَمِرُهُ. إِذْ قَالَتْ لِى امْرَأَتِى لَوْ صَنَعْتَ كَذَا وَكَذَا، فَقُلْتُ لَهَا: وَمَا لَكِ أَنْتِ وَلِمَا هَا هُنَا؟ وَمَا تَكَلُّفُكِ فِى أَمْرٍ أُرِيدُهُ؟ فَقَالَتْ لِى: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ مَا تُرِيدُ أَنْ تُرَاجَعَ أَنْتَ، وَإِنَّ ابْنَتَكَ لَتُرَاجِعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ، قَالَ عُمَرُ: فَآخُذُ رِدَائِى، ثُمَّ أَخْرُجُ مَكَانِى حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى حَفْصَةَ، فَقُلْتُ لَهَا: يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَتُرَاجِعِينَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى يَظَلَّ يَوْمَهُ غَضْبَانَ؟. فَقَالَتْ حَفْصَةُ: وَاللَّهِ إِنَّا لَنُرَاجِعُهُ، فَقُلْتُ: تَعْلَمِينَ أَنِّى أُحَذِّرُكِ عُقُوبَةَ اللَّهِ وَغَضَبَ رَسُولِهِ، يَا بُنَيَّةُ! لاَ يَغُرَّنَّكِ هَذِهِ الَّتِى قَدْ أَعْجَبَهَا حُسْنُهَا، وَحُبُّ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِيَّاهَا. ثُمَّ خَرَجْتُ حَتَّى أَدْخُلَ عَلَى أُمِّ سَلَمَةَ لِقَرَابَتِى مِنْهَا، فَكَلَّمْتُهَا فَقَالَتْ لِى أُمُّ سَلَمَةَ: عَجَبًا لَكَ يَا ابْنَ الْخَطَّابِ قَدْ دَخَلْتَ فِى كُلِّ شَىْءٍ حَتَّى تَبْتَغِى أَنْ تَدْخُلَ بَيْنَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَزْوَاجِهِ؟! قَالَ: فَأَخَذَتْنِى أَخْذًا كَسَرَتْنِى عَنْ بَعْضِ مَا كُنْتُ أَجِدُ، فَخَرَجْتُ مِنْ

عِنْدهَا، وَكَانَ لِى صَاحِبٌ مِنَ الأَنْصَارِ إِذَا غِبْتُ أَتَانِى بِالْخَبَرِ، وَإِذَا غَابَ كُنْتُ أَنَا آتِيهِ بِالْخَبَرِ، وَنَحْنُ حِينَئِذٍ نَتَخَوَّفُ مَلِكًا مِنْ مُلُوكِ غَسَّانَ، ذُكِرَ لَنَا أَنَّهُ يُرِيدُ أَنْ يَسِيرَ إِلَيْنَا، فَقَدِ امْتَلأَتْ صُدُورُنَا مِنْهُ. فَأَتَى صَاحِبِى الأَنْصَارِىُّ يَدُقُّ الْبَابَ. وَقَالَ: افْتَحِ افْتَحْ، فَقُلْتُ: جَاءَ الْغَسَّانِىُّ؟ قَالَ: أَشَدُّ مِنْ ذَلِكَ، اعْتَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَزْوَاجَهُ. فَقُلْتُ: رَغِمَ أَنْفُ حَفْصَةَ وَعَائِشَةَ، ثُمَّ آخُذُ ثَوْبِى فَأَخْرُجُ حَتَّى جِئْتُ، فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى مَشْرُبَةٍ لَهُ يُرْتَقَى إِلَيْهَا بِعَجَلَةٍ وَغُلاَمٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَسْوَدُ عَلَى رَأْسِ الدَّرَجَةِ، فَقُلْتُ: هَذَا عُمَرُ، فَأُذِنَ لِى. قَالَ عُمَرُ: فَقَصَصْتُ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) هَذَا الْحَدِيثَ، فَلَمَّا بَلَغْتُ حَدِيثَ أُمِّ سَلَمَةَ تَبَسَّمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَإِنَّهُ لَعَلَى حَصِيرٍ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَهُ شَىْءٌ، وَتَحْتَ رَأْسِهِ وِسَادَةٌ مِنْ أَدَمٍ حَشْوُهَا لِيفٌ، وَإِنَّ عِنْدَ رِجْلَيْهِ قَرَظًا مَضْبُورًا وَعِنْدَ رَأْسِهِ أُهُبًا مُعَلَّقَةً، فَرَأَيْتُ أَثَرَ الْحَصِيرِ فِى جَنْبِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَبَكَيْتُ، فَقَالَ: مَا يُبْكِيكَ؟ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ كِسْرَى وَقَيْصَرَ فِيمَا هُمَا فِيهِ، وَأَنْتَ رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَا تَرْضَى أَنْ تَكُونَ لَهُمَا الدُّنْيَا وَلَكَ الآخِرَةُ ». {الحديث: ٣٦٧٦ = ٣٦٧٣ فم. تجريد/١، رقم: ٧٧ = ٨٩، ٢٤٦٨، ٤٩١٣، ٤٩١٤، ٤٩١٥، ٥١٩١، ٥٢١٨، ٥٨٤٣، ٧٢٥٦، ٧٢٦٢. تحفة الأشراف: ١٠٥١٢}:

عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەگێڕێتەوە دەفەرموێ: ماوەی ساڵێ چاوەڕێی هەل بووم، بۆئەوە پرسیار لە عومەری کوڕی خەتتاب بکەم، لەواتای ئایەتێ، بەڵام بۆم نەکراو لێم نەپرسی، چونکە ئەوەندە سامی هەبوو لەدڵما، هەتا چوو بۆ سەفەری حەجو منیش لەگەڵیا چووم بۆ حەج، کاتێ گەڕاینەوە لەڕێگە لای دار سیواکێکدا لایدا، بۆسەراو، منیش لەسەری وەستام هەتا لێ بۆوە، جا لەگەڵیدا ڕۆیشتمو گوتم: ئەی فەرمانڕەوای موسوڵمانان! ئەو دوو ژنە کێ بوون کە لەناو ژنەکانی پێغەمبەردا گەلەکۆمە (تەظاهور)ینان لە پێغەمبەر کردبوو (وەك خودا باسی ئەم باسە دەکا لەسەرەتای سوورەتی تەحریمەوە)؟ ئەویش فەرمووی: ئەوە حەفصەی کچی منو عائیشەی کچی ئەبوبەکر بوون. منیش گوتم: بەخودا ساڵێکی

ڕەبەقە دەمەوێ بۆ ئەمە پرسیارت لێ بکەم، بەڵام لەبەر سامی تۆ پڕکێشیم نەدەکرد. فەرمووی: شتی وا مەکە، ئەگەر بەزەینی خۆت وات دەزانی کە شتێ هەیە کەمن دەیزانم‌و لەلای من هەیە، پرسیارم لێ بکە شەرم مەکە، ئەگەر بیزانم پێتی دەڵێم، لەپاشدا عومەر (خودای لێ ڕازی بێ) فەرمووی: بەخودا ئێمە لەسەردەمی نەزانی پێش هاتنی ئیسلامدا ئافرەتمان بەهیچ دانەدەناو هیچ حەق‌و حیسابێکمان بۆ ژن نەدەکرد، هەتا خودا ئایەتی قورئانی لەبارەی ژنانەوە ناردە خوارەوەو بەش‌و بارەو مافی بۆ ژنان دیاریکرد. عومەر فەرمووی: ئەوا جارێکیان خەریکی کارێکی خۆمم‌و بیری لێ دەکەمەوە، لەوکاتەدا ژنەکەم پێی گوتم: بۆئاوا نایکەی! پێیم گوت: تۆ حەقت چییە؟ تۆ بۆخۆت لەکاری من هەڵدەقورتێنی؟ ئەویش گوتی پێم: ئەی عومەر! تۆ چەندە سەیریت! تۆ ناتەوێ کە کەسێ قسە لەقسەتا بکا کەچی کچەکەت ڕۆژ تائێوارێ دەمەدەمێ لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ەکاو دەچێتەوە بەگژ دەمیا، ڕۆژی واهەیە بەم بۆنەیەوە تا ئێوارە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزویری‌و بەقارەوە دەمێنێتەوە؟ فەرمووی: جا هەستام‌و پۆشاکەکەی سەرشانم هەلگرت‌و چووم بۆلای حەفصەو پێیم گوت: کچم! ڕاستە کەتۆ دەچیتەوە بەگژ دەمی پێغەمبەرداو چەندو چوونی لەگەڵدا دەکەیت‌و ڕۆژی واهەیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا ئێوارێ بەزیزی‌و زویری دەمێنێتەوە؟ گوتی: ئەرێ بەخودا ڕاست وایە ویرە ویڕی لەگەڵ دەکەین!

منیش پێیم گوت: تۆ دەزانی کەمن تۆ دەترسێنم لە سزای خودا لەسەر زیزکردنی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کچم! تۆ بەهۆی ئەو ژنەوە (واتە: بەهۆی عائیشەوە) لەخۆت بایی مەبە، ئەو بەجوانی خۆی دەنازێ‌و پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خۆشی دەوێ، تۆ خۆت مەبەستە بەوەوە. لەپاشدا ڕۆیشتم، ئوممو سەلەمەیش خزمم بوو، چووم بۆ ماڵی ئەویش، ئەویش هاوسەری حەزرەت بوو، لەگەڵ ئەویشدا قسەم کرد لەم بارەیەوە، فەرمووی: ئەی کوڕی خەتتاب! سەیرم

لەتۆ دێ، لەهەموو شتێکدا هەڵ دەدەیتێ! تەنانەت ئەوەتا دەتەوێ لەنێوانی پێغەمبەرو ژنەکانیشیا خۆت تێ هەڵبقورتێنی!

عومەر فەرمووی: بەخودا بەڕاستی قسەکانی ئوممو سەلەمە وەها کاریان تێ کردم تۆزێ خاویانکردمەوە! ئینجا لەوێوە ڕۆیشتم هاوڕێیەکی ئەنصاریم هەبوو، منو ئەو بەسەرە دەچووین بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ هەواڵ زانینو دەنگوباسی سرووشو شتی وا، ئەگەر من نەچوومایە ئەو هەواڵو باسو خواسی بۆم دەهێنا، ئەگەر ئەویش نەچوایە من دەنگوباسم بۆی دەبرد، وە لەو سەردەمەدا مەترسیمان لەپاشایێ لەپاشاکانی غەسسان هەبوو، وامان بیستبوو کە ئەم پاشایە کەناوی (الحارث بن أبي شِمّر) بوو، دەیەوێ بەسوپایەکی گەورەوە هێرش بێنێتە سەرمان، زۆر لێی دەترساین، پڕبەدڵ مەترسیمان لێی هەبوو، ڕۆژێ لەناکاو تەماشام کرد وا ئەو هاوڕێ ئەنصارییەم دەدا لەدەرگاو دەڵێ: بیکەرەوە! لەدڵی خۆما گوتم ببێو نەبێ شتێ قەوماوە پێیم گوت: وا پەرۆشی! دیارە کابرای غەسسانی هاتۆتە سەرمان! گوتی: بەڵکوو لەوە خراپتریش رووی داوە: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەناری لە خێزانەکانی گرتووە!

منیش گوتم: هەی لووتی حەفصەو عائیشە بتەوسێتەوەو لووتیان بەقوڕاچێ، بۆ ئیشێ کردیان! جاجلەکانم هەلگرتو دەرچووم بۆ سۆراخی ئەم هەواڵەو چووم بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەماشام کرد حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وا لەناو باڵەخانەیەکا بە پەیژە بۆی سەردەکەوێ، خولامێکی رەشی پێغەمبەر هەبوو، ناوی رەباح بوو، لەسەر تەوقەسەری پەیژەکە بوو، مۆڵەتی بۆ هاتوان وەردەگرت، پێم گوت: رەباح! عەرزی حەزرەت بکە، بلێ کە عومەری کوڕی خەتتاب دەیەوێ بێت بۆ خزمەتت. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێ دام، عومەر فەرمووی: کەچوومە خزمەتی باسەکەم لە نووکەوە بۆ حەزرەت گێڕایەوە، هەتا گەیشتمە سەر قسە رەقەکەی ئوممو سەلەمە، کە بەمنی گوت، حەزرەت زەردەخەنەیەکی کرد. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوکاتەدا لەسەر حەسیرێکی رووت بوو، حەسیرەکە

هیچی تری بەسەرەوە نەبوو، سەرینێکی بەرگ چەرمینی لەژێر سەردا بوو، ناواخنەکەی ریشاڵ (لیف)ی خورما بوو، لە پایینیەوە هەندێ بەرە دارشیلان کە کەوڵی پێ خۆشە دەکرێ هەڵڕژا بوو، کۆمەڵکرابوو، لەژوور سەریشیەوە بە بنمیچەکەوە چەن کەوڵێ هەڵواسرابوو، کە تەماشایم کرد گرێی حەسیرەکە لاقە برغەی حەزرەتی دابڕیبوو، منیش دەستم کرد بەگریان. فەرمووی: ئەی عومەر! بۆچی دەگریت؟ گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! کیسراو قەیسەر، کە یەکەمیان شاهنشاهی ئێرانەو دووەمیان پادشای رۆمە، وان لەو هەموو نازو خۆشییەدا، کە هەموو کەس دەیزانێ، لەگەڵ ئەوەشا کەبێ باوەڕن، کەچی تۆیش کە پێغەمبەری خودای ئەمە حاڵتە کەدەبینین؟ فەرمووی: (ئەدی تۆ بەوە رازی نابی کە دونیا بۆ ئەوان بێو پاشە رۆژیش بۆ خۆمان بێ!!). {تاج/٤، زنجیرە: ٤٩، ژمارە: ٤١٨ — تەفسیر/ سوورەتی تەحریم چاپی/٤}.

**کوردو کورت**:

لێرەدا وەك نموونەیەکی راستو دروستو راستەقینە، بە ئیقتیباس لەم ژیانە سەختو دیژوارەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە نامیلکەی (التركمانُ شَدُّ قُوَى العَرَبِ)ەوە، کە پوختەی ئەو ئەزموونە تاڵانەیە، کە لەماوەی (٣٠) ساڵی نیشتەجێبوونم لە کەرکووك کۆم کردوونەتەوە، لەبارەی ئەو هەموو ناهەقیو زوڵمو زۆرو ستەمەی کە نەتەوەکانی تری کەرکووك لەگەڵ دەوڵەتا لە کوردیان دەکرد، لێرەدا بەم بۆنەیەوە ئەم نموونەیەتان لەو نامیلکەوە بۆ راگوێز ەکەم، بەتایبەتی لەبەرئەوەی کە گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەم راستەقینەیە:

(کە سەرۆکانی گەلو رابەرانی بزووتنەوەکان، هەتا ترسی خوایان هەبێو لەگەڵ ملەتی خۆیان بنو سەرقاڵی کۆکردنەوەی پڕوپیتی جیهان نەبنو لە پێناوی پەیامو مەبەستەکەیانا، بەرگەی هەموو ساردیو گەرمییەك بگرنو گووژاڵکیان لەدەما هەنگوین بێ، هەتا وابن براوەنو لەلای خواو بەندەی خوا پەسەندن، با

دەربەدەرو ئاوارەو شەهیدیش بن، بەڵام هەرکاتێ سەریان کردە دنیا پەرستیو کۆشکو تەلارو پارەو دینارو دۆلارو بەزمو رەزم، ئیتر ئەوە سەرەتای رۆژی رەشی خۆیانو ملەتیانە، بەدیمەن بۆ گەل رابەرن، بەواتا بۆ دوژمن نۆکەرو نوێنەرن!

(... رێزدار مقدم/ محمد أطروشي، لەماڵی مامۆستا مەلا محمد ئەمین، لەتەپەی مەلا عەبدوڵا، لە کەرکووك گێڕایەوە:

(لەگەرمەی شۆڕشا، لە شەستەکانا، شۆڕشگێڕێکی مەزنی ئێرانی، دەیەوێ سەردانێکی مەلا مستەفای بەرزانی بکا، زۆر بە پەرۆشەوە بەنهێنی، بەسواری وڵاخ، دێ بەدێ، بەناوی خوازراوەوە، رۆژێ خۆی دەکا بەمەلا، رۆژێ خۆی دەکا بەشێخ، چەند شەوو رۆژێ، ئاوا بەناو ئەو دەشتو دەرو شاخو داخەدا، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکا، کەجارێ دەڵێ دەرویشی خۆ منو جارێ دەڵێ فەقێی خۆ من، بەپێی شوێن، دەخولێنەوەو قوڕو لیتەی زستان دەشێلنو سەرماو سۆڵە دەچێژن، هەرتاو نەتاوێ لەتاو فڕۆكو تەقەی رەبایاو هێرشی جاشان، هەڵدێنو خۆ لەناو دەوەنو بن بەردێ دەشارنەوە، رۆژانە بەچاوی خۆیان گوندی سووتاوو تەرمی شەهیدو زامار، لەهەموو جۆرێ دەبینن، هەتا بەرە بەرە دەگەنە پەناگەی بەرزانی، هەموو شتێ بە خەیاڵی ئەو مامۆستا ئێرانییەدا دێ ئەمە نەبێ: دەڕوانێ وا تەختو بارەگا زێڕینەکەی مەلای بەرزان، وا لەچیایەکی سەختو دیژواری وادا، کە رێگەی باڵداری نییە، چ جای پادار، وا لەناو ئەشکەوتێکی تاریکی شێداری قانگدراو بەچڕە دووکەڵی کۆتەرە داری تەڕو، پڕ لەسەرە بزووتکی کوژاوەو پڕ لەچراووگ، کە بەشەو لەباتی چراو گوڵۆپو لایت بەکاری دەهێنن، لەپڕ مارێ، یا جانەوەرێ، ئاگری ناو ئەشکەوتەکە گەرمی دەکاتەوەو سڕییەکەی دەردەچێو دووکەڵەکە سەری لێ دەشێوێنێو مەترسیو تۆقانێ لەناو ئەشکەوتەکەدا دروست دەکا، لەمەترسی تۆپو تانكو فڕۆكو جاشو جەیش ناخۆشتر!!

لەلایەکی تریشەوە دەڕوانێ وامەلا مستەفاو نزیکانی بارەگا، ئەوەندە تەپو تۆزە چڕە دووکەڵ چووە بەسەرو چاویاناو تەپوتۆز لە جلەکانیان نیشتووەو

ئەوەندە بە تەختە بەردی داخ لەناو ئەشکەوتەکەدا کولێرە ئاشییان کردووە، ڕێك دەڵێی ئاشەوانن‌و لەناو ئاشا دەژین!!

گوتی: لەو سەردەمەشدا، بەرەی جاشەکان، بەڕۆشنبیرو بە ناڕۆشنبیریانەوە، واتە: بەجاش چەك‌و بەجاش قەڵەمیانەوە، تەنگیان بە بەرزانی هەڵچنی بوو، دژایەتییەکی ماددی‌و مەعنەوییان دەکرد، بەدەیان لیژنە، لە ئەمن‌و لە ئیستیخبارات، تانەو تەشەرو درۆو دەلەسەیان، لەدژی شۆڕش دروست دەکردو وەك بەچکە کۆترو بەچکە تووتی دەیانتفانە سەردەمی لایەنە کوردییە نەیارەکانی شۆڕش‌و ئەوانیش وەك بنێشت‌و کاوێژ شەوو ڕۆژ دەیانجوییەوەو دەیانگوت‌و دەیانگوتەوە، بەمەلا مستەفایان دەگوت: مەلا چۆنبی‌و بە شۆڕشیان دەگوت جەیبی عەمیل‌و بە پێشمەرگەیان دەگوت: شەمشەمە کوێرەو بەسەدامیان دەگوت: زێڕە زێڕەو بە جاشیان دەگوت: سوارەی سەلاحەدین‌و ... تاد.

گوتی: جا ئاغای ئێرانی کە ئەم واقیعە قێزەونەی بینی‌و ئەم چەواشەکاریەی ڕەچاو کردو ئەم ژیانە زبرەی بەرزانی‌و پیاوانی شۆڕشی بینی، گوتی: (ئاغای بەرزانی! ئەم ملەتەی تۆ هەتە، ئەوە ناهێنێ کەتۆ ئاوا خۆتی بۆبکەی بە ئاشەوان، یا خۆتی بۆ بکەی بەقۆچی قوربانی!!).

دەڵێن قازی موحەممەدی (شەهید) کاغەزێ دەنووسێ بۆ شێخی حیسامەددین، کە یارمەتی بداو پشتگیری کۆماری مەهاباد بکا ئەویش بەم شیعرە وەلامی دەداتەوەو عوزری بۆ دێنێتەوە:

هەر لە خانەقین هەتا ژاوەڕۆ
کورد هەر کورت بووەو هەر کورت یاوەڕۆ



# ١٣- نامەی عیددەی ژنان (كتَابُ العِدَّة)

## ٦٦٧) باسی عیددەی ژنی دووگیان. (٣٧٠٦ - ٣٧٠٨)

## بَابٌ: فِي الحَامِلِ تَضَعُ بَعْدَ وفَاةِ زَوْجِهَا

٨٥٨- عَنِ عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ: أَنَّ أَبَاهُ كَتَبَ إِلَى عُمَرَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الأَرْقَمِ الزُّهْرِيِّ يَأْمُرُهُ، أَنْ يَدْخُلَ عَلَى سُبَيْعَةَ بِنْتِ الْحَارِثِ الأَسْلَمِيَّةِ فَيَسْأَلَهَا عَنْ حَدِيثِهَا وَعَمَّا قَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ اسْتَفْتَتْهُ، فَكَتَبَ عُمَرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ إِلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ يُخْبِرُهُ أَنَّ سُبَيْعَةَ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ سَعْدِ ابْنِ خَوْلَةَ وَهُوَ فِى بَنِى عَامِرِ بْنِ لُؤَىٍّ، وَكَانَ مِمَّنْ شَهِدَ بَدْرًا فَتُوُفِّىَ عَنْهَا فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ وَهْىَ حَامِلٌ فَلَمْ تَنْشَبْ أَنْ وَضَعَتْ حَمْلَهَا بَعْدَ وَفَاتِهِ، فَلَمَّا تَعَلَّتْ مِنْ نِفَاسِهَا تَجَمَّلَتْ لِلْخُطَّابِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا أَبُو السَّنَابِلِ بْنُ بَعْكَكٍ - رَجُلٌ مِنْ بَنِى عَبْدِ الدَّارِ - فَقَالَ لَهَا: مَا لِى أَرَاكِ مُتَجَمِّلَةً لَعَلَّكِ تَرْجِينَ النِّكَاحَ؟ إِنَّكِ وَاللَّهِ مَا أَنْتِ بِنَاكِحٍ حَتَّى تَمُرَّ عَلَيْكِ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ، قَالَتْ سُبَيْعَةُ: فَلَمَّا قَالَ لِى ذَلِكَ، جَمَعْتُ عَلَىَّ ثِيَابِى حِينَ أَمْسَيْتُ، فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَسَأَلْتُهُ عَنْ ذَلِكَ؟ فَأَفْتَانِى بِأَنِّى قَدْ حَلَلْتُ حِينَ وَضَعْتُ حَمْلِى، وَأَمَرَنِى بِالتَّزَوُّجِ إِنْ بَدَا لِى، قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَلاَ أَرَى بَأْسًا أَنْ تَتَزَوَّجَ حِينَ وَضَعَتْ، وَإِنْ كَانَتْ فِى دَمِهَا غَيْرَ أَنْ لاَ يَقْرَبُهَا زَوْجُهَا حَتَّى تَطْهُرَ. {الحديث: ٣٧٠٦ = ٣٧٠٢ فم. بخاري. مفازي: ٣٩٩١، ٥٣١٩. أبو داود. طلاق: ٢٣٠٦. نسائي. طلاق: ٣٥١٨}:

عوبەیدوڵڵای کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عوتبە، فەرمووی: عەبدوڵڵای باوکم نامەی نووسی بۆ عومەری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەرقەمی ئەل-زوهری، فەرمانی پێکرد کەبچێ بۆلای سوبەیعەی کچی حاریثی ئەل-ئەسلەمییە، کە پرسیاری لێبکا، لەبارەی دانانی سکەکەیەوە، لەپاش مردنی مێردەکەی، کە پرسیاری لە پێغەمبەر کردووە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چی پێ گوتووە؟

عومـەری كـوڕی عەبـدوڵلا وەڵامـی نووسـییەوە بـۆ بـاوكم ئـەم هەواڵـەی پـێ ڕاگەیاند: كە سوبەیعە پێی گوتم: ژنـی سـەعدی كـوڕی خەولە بـووم، كـە لـەخێڵی بەنی عامیری كوڕی لوئەی دەژمێررا، كـە یـەكێ بـوو لەوانـەی كـە ئامـادەی جـەنگی بەدر بوو بوون، لـە حـەجی ماڵاواییـدا سـەعدی مێـردم مـرد، لـەكاتی مردنیـدا مـن دووگیان بـووم، سـكم پڕبـوو، چـەند شـەوێ لـەپاش مـەرگی سـەعد، مناڵەكـەم بـوو، سكەكەم دانا، جاكاتێ سوبەیعە لە زەیستانی پاك دەبێتەوە، خـۆی دەڕازێنێتـەوە بـۆ خوازبێنیكـاران، ئـەبو سـەنابیلی كـوڕی بەعكـەك (كـە پیـاوێ بـوو لـەخێڵی بـەنی عەبدودار) دەچێ بۆلای‌و پێی دەڵێ: سوبەیعە، چییە دەتبینـم خـۆت ڕازاندۆتـەوەو بـەرگی ڕەشپۆشـی (حیـداد)ت دانـاوە، دەڵێـی بەتـەمای شـووكردنی؟ بـەخودا شـتی وانابێ، تۆ ناتوانی شووبكەیتەوە، هەتا حەیەی مێرد مردن تەواونەكەی، كە بـەپێی ئایەتی قورئان چوار مـانگ‌و دەشـەوە، قورئـان دەفـەرموێ: {وَالَّـذِينَ يُتَوَفَّـوْنَ مِـنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا – بقرة/٢/٢٣٤}. واتە: ئەو پیاوە موسوڵمانانە كەدەمرن‌و ژنەكانیان لەپاش خۆیان بـەجێ دەهێڵن، دەبـێ ئـەو ژنانـە تامـاوەی چـوار مـانگ‌و دەشــەو تازێبـاربن‌و چـاوەڕوانی بكـەن‌و لەوماوەیـەدا شوونەكەنەوە!).

سـوبەیعە فـەرمووی: كاتـێ ئـەبو سـەنابیل ئـاوای پـێم گـوت، ئێـوارێ خـۆمم بەجلـەكانم كـۆكردەوەو چـووم بـۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـودا (درودی خـودای لەسـەر بێ) سـەبارەت بـەم بابەتـەی خـۆم پرسـیارم لێـی كـرد، فـەتوای بۆمـدا، كەلـەدوا دانـانی سكەكەم حەیەم هەڵهاتووەو عیددەم تەواو بووەو هەرچی بۆ ژنی بێ مێرد دروست بێ بۆ منیش دروستە، فەرمانیشی پێم كرد ئەگەر دەمەوێ شووبكەمەوە!

ئیبنو شەهاب (كە یەكێكە لە پیاوانی ڕشتە (سـەنەد)ی ئـەم فەرموودەیـە، كـە عوبەیـدوڵلای كـوڕی عەبـدوڵلا، لـەم فەرموودەیـەدا، مامۆسـتایەتی) ئیبنـو شـەهاب دەفـەرموێ: بەلامـەوە قەیـدی نییـە كـەژنی دووگیـان، ئایـا تەڵاقـدراوبێ، یـا مێـرد مردووبـێ، كـە شـووبكاتەوە، بـا لـەخوێنی زەییسـتانیش پـاك نەبووبێتـەوە، بـەڵام

مێردە تازەکەی نابێ نزیکی بکەوێ تا لەخوێنی زەییستانییەکەی پاك نەبێتەوە!!.
{تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٤ — ٢٢٧٨ چ/٤}.

**روونکردنەوە:**

سوبەیعەی کچی حاریث، لە صەحیحەیندا فەرموودەی هەیەو ناویشی هەیە، ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا دەفەرموێ: فوقەهای مەدینەو فوقەهای کووفە، ئەم فەرموودەی ئێرەی ئەویان گێڕاوەتەوە، ئوم سەلەمەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهاوسەرە پاکیزەکانی بێ) دەفەرموێ: سوبەیعە، لەپاش مەرگی مێردەکەی بەنیو مانگ منداڵی بوو، دوو پیاو (یەکێکیان گەنجو ئەویتریان پیر) خوازبێنی ئەویان کرد، ویستی شووبکا بەلاوەکەیان پیرەکەشیان، کە ئەبو سەنابیل بوو، ویستی نەیهێڵێ، بە بیانووی ئەوەی کە حەیەی هەڵ نەهاتووە، لەهەمان کاتا مەبەستی ئەوەیش بوو، کەسوکارەکەی کەلەوێ نەبوون، کە هاتنەوە ئەوَ هەڵبژێرنو گەنجەکە ئایەخ بکەن، بەڵام سوبەیعە کارەکەی عەرزی حەزرەت کرد ئەویش ڕێگەی پێدا، کە لەم چرکە ساتەوە بەکێ ئارەزوودەکا شووبکاتەوە!

کۆمەڵێ لە پەیڕەوان (تابیعین) فەرموودەکانی ئەویان گێڕاوەتەوە بڕوانە (تاج الأصول في أحاديث الرسول) بەکوردی، بەرگی دووەم، چاپی چوارەم، زنجیرەی حەفتاو نۆ بەتەواوی).

## ٦٦٨) ژنی تەڵاقدراو لەماوەی عیددەکەیدا بۆی هەیە بەڕۆژ دەرچێ بۆ خزمەتی باخو ئیشو کاری ئاسایی خۆی. (٣٧٠٥)

## باب: فِي الْمُطَلَّقَةِ تَخْرُجُ لِجِدَادِ نَخْلِهَا

٨٥٩- عَنِ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رضى الله عنهما) قَالَ: طُلِّقَتْ خَالَتِى، فَأَرَادَتْ أَنْ تَجُدَّ نَخْلَهَا فَزَجَرَهَا رَجُلٌ أَنْ تَخْرُجَ، فَأَتَتِ النَّبِىَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « بَلَى، فَجُدِّى نَخْلَكِ، فَإِنَّكِ عَسَى أَنْ تَصَدَّقِى أَوْ تَفْعَلِى مَعْرُوفًا ». {الحديث: ٣٧٠٥ = ٣٧٠١ فم}:

جـابیری کـوڕی عەبـدوڵلا (ڕەزای خودایـان لـێ بـێ) فـەرمووی: پـوورێکم هـەبوو، سـێ تەڵاقەدرا بوو، جارێ دەچێتە دەرەوە خورماکەی بڕنێ، پیاوێکی پێ دەگا نـەهی لێ دەکاو پێی دەڵێ: تۆ هێشتا حەیـەت هەڵنـەهاتووە، هێشتا عیـددەت تـەواو نـەبووە، چۆن لەماڵ دەردەچیت؟ پووریشم دەچێ بۆلای حـەزرەتو ئەمـەی عـەرزدەکا، پێـی دەفەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (بەڵێ، دەرچۆو بچۆ خورماکـەت بڕنـە، سا بەشکوو خێرێکی لێ بکەی، یا چاکەیێ بکەی، خۆ تۆ زیندانی نیت، لەکونی ژوورەوە نەیەیتە دەرەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٣}.

**٦٦٩) تەڵاقدراو بۆی هەیە لەو ماڵەی کەواتیادا دەربچێ ئەگەر مەترسی لەخۆی هەبوو.** (٣٦٨١ - ٣٧٠٤)

**باب: فِي خُرُوجِ الْمُطَلَّقَةِ مِنْ بَيْتِهَا إِذَا خَافَتْ عَلَى نَفْسِهَا**

٨٦٠- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ قَالَتْ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ زَوْجِي طَلَّقَنِي ثَلاَثًا، وَأَخَافُ أَنْ يُقْتَحَمَ عَلَيَّ، قَالَ: فَأَمَرَهَا فَتَحَوَّلَتْ. {الحديث: ٣٧٠٢ = ٣٦٩٨ فم}:

فاطیمەی کچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فـەرمووی: گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! مێردەکەم سێبەسێ تەڵاقی داوم، ترسی ئەوەم هەیە ئەگەر لەهۆدەو مـاڵی شـەرعی خۆما، لەماوەی عیددەدا، بمێنمەوە، وەك لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: {لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ – ٦٥/١}. واتە:

ئەو ژنە تەڵاقدراوانە دەرمەکەن لە هۆدەو ماڵی شەرعی خۆیان، هەتا حەیەیان هەڵ دێو عیددەیان تەواو دەبێ، وەنابێ خۆشیان لـەماڵو هـۆدەی شـەرعی خۆیـان دەربچن، مەگەر کارێکی ناباری ناشیرینیان لێ دەربکەوێ).

فاطیمە فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد ئەگەر لـەم ماڵـە شـەرعییەی ئێسـتاما بمێنمەوە، تا عیددەم تەواو دەبێ، ماڵێکی چۆڵو هۆڵە، دەترسم کەسـێ یـا دەعبایـێ پەلامارم بدا، ئەویش فەرمووی: (لەوێ بگوێزەرەوە بۆ شوێنێ تر بەدڵی خۆت).

**ڕوونکردنەوە:**

فاطیمەی کچی قەیس، خوشکی ضەحاکی کوڕی قەیسە، کە والی یەزیدی کوڕی موعاویە بوو لەسەر عێراق، لە کۆچکارە پێشینەکان بوو، ئافرەتێکی هۆشمەندی شۆخ بوو، دەساڵ لە ضەحاکی برای گەورەتر بوو، لەماڵی فاطیمەدا ئەهلی شوورا لەپاش شەهیدبوونی ئیمامی عومەر کۆبوونەوە، لەپاش تەڵاقدانی شووی کرد بە ئوسامەی کوڕی زەید.

٨٦١- عَنْ أَبِى سَلَمَةَ بْنَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ عَوْفٍ أَنَّ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ أَخْبَرَتْهُ: أَنَّهَا كَانَتْ تَحْتَ أَبِى عَمْرِو بْنِ حَفْصِ بْنِ الْمُغِيرَةِ، فَطَلَّقَهَا آخِرَ ثَلاَثِ تَطْلِيقَاتٍ، فَزَعَمَتْ أَنَّهَا جَاءَتْ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) تَسْتَفْتِيهِ فِى خُرُوجِهَا مِنْ بَيْتِهَا، فَأَمَرَهَا أَنْ تَنْتَقِلَ إِلَى ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ الأَعْمَى، فَأَبَى مَرْوَانُ أَنْ يُصَدِّقَهُ فِى خُرُوجِ الْمُطَلَّقَةِ مِنْ بَيْتِهَا، وَقَالَ عُرْوَةُ: إِنَّ عَائِشَةَ أَنْكَرَتْ ذَلِكَ عَلَى فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ. {الحديث: ٣٦٨٦ = ٣٦٨٢ فم}:

ئەبو سەلەمەی کوڕی ئەوڕەحمانی کوڕی عەوف (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: فاطیمەی کچی قەیس، گێڕایەوە بۆم گوتی: ژنی ئەبو عەمری کوڕی حەفصی کوڕی موغیرە بووم، ئاخر تەڵاقی سێ تەڵاقەی دام، جا چووم بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بە دەرچوونم و گواستنەوەم لە هۆدەو ماڵە شەرعییەکەمەوە بۆ جێگەیێ تر، پرسیارم لێی کرد، فەرمانی پێم کرد بگوێزمەوە بۆ ماڵی عەبدوڵلا ی کوڕی ئوم مەکتووم کە پیاوێکی کوێر بوو، بەڵام مەڕوانی کوڕی حەکەم کە ئەوکاتە ئەمیری سەر مەدینە بوو گوتی: من بڕوا بەم قسەیە ناکەم، کەژنی تەڵاقدراو لەماڵە شەرعییەکەوە، لە ماوەی عیددەدا بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر. عوروەیش دەیفەرموو: عائیشەی پووریشم، ئەم قسەیەی فاطیمەی کچی قەیسی نەسەلماند). {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠، چاپی چوارەم + ژمارە: ٢٢٨١ + ژمارە: ٢٢٨٢ + ژمارە: ٨٩٠ لەم پەڕوە کە لەدواوە دێ}.

## ٦٧٠) شووكردنەوەی ژنی تەڵاقدراو لەپاش تەواوبوونی عیددەكەی(٣٦٨١ - ٣٧٠٤)

## باب: في تويج المُطَلَّقَةِ بَعْدَ عِدَّتِهَا

٨٦٢- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتَ قَيْسٍ (رضى الله عنها): إِنَّ زَوْجَهَا طَلَّقَهَا ثَلاَثًا، فَلَمْ يَجْعَلْ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً، قَالَتْ: قَالَ لِى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا حَلَلْتِ فَآذِنِينِى، فَآذَنْتُهُ، فَخَطَبَهَا مُعَاوِيَةُ، وَأَبُو جَهْمٍ، وَأُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَّا مُعَاوِيَةُ فَرَجُلٌ تَرِبٌ لاَ مَالَ لَهُ وَأَمَّا أَبُو جَهْمٍ فَرَجُلٌ ضَرَّابٌ لِلنِّسَاءِ، وَلَكِنْ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ »، فَقَالَتْ بِيَدِهَا: هَكَذَا أُسَامَةُ أُسَامَةُ!، فَقَالَ لَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « طَاعَةُ اللَّهِ وَطَاعَةُ رَسُولِهِ خَيْرٌ لَكِ »، قَالَتْ: فَتَزَوَّجْتُهُ فَاغْتَبَطْتُ. {الحديث: ٣٦٩٦ = ٣٦٩٢ فم}:

فاطیمەی كچی قەیس (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: مێردەكەم سێ تەڵاقەی دام، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەفەقەو ژێوارو نیشتەجێی شەرعی، لەماوەی عیددەدا بۆم دانەنا، وەپێی فەرمووم: (هەركاتێ عیددەكەت تەواو بوو ئاگادارم بكەرەوە!) منیش وامكرد، وە عەرزیشم كرد: موعاوییەی كوڕی ئەبو سوفیان‌و ئەبو جەهم‌و ئوسامەی كوڕی زەید خوازبێنیم دەكەن، تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی (درودی خودای لەسەر بێ): (هەرچی موعاوییەیە بۆرە پیاوەو بێ ماڵە، هەرچی ئەبو جەهمیشە لێدەرە لەژن زۆردەدا، شووبكە بە ئوسامەی كوڕی زەید) منیش بەدەستم ئاوام كردو تێم گەیاند كە حەزم لە ئوسامە نییە، چونكە هەم ڕەشەو هەم كۆنە نۆكەرەو بەندەی ئازادكراوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (فەرمانبەریی خوداو فەرمانبەریی پێغەمبەری خودا بۆتۆ باشترە، كەواتە شوو بە ئوسامە بكە). ئیتر لەسەر ڕاوێژو ئاماژەكەی پێغەمبەر شوومكرد بە ئوسامەو ئەوەتانێ خودا كردی بەمایەی خۆشی‌و سەربەرزیی بۆم‌و ژنان خۆزگەم پێ دەبەن! {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٠ + تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٢}.

**٦٧١) تازیباریو ماتەمباری لەماوەی عیددەدا بۆ مێردی مردوو، لەو ماوەدا نابێ خۆی برازێنێتەوەو بۆنی خۆشو کل بەکاربهێنێ (٣٧٠٩ - ٣٧٢٢)**

**بابٌ: فِي الإِحْدَادِ فِي العِدَّةِ عَلَى المَيِّتِ وَتَرْكِ الكحْل**

٨٦٣- عَنْ حُمَيْدِ بْنِ نَافِعٍ عَنْ زَيْنَبَ بِنْتِ أَبِى سَلَمَةَ: أَنَّهَا أَخْبَرَتْهُ هَذِهِ الأَحَادِيثَ الثَّلاَثَةَ، قَالَ: قَالَتْ زَيْنَبُ: دَخَلْتُ عَلَى أُمِّ حَبِيبَةَ زَوْجِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) حِينَ تُوُفِّىَ أَبُوهَا أَبُو سُفْيَانَ، فَدَعَتْ أُمُّ حَبِيبَةَ بِطِيبٍ فِيهِ صُفْرَةٌ، خَلُوقٌ أَوْ غَيْرُهُ، فَدَهَنَتْ مِنْهُ جَارِيَةً، ثُمَّ مَسَّتْ بِعَارِضَيْهَا، ثُمَّ قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِى بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: « لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ». ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ حِينَ تُوُفِّىَ أَخُوهَا فَدَعَتْ بِطِيبٍ فَمَسَّتْ مِنْهُ، قَالَتْ: وَاللَّهِ مَا لِى بِالطِّيبِ مِنْ حَاجَةٍ غَيْرَ أَنِّى سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ عَلَى الْمِنْبَرِ: « لاَ يَحِلُّ لاِمْرَأَةٍ تُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ تُحِدُّ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ، إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا ». قَالَتْ زَيْنَبُ: سَمِعْتُ أُمِّى أُمَّ سَلَمَةَ تَقُولُ: جَاءَتِ امْرَأَةٌ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ ابْنَتِى تُوُفِّىَ عَنْهَا زَوْجُهَا وَقَدِ اشْتَكَتْ عَيْنُهَا، أَفَنَكْحُلُهَا؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ »، (مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاَثًا، كُلَّ ذَلِكَ يَقُولُ: لاَ)، ثُمَّ قَالَ: « إِنَّمَا هِىَ أَرْبَعَةُ أَشْهُرٍ وَعَشْرٌ. وَقَدْ كَانَتْ إِحْدَاكُنَّ فِى الْجَاهِلِيَّةِ تَرْمِى بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ ». قَالَ حُمَيْدٌ: قُلْتُ لِزَيْنَبَ: وَمَا تَرْمِى بِالْبَعَرَةِ عَلَى رَأْسِ الْحَوْلِ؟ فَقَالَتْ زَيْنَبُ: كَانَتِ الْمَرْأَةُ إِذَا تُوُفِّىَ عَنْهَا زَوْجُهَا دَخَلَتْ حِفْشًا وَلَبِسَتْ شَرَّ ثِيَابِهَا، وَلَمْ تَمَسَّ طِيبًا وَلاَ شَيْئًا حَتَّى تَمُرَّ بِهَا سَنَةٌ ثُمَّ تُؤْتَى بِدَابَّةٍ حِمَارٍ أَوْ شَاةٍ أَوْ طَيْرٍ فَتَفْتَضُّ بِهِ، فَقَلَّمَا تَفْتَضُّ بِشَىْءٍ إِلاَّ مَاتَ، ثُمَّ تَخْرُجُ، فَتُعْطَى بَعَرَةً فَتَرْمِى بِهَا، ثُمَّ تُرَاجِعُ بَعْدُ مَا شَاءَتْ مِنْ طِيبٍ أَوْ غَيْرِهِ». ١٤٨٩/٥٨ م {الحديث: ٣٧٠٩ = ٣٧٠٥ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٦ = ٥٣٣٨، ٥٧٠٦ + تجريد/٢، رقم: ٦١٤ = ١٢٨١، ١٢٨٠، ١٢٨٢، ٥٣٣٥. أبو داود. طلاق: ٢٢٩٩. ترمذي. طلاق: ١١٩٥. نسائي. طلاق: ٣٥٠٠، تحفة/١٥٨٧٤}:

حەمیدی کوڕی نافیع (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: زەینەبی کچی ئەبو سەلەمە (ڕەزای خودایان لێ بێ) ئەم سێ فەرموودەیەی بۆم گێڕایەوە، فەرمووی:

١- کاتێ ئەبو سوفیان مرد، کە باوکی ئوم حەبیبە بوو، کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) چووم بۆلای ئوم حەبیبە، بەم بۆنەیەوە، روانیم ئوم حەبیبە داوای بۆنێکی گیراوەی کرد، کەمێ زەعفەرانی تیابوو، جا هەردوو دەستی کرد بەناویداو ئینجا دەستی سووی بەهەردوو لاڕوومەتی خۆیاو بۆنی دا لەخۆی‌و تازێی شکاندو گوتی: بەو خودایەی کەهەر خۆی خودایە، هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەڵام لەبەرئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە لە پێغەمبەرم بیست لەسەر دوانگە دەیفەرموو: (ئەو ژنەی کەباوەڕی بەخوداو بەڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ پتر ماتەم بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد، کە دەبێ بۆ ئەو چوار مانگ‌و دەشەو تازێباربێ).

٢- زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: چووم بۆلای زەینەبی کچی جەحشیش، بەبۆنەی مردنی براکەیەوە، دیم کەئەویش داوای گوڵاوی کردو دای لەخۆی‌و فەرمووی: بەخودا هیچ کارێکم بەبۆنی خۆش نییە، بەڵام لەبەرئەوە بەکاری دەهێنم، چونکە بۆ خۆم لە پێغەمبەرم بیست لەسەر دوانگە (مینبەر) دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەو ژنەی کە ئیمان‌و باوەڕی بەخوداو بە حسێب‌و لێپرسینەوەی ڕۆژی دوایی هەیە، دروست نییە بۆی کە لەسێ ڕۆژ زیاتر تازێ بگرێ بۆ مردوو، مەگەر بۆ مێرد کەدەبێ بۆئەو چوار مانگ‌و دەشەو تازێباربێ).

٣- زەینەب (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئوم سەلەمەی دایکیشم بیست دەیفەرموو: ژنێ هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! کچەکەم مێردەکەی مردووەو چاویشی دێشێ، ئایا چاوی بڕێژێ؟ فەرمووی: (نەء) دووجار یاسێ جار، لەسەریەك، هەموو جارێ دەیفەرموو: (نەء) ئینجا فەرمووی: (خۆی تەنیا چوار مانگ‌و دەشەوە، کەچی ئێوە هێشتا پەلەپەلی لێ

دەكـەن‌و دەتانـەوێ لێـی بدزنـەوە، بـەڵام جـاران لەسـەردەمی نەزانیـدا لـەپاش تێپەڕبوونی ساڵێ، ئەوسا پشقلەكەتان فڕێ دەدا.

حومەیـد (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەڵـێ: بەزەینـەبم گـوت: لـەپاش تێپـەڕبوونی سـاڵێ ئەوسا پشقلەكەتان فڕێ دەدا واتای چی؟ فەرمووی: جاران ژن كەمێردەكەی دەمـرد دەچـووە نـاو كولبەیەكـەوەو جلكێكـی زۆر خراپـی لەبـەر دەكـرد، وەبـۆنی خـۆش‌و گـوڵاوو شـتی وای لـەخۆی نـەدەدا، جـا تاسـاڵێ دەڕۆیـی ئەمـە حـاڵی بـوو، ئـەوجا دەعبایەكیان بۆدەهێنا، كـەرێ، یامـەڕێ، یـا مـەلێكیان دەهێنـا بـۆی، خـۆی پـێ پـاك دەكردەوەو، وەڵێ بەدەگمەن رێ دەكەوت كە ئـەو ژنـە خـۆی بەشـتێ پـاك بكاتـەوەو ئەوشتە لەبەر ئەو پیسی‌و پۆخڵییەی نەمرێ، یا مردار نەبیتەوە!

ئینجا ژنەكە لە كوڵبەكەی دەهاتە دەرەوەو پشقلێكیان دەدایـە دەسـتی، ئـەویش پشقلەكەی توور دەدا، ئیتر عیددەی تەواو دەبوو، وەتـازێی دەشـكاندو ئەوسـا ئەگـەر ئارەزووی ببوایـە وەك جـارانی بـۆن‌و گـوڵاوو شـتی وای بەكاردەهێنایـەوە. {تـاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٧ – ش/د/ت/ن}.

### ٦٧٢) ژنی ماتەمدار بۆنی خۆش‌و بۆیەو سورو سپیاوو جل‌وبەرگی رەنگاو رەنگ‌و رەنگراو نابێ بەكاربهێنێ. (٣٧٠٩ - ٣٧٢٢)

### باب: ترك الطِّيبِ والصِّبَاغِ للمرأة الحَادِّ

٨٦٤- عَنْ أُمِّ عَطِيَّةَ (رضى الله عنها) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تُحِدُّ امْرَأَةٌ عَلَى مَيِّتٍ فَوْقَ ثَلاَثٍ إِلاَّ عَلَى زَوْجٍ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍ وَعَشْرًا، وَلاَ تَلْبَسُ ثَوْبًا مَصْبُوغًا إِلاَّ ثَوْبَ عَصْبٍ، وَلاَ تَكْتَحِلُ، وَلاَ تَمَسُّ طِيبًا، إِلاَّ إِذَا طَهُرَتْ نُبْذَةً مِنْ قُسْطٍ أَوْ أَظْفَارٍ ». {الحديث: ٣٧٢٠ = ٣٧١٦ فم. تجريد/١، رقم: ٢٠٥ = ٣١٣ + ٢٠٦ = ٣١٤، ٣١٥، ٧٣٥٧}:

ئـوم عـەتیێ (رەزای خودای لێ بێ) دەفـەرموێ: پێغەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفـەرموێ: (دروست نییە بۆژن كە لەسێ رۆژ زیاتر ماتەم بگرێ بـۆ مـردوو، مەگـەر بـۆ مێـرد، كەدەبێ چوار مانگ‌و دەشەو تازێبارێ بۆی، وەهەروەها نابێ جل‌و بەرگی رەنگین،

یا رەنگكراو لەبەربكا، مەگەر بەرگێ كە لەپێشا رەنگ كرابێو لەپاشا چنرابێ، وەنابێ چاو برێژێ، یابۆنی خۆش بەكاربهێنێ، بەلاّم كاتێ پاك دەبێتەوە لە بێنوێژیی، كەویستی خۆی بشۆرێ، رێگەی ئەوەی پێ دراوە كە بەقەد پێویست عودو گولاّو نەختێ بۆوانێك بەكاربهێنێ، تا بۆنە ناخۆشەكەی نەمێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٩، ژمارە: ٢٢٧٨، ٢٢٧٧}.

**پوختەی فەرموودەكانی نامەی ژن تەلاّقدانو عیددەی شەرعی ژنان**:

١. ژنی بێنوێژ چۆن تەلاّق دەدرێ.
٢. چەند نموونەیێ لەگێڕانەوەی ژنی تەلاّقدراو بۆژێر ركێفی مێرد لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا.
٣. سێ تەلاّقە لەسەردەمی پێغەمبەرا هەبووە یانا، وەچۆن بووە، وە ئەگەر بووەو رووی داوە بەچەند تەلاّق دانراوە؟ ئایا دروستە كە بگوترێ: (ئیمامی عومەر سێ تەلاّقەی داهێناوە؟).
٤.ژن كە سێ تەلاّقە درا، فڕی مێردی پێوە نامێنێ، هەتا شوویەكی ئاسایی تر، نەكاتەوەو مێردە نوێكەی بەدەستی نەگرێو خۆشی جووتبوون لەیەكتر نەچێژنو ئەوسا مێردی نوێ بمرێ یا تەلاّقی بدا، دروستە بەگرێبەستێكی نوێ سەرلەنوێ شووبكاتەوە بەمێردی كۆنی!
٥. لەخزمەت پێغەمبەردا، بە ئامادەبوونی پیاوانی بیانی، ژنان پرسیاری شەرماوییان كردووەو وەسفی چووكی مێردی خۆیان كردووە. بۆمەبەستی رەوای شەرعی، پێغەمبەریش لێی نەگرتوونو بەلكوو وەلاّمی گونجاویشی داونەتەوە، كە وەلاّمەكەیش خالّی نییە، لەباسكردنی شتی شەرماوی، تەنانەت جاری وادەبوو كە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) شەرم دەیگرت، یا لەسەیریو عەنتیكەیی رووداوو پرسەكە پێدەكەنی.
ئەمەیش بەلگەیەكی روونو ئاشكرایە لەسەر:

أ/ وێنەو پەیکەرو باسکردنی کۆئەندامی زاوزێی نێرومێ، ئەگەر لەبەر مەبەستێکی ڕەوابێ دروستە، بگرە ئەگەر بەبێ ئەوانە، مەبەستە شەرعییەکان ڕوون نەدەبوونەوە، ئەوە نەك هەر دروستەو بەس بەڵکوو پێویستە.

ب/ کرداری جووتبوون ناوکۆییە لەنێوانی ژنو مێرددا، ژنیش مافی خۆیەتی خوازەی سروشتیی خۆی دابین بکا.

٦. حەڵاڵی خوا، ژن بێ، جلو بەرگ بێ، خواردنەوەو خواردن بێ، بەقسەی خلەو بلە حەرام نابێ، بەڵام گەلێ جار ئەو جۆرە قسەیە لەسەر خاوەنەکەی دەکەوێ، دەبێ باجی بدا، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا پێی دەگوترێ کەفارەت، هەتا مرۆڤ بزانێ: (کە زۆرینەی کات گوتاریش وەك کردار کاریگەریی خۆی هەیەو مرۆڤ لێیان بەرپرسیارە!).

٧. کێشەی ناو خێزان، گەلێ جار لەشتێکی بچکۆلەوە دەست پێ دەکا، ئەگەر بەهێمنیو دانایی چارەسەر نەکرێ ئاژاوەیەکی گەورەی لێ بەرپا دەبێ، ئەو نموونانەی لەم بابەتە، کە لە فەرموودەکانی ژمارە: (٨٥٣، ٨٥٤، ٨٥٥، ٨٥٦، ٨٥٧)دا، هاتوون سەرمەشقو پەندو ئامۆژن بۆ ئێمەی گەلی ئیسلام، کە سەبارەت بە ئاژاوەی ناو خێزان هۆشیارو چاوکراوە بین، لەڕاستیدا هۆکاری زۆرینەی حاڵەتی جیابوونەوەی ژنو مێرد لەیەکتر، لەناو سەرجەمی گەلی ئیسلاما، لە هەوەڵەوە هەتا ئێستاو لەمەو دوایش، تێنەگەیشتنە لەم جۆرە نموونانە، لەبارو دۆخی تایبەتی ناو خێزانەکانی پێغەمبەر، کە لە قورئانو سوننەتدا ڕوونکراونەتەوە.

٨. دیارە کە مەبەستی سەرەکی لە هاوسەرییو ژنو مێردیی، دوو ئامانجی گەورەن:

أ/ خێزان سەرچاوەی کۆمەڵە، ژنو مێرد بەردی بناغەی خێزانە، ئەو هۆکارە سەرەکییەی ژنو مێرد وەك چەشە ڕادەکێشێ بۆلای یەکترو بەکەمەندی هاوسەرێتی شەتەکیان دەدا بەیەکەوە: ئەو مەیلە سروشتیە خواکردەیە کە نێرو مێ ڕام دەکا بۆ یەکتری، کە بریتییە لەو خۆشیە کاتیەی، کە لەدوو تویێ تاریکیو

دوو بەدوویی دا، زەماوەند دەکەن‌و دەبن بەدووگیان لەیەك جەستەدا (ئەمە: موقەددیمەی یەکەمە، کە پێشینەیەکی پیرۆزە).

ب/ دروستبوونی وەچەو نەوەو کۆمەڵگاو بەردەوامی رەورەوەی ژیان، لەسەر ئەو بەرنامەو سیستمە جوانەی کە خوای گەورە نەخشەی بۆ کێشاوەو رەزای لەسەریەتی (ئەمە: موقەددیمەی دووەمە).

جا وەکوو ئەنجامێ بۆ ئەم دوو موقەددیمەیە، ئەو منداڵەی کە دروست دەبێ لەنێوانی ژن‌ومێردا، دەبێ هەریەکەیان دڵنیابێ لە رۆڵی خۆی لە دروستبوونیدا، تا دایبنێ بە جگەر گۆشەی خۆی‌و واهەست بکا کە پارچەیەکە لەخۆی‌و بە پێڵووی چاو پارێزگاری لێ بکا، دەی عیددە لەگەڵ داوێنپاکی، دوو هۆن کە سێهەمیان نییە، کە ئەم مەبەستە، بەلایەنی کەمەوە بۆ پیاو دابین دەکەن‌و ئەوکاتە کە ژن‌و مێرد دڵنیا بوون لەوە کە منداڵ منداڵی هەردوکیانەو هەرکەس بە ئەرکی سەرشانی خۆی هەڵساوە، بۆ پیادەکردنی بەرنامەی پیرۆزی خوایی، ئەوکاتە منداڵ دەبێ بە ئاوێنەیەکی بالا نوما، هەم ژن، هەم مێرد خۆی تیا دەبینێ. زمانحاڵیان دەڵێ:

لە ئاوێنەی رووت کورپەم! خۆم بینی

نازانم من تۆم یاخۆ تۆ منی!

٩. عیددەی ژنی دووگیان بەدانانی سکەکەیەتی، هەندێ دەفەرموون: بەدرێژترینی ئەو دوو ماوەیە کە بۆی دانراوە: لەدانانی سك‌و لەچوار مانگ‌و دەشەو، واتە: ئەگەر سکەکەی بەزیاتر لەچوار مانگ‌و دەشەو دانا، ئەوا عیددەی بەدانانی سکەکەیەتی، بەڵام ئەگەر سکەکەی بەکەمتر لەچوار مانگ‌و دەشەو دانا، ئەوا عیددەی بەچوار مانگ‌و دەشەوە کە (أبْعَدُ الأجَلَيْنِ)ە.

١٠. ژن لەکاتی عیددەدا، بۆکاری رەوای خۆی مافی دەرچوونی لەماڵ هەیە، وەك ئەوە بچێ بۆ باخ رنین، یاترسی هەبێ کە تووشی کێشەیێ ببێ. هەندێ دەڵێن: مافی ئەوەی نییە.

١١. كە عیددە تەواو بوو، ژن ئازادو سەربەستە لەکردنی هەموو شتێکی ڕەوا، هەروەها دەتوانێ شووبکاتەوە.

١٢. پرسو راو راوێژکردن بە مرۆڤی باش لەکاتی خوازبێنیدا زۆر پەسەندو ڕەواو بەجێیە.

١٣. لەکاتی تازێباریو ڕەشپۆشیدا، خۆڕازانەوەو بەرگی زەرقیو بەرقی حەرامە، هەروا چاو رشتنو سپیو سووراو کردنو ماکیاج کردنو بۆنی خۆش بەکارهێنانو شووکردنو خوازبێنی.

١٤. بۆ مێرد تازێباری چوار مانگو دەشەوە، یادانانی سکە، ئەگەر بەچوار مانگو دەشەو زیاتر سکەکەی دانا، بۆ مردووی تر سێ رۆژەو بەس، سوننەتە بەکارهێنانی بۆنی خۆش لەپاش سێ رۆژ تازێ بشکێنێ، بەتایبەتی بۆژن.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ١٤- نامەی شەرە نەفرین (لیعان) كتابُ اللعانِ

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٢٨٨، لاپەڕە: ٧٧٧ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠ هەتا ٢٢٥١ + تجرید/٤، ژمارە: ١٦٧٥ هەتا ١٦٧٦ = تەفسیری سوورەتی نوور}.

## ٦٧٣) كەسێ بەسەر ژنەكەیەوە پیاوێ بگرێ (٣٧٢٣ - ٣٧٤٨)

٨٦٥- عَنِ سَهْلَ بْنَ سَعْدٍ السَّاعِدِيَّ (رضى الله عنـه): أَخْبَرَهُ أَنَّ عُـوَيْمِرًا الْعَجْلاَنِـيَّ جَاءَ إِلَى عَاصِمِ بْنِ عَدِيِّ الأَنْصَارِيِّ فَقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ يَا عَاصِمُ لَوْ أَنَّ رَجُلاً وَجَدَ مَـعَ امْرَأَتِـهِ رَجُلاً أَيَقْتُلُهُ، فَتَقْتُلُونَهُ، أَمْ كَيْفَ يَفْعَلُ؟ فَسَلْ لِى عَنْ ذَلِكَ يَا عَاصِمُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَسَأَلَ عَاصِمٌ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَكَرِهَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَسَائِلَ وَعَابَهَا حَتَّى كَبُرَ عَلَى عَاصِمٍ مَا سَمِعَ مِـنْ رَسُـولِ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا رَجَعَ عَاصِمٌ إِلَى أَهْلِهِ جَاءَهُ عُوَيْمِرٌ فَقَالَ: يَا عَاصِمُ مَاذَا قَالَ لَـكَ رَسُـولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ عَاصِمٌ لِعُـوَيْمِرٍ: لَـمْ تَـأْتِنِى بِخَيْـرٍ، قَـدْ كَـرِهَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَسْأَلَةَ الَّتِى سَـأَلْتُهُ عَنْهَـا، قَـالَ عُـوَيْمِرٌ: وَاللَّـهِ لاَ أَنْتَهِـى حَتَّـى أَسْأَلَهُ عَنْهَا. فَأَقْبَلَ عُوَيْمِرٌ، حَتَّى أَتَى رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم) وَسَـطَ النَّـاسِ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ رَجُلاً وَجَدَ مَعَ امْرَأَتِـهِ رَجُـلاً أَيَقْتُلُـهُ فَتَقْتُلُونَـهُ أَمْ كَيْـفَ يَفْعَـلُ؟. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « قَـدْ نَـزَلَ فِيـكَ وَفِـى صَـاحِبَتِكَ، فَاذْهَـبْ فَـأْتِ بِهَا». قَالَ سَهْلٌ فَتَلاَعَنَا وَأَنَا مَعَ النَّاسِ عِنْدَ رَسُـولِ اللَّـهِ (صـلى الله عليـه وسـلم)، فَلَمَّـا فَرَغَا، قَالَ عُوَيْمِرٌ: كَذَبْتُ عَلَيْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنْ أَمْسَكْتُهَا، فَطَلَّقَهَا ثَلاَثًـا قَبْـلَ أَنْ يَـأْمُرَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). قَالَ ابْنُ شِهَابٍ: فَكَانَـتْ سُـنَّةَ الْمُتَلاَعِنَـيْنِ. {الحديث: ٣٧٢٣ = ٣٧١٩ فـم. تجريـد/٤، رقـم: ١٦٧٥ = ٤٧٤٥، ٤٢٣، ٤٧٤٦، ٥٢٥٩-٥٣٠٨-٦٨٥٤-٧١٦٥-٧١٦٦-٧٣٠٤. أبـو داود. طـلاق: ٢٢٤٥. نسـائى. طـلاق: ٣٤٠٢. ابـن ماجة. طلاق: ٢٠٦٦. تحفة الأشراف: ٤٨٠٥}:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عوومەیمیری عەجلانی هات بۆلای عاصیمی کوڕی عەدی ئەنصاری، کە سەرۆك خێڵی عەجلان بوو (ڕەزای خودایان لێ بێ) پێی گوت: ئەی عاصیم! پێم بفەرموو: پیاوێ پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە بگرێت ئەگەر دەیکوژێ ئێوە دەیکوژنەوە، ئەگەر نایکوژێ ئەی چی فوڕێ بەسەر خۆیدا بکا؟ ئەی عاصیم! ئەم پرسیارەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆبکە، عاصیم چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پرسیارەکەی لێی کرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم جۆرە پرسیارانەی پێ ناخۆش بوو، بەڵکوو بەشوورەیی دانا، تەنانەت ئەو وەڵامەی کە عاصیم لەم بارەیەوە لە پێغەمبەری بیست کارێکی ئەستەم‌و قورس‌و گران بوو لەسەر شانی عاصیم.

کاتێ عاصیم گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی، عوومەیمیر چوو بۆلای‌و پێی گوت: ئەی عاصیم! پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چی فەرموو؟ عاصیم پێی گوت: خێرم نەدی لێت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەڵامی نەدایەوە، حەزی لەم پرسیارە نەبوو کەمن لێیم کرد، سەبارەت بەژنەکەی تۆ، عوومەیمیر فەرمووی: بەخودا کۆڵ نادەم، هەتا لەمبارەیەوە بۆخۆم لە پێغەمبەر نەپرسم، جا عوومەیمیر بۆخۆی ڕۆیشت، کەچووە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو کۆمەڵێ خەڵکا بوو، عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! پیاوێ پیاوێك بەسەر ژنەکەیەوە بگرێ چی بکا، ئەگەر دەیکوژێ ئێوە بە قەصاص دەیکوژنەوە، گوایە پیاوێکی کوشتووە دەبێ بکوژرێتەوە لەجیاتی ئەو، ئەگەر نەشی کوژێ ئەی چی بکا؟ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (خودای گەورەو سەروەر، سەبنارەت بەبابەتی تۆو ژنەکەت ئایەتی قورئانی ناردۆتە خوارەوە، بڕۆ ژنەکەت بهێنە!).

سەهل فەرمووی: من لەناو خەڵکەکەدا بووم، لەخزمەت پێغەمبەر، کە فەرمانی بەهەردوکیان کرد، بە ژن‌و بەپیاوەکەی لەناو مزگەوتا شەڕە نەفرینیان کرد، بەپێی ئەو دەستوورەی کە خودا لە قورئاندا دیاریکردووە، لەئایەتی شەشەما لە سوورەتی نوور، کاتێ عوومەیمیر و ژنەکەی لە شەڕە نەفرینەکە لێ بوونەوە،

عوومیر گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر ئەم ژنە لەپاش ئەم ڕووداوو کەین‌و بەینەو ئابڕووچوونە قەبووڵ بکەمەوە، ئەوە واتای وایە کەمن بوختیانم بۆیکردووە، ئیتر سێبەسێ تەڵاقی دا، بەرلەوەی کە پێغەمبەر فەرمانی پێ بکاو پێی بڵێ کە تەڵاقی بدا، ئیبنو شەهاب دەفەرموێ: ئیتر لەدوا ئەو ژن‌و مێردە، جیابوونەوەو تەڵاق بوو بەباوو دەستوور لەنێوان ئەو ژن‌و مێردانەدا کە شەڕە نەفرین دەکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠، ٢٢٥١}.

٨٦٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ: قَالَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ (رضى الله عنه): يَا رَسُولَ اللَّهِ: لَوْ وَجَدْتُ مَعَ أَهْلِي رَجُلاً لَمْ أَمَسَّهُ حَتَّى آتِيَ بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاءَ؟! قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ ». قَالَ: كَلاَّ وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ، إِنْ كُنْتُ لأُعَاجِلُهُ بِالسَّيْفِ قَبْلَ ذَلِكَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « اسْمَعُوا إِلَى مَا يَقُولُ سَيِّدُكُمْ، إِنَّهُ لَغَيُورٌ، وَأَنَا أَغْيَرُ مِنْهُ، وَاللَّهُ أَغْيَرُ مِنِّي ». {الحديث: ٣٧٤٢ = ٣٧٣٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: سەعدی کوڕی عوبادە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! بەپێی ئایەتی حەددی بوختیان بۆ ژنی مەردبێ، دەبێ بوختیانکار چوار شایەت لەسەر ژنەکە ڕاست بکاتەوە، دەنا داری حەددی لێ دەدرێ، من دەزانم کە ئەمە بڕیاری خودایەو بڕیاری خودایش دروسمتەو لاریم لەوەنییە، بەڵام سەرم لەمە دەرناچێ: گریمان من زەلامێ بەسەر ژنەکەمەوە بگرم‌و دەستی بۆنەبەم‌و بچم بەدوای چوار شایەتا بگەڕێم‌و بڵێم وەرن شایەتیم بۆبدەن کە ژنەکەم خەریکی داوێنپیسییە، ئایا شتی وا کاری کردنییە؟! پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەڵێ دەبێ چوارشایەت ڕاست بکەیتەوە، دەنا دادەنرێی بە بوختانچی‌و حەددی بوختیانت لێ دەدرێ!).

سەعدیش فەرمووی: فەرمانی خوداو پێغەمبەری خودا لەسەر سەروچاوە، ئێمە لاریمان لەمە نییە، بەڵام بەوخودایە ڕاست‌و دروستەی کەتۆی کردووە بە پێغەمبەرو ئەم ئایینە پیرۆزەی پیادا ناردووی، پیاو نییە لەباروداۆخێکی ئاوا ئاڵۆزو ڕق‌و تووڕەیەی ورووژێنا خۆی پێ بگیرێ‌و ئەقڵ‌و هۆشی لەلا بمێنێ‌و گوێ

بەگوناهو شتی وابدا، دەسا من بەش بەحاڵی خۆم ئەگەر شتی وام لێ بقەومێ، بەر لەهەموو شتێ، بەزەبری شمشێر شەرعی خۆمی لەگەڵا دەکەم!!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوێ لەئاغاتان بگرن!! بەڕاستی قسەکەی سەیرە، بەڕاستی بۆیە وادەڵێ چونکە بەغیرەتو بەناموسە، دەسا من لەویش زیاتر بەتەنگی ناموسەوە دێم، خودایش لەمن پتر). {تاج/٢، زنجیرە: ٥٧، ژمارە: ٢٢٠٢، ٢٢٠٣، ٢٢٠٤}.

٨٦٧- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: سُئِلْتُ عَنِ الْمُتَلاَعِنَيْنِ فِى إِمْرَةِ مُصْعَبٍ: أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: فَمَا دَرَيْتُ مَا أَقُولُ، فَمَضَيْتُ إِلَى مَنْزِلِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) بِمَكَّةَ، فَقُلْتُ لِلْغُلاَمِ: اسْتَأْذِنْ لِى، قَالَ: إِنَّهُ قَائِلٌ، فَسَمِعَ صَوْتِى، فَقَالَ: ابْنُ جُبَيْرٍ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: ادْخُلْ فَوَاللَّهِ مَا جَاءَ بِكَ هَذِهِ السَّاعَةَ إِلاَّ حَاجَةٌ، فَدَخَلْتُ، فَإِذَا هُوَ مُفْتَرِشٌ بَرْذَعَةً، مُتَوَسِّدٌ وِسَادَةً حَشْوُهَا لِيفٌ، قُلْتُ: الْمُتَلاَعِنَانِ أَيُفَرَّقُ بَيْنَهُمَا؟ قَالَ: سُبْحَانَ اللَّهِ! نَعَمْ، إِنَّ أَوَّلَ مَنْ سَأَلَ عَنْ ذَلِكَ فُلاَنُ بْنُ فُلاَنٍ، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: أَرَأَيْتَ أَنْ لَوْ وَجَدَ أَحَدُنَا امْرَأَتَهُ عَلَى فَاحِشَةٍ كَيْفَ يَصْنَعُ؟ إِنْ تَكَلَّمَ تَكَلَّمَ بِأَمْرٍ عَظِيمٍ، وَإِنْ سَكَتَ سَكَتَ عَلَى مِثْلِ ذَلِكَ. قَالَ: فَسَكَتَ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم) فَلَمْ يُجِبْهُ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ ذَلِكَ أَتَاهُ، فَقَالَ: إِنَّ الَّذِى سَأَلْتُكَ عَنْهُ قَدِ ابْتُلِيتُ بِهِ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ هَؤُلاَءِ الآيَاتِ فِى سُورَةِ النُّورِ: (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ)، فَتَلاَهُنَّ عَلَيْهِ، وَوَعَظَهُ وَذَكَّرَهُ وَأَخْبَرَهُ أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، قَالَ: لاَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ مَا كَذَبْتُ عَلَيْهَا، ثُمَّ دَعَاهَا فَوَعَظَهَا وَذَكَّرَهَا وَأَخْبَرَهَا أَنَّ عَذَابَ الدُّنْيَا أَهْوَنُ مِنْ عَذَابِ الآخِرَةِ، قَالَتْ: لاَ وَالَّذِى بَعَثَكَ بِالْحَقِّ إِنَّهُ لَكَاذِبٌ، فَبَدَأَ بِالرَّجُلِ، فَشَهِدَ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ لَعْنَةَ اللَّهِ عَلَيْهِ إِنْ كَانَ مِنَ الْكَاذِبِينَ، ثُمَّ ثَنَّى بِالْمَرْأَةِ، فَشَهِدَتْ أَرْبَعَ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الْكَاذِبِينَ، وَالْخَامِسَةُ أَنَّ غَضَبَ اللَّهِ عَلَيْهَا إِنْ كَانَ مِنَ الصَّادِقِينَ، ثُمَّ فَرَّقَ بَيْنَهُمَا. {الحديث: ٣٧٢٦ = ٣٧٢٢ فم}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی ئەمیریی موصعەبی کوڕی زوبەیردا، پرسیارم لێکرا، لەبارەی ئەو ژنو مێردەوە، کە لەنێوانی

خۆياندا، شەڕە نەفرین دەكەن، ئایا لەیەكتری جیادەكرێنەوە یانا؟ منیش نەمزانی بڵێم چی، جا رۆیشتم بۆماڵی عەبدوڵلای كوڕی عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) لە مەككە، بە نۆكەرەكەم گوت: مۆڵەتم بۆ وەربگرە دەچم بۆ خزمەتی، خوڵامەكە گوتی: خەوتووە، بەڵام ئیبنو عومەر گوێی لەدەنگم بوو، فەرمووی: ئەوە سەعیدی كوڕی جوبەیرە؟ گوتم: بەڵێ ئەوم، فەرمووی: وەرە ژوورەوە، بەخودا وادیارە، لەمكاتی وچانەدا، بە بەلاش نەهاتووی، كارێكی گرنگ تۆی هێناوە، كاتێ كە چوومە ژوورەوە، دەڕوانم والەسەر جلە وشترێ دانیشتووە، لەسەر پشتییەك شانی دادابوو، كە ناواخنەكەی ریشووی دارخورما بوو، عەرزیم كرد: ئایا ئەو ژنو مێردەی كە شەڕە نەفرینو مولاعەنە دەكەن لەیەكتری جیادەكرێنەوە یانا؟

فەرمووی: سوبحانەڵلا! ئەی چۆن جیاناكرێنەوە، بەڵێ جیادەكرێنەوە، یەكەم كەس كەلەم شتەی پرسی، فیسارە كەسی كوڕی فیسارە كەس بوو، هاتە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی كرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێم بفەرموو گریمان كەسێ بچێ بەسەر ژنەكەیا خەریكی داوێن پیسییە، چاری چییە؟ ئەگەر قسەدەكا هەروەی، ئەگەر قسەناكا هەروەی، یەك لەیەك دیژوارترو سەخت تر. فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) خامۆش بوو، وەڵامی نەدایەوە، جادوای ئەم جارە، پیاوەكە جارێ تریش هاتەوە، عەرزیكرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەو پرسیارەی كەجاری پێشوو عەرزم كردی بەسەر خۆم هاتووە، جا خودای گەورەو سەروەر ئەم چوار ئایەتەی ناردە خوارەوە كەوان لە سوورەتی نووردا: {وَالَّذِينَ يَرْمُونَ أَزْوَاجَهُمْ وَلَمْ يَكُن لَّهُمْ شُهَدَاء إِلَّا أَنفُسُهُمْ فَشَهَادَةُ أَحَدِهِمْ أَرْبَعُ شَهَادَاتٍ بِاللَّهِ إِنَّهُ لَمِنَ الصَّادِقِينَ – ٢٤/النور/الآيات – ٦-٩}.

واتە: ئەو مێردانەی كە بەدەمی خۆیان تۆمەتی حیزێتی دەدەن لەژنەكانیانو جگە لەخۆیان شایەتو بەڵگەی تریان نییە، ئەوە بۆ چەسپاندنی ئەم داوایە دەبێ خۆی لەلای قازی، لەناو كۆمەڵێكا، چوارجار شایەتی بدا: بڵێ: شایەتی دەدەم بەخودا كەمن راست دەڵێم لەوەدا كە دەیڵێم بەژنەكەم، وەكوو داوێنپیسی بێ. وە

ئەگەر ویستی حاشا لە هاوپشتیو باوکێتیی منداڵەکەیشی بکا، ئەوا لەهەموو شایەتییەکانیدا بڵێ: وە ئەو منداڵەیش کە لەلای ژنەکەیە لەمن نییە. وە بۆجاری پێنجەم بڵێ: لەعنەتو نەفرەتو نەفرینی خودام لەسەربێ ئەگەر درۆبکەم لەم وەپاڵدان (نسبت)ەدا.

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئایەتەکانی بەسەر پیاوەکەدا خوێندەوەو سەبارەت بە بوختانی واگەورە پەندو ئامۆژگاری کردو زۆرشتی یادخستەوەو هەواڵی ئەوەیشی پێدا: کەسزای دونیا هەرچۆن بێ زۆر ئاسانترە لەسزای سەختی رۆژی دوایی، قەبووڵی داری حەددی بوختیان، زۆر ئاسانترە لە تۆڵەی سەختی دۆزەخ، پیاوەکەیش گوتی: سوێندم بەو کەسە کەخودای گەورەیە، کەتۆی بەم شەریعەتە پیرۆزەوە رەوانەکردووە بۆسەر بەرەی ئادەمیو جنۆکە بوختیانم بۆ ئەو ژنەی خۆم نەکردووە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ژنەکەشی بانگ کردو هەمان پەندو ئامۆژگاری ئەویشی کردو پێشی فەرموو کە قەبووڵی حەددی داوێنپیسی گەلێ ئاسانترە لەچەشتنی سزای ئاگری سووری دۆزەخ، بەلام ژنەکەیش نەچووە ژێریو گوتی: ناڕاست ناکا، بەوکەسەی کەتۆی رەوانە کردووەو کردوویەتی بە پێغەمبەری خودا، ئەو مێردەی من درۆدەکاو شەڵتاخم پیادەکا.

ئەوسا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کرداری شەڕە نەفرینەکەی جێبەجێ کرد لەنێوانیان، لەپێشا بە پیاوەکە دەستی پێکردو چوارجار خودای کرد بەشایەت کە لەم تۆمەتەدا راست دەکا، لەجاری پێنجەما گوتی: لەعنەتی خودام لێ بێ ئەگەر لەم شایەتییەمدا بوختیانی درۆ بۆ ئەم ژنەی خۆم بکەم، ئەوجا دووەم کەس بەژنەکە دەستی پێکرد، چوارجار گوتی خودا دەکەم بەشایەت کە ئەم مێردەی من درۆدەکاو شەڵتاخم پیادەکا، لەشایەتی پێنجەما گوتی: خەشمو قارو غەزەبی خودام لێ بێ ئەگەر ئەو مێردەی من راست بکا، لەم شایەتییەی کە لەسەر منیدا. ئیتر پاش ئەم شەڕە نەفرینە، پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) لە یەکتری جیاکردنەوەو بڕیاری دا، کە پیاوو ژنەکە فریان بەسەر یەکترییەوە نەماوە. {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٧}.

٨٦٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِلْمُتَلاَعِنَيْنِ: « حِسَابُكُمَا عَلَى اللَّهِ، أَحَدُكُمَا كَاذِبٌ، لاَ سَبِيلَ لَكَ عَلَيْهَا »، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَالِى؟ قَالَ: « لاَ مَالَ لَكَ، إِنْ كُنْتَ صَدَقْتَ عَلَيْهَا فَهْوَ بِمَا اسْتَحْلَلْتَ مِنْ فَرْجِهَا، وَإِنْ كُنْتَ كَذَبْتَ عَلَيْهَا فَذَاكَ أَبْعَدُ لَكَ مِنْهَا ». {الحديث: ٣٧٢٧ = ٣٧٢٤ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٥ = ٥٣١٢، ٥٣١١، ٥٣٤٩، ٥٣٥٠. أبو داود. طلاق: ٢٢٥٧. نسائى. طلاق: ٣٤٧٦. تحفة الأشراف/٧٠٥١} :

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **بەو ژن‌و مێردەی فەرموو، کە لەناو مزگەتەکەی پێغەمبەردا، شەڕە نەفرینیان کرد: حیساب‌و لێپرسینەوەتان لەودنیا لەسەر خودایە، لەم دنیا خوانەبێ کەس نازانێ کامتان راست دەکەن‌و کامتان درۆ دەکەن، دیارە کەئێوە یەکێکتان درۆ دەکەن، ئەی مێرد! ئیتر ئەم ژنە لەژنی تۆ دەرچوو، وەمافت نەما بەسەریەوەو فڕت پێیەوە نەماوە).**

**پیاوەکەی مێردی ژنەکەیش گوتی: ئەی ماڵەکەم، ئەی ئەو ماڵەی کە لەجیاتی مارەیی داومەپێی، ئەوەم ناکەوێتەوە؟ فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ): **(ماڵت ناکەوێ، ئەو مارەیەی کە داوتەپێی بووە بەهی خۆی، چونکە ئەگەر قسەکەت راست بێ ئەوە ماڵەکەی دەکەوێ‌و ئەو مارەییە دەبێ بەهی خۆی لەباتی ئەوە کە لەمەو پێش ژنت بووەو لە باخەڵت گرتووەو بەحەلاڵی لەگەڵی دروستبووی، خۆ ئەگەر بوختیانیشت کردبێ بۆی، ئەمەیانت خراپترو زیاتر بیانووت دەبڕێ‌و ڕێگەی تەشقەڵەت نامێنێ بەوژنە).**

٨٦٩- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رضى الله عنهما): أَنَّ رَجُلاً لاَعَنَ امْرَأَتَهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَفَرَّقَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَيْنَهُمَا وَأَلْحَقَ الْوَلَدَ بِأُمِّهِ قَالَ نَعَمْ. {الحديث: ٣٧٣١ = ٣٧٢٩ فم = فتح المُلْهِم بخارى. طلاق: ٥٣١٥، ٦٧٤٨. أبو داود. طلاق: ٢٢٥٩. ترمذى. طلاق: ١٢٠٣. نسائى. طلاق: ٣٤٧٧. ابن ماجة. طلاق: ٢٠٦٩. تحفة الأشراف: ٨٣٢٢} :

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرموویی: لەسەردەمی پێغەمبەر خۆیدا** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پیاوێ شەرە نەفرینی کرد لەگەڵ ژنەکەیدا، پێغەمبەر جیای کردنەوە لەیەك و منالەکەی کە لەبەینیانا بوو دای بەدایکیی و لکانی بەوەو لەمنالی مێردەکە دەرچوو).**

**روونکردنەوە:**

١. منالَ، لەپاش شەرە نەفرین، ئەگەر مێردی دایکی حاشای لێ بکا، بەمەرجێ، یا لەسکی دایکیدابێ، یاتازە لەدایك بووبێ، ئیتر دەبێ بەمنالی دایکیی و لەمنالی مێردەکەی دەردەچێ.

٢. هەندێ زانا دەفەرموون: (ئەگەر ئەو منالە کچ بێ مارەی دێ لەو مێردەی کە شەرە نەفرینی کردووە لەگەڵ دایکیدا، بەلام ئەم رایە بەناوازەو ناباو دادەنرێ، رای دروست فەرمایشتی جەماوەری زانایانە، کە دەفەرموێ: (کچی ژن گوێزرابێتەوە یانا، ئەگەر مێردەکەی شەرە نەفرینی لەگەڵ کرد، ئەوکچە لەو پیاوە حەرامەو بەخۆیی دادەنرێ، بەلایەنی کەمەوە زڕکچیەتی، هەر هیچ نەبێ کچی ژنەکەیەتی، کچی ژنیش دەستنوێژی لەمێردی دایکی ناشکێ و مارەی لێی نایەت). {بڕوانە: موغنی موحتاج، شەرحی مینهاج بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٧٥. باب: مایحرم من النکاح}.

شت شت رادەکێشێ لەمەزهەبی شافیعیدا کچی پەیدابوو لە ئاوی داوێنپیسی پیاو، بەو پیاوە دەشێ، چونکە ئاوی داوێنپیسی بێ رێزەو بێ بایەخە!).

بەلام بەهەرحاڵ ئەگەر پیاوەکە، لەپاشا دایکی ئەو کچە مارەبکاو بیگوێزێتەوە، ئەو کچەی لێ حەرام دەبێ، چونکە دیسان بەلایەنی کەمەوە دەبێ بەزڕکچی! هەروا باشترین چارە لەم لایەنەوە بۆ کەسێ کە دووچاری ناشایستەیەکی ئاوابێ.

أ/ ئەگەر دایکی کچەیشی مارەنەکرد، بۆئەوەی ببێ بە مەحرەم و خۆیی بۆی، کەسێکی مەحرەمی وەك دایك، یاکچ، یاخوشك، یاژنی خۆی شیربدا بەو منالە کەلە تۆماوی داوێنپیسی خۆیەتی.

ب/ تەقلیدی رای جەماوەری زانایان دەفەرموون: کچی دروستبوو لەئاوی داوێنپیسی لەخاوەن ئاوەکە حەرامە. {بڕوانە: موغنی موحتاج شەرحی مینهاج، بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٧٥. باب: مایحرم من النکاح}.

**تێبینی:**

ئەم حاڵەتە گەرچی لە وڵاتی ئێمەو لەوڵاتی ئیسلاما زۆر کەمەو بەدەگمەن ڕێ دەکەوێ، بەڵام بمانەوێو نەمانەوێ هەیە، وەمنو زۆر کەسی تری وەکوو من بەچاوی خۆمان ئەم جۆرە حاڵەتانەمان دیوە، وە ئەو کچە گەورە بووەو دراوە بەشوو، وە لەوماوەدا لای باوکە ناشەرعییەکەی بووە! بەڵام ئەوەی وا لەبەرچاو لە وڵاتە ناموسوڵمانەکانا، منالی زۆڵ، لە هەندێ وڵاتا دوو لەسەر سێی سەرجەمی دانیشتوانی هەندێ وڵاتە، وە لەوشوێنانە موسوڵمان هەیە زۆریش نەوەك کەم، وە مرۆڤیش گای ڕەش نییە هەتا هەتایە لەیەك پێستابێ، جا ئەگەر موسوڵمانێ تووشی ئەم جۆرە بەلواعاممەیە بوو، باکاتی تەوبەو پەشیمانیو گەڕانەوە بۆ وڵاتی ئیسلامی لەبیربێ، ئەگەر منالی وای بوو، بەشێوەیێ لەشێوەکان بیکا بە مەحرەمی خۆی.

٨٧٠- عَنْ مُحَمَّدٍ - هو ابن سيرين – قَالَ: سَأَلْتُ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ (رضى الله عنه) وَأَنَا أُرَى أَنَّ عِنْدَهُ مِنْهُ عِلْمًا فَقَالَ: إِنَّ هِلاَلَ بْنَ أُمَيَّةَ قَذَفَ امْرَأَتَهُ بِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ، وَكَانَ أَخَا الْبَرَاءِ بْنِ مَالِكٍ لأُمِّهِ، وَكَانَ أَوَّلَ رَجُلٍ لاَعَنَ فِى الإِسْلاَمِ، قَالَ: فَلاَعَنَهَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَبْصِرُوهَا، فَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَبْيَضَ سَبِطًا قَضِىءَ الْعَيْنَيْنِ فَهُوَ لِهِلاَلِ بْنِ أُمَيَّةَ، وَإِنْ جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ جَعْدًا حَمْشَ السَّاقَيْنِ فَهُوَ لِشَرِيكِ ابْنِ سَحْمَاءَ، قَالَ: فَأُنْبِئْتُ أَنَّهَا جَاءَتْ بِهِ أَكْحَلَ جَعْدًا، حَمْشَ السَّاقَيْنِ. {الحديث: ٣٧٣٦ = ٣٧٣٣ فم}:

موحەممەدی کوڕی سیرین (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: بۆ پرسی شەرە نەفرین لە ئەنەسی کوڕی مالیکم پرسی، چونکە لەو بڕوایەدا بووم کە ئەو لەم بارەیەوە

ئاگاداریی هەیە، فەرمووی: هیلالی کوڕی ئومەییە، کە دایك برای شیریی بەرائی کوڕی مالیك بوو، کە بەراء برای هەقی منە، فەرمووی: هیلال شەریکی کوڕی سەحمائی نابەقنگی ژنەکەی خۆیەوەو گوتی: بەسەر ژنەکەمەوە گرتوومە، ئەم هیلالە یەکەم کەس بوو کە لەسەردەمی ئیسلامەتیدا شەڕە نەفرینو لیعان لەگەڵ ژنەکەیدا بکا، جا کەشەڕە نەفرینەکەی لەگەڵ ژنەکەی ئەنجامدا، لەمزگەوتا لەخزمەت پێغەمبەردا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سەرنج بدەن ئەم ژنە سکی پڕە، جا ئەگەر منداڵێکی سپیکەلەی قژخاوی، دووچاو شەڵەقاوی بوو، ئەوە لە هیلالی کوڕی ئومەیەیە، چونکە هیلال خۆی وایە، منداڵیش شێوەی وەك شێوەی باوکی وایە، بەڵام ئەگەر ئەم ژنە منداڵێکی ڕەشکەلەی وەك کل، قژلوولی، دوولاق باریکی بوو، ئەوە لەشەریکی کوڕی سەحمایەو زۆڵە). فەرمووی: هەواڵم زانیوە: کە کوڕێکی ڕەشکەلەی موو لوولی، دوو لاق باریکی بووە. {تاج/٤، زنجیرە: ٧، ژمارە: ٤٠٠٧، چ/٤ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٩، ژمارە: ٢٢٥٠، ٢٢٥١}.

**ڕوونکردنەوە:**

لەکۆتایی گێڕانەوەی ژمارە (٤٠٠٧)ی ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا، زنجیرە: ٧، لاپەڕە: ٣٧٨. چاپی چوارەم نووسراوە: عەینی دەفەرموێ: عیکریمە (ڕەحمەتی خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: ئەم منداڵە لەپاشا کە گەورە بوو، بوو بە فەرمانڕەواو میر لەسەر میصر، وەناوی باوکی نەدەزانرا. دروستی ئەم ڕستەی دواوە ئاوایە: (لەسەر میصرێ، واتە: لەسەر شارێ، چونکە مەبەست وڵاتی میصری زانراو نییە).

## ٦٧٤) کەسێ لەژنەکەی خۆی خانە گومان بێو لەنەسەبی منداڵەکەی دوو دڵ بێو باسی ڕەگە دزێو دزینی ڕەگ (٣٧٢٣ - ٣٧٤٨)

## باب: في إنكار الولَدِ وَنَزْعِ العِرْقِ

٨٧١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه): أَنَّ أَعْرَابِيًّا أَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ امْرَأَتِي وَلَدَتْ غُلَامًا أَسْوَدَ، وَإِنِّي أَنْكَرْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ

(صلى الله عليه وسلم): « هَلْ لَكَ مِنْ إِبِلٍ »؟ قَالَ: نَعَمْ، قَالَ: « مَا أَلْوَانُهَا »؟ قَالَ: حُمْرٌ. قَالَ: « فَهَلْ فِيهَا مِنْ أَوْرَقَ ؟». قَالَ: نَعَمْ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَأَنَّى هُوَ ؟». قَالَ: لَعَلَّهُ يَا رَسُولَ اللَّهِ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَهَذَا لَعَلَّهُ يَكُونُ نَزَعَهُ عِرْقٌ لَهُ ». {الحديث: ٣٧٤٧ = ٣٧٤٤ فم. تجريد بخاري/٥، رقم: ١٧٩٤ = ٥٣٠٥، ٦٨٤٧، ٧٣١٤. أبو داود. طلاق: ٢٢٦٢. تحفة الأشراف: ١٥٣١١}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لە عەرەبی دەشتەکی هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من خۆم سپیم، کەچی ژنەکەم کوڕێکی ڕەشی بووەو من ئەو منالە بەمنالی خۆم نازانمو حاشام لێ کردووە، جا تۆچی دەفەرمووی؟ پێغەمبەر پێی فەرموو: (هیچ وشترت هەیە؟). گوتی: بەلێ هەمە. فەرمووی: (ڕەنگیان چۆنە؟) گوتی: سوورن، فەرمووی: (وشتری تالەیان تیادا هەیە؟) گوتی: وشتری تالەی زۆریان واتیادا، فەرمووی: (ئەو وشترە تالانەیان لەکوێوە تێ کەوتووە؟) گوتی: ڕەنگبێ ڕەگێ لە ڕەگەزیان ڕەنگی وابووبێو ئەمانەی ئێستا چووبنەتەوە سەر ڕەنگی ئەو ڕەگەزە کۆنەی خۆیان! فەرمووی: (دە کوڕەکەی تۆیش هەروەها!).

### ٦٧٥) منالْ هی خاوەنی نوێنە. (٣٥٩٨ - ٣٦٠١)

### بابٌ: الوَلَدُ لِلفِرَاشِ

٨٧٢- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) أَنَّهَا قَالَتْ: اخْتَصَمَ سَعْدُ بْنُ أَبِي وَقَّاصٍ، وَعَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ فِي غُلَامٍ، فَقَالَ سَعْدٌ: هَذَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ابْنُ أَخِي عُتْبَةَ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ عَهِدَ إِلَيَّ أَنَّهُ ابْنُهُ، انْظُرْ إِلَى شَبَهِهِ، وَقَالَ عَبْدُ بْنُ زَمْعَةَ: هَذَا أَخِي يَا رَسُولَ اللَّهِ وُلِدَ عَلَى فِرَاشِ أَبِي مِنْ وَلِيدَتِهِ، فَنَظَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى شَبَهِهِ، فَرَأَى شَبَهًا بَيِّنًا بِعُتْبَةَ، فَقَالَ: « هُوَ لَكَ يَا عَبْدُ: الْوَلَدُ لِلْفِرَاشِ، وَلِلْعَاهِرِ الْحَجَرُ، وَاحْتَجِبِي مِنْهُ يَا سَوْدَةُ بِنْتَ زَمْعَةَ »، قَالَتْ: فَلَمْ يَرَ سَوْدَةَ قَطُّ. {الحديث: ٣٥٩٨ = ٣٥٩٤ فم. بخاري. بيوع: ٢٢١٨،

٦٧٦٥، ٦٨١٧. نسائی. طلاق: ٣٤٨٤. تحفة الأشراف: ١٦٥٨٤. تاج/٢، زنجيرة: ٧٠، ژمارة: ٢٢٥٢، ض/٤}:

عائیشه (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص‌و عەبدی کوڕی زەمعە (خودایان لێ ڕازی بێ) لەسەر خولامێ، واتە: کوڕێ، بوو بەهەرایان سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە برازای منەو کوڕی عوتبەی کوڕی ئەبو وەققاصی برامەو کاتی خۆی بەپێی باوی سەردەمی نەفامی، داوێنپیسی لەگەڵ دایکیدا کردووە، کە کەنیزەکی زەمعەی کوڕی قەیس بوو، کە بەپارە لەشفرۆشی پێ دەکرد، وە عوتبەی برام کاتی خۆی لەپێش مەرگیدا منی ڕاسپاردووە کە ئەمە کوڕی ئەوە، فەرموو تەماشای شێوەیشی بکە، ئەوەتانێ ڕێك لە عوتبەی برام دەچێ‌و کوتومت لەودەکا.

عەبدی کوڕی زەمعەیش، کەبرای باوکیی سەودەی کچی زەمعەی هاوسەری پێغەمبەرە، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمە باوك برای منەو لەسەر نوێنی باوکم لەدایك بووەو لە کەنیزەکی خۆیەتی.

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە سەرنجی شێوەی کوڕەکەیدا ڕوانی شێوەی تەواو لە عوتبە دەچێ، بەڵام بۆ پووچکردنەوەی بڕیاری سەردەمی نەفامی، فەرمووی: (ئەی عەبد! ئەمە هی تۆیەو ئەم کوڕە شەرع دەیدا بەتۆ، چونکە مناڵ هی مێردە، یاهی خاوەنی کەنیزەکە، کەخۆی چووبێتە لای، بەپێی یاسای مناڵ هی خاوەن نوێنە، هەناسە ساردیش بۆ داوێن پیس دەمێنێتەوە).

ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی بەسەودەی هاوسەری خۆی: (ئەی سەودەی کچی زەمعە! حیجابی لێ بگرەوە). عائیشە فەرمووی: ئیتر ئەو کوڕە جارێ تر سەودەی نەبینی.

**ڕوونکردنەوە:**

١. لەلای شافیعییەکان ڕەچەڵەکی ئەم کوڕە کەناوی عەبدوڕەحمانی کوڕی زەمعە بوو، دامەزراوەو چەسپاوەو ئیسپات بووە کە کوڕی زەمعەیە، ئەم فەمایشتەی

پێغەمبەر بەسەودە کە پەردە پۆشی (احتجاب)ی لێ بکات، لەبابەتی دووربینیو ئیحتیاتە.

٢. ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، خۆپاراستن لەشتی گوماناوی کارێکی رەواو پەسەندە.

## ٦٧٦) قسەی رەگەز ناس سەبنارەت بە سەلماندنی رەچەڵەکی منداڵ قەبووڵ دەکرێ. (٣٦٠٢ - ٣٦٠٥)

## بابٌ: قبولُ قَوْلِ القَافَةِ فِي الوَلَدِ

٨٧٣- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) ذَاتَ يَوْمٍ مَسْرُورًا، فَقَالَ: « يَا عَائِشَةُ: أَلَمْ تَرَىْ أَنَّ مُجَزِّزًا الْمُدْلِجِيَّ دَخَلَ عَلَيَّ، فَرَأَى أُسَامَةَ وَزَيْدًا وَعَلَيْهِمَا قَطِيفَةٌ قَدْ غَطَّيَا رُءُوسَهُمَا، وَبَدَتْ أَقْدَامُهُمَا، فَقَالَ: إِنَّ هَذِهِ الأَقْدَامَ بَعْضُهَا مِنْ بَعْضٍ ». {الحديث: ٣٦٠٢ = ٣٥٩٨ فم، تجريد/٤، رقم: ١٤٦٩ = ٣٧٣١، ٣٥٥٥، ٦٧٧٠، ٦٧٧. أبو داود. طلاق: ٢٢٦٨. ترمذى. ولاء: ٢١٢٩. نسائى. طلاق: ٣٤٩٣}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: رۆژێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هات بۆلام، زۆر کەیفی خۆش بوو، لەخۆشیانا نوور لەڕووی دەباری، فەرمووی: (ئەی عائیشە! دەزانیت کە موجەززیزی مودلەجی کە شێوە ناسێکی بەناوبانگ بوو هات بۆلام، لەوکاتەدا ئوسامەو زەیدی باوکی ئوسامە، لەژێر پارچەیێ قەدیفەدا راکشابوون، سەری خۆیان داپۆشی بوو، بەڵام قاچیان بەدەرەوە بوو، موجەززیز لەسەر ئەم حاڵە کەچاوی پێیان کەوت، یەکسەر گوتی: خاوەنی ئەم قاچانە باوكو کوڕن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٧٢، ژمارە: ٢٢٥٦ — ش/د/ت/ن = چ/٤}.

### پوختەی فەرموودەکانی بابەتی شەڕە نەفرین:

١. شەڕە نەفرین، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا ناسراوە بە: لیعان، ئەم بڕیارانەی لەسەر دروست دەبێ:

أ/ ئەو پیاوو ژنە هەتا هەتایە لەیەکتری حەرام دەبن، بەهیچ شێوەیێ حەڵاڵ نابنەوە بۆ یەکتری.

ب/ داری حەددی بوختیان لەکۆڵ پیاوەکە دەخا.

ج/ داری حەددی داوێنپیسی لەکۆڵ ژنەکە دەخا، ئەگەر ناموحصەن بێ، هەروا حەددی رەجمی لەکۆڵ دەخا ئەگەر موحصەن بێ ژنی موحصەن ئەوەیە شووی کردبێو مێرد چووبێتە لایو کردبێتی بەژنو کچێنی نەمابێ.

د/ ئەگەر مێرد حاشا لەمناڵ بکا، لەمناڵی ئەو دەردەچێو دەبێ بەمناڵی دایکیو پەیوەندی بە بنەماڵەی مێردەوە نامێنێ.

٢. بۆ دووربینیو وەرعو تەقوا، واباشە موسوڵمان خۆی لەشتی گوماناوی بپارێزێ، وەك هەبوونی شوبهەی بەهێز لەبابەتێکا، وەك داوای شیرخواردن لەنێوانی دوو منالا، بابەڵگەی رۆشنی سەلمێنەریش نەبێ.

٣. مناڵی حاشا لێکراو گوناهی لەسەر نییە، مرۆڤێکی بەرییە.

٤.ئەو ماڵەی خەرجکراوە بۆ ژنەکە، وەك مارەییو شتی تری وا، هەمووی بووە بەهی خۆی، مافی مێردی پێوە نەماوە.

٥. لەکاتی روودانی کارەساتی وادا، کەمێرد زەلامێ بەسەر ژنەی خۆیەوە بگرێ:

أ/ بۆی هەیە کارەکە نەورووژێنێو رابوێرێ لەگەڵیاو بەهۆکاری رەوا، کارێکی وابکا، کەرێگەی ئەوەی لێ بگرێ.

ب/ بەهێمنی تەڵاقی بداو خۆی رزگاربکا لەدەستیو لەشەڕی بەدووربێ، وە ئەمە لەهەمووی باشترە. (بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٨، ج/٤) کە بەدەق دەفەرموێ: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ هات بۆخزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ژنەکەم دەست بەڕووی کەسەوە نانێ، کەداوای داوێنپیسی لێ بکا؟ فەرمووی: (بەرەڵلایکە، تەڵاقی بدە!). گوتی: دەترسم دوایی دڵم بۆی لێ بدا. فەرمووی: (دە ڕابوێرە لەگەڵی تادڵت

لێی هەڵ دەکەوێ، بەڵکوو ڕێگەی داوێنپیسیشی لێ بگری). ئەبو داودو نەسائی بەڕشتەیەکی دروست گێڕاویانەتەوە.

ج/ شەڕە نەفرینی لەگەڵدا بکا، لەپاش شەڕە نەفرین مێرد هیچ مافێکی لەسەر ژن نامێنێ، گریمان بیکوژێ، دەکوژرێتەوە لەباتی ئەو.

٦. ئەو پیاوەی دەگیرێ بەسەر ژنەوە:

أ/ ئەگەر دانی نا بەتاوانەکەیدا، حەددی داوێنپیسی لێ دەدرێو بەس.

ب/ ئەگەر چوار شایەتیش هەبوو هەروەها.

ج/ ئەگەر نە پێ لێنان هەبوو، نەشایەت، ئەوا هیچی لەسەر نییە، بەزاهیر، بەڵام لای خودا تاوانبارە.

٧. مێردو کەسوکاری ژن، مافی ئەوەیان نییە، کە ژنەکە یا پیاوەکە بکوژن، یا سزابدەن، ئەوە کاری قازییە، ئیشی ئەوان نییە، ئەوەی کەلەناو ڕەشە خەڵکا باوە پێی دەڵێن: (غسل العار: شۆرینەوەی شوورەیی) بنەمایەکی شەرعی نییە، لەیاسا نامە (شەریعەت)ی خودادا، بەڵام جەماوەری زاناکان دەفەرموون: (ئەگەر مێرد، یاخاوەنی ژنی مێرددار، کابرا، یا ژنەکەیان کوشت، ئەگەر چوار شایەتیان هەبوو ناکوژرێنەوە دەنا دەکوژرێنەوە!).

٨. خانە گومانیو دڵ پیسکردن لەژن، بە بیانووی پڕو پووچ، کارێ بێ بایەخە، بەڵام لەهەمان کاتا، ناموس پارێزیو بەتەنگەوە بوونی ناموسو ئابڕوو، کارێ زۆر باشە، دروشمی پیاو چاکانو پێغەمبەرانە (دروودی خودایان لەسەر بێ).

٩. بڕیاری شێوە ناس (قائیف) بۆ سەلماندنی نەسەبو بنەچەو ڕەچەڵەك کارێ پەسەندە، بەتایبەتی لەکاتێکا ئەگەر هەمهەمەو قاومیێ لەنێوانا هەبێ.

**تێبینی:**

زۆر لەبەهرە مەندانی ئەم پەڕاوە پیرۆزانەی فەرموودە دەفەرموون، ژیننامەکان زۆر جێگەی کەڵكو بەهرەن، بەڵام بەئاسانی بۆمان نادۆزرێتەوە. جا

والەم دیدو روانگەیەوە خاوەن ژینامەکان لە ژمارە (١)وە هەتا ژمارە (٨٧٣) لەم لیستەی دواوە ریز دەکەین، خوا پشتیوان بێ:

**لیستو ناوی ئەو هاوەڵو کەسانەی کە لەسەرەتای کتێبەکەوە ناویان هاتووە هەتا ئێرە:**

| ژمارە | ناوی خاوەن ژینامە | ژمارەی فەرموودەکە |
|---|---|---|
| ١ | ئەبو جەمرە: نەصری کوڕی عیمران | ١ |
| ٢ | ئەشەجج: مونذیری کوڕی عائیذ | ١ |
| ٣ | ئەبو هورەیرە | ٢ |
| ٤ | ئەبو تالیبی مامەی پێغەمبەر | ٣ |
| ٥ | ئەبو جەهلو عبدالله بن أمية | ٣ |
| ٦ | سەعیدی کوڕی مُسَیَّب | ٣ |
| ٧ | حەزن باپیری سەعیدی کوڕی مسیب | ٣ |
| ٨ | مسیّبی کوڕی حەزن | ٣ |
| - | (متفق علیه) واتای چییە | ٣ |
| ٩ | ئیبنو عومەر | ٥ |
| ١٠ | میقدادی کوڕی عەمری کیندی | ٦ |
| ١١ | ئوسامەی کوڕی زەید | ٧ |
| - | ئاژاوەکەی سەردەمی ئیبنو زوبەیر چۆن بوو؟ | ٨ |
| ١٢ | جوندوبی کوڕی سوفیان | ٨ |
| ١٣ | عوثمانی کوڕی عەففان | ٩ |
| ١٤ | ئەبو سەعیدی خودری | ١٠ + ٣٣٨ |
| ١٥ | ئیبنو عەجلان | ١١ |

لیستی ناوی ئەو سەحابەو پیاو چاك‌و کەسانەی کە لەسەرەتای کتێبەکەوە هەتا ئێرە، فەرموودەی ژمارە: (٨٧٣) ژین نامەیان بۆ نووسراوە.



# ١٥- نامەی شیردانو مەمك خواردن - كتَابُ الرِّضاعِ

{بڕوانـە: تەجریـدی بوخـاری بـەکوردی بـەرگی/٥ ژمـارە: ١٧٥٣ هـەتا ١٧٥٧ + تاجول ئوصول بەکوردی. بەرگی دووەم، زنجیرە/٣٠، لاپـەڕە: ٤٨٠، ژمـارە: ٢٠٧٦ هـەتا ٢٠٨٠، چاپی چوارەم + فیقهی ئاسان بەکوردی. بەرگی/٢، لاپەڕە: ٦٩٧، ژمارە: ٢٦٣}.

## ٦٧٧) هەرچی بەهۆی سکوزاو خزمایەتییەوە نادروست بێ، بەهۆی شیر خواردنیشەوە نادروستە. (٣٥٥٣ - ٣٥٩٢)

## باب: يَحْرُمُ مِنَ الرِّضَاعَةِ مَا يَحْرُمُ مِنَ الوِلاَدَةِ

٨٧٤- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ عِنْدَهَا، وَإِنَّهَا سَمِعَتْ صَوْتَ رَجُلٍ يَسْتَأْذِنُ فِى بَيْتِ حَفْصَةَ، قَالَتْ عَائِشَةُ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَذَا رَجُلٌ يَسْتَأْذِنُ فِى بَيْتِكَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أُرَاهُ فُلاَنًا ». - لِعَمِّ حَفْصَةَ مِنَ الرَّضَاعَةِ -، قَالَتْ عَائِشَةُ: قلت: يَا رَسُولَ اللَّهِ! لَوْ كَانَ فُلاَنٌ حَيًّا - لِعَمِّهَا مِنَ الرَّضَاعَةِ - دَخَلَ عَلَىَّ؟ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « نَعَمْ إِنَّ الرَّضَاعَةَ تُحَرِّمُ مَا تُحَرِّمُ الْوِلاَدَةُ ». {الحديث: ٣٥٥٣ ترقيم الشيخ خليل مأمون شيخا لِشَرْحِ صحيح مسلم = الحديث: ٣٥٤٩ حسب ترقيم فتح الملهم شرح صحيح مسلم. تجريد البخاري بالكوردي. مجلد/٥، رقم: ١٧٥٤ = ٥٠٩٩، ٢٦٤٦، ٣١٠٥ = فتح الباري شرح صحيح البخاري. نسائي. نكاح: ٣٣١٣. تحفة الأشراف: ١٧٩٠٠}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەلای من بوو، گوێم لێبوو کەپیاوێ ڕێخوازیکرد کەبچێ بۆلای حەفصەی کچی عومەر، کەژنی پێغەمبەر بوو، عائیشە فەرمووی: عەرزی پێغەمبەرم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە پیاوێکە داوای مۆڵەت دەکا، کەبچێ بۆ ماڵی تۆ، واتە: بۆ ماڵی حەفصەی ژنت؟ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وادەزانم کە فیسارە کەسە، کە مامی شیریی حەفصەیە) کەواتە: خۆییەو بێگانە نییە، بابچێت. عائیشە فەرمووی: منیش

عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! دەی کەوابێ ئەگەر ئێستا فیسارەکەس بمایێ، کەمامی شیریی عائیشە بوو، دەیتوانی وەك کەسێکی خۆییو مەحرەم، هاموشۆی منی بکردایە!

فەرمووی: (بەڵێ، چونکە هەرچی بەخزمایەتیو زاوزێ حەرام ببێ، بەهۆی مەمکخواردنیشەوە حەرام دەبێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٢ – چاپی/٤}.

## ٦٧٨) کاریگەریی شیریی بەهۆی ئاوی مێردەوە
## بابٌ: تَحْرِيمُ الرَّضَاعَةِ مِنْ مَاءِ الفَحْلِ

٨٧٥- عَنْ عَائِشَةَ (رضى الله عنها) قَالَتْ: جَاءَ عَمِّى مِنَ الرَّضَاعَةِ يَسْتَأْذِنُ عَلَىَّ، فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، حَتَّى أَسْتَأْمِرَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَلَمَّا جَاءَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قُلْتُ: إِنَّ عَمِّى مِنَ الرَّضَاعَةِ اسْتَأْذَنَ عَلَىَّ فَأَبَيْتُ أَنْ آذَنَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ عَمُّكِ »، قُلْتُ: إِنَّمَا أَرْضَعَتْنِى الْمَرْأَةُ وَلَمْ يُرْضِعْنِى الرَّجُلُ، قَالَ: « إِنَّهُ عَمُّكِ فَلْيَلِجْ عَلَيْكِ ». {الحديث: ٣٥٦٠ شيحا = ٣٥٥٦ فم = ف.م = فتح الملهم. ترمذى. رضاع: ١١٤٨. تجريد البخارى/٤، رقم: ١٦٨٣ = ٤٧٩٦، ٢٦٤٤، ٥١٠٣، ٥١١١، ٥٢٢٩، ٦١٥٦}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەفلەحی برای ئەبول قوعەیس (کە مامی شیریی عائیشە بوو، چونکە عائیشە شیری ژنەکەی ئەبولقوعەیسی خواردبوو، ئەبولقوعەیس باوکی شیریی عائیشە بوو، دیارە کە ئەفلەحی براشی مامی شیریی عائیشەیە) ئەم ئەفلەحە کە مامی شیریم بوو، هات بۆسەردانم، منیش ڕێگەم پێی نەدا، گوتم: هەتا پرس بە پێغەمبەر نەکەم شتی واناکەم، جا کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خودا! مامە شیرییەکەم هاتبوو، دەیویست بێ بۆ دێنیم، منیش ڕێگەم پێی نەدا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (با مامەت بێت بۆ سەردانت). منیش عەرزیم کرد: ئاخر خۆ من شیری براکەی ئەوم نەخواردووە، بەڵکوو من شیری ژنی براکەی ئەوم خواردووە؟ فەرمووی: (ئەوە مامی شیریتە، ڕێگەی پێبدە کە سەردانت بکا).

(نوكتەیێ) گریمان پیاوێ بێتە شیر بۆ منالێو مەمکی بێتە شیرو مەمك بدا بەمنالێ، بەوە نابێ بە منالی، ئەگەر کچ بێ بەوە لێی حەرام نابێ، مارەی لێی دێ!!

## ٦٧٩) برازای شیریی مارەی نایێ
## بابٌ: تحريم ابنة الأخ من الرّضاعة

٨٧٦- عَنْ عَلِيّ (رضى الله عنه) قَالَ: قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ: مَا لَكَ تَنَوَّقُ فِي قُرَيْشٍ وَتَدَعُنَا، فَقَالَ: « وَعِنْدَكُمْ شَيْءٌ »؟ قُلْتُ: نَعَمْ، بِنْتُ حَمْزَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِي، إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ ». {الحديث: ٣٥٦٦ شيحا = ٣٥٦٢ ف.م = فم = فتح الملهم. نسائي. نكاح: ٣٣٠٤. تجريد/٥، رقم: ١٧٥٣ = ٥١٠٠، ٢٦٤٥ = فتح الباري}:

ئیمامی عەلی (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە بۆچی هەرژن لە قورەیش هەڵ دەبژێرێ، کەچی لە ژنانی بەنی هاشمی خۆمان ژن ناخوازی. فەرمووی: (جاکێ لەخۆتان گومان دەبەی کە من بیخوازم؟). گوتم: بەڵێ شك دەبەم: کچەکەی حەمزە، کە ئامۆزای خۆتە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پێم ناشێ، چونکە کچی برای شیریمەو کچی حەمزەیە، حەمزەیش هەم مامی هەقمە، برای باوکمەو هەم برای شیریمە، چونکە ثووەیبە هەم شیری دابوو بە ئیمامی حەمزە، هەم شیری دابوو بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەدوو ساڵ پاش حەمزە شیری دابوو بە پێغەمبەر). {تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٢}.

**روونکردنەوە:**

ثووەیبە دایکی شیریی پێغەمبەرە، یەکەم کەس بووە کە شیر بدا بە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەشیری کورێکی کەناوی مەسرووح بوو، بەرلەوەی پێغەمبەر، حەلیمەی سەعدییەی دایەنی بیبات بۆلای خۆی چەند رۆژێ ثووەیبە مەمکی دەدا پێی، ثووەیبە کارەکەری ئازادکراوی ئەبو لەهەبی مامی پێغەمبەر بوو، ئیبنو

مەنـدە دەفـەرموێ ثـووەیبـە ئیسلام بـووە، پێغەمبـەر زۆر بـۆی بـاش بـووە، هـەتا لەمەککـە بـوو سـیلەی رەحمـی ئـەوی بـەجێ دەهێنـا، خەدیجـەیش زۆر رێـزی لێ دەگـرت، چـونکە خەسـووی شـیریی ئـەو بـووە، لەسـاڵی حـەوتی کۆچـیدا لـەپاش ئازادکردنی خەیبەر، کۆچی دوایی کردووە، ئەم چوار ژنـە مـەمکیان بـە پێغەمبـەر داوە: ئامینەی دایکیو ثووەیبەو حەلیمەی سەعدییەو ئوم ئەیمەن!

ثـووەیبـە دایکـی شـیریی ئیمـامی حـەمزەو پێغەمبـەرو ئـەبو سـەلەمە بـووە. {بڕوانە: تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٤ چاپی چوارەم}.

## ٦٨٠) زڕکچو ژن خوشك مارەییان نایەت
## باب: تحريم الرَّبيبةِ وأختِ المَرأة

٨٧٧- عَنْ أُمِّ حَبِيبَةَ بِنْتِ أَبِى سُفْيَانَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَالـَتْ: دَخَـلَ عَلَـيَّ رَسُـولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ لَهُ: هَلْ لَكَ فِى أُخْتِى بِنْتِ أَبِى سُفْيَانَ؟ فَقـالَ: « أَفْعَـلُ مَـاذَا »؟ قُلْتُ: تَنْكِحُهَا، قَـالَ: « أَوَتُحِـبِّينَ ذَلِـكِ؟ ». قُلْـتُ: لَسْـتُ لَـكَ بِمُخْلِيَـةٍ، وَأَحَـبُّ مَـنْ شَرِكَنِى فِى الْخَيْرِ أُخْتِى، قَالَ: « فَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِى ». قُلْتُ: فَإِنِّى أُخْبِرْتُ أَنَّكَ تَخْطُـبُ دُرَّةَ بِنْتَ أَبِى سَلَمَةَ، قَالَ: « بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ؟ ». قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: « لَوْ أَنَّهَا لَمْ تَكُـنْ رَبِيبَتِـى فِـى حَجْرِى مَا حَلَّتْ لِى إِنَّهَا ابْنَةُ أَخِى مِنَ الرَّضَـاعَةِ، أَرْضَـعَتْنِى وَأَبَاهَـا ثُوَيْبَـةُ، فَـلاَ تَعْرِضْـنَ عَلَيَّ بَنَاتِكُنَّ، وَلاَ أَخَوَاتِكُنَّ ». {الحديث: ٣٥٧١ شـيحا = ٣٥٦٧ فـم تجريـد البخـارى/٥ رقـم: ١٧٥٥ = ٥١٠١، ٥١٠٦، ٥١٠٧، ٥١٢٣، ٥٣٧٢ فـتح البـارى. نسـائى. نكـاح: ٣٢٨٤. تحفة الأشراف: ١٥٨٧٥}:

ئـوم حەبیبـەی کچـی ئـەبو سـوفیان (رەزای خودایان لێ بێ) کـە هاوسـەری پێغەمبـەرە، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هـات بـۆلام، بـۆ ماڵـەوەم، عـەرزیم کـرد: ئـەی پێغەمبەری خودا! بۆچی عـەززەی خوشـکم کەکچـی ئـەبو سـوفیانە مارەناکـەی بـۆ خۆت؟ فەرمووی: (چی بکەم؟) گوتم: مارەی بکە لەخۆتو بیکە بەهاوسەری خۆت.

فـەرمووی: (جـا پێـت خۆشـە؟). گـوتم: بـەڵێ، چـونکە ئـەوە نـەبێ کـە تـەنیا هەرمن ژنت بم‌و تۆ تەنیا هەر بۆمن بیت، خۆشەویسـترین کەسـیش کـە هاوبەشـم بێ، لە بەهرەی هاوسەرێتیی تۆدا، ئەو خوشـکەمە، کـەوابوو حەزدەکـەم کـە مـارەی بکەی، هەتا ئەو شانازی‌و سەربەرزییە بەویش ببڕێ. فەرمووی: (دەسا ئەوە بـۆ مـن دروست نییەو پێم ناشێ، چونکە دروست نییە بۆ پیاوێ دوو خوشـك پێکـەوە مـارە بکا بۆ خۆی).

منـیش گـوتم: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! سـا ئێمـە لـەناو خۆمانـا مقـۆ مقـۆی ئەوەمانە کەتۆ دەتەوێ دوڕەی کچی ئەبو سەلەمە مارەبکەی بۆ خـۆت، مـن شـتێکی وام بیستووە، ئەی ئەوە چۆنە؟ فەرمووی: (هەنەزاکەی خۆم کە کچی ئوم سەلەمەی ژنمە؟). گوتم: بەڵێ ئەو!

فـەرمووی: (دەسـا بـەخودا ئـەوە راسـت نییـە، چـونکە گریمـان ئـەوە زڕکچیشـم نـەبێ‌و لـەکۆش‌و باوەشـی خۆشمـا بـەخێوی نەکـەم، وە بـەربڕیاری ئـەم ئایەتـەش نەکەوێ کە دەفەرموێ: {وَرَبَائِبُكُمُ اللاَّتِي فِي حُجُورِكُم} گریمـان ئەگـەر وایـش نـەبێ هەرپێم ناشێ، چونکە ئەو برازای شیریمە، لەکاتی خۆیدا ثوەیبە مەمکی داوە هەم بەمن‌و هەم بە ئەبو سەلەمەی باوکی، جا نەکچی خۆتـان‌و نەخوشـکی خۆتـانم بـۆ هەڵ مەدەن‌و ئەوانەم پێشـکەش مەکـەن، ئـەی ئێـوەی هاوسـەرانی مـن!). {بڕوانـە: تاج/٢، زنجیرە: ٢٩، ژمارە: ٢٠٧٤ چ/٤}.

## ٦٨١) باسی مژێ، یا دوومژ
## بابٌ: فِي المصَّةِ والمصَّتَان

٨٧٨- عَنْ أُمِّ الْفَضْلِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَتْ: دَخَلَ عَلِيٌّ رسول اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ فِى بَيْتِى، فَقَالَ: يَا نَبِىَّ اللَّهِ، إِنِّى كَانَتْ لِى امْرَأَةٌ فَتَزَوَّجْتُ عَلَيْهَا أُخْرَى، فَزَعَمَتِ امْرَأَتِى الأُولَى أَنَّهَا أَرْضَعَتِ امْرَأَتِى الْحُدْثَى رَضْعَةً أَوْ رَضْعَتَيْنِ، فَقَالَ نَبِىُّ اللَّهِ

(صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُحَرِّمُ الإِمْلاَجَةُ وَالإِمْلاَجَتَانِ ». {الحديث: ٣٥٧٦ شيحا = ٣٥٧٢ فم. نسائي. نكاح: ٣٣٠٨}:

ئوم فەزڵ (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەماڵی من میوان بوو، عارەبێکی دەشتەکی هات بۆ خزمەتی، عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! من ژنێکم هەیە، ژنێکی ترم بەسەر هێناوە، ئێستا ژنی یەکەمم دەڵێ: من ژەمێ یادوو ژەم شیرم داوە بەژنە تازەکەم، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بە مژێ، یا بەدوومژ مەمکخواردن، کچو کوڕ لەیەکتری حەرام نابن!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٠٧٦ ج/٤}.

## ٦٨٢) پێنج ژەم مەمکخواردنی دیاریکراو
## باب: في خمس رضعات

٨٧٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: كَانَ فِيمَا أُنْزِلَ مِنَ الْقُرآنِ: عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ)، ثُمَّ نُسِخْنَ بِخَمْسٍ مَعْلُومَاتٍ، فَتُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهِي فِيمَا يُقْرَأُ مِنَ الْقُرْآنِ. {الحديث: ٣٥٨٢ شيحا = ٣٥٧٨ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەپێشدا ئەمە ئایەتی قورئان بوو: {عَشْرُ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ}. واتە: دە ژەم مەمکخواردنی دیاری کراو، ژنو پیاو لەیەکتری حەرام دەکەن، جا لەپاشا ئەم دەیە هەڵوەشایەوەو بوو بە {خَمْسِ رَضَعَاتٍ مَعْلُومَاتٍ يُحَرِّمْنَ} واتە: پێنج ژەم شیر خواردنی دیاریکراو، ژنو پیاو لەیەکتری حەرام دەکەن. لەدواییدا ئەمەیش نەسخ بۆوە، تەنانەت کە پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی کرد، هێشتا هەندێ کەس بەم نەسخ بوونەوەیان نەزانیبوو، وە لەبەرئەوە تاماوەیەکیش ئەمەیان بە قورئان دەزانیو لەکاتی دەوری قورئانا دەوریان دەکردەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٠٧٧ — م/د/ت/ن}.

## ٦٨٣) مەمكدان بە مرۆڤی گەورە دەیكا بەخۆیی یانا؟
## بابٌ: في رضاعة الكبير

٨٨٠- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا): أَنَّ سَالِمًا مَوْلَى أَبِي حُذَيْفَةَ كَانَ مَعَ أَبِي حُذَيْفَةَ وَأَهْلِهِ فِي بَيْتِهِمْ، فَأَتَتْ (تَعْنِي: ابْنَةَ سُهَيْلٍ) النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: إِنَّ سَالِمًا قَدْ بَلَغَ مَا يَبْلُغُ الرِّجَالُ وَعَقَلَ مَا عَقَلُوا، وَإِنَّهُ يَدْخُلُ عَلَيْنَا، وَإِنِّي أَظُنُّ أَنَّ فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا، فَقَالَ لَهَا النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « أَرْضِعِيهِ، تَحْرُمِي عَلَيْهِ، وَيَذْهَبِ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ ». فَرَجَعَتْ إليه فَقَالَتْ: إِنِّي قَدْ أَرْضَعْتُهُ فَذَهَبَ الَّذِي فِي نَفْسِ أَبِي حُذَيْفَةَ. {الحديث: ٣٥٨٦ شيحا = ٣٥٨٢ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەبو حوزەیفەی كوڕی عوتبە (رەزای خودای لێ بێ) سالمی كوڕی مەعقلی، لەسەردەمی نەزانیدا، كردبوو بە كوڕی خۆی، كە بەم كردارە لە زاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: (تەبەننی) بەرە بەرە سالم گەورە بوو، وە تەبەننی نەماو پووچەوە بوو، بەڵام سالم هاموشۆی ماڵی حوزەیفەی دەكرد، هەتا رۆژێ سەهلەی كچی سوهەیل، كەژنی حوزەیفە بوو، هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزی كرد: (ئەی پێغەمبەری خودا! خۆت دەزانی كە ئێمە جاران لەسەر دەستووری كۆنی سەردەمی نەزانی، سالمان كردبوو بەكوڕی خۆمان، وە وەك كوڕی خۆمان رەفتارمان لەگەڵ دەكردو مەحرەمو خۆیی بوو لەناومانا، بەڵام ئێستا ئەوەتا وەك دەزانیت، خودای گەورە بە ئایەتی قورئان ئەو دەستورو باوو نەریتە كۆنەی پووچ كردۆتەوەو هەڵی وەشاندۆتەوە، وە ئەوەتا سالمیش گەورە بووەو بووە بەپیاو، ئەوەی پیاوان هەستی پێ دەكەن ئەویش هەستی پێ دەكا، لەهەمان كاتا سالم بەگەرمی هاموشۆمان دەكا، وەمن واهەست دەكەم كە حوزەیفەی مێردم، لەدڵەوە لەم بارودۆخە دلگرانەو پێی ناخۆشە، جا ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ ئێستا چی دەفەرمووی لەم بارەیەوە، بۆ چارەسەری ئەم كێشەیە؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (مەمكی پێ بدە، هەتا تۆی لێ حەرام ببێو تۆ ببی بە دایكی شیریی ئەو، وە حوزەیفەی مێردیشت هیچی لەدڵا نامێنێ!).

جا سوهەیلە پێنج جار لەشیری خۆی سالمی تێرکرد، ئیتر سالم بوو بەکوڕی شیریی سوهەیلەو کێشەکەیان کرایەوە. وە سوهەیلە هاتەوە بۆ خزمەت پێغەمبەرو عەرزیکرد: وەك تۆ فەرمووت وامکرد، مەمکم دا بەسالم، وە حوزەیفەی مێردیشم هیچی لەدڵا نەما).

٨٨١- عَنِ زَيْنَبَ بِنْتَ أُمِّ سَلَمَةَ: أَنَّ أُمَّهَا أُمَّ سَلَمَةَ زَوْجَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) كَانَتْ تَقُولُ: أَبَى سَائِرُ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يُدْخِلَ عَلَيْهِنَّ أَحَدٌ بِتِلْكَ الرَّضَاعَةِ، وَقُلْنَ لِعَائِشَةَ: وَاللَّهِ مَا نَرَى هَذَا إِلاَّ رُخْصَةً رَخَّصَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِسَالِمٍ خَاصَّةً، فَمَا هُوَ بِدَاخِلٍ عَلَيْنَا أَحَدٌ بِهَذِهِ الرَّضَاعَةِ وَلاَ رَائِينَا. {الحديث: ٣٥٩٠ شيحا = ٣٥٨٦ ف.م = فم = فتح الملهم}:

زەینەبی کچی ئوم سەلەمە فەرمووی: ئوم سەلەمەی دایکم کە هاوسەری پێغەمبەر بوو (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هەموو هاوسەرە پاکیزەکانی بێ) جاران دەیفەرموو: بێجگە لە عائیشە، هەموو هاوسەرەکانی تری پێغەمبەر، بەوە رازی نەبوون کە شیرو مەمکدان بە مرۆڤی گەورە ببێ بەهۆی لەیەکتری حەرامبوونو شیر دەرەکە ببێ بەدایکی شیریی شیر خۆرەکە، لەبەرئەوە کەسیان قەبووڵیان نەدەکرد، کە پیاوی ناخۆییو نامەحرەم بە بەهانەی شیرخواردنی وا، هاموشۆیان بکا، وە فەرموویان بە عائیشە: (بەخودا ئەمەی کەتۆ دەیکەی بە بەڵگە لەسەر راو بۆچوونی خۆت، کە گوایە شیردان بە گەورەیش، وەك شیردان بە منداڵ، کاریگەریی هەیەو دەبێ بەهۆی دروستبوونی دایكو کوڕیی شیرییو سەرەنجام لەیەکتری حەرام دەبن، ئەمە وانییە، بەڵکوو ئەم حاڵەتە تەنیا مۆڵەتێ تایبەتی بوو، تایبەت بوو بە سالمو سوهەیلەی هاوسەری ئەبو حوزەیفەوە، کە پێغەمبەر خۆی ئەو مۆڵەتە تایبەتەی بۆ سالم رەوا دیبوو، لەبەرئەمە، ئێمە شتی وا قەبووڵ ناکەین کە کەسێ بە بیانووی وا، هاموشۆمان بکا، یا چاوی پێمان بکەوێ!!).

### ٦٨٤) مەمكخواردنی كاریگەر ئەوەیە كە لەكاتی ساوایی‌و لەبەر برسێتی بێت. (٣٥٩٣ - ٣٥٩٧)

### باب: إنّما الرّضاعة من المَجاعة

٨٨٢- عَنْ عَائِشَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قالت: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّـهِ (صلى الله عليه وسلم) وَعِنْدِي رَجُلٌ قَاعِدٌ، فَاشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِ، وَرَأَيْتُ الْغَضَبَ فِي وَجْهِهِ، قَالَتْ: فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ أَخِي مِنَ الرَّضَاعَةِ، قَالَتْ: فَقَالَ: « انْظُرْنَ إِخْوَتَكُنَّ مِنَ الرَّضَاعَةِ، فَإِنَّمَا الرَّضَاعَةُ مِنَ الْمَجَاعَةِ ». {الحديث: ٣٥٩١ شيحا = ٣٥٨٧ فم. تجريد البخارى/٥، رقم: ١٧٥٦ = ٥١٠٢، ٢٦٤٧. أبو اود. نكاح: ٢٠٥٨. نسائى. نكاح: ٣٣١٢}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەهەموو هاوسەرەكانی بێ) فەرمووی: جارێ پیاوێ لەلام دانیشتبوو، خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) لەوكاتەدا هات بۆلام، كە ئەمەی دی لەبەری گران بوو، تەماشای دەموچاویم كرد تووڕە بوو، جا عەرزیم كرد: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە برای شیریمە، بێگانە نییە، پێت ناخۆش نەبێ. فەرمووی: (باش سەرنج بدەن لە براو خوشكی شیریتان، چونكە مەمك خواردن كاتێ دادەمەزرێ‌و كاریگەری دەبێ، كە لەكاتی ساواییدا بێ‌و منالّەكە لەبەر برسێتی ئەو شیرە بخوات!!). {تاج/٢، زنجیرە: ٣٠، ژمارە: ٢٠٧٨ ج/٤ = چاپی چوارەم}.

### پوختەی فەرموودەكانی نامەی شیردان‌و مەمكخواردن:

١ -بۆ پوختەی بڕیارەكانی شیرو مەمكخواردن بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی پێنجەم، فەرموودەی ژمارە: ١٧٥٧ = ٥١٠٨ فەتحولباری).

٢ - شیر خواردن‌و مەمك خواردن بابەتێكی زۆر وردو فرە قووڵ‌و فراوانە، زۆر لە كێشەكانی كۆمەڵگای پێ چارەسەر دەكرێ.

٣ باشترین چارەسەر، بۆ منالّی ناخۆیی، وەك منالّی تەبەننی‌و منالّی زۆڵی شەرعی، ئەوەیە لەڕێگەی شیر پێدانەوە بكرێ بە مەحرەم‌و بەخۆیی لەناو ئەو خێزانەدا.

٤ به ئەزموون دەركەوتووە، ئەو ژن‌و پیاوەی كە گوتراوە شیر لەنێوانیانا هەیە، وە لەبەرئەوەی شیرەكە بەپێی شەرع نەچەسپاوە، ئەگەر شوویان كردبێ بەیەكتری، یا وەجاخ كوێر بوون، یا تووشی دەردو بەڵای گەورە گەورە بوون.

٥ سیلەی رەحم بەجێهێنان لەنێوان كەسوكاری شیریدا كارێكی زۆر پەسەندە.

٦ - بۆئەوەی گومانی بەد دروست نەبێ، بەهۆی دێنی‌و سەردان‌و هاموشۆی ئاساییەوە، واباشە شیرخواردن لەنێوانی دووكەسا ئاشكرا بكرێ‌و باسی بكرێ.



# ١٦- نامەی ژیوارەکان

## (نەفەقات) = كِتَابُ النَّفَقَاتِ

{بڕوانە: تەجریدی بوخاریَ بەكوردی، بەرگی پێنجەم، زنجیرە: ٧٢، لاپەڕە: ٧٥، چاپی یەكەم، لە فەرموودەی ژمارە: ٥٣٥١/١٧٩٧ هەتا فەرموودەی ژمارە: ٥٣٥٧/١٧٩٩ فتح الباری + تاجول ئوصول، بەكوردی، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٨٠، لاپەڕە: ٥٩٥ چاپی چوارەم، ژمارە: ٢٢٧٩ هەتا ٢٢٨٦ + فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، چاپی تاران، لاپەڕە: ٨٠٣، زنجیرە: ٢٩٤ هەتا كۆتایی زنجیرە: ٢٩٨}.

### ٦٨٥) خێر بۆخۆیش، ئەوجا بۆ دەرویش. (٤٣١٤ - ٤٣١٧)

### باب: فِي الإِبْتِدَاءِ بِالنَّفْسِ وَالْأَهْلِ وَذِي الْقَرَابَةِ

٨٨٣- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أنه قَالَ: أَعْتَقَ رَجُلٌ {زاد في رواية: من الأنصار يقال له أبو مذكور} مِنْ بَنِى عُذْرَةَ عَبْدًا لَهُ عَنْ دُبُرٍ {في الرواية الأخرى: يقال له يعقوب} فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: «أَلَكَ مَالٌ غَيْرُهُ؟» فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ: « مَنْ يَشْتَرِيهِ مِنِّى؟ ». فَاشْتَرَاهُ نُعَيْمُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ الْعَدَوِىُّ بِثَمَانِمِائَةِ دِرْهَمٍ، فَجَاءَ بِهَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ، ثُمَّ قَالَ: « ابْدَأْ بِنَفْسِكَ فَتَصَدَّقْ عَلَيْهَا فَإِنْ فَضَلَ شَىْءٌ فَلأَهْلِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ أَهْلِكَ شَىْءٌ فَلِذِى قَرَابَتِكَ، فَإِنْ فَضَلَ عَنْ ذِى قَرَابَتِكَ شَىْءٌ، فَهَكَذَا وَهَكَذَا ». يَقُولُ فَبَيْنَ يَدَيْكَ، وَعَنْ يَمِينِكَ، وَعَنْ شِمَالِكَ).
{الحديث: ٢٣١٠ شيحا = ٢٢٨٨ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٠ = ٢١٤١، ٢٢٣٠، ٢٣٢١، ٢٤٠٣، ٢٤١٥، ٦٧١٦، ٦٩٤٧، ٧١٨٦}:

جابیری كوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێكی ئەنصاری لەخێڵی بەنی عوزرە، كەناوی ئەبو مەزكوور بوو، خولامێكی هەبوو ناوی یەعقووب بوو، ئازادی كرد، بەمەرجێ كە لەپاش مردنی خۆی ئازاد ببێ، كە بەمە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا دەگوترێ: مودبەر، واتە: پاشە مەرگە، پیاوەكە هیچ ماڵێكی تری

نەبوو، وە داما بۆ ماڵ، جا لەپاشا کە ئەم باسە گەیشتەوە بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئەبو مەزکووری فەرموو: (ئایا دارایی ترت هەیە، بێجگە لەم کۆیلەیە؟) گوتی: (نەء نیمە) جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کۆیلەکەی خستە سەر سەواو فەرمووی: (کێ ئەم پیاوەم لێ دەکڕێ؟). جا نوعەیمی کوڕی عەبدوڵڵای عەدەوی لێی کڕی بەهەشت سەد درەمو پارەکەی هێنا بۆ پێغەمبەرو پێغەمبەر لێی وەرگرتو دای بەخاوەنەکەی، کەناوی ئەبو مەزکوور بوو. لەپاشا خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (لەپێشا لەخۆتەوە دەست پێ بکە، ئەگەر ماڵت هەبوو، لەپێشا خێر بەخۆت بکە، جا ئەگەر لەخۆت مایەوە بابۆ خاوو خێزانت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە بابۆ خزمو خوێشت بێ، ئەگەر لەوانیش مایەوە ئەوا بەهەر چوار لاتا درێغی لەخێر کردنو سامان بەخشین مەکە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ٢٠٢٢، ج/٤ + زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٦}.

### ٦٨٦) ژێواری کۆیلەکان لەسەر خاوەنەکانیانو تاوانی پشتگوێ خستنی نانو ئاویان. (٢٣٠٧ - ٢٣٠٩)

٨٨٤- عَنْ خَيْثَمَةَ قَالَ: كُنَّا جُلُوسًا مَعَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا)، إِذْ جَاءَهُ قَهْرَمَانٌ لَهُ، فَدَخَلَ فَقَالَ: أَعْطَيْتَ الرَّقِيقَ قُوتَهُمْ؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: فَانْطَلِقْ فَأَعْطِهِمْ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يَحْبِسَ عَمَّنْ يَمْلِكُ قُوتَهُ ». {الحديث: ٢٣٠٩ شيحا = ٢٢٨٧ ف.م}:

خەیثەمە (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ بووین لەخزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی عومەردا (رەزای خودایان لێ بێ) دانیشتبووین، لەوکاتەدا کلیل بەدەستەکەی هاتە ژوورەوە، عەبدوڵڵا بە کلیلدارەکەیی گوت: ئەرێ نانو ئاوت دا بەکۆیلەکان؟ گوتی: نەء نەمداونەتێ. عەبدوڵڵا فەرمووی: دەبڕۆ نانو ئاوەکەیان بدەرێ. بۆ خۆم بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (بەسە بۆ گوناهباریی کەسێ،

کەنان و ئاو بگرێتەوە لە کۆیلەو ژێر دەستەی خۆی!). {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٥}.

### ٦٨٧) خێری ژیواری خێزان و کەسوکار. (٢٣٠٧ - ٢٣٠٩)

### باب: فَضْلُ النَّفَقَةِ عَلَى العِيَالِ وَالأَهْلِ

٨٨٥- عَنْ ثَوْبَانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَفْضَلُ دِينَارٍ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ دِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى عِيَالِهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ الرَّجُلُ عَلَى دَابَّتِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَدِينَارٌ يُنْفِقُهُ عَلَى أَصْحَابِهِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ »، قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَبَدَأَ بِالْعِيَالِ. ثُمَّ قَالَ أَبُو قِلاَبَةَ: وَأَيُّ رَجُلٍ أَعْظَمُ أَجْرًا مِنْ رَجُلٍ يُنْفِقُ عَلَى عِيَالٍ صِغَارٍ يُعِفُّهُمْ، أَوْ يَنْفَعُهُمُ اللَّهُ بِهِ، وَيُغْنِيهِمْ. {الحديث: ٢٣٠٧ = ٢٢٨٥ فم}:

ثەوبان (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمووێ: (باشترین دیناریٚ کەپیاو خەرجی بکا، ئەو دینارەیە کە خەرجی دەکا بۆ ماڵ و منالی خۆی، هەروا ئەو دینارەیە کە پیاو خەرجی بکا بۆ وڵاخەکەی کە لەپێناوی خوادا پێی تێ دەکۆشێ، وەك ئەوە غەزای پێوە دەکا، یاپێی دەچێ بۆ حەج، هەروا ئەو دینارەیە کە پیاو سەرفی دەکا بۆ هاوەڵانی خۆی، کە لەرِێگەی خوادا خەبات دەگێرِن و غەزا دەکەن و لەپێناوی ئایینی خوادا تێ دەکۆشن).

ئەبو قیلابە (کە ثەوبان مامۆستاکەیەتی) دەفەرمویٚ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەخەرجی خێزان ریزەکەی دەست پێ کردووە، تا ئاماژەبێ بۆئەوە کە خێرکردن بەپێی ئەم ریزکردنە خێری زۆرترە. لەپاشا ئەبو قیلابە بۆ پشتیوانی ئەم بۆچوونەی خۆی، کە خێرکردن لەخێزانی خۆتەوە دەست پێ بکەی خێرترە فەرمووی: دەی پاداشی کێ لەپاداشی ئەو کەسە گەورەترە، کە مەسرەفی کۆمەڵێ منالی ورد دەکێشێ، تا لەخەم دەرەخسێن و لەروو زەردی دەرووزەو سواڵ رزگاریان دەبێ و چاویان لەدەستی ئەم و ئەو نابێ! وەخودا بەهۆی ئەوەوە سوودیان پێ بگەیەنێ و داراو دەوڵەمەندیان بکات؟! دیارە کەس. {بروانە: تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٤، چ/٤} + {ریاض/١، زنجیرە: ٣٦، ژمارە: ٢٩٠}.

٨٨٦- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الْبَدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الْمُسْلِمَ إِذَا أَنْفَقَ عَلَى أَهْلِهِ نَفَقَةً، وَهُوَ يَحْتَسِبُهَا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةً ». {الحديث: ٢٣١٩ = ٢٢٩٧ فم. تجريد/٥، رقم: ١٧٩٧ = ٥٣٥١ فتح البارى = ٥١، تجريد = ٥٥ فتح البارى. ترمذى. برصلة: ١٩٦٥. نسائى. زكاة: ٢٥٤٤. رياض/١/٢٩٣، زنجيره: ٢٦}:

ئەبو مەسعوودی بەدری (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ لەبەر رەزای خودا، مەسرەفی ماڵو منالی خۆی بکا، هەرچییان بۆ خەرج بکا، کەم بێ یازۆر، بەخێرو خێرات دائەنرێ بۆی). {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٢٧٩}.

## ٦٨٨) ژن بۆی هەیە کە لەماڵی مێردەکەی، بەپێی باوی ئاسایی ناو کۆمەڵگای خۆی، مەسرەفی خێزان بکا. (٤٤٥٢ - ٤٤٥٥)

## بابٌ: للمرأةِ أنْ تنفقَ مِنْ مَالِ زَوْجِهَا بالمعْرُوفِ علَى عيالِه

٨٨٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: جَاءَتْ هِنْدٌ إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَاللَّهِ مَا كَانَ عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يُذِلَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، وَمَا عَلَى ظَهْرِ الأَرْضِ أَهْلُ خِبَاءٍ أَحَبَّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ يُعِزَّهُمُ اللَّهُ مِنْ أَهْلِ خِبَائِكَ، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « وَأَيْضًا، وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ »، ثُمَّ قَالَتْ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ أَبَا سُفْيَانَ رَجُلٌ مُمْسِكٌ، فَهَلْ عَلَيَّ حَرَجٌ أَنْ أُنْفِقَ عَلَى عِيَالِهِ مِنْ مَالِهِ بِغَيْرِ إِذْنِهِ؟ فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ حَرَجَ عَلَيْكِ أَنْ تُنْفِقِي عَلَيْهِمْ بِالْمَعْرُوفِ ». {الحديث: ٤٤٥٤ شيحا = ٤٤٤٤ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٠ = ٢٢١١، ٢٤٦٠، ٣٨٢٥، ٥٣٥٩، ٥٣٦٤}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: هیندی دایکی موعاوییە (رەزای خودایان لێ بێ) هات بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەرزیکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! سوێند بەخودا، لەسەر رووی زەوی، بنەماڵەو وڵات نەبووە، کە بەقەد بنەماڵەو وڵاتی تۆ، پێم خۆش بێ، کەخودا داماوو کەساسیان بکا، بەڵام خودا کارێکی وایکرد، کەئێستا

بنەماڵەو وڵات نییە، کە بەقەد بنەماڵەو وڵاتی تۆ، کەپێم خۆش بێ، خودا سەربەرزی هەردوو جیهانیان بکا. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەوکەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەم خۆشەویستییەی تۆ بۆ منو بۆ ئایینی من، رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێ!)

ئەوجا هیند فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پرسیارێکم هەیە کە ئەمەیە: ئەبو سوفیانی مێردم، پیاوێکی رژدو گیرە، ئەوەندەم ناداتێ کە بەشی خۆمو منداڵەکانم بکا، بەئاسایی، مەگەر ئەو نەزانێ، خۆم شتی تری ببەم ئەوسا بەشمان بکا، جا ئایا ئەگەر ئەو نەزانێ، بەنهێنی خۆم لە ماڵەکەی ببەم، بۆ مەسرەفی خۆمو منداڵەکانم گوناهم ناگا؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (گوناهت ناگا، کە بەپێی دەستووری جوانی ناو کۆمەڵ مەسرەفیان بۆ بکەی!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٦}.

**روونکردنەوە:**

هیندی کچی عوتبە، هاوسەری ئەبو سوفیان، دایکی موعاوییە، (رەزای خودایان لێ بێ) هەرسێکیان هاوەڵی پێغەمبەر بوون، خۆیو ئەبو سوفیانی مێردی لە (مەسلەمە)ی فەتح بوون، رۆژی ئازادکردنی مەککە موسوڵمان بوون، لەپێشا لەدوژمنە هەرە سەر سەختەکانی پێغەمبەر بوون، کاتێکیش خودا هیدایەتی دان موسوڵمانی جوانیان لێ دەرچوو، هیند لەجەنگی ئوحوددا، لەگەڵ دەستەیێ، لەژنان، بەسروود خوێندنەوە هانی مێردەکانیان دەدا کە دەجەنگان لەگەڵ پێغەمبەرو لەشکری ئیسلاما، هانیان دەدان لەسەر شەڕکردنو بەدەفەوە دەیانگوتو دەیانچڕاند:

نَحْـنُ بَنَـاتُ طَـارِقِ     نَمْشِـي عَلَـى النَّمَـارِقِ

إِنْ تُقْبِلُـوا نُعَـانِقِ     أَوَ تُـدْبِرُوا نُفَـارِقِ

فِـرَاقَ غَيْـرِ وَامِـقِ

واتە:

کچـی ئەسـتێرەی سـوورین پـەروەردەی سـەر مـافوورین
عاشـق بەشـیرو شـوورین لـەپیاوی کـوونی دووریـن!
یـاری لاوی جەسـوورین

یا ئاوا:-

کچـی ئەسـتێرەو مـانگین بـەنازو شـۆخ و شـەنگین
ئاشـق بەشـێری جـەنگین ئـەو گوڵـەو ئێمـە هـەنگین
لـە هـەڵهاتوو دڵتـەنگین

کاتێ هیند موسوڵمان بوو، بوتێکی هەبوو، بەتەشوێ پارچە پارچەی کردو گوتی: بەڕاستی هەتا لەگەڵ تۆ بووین، چاك لەخۆمان بایی بوو بووین!

هیند کاتێ لەجەنگی ئوحوددا وەحشی حەمزەی مامی پێغەمبەری شەهید کرد، سکی دڕیو جەرگی دەرهێناو برژاندیو ویستی بیخوات، چونکە حەمزە لەجەنگی بەدردا عوتبەی باوکی هێندی کوشتبوو!

لەسەردەمی جێنشینی عومەری کوڕی خەتابا، لەو ڕۆژەدا کە ئەبو قوحافەی باوکی ئەبوبەکری صەدیق مرد، هیندیش مرد، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودایان لێ بێ). بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم بابەتە بڕوانە: ١- ژمارە: ١٩٧ ژینامەی موعاوییەی کوڕی ئەبو سوفیان. ٢- ژمارە: ٨٦٢. هەروا تاج/٣، زنجیرە: ٣٣، ژمارە: ٣٤٢٢ + زنجیرە: ٣٤، ژمارە: ٣٤٢٤، ٣٤٢٣. هەروا تەجریدی بوخاری، بەرگی یەکەم ژمارە: ٦٣ + تەجرید/٢، ژمارە: ٦١٤.

### ٦٨٩) ژنی سێبەسێ تەڵاقدراو ژێوار (نەفەقە)ی نییە. (٣٦٨١ - ٣٧٠٤)

### بابٌ: فِي الْمُطَلَّقَةِ ثَلاَثاً لاَ نَفَقَةَ لَهَا

٨٨٨- عَنْ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) فِى الْمُطَلَّقَةِ ثَلاَثًا قَالَ: « لَيْسَ لَهَا سُكْنَى، وَلاَ نَفَقَةٌ ». {الحديث: ٣٦٩٢ = ٣٦٨٨ فم} :

فـاطيمـەی کچـی قـەیس (رەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: سـەبارەت بـەژنی سێبەسـێ تەڵاقدراو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نەمافی نشیمەن (سوکنا)ی هەیە، لەماوەی عیددەکەیداو، نەخـەرجی (نەفەقـە)شـی بۆهەیـە لەوماوەیـەدا). {تـاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨١ + ژمارە: ٨٦١، ٨٦٢ کە لەپێشەوە ڕابوردن}.

٨٨٩- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) قَالَتْ: مَـا لِفَاطِمَـةَ خَيْـرٌ أَنْ تَـذْكُرَ هَـذَا. تَعْنِـي قَوْلَهَا: لاَ سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةَ. {الحديث: ٣٧٠١ = ٣٦٩٩ فم}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەمەی کە فاطیمەی کچی قەیس دەیگێڕێتەوە، کە گوایە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرموویەتی بە فاطیمە، کاتـێ کـە مێردەکـەی سێبەسێ تەڵاقی داوە: (نەنشیمەنت بۆ هەیەو نەژیوار. واتـە: نـەمافی سـوکنات بـۆ هەیە لەکاتی عیددەکەتا، وەنە نەفەقەت دەکـەوێ). عائیشـە فـەرمووی: گێڕانـەوەی ئەمە لەلایەنی فاطیمەوە هیچ سوودی نییە بۆ سەلماندنی داوای فاطیمـە کـە دەڵـێ: گوایـە ژنـی سێبەسـێ تەڵاقـدراو، نـەمافی نشـیمەنی هەیـە، نـە ژیـوارو خـەرجی دەکەوێ، چونکە ئەم بڕیارە تەنیا بۆ فاطیمە خـۆی وابـووە، کـە لەبـەرهۆی تایبـەت ماڵی مێردەکەی بـەجێ هێشتووە، ئـەگینا بـۆ ژنـانی تـر، کـە سێبەسـێ تەڵاقـدرابن وانیە، هەم مافی نشیمەنیان هەیەو هەم خەرجی).

٨٩٠- عَنْ أَبِي إِسْحَاقَ قَالَ: كُنْتُ مَعَ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ جَالِسًا فِـي الْمَسْجِدِ الأَعْظَـمِ، وَمَعَنَا الشَّعْبِيُّ فَحَدَّثَ الشَّعْبِيُّ بِحَدِيثِ فَاطِمَةَ بِنْتِ قَيْسٍ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صـلى الله عليـه وسلم) لَمْ يَجْعَلْ لَهَا سُكْنَى وَلاَ نَفَقَةً. ثُمَّ أَخَذَ الأَسْوَدُ كَفًّا مِـنْ حَصًـى فَحَصَـبَهُ بِـهِ، فَقَـالَ: وَيْلَكَ تُحَدِّثُ بِمِثْلِ هَذَا، قَالَ عُمَرُ: لاَ نَتْرُكُ كِتَابَ اللَّهِ وَسُنَّةَ نَبِيِّنَـا (صلى الله عليه وسـلم) لِقَوْلِ امْرَأَةٍ لاَ نَدْرِي لَعَلَّهَا حَفِظَتْ أَوْ نَسِيَتْ، لَهَا السُّكْنَى وَالنَّفَقَةُ، قَالَ اللَّهُ عَـزَّ وَجَـلَّ: (لاَ تُخْرِجُوهُنَّ مِـنْ بُيُـوتِهِنَّ وَلاَ يَخْـرُجْنَ إِلاَّ أَنْ يَـأْتِينَ بِفَاحِشَـةٍ مُبَيِّنَـةٍ ). {الحديث: ٣٦٩٤ = ٣٦٩٠ فم. ترمذی. نكاح: ١١٣٥. نسائی. طلاق: ٣٤١٨، ٣٥٥٣}:

ئەبو ئیسحاق (رەحمەتی خودای لێ بێ) فـەرمووی: لەگـەڵ ئەسـوەدی کوڕی یەزیـددا، لـە مزگـەوتی گـەورەی کووفـە دانیشـتبووین، شەعبیشـمان لەگـەڵ بـوو، شـەعبی ئـەو

فەرموودەیەی گێڕایەوە، کە فاطیمەی کچی قەیس دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەجێگەی دانیشتنی پێمداو نەژیوار (نەفەقە)ی بۆ بڕیمەوە، ئەسوەدیش چنگێ چەوی هەڵگرتو چنگە چەوەکەی گرتە شەعبیو پێی گوت: خانە خراپ! ئەمە چییە تۆ دەیگێڕیتەوە؟! ئەی ئەوە نەبوو کە ئەم قسەیە گەیشتەوە بە عومەری کوڕی خەتاب (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئێمە بەقسەی ژنێ وازناهێنین لەنامەی خوداو یاسا نامەی پێغەمبەری، بەتایبەتی لەکاتێکا کە نازانین ئەو ژنە شتەکەی بەباشی لەیادماوە، یا لەیادی نەماوە، ژنی تەڵاقدراو هەم مافی جێگەی دانیشتنی هەیەو هەم نەفەقەو ژێوارو خەرجیشی دەکەوێ، چونکە ئەوەتا خودای گەورە سەبارەت بەم بابەتە دەفەرموێ:

{لَا تُخْرِجُوهُنَّ مِن بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخْرُجْنَ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ – الطلاق/٦٥، الآية/١} :

واتە: ئەوژنە تەڵاقدراوانە دەرمەکەن، لەهۆدەو ماڵی یاسایی (شەرعی) خۆیانا، وەنابێ خۆشیان لەجێگەی نشیمەنی ئاسایی خۆیان دەربچن، مەگەر کارێکی ناباری ناشیرینیان لێ دەربکەوێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٨٠، ژمارە: ٢٢٨٢، چ/٤}.



# ١٧- نامەی کۆیلە ئازادکردن

## كِتَابُ العِتْقِ

{بڕوانە: موختەصەری صەحیحی بوخاری ناسراو بە: تەجریدی بوخاری، بەرگی/٣، لاپەڕە: ١٧٦، زنجیرە: ٥٤، فەرموودەی ژمارە: ١٠٨٣ هەتا ١٠٩٤ = ٢٥١٧ هەتا ٢٥٦٠ فتح الباری + باسی کۆیلە ئازادکردن، لەفیقهی ئاسان، زنجیرە: ٤٠٧، لاپەڕە: ١٠٧٤ هەتا زنجیرە: ٤١٧ + تاجول ئوصول/٢، لاپەڕە: ٤٤٥، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٠٠٩ هەتا ٢٠٣٣ + ریاض الصالحین/٣، زنجیرە: ٢٣٦، ژمارە: ١٣٥٨ هەتا ١٣٦٥} + {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢ لەژمارە: ١٦٠٠ هەتا ژمارە: ١٦٠٨}.

### ٦٩٠) خێرو بەهرەی کەسێ کۆیلەیەکی موسوڵمان ئازادبکا. (٣٧٧٤ - ٣٧٧٧)

### باب: فَضْلُ مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً

٨٩١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ أَعْتَقَ رَقَبَةً مُؤْمِنَةً، أَعْتَقَ اللَّهُ بِكُلِّ عُضْوٍ مِنْهُ عُضْوًا مِنَ النَّارِ حَتَّى يُعْتِقَ فَرْجَهُ بِفَرْجِهِ».{الحديث: ٣٧٧٦ =٣٧٧٢ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٨٣=٢٥١٧، ٦٧١٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموویی: ژنەوتم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەر موسوڵمانێ موسوڵمانێکی کۆیلە ئازادبکا، خودا لەجیاتی هەر ئەندامێکی ئەو کۆیلەیە، ئەندامێکی ئەو ئازادکارە، لە ئاگری دۆزەخ، ئازاد دەکا، تەنانەت دامەنو شەرمگای لەجیاتی دامەنو شەرمگای ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٢٠١٠}.

### ٦٩١) ئازادکردنی بنەچە لەلایەنی وەچەوە (٣٧٧٨ - ٣٧٧٩)

٨٩٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَجْزِى وَلَدٌ وَالِدًا، إِلاَّ أَنْ يَجِدَهُ مَمْلُوكًا فَيَشْتَرِيَهُ فَيُعْتِقَهُ ». {الحديث: ٣٧٧٨ — ٣٧٧٤ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرموی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (كەس لەچاكەی باوك‌و دایك‌و باپیرەو نەنكی خۆی دەرناچێ، مەگەر ئەمانە بەندەبن‌و ئەو بیانكڕێ‌و ئازادیان بكا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٦}.

### ٦٩٢) كەسێ بەشی خۆی لە كۆیلەیێ ئازاد بكا. (٣٧٤٩ - ٣٧٥٤)

### باب: مَنْ أعْتَقَ شِرْكاً لَهُ فِي عَبْدٍ

٨٩٣- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ أَعْتَقَ شِرْكًا لَهُ فِى عَبْدٍ فَكَانَ لَهُ مَالٌ يَبْلُغُ ثَمَنَ الْعَبْدِ قُوِّمَ عَلَيْهِ قِيمَةَ الْعَدْلِ، فَأُعْطِىَ شُرَكَاؤُهُ حِصَصَهُمْ، وَعَتَقَ عَلَيْهِ الْعَبْدُ، وَإِلاَّ فَقَدْ عَتَقَ مِنْهُ مَا عَتَقَ ». {الحديث: ٣٧٤٩ = ٣٧٤٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٥٨ = ٢٥٢٢}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەوەی كەبەشی خۆی لە كۆیلەیەك ئازادبكا، ئەگەر ئەوەندەی بەهای ئەو كۆیلەیە مالّی هەبوو، ئەوا كۆیلەكە بەنرخی كاتی كۆیلەیی دەقەبلێنرێ، ئەوجا هەریەكێ لەهاوبەشەكانی، پارەی پشكەكەی خۆیی دەدرێتێ لەوماڵە كەهی ئازادكەری پشكی یەكەمە، ئیتر كۆیلەكە هەمووی بەتەواوی ئازاد دەبێ، لەسەر حیسابی ئازادكەری پشكی یەكەم، دەنا ئەگەر ئەوەندەی ماڵ نەبوو كەبەشی هەموو پشكەكانی كۆیلەكە بكا، ئەوە هەر ئەو بەشەی ئازاد دەبێ كە ئازادكراوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨}.

### ٦٩٣) كۆیلە ئەگەر بەشێكی ئازادكرا، دەبێ كەسابەت بكا هەتا بەتەواوی خۆی ئازاد دەكا. (٣٧٤٩ - ٣٧٥٤)

٨٩٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ أَعْتَقَ شِقْصًا لَهُ فِى عَبْدٍ فَخَلاَصُهُ فِى مَالِهِ إِنْ كَانَ لَهُ مَالٌ، فَإِنْ لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ اسْتُسْعِىَ الْعَبْدُ غَيْرَ مَشْقُوقٍ عَلَيْهِ ». {الحديث: ٣٧٥٢ = ٣٧٤٩ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٧٨ = ٢٤٩٢، ٢٥٠٤، ٢٥٢٦، ٢٥٢٧}:

**ئــەبو هــورەیرە** (ڕەزای خــودای لێ بــێ) **دەفــەرموێ: خۆشەویســت** (دروودی خــودای لەســەر بــێ) دەفەرموێ: (ئەوەی کەپشکی خۆی لە کۆیلەیەك ئازادبکا، لەسەریەتی لەماڵی خۆی هەمووی ئازادبکا، ئەگەر ئەوەنـدەی مـاڵ هەبوو کـە بەشـی هـەموو پشکەکانی ئـەو کۆیلەیـە بکـا، بـەڵام ئەگـەر ئەوەنـدەی مـاڵ نـەبوو کەبەشـی ئـەوەبکا، ئـەوا هـەر ئەوەندەی ئازاد دەبێ کە ئازادکراوە، ئەوسا کۆیلەکە، بەنرخی کاتی کۆیلەیی ڕێك دەقەبلێنرێ، ئەوجا کەسابەتی پێ دەکرێ هەتا ئەوەندە ماڵ پەیدا دەکا، کەبیدات بەهەقی ئەو پشکانەیدا کە هێشتا ئازاد نەبوون، هەتا بە ئێجگاری خۆی پێ ئازاد دەکاو لە کۆیلەیی ڕزگاری دەبێ، بەڵام نابێ زەبری پتر لەتوانای خۆیی لێ بکرێ، بۆ پەیداکردنی بەهای ئەو بەشەی تری، کە لەسەر خۆیەتی بەکارکردن ئازادی بکا).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٧، ژمارە: ٢٠١٨}.

## ٦٩٤) تیروپشك لەکاتی ئازادیکردندا. (٤٢٧٤ - ٤٣١٣)
## بابٌ: القُرْعَةُ فِي الْعِتْقِ

٨٩٥- عَـنْ عِمْـرَانَ بْـنِ حُصَـيْنٍ (رَضِـيَ اللّٰهُ عَنْهُمَـا): أَنَّ رَجُـلاً {زاد في روايـة: مـن الأنصار} أَعْتَقَ سِتَّةَ مَمْلُوكِينَ لَهُ عِنْدَ مَوْتِهِ، لَمْ يَكُنْ لَهُ مَـالٌ غَيْـرُهُمْ، فَـدَعَا بِهِـمْ رَسُـولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَجَزَّأَهُمْ أَثْلاَثًا ثُمَّ أَقْرَعَ بَيْـنَهُمْ، فَـأَعْتَقَ اثْنَـيْنِ، وَأَرَقَّ أَرْبَعَـةً، وَقَالَ لَهُ قَـوْلاً شَـدِيدًا. {الحـديث: ٤٣١١ – ٤٣٠٣ فـم. أبـو داود. عتـق: ٣٩٥٩. ترمـذي. أحكام: ١٣٦٤. تحفة الأشراف/ ١٠٨٨٠}:

عیمرانـی کـوڕی حوصـەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: (پیـاوێ هـەموو ماڵەکـەی تەنیا شەش کۆیلە بـوو، لەسـەرەمەرگا هەرشەشـیانی ئـازادکرد، پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بـانگی کـردنو کردنـی بەسـێ بـەشو دەو (قورعـە)ی لـەنێوانا کـردن، دوانیـانی ئـازادکرد کـە دەوەکـەیان بـۆ دەرچـووبوو، وە چواریشـیانی بـە کۆیلـەیی هێشـتەوە، وە خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) قسـەی نـاخۆشو تونـدی بـە پیاوەکـە گـوت، لەسـەر ئـەوکارە ناشـیرینە، کـە لەسـەرە مـەرگا، هـەموو سـامانەکەی کـردووە بـەخێر. لەگێڕانەوەیـەکی نەسـائیدا پێـی فـەرموو: (نیـازم هـەبوو نوێـژ لەسـەر

تەرمەکەی نەکەم). لەگێڕانەوەیەکی ئەبو داوودا: (ئەگەر بەرلەوە بنێژرێ ئامادەی تەرمەکەی ببوومایە، نەمدەهێشت لە گۆڕستانی موسوڵمانان بنێژرایە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٠٠١، چ/٤، لاپەڕە: ٤٤٠}.

**٦٩٥) ئەوکەسە دەبێ بەخاوەنی هەقداری (الولاء = سەرداریی) کە ئازادی دەبەخشێ. (٣٧٥٥ - ٣٧٦٦)**

**باب: الوَلاءُ لِمَنْ أعْتَقَ**

٨٩٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: دَخَلَتْ عَلَيَّ بَرِيرَةُ، فَقَالَتْ: إنَّ أَهْلِي كَاتَبُونِي عَلَى تِسْعِ أَوَاقٍ، فِي تِسْعِ سِنِينَ، فِي كُلِّ سَنَةٍ أُوقِيَّةٌ، فَأَعِينِينِي، فَقُلْتُ لَهَا: إنْ شَاءَ أَهْلُكِ أَنْ أَعُدَّهَا لَهُمْ عَدَّةً وَاحِدَةً وَأُعْتِقَكِ وَيَكُونَ الْوَلاءُ لِي فَعَلْتُ، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ لأَهْلِهَا، فَأَبَوْا إلاَّ أَنْ يَكُونَ الْوَلاءُ لَهُمْ، فَأَتَتْنِي، فَذَكَرَتْ ذَلِكَ، قَالَتْ: فَانْتَهَرْتُهَا، فَقَالَتْ: لاَهَا اللَّهِ إذًا، قَالَتْ: فَسَمِعَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَسَأَلَنِي فَأَخْبَرْتُهُ، فَقَالَ: « اشْتَرِيهَا وَأَعْتِقِيهَا وَاشْتَرِطِي لَهُمُ الْوَلاَءَ، فَإِنَّ الْوَلاَءَ لِمَنْ أَعْتَقَ. فَفَعَلْتُ، قَالَتْ: ثُمَّ خَطَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَشِيَّةً فَحَمِدَ اللَّهَ وَأَثْنَى عَلَيْهِ بِمَا هُوَ أَهْلُهُ، ثُمَّ قَالَ: « أَمَّا بَعْدُ، فَمَا بَالُ أَقْوَامٍ يَشْتَرِطُونَ شُرُوطًا لَيْسَتْ فِي كِتَابِ اللَّهِ عز وجل، مَا كَانَ مِنْ شَرْطٍ لَيْسَ فِي كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ فَهُوَ بَاطِلٌ، وَإِنْ كَانَ مِائَةَ شَرْطٍ، كِتَابُ اللَّهِ أَحَقُّ، وَشَرْطُ اللَّهِ أَوْثَقُ، مَا بَالُ رِجَالٍ مِنْكُمْ يَقُولُ أَحَدُهُمْ أَعْتِقْ فُلاَنًا وَالْوَلاَءُ لِي، إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ ». {الحديث: ٣٧٥٨ = ٣٧٥٥ فـم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩٤ = ٢٥٦٠، ٢١٥٦، ٢٥٦٢، ٢١٦٩، ٢٧٥٧، ٦٧٥٢، ٦٧٥٧، ٦٧٥٩، ٢٥٦١، ٢٥٦٣، ٢٥٦٤، ٢٥٦٥. أبو داود. فرائض: ٢٩١٥. نسائي. بيوع: ٤٦٥٨. تحفة الأشراف/ ٨٣٣٤}:

عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەریرە هات بۆلام، گوتی: خاوەنەکانم نامە نووسی (موکاتەبە)یان لەگەڵدا کردووم لەسەر نۆ ئۆقیە، بۆماوەی نۆ ساڵ، کەهەر ساڵەی ئۆقیەیە بدەم، جا هاتووم بۆلات کە تۆیش یارمەتییەکم بدەی، هەتا زوو رزگارم ببێ لەم کۆیلەییە، وە ئەوکاتە هیچ پشکێکی لەنامە نووسییەکەی جێبەجێ نەکرد بوو؟!

منیش پێیم گوت: برۆ بە ئاغاکانت بڵێ: ئەگەر ئەوان ئارەزوو دەکەنو رازی دەبن، ئەوا من ئەو پارەیان هەموو بەیەکجار بە نەختی بۆ دەژمێرمو یەکسەر ئازادت دەکەم، بەڵام بەمەرجێ کە سەرداریی (وَلاَء = هەقداری)یەکەت بۆ من بێو من ببم بەهەقدارت، جا ئەویش ئەم باسە دەگێڕێتەوە بۆ ئاغاکانی، بەڵام ئاغاکانی بەوە رازی نابنو دەڵێن: سەرداریيو هەقداریی هی خۆمانەو نایدەین بەکەسی تر.

جا دیسانەوە بەریرە هاتەوە بۆلامو ئەم باسوو خواسەی بۆم گێڕایەوە، منیش پیا هەڵشاخام، ئەویش گوتی: سوێندم بەخودا هەر ئەوەیە کە عەرزم کردی. عائیشە فەرموی: جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەمەی بیستو لەمنی پرسی، منیش باسەکەم عەرزی کرد، فەرمووی پێم: (تۆ بیکڕەو ئازادی بکەو مەرجیش دابنێ کە سەرداریی بۆ ئەوان بێ، ئەو مەرجە بایەخی نییە، چونکە لەڕاستیدا سەرداریی بۆ ئەو کەسەیە کە بەندەکە ئازاد دەکا). منیش وامکرد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەر لەئێوارەیێ، هەڵسایەوەو وتارێکی دا، سوپاسو ستایشێ کە شایانی خودابێ کردیو ئەوجا فەرمووی: (لەپاش ئەمە ئەوە بۆچی هەندێ کەس دەچێ مەرجی وا بەمەرج دەگرێ، کە لەناو یاسانامەی خودادا نەبێ، دەی هەرکەسێ مەرجی وا بەمەرج بگرێ، لەکاتی سەوداو مامەڵەو کردنی کارێکا، ئەوە پووچو بەتاڵە، ئەوجۆرە مەرجە سوودی نابێ بۆی، ئەگەر سەد مەرجیش بێ هەموویان پووچو بێ بایەخن، نامەی خودا لەپێشترە، مەرجی خودا پتەوترە، ئەوە بۆ هەندێ پیاو لەئێوە دەڵێن: ئێمە فیسارە کەسی کۆیلە ئازاد دەکەین، بەمەرجێ کە سەرداریيەکەی بۆخۆمان بێ، بەبێ چەندو چوون سەرداری هی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩}.

**روونکردنەوە:**

١ ئۆقیەی سەردەمی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چل درەمی زیوە.

٢ - بەریرە لەپێشا خزمەتی عائیشەی دەکرد، دوایی عائیشە کڕیو ئازادی کرد، زۆر دڵسۆزی عائیشە بوو، هەتا مردن.

ئیبنو عەبدولبەڕ لە ئیستیعابا، ئەم کەرامەتە لە بەریرەوە دەگێڕێتەوە:

(عەبدولخالیقی کوڕی زەیدی کوری واقید فەرمووی: باوکم گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان گێڕایەوە بۆمان، فەرمووی: لەپێش ئەوەدا کەببم بەجێنشین (خەلیفە) لە مەدینە، لەخزمەتی بەریرەدا دادەنیشتم، زۆرجار پێی دەفەرمووم: ئەی عەبدولمەلیك! دەبینم چەند رەوشتێکی بەرزی باشت واتیادا، لەبەرئەوە واهەست دەکەم کەتۆ دەبیت بەجێنشین لەسەر موسوڵمانان، جا ئەگەر بوویت بەخەلیفەو جێنشین، خۆت لەخوێنڕشتنی ناڕەوا بەدوور بگرە، چونکە بۆ خۆم لەزاری پیرۆزی حەزرەتم بیست دەیفەرموو: (پیاوی واهەیە، دەڕوا بەرەو بەهەشت، تادەگاتە بەردەرگاکەیو بەچاوی سەر تەماشای دەکا، لەوێ بەپاڵ دەری دەکەنو تەسی پێ دەکەنەوە، لەسەر لوێچێ خوێنی ناڕەوا، لەسەر پڕشاخی کەڵە شاخێ خوێن، کە لەدنیادا بەناڕەوا رشتوویەتی!).

عەینی دەفەرموێ: بەریرە بەڕەگەز نەبەطی، یا قیبطی بووە. بەریرە (رەزاو رەحمەتی خودای لێ بێ) هەتا سەردەمی جێنشینی موعاوییە مابوو، بەریرە ئەو بەریرەیە، کە لەحەدیثی ئیفکا، ناوی هاتووەو لەسەر راوێژی ئیمامی عەلی، پێغەمبەر پرسی پێ دەکاو پێی دەفەرموێ: (ئەی بەریرە! هیچت لە عائیشە دیوە کە جێگەی گومان بێ؟). {بڕوانە: تاج/٤، زنجیرە: ٧ تەفسیری سوورەتی نوور، ژمارە: ٤٠٠٨. بەتایبەتی لاپەڕە/ ٣٩٠ چاپی چوارەم} + {تەجریدی بوخاری = موختەصەری صەحیحی بوخاری، بەکوردی، بەرگی/٣، ژمارە: ١١٢١، لاپەڕە: ٢٠٩ چاپی یەکەم}.

٣ وەلاء، یا سەرداریی، یا هەقداریی، لەزاراوی شەرعو یاسا نامەی خوای گەورەدا، باوانییەکە، کە هۆکەی نەمانی خاوەنییە، لەکۆیلەدا، بەهۆی ئازادبوونەوە.

بەنموونە: ئەگەر کەسێ بەهەر هۆیێ، کەسێ ئازادبکا، وە ئازادکراوەکە بمرێ، وە میراتبەری خزمی نەبێ، ئەوە ئازادکەرەکەی کەلەپوورەکەی دەبا، ئەگەر مێییە

نەبێ، لەکاتی شووکردنا، ئازادکەرەکەی هەقداریەتیو مارەی دەبڕێ لە شووەکەی، یا ئەگەر بمرێ نوێژی لەسەردەکا، وە کۆمەڵێ مافی تر، کە بەپێی شەرع بۆ ئازادکەرو ئازادکراو دەچەسپێ.

## ٦٩٦) ژن ئەگەر ئازادکراو مێردەکەی کۆیلە بوو خۆی سەرپشکە، کە شووکردنەکەی هەڵوەشێنێتەوە

٨٩٧- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) زَوْجِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهَا قَالَتْ: كَانَ فِي بَرِيرَةَ ثَلاَثُ سُنَنٍ: خُيِّرَتْ عَلَى زَوْجِهَا حِينَ عَتَقَتْ، وَأُهْدِيَ لَهَا لَحْمٌ، فَدَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَالْبُرْمَةُ عَلَى النَّارِ، فَدَعَا بِطَعَامٍ، فَأُتِيَ بِخُبْزٍ وَأُدُمٍ مِنْ أُدُمِ الْبَيْتِ، فَقَالَ: « أَلَمْ أَرَ بُرْمَةً عَلَى النَّارِ فِيهَا لَحْمٌ؟». فَقَالُوا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، ذَلِكَ لَحْمٌ تُصُدِّقَ بِهِ عَلَى بَرِيرَةَ، فَكَرِهْنَا أَنْ نُطْعِمَكَ مِنْهُ، فَقَالَ: « هُوَ عَلَيْهَا صَدَقَةٌ وَهُوَ مِنْهَا لَنَا هَدِيَّةٌ »، وَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) فِيهَا: « إِنَّمَا الْوَلاَءُ لِمَنْ أَعْتَقَ ».
{الحديث: ٣٧٦٥ = ٣٧٦٢ فم} :

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەهۆی بەریرەوە سێ پرسی شەرعی روونکرانەوە:

١ -مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەریرە خۆیی کرد بەسەر پشك: کە یاوەك جاران کە خۆشی کەنیز (ئەمەتە) بوو، هێشتا ئازاد نەکرابوو، بەلای مێردەکەیەوە دانیشێت، یا هەر لەئێستاوە دەستی لێ هەلگریتو لەپاش ئازادبوون خۆی هەڵبژێرێو شووەکەی هەڵوەشێنێتەوە.

٢ - گەلێ جار خەڵك خێریان بۆ دەهێنا، وە ئەویش لەپاش ئەوەی کەوەری دەگرت، بەدیاریی دەیهێنا بۆ ئێمە. جا منیش ئەمەم عەرزی پێغەمبەر کرد، فەرمووی: (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەڵام لەوەوە بۆ ئێوە دەبێ بەدیاریی، کەواتە: بیخۆن قەیناکا. وەك ئەوە جارێ گۆشتیان بەدیاری هێنابوو بۆ بەریرە، کە ئەوکاتە کارەکەری من بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، دیزەکە بەسەر ئاگرەوە بوو، گۆشتەکەی بەریرەی تیادا دەکولا، پێغەمبەر (دروودی خودای

لەسەر بێ) داوای خواردەمەنی کرد، نانو پێخۆریان لەهیماڵەوە بۆهێنا، ئەویش فەرمووی: (دیزەیەکم بینی لەسەر ئاگرەکە دەکولا گۆشتی تیابوو، ئەی بۆچی لەوەتان بۆم نەهێنا؟).

عەرزیانکرد: بەڵێ وایە، ئەی پێغەمبەری خودا! ئەوە گۆشتێکە بەخێردراوە بە بەریرە، لەبەرئەوە حەزمان نەکرد کەتۆ لێی بخۆیت، چونکە تۆ زەکاتو شتی وا ناخۆیت. فەرمووی: (ئەوە بۆ ئەو خێرە، بەڵام لەوەوە بۆ ئێمە دەبێ بەدیارییو خواردنی بۆ منیش دروستە).

٣ خاوەنەکانی ویستیتان کە بیفرۆشن، بەڵام بەمەرجێ کە هەقدارییەکەی بۆ خۆیان بێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هەقداریی هینی ئەو کەسەیە کە کۆیلەکە ئازاد دەکا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٩، ژمارە: ١٢٥٤، ١٢٥٥، ١٢٥٦، ١٢٥٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٧ + تاج/٢، زنجیرە: ١٨، ژمارە: ٢٠١٩ + تاج/٢، زنجیرە: ٦٦، ژمارە: ٢٢٣٩}.

## ٦٩٧) پێشگیریی لە فرۆشتنی هەقداریی یا بەخشینی (٣٧٦٧ - ٣٧٦٨)

٨٩٨- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلاَءِ وَعَنْ هِبَتِهِ. {الحديث: ٣٧٦٧ = ٣٧٦٤ فم. بخاري. عتق: ٢٥٣٤، ٦٧٥٦. أبو داود. فرائض: ٢٩٢٥. نسائي. بيوع: ٤٦٧٣. تحفة الأشراف: ٧١٨٦}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەو گیریی کردووە لەفرۆشتنی سەرداریو بەخشینی بەکەسێکی تر. {تاج/٢، زنجیرە: ٢٠، ژمارە: ٢٠٢٣ — ش/د/ت/ن}.

## ٦٩٨) کەسێ سپڵە دەرچێ حاشا لەخێڵی ئازادکەرانی خۆی بکات(٣٧٦٩ - ٣٧٧٣)

٨٩٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ تَوَلَّى قَوْمًا بِغَيْرِ إِذْنِ مَوَالِيهِ فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللَّهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ، لاَ يُقْبَلُ الله مِنْهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَرْفٌ وَلاَ عَدْلٌ ». {الحديث: ٣٧٧١ = ٣٧٦٧ فم}:

ئەم فەرموودەیە لەپێشەوە لەم جێگەیەدا: ژمارە: {٧٧٧} ڕۆیشت.

## ٦٩٩) کاتێ لە کۆیلەی خۆی دا با ئازادی بکا. (٤٢٧٤ - ٤٣١٣)
## بَابٌ: إِذَا ضَرَبَ مَمْلُوكَهُ أَعْتَقَهُ

٩٠٠- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنْتُ أَضْرِبُ غُلاَمًا لِي، {زاد في رواية: فجعل يقول: أعوذ باللّه، قال: فجعل يضربه، فقال: أعوذ برسول الله فتركه} فَسَمِعْتُ مِنْ خَلْفِي صَوْتًا: اعْلَمْ أَبَا مَسْعُودٍ! لَلَّهُ أَقْدَرُ عَلَيْكَ مِنْكَ عَلَيْهِ، فَالْتَفَتُّ، فَإِذَا هُوَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: هُوَ حُرٌّ لِوَجْهِ اللَّهِ، فَقَالَ: « أَمَا لَوْ لَمْ تَفْعَلْ لَلَفَحَتْكَ النَّارُ، أَوْ لَمَسَّتْكَ النَّارُ ». {الحديث: ٤٢٨٤ = ٤٢٧٦ ف.م}:

ئەبو مەسعوودی بەدری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ بەقەمچی خوڵامێکی خۆمم فەلاقە دەکرد، ئەویش هەر دەیگوت: (أَعُوذُ بِاللَّهِ: پەنا دەگرم بەخودا لەئێش و ئازاری تۆ). واتە: توخوا لێم مەدە، منیش هەرلێم دەدا، ئەوجا خوڵامەکە گوتی: پەنا دەگرم بە پەنای پێغەمبەر لەدەست ئەم لێدانەی تۆ). واتە: توو پێغەمبەر لێم مەدە، ئیتر منیش وازم لێ هێنا. لەپشتمەوە گوێم لەدەنگێ بوو دەیفەرموو: بزانە ئەی ئەبو مەسعوود! منیش لەبەر تووڕەیی خۆم لە دەنگەکە باش تێ نەگەیشتم، کەهاتە بەرەوە ڕوانیم حەزرەتە، ڕوانیم دەفەرموێ: (هۆ ئەبو مەسعوود! باش باش بزانە: کەخودا باشتر بەتۆ دەوێرێ، هەتا تۆ بەم خوڵامە). جامنیش گوتم: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بەشایەت بە، ئەو خوڵامە ئازادبێ لەبەر ڕەزای خودا، فەرمووی: (دەی ئەگەر ئاوات نەکردایە، ئاگری دۆزەخ چەشکەی دەکردیت) یا فەرمووی: (ئاگری دۆزەخ چزەی لێ هەڵ دەستاندی!). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠٤}.

٩٠١- عَنْ زَاذَانَ أَنَّ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) دَعَا بِغُلاَمٍ لَهُ فَرَأَى بِظَهْرِهِ أَثَرًا، فَقَالَ: أَوْجَعْتُكَ؟ فَقَالَ: لاَ، قَالَ: فَأَنْتَ عَتِيقٌ. قَالَ: ثُمَّ أَخَذَ شَيْئًا مِنَ الأَرْضِ فَقَالَ: مَا لِي فِيهِ مِنَ الأَجْرِ مَا يَزِنُ هَذَا، إِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ

ضَرَبَ غُلَامًا لَهُ حَدًّا لَمْ يَأْتِهِ أَوْ لَطَمَهُ فَإِنَّ كَفَّارَتَهُ أَنْ يُعْتِقَهُ ». {الحديث: ٤٢٧٥ = ٤٢٦٧ فم}:

ئەم فەرموودەيە لە صەحيحى موسليما ئاوايە:

زاذان (رەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: ئيبنو عومەر (رەزاى خودايان لێ بێ) جارێ لە خولاميْكى خۆيدا، دوايى بانگى كرد، روانى شوێنەوارى لێدانەكە وابەپشتيەوە، پێى فەرموو: ئەرێ ئێشم پێ گەياندى؟ گوتى: نەء، فەرمووى: (دەى تۆ ئازاديت!). فەرمووى: پاشان ئيبنو عومەر چوكلێكى لەزەوييەكە هەلگرتو فەرمووى: (سەنگى ئەمەم پاداش بۆ نييە لەئازادكردنى ئەم بەندەيەدا، چونكە لەبەر كەفارەتى ئەوە ئازادم كردووە كە لێيم داوە،، بۆ خۆم لە خۆشەويستم بيست، دەيفەرموو (دروودى خوداى لەسەر بێ): (هەركەسێ دارى حەدد لەخولامى خۆى بدا، كە ئەو خولامە شايستەى ئەو دارى حەددە نەبێ، يا بەبەرى دەست زللەيەكى لێ بدا، ئەوە بەمەرجێ لەو تاوانە پاك دەبێتەوە كە لەجياتى ئەوە ئازادى بكا). {رياض/٤، زنجيرە: ٢٨٢، ژمارە: ١٦٠٥}.

٩٠٢- عَنْ سُوَيْدِ بْنِ مُقَرِّنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ جَارِيَةً لَهُ لَطَمَهَا إِنْسَانٌ، فَقَالَ لَهُ سُوَيْدٌ: أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ الصُّورَةَ مُحَرَّمَةٌ. فَقَالَ: لَقَدْ رَأَيْتُنِي وَإِنِّي لَسَابِعُ إِخْوَةٍ لِي مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَمَا لَنَا خَادِمٌ غَيْرُ وَاحِدٍ، فَعَمَدَ أَحَدُنَا فَلَطَمَهُ فَأَمَرَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نُعْتِقَهُ. {الحديث: ٤٢٨٠ شيحا = ٤٢٧٢ فم. أبو داود. أدب: ٥١٦٦. ترمذى. نذورو أيمان: ١٥٤٢، تحفة الأشراف/٤٨١١}:

ئەبو شوعبەى عيراقى (رەحمەتى خوداى لێ بێ) فەرمووى: سووەيدى كوڕى موقرين (رەزاى خوداى لێ بێ) كارەكەرێكى هەبوو، مرۆڤێ شەقازللەيەكى لێ دا، سووەيد پێى گوت: چۆن شتى وا دەكەى، ئەدى نازانى كە لێدانى دەموچاو، كە شێوەو وێنەى مرۆڤى لێ كێشراوە، لەبەر رێزى حەرامو نادروستە؟ ئەوجا سووەيد فەرمووى: ئێمە حەوت برابووين، لەخزمەت پێغەمبەردا، تاقە كارەكەرێكمان هەبوو، برا بچكۆلەكەمان شەقازللەيەكى لێدا، ئيتر پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) لە تۆڵەى ئەو شەقازللەيەدا،

فەرمانی پێمان کرد، ئازادمان کرد. {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٢، ژمارە: ٦٨٠٣/٤ - ٦٨} + {تاج/٢، ژمارە: ٢٠٣٢} + {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٣٣، ٢٠٣٠} + {تاج/٣، زنجیرە: ٩٨، ژمارە: ٢٣٨٣}.

## ٧٠٠) هەڕەشەی قورس لەکەسێ بوختیانی داوێنپیسی بۆ کۆیلەیێ بکا(٤٢٧٤ - ٤٣١٣)

## بابٌ: التَّغْلِيظُ عَلَى مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكاً بِالزِّنا

٩٠٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ أَبُو الْقَاسِمِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ قَذَفَ مَمْلُوكَهُ بِالزِّنَا يُقَامُ عَلَيْهِ الْحَدُّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ إِلاَّ أَنْ يَكُونَ كَمَا قَالَ ». {الحديث: ٤٢٨٧ شيحا = ٤٢٧٩ ف.م. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧٣ = ٦٨٥٨ فتح الباري. أبو داود. أدب: ٥١٦٥. ترمذي. بروصلة: ١٩٤٧. تحفة الأشراف: ١٣٦٢٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: بەگوێی خۆم ژنەوتم لەزاری پیرۆزی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ بوختیان بکا بۆ بەندە، یا کۆیلە، یا کەنیزەکی خۆی، بەڵام کۆیلەکەی، ژن بێ یا پیاو، بێ تاوان بێو پاك بێ لەو قسەو بوختیانە، ئەوە لەرۆژی قیامەتا، ئەو خاوەن کۆیلەیە دادەنرێ بە بوختیانکار، لەرۆژی قیامەتا لەسەر ئەو بوختیانە داری حەددی لێ دەدرێ، مەگەر وەك دەڵێ کۆیلەکە وابێ، ئەوە داری حەددی لێ نادرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٩٥، ژمارە: ٢٣٧٠ ج/٤}.

## ٧٠١) چاکەکردن لەگەڵ کۆیلەدا، لەبەرگا، لەخۆراکا، نابێ ئەرکی واشیان بدرێ بەسەردا کە لەکێش و وزەیانا نەبێ. (٤٢٧٤ - ٤٣١٣)

## باب: الإحسانُ إلَى المملوكِينَ فِي الطَّعَامِ وَاللِّبَاسِ وَلاَ يُكَلَّفُونَ ملاَ يُطِيقُونَ

٩٠٤- عَنِ الْمَعْرُورِ بْنِ سُوَيْدٍ قَالَ: مَرَرْنَا بِأَبِي ذَرٍّ بِ(الرَّبَذَةِ) وَعَلَيْهِ بُرْدٌ، وَعَلَى غُلاَمِهِ مِثْلُهُ، فَقُلْنَا: يَا أَبَا ذَرٍّ لَوْ جَمَعْتَ بَيْنَهُمَا كَانَتْ حُلَّةً، فَقَالَ: إِنَّهُ كَانَ بَيْنِي وَبَيْنَ رَجُلٍ مِنْ إِخْوَانِي كَلاَمٌ وَكَانَتْ أُمُّهُ أَعْجَمِيَّةً، فَعَيَّرْتُهُ بِأُمِّهِ، فَشَكَانِي إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه

وسلم)، فَلَقِيتُ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: « يَا أَبَا ذَرّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ »، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ سَبَّ الرِّجَالَ سَبُّوا أَبَاهُ وَأُمَّهُ. قَالَ: « يَا أَبَا ذَرّ إِنَّكَ امْرُؤٌ فِيكَ جَاهِلِيَّةٌ، هُمْ إِخْوَانُكُمْ جَعَلَهُمُ اللَّهُ تَحْتَ أَيْدِيكُمْ، فَأَطْعِمُوهُمْ مِمَّا تَأْكُلُونَ، وَأَلْبِسُوهُمْ مِمَّا تَلْبَسُونَ، وَلاَ تُكَلِّفُوهُمْ مَا يَغْلِبُهُمْ، فَإِنْ كَلَّفْتُمُوهُمْ فَأَعِينُوهُمْ ». {الحديث: ٤٢٨٩ شيحا = ٤٢٨١ فم. بخاري. إيمان: ٣٠، ٢٥٤٥، ٦٠٥٠. أبو داود. أدب: ٥١٧٥. ترمذي. بروصلة: ١٩٤٦. ابن ماجة. أدب: ٣٦٩٠. تحفة الأشراف/ ١١٩٨٠}:

مەعروورى كوڕى سووەيد فەرمووى: لەڕەبەزە ئەبو زەڕم بينى، دەستێ بەرگى نيوەى تازەو نيوەى كۆنى لەبەردا بوو، خولامەكەيشى هەروەها دەستێ بەرگى وەهاى لەبەردا بوو، پێمان گوت: ئەى ئەبو زەڕ! هۆى چييە كە بەرگى خۆت‌و بەرگى خولامەكەت وەك يەكە، هى هەردوو لاتان نيوەى تازەيەو نيوەى كۆنە، ئەگەر هەردوو پارچە تازەكە بۆ يەكێكتان بوايەو هەردوو پارچە كۆنەكەيش بۆ يەكێكتان بوايە، هەركەسەتان قاتێكى يەك ڕەنگى لەبەردا دەبوو؟

ئەويش فەرمووى: لەسەردەمى حەزرەتدا، قسەم بەبرادەرێكى خۆم گوت، كە بيلال بوو، دايكى بێگانە بوو، عەرەب نەبوو، تانەى ئەوەم لێدا كە دايكى ڕەشە، پێم گوت: ئەى كوڕى ژنە ڕەشەكە!

ئەويش لەلاى پێغەمبەر (دروودى خوداى لەسەر بێ) سكالاى ئەوەى لەدەستم كرد، كاتێ چوومە خزمەتى حەزرەت (دروودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى پێم: (ئەى ئەبو زەڕ! هێشتا بۆنى ڕەگەز پەرستى سەردەمى نەزانى (جاهيلييەت)ت لێ دێ). منيش عەرزيم كرد: قوربان! ئەى پێغەمبەرى خودا! خۆى وايە: كەسێ جنێو بەخەڵك بدا، خەڵكيش جنێو بە باوك‌و دايكى ئەو دەدەن. فەرمووى: (ئەى ئەبو زەڕ! ئەوە ڕەوشتى سەردەمى نەزانييە كە لەتۆدا ماوە، ئەم كۆيلانە هەرچەند بەندەو خولام‌و بەردەست‌و نۆكەرى ئێوەن، بەلام لە بنەڕەتدا براتانن‌و ئێوەو ئەوان لەيەك دايك‌و باوكن، كە باوە ئادەم‌و دايە حەوان، ئەوەندە هەيە خودا لەبەر حيكمەتێ، ئەوانى كردووە بەژێر دەستەى ئێوە، دەى برايەكى باش بن، ئەگەر يەكێ لەم

برایانەی خۆتان کەوتە ژێر دەستتان وەك برا رەفتاریان لەگەڵدا بکەن‌و خۆتان چی دەخۆن ئەوەیش بدەن بەوان، وەخۆتان چی لەبەر دەکەن لەهەمان جل‌و بەرگیش بۆ ئەوان بکەن، قەتیش زەحمەتیان مەدەن‌و ئەرکێکی وا مەدەن بەسەریانا کە لەوزەو کێشیانا نەبێت، کە ئەرکێکیش دەدەن بەسەریانا، خۆشتان بەپێی حاڵ‌و توانا یاریدەیان بدەن). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٧، ژمارە: ١٣٦٠/١ - ٤١٤} + {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٢٩} + {تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٣١٨٥ چاپی چوارەم = چ/٤}.

٩٠٥- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِذَا صَنَعَ لأَحَدِكُمْ خَادِمُهُ طَعَامَهُ ثُمَّ جَاءَهُ بِهِ، وَقَدْ وَلِیَ حَرَّهُ وَدُخَانَهُ فَلْيُقْعِدْهُ مَعَهُ فَلْيَأْكُلْ، فَإِنْ كَانَ الطَّعَامُ مَشْفُوهًا قَلِيلاً فَلْيَضَعْ فِی يَدِهِ مِنْهُ أُكْلَةً أَوْ أُكْلَتَيْنِ ». قَالَ دَاوُدُ وهو ابن قيس: يَعْنِی لُقْمَةً أَوْ لُقْمَتَيْنِ. {الحديث: ٤٢٩٣ شيحا = ٤٢٨٥ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٩٢ = ٢٥٥٧، ٥٤٦٠. تحفة الأشراف: ١٤٦٢٨}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان نۆکەرەکەی نانی بۆ دروست کرد، ئەوجا بۆی دانا، دیارە کەئەو پێوەی ماندوو بووەو ئەو تینی گەرماکەیی چەشتووەو دووکەڵەکەی چووە بەسەرو چاویدا، کەواتە با لەگەڵ خۆی دایبنیشێنێ هەتا نانەکەی لەگەڵا بخوات، خۆ ئەگەر نانەکە کەمبوو، وەدای نەنیشان لەگەڵ خۆی، با پاروویێ، دوو پارووی لێی بداتێ) داوودی کوڕی قەیس فەرمووی: (واتە: تیکەیێ یا دوو تیکەی پێ بدات). {تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٣١ + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٧، ژمارە: ١٣٦١/٢ - ٤١٥}.

## ٧٠٢) خێرو پاداشی کۆیلەیێ کە دڵسۆزبێ بۆ خاوەنەکەی‌و بەجوانیش خودای خۆی بپەرستێ. (٤٢٧٤ - ٤٣١٣)

٩٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الْعَبْدَ إِذَا نَصَحَ لِسَيِّدِهِ، وَأَحْسَنَ عِبَادَةَ رَبِّهِ فَلَهُ أَجْرُهُ مَرَّتَيْنِ ». {الحديث: ٤٢٩٤ شيحا = ٤٢٨٦ فم}:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرموی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (ئەو بەندەیەی لەگەڵ ئاغاکەی دڵسۆزو ساغ بێ، لەهەمان کاتدا بەجوانی خودای خۆی بپەرستێ، ئەوە دووقات پاداشی باشی بۆهەیە). {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٣٧، ژمارە: ١٣٦٢ + تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٢٧}.

٩٠٧- عَنِ أَبُو هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الْمُصْلِحِ أَجْرَانِ »، وَالَّذِى نَفْسُ أَبِى هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ لَوْلاَ الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّى لأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ قَالَ: وَبَلَغَنَا أَنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ لَمْ يَكُنْ يَحُجُّ حَتَّى مَاتَتْ أُمُّهُ لِصُحْبَتِهَا). {الحديث: ٤٢٩٦ شيحا = ٤٢٨٨ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی:** (بەندەی زەڕ خڕیدەی باشی چاکە خواز، دوو پاداشی گەورەی بۆ هەیە). ئەبو هورەیرە دەیفەرموو: بەو کەسە کە گیانی منی بەدەسە، ئەگەر لەبەر خاتری خەباتو تێکۆشانو غەزا لەڕێگەی خوداداو لەبەر حەج کردنو خزمەتی دایکم نەبێ، حەزم دەکرد کە بەبەندەیی بمرم.

راوی دەفەرموێ: بەئێمە گەیشتۆتەوە کە ئەبو هورەیرە، جگە لەحەجە فەرزەکەی، حەجی تری نەکردووە، هەتا دایکی مردووە، لەبەر خزمەتی دایکی. {ریاض/ ٣، زنجیرە: ٢٣٨، ژمارە: ١٣٦٣. تاج/٢، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ٢٠٢٨}.

### ٧٠٣) فرۆشتنی کۆیلەی پاشە مەرگە، بەمەرجی خۆی
### بَابٌ: فِي بَيْعِ الْمُدَبَّرِ إِذَا لَمْ يَكُنْ لَهُ مَالٌ غَيْرُهُ

بڕوانە فەرموودەکەی سەرەتای نامەی ژیوارەکان، فەرموودەکەی جابیری کوڕی عەبدوڵلا، ژمارە: ٨٨٣.

**روونکردنەوە:**

کورتو پوخت: لەم سەردەمەدا کۆیلەیی تاکە کەسی نەماوە بەلام کۆیلەیی گەلانو خاکو نیشتمان سەرەتایەتی، وە ئەو چەمکو مەبەستو پێشنیارو خێرو

پاداشانەی کە لەبابەتی کۆیلەیی‌و ئازادیکردن‌و باشبوون‌و چاکەکردن لەگەڵ تاکە کەسدا مەبەستن‌و پەسەندن، لەگەڵ گەلی کۆیلەیشدا زیاتر مەبەست‌و پەسەندن.

بەیادی ئەو رۆژگارە ناهەموارە دوورو درێژەی کە لەکەرکووکی بووکی کوردستان، دیل‌و کۆیلەو ژێر چەپۆکەی ژێر دەستی ئەعرابەکانی (حیزبی بەعثی عەرەبی ئیشتراکی) بووین، وە بەئومێدی ئەوەی کە ئەم سەربەستی‌و ئازادییەی کەئێستا لەهەرێما هەیە، دەرووی رەحمەتی خودابێ‌و هەتاسەر بەردەوام بێ‌و پرشنگی بگاتە هەموولایەکی کوردستانی نیشتمانی کوردان‌و ئەم گەندەڵانەی خۆمان نەبن بەهۆی داخستنی ئەم دەرووی رەحمەتە، بۆ بەیانی حاڵ‌و بۆ پەند وەرگرتن لە پەندەکان‌و بۆ بەراوردێ لەنێوان هەنووکەو رابردوودا، بەهیوای سوپاسی خودا لەسەر نازو بەهرەکانی، ئەم چوارینەتان عەرز دەکەم، کەبۆ تەعبیر لەحاڵی شڕی کوردی کەرکووك، کاتی خۆی گوتوومە:

قڵچەی بۆیاخی و گسکی کەناسیی
بۆ کوردان بوونە: کەواو کراسی
هەندێکی تریان لەبەربێ کەسی
بوونەتە مەلا، زۆر بەکەساسی
وەی لەرۆژی رەش!! ئای لە کەساسی
وای لە کەساسیی کاتی ژێر دەسی!!



# ١٨- نامەی کڕین و فرۆشتن

## كتَابُ البُيُوعِ

{بڕوانە: تەجریدی بوخاری، بەرگی سێیەم، زنجیرە: ٣٩ لەژمارە: ٩٣٣ هەتا ژمارە: ٩٩٧ + فیقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، زنجیرە: ١٨٧، لاپەڕە: ٤٧١ چاپی تاران + تاج الأصول بەرگی دووەم، چاپی چوارەم، زنجیرە: ١٥٠، لاپەڕە: ٣١٨ بە ژمارە: ١٧٥٦ دەست پێ دەکات}.

### ٧٠٤) فرۆشتنی خۆراك بەخۆراكی وێنەی خۆی. (٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)

### بَابٌ: بَيْعُ الطَّعَامِ بِالطَّعَامِ مِثْلاً بِمِثْلٍ

٩٠٨- عَنْ مَعْمَرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ، أَنَّهُ أَرْسَلَ غُلاَمَهُ بِصَاعِ قَمْحٍ، فَقَالَ: بِعْهُ، ثُمَّ اشْتَرِ بِهِ شَعِيرًا، فَذَهَبَ الْغُلاَمُ فَأَخَذَ صَاعًا وَزِيَادَةَ بَعْضِ صَاعٍ، فَلَمَّا جَاءَ مَعْمَر، أَخْبَرَهُ بِذَلِكَ، فَقَالَ لَهُ مَعْمَرٌ: لِمَ فَعَلْتَ ذَلِكَ؟ انْطَلِقْ فَرُدَّهُ، وَلاَ تَأْخُذَنَّ إِلاَّ مِثْلاً بِمِثْلٍ، فَإِنِّى كُنْتُ أَسْمَعُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وآله وسلم) يَقُولُ: « الطَّعَامُ بِالطَّعَامِ مِثْلاً بِمِثْلٍ » قَالَ: وَكَانَ طَعَامُنَا يَوْمَئِذٍ الشَّعِيرَ. قِيلَ لَهُ: فَإِنَّهُ لَيْسَ بِمِثْلِهِ، قَالَ: إِنِّى أَخَافُ أَنْ يُضَارِعَ. {الحديث: ٤٠٥٦ شيحا = ٤٠٥١ فم}:

مەعمەری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودای لێ بێ) خوڵامەکەی خۆی نارد، مەنێ گەنمی پێدا، فەرمووی پێی: (ئەم گەنمە بفرۆشەو بەپارەی گەنمەکە چەندی کرد جۆم بۆ بکڕە). خوڵامەکەیش چوو گەنمەکەی گۆڕییەوە بەمەنێ جۆو بەهەندێ زیاتریش، جاکاتێ مەعمەر هاتەوە، خوڵامەکە پێی گوت کە ئاوامکردووە، مەعمەریش پێی فەرموو: بۆچی شتی وا دەکەی؟ بڕۆ زیادەکە بەرەوە بۆ خاوەنی، گەنمەکە چەندە رێك بەقەد ئەو وەرگرەو بەس، یەك بەیەك نەزیاد، نەکەم، چونکە من بۆخۆم، لە پێغەمبەرم دەبیست دەیفەرموو: (خۆراك بەخۆراك، هەرچەشنێ بەچەشنی خۆی سەر بەسەر، وەکوو یەك بەبێ زیادو کەم!). مەعمەر فەرمووی: ئەوسەردەمە

خۆراكمان بەس جۆبوو. گوترا بە مەعمەر: (جاكەی جۆ لە چەشنی گەنمە، جۆ چەشنێكەو گەنم چەشنێكی ترە، كەواتە زیادەكە قەیدی نییە؟). مەعمەر فەرمووی: بەڕاستی من دەترسم كە هاوچەشن بن، چونكە جۆو گەنم لەیەكەوە نزیكن‌و بە هەردووكیشیان دەگوترێ خۆراك، ئەوكاتە دەبێ بەسوودو سوودیش نادروستە).

**روونكردنەوە:**

١ -ڕێبازی جەماوەری شەرع زانەكان: گەنم‌و جۆ دوو جۆری جیا جیان، هاوجۆرو هاوچەشن نین، لەبەرئەوە دروستە كە یەكێكیان لە یەكێكیان زیاتر بێ، ئەم بۆچوونەی مەعمەر لەبەر وەرع‌و دووربینییە، دەنا گۆڕینەوەی گەنم بەجۆ زیادیشی هەبێ دروستە.

٢ - مەعمەری كوڕی عەبدوڵڵای كوڕی نەضلە، لە موسوڵمانە هەرە پێشینەكانە، دوو كۆچی كردووە، كۆچێ بۆ حەبەشەو كۆچێ بۆ مەدینە، تەمەنی زۆر درێژ بووە، لەمەدینە نیشتەجێ بوو، لەبنەڕەتا خەڵكی مەككە بوو.

**٧٠٥) پێشگیریی لە فرۆشتنەوەی خواردەمەنی، بەر لەوەرگرتنی(٣٨١٥ - ٣٨٢٨)**
**باب: النهی عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ قَبْلَ أَنْ يُسْتَوْفَى**

٩٠٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنِ ابْتَاعَ طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ ». قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: وَأَحْسِبُ كُلَّ شَىْءٍ مِثْلَهُ.
{الحديث: ٣٨١٥ شيحا = ٣٨١١ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٦٧ = ٢١٣٢، ٢١٣٥ فتح البارى. أبو داود. بيوع. طعام: ٣٤٩٧. ترمذى. بيوع: ١٢٩١. نسائى. بيوع: ٤٦١٢ تحفة الأشراف: ٥٧٣٦}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەركەسێ خۆراكێكی لەكەسێ تر كڕی، تاخۆی بەتەواوی وەری نەگرێ نەیفرۆشێتەوە بەكەسێكی تر).

ئیبنو عەبباس دەفەرموێ: وادەزانم هەموو شتێ لەم لایەنەوە وەك خۆراك وایە).

٩١٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ لِمَرْوَانَ: أَحْلَلْتَ بَيْعَ الرِّبَا؟ فَقَالَ مَرْوَانُ: مَا فَعَلْتُ، فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ: أَحْلَلْتَ بَيْعَ الصِّكَاكِ وَقَدْ نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ الطَّعَامِ حَتَّى يُسْتَوْفَى؟ قَالَ: فَخَطَبَ مَرْوَانُ النَّاسَ فَنَهَى عَنْ بَيْعِهَا. قَالَ سُلَيْمَانُ: فَنَظَرْتُ إِلَى حَرَسٍ يَأْخُذُونَهَا مِنْ أَيْدِي النَّاسِ. {الحديث: ٣٨٢٧ شيحا = ٣٨٢٤ فم}:

ئەو سەردەمەی مەڕوانی کوری حەکەم، لەلایەنی موعاوییەوە کرابوو، بەمیری سەر مەدینە، ئەبو هورەیرە پێی فەرموو: تۆ مامەڵەی کڕینو فرۆشتنی سوودت حەڵاڵ کردووە؟

مەڕوان فەرمووی: شتی وام نەکردووە، کامەیە پێم بڵێ؟ ئەبو هورەیرەیش فەرمووی: ئەی ئەوە نییە کە کڕینو فرۆشتنی چەکت حەڵاڵ کردووە، وەلحاڵ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی کردووە لەوە، کە خۆراك بفرۆشێتەوە، پێش ئەوە کە بەتەواوی وەربگیرێ!؟

فەرمووی: جا مەڕوان وتارێکی دا بۆ خەڵکەکەو نەهی کرد لەکڕینی چەك. سولەیمان فەقێی ئەبو هوروەیرەیە لەگێڕانەوەی ئەم فەرموودەیەدا، دەفەرموێ: بەچاوی خۆم دەمبینی کە پاسەوانەکان، ئەو چەکانەیان دەسەندەوە، کە بەدەستی خەڵکەوە بوون.

**ڕوونکردنەوە:**

١- بەدیمەن فرۆشتنی چەك، یا کومپیالە، پەیوەندی نییە بە فرۆشتنی خۆراکەوە، بەڵام ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: مەبەست لەچەك لەم شوێنەدا، ئەوەیە کە لەم سەردەمەی ئێمەدا پێی دەگوترێ: (بِطَاقة تموينيّة: فۆڕمی خۆراك: فۆڕمی بایعی).

٢ - نــەوەوی دەفــەرموێ: (مەبەســت لەچــەك لــەم شــوێنەدا پســووڵەیێ بــووە، کاربەدەستی شوێنێ دەری دەکاو لێی دەنووسێ، ئەوەندە خۆراك، یا ئەوەنـدە شـتی تـر بـدەن بەهـەڵگری ئـەم پسـووڵەیێ، لـەماڵی حوکومـەت). نـەوەوی دەفــەرموێ: فرۆشــتنی ئــەم جــۆرە کــارتو فۆرمــە دروســتە لەلایــەنی خاوەنەکەیەوە، وە فەرمووەدەکەی ئەبو هورەیرە تەئویل دەکا.

٣ مەڕوانی کوڕی حەکەم ئەمەوییە، قوڕەیشییە، دەڵێن: لەپاش کۆچ بەدوو ساڵ، یا بەچوار ساڵ لەدایك بووە، چەسپاوە کە پێغەمبەری بەمنداڵی دیوە، بەفەقیـە دادەنـرێ، لـە صـەحیحی بوخاریـدا فـەرمووەدەی هەیـە، بڕوانـە: تەجریـد/٢، ژمارە: ٧٩٩ = ١٦٩٤ فتح الباری، نووسەری حەزرەتی عوسمان بوو، فەرمانڕەوای موعاوییە بوو لەسەر مەدینە.

### ٧٠٦) گواستنەوەی خۆراك ئەگەر بەگۆترە فرۆشرا. (٣٨١٥ - ٣٨٢٨)
### بابٌ: نَقْلُ الطعام إذا بِيعَ جُزَافاً

٩١١- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنِ اشْتَرَى طَعَامًا فَلاَ يَبِعْهُ حَتَّى يَسْتَوْفِيَهُ » قَالَ: وَكُنَّا نَشْتَرِى الطَّعَامَ مِنَ الرُّكْبَانِ جِزَافًا فَنَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ نَبِيعَهُ حَتَّى نَنْقُلَهُ مِنْ مَكَانِهِ. {الحديث: ٣٨٢١ = ٣٨١٧، ٣٨١٨ فم} :

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (هەرکەسـێ خـۆراکی لەکەسـێ کـڕی، تـا بەتـەواوی لێـی وەرنـەگرێ نەیفرۆشـێتەوە بەیـەکێکی تـر). ئیبنـو عومـەر فـەرمووی: جـاران لـەکاروانی خۆراکمـان بـەگۆترە دەکڕی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی پێمان نەدەدا، کە بیفرۆشینەوە، بەیەکێ تر، تا نەیگوێزینەوە لە شوێنەکەی خۆی).

**ڕوونکردنەوە:**

ئـەم فەرمووەدەیـە فیقهێکـی عەمـەلی واتیـادا، لەبەرئـەوە دەڵـێم: مامۆسـتای عەسـقەلانی لـە فەتحولباریـدا دەفـەرموێ: (کـورتو پوخـت: وەرگرتنـی فرۆشـراو

لەلایەنی کڕیارەوە بۆ دامەزراندنی فرۆشتنەکە بەسە، ئەگەر لەشوێنی خۆشی نەیگوێزێتەوە بۆ شوێنی تر، دەتوانێ بیفرۆشێتەوە بەکەسێ تر).

### ٧٠٧) فرۆشتنی خۆراك لەگۆترە، بەخۆراك بە پێوانەی دیاریکراو. (٣٨٥٥ - ٣٨٧٧)

### باب: بَيْعُ الطَّعَامِ المكيل بِالجُزَاف

٩١٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْمُزَابَنَةِ: أَنْ يَبِيعَ ثَمَرَ حَائِطِهِ إِنْ كَانَتْ نَخْلاً بِتَمْرٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ كَرْمًا أَنْ يَبِيعَهُ بِزَبِيبٍ كَيْلاً، وَإِنْ كَانَ زَرْعًا أَنْ يَبِيعَهُ بِكَيْلِ طَعَامٍ، نَهَى عَنْ ذَلِكَ كُلِّهِ. {الحديث: ٣٨٧٦ شيحا = ٣٨٧٣ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٦ = ٢١٧١، ٢١٧٢، ٢١٨٥، ٢٢٠٥. نسائي. بيوع: ٤٥٦٣. أبن ماجة. تجارات: ٢٢٦٥. تحفة الأشراف: ٨٢٧٣}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی دەکرد لە موزابەنە، موزابەنە بەکوردی واتە: بەرسیلەکاری، یا تەڕەکاری، یا تەڕە فرۆشی، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا بریتییە لەوە: کە بەروبوومی دێبەرەکەی، ئەگەر باخی خورما بوو، بەری خورماکەی، بەفەریکی، کەپێی دەگوترێ: روتاب، یا بەرسیلە، بیفرۆشی بەخورمای کامڵ، بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وە ئەگەر مێو بوو، بەرەکەی بخەملێنێو بیفرۆشێ بە ئەندازەیە مێوژ کە پێوانەکەی زانراوبێ، وەك ئەوە بڵێ: چی خورما، یا بەرسیلە، یاترێ، یا روتاب، بەم باخەی منەوە هەیە، ئەوا فرۆشتم بەبیست ربە خورما، یا چل ربە مێوژ، بەتۆ، وە ئەگەر شینایی‌و دانەوێڵە بوو، بیفرۆشێ بەدانەوێڵەی وشك، بەپێوانە، وەك ئەوە بڵێ: بەری ئەم پارچە نیسکەم فرۆشت بەتۆ بە پەنجا ربە نیسکی ئاسایی.

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیری دەکرد لەم مامەڵانە لەهەموویان.

### ٧٠٨) فرۆشتنی بەروبوومو خۆراك وەك خورماو شتی وا سەربەسەر(٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)

### باب: بَيْعُ التَّمْرِ مِثْلاً بِمِثْلٍ

٩١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَأَبِي سَعِيدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بَعَثَ أَخَا بَنِى عَدِىّ الأَنْصَارِىَّ فَاسْتَعْمَلَهُ عَلَى خَيْبَرَ، فَقَدِمَ بِتَمْرٍ جَنِيبٍ فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَكُلُّ تَمْرِ خَيْبَرَ هَكَذَا؟ ». قَالَ لاَ وَاللَّهِ يَا رَسُولَ اللَّهِ، إِنَّا لَنَشْتَرِى الصَّاعَ بِالصَّاعَيْنِ مِنَ الْجَمْعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَفْعَلُوا، وَلَكِنْ مِثْلاً بِمِثْلٍ أَوْ بِيعُوا هَذَا وَاشْتَرُوا بِثَمَنِهِ مِنْ هَذَا، وَكَذَلِكَ الْمِيزَانُ ». {الحديث: ٤٠٥٧ = ٤٠٥٢ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٨ = ٢٣٠١، ٢٣٠٢، ٤٢٤٤، ٧٣٥٠. نسائى. بيوع: ٤٥٦٧}:

ئەبو هورەیرەو ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموویان: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) برادەرێ ئەنصاری، لەخێڵی بەنی عەدی، کەناوی سەوادی کوڕی غەزیيە بوو، کردی بەسەرکاری سەر قەڵای خەیبەر، کەهاتەوە خورمایەکی نایابی بۆ هێنا، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا خورمای خەیبەر هەمووی هەروایە؟). فەرمووی: نەبەخوا، ئەی پێغەمبەری خودا! بەڵکو مەنێ لەم خورما نایابە دەکڕین بەدوو مەن خورمای جەڵەبی. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نا وامەکەن بەڵام دەبێ سەر بەسەر بێ، یاخود ئەم نایابە بفرۆشن‌و بە پارەکەی لەو ئایەخە بکڕن، ئیتر خوای بەپێوانە بێ، یا بەکێشانەبێ هەروا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦١، ژمارە: ١٨٧٠}.

بڕوانە فەرموودەکەی مەعمەر، ژمارە: ٩٠٨ کە لەپێشەوە رابورد، ئەویش هەر لەم بابەتەیە.

### ٧٠٩) فرۆشتنی کۆمەڵە خۆراك بەگۆترە. (٣٨٢٩ - ٣٨٣٠)

### باب: بَيْعُ الصُّبْرَةِ مِنَ التَّمْرِ

٩١٤- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ الصُّبْرَةِ مِنَ التَّمْرِ لاَ يُعْلَمُ مَكِيلَتُهَا، بِالْكَيْلِ الْمُسَمَّى مِنَ التَّمْرِ. {الحديث: ٣٨٢٩ = ٣٦٢٦ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری (نەهی)ی كردووە لەفرۆشتنی كۆمەڵە خورما لەگۆترە، بە ئەندازەیێ خورمای تر كەپێوانەی زانراوبێ، وەك ئەوە گەلێ كەس دەڵێن: ئەم كۆمەڵە گەنمە كەهێشتا نەپێوراوە، لەبڕ لەسەر من بەبیست ربە گەنم). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤٢. نسائی. بیوع: ٤٥٦١}.

### ٧١٠) مێوە، یابەر، نافرۆشرێ تاخۆش نەبێ. (٣٨٤٠ - ٣٨٥٤)

### بابٌ: لاَ يُبَاعُ الثمرُ حَتَّى يَطِيبَ

٩١٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى أَوْ نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ حَتَّى يَطِيبَ. {الحديث: ٣٨٤٩ = ٣٨٤٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٣ = ٢١٨٩}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری لێمان كرد: لەفرۆشتنی بەری دارو درەخت تاخۆش نەبێو بەكەڵكی خواردن نەیێ).

٩١٦- عَنْ أَبِى الْبَخْتَرِيِّ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ، فَقَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَأْكُلَ مِنْهُ، أَوْ يُؤْكَلَ، وَحَتَّى يُوزَنَ. قَالَ: فَقُلْتُ: مَا يُوزَنُ؟ فَقَالَ رَجُلٌ عِنْدَهُ: حَتَّى يَحْزَرَ. {الحديث: ٣٨٥١ = ٣٨٤٨ فم. بخاري. بيوع: ٢٢٤٦، ٢٢٤٧، ٢٢٤٨، ٢٢٤٩، ٢٢٥٠}:

ئەبولبەختەری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە ئیبنو عەبباسم پرسی، لەبارەی بەری دارخورماوە، ئایا دەفرۆشرێ یانا، فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری دەكا لەفرۆشتنی بەری دارخورما، تا بەكەڵكی خواردن دێ، ئەوكاتە دروستە بیفرۆشێ، وەك فەریكە خورماو روتاب، وەهەتا بەسەر دارەكەوە دەقەبلێنرێ، گوتم: مەبەست لە دەقەبلێنرێ چییە؟ پیاوێ لەخزمەتیدا بوو گوتی: مەبەست ئەوەیە كە خەمڵ بكرێو بەرەكەی بگاتە ڕادەیەكی وا كە خەملكار بەمەزەنە بزانێ كەچەند ربە، یاچەن باتمان خورما دەردەچێ!

### ٧١١) جلەوگیری لەفرۆشتنی بەروبووم تاپێ دەگا. (٣٨٤٠ - ٣٨٥٤)
### بابك النَّهْىُ عَنْ بَيْعِ الثَّمرِ حَتَّى يَبْدُوَ صَلاَحُهُ

٩١٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ النَّخْلِ حَتَّى يَزْهُوَ، وَعَنِ السُّنْبُلِ حَتَّى يَبْيَضَّ وَيَأْمَنَ الْعَاهَةَ، نَهَى الْبَائِعَ وَالْمُشْتَرِيَ. {الحديث: ٣٨٤٠ = ٣٨٣٩ فم. بخاري. بيوع: ٢١٩٤. أبو داود. بيوع: ٣٣٦٧. تحفة الأشراف: ٨٣٥٥}:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **جلەوگیری کردووە لەفرۆشتنی بەری دارخورما، تا ماتە دەدا، سوور یازەرد هەڵ دەگەڕێ، وە لەفرۆشتنی دانەوێڵە لەناو گوڵەکەیدا، بەرلەوە کەسپی هەلگرێو لەدەردو بەلای ئاسمانی رزگاری ببێ، جلەوگیری کردووە لەم جۆرە سەودایە، چ بۆ فرۆشیار چ بۆ کڕیار. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٧}.**

### ٧١٢) باسی فەریکە فرۆش (موزابەنە). (٣٨٥٥ - ٣٨٧٧)
### بابٌ: بَيْعُ الْمُزَابَنَةِ

٩١٨- عَنِ بُشَيْرُ بْنُ يَسَارٍ مَوْلَى بَنِى حَارِثَةَ أَنَّ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ وَسَهْلَ بْنَ أَبِى حَثْمَةَ حَدَّثَاهُ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُزَابَنَةِ، الثَّمرِ بِالتَّمْرِ، إِلاَّ أَصْحَابَ الْعَرَايَا فَإِنَّهُ قَدْ أَذِنَ لَهُمْ. {الحديث: ٣٨٦٨ = ٣٨٦٥ فم = ف.م. بخاري. بيوع: ٢١٩١، ٢٣٨٤، أبو داود. بيوع: ٣٣٦٣. ترمذي. بيوع: ١٣٠٣. تحفة/٤٦٤٦}:

**بوشەیری کوڕی یەسار، ئازادکراوی بەرەبابی بەنی حاریثە** (رەحمەتی خودای لێ بێ) **فەرمووی: رافیعی کوڕی خەدیجو سەهلی کوڕی ئەبو حەیثەمە** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرموویان پێم: پێغەمبەر** (درودی خودای لەسەر بێ) **جلەوگیری کردووە لە فەریکە فرۆش، کە برێتییە لەفرۆشتنی بەروبوومی خەملکراو بەسەرداردەوە، بەخورمای رنراو، یا بەمێوژ. تەنیا بەیعولعەرایای لێ دەرچێ، چونکە پێغەمبەر لەبەر ئاسانکاریو بەرژەوەندی گشتی رێگەی بەیعول عەرایای داوە). لەدواوە واتای عەرایا دەکەین.**

## ٧١٣) فرۆشتنی بەری دارە دۆخە بەخەملْکردنی. (٣٨٥٥ - ٣٨٧٧)
## بَابٌ: بَيْعُ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا

٩١٩- عَنْ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَخَّصَ فِي الْعَرِيَّةِ يَأْخُذُهَا أَهْلُ الْبَيْتِ بِخَرْصِهَا تَمْرًا يَأْكُلُونَهَا رُطَبًا. {الحديث: ٣٨٥٧ = ٣٨٥٤ فم. بخاري. بيوع: ٢١٧٣، ٢١٨٤. ترمذي. بيوع: ١٣٠٠. نسائي. بيوع: ٤٥٤٦. ابن ماجة. تجارات: ٢١٦٨. تحفة الأشراف: ٣٧٢٣}:

زەیدی کوڕی ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) مۆڵەتی بەیعولعەرایای داوە، کە خاوەن باخەکە، لە هەژارەکەی دەکڕێتەوە، دەیقەبلێنێ بە ئەندازەیێ خورمای دیاریکراو، وە خۆیان بەروتابی دەیخۆن).

## ٧١٤) ئەندازەی بەیعولعەرایا چەندە. (٣٨٥٥ - ٣٨٧٧)
## بابٌ: فِي قَدرِ مَايَجُوزُ بَيْعُهُ مِنَ الْعَرَايَا

٩٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَخَّصَ فِي بَيْعِ الْعَرَايَا بِخَرْصِهَا فِيمَا دُونَ خَمْسَةِ أَوْسُقٍ أَوْ فِي خَمْسَةٍ. (يَشُكُّ دَاوُدُ قَالَ: خَمْسَةٌ أَوْ دُونَ خَمْسَةٍ). {الحديث: ٣٨٦٩ شيحا = ٣٨٦٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٤ = ٢١٩٠، ٢٣٨٢ فتح الباري. أبو داود. بيوع: ٣٣٦٤. ترمذي. بيوع: ١٣٠١. نسائي. بيوع: ٤٥٥٥. تحفة الأشراف: ١٤٩٤٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ڕێگەی فرۆشتنی بەری دارە بەدۆخە (عەرایا)ی داوە، کە بەسەر دارەکەوە بخەملێنرێ بەخورمای پێگەیشتووی ڕنراو، بەمەرجێ لەپێنج وەسق کەمتربێ، یا فەرمووی: بەمەرجێ وەسق تێ نەپەڕێ). داوود کە ئەم فەرموودەیە لە ئەبو سوفیانەوە، لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە، گومانی لەوەدا هەبوو کە فەرموویەتی: (لەپێنج ویسق تێ نەپەڕێ) یاخۆ فەرموویەتی: (بەمەرجێ لەپێنج وەسق کەمتربێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٣٥ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

**روونكردنەوە:**

١-عەرايا بەچەند واتايێ واتاكراوە، بەڵام پوختەی ئەو واتايانە ئەمەيە: كە خاوەن باخ، دارێ، دوو دار، دەدا بەهەژارێ، كەخۆيان باخيان نەبێ، تابەرەكەی بخۆن و لەپاشا دارەكە هی خۆيەتی، هەروەك چۆن بزنە دۆخە بەهاران دەدرێ بەئاغا، يا بەهەژارێ، يا بەماڵی رەشايی كە ئاژەڵيان نەبێ هەتا دۆكەی بخۆن و پايز ديدەنەوە بەخاوەنی، دارە دۆخەيش (واتە: عەراياش) شتێكە لەم بابەتە. جا گەلێ جار رێ دەكەوێ، هەژارەكە بەرەكە بەكارناهێنێ، جا تابە ئاموشۆی زۆر، يا ناوەخت ئازاری خاوەن باخەكە نەدا، خاوەن باخەكە، بەرەكەی لێ دەكڕێتەوە، بەسەر دارەكەوە دەيقەبلێنن بەخورمای رنراو، بە ئەندازەيەكی دياريكراو خاوەن باخەكە لەباتی روتاب يا ميوەی كە بەدارەكەوەيە ئەو ئەندازە خورما دياريكراوەی دەداتێ.

٢ - بڕوانە تاجول ئوصول، بەرگی دووەم زنجيرە: ١٧٧، لاپەڕە: ٤٠١. باسەی (دۆخە = منيحة) + زنجيرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠).

**٧١٥) بەری فرۆشراوی باخ ئەگەر تووشی دەردوبەڵا بوو، بەر لەڕنين و چنينی.**
**(٣٩٥٢ - ٣٩٥٧)**

**باب: الجَائِحَةُ فِي بَيْعِ الثَّمَرِ**

٩٢١- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لَوْ بِعْتَ مِنْ أَخِيكَ ثَمَرًا فَأَصَابَتْهُ جَائِحَةٌ فَلاَ يَحِلُّ لَكَ أَنْ تَأْخُذَ مِنْهُ شَيْئًا. بِمَ تَأْخُذُ مَالَ أَخِيكَ بِغَيْرِ حَقٍّ؟ ». {الحديث: ٣٩٥٢ شيحا = ٣٩٤٨ ف.م} :

جابيری كوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودايان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر تۆ بەبرای موسوڵمانی خۆت، بەری باخێ، ياداری، بفرۆشی دەردێكی بنەبڕكەر لێيداو فەوتانی، دروست نييە بۆتۆ كەهيچ لەبەهاكەيی لێ وەربگريت، ئاخر لەباتی چی ماڵی براكەت بەناڕەوا وەردەگری؟).

**روونكردنهوه:**

(وَضع الحَوائج) بابەتێكی شەرعییە، دوورو درێژە، دیدو رای زانایان لەبارەیەوە، بەچەند جۆرێكە، بەكۆی دەنگ لەكاتی رووداني كارەساتی وادا، فرۆشیار پیاوەتیو یارمەتیو چاوپۆشی لەبیرنەچێ. ئەوەوی لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (ئەگەر بەروبوومێ فرۆشرا، فرۆشیار تەسلیمی كڕیاری كرد، بەم رەنگە رێگەی دا كەبیڕنێ، بەڵام بەرلەكاتی رنینی دەردوبەڵای ئاسمانی لێیدا، شافیعیو حەنەفیو كەسانی تریش دەفەرموون: (ئەوە كڕیار خۆی بەرپرسیارە، فرۆشیار بۆی هەیە كە بەهاكەی لێ بسێنێ، بەڵام واپەسەندە كە چاوپۆشی لێ بكا). {بڕوانە: تاجول ئوصول/٢، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠، ١٩٢١ چ/٤}.

### ٧١٦) خاوەن قەرزەكان چی ئامادەبوو ئەوە دەبەنو بەس. (٣٩٥٨ - ٣٩٦٢)

### باب: منه: وَأَخْذَ الغُرَمَاءُ مَا وَجَدُوا

٩٢٢- عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أُصِيبَ رَجُلٌ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي ثِمَارٍ ابْتَاعَهَا، فَكَثُرَ دَيْنُهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « تَصَدَّقُوا عَلَيْهِ »، فَتَصَدَّقَ النَّاسُ عَلَيْهِ فَلَمْ يَبْلُغْ ذَلِكَ وَفَاءَ دَيْنِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِغُرَمَائِهِ: « خُذُوا مَا وَجَدْتُمْ وَلَيْسَ لَكُمْ إِلاَّ ذَلِكَ». {الحديث: ٣٩٥٨ = ٣٩٥٤ فم}:

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەسەردەمی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) پیاوێ بەری باخی كڕی، لەپاشا بەرەكە فەوتاو پیاوەكە تێ شكاو بوو بەژێر قەرزو قوڵەوە، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) كە داواكە بەرزەوە كرا بۆڵای فەرمووی: (خێری پێ بكەنوو زەكاتی پێ بدەن!).

خەڵكەكەیش وایان كردو خێرو زەكاتیان پێدا، بەڵام ئەو ئەندازەی كەدایان پێی بەشی بژاردنی قەرزەكەی نەكرد بەتەواوی، جا حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) بەخاوەن قەرزەكانی فەرموو: (چیتان دەست كەتووە بیبەن، ئیتر هەرئەوەتان دەكەوێو بەس). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٢، ژمارە: ١٩٢٠ چ/٤}.

## ٧١٧) ئەگەر باخ فرۆشراو بەری پێوە بوو. (٣٨٧٨ - ٣٨٨٤)
## بابٌ: مَنْ بَاعَ نَخْلاً فِيهَا ثَمَرٌ

٩٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنِ ابْتَاعَ نَخْلاً بَعْدَ أَنْ تُؤَبَّرَ فَثَمَرَتُهَا لِلَّذِى بَاعَهَا إِلاَّ أَنْ يَشْتَرِطَ الْمُبْتَاعُ». {الحديث: ٣٨٨٢ = ٣٨٧٩ فـم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤٥ = ٢٣٧٩. ترمذی. بيوع: ١٢٤٤. تحفة الأشراف/٦٩٠٧}:

عەبدوڵلای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لە پێغەمبەرم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (کەسێ دارە خورما، یا باخە خورمای کڕی، پاش موتوربەکردنی، بەرەکەی بۆ فرۆشیارەکەیە، لەبەرئەوە مافی هاموشۆو ئاودان و شتی وای هەیە، تابەرەکەی دەڕنێ، مەگەر کڕیارەکە مەرج دابنێ کە بەرەکەی بۆ خۆی بێ و فرۆشیاریش لەکاتی گرێدانەکەدا بەوە ڕازی بێ).

## ٧١٨) فرۆشتن لەجۆری (موخابەرە) و (موحاقەلە). (٣٨٨٥ - ٣٨٩٢)
## بابٌ: بَيْعُ الْمُخَابَرَةِ وَالْمُحَاقَلَةِ

٩٢٤- عَنْ زَيْدِ بْنِ أَبِى أُنَيْسَةَ قَالَ: حَدَّثَنَا أَبُو الْوَلِيدِ الْمَكِّيُّ وَهُوَ جَالِسٌ عِنْدَ عَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ الْمُحَاقَلَةِ وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُخَابَرَةِ، وَأَنْ تُشْتَرَى النَّخْلُ حَتَّى تُشْقِهَ. (وَالإِشْقَاهُ: أَنْ يَحْمَرَّ) أَوْ يَصْفَرَّ أَوْ يُؤْكَلَ مِنْهُ شَيْءٌ، وَالْمُحَاقَلَةُ: أَنْ يُبَاعَ الْحَقْلُ بِكَيْلٍ مِنَ الطَّعَامِ مَعْلُومٍ، وَالْمُزَابَنَةُ: أَنْ يُبَاعَ النَّخْلُ بِأَوْسَاقٍ مِنَ التَّمْرِ، وَالْمُخَابَرَةُ: الثُّلُثُ، وَالرُّبُعُ وَأَشْبَاهُ ذَلِكَ. قَالَ زَيْدٌ: قُلْتُ لِعَطَاءِ بْنِ أَبِى رَبَاحٍ: أَسَمِعْتَ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ يَذْكُرُ هَذَا عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: نَعَمْ. {الحديث: ٢٨٨٨ شيحا = ٢٨٨٥ فـم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٩ = ٢٢٠٧، ٢١٨٦، ٢١٨٧. نسائي. إيمان: ٣٨٨٨}:

زەیدی کوڕی ئەبو ئونەیسە فەرمووی: ئەبولوەلیدی مەککی لەخزمەتی عەتای کوڕی ئەبو ڕەباحا دانیشتبوو، گێڕایەوە بۆمان فەرمووی: جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیری کردووە لە

(موحاقەلـە) و (موزابەنـە) و (موخابـەرە) وە نـەیی کـردووە لـەوە کەبـەری دارە خورمـا بفرۆشـرێ، هـەتا ماتـە دەدا، ماتـەدان ئەوەیـە کـەوا سـووربێ، یـاوا زەرد هەلگـەرێ کـە نیشانەی سـەرەتای گـەیینی دیـاری دابـێ، بەشـێوەیێ وا کەبەکـەلکی خواردن بێت. فەرمووده گێرەوە دەفەرموێ:

١ موحاقەلـە، واتـە: قەرسـیلکاریی، برێتییـە لەفرۆشـتنی قەرسـیلو شـینایی نەدووراوە، بەگەنم، یا بەدانەوێڵەی تر، بە پێوانەیەکی زانراو، وەك دەربە، یا شەش تەنەکە.

٢ موزابەنە، واتە: بەرسیلەکاری، واتە: فرۆشتنی روتابو بەرسیلەی تـرێ، بەسـەر دارەوە، بەخورما، یا بەمێوژ بە پێوانەیەکی دیاریکراو، وەك چەند وەسقێ خورما.

٣ موخابەرە، واتە: مڵکانەکاریی، برێتییە لەوە کەیەکێ پارچەیێ زەوی بدا بەکەسێ کە خۆشی بکاو، دایچێنێ، بەمڵکانە، بەسێ یەك، یا بەچوار یەك، یا بەکەمتر، یا بەزیاتر.

زەید فەرمووی: عەرزی عەتائی کوری ئەبو رەباحم کرد: ئایا تۆ ئەمەت بیست لەجابیری کوری عەبدوللا کە ئەمە بگێرێتـەوە لـە پێغەمبـەرەوە (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ فەرمووی: (بەلێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٩ چ/٤}.

## ٧١٩) فرۆشتن بەوادەی چەند سالێ کەپێی دەگوتری (موعاوەمە)(٣٨٨٥ - ٣٨٩٢)
## باب: بَيْعُ المُعَاوَمَةِ

٩٢٥- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ وَسَعِيدِ بْنِ مِينَاءَ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنِ الْمُحَاقَلَةِ، وَالْمُزَابَنَةِ وَالْمُعَاوَمَةِ، وَالْمُخَابَرَةِ. قَالَ أَحَدُهُمَا: بَيْعُ السِّنِينَ هِيَ الْمُعَاوَمَةُ. وَعَنِ الثُّنْيَا وَرَخَّصَ فِي الْعَرَايَا. {الحديث: ٣٨٩٠ = ٣٨٨٧ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٨٦ = ٢١٩٦ فتح. أبو داود. بيوع: ٣٣٧٠. إبن ماجة. تجارات: ٢٢١٨. تحفة الأشراف: ٢٢٥٩و٢٢٦١}:

ئەبو زوبەیرو سەعیدی کوری میناء فەرموویان: جـابیری کـوری عەبـدوللا (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێشگیریی کردووە لە (موحاقەلـە) و

(موزابەنە) و (موعاوەمە) و (موخابەرە)و لە ئیستثنا، وەرِێگەی عەرایای داوە، یا ئەبو زوبەیر، یا سەعیدی کوڕی میناء، یەکێکیان فەرمووی: موعاوەمە: بریتییە لە فرۆشتنی بەری درەخت بەوادەی چەند ساڵێ، کەوادە دیاریکرناوەکە تەواو بوو، دەبێتەوە بەهی خاوەنە پێشووەکەی.

**ڕوونکردنەوە:**

١ بڕوانە فەرموودەی پێشوو بۆ زانینی واتای زاراوەکان: (محاقلة، مزابنة، مخابرة).

٢ - ئیستیثنا (واتە: چەرتکردنو لێ دەرکردن) بریتییە لەوە کەشتێ بفرۆشرێو بەشێکی نەزانراوی لێ جیابکرێتەوە، وەك ئەوە بلێ: ئەوا ئەم کۆمەڵە گەنمەم پێ فرۆشتیت هەندێکی نەبێ، یاوا ئەم جلو بەرگانەم فرۆشت بەتۆ چەند دانەیەکیان نەبێ.

٣ موعاوەمە لە عامە، کە بەمانا ساڵە، وەك موسانەهە، کە لە (سنة)یە، یا موشاهرە، موفاعەلەیە لە (شَهْر).

٩٢٦- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رسول اللّه (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ السِّنِينَ. وَفِي رِوَايَةِ ابْنِ أَبِي شَيْبَةَ: عَنْ بَيْعِ الثَّمَرِ سِنِينَ. {الحديث: ٣٩٠٧ = ٣٩٠٤ ف.م = فم = فتح الملهم. أبو داود. بيوع: ٣٣٧٤. نسائى. بيوع: ٤٥٤٤. تحفة الأشراف/٢٢٦٩}:

جابیری کوڕی عەبدوڵلا (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەفرۆشتنی بەری دارو درەختو باخ، بۆ ماوەی ساڵێ، یاچەند ساڵێ.

## ٧٢٠) فرۆشتنی کۆیلەیەك بەدوو کۆیلە. (٤٠٨٩)

## باب: بَيْعُ العَبْدِ بالعَبْدَيْنِ

٩٢٧- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ عَبْدٌ فَبَايَعَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) عَلَى الْهِجْرَةِ وَلَمْ يَشْعُرْ أَنَّهُ عَبْدٌ، فَجَاءَ سَيِّدُهُ يُرِيدُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « بِعْنِيهِ ». فَاشْتَرَاهُ بِعَبْدَيْنِ أَسْوَدَيْنِ، ثُمَّ لَمْ يُبَايِعْ أَحَدًا بَعْدُ، حَتَّى يَسْأَلَهُ أَعَبْدٌ هُوَ؟ {الحديث: ٤٠٨٩ = ٤٠٨٤ فم}:

**جابير** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: کۆیلەیێ هاتە خزمەتی حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پەیمانی دا بە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەسەر کۆچکردن، حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نەیزانی کە ئەوە کۆیلەیە، لەپاشا خاوەنەکەی هات، داوای بەندەکەی کردەوە، پێغەمبەریش** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی پێی: (بیفرۆشە پێم).**

**جا لەخاوەنەکەی کڕی بەدوو کۆیلەی رەش. ئیتر لەوەپاش پەیمانی نەدەدا بەکەس هەتا لێی دەپرسی: (خۆتۆ کۆیلە نیت؟)**

### ٧٢١) فرۆشتنی ئاژەڵی نەدۆشراو بەنیازی تەفرەدانی کڕیار. (٣٨٠٩ - ٣٨١٤)

### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ بَيْعِ الْمُصَرَّاة

٩٢٨- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنِ ابْتَاعَ شَاةً مُصَرَّاةً فَهُوَ فِيهَا بِالْخِيَارِ ثَلاَثَةَ أَيَّامٍ، إِنْ شَاءَ أَمْسَكَهَا، وَإِنْ شَاءَ رَدَّهَا، وَرَدَّ مَعَهَا صَاعًا مِنْ تَمْرٍ ». {الحديث: ٣٨١٠ = ٣٨٠٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٢ = ٢١٥١ = ٩٦٩ت = ٢١٤٠ فتح الباری}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (ئەگەر کەسێ مەڕێ، یا بزنێ، یا ئاژەڵێکی کڕی، بۆ فێڵ چەند رۆژێ نەدۆشرا بوو، هەتا کڕیار پێی بخەڵەتێو وابزانێ کە بەشیرە، ئەوە لەپاش دۆشینی، کڕیار خۆی لەماوەی سێ رۆژدا، سەرپشکە لەیەکێ لەم دووە: ئەگەر حەزکا مەڕەکە هەڵدەگرێو، ئەگەر حەزکا دەیداتەوە بەسەر خاوەنەکەیدا، بەڵام دەبێ مەنێ خورما، نەك گەنم، بدا بەفرۆشیار لەجیاتی شیرەکەی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٠، ژمارە: ١٨٠٣ — ش/د/ت}.**

### ٧٢٢) شتێ کەخواردنی دروست نەبێ، فرۆشتنیشی دروست نییە(٤٠٢٤ - ٤٠٢٩)

### باب: تحريم بَيْعِ مَاحَرُمَ أَكْلُهُ

٩٢٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُما) قَالَ: بَلَغَ عُمَرَ أَنَّ سَمُرَةَ بَاعَ خَمْرًا، فَقَالَ: قَاتَلَ اللَّهُ سَمُرَةَ أَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لَعَنَ اللَّهُ الْيَهُودَ،

حُرِّمَتْ عَلَيْهِمُ الشُّحُومُ، فَجَمَلُوهَا فَبَاعُوهَا ». {الحديث: ٤٠٢٦ = ٤٠٢١ ف.م = فم = فتح الملهم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٦ = ٢٢٣٦، ٤٢٩٦، ٤٦٣٣ فتح الباری}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) **فەرمووی: قسە گەیشتەوە بە ئیمامی عومەر** (رەزای خودای لیٚ بیٚ) **کە سەموورەی کوڕی جوندوب، کە هاوەڵی پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لەسەر هەموو هاوەڵەکانی بیٚ) کە ئارەقی لەباتی سەرانە لەخاوەن نامەکان وەرگرتووەو دوایی فرۆشتوویەتیەوە بەخۆیان، کە ئەم هەواڵە گەیشتەوە بە عومەر فەرمووی: خودا بچیٚ بەگژ سەموورەدا، چۆن هەڵەی وادەکا، دیارە ئەوەی نەزانیوە کە پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **دەفەرمویٚ: (نەفرەتو لەعنەتی خودا لە جوولەکەکان بیٚ، کاتیٚ خودای گەورەو سەروەر، بەزو پیوی مردارەوەبووی لیٚ حەرام کردن، دەچوون بەزەکەیان بەئاگر دەتواندەوەو پوختیان دەکردو دەیان پاڵاوتو بەرۆنە زەنگی دەیانفرۆشتو ئەوجا پارەکەیان دەخوارد!)**

**روونکردنەوە:**

١- مەبەست ئەوەیە، هەرشتیٚ کەخودا قەدەغەی کردبیٚ کە کەڵکی لیٚ وەربگیریٚ، دروست نییە بفرۆشریٚ، وەك مەیو بادە، چونکە بەکۆی را فرۆشتنی ئەم شتانەی تر دروستە، گەرچی گۆشتیان حەرامە: پشیلەو وێزو درندەی راویو کەری ماڵی. لە فەرموودەدا باسی ئەوەی تیایە، کە کەوڵی مردار بە دەباخ پاك دەبێتەوەو کەڵکی لیٚ وەردەگیریٚو دروستە فرۆشتنی.

٢ - حیلە شەرع (واتە: فێڵی شەرعی) کورتو پوخت دوو جۆرە:

أ- ئەگەر مەبەست لیٚی، خۆدزینەوە بوو لە ئەرکی ئایینی، یاکردنی ناهەق بەهەق، یا بەپێچەوانەوە، وەك کەسیٚ بۆ ئەوەی نەچیٚ بۆ حەج، یان زەکات نەدا، ناوبەناو ماڵەکەی ببەخشیٚ بەژنەکەی هەتا (حَوْلی) پیٚ إسقاط بکا، یا إِسْتِطَاعَە، ئەوە نەوەك هەر حەرامەو بەس، بەڵکوو ئەوە تاوانەو دائەنریٚ بەگەمە کردن بە ئایینی پیرۆزی خودا.

ب- بەلام فێڵی شەرعی ئەگەر بۆ مەبەستێکی ڕەوا بوو، کەشەرع ئەو مەبەستە پەسەند بکا، ئەوە دروستەو قەیدی نییە، وەك: کەسێ بەناوی دیارییەوە بەرتیل بدا بەکاربەدەستێ هەتا بەو فێڵە، حەقی شەرعی خۆی وەربگرێ، بەبێ ئەوەی کەزیان لەکەسێ تر بدا، یا وەك مەلایێ، بەنیازێکی پاك، بۆ چارەسەرکردنی کێشەیەکی خێزانی گەورە، بە حیلە شەرعێ تەڵاقێ چاك بکاتەوە، یا بڕیاربدا کەنیکاحو مارەبڕینەکە لەبنەڕەتدا دانەمەزراوە. فێڵە شەرعانە، لە قورئانو سوننەتدا هەیە، وەك: {فَاضْرِب بِّهِ وَلَا تَحْنَثْ} یا وەك {كَذَٰلِكَ كِدْنَا لِيُوسُفَ}.

جارێ پیاوێ هاتە خزمەتی مەلایێ، گوتی زۆریان بۆ هێناوم، ناچارم دەکەن کە تەلاقی سێبەسێ بخۆم، منیش هەق دەزانم کەشتەکە وانییە، ئەگەر تەلاقەکە نەخۆم فەرتەنەیەکی گەورە دەقەومێ، ئەگەر دەشی خۆم، ئێمە منو ژنەکەم گوناهمان چییە، بەناهەق لەیەك حەرام ببین، جا مامۆستا چارم چییە؟

مامۆستاش پاش ئەوە لە حاڵەکە بەباشی حاڵی بوو، گوتی: بڕۆ ژنەکەتو باوکی ژنەکەت بێنە، جا ڕێکەوتن، کە لەپێش سوێند خواردنەکەدا، بەنهێنیو بەهێمنی، بێنەوە بۆ خزمەتی مامۆستا، ئەوانیش وایانکرد، جا مامۆستا گوتی بەمێردەکەی کە خولعی بکا لەسەر ئەوە کەبچێ سینییەك خواردن بێنێ بۆ ئەم مەجلیسە، ژنەکەیش وایکرد، ئەمجا بەپیاوەکەی گوت، دەبڕۆ تەلاقەکەیان بۆ بخۆ، کەس بەم کەینو بەینە نەزانێ، دوایی خۆتو ژنەکەو باوکی ژنەکە وەرنەوە بۆلای خۆم، ژنەکەت لەسەر مارەیی نوێ، بەرەزای خۆیو بەرەزای وەلییەکەی لێت مارە دەکەمەوە. مامۆستا لە فەتواکەیدا ئاماژەی بۆ موغنی موحتاج کرد کە دەفەرموێ:

{وَيَلْحَقُ الطَّلَاقُ رجعيَّةً لأنها في حكم الزوجات، لِبَقَاءِ الوِلاَيَةِ عليها بِمُلْكِ الرّجْعَةِ، وَلاَ يَلْحَقُ الطَّلاَقُ مَخْتَلِعَةً، فَلاَ يلحقها طَلاَقٌ وَ إِنْ كَانَتْ فِي العِدَّةِ. لانتفاءِ الوِلاَيَةِ عَلَيْها}.

مامۆستا بەژنەکەی فەرموو، تۆیش لەم ماوەیەدا بەدێنی بڕۆرەوە بۆ ماڵی باوکت، تۆ ئێستا ژنی ئەو پیاوەنیت. پاش دووسێ ڕۆژ هاتنەوە، بۆ خزمەتی

مامۆستا، مامۆستا ژنەکەی سەرلەنوێ لەسەر مارەیی تازە مارە کردەوە لەمێردە پێشووەکەی، وە فەرمووی: پێویست بە تەواوبوونی عیددەناکا، لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی (رەحمەتی خودای لێ بێ) ئەگەر موختەلیعە (ئەو ژنەی مێردەکەی خولعی لەگەڵ کردووە) ئەگەر مارە ببڕێتەوە لەمێردی پێشووی عیددەی لەسەر نییەو عیددە پێویست نییە. {بڕوانە: مغنی المحتاج شەرحی مینهاج، بەرگی/٣، ص٢٩٢ فصلٌ خِطابُ الأجنبيَّةِ بطلاقٍ... إلخ}.

## ٧٢٣) فرۆشتنی مەیو بادە نادروستە. (٤٠١٩ - ٤٠٢٣)
## باب: تَحْرِيمُ بَيْعِ الخَمْرِ

٩٣٠- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ وَعْلَةَ السَّبَئِيِّ (مِنْ أَهْلِ مِصْرَ) أَنَّهُ سَأَلَ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَمَّا يُعْصَرُ مِنَ الْعِنَبِ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إِنَّ رَجُلاً أَهْدَى لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَاوِيَةَ خَمْرٍ، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « هَلْ عَلِمْتَ أَنَّ اللَّهَ قَدْ حَرَّمَهَا ». قَالَ: لاَ. فَسَارَّ إِنْسَانًا. فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « بِمَا سَارَرْتَهُ ». فَقَالَ: أَمَرْتُهُ بِبَيْعِهَا، فَقَالَ: « إِنَّ الَّذِى حَرَّمَ شُرْبَهَا حَرَّمَ بَيْعَهَا ». قَالَ فَفَتَحَ الْمَزَادَةَ حَتَّى ذَهَبَ مَا فِيهَا. {الحديث: ٤٠٢٠ = ٤٠١٥ فم}:

عەبدورەحمانی کوڕی وەعلەی ئەل‌سەبەئی، کە خەڵکی میصر بوو، دەیفەرموو: پرسیارم کرد لە ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) لەبارەی شەرابی ترێوە؟ ئیبنو عەبباس فەرمووی: پیاوێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەوەی نەزانیبوو کە عەرەق قەدەغە بووە، پڕکوندەیەکی گاوەس عەرەقی بەدیاری هێنا بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەری نەگرتو پێی فەرموو: (دیارە نەتزانیوە کە خودای گەورە مەیو بادەی قەدەغە کردووە). پیاوەکە گوتی: بەڵێ نەمزانیوە، ئەوجا پیاوەکە بەچپە قسەیەکی لەگەڵ پیاوێکی ترکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئەوە چپەی چیت لەگەڵ کرد؟) گوتی: پێم گوت: کە بیفرۆشێ. پێغەمبەر فەرمووی: (ئەوکەسەی کەخواردنەوەی عەرەقی حەرام کردووە، هەر ئەوکەسەیش فرۆشتنی عەرەقی حەرام کردووە!).

فەرمووی ئەوجا هەنگڵی کوندە عەرەقەکەی کردەوە، هەتا هەرچی عەرەقی تیادابوو رژایە سەر لەو زیخەڵانەکە.

### ٧٢٤) فرۆشتنی مردارو بتو بەراز نادروستە. (٤٠٢٤ - ٤٠٢٩)

### بابٌ: تَحْرِيمُ بيعِ المَيْتَةِ وَالْأَصْنَامِ وَالخنازيرِ

٩٣١- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ عَامَ الْفَتْحِ وَهُوَ بِمَكَّةَ: « إِنَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ حَرَّمَ بَيْعَ الْخَمْرِ وَالْمَيْتَةِ وَالْخِنْزِيرِ وَالأَصْنَامِ ». فَقِيلَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَرَأَيْتَ شُحُومَ الْمَيْتَةِ فَإِنَّهُ يُطْلَى بِهَا السُّفُنُ وَيُدْهَنُ بِهَا الْجُلُودُ وَيَسْتَصْبِحُ بِهَا النَّاسُ؟ فَقَالَ: « لاَ هُوَ حَرَامٌ ». ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ ذَلِكَ: « قَاتَلَ اللَّهُ الْيَهُودَ ، إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لَمَّا حَرَّمَ عَلَيْهِمْ شُحُومَهَا أَجْمَلُوهُ ثُمَّ بَاعُوهُ فَأَكَلُوا ثَمَنَهُ ». {الحديث: ٤٠٢٤ شيحا = ٤٠١٩ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٦ = ٣٢٣٦، ٤٢٩٦، ٤٦٣٣. أبو داود. ليوع: ٣٤٨٦. ترمذي. بيوع: ١٢٩٧. نسائي. بيوع: ٤٢٦٧. تحفة الأشراف: ٢٤٩٤} :

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ساڵی ئازادکردنی شاری مەککە، لەوکاتەدا کە هێشتا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەمەککە بوو، نەگەڕابۆوە بۆ مەدینە، لەوکاتەدا لەخۆیم بیست دەیفەرموو: (خوداو پێغەمبەری خودا، کڕینو فرۆشتنی مەیو ئارەقو مردارو بەرازو بتیان حەرام کردووە). عەرزیکرا: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! پێمان بفەرموو: ئەی ئایا ئەوە چۆنە کە خەڵك بەزو پیوی مردارەوە بوو، دەچن کەشتیو کەوڵی پێ چەور دەکەن، تا کەشتییەکە بپارێزێ لەهەوای دەریاو کەوڵەکەیش جیڕببێو قایم ببێ، یا چرای پێ دەگرێنن، شتی وا دەبێ یانا؟ فەرمووی: (نابێ ئەوەیش هەر حەرامە). لەهەمان کاتدا فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بێ): (خودا بچێ بەگژ جوولەکەکاندا، کاتێ خودای گەورەو سەروەر، بەزو پیوی مردارەوەبووی لێیان حەرام کرد، دەچوون بەئاگر دەیان تواندەوەو پوختیان دەکردو دەیان پاڵاوتو بەرۆنی دەیانفرۆشت، ئەوجا پارەکەیان دەخوارد). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٣} .

### ٧٢٥) پێشگیریی لەبەهای سەگ‌و کرێی سەلیتەو لەمزی کوڵەنانی(٣٩٨٥ - ٣٩٩١)
### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ ثَمَنِ الكَلْبِ وَمَهْرِ البَغِيِّ وحُلْوانِ الكَاهِنِ

٩٣٢- عَنْ أَبِي مَسْعُودٍ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ، وَمَهْرِ الْبَغِيِّ، وَحُلْوَانِ الْكَاهِنِ ». {الحديث: ٣٩٨٥ = ٣٩٨١ فـم. تجريد/٣، رقم: ٩٩٧ = ٢٢٣٧، ٢٢٨٢، ٥٣٤٦، ٥٧٦١. أبو داود. بيوع: ٣٤٢٨. ترمذي. نكاح: ١١٣٣. نسائي. صيدو ذبائح: ٤٣٠٣. تحفة الأشراف: ١٠٠١٠}:

ئەبو مەسعوودی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەهای سەگ‌و کرێی حیزو وەڵیفەت‌و سەرقەڵەمانەی کوڵە نانی قەدەغە کردووە).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٨٠}.

### ٧٢٦) پێشگیریی لەبەهای پشیلە. (٣٩٨٥ - ٣٩٩١)
### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ ثَمَنِ السِّنَّوْرِ

٩٣٣- عَنْ أَبِي الزُّبَيْرِ قَالَ: سَأَلْتُ جَابِرًا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ ثَمَنِ الْكَلْبِ وَالسِّنَّوْرِ قَالَ: زَجَرَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٩٩١ شيحا = ٣٩٨٧ فم}:

ئەبو زوبەیر فەرمووی: لەجابیرم پرسی (ڕەزای خودای لێ بێ) لەبارەی بەهای سەگ‌و بەهای پشیلەوە، حەڵاڵە یا حەرامە؟ فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەرزەنشت‌و سەرکۆنەی کەسانێ دەکا، کەشتی وا دەکەن).

### ٧٢٧) دەسکەوتی کەڵەشاخگر چەپەڵە. (٣٩٨٥ - ٣٩٩١)
### بابٌ: كَسْبُ الحَجَّامِ خَبِيثٌ

٩٣٤- عَنِ رَافِعُ بْنُ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « ثَمَنُ الْكَلْبِ خَبِيثٌ، وَمَهْرُ الْبَغِيِّ خَبِيثٌ، وَكَسْبُ الْحَجَّامِ خَبِيثٌ ». {الحديث: ٣٩٨٨ = ٣٩٨٤ فم}:

رافیعی کوڕی خەدیج (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (بەهای سەگ چەپەڵە، هەروا کرێی ژنی داوێنپیس، هەروا دەسکەوتی کەڵەشاخگر).

## ٧٢٨) کرێی کەڵەشاخگر حەڵاڵە. (٤٠١٤ - ٤٠١٨)

## بابٌ: إباحةُ أجْرَةِ الحَجَّامِ

**٩٣٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: حَجَمَ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) عَبْدٌ لِبَنِي بَيَاضَةَ، فَأَعْطَاهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم) أَجْرَهُ، وَكَلَّمَ سَيِّدَهُ فَخَفَّفَ عَنْهُ مِنْ ضَرِيبَتِهِ، وَلَوْ كَانَ سُحْتًا لَمْ يُعْطِهِ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٤٠١٨ = ٤٠١٣ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٥٤ = ٢١٠٣، ١٨٣ فتح الباری. تحفة الأشراف/٥٧٠٩}:**

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: ئەبو طەیبە کە کۆیلەی بەرەبابی بەیاضە بوو، کەڵەشاخی گرت لە حەزرەت** (دروودی خودای لەسەر بێ) **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **لەباتی کرێکەی مەنێ خورمای پێداو، فەرمانی کرد بەخاوەنەکەشی کە لەسەرانەکەی کەم بکاتەوە، ئەویش وایکرد، دەی ئەگەر مزو هەقدەستی کەڵەشاخگر حەرام بوایە، پێغەمبەر شتی وای نەدەکر، کەخۆی کرێی کەڵەشاخگر بدات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٦، ژمارە: ١٧٦٦، ١٧٧٠ چ/٤}.**

**روونکردنەوە:**

١ لەم کۆمەڵە فەرموودەدا، کەوان لە صەحیحی موسلیمدا لەم شوێنەدا، کە پێنج فەرموودەن کە ژمارە: (٤٠١٤، ٤٠١٥، ٤٠١٦، ٤٠١٧، ٤٠١٨)ن، بەپێی تەرقیمی/شێخ خلیل مأمون شیحا، لەسەر فەرمایشتی ئیمامی نەوەوی، ئەم بەهرانەیان واتیادا:

أ/ کەڵەشاخگرتن حەڵاڵە.

ب/ لەدەرمانە هەرە باشەکانە.

ج/ خۆتیمار کردن رەوایەو دروستە.

د/ هەقدەستی پزیشكو تیمارکەرو چارەسەری پزیشکی دروستە.

هـ/ تکاکردن لەلای کاربەدەستو خاوەن مافانو خاوەن قەرزو سەرکار، بۆ داشکاندنی مافی خۆیانو بۆیارمەتیو کارئاسانی لەگەڵ خواردەستا، کارێ پەسەندو دروستە.

و/ موخارەجە دروستە، کە ئەوەیە کە کۆیلەو خاوەنەکەی ڕێ بکەون لەسەرئەوە کە کۆیلەکە کاربکا، لەڕۆژانەکەی یا لەمانگانەکەی، بەشێ یادوو بەش، یازیاتر یاکەمتر بۆ ئاغاکەبێو باقیەکەی بۆ بەندەکە خۆی بێ، جۆرێکە لە گۆترەکاری.

٢ - ئەبو تەیبە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمایشتی دۆغری ئەوەیە کەناوی نافیع بووە، کەڵەشاخگر بووە، دەڵێن سەدو چلو سێساڵ ژیاوە، ناوی ئەبو طەیبە لە صەحیحەینا هاتووە، بڕوانە: ژمارە: ٩٥٣، تجرید/٣ = ٢١٠٢ فتح الباری.

٩٣٦- عَنْ حُمَيْدٍ قَالَ: سُئِلَ أَنَسُ بْنُ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ كَسْبِ الْحَجَّامِ فَقَالَ: احْتَجَمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، حَجَمَهُ أَبُو طَيْبَةَ، فَأَمَرَ لَهُ بِصَاعَيْنِ مِنْ طَعَامٍ، وَكَلَّمَ أَهْلَهُ فَوَضَعُوا عَنْهُ مِنْ خَرَاجِهِ وَقَالَ: « إِنَّ أَفْضَلَ مَا تَدَاوَيْتُمْ بِهِ الْحِجَامَةُ، أَوْ هُوَ مِنْ أَمْثَلِ دَوَائِكُمْ ». {الحديث: ٤٠١٤ = ٤٠٠٩ فم}:

حومەید فەرمووی: پرسیارکرا لە ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) لەبارەی دەسکەوتی کەڵە شاخگرەوە، کە دروستە یانا؟ فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کەڵە شاخی لەخۆی گرت، ئەبو طەیبە کەڵەشاخی لێ گرت، فەرمانی کرد، کەدوو مەن خۆراکی پێ بدەن، وەقسەی لەگەڵ خاوەنەکەی کرد کە لەسەرانەکەی سەریشی، ئەندازەیێ دابشکێنن. خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (وەباشترین تیمارو دەرمان کە خۆتانی پێ تیمار بکەن کەڵە شاخگرتنە) یا فەرمووی: (کەڵە شاخ گرتن لەنموونەیی ترین دەرمانی ئێوەیە ئەی خەڵکی وڵاتی حیجاز!).

## ٧٢٩) فرۆشتنی بەمەرجی سك کردنی سك. (٣٧٨٨ - ٣٧٨٩)
## باب: بَيْعُ حَبَلِ الحَبَلَةِ

٩٣٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: كَانَ أَهْلُ الْجَاهِلِيَّةِ يَتَبَايَعُونَ لَحْمَ الْجَزُورِ إِلَى حَبَلِ الْحَبَلَةِ. وَحَبَلُ الْحَبَلَةِ أَنْ تُنْتَجَ النَّاقَةُ ثُمَّ تَحْمِلَ الَّتِي نُتِجَتْ، فَنَهَاهُمْ

رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ ذَلِكَ. {الحديث: ٣٧٨٩ = ٣٧٨٥ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧١ = ٢١٤٣، ٢٢٥٦، ٣٨٤٣. أبو داود. بيوع: ٣٣٨١} :

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهیی کردووە لەوجۆرە فرۆشتنەی کە دەبەسترێ بەزانینی بەچکەی ناوسکی وشتری ئاوسەوە! کە ئەم جۆرە فرۆشتنە لەسەردەمی نەزانی، پێش هاتنی ئیسلاما باوبووە، خەڵك دەیانکرد لەسەر یەکێ لەم دوو شێوەیە: یەکەم پیاوێ وشترێکی دەکڕی، بە بەهایەکی دیاریکراوی نەدراوی دواخراو، بەوادەی ئەوەندە کە ئەو وشترە بزێو سکەکەشی گەورە ببێو بزێ ئەوسا بەهاکە بدات، دووەم: بەچکەی ئەو بەچکەیە کەوا لەسکی ئەم وشترەدا، لەتۆم کڕی بە ئەوەندەو ئەوەندە!! {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٠٨}.

## ٧٣٠) پێشگیریی لە مامەڵەی (مُلامَسه) و (مُنابَذه). (٣٧٨٠ - ٣٧٨٦)

## بابٌ: النهي عَنْ بَيْعِ الْمُلامَسَةِ وَالْمُنابَذَةِ

٩٣٨- عَنِ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعَتَيْنِ وَلِبْسَتَيْنِ، نَهَى عَنِ الْمُلامَسَةِ وَالْمُنَابَذَةِ فِي الْبَيْعِ، وَالْمُلامَسَةُ: لَمْسُ الرَّجُلِ ثَوْبَ الآخَرِ بِيَدِهِ بِاللَّيْلِ أَوْ بِالنَّهَارِ، وَلاَ يَقْلِبُهُ إِلاَّ بِذَلِكَ وَالْمُنَابَذَةُ أَنْ يَنْبِذَ الرَّجُلُ إِلَى الرَّجُلِ بِثَوْبِهِ، وَيَنْبِذَ الآخَرُ إِلَيْهِ ثَوْبَهُ، وَيَكُونُ ذَلِكَ بَيْعَهُمَا مِنْ غَيْرِ نَظَرٍ وَلاَ تَرَاضٍ. {الحديث: ٣٧٨٥ = ٣٧٨١ فم. تجريد/٣، رقم: ٢٣٢ = ٣٦٧، ١٩٩١، ٢١٤٧، ٥٨٢٢، ٦٢٨٤، ٥٨٢٠، ٢١٤٤ فتح الباري. أبو داود. بيوع: ٣٣٧٩. نسائي. بيوع: ٤٥٢٢} :

ئەبو سەعیدی خودری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەهی کردووە لەدوو جۆرە فرۆشتنو لەدوو جۆرە لەبەرکردن، نەهی کردووە لەفرۆشتن بە مولامەسە، مولامەسە ئەوەیە: پیاوێ لەپیاوێ تر، پارچەیێ جل دەکڕێ، لەباتی تەماشاکردنو ئەم دیوەو ئەودیو کردنی، دەستی لێ دەدا، وە ئەم دەست لێدانەیش خوای بەشەوی تاریك بێ، خوای بەرۆژی رووناك بێ. وەنەهی

کردووه لەفرۆشتن بە موونابەزە، موونابەزەیش واتە: هەڵدان بۆیەکتری، بەم شێوەیە: ئەم جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆ ئەوو ئەویش جلەکەی خۆی هەڵبدا بۆ ئەم، وە ئەم گۆڕینەوە بەهەڵدان بۆیەکتری لەجیاتی گوتە (صیغە)ی فرۆشتن، کە برێتییە لە ئیجاب و قەبووڵ، ئیتر بەبێ سەرنجدانی فرۆشراوو بەبێ ئەوە کەدڵ بیگرێ یانا).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨٠٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

مەبەست لە (دوو جۆرە لەبەرکردن)ەکەیش ئەمەیە، کە لەگێڕانەوەی ژمارە (٢٣٢)ی تەجریددا دەفەرموێ:

ئەبو سەعیدی خودری (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەری خودا (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی کردووە لەوە کە مرۆڤ بە پارچە جلێ خۆی شەتەك بدا، بەشێوەیەکی وا، کە نەتوانێ دەستی لێوەی دەربێنێ، مەگەر لەدامێنەوە، کە بەم جۆرە خۆپێچانەوەیە لەزاراوی شەریعەتدا دەگوترێ: (إشْتِمَالُ الصَّمَّاء = مەلەتکۆپێچ). وەنەهی کردووە لەوجۆرە لەبەرکردنەیش: کەپیاو بەچیچکانەوە جلێ بئاڵێنێ بەخۆیەوە، بەڵام هیچ نەدا بەشەرمگای خۆیدا، کە بەم جۆرە خۆپێچانەوەیش دەگوترێ: (ئیحتیباء: تێوەپێچان).

## ٧٣١) فرۆشتنی (غەرەر) و (حەصاة). (٣٧٨٧)

٩٣٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ بَيْعِ الْحَصَاةِ وَعَنْ بَيْعِ الْغَرَرِ. {الحديث: ٣٧٨٧ = ٣٧٨٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەهیی کردووە لەفرۆشتنی بەردەهاوێژ (بيع الحصاة) و لەفرۆشتنی شتی نەزانراوو دەست نەداو (بيع الغَرَر). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٩٢ — م/د/ت/ن}.

١ فرۆشتنی بەردە هاوێژ، بەسێ واتا واتا کراوە:

أ/ فرۆشیار دەڵێ: لەم جلو بەرگانە ئەوەیانم پێ فرۆشتی، کە ئەم بەردەم تێ گرت، بەری بکەوێ.

ب/ ئەم شتەم پێ فرۆشتی، ئەوەندە سەرپشکیو مافی پەشیمانیت هەیە، هەتا ئەم چەوە فڕە دەدەم.

ج/ کاتێ جەوێکم گرتە ئەم جلو بەرگە، ئەوە لەجیاتی گوتەی فرۆشتن.

٢ - بەیعولغەرەر، ئەوجۆرە فرۆشتنەیە بەدیمەن باشە، کڕیار تەفرەو دەستەشکێن دەکا، بەلآم وەکی تر زۆرجار بەزیانی ئەو دەشکێتەوە، وەك فرۆشتنی نەزانراوو دەستنەداو، وەك فرۆشتنی مەل بەحەواوە، ياماسی لەئاوا، ياشتی بزربوو.

## ٧٣٢) جلەوگیریی لەکۆستە کۆستەو زەمی درۆ. (٣٧٩٠ - ٣٧٩٧)

## بَابٌ: النَّهْىُ عَنْ النَّجَش

٩٤٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنِ النَّجْشِ. {الحديث: ٣٧٩٧ = ٣٧٩٣ فم. بخاری. بیوع: ٢١٤٢، ٦٦٦٢. نسائی. بیوع: ٤٥١٧. رياض/٤، زنجيره: ٢٧٦، ژماره: ٣/١٥٨٠}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جلەوگیریی کردووە لەکۆستە کۆستەو زەمی درۆ بۆ تەفرەدانی کڕیار). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٥ ج/٤}.

## ٧٣٣) مامەڵە لەسەر مامەڵەی برای خۆت

## باب: بَيْعِ الرَّجُلِ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ

بڕوانە: ژمارە: (٨٠٠) کە لەپێشەوە رابورد.

## ٧٣٤) نەیی کراوە لەچوون بەپیر کالآوو شمەکەوە. (٣٧٩٨ - ٣٨٠٢)

## باب: النهى عَنْ تَلَقِّى السِّلَعِ

٩٤١- عَنِ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَلَقَّوُا الْجَلَبَ، فَمَنْ تَلَقَّاهُ فَاشْتَرَى مِنْهُ فَإِذَا أَتَى سَيِّدُهُ السُّوقَ فَهُوَ بِالْخِيَارِ ». {الحديث: ٣٨٠٢ = ٣٧٩٨ فم، تجريد/٣، رقم: ٩٧٤ = ٢١٥٨، ٢١٦٣، ٢٢٧٤}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (مەچن بەپیر کاروانییەوە کە کووتاڵو شمەك دەهێنن بۆ بازاڕ، تاپێش ئەوەی کەبگەنە بازاڕ کاڵاکەیان بەهەرزان لێ بکڕنو خۆتان بەگران بیفرۆشنەوە، ئەگەر کەسێ چوو بەپیر کاروانییەوەو شمەکی لێ کڕی، کاتێ خاوەن کاڵاکە گەیشتە ناو بازاڕو زانی کە تاڵان فرۆشی کردووە، بۆی هەیە کە پەشیمان ببێتەوەو سەوداکە هەڵوەشێنێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٢ چ/٤}.

## ٧٣٥) شاری شت بۆ لادێیی نەفرۆشێ. (٣٨٠٣ - ٣٨٠٨)
## بابٌ: لاَ يَبِعْ حَاضِرٌ لِبَادٍ

٩٤٢- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ تُتَلَقَّى الرُّكْبَانُ، وَأَنْ يَبِيعَ حَاضِرٌ لِبَادٍ، قَالَ طاووس: فَقُلْتُ لاِبْنِ عَبَّاسٍ: مَا قَوْلُهُ حَاضِرٌ لِبَادٍ؟ قَالَ: لاَ يَكُنْ لَهُ سِمْسَارًا. {الحديث: ٣٨٠٤ شيحا = ٣٨٠٠ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٤ = ٢١٥٨، ٢١٦٣، ٢٢٧٤. أبو داود. بيوع: ٣٤٣٩. نسائي. بيوع: ٤٥١٢. تحفة الأشراف: ٢٧٢١}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەچوون بەپیری کاروانییەوە بۆ قەراخی شار، کە لەدەرەوە خۆراكو شمەك دەهێنن، تا لەناو شارا بەنرخی ئاسایيو ڕۆژو بازاڕ بیفرۆشن، وەنەیی کردووە لەوەیش کەشاری شت بۆ لادێیی بفرۆشێ. تاووس (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی ئیبنو عەبباسم کرد: مەبەستی لەگوتەی (شاری بۆ لادێیی) چییە؟ فەرمووی: نەبێ بەدەڵاڵی. {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٥٥، ژمارە: ١٧٧٥ + تاج/٢، زنجیرە: ١٥٢، ژمارە: ١٨١٢ + ١٨١٣}.

## ٧٣٦) جڵەوگیریی لەشاردنەوەی شمەكی پێویست بۆكاتی گرانی، كەبەم كردارە دەگوترێ (قۆرخ). (٤٠٩٨ - ٤١٠٠) - بابٌ: النَّهْيُ عَنِ الحُكْرَةِ

٩٤٣- عَنْ مَعْمَرًا بن عبداللّه (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّه (صلى الله عليه وسلم): « مَنِ احْتَكَرَ فَهُوَ خَاطِئٌ ». فَقِيلَ لِسَعِيدِ بن المسيب: فَإِنَّكَ تَحْتَكِرُ؟ قَالَ سَعِيدٌ: إِنَّ مَعْمَرًا الَّذِى كَانَ يُحَدِّثُ هَذَا الْحَدِيثَ كَانَ يَحْتَكِرُ. {الحديث: ٤٠٩٨ = ٤٠٩٢}:

**مەعمەر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (هەرکەسێ شت بکڕێو هەڵی بگرێ بۆکاتی گرانی هەتا بەگران بیفرۆشێتەوە، ئەوکەسە تاوانبارە). جا بەسەعیدی کوڕی موسەییەبیان گوت: خۆتۆ خۆشت ئەمە دەکەیت، ئەی ئەمە چەنی بەچەنە؟! فەرمووی: مەعمەر خۆشی کەراوی ئەم فەرموودەیە لەخودی پێغەمبەرەوە ئەویش ئەمەی دەکرد! {تاج/٢، زنجیرە: ١٥١، ژمارە: ١٨٠٧ چ/٤}.

**ڕوونکردنەوە:**

شت قۆرخکردن کاتێ حەرامە، کەشتەکە خۆراکی پێویست بێ، بۆ گوزەرانی مەردوم، کەواتە:

١- هەلگرتنی خۆراکێ کە پێویست نەبێ بۆ ژیانی خەڵك حەرام نییە، وەك کەسێ قەڵی هەبێ، هەڵی بگرێ بۆکاتی جەژن، چونکە گۆشتی قەل پێویستی ژیان نییەو دانانرێ بەقووت.

٢- هەلگرتنی شتی تر کە خۆراکی پێویست نەبێ بۆکاتی برەوو فرۆخت حەرام نییە، وەك کڕینی ئامێری فێنك کەرەوە، وەك پانکەو باوەشێن، لەزستانا، بۆ سەرەتای وەرزی هاوین!

هەزار رەحمەت لەگیانی ئەبو یوسف، کە یەکێکە لە شاگردە گەورەکانی ئەبو حەنیفە، کە دەفەرموێ: (هەرشتێ شاردنەوەی زیانبدا لەخەڵکی بەگشتی، هەلگرتنی بۆکاتی گرانی دائەنرێ بە قۆرخو ئیحتکارو حەرامە).

وەك ئەوە لەوڵاتی خۆمانا، کەسانی ویژدان مردوو، دەچوون غازو نەوتو سووتەمەنییان دەشاردەوەو لەزستانا بەچەندین قات دەیانفرۆشت!!

جێگەی داخە ئەم کوردستانەی خۆمان، جێگەو پێگەی کوردایەتیو مەردایەتی بوو، بەڵام بەهۆی ئەم عەولەمەو عەلمانەتییەوە، کەئێستا پارتو گورووپو لایەنە بەناو نیشتمانیو بەدیمەن کوردستانییەکان بانگەشەیان بۆدەکەن، ئێستا ئەم شیعرانە بوون بەدروشمی هەمووان:

کورد ایـــــەتی، گـــــەر بـــــەزەررە، واپێتـــــەوە
ئەســـتەمە تـــۆ، لـــەم هەرێمـــە، جێـــت بێتـــەوە
گەنـــدەڵ نـــەبی، لـــەم زەمانـــە، دەتکـــەن بەشـــێت
چـــون خەتـــەری، نـــاو شـــێتخانە، دەکـــەن بـــەجێت

مـــن کـــوردم لـــە کـــورد بێـــزارم ئێجگـــار
سەرجەم گەندەڵن، سەرجەم ناهەموار
دەدریێ وا لـــــەناو هـــــۆزێ وا بێبـــــار
قەت باوەڕ مەکەن بەکـەس بکـرێ چـار

## ٧٣٧) فرۆشتن بەمەرجی سەرپشكی. (٣٨٢٩ - ٣٨٣٠)

## بابٌ: بَيْعُ الخِيَار

٩٤٤- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّـهُ قَالَ: « إِذَا تَبَايَعَ الرَّجُلَانِ، فَكُلُّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا بِالْخِيَارِ، مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا وَكَانَا جَمِيعًا، أَوْ يُخَيِّرُ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، فَإِنْ خَيَّرَ أَحَدُهُمَا الآخَرَ، فَتَبَايَعَا عَلَى ذَلِكَ فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ، وَإِنْ تَفَرَّقَا بَعْدَ أَنْ تَبَايَعَا، وَلَمْ يَتْرُكْ وَاحِدٌ مِنْهُمَا الْبَيْعَ، فَقَدْ وَجَبَ الْبَيْعُ ». {الحديث: ٣٨٣٣ = ٣٨٣٠ فم. بخاري. بيوع: ٢١١٢. نسائي. بيوع: ٤٤٨٣. تحفة الأشراف: ٨٢٧٢} :

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (کاتێ پیاوێ شتێکی بە پیاوێکی تر فرۆشت، ئەوە هەردوو لایان سەرپشکن و مافی پەشیمان بوونەوەیان بۆ هەیە، هەتا بەیەکەوە بن، تا ئەودەمەی کە لەیەکتری جوێ دەبنەوە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان ئەوی تریانی کرد بەسەرپشك، کەمافی پەشیمان بوونەوەی بۆ هەبێ، هەتا سێ ڕۆژ، یاکەمتر، ئەوە ئەو مافەی بۆ هەیە، یاکردی بەسەر پشك کەسەوداکە هەڵبگرێ و قوبووڵی بکاو مافی سەرپشکی و پەشیمان بوونەوە نەمێنێ، وەلەسەر ئەوە ڕێ کەوتن ئەوە سەوداکە بەتەواوی دادەمەزرێ و کەس مافی پەشیمان بوونەوەی بۆ نییە، بابەلەشیش لەیەکتری جیانەبنەوە. ئەگەر

کەسێ شتێکی فرۆشت بەکەسێ، وەدوایی لەیەکتری جیابوونەوە، وەلەو ماوەیەدا کەسیان فرۆشتنەکەی هەڵنەوەشانەوە، وە سەرپشکییان بۆماوەی سێ رۆژ یاکەمتر بەمەرج نەگرت، ئەوە دیسان فرۆشتنەکە بەتەواوی دامەزراوەو مافی هەڵوەشانەوەو پەشیمان بوونەوە نامێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٨}.

بۆئەوەی لەم فەرموودەیە بەتەواوی تێ بگەین، بفەرموون تەماشای فەتحولباری بفەرموون، فەرموودەی ژمارە: ٢١١٢. كتابُ البُيُوع، باب: إذَا خَيَّرَ أَحَدُهُمَا صَاحِبَهُ بَعْدَ البَيْعِ فَقَدْ وَجَبَ البَيْعُ.

## ٧٣٨) سەر راستیو مامەڵە خۆشیو راستگۆییو روونکردنەوەی نەنگ (٣٨٢٩ - ٣٨٣٠)

## بابٌ مِنْهُ: وَالصِّدْقُ فِي البَيْعِ وَالبَيَان

٩٤٥- عَنْ حَكِيمِ بْنِ حِزَامٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الْبَيِّعَانِ بِالْخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا، فَإِنْ صَدَقَا وَبَيَّنَا، بُورِكَ لَهُمَا فِي بَيْعِهِمَا، وَإِنْ كَذَبَا وَكَتَمَا مُحِقَتْ بَرَكَةُ بَيْعِهِمَا ». {الحديث: ٣٨٣٦ شيحا = ٣٨٣٦ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٤٥ = ٢٠٧٩، ٢٠٨٢، ٢١٠٨، ٢١١٠، ٢١١٤. أبو داود. بيوع: ٣٤٥٩. ترمذى. بيوع: ١٢٤٦. نسائى. بيوع: ٤٤٦٩. تحفة الأشراف: ٣٤٢٧}:

حەکیمی کوڕی حیزام (رەزای خودای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (کڕیارو فرۆشیار، هەردوو لایان خۆیان سەرپشکنو دەتوانن پەشیمان ببنەوە، هەتا لەیەکتری جیادەبنەوە، جائەگەر لەگەڵ یەکتریدا، راستو دروست بنو شت لەیەکتری نەشارنەوەو، نەنگی شاراوەی سەوداکە حەشارنەدەن، ئەوە ئەو سەودایەیان پیتو فەڕی تێ دەکەوێ بۆیان، بەلام ئەگەر لەگەڵ یەکتری ناڕاست بنو شت لەیەکتری حەشاربدەن، ئەوا پیتو فەڕی سەوداکەیان دەچێ بەحەوادا).
{تاج/٢، زنجیرە: ١٤٩، ژمارە: ١٧٩٦}.

### ٧٣٩) کەسێ لەمامەڵەو سەودادا بخەڵەتێ. (٣٨٣٨ - ٣٨٣٩)
### بابٌ: مَنْ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوع

٩٤٦- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: ذَكَرَ رَجُلٌ لِرَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّهُ يُخْدَعُ فِي الْبُيُوعِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ بَايَعْتَ فَقُلْ: لاَ خِلاَبَةَ »، فَكَانَ إِذَا بَايَعَ يَقُولُ: لاَ خِيَابَةَ. {الحديث: ٣٨٣٨ = ٣٨٣٥ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٥٧ = ٢١١٧، ٢٤٠٧، ٢٤١٤، ٦٩٦٤. أبو داود. بيوع: ٣٤٥٩. ترمذي. بيوع: ١٢٤٦. نسائي. بيوع: ٤٤٦٩. تحفة الأشراف: ٣٤٢٧}:

ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ عەرزی پێغەمبەری کرد، کە لەسەوداو مامەڵەدا دەخەڵەتێ، فەرمووی پێی: (کاتێ سەودای شتێ دەکەی پێی بڵێ: بەبێ فڕوفێڵو فۆڵبڕین). جا پیاوەکە کاتێ کەشتێکی سەودا دەکرد دەیگوت: بەبێ فڵو فێڵو فۆڵبڵین!! چونکە زمانپس بوو، زمانی دەگرت لەقسەکردنا، پیتێکی دەکرد بەپیتێکی تر، لامی بەیێ گۆ دەکرد، لەباتی لاخیلابەتە، دەیگوت لاخییابەتە.

### ٧٤٠) کەسێ گزی بکات لەمن نییە
### بابٌ: مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي

٩٤٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) مَرَّ عَلَى صُبْرَةِ طَعَامٍ، فَأَدْخَلَ يَدَهُ فِيهَا، فَنَالَتْ أَصَابِعُهُ بَلَلاً، فَقَالَ: « مَا هَذَا يَا صَاحِبَ الطَّعَامِ »؟ فَقَالَ: أَصَابَتْهُ السَّمَاءُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « أَفَلاَ جَعَلْتَهُ فَوْقَ الطَّعَامِ كَيْ يَرَاهُ النَّاسُ؟! مَنْ غَشَّ فَلَيْسَ مِنِّي ». {الحديث: ٢٨٠ = . ترمذي. بيوع: ١٣١٥. تحفة الأشراف: ١٣٩٧٩}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلای پیاوێ خۆراکی دەفرۆشت، پرسیاری لێکرد: چۆنی دەفرۆشی؟ پیاوەکە گوتی: ئاواو ئاوا.

جا خودا نیگای نارد بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە دەستی پیاکە، جا کەدەستی پیاکرد خۆراکەکە لەناوەوە تەڕبوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: ئەی خاوەن خۆراك! ئەم تەرییە چییە؟ گوتی: ئەوە بارانی لێ داوە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (ئەی نەدەبوو بیخەیتە سەرەوە، تاخەڵك بیبینن؟ ئینجا فەرمووی: (کەسێ گزیو خەڵو خەشمان لێ بکا لەمن نییە). {ریاض/٤، زنجیرە: ٢٧٦، ژمارە: ١/١٥٧٩ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٥ ج/٤}.

## ٧٤١) پارە گۆڕینەوەو فرۆشتنی زێڕ بەزیو بەحازری. (٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)
## بابُ: الصَّرْفُ وَبَيْعُ الذَّهَبِ بِالْوَرِقِ نَقْداً

٩٤٨- عَنْ مَالِكِ بْنِ أَوْسِ بْنِ الْحَدَثَانِ أَنَّهُ قَالَ: أَقْبَلْتُ أَقُولُ: مَنْ يَصْطَرِفُ الدَّرَاهِمَ؟ فَقَالَ طَلْحَةُ بْنُ عُبَيْدِ اللَّهِ وَهُوَ عِنْدَ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما): أَرِنَا ذَهَبَكَ ثُمَّ ائْتِنَا إِذَا جَاءَ خَادِمُنَا نُعْطِكَ وَرِقَكَ، فَقَالَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ: كَلاَّ وَاللَّهِ لَتُعْطِيَنَّهُ وَرِقَهُ، أَوْ لَتَرُدَّنَّ إِلَيْهِ ذَهَبَهُ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « الْوَرِقُ بِالذَّهَبِ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ رِبًا، إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ رِبًا إِلاَّ هَاءَ وَهَاءَ ». {الحديث: ٤٠٣٥ = ٤٠٣٠ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٦٨ = ٢١٣٤، ٢١٧٠، ٢١٧٤. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٨. ترمذي. بيوع: ١٢٤٣. نسائي. بيوع: ٤٥٧٢. تحفة الأشراف: ١٠٦٣٠}:

مالیکی کوڕی ئەوسی کوڕی حەدەثان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ ویستم سەد دیناری زێڕ بگۆڕمەوە بەدرەمی زیو، بانگەوازم کرد: کێ زێڕ دەکرێ بەزیو؟ طەلحەی کوڕی عوبەیدوڵلا، لەلای عومەری کوڕی خەتاب بوو، (ڕەزای خودایان لێ بێ) بانگی کردمو سەودامان بڕییەوەو ڕێکەوتین لەسەر گۆڕینەوە، کە لەجیاتی هەردینارێ، ژمارەیەکی دیاریکراو، درەمی زیوم پێ بدا، جا طەلحە زێڕەکەی لەمن وەرگرتو تەماشای کردو ژماردیو لەدەستیدا ئەم دیوو ئەو دیوی پێ دەکرد، ئینجا فەرمووی: با کلیلدارەکەم لە جەنگەڵەکە بێتەوە، وەرەوە بۆلامان، درەمە زیوەکانت

دەدەینێ. (جەنگەڵەکە شوێنێکی نزیکە لەمەدینە وا لەعەوالی مەدینە، ناودارە بەغابەی مەدینە).

عومەریش گوێی لەم قسانەمان بوو، فەرمووی: ئەی مالیك! بەخودا نابێ لە تەلحە جیاببیتەوە، هەتا زیوەکەی لێ وەرنەگریت، بانەبێ بەسوود، چونکە پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زیو بەزێڕ دەست بەدەست نەبێ سوودە، گەنم بەگەنم دەست بەدەست نەبێ سوودە، جۆ بەجۆ دەست بەدەست نەبێ سوودە، خورما بەخورما دەست بەدەست نەبێ سوودە).

**ڕوونکردنەوە:**

وشەی صەرف لەبنەڕەتدا: گۆڕینەوەی بەهایە بەبەها، وەك پارە بەپارە، خوردە بەدرشت، درەم بەدینار، زێڕ بەزێڕ، ئیتر خوای هەردوولا یەکسان بن، وەك گۆڕینەوەی وەرەقەیەکی بیستو پێنج دیناری، بەبیستو پێنج دیناری وردە، یا لایەکیان زیاتربێ، وەك لیرەیەك بەسەد درەم.

**٧٤٢) فرۆشتنی زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو ئەوشتانەی کە سوودیان واتیادا، دەبێ دەقاو دەق بنو سەر بەسەربنو بەقەدیەك بنو دەست بەدەست بن.**

(٤٠٣٠ - ٤٠٣٩)

**بابٌ: بَيْعُ الذَّهَبِ بِالذَّهَبِ وَالفِضَّةُ بِالفِضَّةِ والبرُ بالبُرِّ وَسائِرُ مافيه الرِّبا سَواءً بسَواءٍ، يَداً بيَدٍ**

٩٤٩- عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ وَالْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ، وَالْبُرُّ بِالْبُرِّ، وَالشَّعِيرُ بِالشَّعِيرِ، وَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ، وَالْمِلْحُ بِالْمِلْحِ، مِثْلاً بِمِثْلٍ سَوَاءً بِسَوَاءٍ، يَدًا بِيَدٍ، فَإِذَا اخْتَلَفَتْ هَذِهِ الأَصْنَافُ، فَبِيعُوا كَيْفَ شِئْتُمْ إِذَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ ». {الحديث: ٤٠٣٩ = ٤٠٣٤ فم. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٩. ترمذي. بيوع: ١٢٤٠}:

عوبادەی کوڕی صامیت (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (زێڕ بەزێڕو زیو بەزیوو گەنم بەگەنمو جۆ بەجۆو خورما بەخورماو خوێ بەخوێ. دەبێ دەقاو دەق بەقەد یەکبنو ڕێکاو ڕێك وەك یەك بنو دەست

بەدەست بن، ئەگینا ئەگەر وانەبوو، وەك كەم بەزۆر، یا حازر بەناحازر، ئەوە دەبێ بەسوود. بەڵام ئەگەر هەردوو شتەكە لەچەشنی یەك نەبوون، وەك گەنم بەجۆ، یازێڕ بەزیو، چۆن ئارەزوو دەكەن ئاوا بیفرۆشن، بەمەرجێ دەست بەدەست بێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤١ چ/٤} .

**روونكردنەوە:**

عوبادەی كوڕی صامیت (رەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، خەزرەجییە، ئامادەی پەیمانی عەقەبەی یەكەم و دووەم بووە، هەروا ئامادەی غەزای بەدرو جەنگی ئوحودو پەیمانی خۆشنوودی (بەیعەتی ریزوان)و هەموو شەڕگاكانی تری پێغەمبەر بووە، لەگەڵ پێغەمبەر خۆیدا (دروودی خودای لەسەر بێ).

لە پێغەمبەرەوە سەدو هەشتاو یەك فەرموودەی گێڕاوەتەوە، شەشیان پەسەندی هەردوو پیرن (واتە: متفق علیهِ)ین، دوانیان لەبوخاریدا هەیە، بەڵام لە موسلیمدا نییە، دوانیشیان لە موسلیمدا هەیە، لە بوخاریدا نین. یەكەم كەس بووە كەبووە بەقازی فەلەستین، پیاوێكی كەڵەگەتی قەویلەی قۆزی بەهرەمەند بووە، ساڵی (٣٤)ی كۆچی مردووە، گۆڕەكەی لە بەیتولمەقدیس، جێگەكەی زانراوە. لە ئیستیعابا دەفەرموێ: لە فەلەستین مردووە، لە بەیتولمەقدیس نێژراوە، وەهەتا ئێستا گۆڕەكەی ناسراوە، ساڵی سیی و چواری كۆچی لەتەمەنی حەفتاو دوو ساڵیدا مردووە. یەكێ بوو لەو كەسانەی كە لەسەردەمی پێغەمبەردا هەموو قورئانیان لەبەربوو. {بڕوانە تەجریدی بوخاری بەرگی یەكەم، لاپەڕە: ٣٧، ژمارە: ١٨ چاپی یەكەم} .

### ٧٤٣) جڵەوگیریی لە فرۆشتنی زێڕ بەزیو بەناحازر (بەقەرز). (٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)

### بابٌ: النَّهْيُ عَنْ بَيْعِ الذَّهَبِ بِالوَرِقِ نَسِيئَةً

٩٥٠- عَنْ أَبِى الْمِنْهَالِ قَالَ: بَاعَ شَرِيكٌ لِى وَرِقًا بِنَسِيئَةٍ إِلَى الْمَوْسِمِ أَوْ إِلَى الْحَجِّ فَجَاءَ إِلَيَّ فَأَخْبَرَنِى، فَقُلْتُ: هَذَا أَمْرٌ لاَ يَصْلُحُ، قَالَ: قَدْ بِعْتُهُ فِى السُّوقِ فَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ عَلَيَّ أَحَدٌ. فَأَتَيْتُ الْبَرَاءَ بْنَ عَازِبٍ، فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ: قَدِمَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم)

الْمَدِينَةَ وَنَحْنُ نَبِيعُ هَذَا الْبَيْعَ، فَقَالَ: « مَا كَانَ يَدًا بِيَدٍ فَلاَ بَأْسَ بِهِ، وَمَا كَانَ نَسِيئَةً فَهُوَ رِبًا، وَائْتِ زَيْدَ بْنَ أَرْقَمَ فَإِنَّهُ أَعْظَمُ تِجَارَةً مِنِّي». فَأَتَيْتُهُ فَسَأَلْتُهُ، فَقَالَ مِثْلَ ذَلِكَ. {الحديث: ٤٠٤٧ = ٤٠٤٢ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٣٨ = ٢٠٦٠، ٢١٨٠، ٢٤٩٧، ٢١٣٩، ٢٠٦١، ٢١٨١، ٢٤٩٨، ٢٩٤٠. نسائي. بيوع: ٤٥٨٩، ٤٥٩٠، ٤٥٩١}:

ئەبو مینهال (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: هاوبەشێکم هەبوو، بڕێ زیوی فرۆشت بەزێڕ بەقەرز هەتا وەرزی حەج، کەهات بۆلام ئەم باسەی بۆم کرد، گوتم: شتی وانابێ، ئەوە سوودە، گوتی: من تائێستا ئەم جۆرە مامەڵەو سەودایەم لەبازاڕ کردووە، کەسێ ڕەخنەی لێم نەگرتووە. جاچووم بۆ خزمەتی بەرائی کوڕی عازیب (ڕەزای خودای لێ بێ) لێم پرسی، فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەشریفی هاتو کۆچی کرد بۆ مەدینە، ئێمە ئەم جۆرە مامەڵەیەمان دەکرد: پارەمان دەگۆڕییەوە بەپارە، کەلەم بارەیەوە پرسیارمان لێی کرد، فەرمووی: (ئەگەر دەست بەدەست بێ قەیدی نییە، بەلام ئەگەر پارەیەکیان دەست بەدەستو ئەوی تریان قەرزبێ، واتە: دواخراوبێ، ئەوە سوودە. بەراء فەرمووی: بچۆ بۆلای زەیدی کوڕی ئەرقەم، چونکە بازرگانیی ئەو لەهی من گەورەترە، جاچووم بۆلایو پرسیارم لێی کرد، ئەویش هەمان شتی فەرموو). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٤٣}.

### ٧٤٤) دیناری بەدوو دینارو درەمێ بەدوو درەم مەفرۆشن. (٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)
### بَابٌ: لا تَبِيعُوا الدِّينَارَ بِالدِّينَارَيْنِ وَلاَ الدِّرْهَمَ بِالدِّرْهَمَيْنِ

٩٥١- عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ تَبِيعُوا الدِّينَارَ بِالدِّينَارَيْنِ وَلاَ الدِّرْهَمَ بِالدِّرْهَمَيْنِ ». {الحديث: ٤٠٣٤ = ٤٠٢٩ فم}:

عوثمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (لیرەیێ مەفرۆشن بەدوو لیرە، وە درەمێکی زیو مەفرۆشن بەدوو درەمی زیو).

لیرە، واتە: دیناری زێڕ.

### ٧٤٥) فرۆشتنی گەردانەی تێکەڵ لەزێڕو مووروو، بەزێڕ. (٤٠٣٠ - ٤٠٦٩)
### بَابٌ: القِلادَةِ وَفِيهَا ذَهَبٌ وَخَرَزٌ بِذَهَبٍ

٩٥٢- عَنْ فَضَالَةَ بْنَ عُبَيْدٍ الأَنْصَارِيَّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) يَقُولُ: أُتِيَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ بِخَيْبَرَ بِقِلاَدَةٍ فِيهَا خَرَزٌ وَذَهَبٌ، وَهِيَ مِنَ الْمَغَانِمِ تُبَاعُ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالذَّهَبِ الَّذِي فِي الْقِلاَدَةِ فَنُزِعَ وَحْدَهُ، ثُمَّ قَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الذَّهَبُ بِالذَّهَبِ، وَزْنًا بِوَزْنٍ ». {الحديث: ٤٠٥١ = ٤٠٤٦ فم}:

فوضالەی کوڕی عوبەیدی ئەنصاری (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەغەزای خەیبەردا، لەخەیبەر گەردانەیەکی تێکەڵ لەموورو لەزێڕیان هێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەهی تالآنی بوو، دەیانویست بیفرۆشن، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی فەرموو زێڕەکەی ناو گەردانەکەیان جیاکردەوە، ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێیان: (زێڕ بەزێڕ لەکاتی فرۆشتندا، دەبێ بەکێشانە هاوسەنگ بن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٨، ژمارە: ١٧٩٦}.

**ڕوونکردنەوە:**

فوضالەی کوڕی عوبەید ئەنصارییە، لەموسوڵمانە پێشینەکانە، یەکەم غەزا کەئامادەی بووە، غەزای ئوحودە، ئامادەی ئازادکردنی شامو میصر بووە، لەشام نیشتەجێ بوو، خانوویەکی لەوێ بۆخۆی دروست کرد، پیاوێکی جەڵد بوو، لەڕاکردناماینی بەجێ دەهێشت، لەسەر ڕاوێژو ڕاسپێری ئەبو دەرداء، کە ئەبو دەرداء قازی دیمەشق بوو، کە ئەبو دەرداء مرد، موعاوییە فوزالەی کرد بەقازی دیمەشق‌و پێی گوت: وامەزانە کەمن لەبەر خۆشەویستی، تۆم کردووە بەقازی، بەڵکوو تۆم کردووە بەپەردەی خۆم لەئاگری دۆزەخ، دەی تۆیش بە جێبەجێکردنی عەدل‌و داد، لە قەزاوەتەکەتا پەردە بکە بۆخۆت لەئاگری دۆزەخ، یەکێ بوو لەکۆمەڵەی پەیمانی بەیعەتو شەجەرە، کەکاتێ مرد، موعاوییە خۆی چووە ژێر دارە تەرمەکەی، لەساڵی پەنجاو سێی کۆچیدا ماڵاوایی لەجیهان کرد.

## ٧٤٦) سوود لەسەودای پارە بەپارەدا
## بَابٌ: الرِّبَا فِي بُيُوعِ النَّقْدِ

٩٥٣- عَنِ عَطَاءُ بْنُ أَبِى رَبَاحٍ أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِىَّ لَقِىَ ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُم) فَقَالَ لَهُ: أَرَأَيْتَ قَوْلَكَ فِى الصَّرْفِ، أَشَيْئًا سَمِعْتَهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَمْ شَيْئًا وَجَدْتَهُ فِى كِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ؟ فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: كَلاَّ لاَ أَقُولُ لك، أَمَّا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَأَنْتُمْ أَعْلَمُ بِهِ، وَأَمَّا كِتَابُ اللَّهِ، فَلاَ أَعْلَمُهُ، وَلَكِنِّي حَدَّثَنِى أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « أَلاَ إِنَّمَا الرِّبَا فِى النَّسِيئَةِ ». {الحديث: ٤٠٦٧ = ٤٠٦٢ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٧٩ = ٢١٧٧، ٢١٧٦، ٢١٧٨. نسائى. بيوع: ٤٥٩٤. تحفة الأشراف: ٩٤}:

عەطائى كوڕى ئەبو ڕەباح دەفەرموێ: ئەبو سەعيدى خودرى گەيشت بەئيبنو عەبباس (ڕەزای خودا لەهەموويان بێ) فەرمووى پێى: (پێم بڵێ ئەمەى تۆ دەيڵێيت، سەبارەت بەگۆڕينەوەى پارە بەپارەو زێڕ بەزێڕو زيو بەزيو، ئەگەر حازرو دەست بەدەست بێ، لايەكيان زياتريش بێ قەيناكا، ئايا ئەمەى دەيڵێيت لەم بارەيەوە شتێكە لە پێغەمبەرت بيستووە، يا شتێكە لەنامەى خوادا ديوتە؟ ئيبنو عەبباس فەرمووى: نەخێر من شتى وام نەلە پێغەمبەر بيستووەو نەلە قورئانا ديومە، چونكە بۆ پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) ئێوە باشتر ئاگاتان لەفەرموودەكانى ئەو هەيە، بۆ قورئانيش شتى وام تيادا نەديوە، بەڵام ئەوەندە هەيە سەرچاوەى ئەم گوتەيەى من، ئەم فەرموودەيە، كە ئوسامەى كوڕى زەيد گێڕايەوە بۆم، فەرمووى: پێغەمبەر (درودى خوداى لەسەر بێ) فەرمووى: (هۆشياربن كەسوود تەنيا لەگۆڕينەوەى حازر بەناحازردا هەيە).

٩٥٤- عَنْ أَبِى نَضْرَةَ قَالَ: سَأَلْتُ ابْنَ عُمَرَ وَابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُم) عَنِ الصَّرْفِ فَلَمْ يَرَيَا بِهِ بَأْسًا، فَإِنِّى لَقَاعِدٌ عِنْدَ أَبِى سَعِيدٍ الْخُدْرِىِّ فَسَأَلْتُهُ عَنِ الصَّرْفِ، فَقَالَ: مَا زَادَ فَهُوَ رِبًا، فَأَنْكَرْتُ ذَلِكَ لِقَوْلِهِمَا، فَقَالَ: لاَ أُحَدِّثُكَ إِلاَّ مَا سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، جَاءَهُ صَاحِبُ نَخْلِهِ بِصَاعٍ مِنْ تَمْرٍ طَيِّبٍ، وَكَانَ تَمْرُ النَّبِىِّ (صلى الله عليه وسلم) هَذَا اللَّوْنَ، فَقَالَ لَهُ النَّبِىُّ (صلى الله عليه وسلم): « أَنَّى لَكَ هَذَا »؟

قَالَ: انْطَلَقْتُ بِصَاعَيْنِ فَاشْتَرَيْتُ بِهِ هَذَا الصَّاعَ، فَإِنَّ سِعْرَ هَذَا فِي السُّوقِ كَذَا، وَسِعْرَ هَذَا كَذَا، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « وَيْلَكَ أَرْبَيْتَ، إِذَا أَرَدْتَ ذَلِكَ فَبِعْ تَمْرَكَ بِسِلْعَةٍ، ثُمَّ اشْتَرِ بِسِلْعَتِكَ أَيَّ تَمْرٍ شِئْتَ »؟ قَالَ أَبُو سَعِيدٍ: فَالتَّمْرُ بِالتَّمْرِ أَحَقُّ أَنْ يَكُونَ رِبًا أَمِ الْفِضَّةُ بِالْفِضَّةِ؟ قَالَ: فَأَتَيْتُ ابْنَ عُمَرَ بَعْدُ، فَنَهَانِي، وَلَمْ آتِ ابْنَ عَبَّاسٍ، قَالَ: فَحَدَّثَنِي أَبُو الصَّهْبَاءِ أَنَّهُ سَأَلَ ابْنَ عَبَّاسٍ عَنْهُ بِمَكَّةَ، فَكَرِهَهُ. {الحديث: ٤٠٦٣ = ٤٠٥٨ فم}:

ئەبو نەضرە فەرمووی: لەئیبنو عومەرو لەئیبنو عەبباسم پرسی (ڕەزای خودا لەهەموویان بێ) لەبارەی پارە گۆڕینەوە، کە لایەکیان لەلایەکیان زیاتربێ، ئایا بڕیاری ئەوە چۆنە؟ فەرموویان: شتی واقەیدی نییە. جارێ لەلای ئەبو سەعیدی خودری دانیشتبووم سەبارەت بەهەمان پرسیار، پرسیارم لەویش کرد، فەرمووی: (شتی وا ئەوەی زیادەبێ سوودە) منیش بەپێی گوتەی ئەو دووزاتە ڕەخنەم لەئەبو سەعید گرت، ئەویش فەرمووی: بۆخۆم چیم لە پێغەمبەر بیستووە ئەوەت بۆ دەگێڕمەوە، جارێ باخەوانی باخە خورماکەی مەنێ خورمای نایابی بۆهێنا، خورماکەی پێغەمبەریش لەم جۆرە خورما ئایەخەیە بوو، لەبەرئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە باخەوانەکەی فەرموو: (ئەم خورما نایابەت لەکوێ بوو؟). باخەوانەکە گوتی: دوومەن لەخورمای باخەکەی خۆمانم برد، ئەم مەنە خورمایەم پێ کڕی، چونکە نرخی ئەمەیان لەبازاڕ ئەوەندەیەو هەرزانە، نرخی ئەمەشیان لەبازاڕ ئەوەندەیەو گرانە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (خانە خراپ! ئەوە سوودە! ئەگەر ویستت شتی وابکەیتو شتێ بگۆڕیتەوە بەشتێ لەچەشنی خۆی، وەك خورما بەخورما، یاترێ بەترێ، یا گۆشت بەگۆشت، بەوێنە ئەگەر ویستت خورما بگۆڕیتەوە بەخورما، لەپێشا خورماکەی خۆت بفرۆشە بەپارە، یا بەکالاێ، ئەوجا بەو پارەیە، یابەو کالایە، چی جۆرە خورمایەکت ویست پێی بکڕە!).

ئەبو سەعید فەرمووی: دەی من لەتۆ دەپرسم: خورما بەخورما ئەگەر لایەکیان زیاتربێ، ئەوە شایانترە کەسوودبێ، یازیو بەزیو ئەگەر لایەکیان زیاتربێ؟! دیارە زیو بەزیو لەکاتی وادا شایانترە کەسوودبێ، واتە ڕیبابێ.

ئەبو نـەضـرە فـەرمووی: جالـەوە دواتـر چـووم بـۆلای ئیبنـو عومـەر، دیـاربوو، لەقسەی پێشووی خۆی پەشیمان بوو بۆوە، چونکە جلەوگیری لەوجۆرە مامەڵەیە دەکرد، کەلەکاتی پارە گۆڕینەوەدا لایەکیان لەلایەکیان پتربێ، بەڵام نەچووم بۆلای ئیبنو عەبباس، ئـەبو نـەضـرە فـەرمووی: بـەڵام ئـەبو صـەهباء گێڕایـەوە بـۆم، کـە لەمەککە لەبارەی پارە گۆڕینەوە، کە لایەکیان پتربێ لەویتریان، لەئیبنو عەبباسم پرسی، کـاری وای پـێ خـراپ بـوو، وادیـارە کەئـەویش وەك ئیبنـو عومـەر لەقسـەی پێشووی خۆی پەشیمان بۆتەوە.

## ٧٤٧) نەفرینو لەعنەت لەسوو خۆرو لەسوود وەرگر

## باب: لعن آكِل الرِّبا وَمُؤكله.

{بڕوانە: ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٧}

٩٥٥- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: لَعَنَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) آكِـلَ الرِّبَا، وَمُوكِلَهُ، وَكَاتِبَهُ وَشَاهِدَيْهِ وَقَالَ: هُمْ سَوَاءٌ. {الحديث: ٤٠٦٩ شيحا = ٤٠٦٤ فم}:

جابیری کـوڕی عـەبـدوڵلا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: پێغـەمبـەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەفرینی کردووە لەمانە: لەسوود خۆرو لەسوود وەرگرو لەوکەسە دەینووسێو لـەو کەسەش دەبێ بەشایەتی سەودای سوود). وە حـەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئەمانە هەموویان لە تاوانباریو نەفرین لێکراویدا چون یـەکن). {تـاج/٢، زنجیـرە: ١٥٤، ژمارە: ١٨٣٩ + ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٧، ژمارە: ١٦١٥}.

## ٧٤٨) وەرگرتنی حەڵاڵی روونو ئاشکراو وازهێنان لەشتی گوماناوی

## (٤٠٧٠ - ٤٠٧٣) باب: أخْذُ الحلال البيّن وترْكُ الشُّبُهات

٩٥٦- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) يَقُولُ - وَأَهْوَى النُّعْمَانُ بِإِصْبَعَيْهِ إِلَى أُذُنَيْهِ -: « إِنَّ الْحَلاَلَ بَيِّنٌ، وَإِنَّ الْحَرَامَ بَيِّنٌ، وَبَيْنَهُمَا مُشْتَبِهَاتٌ، لاَ يَعْلَمُهُنَّ كَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ، فَمَنِ اتَّقَى الشُّبُهَاتِ اسْتَبْرَأَ لِدِينِـهِ وَعِرْضِهِ، وَمَنْ وَقَعَ فِي الشُّبُهَاتِ، وَقَعَ فِي الْحَرَامِ، كَالرَّاعِي يَرْعَى حَوْلَ الْحِمَى، يُوشِـكُ أَنْ يَرْتَعَ فِيهِ، أَلاَ وَإِنَّ لِكُلِّ مَلِكٍ حِمًى أَلاَ وَإِنَّ حِمَى اللَّهِ مَحَارِمُهُ، أَلاَ وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً

إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلاَ وَهِيَ الْقَلْبُ». {الحديث: ٤٠٧٠ شيحا = ٤٠٦٥ فم. تجريد/١، رقم: ٤٨ = ٥٢، ٢٠٥١ فتح الباري. أبو داود. بيوع: ٣٣٣٠، ٣٣٢٩، ترمذي. بيوع: ١٢٠٥. نسائي. بيوع: ٤٤٦٥. رياض/٢، زنجيره: ٦٨، ژماره: ١/٥٨٨}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (ڕەزای خودایان لێ بێ) هەردوو دەستی خۆی درێژکرد بۆ هەردوو گوێی خۆی‌و فەرمووی: بەم دوو گوێیانەی خۆم، لەزاری پیرۆزی پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (درودی خودای لەسەر بێ): شتی حەلاڵ دیارو ئاشکرایە، هەروەها شتی حەرامیش دیارو ئاشکرایە، بەلام لەوبەینەدا هەندێ شت هەن دوو بەینین‌و لەهەردوولا دەچن، لەبەرئەوە گەلێ کەس حوکمەکەیان نازانن، بەلام زانایانی ئایین، لەپاش لێکۆڵینەوەی شایان، بڕیارە شەرعییەکەیان دەدۆزنەوەو بڕیار دەدەن کە حەلاڵن یا حەرامن، جا ئەوەی کەخۆی بپارێزێ لەشتی شوبهەدارو گومان لێکراو، ئەوە ئایین‌و ناموسی خۆی لە نەنگ‌و لکە دەپارێزێ بەپێی شەرعی خوا.

بەلام ئەوەی کە توخنی شتی شوبهەدارو گومانلێکراو دەکەوێ، خوانەخوا، تووشی دەبێ، بەتووشی حەرامیشەوە، وەك چۆن شوان ئەگەر لەدەوروبەری پاکژو پاوان، ران بلەوەڕێنێ، بەرە بەرە رانەکە لەپاوەندەکەیش دەلەوەڕێ.

باش ئاگاداربن! کەهەموو پادشایێ بەست‌و پاوەندێکی تایبەتی خۆی هەیە، بزانن کە بەست‌و پاوەندی خودایش ئەو شتانەیە کە حەرامی کردوون!

باش ئاگاداربن! کە گوڵمەیەك گۆشت هەیە لەناو جەستەدا ئەگەر ئەو گوڵمە گۆشتە سازو باش بوو، ئەوا جەستەیش هەموو سازو باش دەبێ، بەلام ئەگەر ئەو گوڵمەیە خراپ بوو، ئەوا جەستەیش هەمووی خراپ دەبێ، بزانن کە ئەو گوڵمەیە برێتییە لەدڵ، دڵی پاك‌و لەشی چاك، دڵی پیس‌و لەشی ناپاك). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٤، ژمارە: ١٧٥٦}.

**٧٤٩) قەرزدانەوە بەچاکتر لەخۆی، لەباشترینی ئێوەن ئەوانەتان کەقەرز بەجوانی دەدەنەوە.** (٤٠٨٤ - ٤٠٨٨)

**بَاب: مَنِ اسْتَلَفَ شَيْئاً فَقَضَى خَيْراً مِنْهُ، وَخَيْرُكم أَحْسَنُكُم قَضَاءً**

٩٥٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كَانَ لِرَجُلٍ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَقٌّ، فَأَغْلَظَ لَهُ، فَهَمَّ بِهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ لِصَاحِبِ الْحَقِّ مَقَالاً، فَقَالَ لَهُمُ: اشْتَرُوا لَهُ سِنًّا فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَقَالُوا: إِنَّا لاَ نَجِدُ إِلاَّ سِنًّا هُوَ خَيْرٌ مِنْ سِنِّه، قَالَ: « فَاشْتَرُوهُ فَأَعْطُوهُ إِيَّاهُ، فَإِنَّ مِنْ خَيْرِكُمْ أَوْ خَيْرِكُمْ أَحْسَنُكُمْ قَضَاءً ». {الحديث: ٤٠٨٦ = ٤٠٨١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠١٤ = ٢٣٠٥، ٢٣٩٠، ٢٣٩٢، ٢٣٩٣، ٢٤٠١، ٢٦٠٦، ٢٦٠٩ فتح الباري. ترمذي. بيوع: ١٣١٦، ١٣١٧. نسائي. بيوع: ٤٧٠٧. رياض/٣، زنجيره: ٢٤٠، ژماره: ١/١٣٦٧}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کابرایێ، ئاژەڵێکی لەسەر پێغەمبەر بوو (دروودی خودای لەسەر بێ) کابراکە داوای ئاژەڵەکەیی کردەوە، قسەی رەق بوو لەگەڵ پێغەمبەردا، جا هاوەڵان قرمیان لێ خۆشکرد، کە پەلاماری بدەنو تەمێی بکەن، بەڵام پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: وازی لێ بێنن، چونکە خاوەن ماف قسەی رەوایەو هەقی قسەی هەیە، ئاژەڵێکی هاوتەمەنی ئاژەڵەکەی خۆیی بۆ بکڕنو بیدەن پێی. گوتیان: ئاژەڵی وانییە، مەگەر لەئاژەڵەکەی خۆی باشتری بۆپەیدا بکەین؟ فەرمووی: دەبیکڕنو بیدەنێ، چونکە لەپیاو باشانی ئێوەن، ئەو کەسانەتانن کە قەرز زۆر بەجوانی دەدەنەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٨١ — ش/د/ت/ن + ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٠، ژمارە: ١/١٣٦٧}.

**٧٥٠) جڵەوگیریی کراوە لەسوێند خواردن لەکاتی سەودادا.** (٤١٠٣ - ٤١٠٥)

**بَابُ: النَّهْيُ عَنِ الحَلْفِ فِي البَيْعِ**

٩٥٨- عَنْ أَبِي قَتَادَةَ الأَنْصَارِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ سَمِعَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « إِيَّاكُمْ وَكَثْرَةَ الْحَلِفِ فِي الْبَيْعِ فَإِنَّهُ يُنَفِّقُ، ثُمَّ يَمْحَقُ ». {الحديث: ٤١٠٢ شيحا = ٤٠٩٦ فم}:

ئەبو قەتادەی ئەنصاری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (لەسەوداو مامەڵەدا دووربن لەسوێند خواردنی زۆر، چونکە لەپێشا برەو بەکاڵا دەدا، بەڵام لەئەنجامدا پیتو بەرەکەتی دەبا). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٢ + ریاض/٤، زنجیرە: ٣١٨، ژمارە: ١٧٢٠، ١٧٢١}.

٩٥٩- عَنْ أَبِی هُرَیْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلی الله علیه وسلم): « ثَلاَثٌ لاَ یُکَلِّمُهُمُ اللَّهُ، وَلاَ یَنْظُرُ إِلَیْهِمْ، وَلاَ یُزَکِّیهِمْ، وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِیمٌ: رَجُلٌ عَلَی فَضْلِ مَاءٍ بِالْفَلاَةِ یَمْنَعُهُ مِنِ ابْنِ السَّبِیلِ، وَرَجُلٌ بَایَعَ رَجُلاً بِسِلْعَةٍ بَعْدَ الْعَصْرِ فَحَلَفَ لَهُ بِاللَّهِ لأَخَذَهَا بِکَذَا وَکَذَا فَصَدَّقَهُ وَهُوَ عَلَی غَیْرِ ذَلِكَ، وَرَجُلٌ بَایَعَ إِمَامًا لاَ یُبَایِعُهُ إِلاَّ لِدُنْیَا فَإِنْ أَعْطَاهُ مِنْهَا وَفَی، وَإِنْ لَمْ یُعْطِهِ مِنْهَا لَمْ یَفِ ». {الحدیث: ٢٩٣ = تجرید/٣، رقم: ١٠٣٧ = ٢٣٥٨، ٢٣٦٩، ٢٦٧٢، ٧٢١٢، ٧٤٤٦. ریاض/٤، لاپەڕە: ١٣٢٨، فەرموودە: ٢٨ چاپی یەکەم = ژمارە: ٢٨/١٨٣٥ – ٢٩٩. چاپی دووەم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: لەرۆژی قیامەتدا ئەم سێ کەسە خودا نەقسەی خۆشیان لەگەڵدا دەکاو نەڕوویان دەداتێو نەبەچاوی میهرەبانی تەماشایان دەکاو نەپاكو خاوێنیان دەکاتەوەو نەتاریفیان دەکا، واتە لەهیچ روویەکەوە روویان ناداتێ، سەرەڕای ئەوەیش سزایەکی سەختیان بۆهەیە:

یەکەم: پیاوێ کە لەچۆڵێ، زیادە ئاوی هەبێو لە ڕێبواری قەدەغە بکا.

دووەم: پیاوێ کە لەپاش عەصر کەکاتی بەرزبوونەوەی فریشتەکانە، لەگەڵ کردەوەی رۆژی بەندەدا، ئەو لەوکاتە ناسکەدا، لەسەر مامەڵەو سەودا سوێندی درۆبخواو، بەپیاوێ بڵێ بەخوا ئەم کاڵایە ئەمەندەو ئەوەندەم پێداوە، کابرایش باوەڕی پێبکا، خۆشی درۆبکا.

سێیەم: پیاوێ پەیمان بدا بەپێشەوا مەبەستی دنیابێو سەیری بەرژەوەندی خۆی بکا، جا ئەگەر پێشەوا بەشیدا ئەویش بەگوێی دەکا، بەڵام ئەگەر ئەو بەشی نەدا، ئەویش بەگوێی نەکا).

## ٧٥١) فرۆشتنی وشتر بەمەرجێ فرۆشیار مافی سواربوونی بمێنێ
(٤٠٧٤ - ٤٠٨٣)

## باب: بَيْعُ الْبَعِيرِ وَاسْتِثْنَاءُ حُمْلَانِهِ

٩٦٠- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضِيَ اللّهُ عَنْهُما) قَالَ: غَزَوْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَتَلَاحَقَ بِي وَتَحْتِي نَاضِحٌ لِي قَدْ أَعْيَا وَلاَ يَكَادُ يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: مَا لِبَعِيرِكَ؟ قَالَ: قُلْتُ: عَلِيلٌ، قَالَ: فَتَخَلَّفَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَزَجَرَهُ وَدَعَا لَهُ، فَمَا زَالَ بَيْنَ يَدَيِ الإِبِلِ قُدَّامَهَا يَسِيرُ، قَالَ: فَقَالَ لِي: « كَيْفَ تَرَى بَعِيرَكَ » قَالَ: قُلْتُ: بِخَيْرٍ، قَدْ أَصَابَتْهُ بَرَكَتُكَ، قَالَ: « أَفَتَبِيعُنِيهِ »؟ فَاسْتَحْيَيْتُ، وَلَمْ يَكُنْ لَنَا نَاضِحٌ غَيْرُهُ، قَالَ: فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَبِعْتُهُ إِيَّاهُ عَلَى أَنَّ لِي فَقَارَ ظَهْرِهِ حَتَّى أَبْلُغَ الْمَدِينَةَ، قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي عَرُوسٌ فَاسْتَأْذَنْتُهُ، فَأَذِنَ لِي، فَتَقَدَّمْتُ النَّاسَ إِلَى الْمَدِينَةِ، حَتَّى انْتَهَيْتُ، فَلَقِيَنِي خَالِي، فَسَأَلَنِي عَنِ الْبَعِيرِ؟ فَأَخْبَرْتُهُ بِمَا صَنَعْتُ فِيهِ، فَلاَمَنِي فِيهِ، قَالَ: وَقَدْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لِي حِينَ اسْتَأْذَنْتُهُ: « مَا تَزَوَّجْتَ، أَبِكْرًا أَمْ ثَيِّبًا؟». فَقُلْتُ لَهُ: تَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا، قَالَ: « أَفَلاَ تَزَوَّجْتَ بِكْرًا تُلاَعِبُكَ وَتُلاَعِبُهَا »؟ فَقُلْتُ لَهُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ تُوُفِّيَ وَالِدِي أَوِ اسْتُشْهِدَ وَلِي أَخَوَاتٌ صِغَارٌ، فَكَرِهْتُ أَنْ أَتَزَوَّجَ إِلَيْهِنَّ مِثْلَهُنَّ فَلاَ تُؤَدِّبُهُنَّ، وَلاَ تَقُومُ عَلَيْهِنَّ، فَتَزَوَّجْتُ ثَيِّبًا لِتَقُومَ عَلَيْهِنَّ وَتُؤَدِّبُهُنَّ، قَالَ: فَلَمَّا قَدِمَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْمَدِينَةَ غَدَوْتُ إِلَيْهِ بِالْبَعِيرِ، فَأَعْطَانِي ثَمَنَهُ، وَرَدَّهُ عَلَيَّ. {الحديث: ٤٠٧٦ = ٤٠٧١ فم. بخاري. استقراض: ٢٢٨٥، ٢٧١٨، ٢٩٦٧. أبو داود. بيوع: ٢٥٠٥. ترمذي. بيوع: ١٢٥٢. نسائي. بيوع: ٤٦٥١}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەخزمەت پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) چووین بۆ غەزا، وشترێکی ئاوکێشم لەژێردا بوو، وەستابوو، کەڵکی ڕۆیشتنی نەمابوو، بەئاستەم ڕێگەی دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەدوامەوە بوو پێم گەیشت، فەرمووی پێم: (ئەی جابیر! ئەوە وشترەکەت چییەتی؟) عەرزیم کرد: نەخۆشە، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو لەدواوە تێی خوڕیو نزای بۆیکرد، ئیتر وای لێهات هەر لەپێش وشترەکانەوە دەڕۆیشت، پاش ماوەیێ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (ئەرێ وشترەکەت ئێستا چۆنە؟) منیش عەرزیم

کرد: زۆرباشه، لەپیتو فەڕو پیرۆزی تۆوە زۆرباش بووە. خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی پێم: (پێمی دەفرۆشیت؟). گەرچی وشتری ئاوکێشی ترمان نەبوو، لەبەرئەوە حەزم لەفرۆشتنی نەبوو، بەلاَم شەرمم لە پێغەمبەر کرد، لەبەرئەوە گوتم: بەلْیَ دەیفرۆشم، جاپێیم فرۆشت، بەمەرجیَ هەتا دەچمەوە مەدینە خۆم سواری پشتی ببم.

جا عەرزی حەزرەتم کرد: قوربان! من تازە زاوام، لەبەرئەوە حەزدەکەم زوو بگەمەوە مالْەوە، ئەگەر مۆلْەتم بدەی پێش دەکەومو دەڕۆم، ئەویش مۆلْەتی ئەوەی پێدام، ئیتر پێش خەلْکەکە کەوتم بەرەو مەدینە، تا گەیشتمە ناوشار، لەویَ خالْم پیَ گەیشت، پرسیاری وشترەکەمی لێمکرد، منیش چیرۆکەکەیم بۆیگێڕایەوە، ئەویش لەسەرئەوە سەرزەنشتی کردم.

جابیر فەرمووی: لەوکاتەدا کە مۆلْەتم لە پێغەمبەر وەرگرت، کەپێش بکەوم لەبەرئەوەی کەتازە زاوام، فەرمووی پێم: (چیت هێناوە، کچ یا بێوەژن؟) عەرزیم کرد: بێوەژنم هێناوە. فەرمووی: (ئەی بۆ کچێکت نەهێنا، گەمەو یاری لەگەلْ بکەیتو گەمەو یاریت لەگەلْ بکا؟) عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! عەبدوللاَی باوکم کەمردو لەغەزای ئوحوددا شەهیدبوو، حەوت خوشك، یانۆ خوشکی بەسەردا بەجیَ هێشتم، کەهەموویان سەرو قنگ بوونو منالْ بوون، لەبەرئەوە بێوەژنێکم هێنا کە کارامەبیَ، مالْو مێردی دیبیَو وەك خۆیان کوَلْیو دەسەوسان نەبیَ، تابتوانیَ بەجوانی پەروەردەیان بکاتو سەرپەرشتییان بکات.

جابیر فەرمووی: کاتیَ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) گەیشتەجیَو هاتەوە مەدینە، وشترەکەم بۆیبرد، ئەویش پارەکەیی پێمدا، بەلاَم لەپاشا وشترەکەشی پێم دایەوە.
{تاج/٢، زنجیرە: ٢٤، ژمارە: ٢٠٥٣ + ژمارە: ٨٤٧ کە لەزنجیرە: ١٦٦٠دا لەپێشەوە رابورد}.

## ٧٥٢) قەرز داشكاندن. (٣٩٥٨ - ٣٩٦٢)

## باب: فِي الوَضْعِ مِنَ الدَّيْنِ

٩٦١- عَنِ كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّهُ تَقَاضَى ابْنَ أَبِي حَدْرَدٍ دَيْنًا كَانَ لَهُ عَلَيْهِ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْمَسْجِدِ، فَارْتَفَعَتْ أَصْوَاتُهُمَا، حَتَّى سَمِعَهَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَهُوَ فِي بَيْتِهِ، فَخَرَجَ إِلَيْهِمَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) حَتَّى كَشَفَ سِجْفَ حُجْرَتِهِ، وَنَادَى كَعْبَ بْنَ مَالِكٍ فَقَالَ: « يَا كَعْبُ». فَقَالَ: لَبَّيْكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، فَأَشَارَ إِلَيْهِ بِيَدِهِ أَنْ ضَعِ الشَّطْرَ مِنْ دَيْنِكَ، قَالَ كَعْبٌ: قَدْ فَعَلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « قُمْ فَاقْضِهِ ». {الحديث: ٣٩٦١ = ٣٩٥٧ فم. تجريد/١، رقم: ٢٧٩ = ٤٥٧، ٤٧١، ٢٤١٨، ٢٤٢٤، ٢٧٠٦، ٢٧١٠. أبو داود. أقضية: ٢٥٩٥. نسائي. قضاة: ٥٤٢٣، ٥٤٢٩. رياض/١، زنجيره: ٣١، ژماره: ٣/٢٥٠ چاپی دووەم}:

كەعبی كوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: قەرزێكم لەسەر ئیبنو ئەبو حەدرەد بوو، لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو مزگەوتا داوایم لێی كردەوە، بەهۆی ئەوەوە دەنگمان بەرزەوە بوو، تارادەیەكی وا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەناو ماڵی خۆیەوە گوێی لەدەنگە دەنگمان بوو، جا تەشریفی هاتە دەرەوە كەبێ بۆلامان، چوو پەردەی دەرگای هۆدەكەی خۆیی لادا، دەرگای هۆدەكەی لەسەر ماڵی مزگەوت بوو، ئەوجا بانگی كرد: (ئەی كەعبی كوڕی مالیك!) گوتم: بفەرموو ئەی پێغەمبەری خودا! سەرم لەڕێتایە. فەرمووی: (ئەوەندە لەقەرزەكەت دابشكێنە) بەئاماژەی دەست تێی گەیاندم كە لەنیوەی قەرزەكەی خۆش ببم. كەعب فەرمووی: ئەوا دایم شكان ئەی پێغەمبەری خودا! جا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بە ئیبنو ئەبی حەدرەدی فەرموو: (دەتۆیش هەڵسە بڕۆ ئەو نیوەكەی تری پێ بدەرەوە).

**٧٥٣) قەرز كوێریی دەوڵەمەند ستەمە، باسی بەرەو رونكردنەوە(٣٩٧٨ - ٣٩٧٩)**
**بابٌ: فی مُطْلِ الغنیِّ ظُلْمٌ، والحَوالَةُ**

٩٦٢- عَنْ أَبِی هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَطْلُ الْغَنِيِّ ظُلْمٌ، وَإِذَا أُتْبِعَ أَحَدُكُمْ عَلَى مَلِيءٍ فَلْيَتْبَعْ ». {الحديث: ٣٩٧٨ = ٣٩٧٤ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٠٨ = ٢٢٨٧، ٢٢٨٨، ٢٤٠٠. أبو داود. بيوع: ٣٣٤٥. نسائى. بيوع: ٤٧٠٥. رياض/٤، زنجيره: ٢٨٤، ژماره: ١٦١١/١٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) لەخۆشەویستەوە دەفەرموێ: (قەرزكوێریی دەوڵەمەند گەلێ ستەمە! زۆر نارەوایە، ئەگەر كەسێكیشتان لەلایەنی قەرزارەكەی خۆیەوە، بەرەو رووی كەسێكی دەوڵەمەند كرایەوە، كە ئەوكەسە دەوڵەمەندە، لەباتی قەرزارەكەی خۆی، قەرزەكەی پێ بداتەوە، ئەوە بابچێ قەرزەكەی لەو دەوڵەمەندە وەربگرێتەوە). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٦، ژمارە: ١٨٩٧}.

**٧٥٤) دارا مۆڵەتی نەدارابداو چاوپۆشی لێ بكا. (٣٩٦٩ - ٣٩٧٧)**
**بابٌ: فِي إِنْظَارِ المُعْسِرِ والتَّجَاوُز**

٩٦٣- عَنْ حُذَيْفَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِیِّ (صلى الله عليه وسلم): « أَنَّ رَجُلاً مَاتَ فَدَخَلَ الْجَنَّةَ، فَقِيلَ لَهُ: مَا كُنْتَ تَعْمَلُ (قَالَ: فَإِمَّا ذَكَرَ، وَإِمَّا ذُكِّرَ) فَقَالَ: إِنِّی كُنْتُ أُبَايِعُ النَّاسَ، فَكُنْتُ أُنْظِرُ الْمُعْسِرَ وَأَتَجَوَّزُ فِی السِّكَّةِ أَوْ فِی النَّقْدِ، فَغُفِرَ لَهُ »، فَقَالَ أَبُو مَسْعُودٍ: وَأَنَا سَمِعْتُهُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم). {الحديث: ٣٩٧١ = ٣٩٦٨ فم. تجريد/٣، رقم: ٩٤٤ = ٢٠٧٧، ٢٣٩١، ٣٤٥١. تحفة الأشراف: ٣٣١٠}:

حوزەیفە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (پیاوێ دەمرێ و دەچێتە بەهەشت، پێی گوترا: تۆ چیت دەكرد، كەوا خودا بەهەشتی پێ بەخشیت؟)

فەرموودە گێڕەوە فەرمووی: یابەندەكە خۆی هۆی لێخۆشبوونەكەیی لەیادبوو وەباسی كرد، یا فریشتەكان ئەوەیان یادخستەوە، بەهەرحاڵ گوتی: من لەجیهانا سەوداو مامەڵەم لەگەڵ خەڵكا دەكرد، دەستوورم وابوو چاوپۆشیم لەنەدارا دەكردو

مۆڵەتم دەداو پێم لێ نەدەکردە کەوش، لەپارە وەرگرتنیشا چاوپۆشیم دەکردو گوێم بەکەموکوڕی دراوەکە نەدەدا، جا خودا لێی خۆش بوو).

ئەبو مەسعوودی ئەنصاریش (رەزای خودایان لێ بێ) فەرموی: منیش ئەم فەرموودەیەم، وەك حوزەیفە، لە پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە. {ریاض/٣، زنجیرە: ٢٤٠، ژمارە: ١٣٦٨، ١٣٦٩، ١٣٧٠، ١٣٧١، ١٣٧٢، ١٣٧٣ + تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٩}.

٩٦٤- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي قَتَادَةَ: أَنَّ أَبَا قَتَادَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) طَلَبَ غَرِيمًا لَهُ فَتَوَارَى عَنْهُ ثُمَّ وَجَدَهُ، فَقَالَ: إِنِّي مُعْسِرٌ، فَقَالَ: آللَّهِ؟ قَالَ: آللَّهِ، قَالَ: فَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ سَرَّهُ أَنْ يُنْجِيَهُ اللَّهُ مِنْ كُرَبِ يَوْمِ الْقِيَامَةِ، فَلْيُنَفِّسْ عَنْ مُعْسِرٍ، أَوْ يَضَعْ عَنْهُ ». {الحديث: ٣٩٧٦ = ٣٩٧٢ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبو قەتادە فەرمووی: ئەبو قەتادەی باوکم، قەرزی لەسەر قەرزارێکی خۆی بوو، چوو داوای قەرزەکەیی لێ بکاتەوە، قەرزارەکەیش خۆی لێی شاردەوە، لەپاشا دۆزییەوە، باوکم داوای قەرزەکەی سەری لێ کردەوە، گوتی: نەدارامو نیمە، باوکم فەرمووی: توخوا جاوایە، گوتی: بەخودا وایە. باوکم فەرمووی: دەی من بەگوێی خۆم لە پێغەمبەرم بیست دەیفەرموو (دروودی خودای لەسەر بێ): (کەسێ حەزدەکا، کەخودا لەمەینەتەکانی رۆژی قیامەت رزگاری بکا، با مۆڵەتی نەدارا بدا، یا لەقەرزەکەی سەری دابشکێنێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٤٧، ژمارە: ١٧٧٩، ١٧٨٠، ١٧٨٢ + تاج/٣، زنجیرە: ١١٠، ژمارە: ٣١٨٥ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

### ٧٥٥) کەسێ ماڵی خۆی بەسەر بگرێتەوە لەلای کەسێ کەنابووت کەوتبێ ئەوەیە هی خۆیەتی. (٣٩٦٣ - ٣٩٦٨)

### باب: مَنْ أَدْرَكَ مَالَهُ بِعَيْنِهِ عِنْدَ مُفْلِسٍ

٩٦٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا أَفْلَسَ الرَّجُلُ فَوَجَدَ الرَّجُلُ عِنْدَهُ سِلْعَتَهُ بِعَيْنِهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا ». {الحديث: ٣٩٦٨ = ٣٩٦٤ فم}:

ئـەبو هـورەیرە (ڕەزای خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: خۆشەویسـت (دروودی خـودای لەسـەر بێ) دەفـەرموێ: (هەرکەسێ خـودی مـاڵی خـۆیی بەسـەرگرتەوە، لـەلای پیـاوێکی لات کەوتوو، ئەوە هی خۆیەتیو بەو ڕەواترە هەتا کەسێکی تـر). {تـاج/٢، زنجـیرە: ١٦٥، ژمارە: ١٨٩٤}.

## ٧٥٦) فرۆشتنو بارمتە (ڕەهن). (٤٠٩٠ - ٤٠٩٣)

## باب: البَيْعُ والرَّهْنُ

٩٦٦- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُا): أَنَّ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) اشـترى مِنْ يَهُودِيّ طَعَامًـا إلى أجـل، وَرَهَنَـهُ دِرْعًـا مِـنْ حَدِيـدٍ. {الحـديث: ٤٠٩٢ = ٤٠٨٦ فـم. تجريـــد/٣، رقـــم: ٩٤١ = ٢٠٦٨، ٢٠٩٦، ٢٢٠٠، ٢٢٥١، ٢٢٥٢، ٢٣٦٨، ٢٥٠٩، ٢٥١٣، ٢٩١٦، ٤٤٦٧. نسائى. بيوع: ٤٦٢٣. ابن ماجة. رهـون: ٢٤٣٦. تحفـة الأشـراف: ١٥٩٤٨}:

عائیشەی هاوسەری پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر پێغەمبەرو ڕەزای خـودا لەهاوسـەرانی) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) لەمەدینـە، لەجوولەکـەیێ هـەنێ جـۆ بەقـەرز، بۆماوەیـەکی دیـاریکراو دەکـڕێ، زریەیـەکی ئاسـنی هـەبوو، لەبارمتەی ئەو جۆیەدا، لەلای جوولەکەکە دانـابوو). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٥٧، ژمـارە: ١٨٥٠} + {ڕیاض/٢، زنجیرە: ٥٦، ژمارە: ٥٠٥/١٠}.

## ٧٥٧) سەلەمکردن بەسەر بەروبووم. (٤٠٩٤ - ٤٠٩٧)

## بابٌ: السَّلَفُ فِي الثِّمَارِ

٩٦٧- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) قَالَ: قَدِمَ النَّبِـيُّ (صـلى الله عليـه وسـلم) الْمَدِينَةَ وَهُمْ يُسْلِفُونَ فِى الثِّمَارِ السَّنَةَ وَالسَّنَتَيْنِ، فَقَالَ: « مَنْ أَسْلَفَ فِى تَمْرٍ فَلْيُسْلِفْ فِى كَيْلٍ مَعْلُومٍ، وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ، إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ ». {الحديث: ٤٠٩٤ = ٤٠٨٨ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ٩٩٨ = ٢٢٣٩، ٢٢٤٠، ٢٢٤١، ٢٢٥٣. أبـو داود. بيـوع: ٣٤٦٣. ترمـذى. بيـوع: ١٣١١. نسائى. بيوع: ٤٦٣٠. ابن مـاجة. تجارات: ٢٢٨٠. تحفة الأشراف: ٥٨٢٠}:

**ئیبنو عەبباس** (رەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: کاتێ پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کۆچی کرد بۆ مەدینە، خەڵك بەسەر بەری دارو درەختو شینایيو دانەوێڵە، سەلەمیان دەکرد بۆماوەی ساڵێ یادوو ساڵ. جا پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **فەرمووی: (هەرکەسێ سەلەم بەسەر خورما، یا بەسەر شتێ تر دەکا، با ئەندازەی شتە سەلەم بەسەرکراوەکە دیاری بێ، وەك دەربە، یا بەکێشانە زانراوبێ، وەك سەدکیلۆ، هەروەها بۆماوەی چەندیشە، ماوەکە ناوبرێ، وەك ساڵێ، دوو ساڵ، مانگێ، دوو مانگ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٦، ژمارە: ١٨٤٧}.**

## ٧٥٨) بەش هەڵگرتنەوە (شوفعە). (٤١٠٣ - ٤١٠٥)

## بابٌ: فِي الشُّفْعَةِ

**(بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٥١٥، زنجیرە: ٢٢٤)**

**٩٦٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) بِالشُّفْعَةِ فِي كُلِّ شِرْكَةٍ لَمْ تُقْسَمْ، أَوْ حَائِطٍ، لاَ يَحِلُّ لَهُ أَنْ يَبِيعَ حَتَّى يُؤْذِنَ شَرِيكَهُ، فَإِنْ شَاءَ أَخَذَ، وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ، فَإِذَا بَاعَ وَلَمْ يُؤْذِنْهُ فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ). {الحديث: ٤١٠٤ = ٤٠٩٨ فم}:**

**جابیر** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **شوفعە (بەشی هاوبەشو بەشی هاوسێ هەڵگرتنەوە)ی داناوە، لەهەموو شتێکا کەهاوبەشی بێو هێشتا دابەش نەکرابێ، هەروا بێستانو باخیش لەوشتانەن کە قەبووڵی شوفعە دەکەن، جا لەکاتی وادا دروست نییە بۆ هاوبەش کەبەشەکەی خۆی بفرۆشێ، هەتا هاوبەشەکەی ئاگادار نەکاتەوە، جا هاوبەشەکەی کەیفی خۆیەتی یابەشی هاوبەشەکەی هەڵ دەگرێتەوە، یاوازی لێ دێنێ، گریمان ئەگەر هاوبەش بەبێ ئاگادار کردنەوەی هاوبەشەکەی، بەشی خۆی فرۆشتەوە، هاوبەشەکەی لەپێشترە بەهەڵگرتنەوەی ئەو بەشە فرۆشراوەیە!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٢}.**

**٧٥٩) سەری دوستەك‌و گوێسەوانە دانان لەسەر دیواری هاوسێ.** (٤١٠٦ - ٤١٠٧)

**باب: غَرْزُ الخَشَبِ فِي جِدَارِ الجَارِ**

٩٦٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَمْنَعْ أَحَدُكُمْ جَارَهُ أَنْ يَغْرِزَ خَشَبَةً فِى جِدَارِهِ ». قَالَ ثُمَّ يَقُولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: مَا لِى أَرَاكُمْ عَنْهَا مُعْرِضِينَ؟! وَاللَّهِ لأَرْمِيَنَّ بِهَا بَيْنَ أَكْتَافِكُمْ. {الحديث: ٤١٠٦ = ٤١٠٠ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٦٩ = ٢٤٦٣، ٥٦٢٧، ٥٦٢٨}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ڕێگەی دراوسێ بدەن کەسەری دەستەك‌و گوێسەوانە لەسەر دیواری ئێوە دابنێن). لەپاشا ئەبو هورەیرە فەرمووی: ئەوە بۆچی دەتان بینم لووتەلان لەم فەرمایشتە! دەسا بەیەزدانی پاك خۆشیتان بێ‌و ترشیتان بێ، من ئەرکی سەرشانی خۆم بەجێ دەهێنم‌و ئەم فەرمایشت‌و ئامۆژگارییانە وەك گولمێخ دەکوتم بەناو شانتانا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٥٨، ژمارە: ١٨٥٦}.

**٧٦٠) هەرکەسێ بەزۆرو ستەم بستێ زەوی زەوت بکا بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە دەکرێ بەئەڵقەو دەکرێتە ملی.** (٤١٠٦ - ٤١٠٧)

**باب: مَنْ ظَلَمَ مِنَ الأَرْضِ شِبْراً طُوِّقَ مِنْ سَبْعِ أَرَضِينَ**

٩٧٠- عَنْ عُرْوَةَ بن الزبير (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ): أَنَّ أَرْوَى بِنْتَ أُوَيْسٍ ادَّعَتْ عَلَى سَعِيدِ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ) أَنَّهُ أَخَذَ شَيْئًا مِنْ أَرْضِهَا فَخَاصَمَتْهُ إِلَى مَرْوَانَ بْنِ الْحَكَمِ فَقَالَ سَعِيدٌ: أَنَا كُنْتُ آخُذُ مِنْ أَرْضِهَا شَيْئًا بَعْدَ الَّذِى سَمِعْتُ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟! قَالَ وَمَا سَمِعْتَ مِنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)؟ قَالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: « مَنْ أَخَذَ شِبْرًا مِنَ الأَرْضِ ظُلْمًا طُوِّقَهُ إِلَى سَبْعِ أَرَضِينَ ». فَقَالَ لَهُ مَرْوَانُ: لاَ أَسْأَلُكَ بَيِّنَةً بَعْدَ هَذَا، فَقَالَ: اللَّهُمَّ إِنْ كَانَتْ كَاذِبَةً فَعَمِّ بَصَرَهَا، وَاقْتُلْهَا فِى أَرْضِهَا، قَالَ: فَمَا مَاتَتْ حَتَّى ذَهَبَ بَصَرُهَا، ثُمَّ بَيْنَا هِىَ تَمْشِى فِى أَرْضِهَا، إِذْ وَقَعَتْ فِى حُفْرَةٍ فَمَاتَتْ. {الحديث: ٤١١٠ = ٤١٠٤ فم}:

عوروەی کوڕی زوبەیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئەروای کچی ئووەیس سکاڵای ئەوەی دەکرد، کە سەعیدی کوڕی زەید (رەزای خودای لێ بێ) بەشێ لەزەوییەکەی ئەوی داگیرکردووە، لەلای مەروانی کوڕی حەکەم سکاڵای لێ کرد، کە ئەوکاتە مەڕوان میری سەر مەدینە بوو، سەعید فەرمووی: منێ کە بەگوێی خۆم لەم بارەیەوە هەڕەشەی گەورەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستبێ، دەچم زەوی لەو زەوت دەکەم؟! مەڕوان فەرمووی: چیت لەم بارەیە لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە؟ سەعید فەرمووی: (بەگوێی خۆم لەزاری پیرۆزی خۆشەویستم بیست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (هەرکەسێ، بەناهەق، بەزۆرو ستەم، بستێ زەوی یازیاتر داگیربکا، لەرۆژی قیامەتا، ئەو بستە زەوییە، بەهەر حەوت چینەی زەمینەوە، وەك کەڵەمە لەملی گادا، ئاوا دەکرێ بەتەوقو دەکرێتە ئەستۆی!).

مەڕوان فەرمووی بەسەعید: ئەم فەرموودەیە بەسە کەببێ بە بەڵگە لەسەر راستگۆیی تۆ، سەبارەت بەداوای ئەم ژنە، لەبەرئەوە لەپاش ئەم بەڵگەیە داوای بەڵگەی ترت لێ ناکەمو داوای ژنەکەی رەتکردەوە.

سەعید فەرمووی: خودایە! تۆ ئاگات لێ هەیە، کە ئەم ژنە ئەم بوختانەی بۆمن کرد، کە بەناهەق زەویم لێی داگیرکردووە، خودایە! ئەگەر درۆ دەکا چاوی کوێرکەو لەناو ئەم زەوییەی خۆیدا بەکوشتی بدەی).

فەرمووی: ئەروا نەمرد هەتا کوێربوو، جارێکیش لەناو زەوییەکەی خۆیدا، کە لەپاڵ زەوییەکەی سەعیددا بوو دەسووڕایەوە، لەپڕ کەوتە ناو بیرێکەوەو مرد!! هەردوو نزاکەی سەعیدی لێ گیرابوو). {تاج/٥، زنجیرە: ١٠، ژمارە: ٤٧٢٧} .

**روونکردنەوە:**

١ -بڕوانە: ژمارە: ١٠٦٣ تەجریدی بوخاری بەرگی سێیەم، هەروا ریاض/١، لاپەڕە: ١٩٤، زنجیرە: ٢٦، ژمارە: ٢٠٦/٤.

٢ - سەعیدی کوڕی زەیدی کوڕی عەمری ئەلعەدەوییە (رەزای خودای لێ بێ) لە موسوڵمانە هەرە پێشینەکانە، ئیمامی عومەر لەماڵی ئەودا ئیسلام بووە، سەعید مێردی

فاطیمەی کچی خەطاب بوو، کە خوشکی پێشەوا عومەر بوو، سەعید یەکێکە لە عەشەرەی موبەشەرە، واتە: یەکێکە لەو دەکەسە کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەژیانی خۆیدا موژدەی بەهەشتی پێیان داوە، ئامادەی گەلێ لەغەزاو نەبەردەکانی پێغەمبەر بووە، وەك غەزای یەرمووك، بەشداری لەئازادکردنی دیمەشقدا کردووە، سەعیدی کوڕی حەبیب دەیفەرموو: ئەم زاتانە لەخزمەت پێغەمبەردا لەیەك پلەو پایەدا بوون: ئەبوبەکرو عومەرو عوسمانو عەلیو سەعدو سەعیدو طەلحەو زوبەیرو عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف، لەجەنگو نەبەردو کوشتارگاکاندا، لەبەردەمیەوە بوون، لەنوێژدا لەپشتیەوە بوون، سەعید پیاوێکی گەنم ڕەنگی تووکن بوو، نزای زۆر زۆر گیرادەبوو، زەیدی باوکی پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو، لەسەر ئایینی حەزرەتی ئیبراهیم بوو (دروودی خودای گەورەوەی لەسەر بێ)، خوێنو مردارەوەبووی نەدەخوارد، هەروا گۆشتی ئاژەڵێکی نەدەخوارد کەناوی بتو ئەنصابی لەکاتی سەربڕیندا لێ هێنرابێ، لەپێش پێغەمبەرایەتیی پێغەمبەردا، بەخزمەتی پێغەمبەر دەگا، بەڵام فریای هاتنی ئیسلام ناکەوێ.

ئیبنو عەبدول بەڕ، لە ئیستیعابا ڕاگوێز دەکا:

(سەعیدی کوڕی زەید دەچێتە خزمەتی حەزرەت، عەرزی دەکا: قوربان! باوکم ئەوەبوو کەخۆت دیوتەو خەڵك باسی کردووە بۆت، کەواتە: نزای باشی بۆبکەو بۆی بپاڕێرەوە کەخودا لێی خۆش بێ، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (باوکت لەڕۆژی دوا ڕۆژدا کە زیندوو دەکرێتەوە، بەیەك نەتەوەی تەواو دادەنرێ).

سەعید سێ فەرموودەی لەبوخاری پیرۆزدا هەیە، سەعید لەکۆتایی تەمەنیدا لەعەقیق دەمرێ، تەرمەکەی دەبەنەوە بۆ مەدینە، لەوێ بەخاکی دەسپێرن، لەساڵی (٥٥) پەنجاو پێنجی کۆچیدا دەمرێ، لەسەردەمی جێنشینی موعاوییەدا، تەمەنی نزیکی حەفتاو سێ ساڵ بووە (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

## ٧٦١) ئەگەر لەسەر چەندێتی ڕێگە بوو بەکێشە. (٤١١٥)
## بابٌ: إِذَا اخْتَلَفَ فِي الطَّرِيقِ جُعِلَ عَرْضُهُ سَبْعَةُ أَزْرُعٍ

٩٧١- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِذَا اخْتَلَفْتُمْ فِى الطَّرِيقِ جُعِلَ عَرْضُهُ سَبْعَ أَذْرُعٍ ». {الحديث: ٤١١٥ = ٤١٠٩ فم. تحفة الأشراف/١٣٥٥٥}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (درودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (ئەگەر لەسەر چەندێتی ڕێگەوبان بوو بەهەراو کێشەتان، ئەوا شەرع بڕیاری داوە کەپانیی ڕێگەکە لەحەوت گەز کەمتر نەبێ).

**ڕوونکردنەوە:**

١ ـ ئەمە بۆ کۆن وابوو، ئێستا ڕێگەوبانو شەقام، بەتایبەتی لەناو شارەکاندا، لەڕێگەوبانە سەرەکییەکاندا، دەستوورو یاساو ڕێسای تایبەتی خۆی هەیە، بەپێی شوێنو کاتو جێگەی تایبەت، بەپێی بەرژەوەندی گشتی، پسپۆڕان ئەندازەی دیاری دەکەن!

٢ - پوختەی بڕیارەکانی فەرموودەکانی نامەی کڕینو فرۆشتن:

١)کڕینو فرۆشتنی خۆراك بەخۆراكو بژێوی بە بژێویو بەروبوومو میوە، بەجۆری خۆی، یابەجۆرێکی تر، یا پارە بەپارە یا زێڕ بەزێڕ، یا زیو بەزیو، دەستوورو یاسای تایبەتی خۆی هەیە، ئەگەر موسوڵمان ئاگای لەخۆی نەبێ دوورنییە کەتووشی سوود خۆریی ببێ، واباشە لەکاتی وادا پرس بە پسپۆڕان بکرێ.

٢) فرۆشتنی شت بەگۆترە بەبەهای دیاریکراو نادروستو ناپەسەندو ناباشە.

٣) میوەو بەروبووم هەتا بەکەڵکی خواردن نەیەت دروست نییە بیفرۆشن. بەڵام ئەگەر بەکەڵکی خواردن دەهات دروستە، وەك: فەریکە نۆكو فەریکە چوالەو ڕوتابو فەریکە گوێز.

٤) دارە دۆخە سوننەتە، ئەگەر ماڵێ ڕەشایی بوو لەگوندێکا، ئاژەڵیان نەبوو، سوننەتە ئاژەڵدارەکان، ئاژەڵی شیرداریان بەدۆخە بدەنێ، یائەگەر باخیان

نەبوو، دارە خورمایێ، برکە هەنجیرێ، یابنجێ مێویان پێ بدرێ کەشیرو بەرەکەی بخۆن‌و دوایی سەرەکە بۆخاوەنەکەی بگەڕێننەوە.

٥) لەکاتی دەردو بەلای ئاسمانی بۆ ئاژەڵ‌و بێستان‌و باخ دەستووری تایبەت هەیە، بڕیاری تایبەت هەیە.

٦) لەهەموو روویەکەوە یارمەتی لێقەوماو، بەتایبەتی قەرزار، کارێ پەسەندە.

٧) باسی کۆمەڵێ سەوداو مامەڵەی جیاجیا، کە حوکم‌و ناوو بڕیارەکانیان، کەمێ دوورو درێژە، لەکتێبی شەرعا بەباشی باس کراون.

٨) بەشێوەی گشتی دار رواندن‌و باخ‌و رەز دروست کردن‌و شینایی چاندن‌و بەرەودان بەکشتوکاڵ‌و باخ‌و شتی وا کارێکی زۆر نایاب‌و پەسەندە، وەهۆی خێری هەردوو جیهانە، تەنانەت رواندن‌و چاندن‌و ناشتنی دارو درەخت‌و گوڵ‌و شتی وا، ئەگەر لەناو ماڵیشدا بێ‌و بۆ زینەتیش بێ، کارێ زۆر پەسەندو باشن‌و مایەی رەحمەتی خودان. گەڵێ جار تاقە گوڵێ لەماڵێکا، لەسەرە رێگەیەکا، لەباخچەیەکا، سەرەنجی مرۆڤ رادەکێشێ‌و خۆشی دەڕوێنێ لەناو دڵ‌و هەستی مرۆڤو سۆزێکی تەلیسماوی پڕ لەمیهرو هەژان‌و خەمی تەماوی دەورووژێنێ، کە بەکتێبێ تەعبیری لێ نادرێتەوە، رەحمەت لەگوتەری:

بەچاو نەمدیوە لەم دنیا
جەوان بێ وەک گوڵی تەنیا



# ١٩- نامەی مڵكانە
## كِتَابُ المُزَارَعَةِ

### ٧٦٢) جڵەوگیریی لەبەكرێدانی زەوی. (٣٨٩٣ - ٣٩٣٨)
### بابٌ: النهىُ عَنْ كِراءِ الأَرْضِ

٩٧٢- عَنْ جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ، فَلْيَزْرَعْهَا أَوْ لِيُزْرِعْهَا أَخَاهُ، وَلاَ يُكْرِهَا ». {الحديث: ٣٨٩٨ = ٣٨٩٥ فم}:

جابیری كوڕی عەبدوڵڵا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (ئەگەر كەسێ زەوی هەیە با یاخۆی دایبچێنێ، یا بەپیاوەتی بیدات بەبرایەكی ئایینی خۆی دایچێنێ بۆ خۆی بەبێ مڵكانەو دوایی زەوییەكەی بۆ ڕەت بكاتەوە، خۆ ئەگەر هیچ كامێ لەم دوو سەرپشكییەی نەكرد، با زەوییەكەی بخەوێنێو نەیدا بەكرێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٨، ژمارە: ١٩١٠}.

### ٧٦٣) بەكرێدانی زەوی. (٣٨٩٣ - ٣٩٣٨)
### باب: كِراءُ الأَرْضِ

٩٧٣- عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: كُنَّا نُحَاقِلُ الأَرْضَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَنُكْرِيهَا بِالثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالطَّعَامِ الْمُسَمَّى، فَجَاءَنَا ذَاتَ يَوْمٍ رَجُلٌ مِنْ عُمُومَتِي فَقَالَ: نَهَانَا رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَنْ أَمْرٍ كَانَ لَنَا نَافِعًا، وَطَوَاعِيَةُ اللَّهِ وَرَسُولِهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْفَعُ لَنَا، نَهَانَا أَنْ نُحَاقِلَ بِالأَرْضِ فَنُكْرِيَهَا عَلَى الثُّلُثِ وَالرُّبُعِ وَالطَّعَامِ الْمُسَمَّى، وَأَمَرَ رَبَّ الأَرْضِ أَنْ يَزْرَعَهَا أَوْ يُزْرِعَهَا، وَكَرِهَ كِرَاءَهَا وَمَا سِوَى ذَلِكَ. {الحديث: ٣٩٢٢ = ٣٩١٩ فم}:

ڕافیعی كوڕی خەدیج (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەسەرینی پێغەمبەر خۆی (دروودی خودای لەسەر بێ) زەویمان دەدا بەكرێ، لەسەر شێوەیێ لەم شێوانە: دەماندا بەكرێ بە

سێیەکی دەسکەوتی بەروبوومەکەی یا بەچواریەکی، یابەکەمتر، یابەزیاتر، وەك ئەوە دەمانگوت: ئەگەر سیی ربەی تیابوو دەی بۆ منو بیستی بۆتۆ، یادەماندا بەبڕێ خۆراکی ناوبراو، بەوێنە دەمانگوت: ئەم پارچە زەوییە داچێنە بۆخۆت، بەدەر بەگەنم، یا بەبیست تەنەکە چەڵتووك، هەتا ڕۆژێ پیاوێ لەمامەکانی خۆم هات بۆلامان گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێ کردین لەکارێ سوودی هەبوو بۆمان، بەهەرحاڵ بەجێهێنانی فەرمانی خوداو فەرمانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سوودو قازانجی زیاترە بۆمان، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) نەیی کردووە لەوە: کە پارچە زەوی بدەین بەکرێ، بەسێیەكو بەچواریەكو بەکەمترو بەزیاتر، یا بەئەندازەیێ خۆراکی ناوبراو، وەك سەدکیلۆ، یا پەنجا ربە گەنم، یاجۆ، یانیسك. مامەکەم گوتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانی بەخاوەن زەوی کردووە: کە یاخۆی داچێنێو بەرهەمی بهێنێ، یابیدات بە کەسێکی تر کە بۆخۆی داچێنێو لەپاش کۆکردنەوەی بەروبوومەکەی زەوییەکە هی خۆیەتی وەك جاری جاران. مامەکەم فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) حەزی لەوە نەبوو، کەزەوی بدرێ بەکرێ، یاشتێ وای لێ بکرێ، وەکوو بەکرێدان وابێ.

### ٧٦٤) بەکرێدانی زەوی بەزێڕو زیو. (٣٨٩٣ - ٣٩٣٨)

### بابُ: كِرَاءُ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ

٩٧٤- عَنْ حَنْظَلَةُ بْنُ قَيْسٍ الأَنْصَارِيُّ قَالَ: سَأَلْتُ رَافِعَ بْنَ خَدِيجٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ كِرَاءِ الأَرْضِ بِالذَّهَبِ وَالْوَرِقِ فَقَالَ: لاَ بَأْسَ بِهِ، إِنَّمَا كَانَ النَّاسُ يُؤَاجِرُونَ عَلَى عَهْدِ رسول الله (صلى الله عليه وسلم) عَلَى الْمَاذِيَانَاتِ وَأَقْبَالِ الْجَدَاوِلِ، وَأَشْيَاءَ مِنَ الزَّرْعِ، فَيَهْلِكُ هَذَا وَيَسْلَمُ هَذَا، وَيَسْلَمُ هَذَا وَيَهْلِكُ هَذَا، فَلَمْ يَكُنْ لِلنَّاسِ كِرَاءٌ إِلاَّ هَذَا، فَلِذَلِكَ زُجِرَ عَنْهُ، فَأَمَّا شَيْءٌ مَعْلُومٌ مَضْمُونٌ فَلاَ بَأْسَ بِهِ. {الحديث: ٣٩٢٩ = ٣٩٢٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٢٤ = ٢٣٢٧، ٢٣٣٢، ٢٧٢٢، أبو داود. بيوع: ٣٣٩٢، ٣٣٩٣. نسائي. أيمان ونذور: ٣٩٠٨. تحفة الأشراف: ٣٥٥٣}:

حەنظەلەی کوڕی قەیسی ئەنصاری (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لەڕافیعی کوڕی خەدیجم پرسی، لەبارەی بەکرێدانی زەوی بەپارەو بەزێڕو زیو، فەرمووی: (دروستەو هیچ قەیدی نییە، ئەوەندە هەیە لەسەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خودای لەسەر بێ) زەوییەکیان دەدا بەکرێ، لەسەرئەوەی کە لەسەر لێوارو ئەمبەرو ئەوبەری ماکاوەکان دەڕوێ، یالەسەر سەرقەدو دەمی دیراوەکان دەڕوێ، یالەسەر شکارتەیێ، ڕێ دەکەوتن لەسەر ئەوە کەئەوانەی گوتران بۆ خاوەن زەوییەکە بن‌و ئەویتری بۆ وەرزێرەکە بێ، جازۆر جاری وا ڕێ دەکەوت، هی ئاغاکە باشی دەهێناو هی وەرزێرەکە خراپ، یا بەپێچەوانەوە، وە ئەمە تەنیا شێوەی بەکرێدانی زەوییان بوو، وەگەلێ جار ئەم بارودۆخە سەری دەکێشا بۆ کێشەوبەرە، لەبەرئەوە سەرزەنشت دەکران لەسەر ئەوجۆرە مامەڵەیە، چونکە زۆرجار سەری دەکێشا بۆ زیان‌و تێشکان (غور)ی لایەکیان، بەڵام زەویدان بەکرێ لەسەر کرێیەکی دیاریکراوی دابینکراو هیچ قەیدی نییە).

## ٧٦٥) بەکرێدانی زەوی بەکرێیەکی ناوبراو
## باب: المؤاجَرَةُ

٩٧٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ السَّائِبِ قَالَ: دَخَلْنَا عَلَى عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَعْقِلٍ فَسَأَلْنَاهُ عَنِ الْمُزَارَعَةِ؟ فَقَالَ: زَعَمَ ثَابِتٌ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنِ الْمُزَارَعَةِ، وَأَمَرَ بِالْمُؤَاجَرَةِ، وَقَالَ: « لاَ بَأْسَ بِهَا ». {الحديث: ٣٩٣٣ = ٣٩٣٠ فم}:

عەبدوڵڵای کوڕی سائیب فەرمووی: چووین بۆ خزمەتی عەبدوڵڵای کوڕی مەعقیل (ڕەزای خودای لێ بێ) لەبارەی بەکرێدانی زەوی‌و زارەوە بەملکانە پرسیارمان لێ کرد؟ فەرمووی: ثابیت (ڕەزای خودای لێ بێ) بەقسەی خۆی دەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی دەکرد لەدانی زەوی بەملکانە، بەڵام فەرمانی دەکرد کە بەپارەو شتی وابدرێ بەکرێ، وە فەرمووی: (قەیناکا).

## ٧٦٦) بەخشینی زەوی بەوەرزێر بۆخۆی دایچێنێ

## بابٌ: في مَنْحِ الأرْضِ

٩٧٦- عَنْ طَاوُسٍ أَنَّهُ كَانَ يُخَابِرُ: قَالَ عَمْرٌو: فَقُلْتُ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ الرَّحْمَنِ لَوْ تَرَكْتَ هَذِهِ الْمُخَابَرَةَ، فَإِنَّهُمْ يَزْعُمُونَ أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) نَهَى عَنِ الْمُخَابَرَةِ، فَقَالَ أَيْ عَمْرُو!: أَخْبَرَنِي أَعْلَمُهُمْ بِذَلِكَ، يَعْنِي ابْنَ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما)، أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَمْ يَنْهَ عَنْهَا، إِنَّمَا قَالَ: « يَمْنَحُ أَحَدُكُمْ أَخَاهُ خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَأْخُذَ عَلَيْهَا خَرْجًا مَعْلُومًا ». {الحديث: ٣٩٣٤ = ٣٩٣١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٢٧ = ٢٣٣٠، ٢٣٤٢، ٢٦٣٤. أبو داود. بيوع: ٣٣٨٩. ترمذي. أحكام: ١٣٨٥. نسائي. أيمان ونذور: ٣٨٨٢. ابن ماجة. رهون: ٢٦٥٦، ٢٤٦٤. تحفة الأشراف: ٥٧٣٥}:

عەمری کوڕی دینار (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: عەرزی تاووسم کرد (رەحمەتی خودای لێ بێ): خۆزگا وازت لەبەکرێدانی زەوی بەملکانە دەهێنا، چونکە ئەوانە بەقسەی خۆیان دەڵێن: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لەشتی واکردووە؟ تاووس (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئەی عەمر! زاناترینیان کە ئیبنو عەبباسە (رەزای خودایان لێ بێ) هەواڵی پێمداوە: کە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەیی لێ نەکردووە، بەلام فەرموویەتی: (ئەگەر زەوی‌و زارتان بەپیاوەتی بدەن بەبرای ئایینی خۆتان کە بۆخۆی دایبچێنێ، لەوە باشترە کە بەملکانە پێی بدەن، یا بەکرێیەکی دیاریکراو پێی بدەن!). {تاج/٢، زنجیره: ١٦٨، ژماره: ١٩٠٧}.

## ٧٦٧) باخەوانی‌و ئاودێریی بەبەشێکی دیاریکراو لە بەروبوومی زەوییە بەرهەم هێنراوەکە. (٣٩٣٩ - ٣٩٤٤)

## باب: المُسَاقَاةُ وَمُعَامَلَةُ الأَرْضِ بِجُزْءٍ مِنَ الثَّمَرِ وَالزَّرْعِ

٩٧٧- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا) قَالَ: أَعْطَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) خَيْبَرَ بِشَطْرِ مَا يَخْرُجُ مِنْ ثَمَرٍ أَوْ زَرْعٍ، فَكَانَ يُعْطِي أَزْوَاجَهُ كُلَّ سَنَةٍ مِائَةَ وَسْقٍ، ثَمَانِينَ وَسْقًا مِنْ تَمْرٍ، وَعِشْرِينَ وَسْقًا مِنْ شَعِيرٍ، قال: فَلَمَّا وَلِيَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَسَمَ خَيْبَرَ، خَيَّرَ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) أَنْ يُقْطِعَ لَهُنَّ الأَرْضَ وَالْمَاءَ. أَوْ يَضْمَنَ

لَهُنَّ الأَوْسَاقَ كُلَّ عَـامٍ، فَـاخْتَلَفْنَ، فَمِـنْهُنَّ مَـنِ اخْتَـارَ الأَرْضَ وَالْمَـاءَ، وَمِـنْهُنَّ مَـنِ اخْتَـارَ الأَوْسَاقَ كُلَّ عَامٍ، فَكَانَتْ عَائِشَةُ وَحَفْصَةُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) مِمَّنِ اخْتَارَتَا الأَرْضَ وَالْمَـاءَ. {الحديث: ٣٩٤٠ = ٣٩٣٧ فم}:

**ئیبنو عومەر** (رەزای خودایان لیٚ بیٚ) **فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **کاتی وڵاتی** خەیبەری ئازادکرد، دایەوە بەخەڵکی خەیبەر، کە بەنیوەیی بەرهەمی بهیٚنن، چ میوەو بەروبوومو چ دانەویٚڵەو شینایی بەنیوەیی، نیوەی بۆ دەوڵەتی ئیسلامو نیوەی بۆ وەرزیرو ئاودیٚرەکان بۆخۆیان. جا پیٚغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیٚ) هەموو ساڵیٚ لەدەرامەتی خەیبەر، سەد وەسقی دەدا بە هاوسەرەکانی، هەشتای خورماو بیستی جۆ.

جاکاتیٚ پیٚشەوا عومەر بوو بەجیٚنشینو خەیبەری دابەشکرد، هاوسەرەکانی پیٚغەمبەری کرد بەسەرپشك: کەیا بەشە زەویو ئاو هەڵبگرن، یالەسەر ساڵانەی خۆیان بەردەوام بنو ساڵ بەساڵ چەند تەغاریان بۆ دانراوە وەری بگرن. ئیتر ئەوەبوو هەندیٚکیان زەویو ئاویان هەڵگرتو هیٚندیٚکیان ساڵانەیان هەڵبژارد. عائیشەو حەفصە لەو هاوسەرانە بوون کە زەویو ئاویان هەڵگرتبوو. {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٠، ژمارە: ١٩١٥ — ش/د/ت}.

## ٧٦٨) هەرکەسیٚ نەمامیٚ بنیٚژیٚ. (٣٩٤٥ - ٣٩٥١)

## بابٌ: فِيمَنْ غَرَسَ غَرْساً

٩٧٨- عَنْ جَابِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا، إِلاَّ كَانَ مَا أُكِلَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا سُرِقَ مِنْهُ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ مِنْهُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةٌ، وَمَا أَكَلَتِ الطَّيْرُ فَهُوَ لَهُ صَدَقَةً، وَلاَ يَرْزَؤُهُ أَحَدٌ إِلاَّ كَانَ لَهُ صَدَقَةٌ ». {الحديث: ٣٩٤٥ = ٣٩٤١ فم. رياض/ زنجيره: ١٣، ژماره: ١٩/١٣٥. تجريد/٣، رقم: ١٠١٩ = ٢٣٢٠، ٦٠١٢}:

**جابیر** (رەزای خودای لیٚ بیٚ) **فەرمووی: پیٚغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بیٚ) **دەفەرمویٚ:** (هەر موسوڵمانیٚ، شتیٚ بڕویٚنیٚ، یا نەمامیٚ بنیٚژیٚ، ئەوەی لیٚی بخوا، ئەوەی لیٚی بدزیٚ،

ئەوەی دڕندەو دەعبا بیخوا، ئەوەی مەڵو مۆر بیخوا، ئەوەی سوودی لێ ببینێ، ئیتر هەر سوودێك بێ، ئەمانە هەموویان بۆی دەبن بەخێرو خێرات). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٧، ژمارە: ١٩٠٥}.

### ٧٦٩) فرۆشتنی زیادە ئاو. (٣٩٨٠ - ٣٩٨٤)

### باب: بَيْعُ فَضْلِ الْمَاءِ

٩٧٩- عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) عَنْ بَيْعِ فَضْلِ الْمَاءِ. {الحديث: ٣٩٨٠ = ٣٩٧٦ فم}:

جابیری کوڕەی عەبدوڵلا (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جڵەوگیریی کردووە لەفرۆشتنی ئاوی زیاد لەپێداویستی مرۆڤ خۆی، بەتایبەتی لە چۆڵ.

### ٧٧٠) نابێ زیادە ئاوو زیادە لەوەڕ قەدەغە بکرێن. (٣٩٨٠ - ٣٩٨٤)

### بَابُ: مَنْعُ فَضْلِ الْمَاءِ وَالْكَلإِ

٩٨٠- عَنِ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « لاَ تَمْنَعُوا فَضْلَ الْمَاءِ لِتَمْنَعُوا بِهِ الْكَلأَ ». {الحديث: ٣٩٨٣ = ٣٩٧٩ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درموودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێ: (ئاوی زیادە قەدەغە مەکەن، هەتا زیادە لەوەڕی پێ قەدەغە بکەن). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٤، ژمارە: ١٩٢٨ — ش/د/ت/ن = بخاری. مساقاة: ٢٥٥٣، ٢٤٥٤، ٦٩٦٣. ترمذی. بیوع: ١٢٧٢}.

**ڕوونکردنەوە:**

١ـ ئەوەی (پڕ گۆڕی پیرۆزی لەنووری خودابێ) دەفەرموێ: وەك ئەوە کەسێ بیرێکی هەبێ، وە ئاوی بیرەکە لەخۆی زیادبێ، وە لەنزیکی ئەو بیرە لەوەڕ هەبێ، جا ئەگەر خاوەن بیرەکە، یاخاوەن کارێزەکە، بیرەکەی، یا ئاوەکەی

قەدەغە بکا، لە ماڵاتو ئاژەڵ، لەبەر بێ ئاوی کەس ئاژەڵ نەلەوەڕێنێ، لەو لەوەڕگایە!

٢ - کورتو پوخت: خاوەن بیرو کارێزو چەم، ئەگەر ئاوەکەی لەخۆی زیادبوو، نابێ قەدەغەی بکا، لە ئاتاج، تەنانەت نابێ قەدەغەی بکا لە ئاژەڵو ماڵاتو گیانلەبەرانیش.

٣ خاوەن کارێزو بیرو چەمو جۆگە، دەتوانێ ئەو ئاوە بفرۆشێ، بۆ ئاودێریو ئاودانی کشتوکاڵو باخو رەز.

٤ ئێستا ئاو بەزۆر شێوە دەفرۆشرێ، وەك بە بوتڵ، یا بەکارتۆن، یا بەتەنکەر، وەزۆر دەسگا سەرگەرمی ئەم کارەن، هەیە تەقطیری دەکا، هەیە تەعقیمی دەکا، فرۆشتنی ئەم جۆرە ئاوانە بەهیچ شێوەیێ بەرواتاو چەمکی ئەم فەرموودانە ناکەوێ. بگرە ئەم جۆرە کارە پیرۆزانە ئەرکێکی پیرۆزی دینیو ژینیو سەردەمین، بەلام ئەوەندە هەیە: (مۆڵەتی دەستەلاتی ولاتو رێپێدانی تایبەتی بۆ ئەم جۆرە کارانە مەرجەو بەس).

لێرەدا، بۆ پشتگیریی ئەم بڕگەی چوارە، ئەم دەقە لەشەرحی (فتح الملهم)ەوە راگوێز دەکەم، دەفەرموێ: ئیمام ئەبو یوسف دەفەرموێ:

{وَإِنْ هَيَّأَ لَهُ مصنعة فَاسْتَقى فِيهَا بِأَوْعِيَتِهِ حَتَّى جَمعَ فِيهَا مَاءً كَثيراً، ثُمَّ بَاعَ مِنْ ذلِكَ فَلاَ بَأْسَ}.

واتە: ئەگەر کەسێ کارگەیێ دابنێو ئاوی زۆری تیا ئامادە بکاو بیکاتە دەفرو شتی واوەو دوایی لێی بفرۆشێ قەیدی نییە). {بڕوانە شەرحی فەرموودەی ژمارە (٣٩٧٩) لە فتح الملهم دا}.

بسم الله الرحمن الرحيم

# ٢٠- نامەی راسپێریو خێرکردنو خەڵاتو ژینە بەخش

## كِتَابُ الوِصَيَا وَالصَّدَقَةِ وَالنُّحْلِ وَالعُمْرَى

{تاج/٢، زنجيره: ١١ لەژمارە: ١٩٩٧ هەتا ٢٠٠٥}

### ٧٧١) هاندان لەسەر راسپێریکردن بۆ کەسێ شتێکی وای هەبێ کە راسپێری تیادا بکرێ. (٤١٨٠ - ٤١٩٤)

### باب: الحَثُّ الْوَصِيَّة لِمَنْ لَهُ مَا يُوصِي فِيه

٩٨١- عَنْ سَالِمٍ عَنْ ابن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّـهُ سَـمِعَ رَسُـولَ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) قَالَ: « مَا حَقُّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ لَهُ شَيْءٌ يُوصِى فِيهِ يَبِيتُ ثَلاَثَ لَيَالٍ إِلاَّ وَوَصِيَّتُهُ عِنْدَهُ مَكْتُوبَةٌ ». قَالَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَـرَ: مَـا مَـرَّتْ عَلَـيَّ لَيْلَـةٌ مُنْـذُ سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم) قَـالَ ذَلِـكَ إِلاَّ وَعِنْـدِي وَصِـيَّتِي. {الحديث: ٤١٨٣ = ٤١٧٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٣٦ = ٢٧٣٨. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٢. ترمذى. جنائز: ٩٧٤}:

سالم (رەحمەتی خودای لێ بێ) دەفەرموێ: ئیبنو عومەر (رەزای خودایان لێ بێ) دەفەرموێ: بیستم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) دەیفـەرموو: (هـەر موسـوڵمانێ شـتێکی هـەبێ، کەبیەوێ راسپێریی (وەسێتی) تیابکا، هەق وایە سێ شەوی بەسـەردا تـێ نەپـەڕێ، هەتا وەسێتنامەکەی بەنووسراوەیی، لەلای خۆی دادەنێ!)).

ئیبنـو عومـەر دەیفـەرموو: ئـەوەتێ ئەمـەم لـە پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) بیستووە، شەو نەبووە کە راسپێری نامەکەمم لەلا نـەبووبێ. {تـاج/٢، زنجیره: ١١، ژمارە: ١٩٩٧ ج/٤ = چاپی چوارەم — ش/د/ت/ن}.

### ٧٧٢) راسپێریی شەرعی نابێ لەسێیەك تێپەڕێ. (٤١٨٠ - ٤١٩٤)

### بابٌ: الوَصِيَّةُ بِالثُّلُث لا يُجَاوزُ

٩٨٢- عَنْ سَعْدٍ بن أبي وقاص (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: عَادَنِى رَسُولُ اللَّـهِ (صـلى الله عليه وسلم) فِى حَجَّةِ الْوَدَاعِ مِنْ وَجَعٍ أَشْفَيْتُ مِنْـهُ عَلَـى الْمَـوْتِ، فَقُلْـتُ: يَـا رَسُـولَ اللَّـهِ بَلَغَنِى مِنَ الْوَجَعِ مَا تَرَى وَأَنَا ذُو مَـالٍ وَلاَ يَرِثُنِـى إِلاَّ ابْنَـةٌ لِـى وَاحِـدَةٌ، أَفَأَتَصَـدَّقُ بِثُلُثَـىْ

مَالِي؟ قَالَ: لاَ، قُلْتُ: أَفَأَتَصَدَّقُ بِشَطْرِهِ؟ قَالَ: « لاَ، الثُّلُثُ وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ، إِنَّكَ أَنْ تَذَرَ وَرَثَتَكَ أَغْنِيَاءَ خَيْرٌ مِنْ أَنْ تَذَرَهُمْ عَالَةً يَتَكَفَّفُونَ النَّاسَ، وَلَسْتَ تُنْفِقُ نَفَقَةً تَبْتَغِي بِهَا وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ أُجِرْتَ بِهَا، حَتَّى اللُّقْمَةُ تَجْعَلُهَا فِي فِي امْرَأَتِكَ ». قَالَ: قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أُخَلَّفُ بَعْدَ أَصْحَابِي؟ قَالَ: « إِنَّكَ لَنْ تُخَلَّفَ فَتَعْمَلَ عَمَلاً تَبْتَغِي بِهِ وَجْهَ اللَّهِ إِلاَّ ازْدَدْتَ بِهِ دَرَجَةً وَرِفْعَةً، وَلَعَلَّكَ تُخَلَّفُ حَتَّى يُنْفَعَ بِكَ أَقْوَامٌ وَيُضَرَّ بِكَ آخَرُونَ، اللَّهُمَّ أَمْضِ لأَصْحَابِي هِجْرَتَهُمْ، وَلاَ تَرُدَّهُمْ عَلَى أَعْقَابِهِمْ، لَكِنِ الْبَائِسُ سَعْدُ ابْنُ خَوْلَةَ »، قَالَ: رَثَى لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) مِنْ أَنْ تُوُفِّيَ بِمَكَّةَ. {الحديث: ٤١٨٥ = ٤١٧٨ فم. تجريد/٢، رقم: ٦٢٣ = ١٢٩٥ فتح الباري. أبو داود. وصايا: ٢٨٦٤. ترمذي. وصايا: ٢١١٦. نسائي. وصايا: ٣٦٢٨. تحفة الأشراف: ٣٨٩٠}:

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ساڵی حەجی ماڵاوایی، کەناسراوە بەساڵی حەججەتول وەداع، لە مەککە نەخۆشکەوتم، کەشەنگ بووم خەریکبووم بمرم، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هات بۆلام، بۆ سەردانو هەواڵپرسیم، عەرزیمکرد: ئەی پێغەمبەری خودا! خۆ دەمبینی کە نەخۆشی چی لێ کردووم، ماڵێکی زۆریشم هەیە، تاقە کچێکیشم هەیە کە کەلەپوورو میراتم لێ بگرێ، جادەمەوێ کەدوو بەش لەسێ بەشی ماڵەکەم بکەم بەخێرو وەسێتو راسپێری، لەپاش مردنم بۆم بکرێ بەخێر، جاتۆ فەرمانت بەچییە، شتی وا دروستە یانا؟

فەرمووی: (نەء، دروست نییە). گوتم: دەنیوەی دەکەم بەخێر، دەبێ یانا؟

فەرمووی: (نەء، ئەویش نابێ).

گوتم: دەسێیەکێکی دەکەم بەخێر؟ فەرمووی: (سێیەك دەبێ، بەلام سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتربێ باشترە، چونکە تۆ لەپاش مردنی خۆت، میراتبەرەکانت بەدەوڵەمەندیو تێرو تەسەلی بەجێ بهێڵیت، گەلێ لەوە باشترە کە بەهەژاری بەجێیان بهێڵیت لەپ لەمو لەو پان بکەنەوەو چاویان لەدەستی خەڵك بێ!

ئەوەیش بزانە هەرچی خەرج بکەی لەبەر ڕەزای خودای گەورە ئەوا پاداشی باشی لەسەر وەردەگریت، تەنانەت ئەو پاروە نانەیش کەدەیدەیت بەژنی خۆت، یا

ئەو مەسرەفەی کەدەیکەی بۆ خێزانی خۆت، کە ژێواریان لەسەر تۆیە، ئەم جۆرە مەسرەفەیش، بەمەرجێ بەنیازێکی پاك بێ، ئەویش هەر خێرێکی گەورەیە).

فەرمووی: عەرزیمکرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! دەترسم لەهاوڕێکانم بەجێ بمێنمو لەم نەخۆشییەدا لە مەککە بمرمو لەگەڵ ئێوەدا نەگەڕێمەوە بۆ رەوگەی کۆچو داری هیجرەتم، وە ئەوەیش بۆ کۆچەکەم زیانی هەبێ؟ فەرمووی: (بابەجێش بمێنی، گرنگ ئەوەیە تۆ بەنیازی پاك، هەرکارێ بکەی، لەهەرکوێ بێ، بەمەرجێ مەبەستت رەزای خودابێ پێی، ئەوە پلەو پایەت لای خودا پێی بەرزتر دەبێتەوە. ئومێدیش دەکەم کەجارێ نەمریو بمێنیو تەمەنت درێژبێو لەپاش ئێمە بمێنیو خوا بتکا بەمایەی خێرو خۆشی بۆ گەلی موسوڵمانانو ببی بەهۆی زیانو شکستی بۆ هۆزی بێباوەڕان ئەی خودایە! کۆچی هاوەڵانم تاسەربێو قەبووڵو گیرابێ، وەپاشگەزیان نەکەیتەوە لێی).

بەڵام داخەکەم هەژارە: سەعدی کوڕی خەولە، لەمەککە مرد، لەدارول هیجرەتەکەی نەمرد کە مەدینە بوو، بۆیە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەزەیی پیادا هاتەوەو دڵی پێی سووتا. {تاج/٢، زنجیرە: ١٢، ژمارە: ٢٠٠٠}.

سەعدی کوڕی ئەبو وەققاص لەپاش ئەم نزاو تکایەی پێغەمبەر بۆی، چاك بۆوەو خودا پیتو فەڕی خستە تەمەنی چل ساڵی ترژیا.

٩٨٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: لَوْ أَنَّ النَّاسَ غَضُّوا مِنَ الثُّلُثِ إِلَى الرُّبعِ، فَإِنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « الثُّلُثُ، وَالثُّلُثُ كَثِيرٌ ». {الحديث: ٤١٩٤ = ٤١٨٧ فم. بخاري. وصايا: ٢٧٤٣. نسائى. وصايا: ٣٦٣٦. ابن ماجة. وصايا: ٢٧١١. تحفة الأشراف: ٥٨٧٦}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆزگە ئەو خەڵکە لەکاتی وەسێتکردندا، لەباتی سێیەکی ماڵ کە دەیکەن بەخێر، بۆ پاش مەرگیان، چواریەکیان دەکرد بەئاخر ئەندازەی دروست بۆ راسپێری، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەم بارەیەوە دەفەرموێ: (سێیەکی ماڵ بۆ راسپێری (وەسێت) دەبێ، بەڵام سێیەکیش هەر زۆرە، کەمتربێ باشترە).

## ٧٧٣) راسپێریی پێغەمبەر بۆ نەتەوەی ئیسلام ئەوەبووە كە پابەندبن بەنامەی خوداوە. (٤٢٠٣ - ٤٢١٠)

## بابُ: وَصِيَّةُ النَّبِيّ (صلى الله عليه وسلم) بِكِتَابِ اللّه

٩٨٤- عَنْ طَلْحَةَ بْنِ مُصَرِّفٍ قَالَ: سَأَلْتُ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ أَبِي أَوْفَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): هَلْ أَوْصَى رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)؟ فَقَالَ: لاَ، قُلْتُ: فَلِمَ كُتِبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْوَصِيَّةُ أَوْ فَلِمَ أُمِرُوا بِالْوَصِيَّةِ؟ قَالَ: أَوْصَى بِكِتَابِ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ. {الحديث: ٤٢٠٣ = ٤١٩٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٣٨ = ٢٧٤٠، ٤٤٦٠، ٥٠٢٢. ترمذي. وصايا: ٢١١٩. نسائي. وَصَايا: ٣٦٢٢. ابن ماجة. وصايا: ٢٦٩٦. تحفة الأشراف: ٥١٧٠}:

طەلحەی كوڕی موصەرریف (ڕەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: لە عەبدوڵڵای كوڕی ئەبو ئەوفام پرسی: ئایا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ڕاسپێریو وەسێتی كرد بۆ پاش مەرگی؟ فەرمووی: (نەء) عەرزیمكرد: ئەی باشە ئەی چۆن وەسێتو ڕاسپێریی لەسەر موسوڵمانان داناوە؟ فەرمووی: وەسێتو ڕاسپێریی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ ئۆمەتی ئەوەبوو كە كارو ڕەفتار بە قورئان بكەن كەنامەی نووسراوی خودایە).

بۆ تێگەیشتنی تەواو لەچۆنێتیی ئەم ڕاسپێرییەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕوانە: تاج/١، زنجیرە: ٩، ژمارە: ٧٠، ٧١، ٧٣، ٧٤ + تاج/٣، زنجیرە: ٧٤، ژمارە: ٣٥٨١ + تاج/٤، زنجیرە: ٧٦ + تاج/٣، زنجیرە: ١٦، ژمارە: ٣٣٤٣}:

٩٨٥- عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُا) قَالَتْ: مَا تَرَكَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) دِينَارًا وَلاَ دِرْهَمًا، وَلاَ شَاةً وَلاَ بَعِيرًا وَلاَ أَوْصَى بِشَيْءٍ. {الحديث: ٤٢٠٥ = ٤١٩٨ فم}:

عائیشە (ڕەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) وەفاتی كرد: هیچی لەپاش بەجێ نەما: نەزێڕ، نەزیو، نەدینار، نەدرەم، نەڕانە مەڕو بزن، نەڕانە وشتر، نەڕایسپارد كەكێ لەپاش خۆی ببێ بەجێنشینی، وە نەڕایسپارد كە ئەوەندە لەسامانەكەی خێرو ڕاسپێری بێ!).

**روونكردنەوە:**

١- **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) كە وەفاتی كرد چەند راسپێریو ئامۆژگارییەكی كردووە، وەك باشبوون بۆ ئەنصارو بۆ كەسوكاری خۆیو وەفد بەڕێكردن وەك خۆی كە لەژیانا بووەو پاك كردنەوەی دوورگەی عەرەب لە غەیری موسوڵمانانو پابەندبوون بەنامەی خوداوەو راسپێری باش سەبارەت بەژنانو ئاگاداری نوێژەكانو گۆڕەكەی نەكەن بەبتو باش بوون لەگەڵ بەندەو كۆیلەدا.

٢- **پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) ئەم شتانەی لەپاش بەجێماوە: دوو ثەوبی حیبەرەو ئیزارێكی عمانیو دوو جلی صەحارینو كراسێكی صەحاریو كراسێكی سەحوولیو جبەیەكی یەمەنیو كراسێكو... چەند شتێكی سادەی تری لەم بابەتە).

٩٨٦- عَنِ الأَسْوَدِ بْنِ يَزِيدَ قَالَ: ذَكَرُوا عِنْدَ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا) أَنَّ عَلِيًّا (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) كَانَ وَصِيًّا، فَقَالَتْ مَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ؟! فَقَدْ كُنْتُ مُسْنِدَتَهُ إِلَى صَدْرِي (أَوْ قَالَتْ حَجْرِي)، فَدَعَا بِالطَّسْتِ، فَلَقَدِ انْخَنَثَ فِي حَجْرِي، وَمَا شَعَرْتُ أَنَّهُ مَاتَ، فَمَتَى أَوْصَى إِلَيْهِ)؟ {الحديث: ٤٢٠٧ = ٤٢٠٠ فم. بخاري. شروط: ٢٧٤١، ٤٤٥٩. نسائي. وصايا: ٣٦٢٤. تحفة الأشراف: ١٥٥١٧}:

ئەسودی كوڕی یەزید فەرمووی: لەلای حەزرەتی عائیشە (رەزای خودای لێ بێ) باسی ئەوەیان بۆیكرد: كە عەلی كوڕی ئەبو تالیب (رەزای خودای لێ بێ) راسپێرراوی پێغەمبەر بێ بۆ جێنشینی لەپاش مەرگی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ)؟ عائیشە فەرمووی: ئەمە كەی ئەم راسپێرییەی كردووە بۆی؟! ئەی بۆ من ئاگام لێی نییە؟ لەكاتی سەرەمەرگا، پێغەمبەر لەباوەشی منابوو، سەریم نابوو بەسینگمەوە، لەوكاتە ناسكەدا داوای تەشتێكی كرد، تاتفی تێبكا، هەرئەوەندەم زانی كە لەشی شل بوو، خاوبۆوە لەباوەشما، نەمزانی چۆن گیانی دەرچوو، كەواتە ئیتر ئەم راسپێرییەی كەی كردووە بۆی؟!

## ٧٧٤) راسپێریی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کە فرەخواکان لە دوورگەی عەرەب دەرکەن‌و بەجوانی نوێنەر (وەفد=شاند) بەرێکەن(٤٢٠٣ - ٤٢١٠)

## بَابٌ: وَصِيَّةُ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) بِإِخْرَاجِ الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ وَبِإِجَازَةِ الْوَفْدِ

٩٨٧- عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ قَالَ: قَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا): يَوْمُ الْخَمِيسِ وَمَا يَوْمُ الْخَمِيسِ؟ ثُمَّ بَكَى حَتَّى بَلَّ دَمْعُهُ الْحَصَى، فَقُلْتُ: يَا ابْنَ عَبَّاسٍ! وَمَا يَوْمُ الْخَمِيسِ؟ قَالَ: اشْتَدَّ بِرَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَجَعُهُ فَقَالَ: « ائْتُونِى أَكْتُبْ لَكُمْ كِتَابًا لاَ تَضِلُّوا بَعْدِى فَتَنَازَعُوا، وَمَا يَنْبَغِى عِنْدَ نَبِيٍّ تَنَازُعٌ »، وَقَالُوا: مَا شَأْنُهُ أَهَجَرَ؟ اسْتَفْهِمُوهُ، قَالَ: « دَعُونِى فَالَّذِى أَنَا فِيهِ خَيْرٌ، أُوصِيكُمْ بِثَلاَثٍ: أَخْرِجُوا الْمُشْرِكِينَ مِنْ جَزِيرَةِ الْعَرَبِ، وَأَجِيزُوا الْوَفْدَ بِنَحْوِ مَا كُنْتُ أُجِيزُهُمْ »، قَالَ: وَسَكَتَ عَنِ الثَّالِثَةِ أَوْ قَالَهَا فَأُنْسِيتُهَا. {الحديث: ٤٢٠٨ = ٤٢٠١ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٤٥ = ٣٠٥٣، ١١٤ فتح الباري. أبو داود. خراج: ٣٠٢٩}:

سەعیدی کوڕی جوبەیر (رەحمەتی خودای لێ بێ) فەرمووی: ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: ئای لەو رۆژی پێنج شەممەیە چۆن رۆژی پێنج شەممەیە بوو؟ ئەوجا ئیبنو عەبباس زۆر گریا، هەتا بەفرمێسك زیخ‌و چەوی بەرپێی خۆی تەڕکرد!

جا عەرزیمکرد: قوربان! ئەی ئیبنو عەبباس! کام رۆژی پێنج شەممەیەت مەبەستە، کەوا بەیادی واپەرێشانی؟ فەرمووی: لەرۆژی پێنج شەممەدا، نەخۆشییەکەی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تەواو کەشەنگ بوو، فەرمووی: (نامەیەکم بۆ بهێنن، هەتا نامەیەکتان بۆ بنووسم، ئیتر لەپاش ئەو وەسێتنامەیە، وەلەپاش مەرگی من، هەتا هەتایە رێگەی راست وون ناکەن‌و سەرتان لێ ناشێوێ) بەڵام هاوەڵان لەناو خۆیانا بوو بەهەرایان، خزمەتی پێغەمبەرانیش، بەتایبەتی لەکاتی واناسکا، شوێنی مشتومڕو بگرەو بەردەو شوێنی هەراو هۆریا نییەو نابێ شتی وا رووبدا).

ئەوەبوو هەندێ کەس گوتیان: ئەوە چییە، دەڵێی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەر سەختی نەخۆشینەکەی وڕێنە دەکاو قسە دەبڕسکێنێ؟ ئادەی داوای

ڕوونکردنـەوەی لێ بکـەن کەمەبەسـتی چـییە! حـەزرەت (دروودو سـڵاوی خـودای لەسەربێو سەرو ماڵو منداڵو بـاوكو دایـكو هەسـتو نەسـت هـەمووی بـەقوربانی گەردی سەر گۆڕی پیرۆزی بێ) فـەرمووی: (کـەوای لێ هـات! لـێم گـەڕێن باخـەریکی حاڵی خۆم بمو خۆم ئامادە بکەم بۆ شادبوون بەخزمەتی پەروەردگارم، ئەم حاڵـەی خۆم گەلێ باشترو چاکترە لەمەی کەئێوە لەمنتان دەوێ!). فەرمووی: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فـەرمووی: (ئـەم سـێ ڕاسـپێرییەتان بـۆ دەکـەم: یەکـەم: فـرە خواکـان لەدوورگـەی عـەرەب دەرکـەنو مـەهێڵن دوورگـەی عـەرەب، فـرە خـوا (موشـریك)ی تیادانیشێ. دووەم: وەك خۆم بەجوانی نوێنەر (وەفد) بـەڕێ بکـەنو خـەڵاتیان پـێ بدەن...). ئیبنو عویەینە فەرمووی: سولەیمان فەرمووی: سـەعیدی کوڕی جوبـەیر باسی ڕاسپێری سێیەمیانی نـەکرد، یائـەو نـاوی ڕاسـپێری سێیەمیشی هێنـاو باسـی کرد، بەڵام من لەیادم نەماوە!). {تاج/٤، زنجیرە: ٨١، ژمـارە: ٤٥٦٥ ج/٤ + تـەجریـد/١، رقـم: ٩٣ = ١١٤، ٣٠٥٣، ٣١٦٨، ٤٤٣١، ٣٢٤٤، ٥٦٦٩، ٧٣٦٦ = فـتح البـاری شـرح صـحیح البخاری}.

## ٧٧٥) نەیی کردن لەوە کە مرۆڤ بەخشراوی خۆی هەڵبگرێتەوە، چ بەکڕین، چ بەشێوەیێ تر. (٤١٣٩ - ٤١٤٥)

## باب: النَّهْيُ أنْ يَعُودَ فِي الصَّدَقَة

٩٨٨- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ) قَـالَ: حَمَلْـتُ عَلَـى فَـرَسٍ عَتِيـقٍ فِـى سَبِيلِ اللَّهِ فَأَضَاعَهُ صَاحِبُهُ، فَظَنَنْتُ أَنَّهُ بَائِعُهُ بِرُخْصٍ، فَسَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) عَنْ ذَلِكَ فَقَالَ: « لاَ تَبْتَعْهُ وَلاَ تَعُدْ فِى صَدَقَتِكَ، فَإِنَّ الْعَائِدَ فِـى صَـدَقَتِهِ كَالْكَلْـبِ يقيء ثـم يَعُـودُ فِـى قَيْئِـهِ ». {الحديث: ٤١٣٩ = ٤١٣٣ فـم. تەجريـد/٢، رقـم: ٧١٦ = ١٤٩٠، ٢٦٢٣، ٢٦٣٦، ٢٩٧٠، ٣٠٠٣. نسـائى. زكـاة: ٢٦١٤. ابـن ماجـة. صـدقات: ٢٣٩٠. تحفة الأشراف: ١٠٣٨٥}:

عومـەری کـوڕی خـەتاب (ڕەزای خـودای لێ بـێ) فـەرمووی: ئەسـپێکی نایـابم هـەبوو، لەرێگەی خودادا بەخشیم بەغەزاکارێ، بەڵام خاوەنەکەی قـەدری نـەزانیو زۆر بـێ

خزمەتی کرد، منیش ویستم لێی بکڕمەوە، بەزەینی خۆم گوتم: بەهەرزان دەیفرۆشێ، چونکە تەواو لەڕو لاوازی کردبوو، بۆ ئەمە پرسیارم لە خۆشەویست کرد (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (نە بیکڕەرەوەو نەهیچ خێرو بەخشینێکی خۆت بەپارە هەڵبگرەوە، با ئەو کەسەی کە بەخشیوتە پێی، بەیەك درەمیش بیداتەوە پێت، چونکە ئەوەی کە خێرو بەخشراوی خۆی بکڕێتەوە، یا بیقەبڵێنێ بە پارەو بەو پارەیە هەڵی بگرێتەوە، ئەوە وەك سەگێ وایە ڕشانەوەی خۆی بخواتەوە).
{ریاض/٤، زنجیرە: ٢٨٥، ژمارە: ١٦١٢/١} + {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٨، ژمارە: ١٩٤ ج/٤}.

٩٨٩- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « الْعَائِدُ فِى هِبَتِهِ كَالْكَلْبِ يَقِىءُ ثُمَّ يَعُودُ فِى قَيْئِهِ ». {الحديث: ٤١٥٢ = ٤١٤٦ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٥ = ٢٥٨٩، ٢٦٢١، ٢٦٢٢، ٦٩٧٥. نسائى. هبة: ٣٦٩٣. تحفة الأشراف: ٥٧١٢}:

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (کەسێ دەسەنەو بەخششی خۆی، دووبارە هەڵبگرێتەوە، یان بیسەنێتەوە لەو کەسە کەپێی بەخشیوە، وەك سەگ وایە کە بڕشێتەوەو لەدواییدا سەرلەنوێ ڕشانەوەی خۆی دووبارە بخواتەوە).

## ٧٧٦) کەسێ بەتایبەتی هەندێ لەمناڵەکانی خەڵات بکا. (٤١٥٣ - ٤١٦٣)
## باب: مَنْ نَحَلَ بَعْضَ وَلَدِهِ دُونَ سَائِرِ بَنِيهِ

٩٩٠- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِى بِبَعْضِ مَالِهِ فَقَالَتْ أُمِّى عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ: لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ)، فَانْطَلَقَ أَبِى إِلَى النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِيُشْهِدَهُ عَلَى صَدَقَتِى، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ »؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: « اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِى أَوْلاَدِكُمْ ». فَرَجَعَ أَبِى فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ. {الحديث: ٤١٥٧ = ٤١٥١ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٠٤ = ٢٥٨٧ فتح البارى}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم بڕێ لەماڵەکەی خۆی بەخشی بەمن، عەمرەی کچی ڕەواحەی دایکم، گوتی بەباوکم: من بەمە رازی نابم، هەتا پێغەمبەر نەکەی بەشایەت لەسەر ئەم خەڵاتە، جا باوکم بردمی بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هەتا بیکا بەشایەت لەسەر ئەم بەخششە، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پێی فەرموو: (ئایا هەموو منداڵەکانی ترت بەقەد ئەمت پێ بەخشیوە؟) فەرمووی: (نەء) حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (لەخودا بترسن و بێ فەرمانی مەکەن و بەیەك چاو تەماشای هەموو منداڵەکانتان بکەن و دادپەروەربن لەنێوانیانا، چونکە خودا وای پێخۆشە).

فەرمووی: باوکم لە بەخشیشەکەی پەشیمان بۆوەو لەمنی سەندەوە. {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨ چ/٤}.

٩٩١- عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ قَالَ: انْطَلَقَ بِي أَبِي يَحْمِلُنِي إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ اشْهَدْ أَنِّي قَدْ نَحَلْتُ النُّعْمَانَ كَذَا وَكَذَا مِنْ مَالِي، فَقَالَ: « أَكُلَّ بَنِيكَ قَدْ نَحَلْتَ مِثْلَ مَا نَحَلْتَ النُّعْمَانَ؟». قَالَ: لاَ، قَالَ: « فَأَشْهِدْ عَلَى هَذَا غَيْرِي»، ثُمَّ قَالَ: «أَيَسُرُّكَ أَنْ يَكُونُوا إِلَيْكَ فِي الْبِرِّ سَوَاءً »؟ قَالَ: بَلَى، قَالَ: « فَلاَ إِذًا ». {الحديث: ٤١٦١ = ٤١٥٥ فم. تقدم تخريجه فی الحديث ٩٩٠}:

نوعمانی کوڕی بەشیر (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: باوکم هەڵی گرتم و بردمی بۆلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆ بەشایەتبە کەئەوا ئەوەو ئەوەم لەماڵەکەم بەخشی بە نوعمانی کوڕم. فەرمووی: (ئایا گشت کوڕەکانی تریشت بەقەد ئەمت پێ بەخشیون؟) باوکم فەرمووی: نەء. فەرمووی: (دە کەسێکی تر بکە بەشایەتی ئەمە، من شایەتی نادەم). لەپاشا فەرمووی: (ئەی حەزیش ئەکەی کە کوڕەکانت هەموویان وەك یەك بۆت باش بن؟). باوکم فەرمووی: (بەڵێ). فەرمووی: (کەواتە نابێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١، ژمارە: ١٩٥٨ چ/٤}.

## ٧٧٧) کەسێ شتێ بدا بەکەسێ تاماوەی ژیانی. (٤١٦٤ - ٤١٧٩)
## باب: فِي الرَّجُلِ يُعْمِرُ رجلاً عُمْرى

٩٩٢- عَنِ جَابِرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « أَيُّمَا رَجُلٍ أَعْمَرَ رَجُلاً عُمْرَى لَهُ وَلِعَقِبِهِ فَقَالَ: قَدْ أَعْطَيْتُكَهَا وَعَقِبَكَ مَا بَقِيَ مِنْكُمْ أَحَدٌ، فَإِنَّهَا لِمَنْ أُعْطِيَهَاوعَقِبِهِ، وَإِنَّهَا لاَ تَرْجِعُ إِلَى صَاحِبِهَا مِنْ أَجْلِ أَنَّهُ أَعْطَى عَطَاءً وَقَعَتْ فِيهِ الْمَوَارِيثُ ». {الحديث: ٤١٦٦ = ٤١٥٨ فم. تجريد/٣، رقم: ١١١٤ = ٢٦٢٥. أبو داود. بيوع: ٣٥٥٠. ترمذي. أحكام: ٣١٤٨. نسائي. عمرى: ٣٧٤٤. ابن ماجة. هبات: ٢٣٨٠. تحفة الأشراف: ٣١٤٨}:

جابیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر پیاوێ شتێکی دا بەپیاوێکی تر، کە لەژیانیدا بۆ خۆی بێ، وە لەپاش خۆی بۆ وەچەو منداڵو نەوەی بێ، وە گوتی: ئەمەم دا بەتۆو بەمنداڵو وەچەی تۆ تایەکێکتان بمێنێ، ئەوە لەکاتی واداو لەم حاڵەتەدا دەبێ بەهی ئەو کەسەی کەدراوە پێی، وە جارێکی تر نابێتەوە بەهی خاوەنە پێشووەکەی، کە لەزاراوی شەرعی پیرۆزدا پیی دەگوترێ: موعممیر، چونکە ئەم جۆرە دەسەنەو بەخشینە بەشی کەلەپوور بەر (میراتگر)یی تێ دەکەوێ). {تاج/٢، زنجیرە: ١٧٩، ژمارە: ١٩٤٣ چ/٤ = چاپی چوارەم}.

٩٩٣- عَنْ جَابِرِ بن عبدالله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « أَمْسِكُوا عَلَيْكُمْ أَمْوَالَكُمْ وَلاَ تُفْسِدُوهَا فَإِنَّهُ مَنْ أَعْمَرَ عُمْرَى فَهِيَ لِلَّذِي أُعْمِرَهَا حَيًّا وَمَيِّتًا وَلِعَقِبِهِ ». {الحديث: ٤١٧٢ = ٤١٦٥ فم}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەست بەماڵی خۆتانەوە بگرن، بەفیڕۆ داغانی مەکەن، ئەوەیش بزانن هەرشتێ کەبەناوی زینەبەخش (عومرا)وە بیدەن بەکەسێ، دەبێ بەهی ئەوکەسە، چ بەزیندوویی، چ بەمردوویی، لەپاش خۆشی دەبێ بەهی وەچەو نەوەکەی).

**ڕوونکردنەوە:**

ژینەبەخش (عومرا) لەسەردەمی نەزانی پێش ئیسلاما باوبووە، باخێ، ئاشێ، کارێزێ، خانوویێ، پارچە زەوییەکیان دەدا بەکەسێو پێیان دەگوت: ئەم شتە بۆ خۆت تاماویت، یا تامن ماوم دوایی ببێتەوە بەهی خۆم، ئەگەر تۆ مردیت، یا ببێتەوە بەهی تۆ ئەگەر من مردم. بەلاّم کە ئیسلام هات دەستوورێکی نوێی بۆ ژینە بەخش دانا، کە پوختەکەی ئەمەیە:

١-گوتی بۆ خۆتو لەپاش خۆت بۆ منالّو وەچەت، ئەم جۆرە بەیەکجاری دەبێ بەهی پێبەخشراو، قەت نابێتەوە بۆ خاوەنی پێشووی.

٢- گوتی بۆخۆت تاماوی، کەمردیت ببێتەوە بەهی خۆم، لەمەیانا دوو دیدو بۆچوون هەیە: یەکەم دەفەرموێ: ئەمەیان تا پێبەخشراو ماوە بۆ خۆیەتی، پاش مردنی دەبێتەوە بەهی بەخشەر، ئەگەر خۆی مابوو، دەنا دەبێتەوە بەهی کەلەپوور گرەکانی. دووەم دەفەرموون: جیاوازی نییە لەنێوانی شێوەی یەکەمو شێوەی دووەمدا، لەهەردوو بارەکەدا دەبێ بەهی پێبەخشراوو وەچەکەی، جارێکی تر ناگەڕێتەوە بۆ بەخشەرو نەوەکەی.

٣ گوتی بۆخۆت، تاماوی لەبەندی ژیانا. ئەمەیان راجیایی زۆری واتیادا، هەندێ دەفەرموون ئەم جۆرەش هەتا هەتایە دەبێ بەهی پێبەخشراو، وەك بڕگەی یەکەم، هەندێ تر دەلێن: لەپاش مردن دەبێتەوە بەهی خاوەنەکەی، گەلێ فەرمایشتی تریش هەیە.

**تێبینی:**

لەڕاستیدا زۆر لەم بابەتو سەوداو کارو کردەوانەی، کەوان لەم بابەتی کڕینو فرۆشتنو کۆیلەییو عومراو شتی وادا، بەپێی رۆژ بەشێوەیێ تر سەریان هەلّ داوەو هاتوونەتە ناوکایەوە، جا گرنگ ئەوەیە ئەم دەقانە بکرێن بەسەرچاوە بۆ دۆزینەوەی بڕیاری شەرع، بۆ شێوەکارە نوێکانی ئەم بابەتانە، لەبەرگە تازەکەیاندا. بەوێنە: جاران لەماڵەوە نانی شایی دەکرا، بەبۆنەی گواستنەوەی بووکەوە، ئایا ئێستا ئەو ئاهەنگەی لەهۆڵە تایبەتەکان دەکرێ، جێگەی ئەو نانی شاییە دەگرێتەوە، یانا، وە وەك ئەو سوننەتە یانا؟؟



# ٢١- نامەی فەرائیز (کەلەپوور دابەشکردن)

{تاج/٢، زنجیرە: ١، لاپەرە: ٤١٦ هەتا زنجیرە: ١١ + تجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣١٦، زنجیرە: ٨٨ لەژمارە: ٢٠٥٩ هەتا ژمارە: ٢٠٦٤ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٦٢٢، زنجیرە: ٢٤٣ چاپی ئێران}.

## ٧٧٨) نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێ وەنە بەپێچەوانەوە.

(٤١١٦ - ٤١٣٨)

### باب: لا يَرِثُ المُسْلِمُ الكافرَ ولا يرثُ الكافرُ المُسْلِمَ

٩٩٤- عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « لاَ يَـرِثُ الْمُسْـلِمُ الْكَـافِرَ وَلاَ يَـرِثُ الْكَـافِرُ الْمُسْـلِمَ ». {الحديث: ٤١١٦ = ٤١١٠ فم. بخاری. فرائض: ٦٧٦٤}:

ئوسامەی کوڕی زەید (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (نە موسوڵمان کەلەپوور لە ناموسوڵمان وەردەگرێ‌و نە ناموسوڵمان کەلەپوور لە موسوڵمان وەردەگرێ، هیچیان کەلەپوور لەهیچیان وەرناگرن).

{تاج/٢، زنجیرە: ٢، ژمارە: ١٩٦٠ ج/٤}.

## ٧٧٩) هەموو خاوەن بەشێ، بەپێی قورئانەکە، بەشی دیاریکراوی خۆی پێ بدەن.

(٤١١٦ - ٤١٣٨)

### بابك أَلْحِقُوا الفَرائِضَ بِأَهْلِهَا

٩٩٥- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « أَلْحِقُوا الْفَـرَائِضَ بِأَهْلِهَـا فَمَـا تَرِكَـتِ الفـرائضُ فَلأَوْلَـى رَجُـلٍ ذَكَـرٍ ». {الحديث: ٤١١٧ = ٤١١ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٥٩}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەموو خاوەن بەشێ لە کەسوکاری مردوو، بەشە دیاریکراوی خۆی پێ بدەن،

بەپێی دەقی قورئانەکە، ئەنجا هەرچی لەوان مایەوە، ئەوە بۆ خزمترین کەسی مردووەکەیە بەمەرجێ نێرینە بێ!). {تاج/٢، زنجیرە: ٤، ژمارە: ١٩٧٢ چ/٤}.

### ٧٨٠) کەلەپووری کەلالە، کە بەکەسێ دەگوترێ نەبنەچەی مابێو نەوەچەی هەبێ. (٤١١٦ - ٤١٣٨)

### باب: ميراثُ الكَلاَلَة

٩٩٦- عَنْ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما) قال: دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَأَنا مَرِيضٌ لاَ أَعْقِلُ، فَتَوَضَّأَ فَصَبُّوا عَلَيَّ مِنْ وَضُوئِه، فَعَقَلْتُ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّهِ إِنَّمَا يَرِثُنِى كَلاَلَةٌ، فَنَزَلَتْ آيَةُ الْمِيرَاثِ، فَقُلْتُ لِمُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ: (يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِى الْكَلاَلَةِ) قَالَ: هَكَذَا أُنْزِلَتْ). {الحديث: ٤١٢٤ = ٤١١٨ فم. تجريد/١، رقم: ١٤٣ = ١٩٤، ٤٥٧٧، ٥٦٥١، ٥٦٦٤، ٥٦٧٦، ٦٧٢٣، ٦٧٤٣، ٧٣٠٩. تحفة الأشراف: ٣٠٤٣}:

جابیری کوڕی عەبدوڵڵا (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: نەخۆش بووم، هۆشم بەخۆم نەبوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) هاتبوو بۆ سەردانو هەواڵپرسیم، دەستنوێژ دەگرێو لەئاوی دەستنوێژەکەیم لێ دەپرژێنێ، ئەوجا هۆشم هاتەوە، جاگوتم: ئەی ڕەهبەری خودا! میراتو کەلەپوورەکەم بۆ کێ دەبێ؟ چونکە من تەنیا چەن خوشکێکم هەن کەلەپوورم لێ بگرنو کەسی ترم نییە نەباوكو دایكو نەمناڵ، ئیتر بەم بۆنەیەوە ئایەتی کەلەپووری کەلالە هاتە خوارەوە).

ڕشتەی ئەم فەرموودەیە لە صەحیحی موسلیمدا ئاوایە: موسلیم، لە موحەممەدی کوڕی حاتەم، لە بەهز، لە شوعبە، لە موحەممەدی کوڕی مونکەدیر، لە جابیرەوە. جا لێرەدا شوعبە دەفەرموێ: بە موحەممەدی کوڕی مونکەدیرم گوت: مەبەستی جابیر لەهاتنە خوارەوەی ئایەتی کەلالە، ئەم ئایەتەیە، کە ئایەتی (١٧٦)ە لەسوورەتی نیساء، کە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ}؟!

موحەممەد فەرمووی: بەڵێ، ئەم ئایەتە لەکەشێکی وادا هاتۆتە خوارەوە. {تاج/١، زنجیرە: ٢١، ژمارە: ١٥٨ چ/٤}.

٩٩٧- عَنْ مَعْدَانَ بْنِ أَبِى طَلْحَةَ أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) خَطَبَ يَوْمَ جُمُعَةٍ، فَذَكَرَ نَبِيَّ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) وَذَكَرَ أَبَا بَكْرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) ثُمَّ قَالَ: إِنِّى لاَ أَدَعُ بَعْدِى شَيْئًا أَهَمَّ عِنْدِى مِنَ الْكَلاَلَةِ، مَا رَاجَعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِى شَىْءٍ مَا رَاجَعْتُهُ فِى الْكَلاَلَةِ، وَمَا أَغْلَظَ لِى فِى شَىْءٍ مَا أَغْلَظَ لِى فِيهِ حَتَّى طَعَنَ بِإِصْبَعِهِ فِى صَدْرِى، وَقَالَ: « يَا عُمَرُ أَلاَ تَكْفِيكَ آيَةُ الصَّيْفِ الَّتِى فِى آخِرِ سُورَةِ النِّسَاءِ »، وَإِنِّى إِنْ أَعِشْ أَقْضِ فِيهَا بِقَضِيَّةٍ يَقْضِى بِهَا مَنْ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ، وَمَنْ لاَ يَقْرَأُ الْقُرْآنَ. {الحديث: ٤١٢٦ = ٤١٢٠ فم}:

میعدانی کوڕی ئەبو طەلحە دەفەرموێ: لەرۆژێکی هەینیدا، عومەری کوڕی خەتتاب (رەزای خودای لێ بێ) کاتێ جێنشین بوو، وتارێکی دا، یادی پێغەمبەرو یادی ئەبوبەکری کرد (دروودی خودا لەسەر پێغەمبەرو رەزای خودا لە ئەبوبەکربێ)، ئەوجا فەرمووی: گرنگترین بابەتێ لەزانستی فەرائیزدا، کەهەتا ئێستا بەتەواوی بۆم روون نەبۆتەوە، پرسی کەلالەیە، دەترسم هەروا بمێنێتەوە هەتا پاش مردنم، بۆ هیچ شتێ لەبابەتی فەرائیزدا، وەك بابەتی کەلالە، چەند جارو چەندبار پرسیارم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) نەکردووە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەسەر هیچ شتێ وەك کەلالە لەگەڵما توندو تیژ نەبووە، تەنانەت لەدواجارا پەنجەی ژەند بەسینەماو فەرمووی: (ئەی عومەر! ئەی فارووق! تۆ زاناو دانای، ئەوەندە لەشت مەکۆڵەرەوە، ئوصولی مەسائیلو روئوسی ئەقلامو سەرچاوە سەرەکییەکانی پرسەکانو نموونە سەر مەشقەکانی بابەتەکان. لە قورئانی پیرۆزو، لە سوننەتی مندا هەن، جا کەواتە، زیاد لەپێویست ئەوەندە ئیعتماد لەسەر دەقی رۆشن، لەهەموو پرسێکا مەکەن، چونکە پرسەکان زۆرو بێشومارو دەقەکان کەمن، کەواتە تێکۆشنو ئیجتیهاد بکەنو لە ئوصولو بنەماو سەرچاوەو دەقو نموونەکان ئیستنباطی ئەحکام بکەن، چونکە زانستی ئیستنباط ئەرکی سەرەکی سەرشانی زاناکانە، جا ئەی عومەر! کە ئەمەت زانی، ئیتر ئایەتەکەی کە لەهاویندا هاتە خوارەوە، ئەوەت بەس نییە، کە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ – نیساء/٤/١٧٦}.

ئەوجا ئیمامی عومەر فەرمووی: ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ‌و عومر باقی بێ، بڕیارێ وا روون‌و رێكوپێك دەدەم، سەبارەت بەبابەتی كەلالە، كە هەموو كەس، خوێنەوارو نەخوێنەوار، قورئان خوێن‌و قورئان نەخوێن، پێی رازی بن‌و حوكمی پێ بكەن). {تاج/٢، زنجیرە: ٥، ژمارە: ١٩٧٤ ج/٤}.

**روونكردنەوە:**

١ بۆ روونكردنەوەی ئەم فەرموودەیە، لەسەر ئەم شێوەیە، بەهرە لەشەرحی نەوەوی‌و فەتحولمولهیم وەرگیراوە.

٢ - ئەمە ئاخر رۆژی هەینی‌و وتاری هەینی بووە، لەژیانی عومەردا، چونكە لەرۆژی چوارشەممەی دوای ئەم وتارە پێكراوە.

٣ دەڵێن رۆژێ ئیمامی عومەر، دەیەوێ لەبارەی كەلالەوە، لە ئێسكە پانكۆڵەكەی شانی ئاژەڵ نامەیێ بنووسێ‌و بۆ ئەم مەبەستە كۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەر، لەماڵێكا كۆدەكاتەوەو دەیەوێ لەم بارەیەوە راوێژیان پێ بكاو دەست دەكا بەقسەكردن، لەناكاوا مارێ دەرئەچێ‌و دۆخەكە دەشەڵەژێنێ‌و خەڵكەكە بڵاوەی لێ دەكەن، عومەریش دەفەرموێ: (ئەگەر ویستی خودای لەسەر بوایە، خودا ئەم كارەی كۆبوونەوە بۆی تەواوی دەكرد!).

### ٧٨١) دواهەمین ئایەتی قورئان كە هاتووە ئایەتی كەلالەیە
### باب: آخر آية نزلت آية الكَلاَلَة

٩٩٨- عَنِ الْبَرَاءِ بن عازب (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا): أَنَّ آخِرَ سُورَةٍ أُنْزِلَتْ تَامَّةً سُورَةُ التَّوْبَةِ، وَأَنَّ آخِرَ آيَةٍ أُنْزِلَتْ آيَةُ الْكَلاَلَةِ. {الحديث: ٤١٣٠ = ٤١٢٤ فم}:

بەرائی كوڕی عازیب (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: دوا سوورەت كەهات بۆ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سوورەتی بەرائەت بوو، هەمووی بەتەواوی بەیەكجار هات، وەدوا ئایەتیش كەهات ئایەتی كەلالە بوو، كە دەفەرموێ: {يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ}. {تاج/٢، زنجیرە: ٥، ژمارە: ٣٨٢٢}.

## ٧٨٢) کەسێ ماڵو سامانی لەپاش بەجێ بمێنێ بۆ کەلەپوور گرەکانیەتی.
(٤١١٦ - ٤١٣٨)
## بابٌ: مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِه

٩٩٩- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) كَانَ يُؤْتَى بِالرَّجُلِ الْمَيِّتِ عَلَيْهِ الدَّيْنُ، فَيَسْأَلُ: « هَلْ تَرَكَ لِدَيْنِهِ مِنْ قَضَاءٍ؟ فَإِنْ حُدِّثَ أَنَّهُ تَرَكَ وَفَاءً، صَلَّى عَلَيْهِ، وَإِلاَّ قَالَ: « صَلُّوا عَلَى صَاحِبِكُمْ ». فَلَمَّا فَتَحَ اللَّهُ عَلَيْهِ الْفُتُوحَ، قَالَ: « أَنَا أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ، فَمَنْ تُوُفِّيَ وَعَلَيْهِ دَيْنٌ فَعَلَيَّ قَضَاؤُهُ، وَمَنْ تَرَكَ مَالاً فَلِوَرَثَتِهِ ». {الحديث: ٤١٣٣ = ٤١٢٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤٩ = ٢٣٩٩، ٢٢٩٨، ٢٣٩٨، ٤٧٨١، ٥٣٧١، ٦٧٣١، ٦٧٤٥، ٦٧٦٣}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: گەلێ جار وادەبوو، تەرمی مردوویان دەهێنا بۆ خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) تا نوێژی مردووی لەسەر بکا، وادەبوو مردووەکە قەرزار بوو، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەیفەرموو: (ئەوەندەی ماڵ لەپاش خۆی بەجێهێشتووە کەبەشی دانەوەی قەرزەکەی سەری بکا؟).

جا ئەگەر عەرزیان بکردایە: بەڵێ، ئەوا نوێژی لەسەر تەرمەکەی دەکرد، دەنا ئەگەر بیانگوتبایە ئەوەندەی ماڵ لەپاش بەجێ نەماوە کەبەشی دانەوەی قەرزەکەی سەری بکا بەتەواوی، دەیفەرموو: (دە خۆتان نوێژ لەسەر مردووەکەتان بکەن!).

بەڵام بەرە بەرە کە خودای گەورە دەرووی دارایی، بەهۆی فتوحاتەوە، لەحەزرەت کردەوە، مردوو ئەگەر قەرزاریش بوایە نوێژی لەسەر دەکردو ئاماژە بە ئایەتی {النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ} دەیفەرموو: (من دڵسۆزترو لەپێشترم بۆ گشت موسوڵمانێ، لەهەموو کەسێکی تر، هەتا لەخۆشی لەپێشترم بۆی، جائەگەر موسوڵمانێ مردو قەرزی لەسەربوو، ئەوە قەرزەکەی لەسەر من، ئەگەر خۆی ماڵی لەپاش بەجێ نەمابوو، من قەرزەکەی بۆ دەدەمەوە، بەڵام ئەگەر ماڵی تری لەپاش بەجێمابوو، ئەوە بۆ میرات بەرەکانیەتی). {تاج/٢، زنجیرە: ١٦٤، ژمارە: ١٨٩٢ — ش/د/ت/ن} + {ژمارە: ٤١٠ کە لەپێشەوە رابورد}.



# ٢٢- نامەی وەقف (كِتَابُ الوَقْفِ)

{بڕوانە: فيقهی ئاسان، بەرگی یەکەم، لاپەڕە: ٥٨٠ چاپی ئێران زنجیرە: ٢٣٧ + تاج/٢، لاپەڕە: ٤٠٧، زنجیرە: ١٨١، ١٨٢، ١٨٣، لەژمارە: ١٩٥١ هەتا ژمارە: ١٩٥٨}.

## ٧٨٣) ئەصڵ دەکرێ بەوەقفو بەروبوومی دەکرێ بەخێر

١٠٠٠- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) قَالَ: أَصَابَ عُمَرُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَرْضًا بِخَيْبَرَ، فَأَتَى النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) يَسْتَأْمِرُهُ فِيهَا، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي أَصَبْتُ أَرْضًا بِخَيْبَرَ لَمْ أُصِبْ مَالاً قَطُّ هُوَ أَنْفَسُ عِنْدِي مِنْهُ فَمَا تَأْمُرُنِي بِهِ، قَالَ: « إِنْ شِئْتَ حَبَسْتَ أَصْلَهَا، وَتَصَدَّقْتَ بِهَا »، قَالَ: فَتَصَدَّقَ بِهَا عُمَرُ: أَنَّهُ لاَ يُبَاعُ أَصْلُهَا وَلاَ يُبْتَاعُ وَلاَ يُورَثُ وَلاَ يُوهَبُ، قَالَ: فَتَصَدَّقَ عُمَرُ فِي الْفُقَرَاءِ، وَفِي الْقُرْبَى وَفِي الرِّقَابِ، وَفِي سَبِيلِ اللَّهِ، وَابْنِ السَّبِيلِ، وَالضَّيْفِ، لاَ جُنَاحَ عَلَى مَنْ وَلِيَهَا أَنْ يَأْكُلَ مِنْهَا بِالْمَعْرُوفِ، أَوْ يُطْعِمَ صَدِيقًا غَيْرَ مُتَمَوِّلٍ فِيهِ. {الحديث: ٤٢٠٠ = ٤١٩٣ فم. تجريد/٣، رقم: ١٠٤١ = ٢٧٦٤، ٢٧٣٧، ٢٧٧٢. أبو داود. وصايا: ٢٨٧٨. ترمذي. أحكام: ١٣٧٥. ابن ماجة. صدقات: ٢٣٩٦. تحفة: ٧٧٤٢}:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: عومەر لەخەیبەر، زەوییەکی دەست کەوت، چوو بۆلای پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **کە ڕاوێژی پێ بکا، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! پارچەیێ زەویم چنگ کەوتووە لەخەیبەر، ئەوەتی هەم ماڵی وا نایابم نەبووە، دەمەوێ بیکەم بەخێر، تۆ دەفەرمووی بیکەم بەچی؟ فەرمووی** (دروودی خودای لەسەر بێ): **(ئەگەر حەزدەکەی خۆی بکە بەوەقفو دەرامەتەکەی بکە بەخێر!).**

**جا عومەریش** (ڕەزای خودای لێ بێ) **لەسەر ئەم شێوەیە کردی بەخێر: جێ زەوییەکە خۆی نە دەفرۆشرێ، نەدەکڕرێ، نەبە کەلەپوور دەبرێ، نە دەبەخشرێ، فەرمووی: عومەر دەرامەتەکەی وەقف کرد لەسەر ئەم کەسانە: لەسەر هەژاران و**

خـزمو خوێشانو لـەڕێی ئازادکردنی کۆیلـەداو لەڕێگـەی خـوداداو لەسـەر ڕێبـوارو میوان، وە ئەو کەسەیشی کـە سەرپەرشـتی ئـەو وەقفـە دەکـا، گوناهی لەسـەر نییـە ئەگەر بەشێوەیەکی پەسەند خۆی لێی بخوا، یا دەرخـواردی دۆسـتو بـرادەری بـدا، بەمەرجێ لێی نەیکا بە ماڵو بیکا بەهی خۆی). {تـاج/٢، زنجیرە: ١٨١، ژمـارە: ١٩٥٣ — ش/د/ت/ن}.

## ٧٨٤) ئەو خێرەی کە لەپاش مردن دەگا بەمردوو. (٤١٩٩)

## باب: ما يَلْحَقُ الإنْسَانَ ثَوابُهُ بَعْدَهُ

١٠٠١- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ) أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ (صَلَّى اللّٰهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَـالَ: « إِذَا مَاتَ الإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلاَّ مِنْ ثَلاَثَةٍ، إِلاَّ مِنْ صَـدَقَةٍ جَارِيَـةٍ، أَوْ عِلْـمٍ يُنْتَفَـعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَـدْعُو لَـهُ ». {الحـديث: ٤١٩٩ = ٤١٩٢ فـم. ترمـذى. أحكـام: ١٣٧٦. نسائى. وصايا: ٣٦٥٣. تحفة الأشراف: ١٣٩٧٥}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) لە حەزرەتـەوە دەفـەرموێ (دروودی خودای لەسەر بێ): (کاتـێ ئادەمیزاد دەمرێ، هەموو کردەوەیەکی کۆتـایی دێ، ئـەم سـێ جـۆرە نـەبێ: یەکـەم: خێرێکی نەبڕاوە (وەك مزگەوتو کارێزو پـردو شـتی تـری وەقـف). دووەم: زانینـی بەسـوود (وەك دانـانی کتێبـی بـاش بـەنیازی پـاكو پێگەیانـدنی فـەقێو قوتـابیو شاگردی بەسوودو بەکەڵك بۆ گەلی ئیسلام). سێیەم: منـداڵو وەچـەیەکی بـاش، کـە دووعاو نزای باشی بۆ بکا، یاخێری تری بۆ بکا. {ڕیاض/٣، لاپـەڕە: ٣، زنجـیرە: ١٦٢، ژمارە: ٩٤٩/٢ - ٢}.

## ٧٨٥) خێرکردن بۆ کەسێ مردبێو ڕاسپێری نەکردبێ

## باب: الصَّدَقَةُ عَمَّنْ مَاتَ وَلَمْ يُوصِ

بڕوانە فەرموودەکـەی عائیشـە کـە لەپێشـەوە لەباسـی زەکاتـا ڕابـوورد بڕوانـە: ژمـارە: (٥٣٢) و (٥٣٣) و (٦٠٥) و (٤٩٧) و (٤٧٧) و (٤٨٢) و (٤٩٩) و (٦٠٦) و (١٠٠٣) + {بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ١٣٤، زنجیرە: ١٣١ بەتەواوی}.



# ٢٣- نامەی نەزرو ئاهکردن (كِتَابُ النُّذُورِ)

{بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ١٣٠، زنجیرە: ١٣٠ لەژمارە: ٢٥٢٠ هەتا ژمارە: ٢٥٤٨ + تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣٠٥ ژمارە: ٢٠٤٨ هەتا ٢٠٥٦ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ١٠٢٢ زنجیرە: ٣٧٨ هەتا زنجیرە: ٣٨٦}.

## ٧٨٦) جێبەجێ کردنی نەزرێ کە فەرمانبەریی خودابێ. (٤٢٦٨ - ٤٢٧٣)
## باب: الوَفاءُ بالنَّذْرِ إذَا كَانَ فِي طَاعةِ اللهِ

١٠٠٢- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهما): أَنَّ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهُوَ بِالْجِعْرَانَةِ بَعْدَ أَنْ رَجِعَ مِنَ الطَّائِفِ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي نَذَرْتُ فِي الْجَاهِلِيَّةِ أَنْ أَعْتَكِفَ يَوْمًا فِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ، فَكَيْفَ تَرَى؟ قَالَ: « اذْهَبْ فَاعْتَكِفْ يَوْمًا »، قَالَ: وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَدْ أَعْطَاهُ جَارِيَةً مِنَ الْخُمْسِ، فَلَمَّا أَعْتَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَبَايَا النَّاسِ، سَمِعَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَصْوَاتَهُمْ يَقُولُونَ: أَعْتَقَنَا رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ: مَا هَذَا؟ فَقَالُوا: أَعْتَقَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) سَبَايَا النَّاسِ. فَقَالَ عُمَرُ: يَا عَبْدَ اللَّهِ اذْهَبْ إِلَى تِلْكَ الْجَارِيَةِ فَخَلِّ سَبِيلَهَا. {الحديث: ٤٢٧٠ = ٤٢٦٢ فـم. بخاري. فرض الخمس: ٣١٤٤، ٤٣٢٠. تجريد/٣، رقم: ١٢٦٨، ١٠١٥ = ٣١٤٤، ٢٣٠٧، ٢٥٨٤}:

عەبدوڵڵای کوڕی عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: لەپاش غەزای حونەین، لەپاش ئەوە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) لە طائیف گەڕایەوە، لەجیعرانە بوو، باوکم عومەری کوڕی خەتاب عەرزی کرد: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! من لەسەردەمی نەزانیدا، نەزرم کردووە کەشەوێ لەناو مەسجیدولحەراما خەڵوە بکێشم، جا ئێستا تۆ فەرمانت بەچییە؟ فەرمووی: (بڕۆ ڕۆژێ لەوێ خەڵوە بکێشەو ئیعتیکافەکەت جێبەجێ بکە).

فەرمووی: لەژنە دیلەکانی غەزای حونەین، لەبەشی پێنج یەك، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کەنیزێکی دا بەعومەر، جاکاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە پیاوەتی ژنو منالە دیلەکانی هۆزی هەوازینی بەردا، لەخۆشیانا خەڵکەکە، بەناو کۆڵانەکانا رایان دەکردو دەهاتنو دەچوونو بەدەنگی بەرز هاواریان دەکرد: ئۆخەی! پێغەمبەری خودا ئازادی کردین! عومەر گوێی لەدەنگە دەنگیان بوو، فەرمووی بەمن: عەبدوللا بزانە ئەم دەنگە دەنگە چییە؟ عەرزیمان کرد: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەپیاوەتی منالو ژنە دیلەکانی هۆزی هەوازینی ئازادکردووە.

جا باوکم فەرمووی: ئەی عەبدوللا! دەتۆیش بچۆ ئەو کەنیزەکەی منیش، کە لەدیلەکانی غەزای هەوازین بەرم کەوتووە بەرەڵای بکە منیش چووم فەرمانەکەیم بەجێ هێنا. {تاج/٤، زنجیرە: ٧١، ژمارە: ٤٥٤٤} + {تاج/٤، زنجیرە: ٩٦، ژمارە: ٤٦٣٤، ٤٦٣٥}.

## ٧٨٧) فەرمانکردن بە جێبەجێکردنی نەزر. (٤٢١١ - ٤٢٢٩)
## بابٌ: الأمْرُ بِقَضَاءِ النَّذْرِ

١٠٠٣- عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) أَنَّهُ قَالَ: اسْتَفْتَى سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فِي نَذْرٍ كَانَ عَلَى أُمِّهِ، تُوُفِّيَتْ قَبْلَ أَنْ تَقْضِيَهُ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « فَاقْضِهِ عَنْهَا ». {الحديث: ٤٢١١ = ٤٢٠٤ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٥٥ = ٦٦٩٨، ٢٧٦١، ٦٩٥٩ فتح الباري}:

ئیبنو عەبباس (رەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: سەعدی کوڕی عوبادە (رەزای خودای لێ بێ) لە پێغەمبەری پرسی: دایکم نەزرێکی لەسەر بوو، لەپێش ئەوەدا کە جێبەجێی بکا مرد، ئایا دەبێ ئێستا من خۆم بیگێڕمەوە بۆی؟ فەرمووی: (بەڵێ دەبێ، ئێستا تۆ خۆت بۆی بگێڕەرەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣١، ژمارە: ٢٥٢٦}.

## ٧٨٨) کەسێ نەزربکا، کە بەپێ بچێ بۆ سەردانی کەعبە. (٤٢١١ - ٤٢٢٩)
## بابٌ: فِيمَنْ نَذَر أَنْ يَمْشِيَ إِلَى الكَعْبَة

١٠٠٤- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) أَنَّهُ قَالَ: نَذَرَتْ أُخْتِي أَنْ تَمْشِيَ إِلَى بَيْتِ اللَّهِ حَافِيَةً، فَأَمَرَتْنِي أَنْ أَسْتَفْتِيَ لَهَا رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم)، فَاسْتَفْتَيْتُهُ فَقَالَ: « لِتَمْشِ وَلْتَرْكَبْ ». {الحديث: ٤٢٢٦ = ٤٢١٩ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٥٣ = ١٨٦٦. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٩٩. نسائي. أيمان ونذور: ٣٨٢٣. تحفة الأشراف: ٩٩٥٧}:

عوقبەی کوڕی عامیر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خوشکێکم نەزری کردبوو کە بەپێی پەتی بڕوا بۆ خانەی خودا، وەگوتی بەمن کە بۆ ئەمە پرسی بۆ بکەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) جا کاتێ پرسیارم لێی کرد لەم بارەیەوە، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (با بەپیادەیش‌و بەسواریش بڕوا بۆ جێبەجێکردنی نەزرەکەی).

**ڕوونکردنەوە:** ئەگەر لەباری وادا پێلاویش لەپێ بکا قەیناکا.

١٠٠٥- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) رَأَى شَيْخًا يُهَادَى بَيْنَ ابْنَيْهِ، فَقَالَ: « مَا بَالُ هَذَا؟». قَالُوا: نَذَرَ أَنْ يَمْشِيَ، قَالَ: « إِنَّ اللَّهَ عز وجل عَنْ تَعْذِيبِ هَذَا نَفْسَهُ لَغَنِيٌّ »، وَأَمَرَهُ أَنْ يَرْكَبَ. {الحديث: ٤٢٢٣ = ٤٢١٦ فم. تجريد/٢، رقم: ٨٥٢ = ١٨٦٥، ٦٧٠١. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٣٠١. ترمذي. نذور وأيمان: ١٥٣٧. نسائي. أيمان ونذور: ٣٨٦١. تحفة الأشراف: ٣٩٢}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: جارێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیرە مێردێکی بینی، خۆی دابوو بەسەر شانی دوو کوڕی خۆیدا، بەلارە لارە خۆی بەکێش دەکرد، لەبەر بێ هێزی، فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەمە چییە بۆ وادەکا؟) کوڕەکانی گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا! نەزری کردووە کە بەپێ بڕوا بۆ خانەی خودا، ئەمەیش حاڵیەتی. فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی پیرەمێرد! سواربەو بەسواریی بڕۆ بۆ جێبەجێ کردنی نەزرەکەت، خودا هەوەجێی بەتۆو

بەنەزری تۆ نییە، وەهەوەجای بەوەنییە کە ئەم ئیختیارە ئاوا سزاو ئازاری خۆی بدا). {تاج/٣، لاپەڕە: ١٣٦، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٣ چ/٤}.

**٧٨٩) نەیی کردن لەنەزر، چونکە چارەنووس رەت ناکاتەوە.** (٤٢١١ - ٤٢٢٩)

**باب: النهيُ عَنِ النَّذْرِ وأَنَّهُ لاَ يَردُّ شَيْئاً**

١٠٠٦- عَنِ ابْنِ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): أَنَّهُ نَهَى عَنِ النَّذْرِ وَقَالَ: « إِنَّهُ لاَ يَأْتِي بِخَيْرٍ، وَإِنَّمَا يُسْتَخْرَجُ بِهِ مِنَ الْبَخِيلِ ». {الحديث: ٤٢١٥ = ٤٢٠٨ فم}:

**ئیبنو عومەر** (ڕەزای خودایان لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **نەهی دەکرد** لەنەزر کردن، وە دەیفەرموو: (چونکە خودی نەزرەکە خۆی بەبێ چارەنووسی خودایی، هیچ خێرێ ناهێنێ بۆ نەزرکار، بەلام ویستی خودا وایە کە بەهۆی نەزرەوە، خێرو بەخشین لەچنگی مرۆڤی رژدو چرووك دەربهێنرێ). {تەجرید/٥، ژمارە: ٢٠٤٥ = ٦٦٩٤ + بخاری. قدر: ٦٦٠٨ + تاج/٣، لاپەڕە: ١٣١، زنجیرە: ١٣٠، ژمارە: ٢٥٢٠، ٢٥٢١}.

١٠٠٧- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عن النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) قَالَ: « إِنَّ النَّذْرَ لاَ يُقَرِّبُ مِنِ ابْنِ آدَمَ شَيْئًا لَمْ يَكُنِ اللَّهُ قَدَّرَهُ لَهُ، وَلَكِنِ النَّذْرُ يُوَافِقُ الْقَدَرَ فَيُخْرَجُ بِذَلِكَ مِنَ الْبَخِيلِ مَا لَمْ يَكُنِ الْبَخِيلُ يُرِيدُ أَنْ يُخْرِجَ ». {الحديث: ٤٢١٩ = ٤٢١٢ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٥ = ٦٦٩٦ فتح الباري}:

**ئەبو هورەیرە** (ڕەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: پێغەمبەر** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (ئەو شتەی کەخودا نەینووسیبێ لەچارەی ئادەمیزاد، بەشت نەزرکردن بۆی نابێ، بەلام وادەبێ کەزۆر جاران کە نەزرەکە لەگەڵ چارەنووس یەك دەگرێو شتەکە روو دەداتو ئادەمیزاد وادەزانێ کە ئەوە لەبەر نەزرەکەی ئەو رووی داوە، جا بەهۆی ئەمەوەو لەسەر ئەم بنیاتە، بەنەزر شت لەپیاوی پیسکەو چرووك دەکێشرێتەوە، بەلام ئەگەر وانەبوایە ئەو پیسکەیە ئەو خێرو نەزرەی نەدەکر). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٠، لاپەڕە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٢١}.

**٧٩٠) نــەزركردنی گوناه نەدادەمــەزرێ، نــە جێبــەجێ دەكــرێ، هــەروا نەزركردنی شتێ كەهی خۆی نەبێ، یا لەتوانایا نەبێ.** (٤٢١١ - ٤٢٢٩)

**باب: لا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللهِ وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ الْعَبْدُ**

١٠٠٨- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَـالَ: كَانَـتْ ثَقِيـفُ حُلَفَـاءَ لِبَنِـي عُقَيْلٍ، فَأَسَرَتْ ثَقِيفُ رَجُلَيْنِ مِـنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ)، وَأَسَرَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَجُلاً مِنْ بَنِي عُقَيْلٍ، وَأَصَابُوا مَعَهُ الْعَضْبَاءَ، فَأَتَى عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) وَهْوَ فِـي الْوَثَـاقِ، قَـالَ: يَـا مُحَمَّـدُ! فَأَتَـاهُ، فَقَالَ: « مَا شَأْنُكَ »؟ قَالَ: بِمَ أَخَذْتَنِي وَبِمَ أَخَذْتَ سَابِقَةَ الْحَاجِّ؟ فَقَالَ (إِعْظَامًا لِـذَلِكَ): « أَخَذْتُكَ بِجَرِيرَةِ حُلَفَائِكَ ثَقِيفَ »، ثُمَّ انْصَرَفَ عَنْهُ فَنَادَاهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! يَا مُحَمَّدُ! وَكَـانَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) رَحِيمًا رَقِيقًا، فَرَجَعَ إِلَيْـهِ فَقَـالَ: « مَـا شَـأْنُكَ »؟ قَـالَ: إِنِّي مُسْلِمٌ، قَالَ: « لَوْ قُلْتَهَا وَأَنْتَ تَمْلِكُ أَمْرَكَ أَفْلَحْتَ كُلَّ الْفَلاَحِ »، ثُمَّ انْصَـرَفَ، فَنَـادَاهُ، فَقَالَ: يَا مُحَمَّدُ! يَا مُحَمَّدُ! فَأَتَاهُ، فَقَالَ: « مَا شَأْنُكَ »؟ قَالَ: إِنِّي جَائِعٌ فَـأَطْعِمْنِي وَظَمْآنُ فَأَسْقِنِي، قَالَ: « هَذِهِ حَاجَتُكَ » فَفُدِيَ بِالرَّجُلَيْنِ، قَالَ: وَأُسِرَتِ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ وَأُصِيبَتِ الْعَضْبَاءُ، فَكَانَتِ الْمَرْأَةُ فِي الْوَثَاقِ، وَكَانَ الْقَوْمُ يُرِيحُونَ نَعَمَهُمْ بَيْنَ يَدَيْ بُيُوتِهِمْ، فَانْفَلَتَـتْ ذَاتَ لَيْلَةٍ مِنَ الْوَثَاقِ فَأَتَتِ الإِبِلَ، فَجَعَلَتْ إِذَا دَنَتْ مِنَ الْبَعِيرِ رَغَا، فَتَتْرُكُـهُ حَتَّـى تَنْتَهِـيَ إِلَى الْعَضْبَاءِ فَلَمْ تَرْغُ، قَالَ: وَهِيَ نَاقَةٌ مُنَوَّقَةٌ فَقَعَدَتْ فِي عَجُزِهَا، ثُمَّ زَجَرَتْهَا، فَانْطَلَقَـتْ، وَنَذِرُوا بِهَا، فَطَلَبُوهَا فَأَعْجَزَتْهُمْ، قَالَ: وَنَذَرَتْ لِلَّهِ عز وجل إِنْ نَجَّاهَا اللَّهُ عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّهَا! فَلَمَّا قَدِمَتِ الْمَدِينَةَ رَآهَـا النَّـاسُ، فَقَـالُوا: الْعَضْبَـاءُ نَاقَـةُ رَسُـولِ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَتْ: إِنَّهَا نَذَرَتْ إِنْ نَجَّاهَا اللَّهُ عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّهَا! فَـأَتَوْا رَسُـولَ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) فَذَكَرُوا ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ: « سُبْحَانَ اللَّهِ بِئْسَمَا جَزَتْهَا، نَذَرَتْ لِلَّهِ إِنْ نَجَّاهَا اللَّـهُ عَلَيْهَا لَتَنْحَرَنَّهَا! لاَ وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةٍ، وَلاَ فِيمَا لاَ يَمْلِكُ الْعَبْـدُ ». {الحديث: ٤٢٢١ = ٤٢١٤ فم}:

عیمرانی كوڕی حوصەین (ڕەزای خودایان لێ بێ) فـەرمووی: هـۆزی ثـەقیـف هاوپـەیمانی هۆزی بەنی عەقیل بوون، هـەروا هاوپـەیمان بـوون لەگـەڵ موسـوڵمانانا، جا هـۆزی ثەقیف پەیمانەكەیان دەشكێنن‌و دوو پیاو لە هاوەڵانی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ)

دیل دەکەن، هاوەڵانی پێغەمبەریش پیاوێ لەهۆزی بەنی عەقیل دیل دەکەن، پیاوە دیلەکە وشترێکی چاکی پێ دەبێ، ناوی عەضباء دەبێ، هاوەڵان ئەویش بەتاڵانی دەگرن، کە لەدواتر ئەم وشترە کەناوی عەضباء بوو، بوو بەهی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) پیاوە دیلەکە بەکۆتو زنجیرەوە بوو، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چوو بۆلایو فەرمووی پێی: (ها چیتە، چیت دەوێ؟) گوتی: من تاوانم چییە بەچی هەقێ منتان گرتووە، وەبەچی هەقێ ئەو وشترەی منتان بەتاڵانی گرتووە، کە هەمیشە پێشەنگی کاروانی حاجیان بوو؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) لەبەرئەوەی کەزۆر بەزەحمەتی زانی، کە تۆمەتی بێ پەیمانی لێ بدرێو گومانی واخراپی پێ ببرێ فەرمووی: (تۆ بەتاوانی ثەقیفی هاوپەیمانت گیراوی، کە بەناڕەوا دوو پیاویان لە هاوەڵانی من بەدیل گرتووە) ئەوجا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی بڕواو کەمێ رۆیشت، کابرا بانگی کردەوەو گوتی: ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد! پێغەمبەریش زۆر بەسۆزو میهرەبانو نەرمو نیان بوو، لەبەرئەوە گەڕایەوە بۆ لایو فەرمووی: (هاخێر، چیت دەوێ؟) گوتی: (من موسوڵمان بوومو ئێستا موسوڵمانم) پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەم قسەیەت کاتێ سوودی تەواوی دەبوو بۆ تۆ، کەپێش ئەوە یەخسیر بکرێیت بتگوتبایە، بەڵام ئێستا گەرچی سوودی هەیە بۆت بەڵام رزگارت ناکا لە دیلیی). دیسان پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ویستی بڕوا، بەڵام کابرا بانگی کردەوەو گوتی: ئەی موحەممەد! ئەی موحەممەد! پێغەمبەر گەڕایەوە بۆلایو فەرمووی: (چیت دەوێ؟) گوتی: من برسیم نانم پێ بدە، توونیم ئاوم پێ بدە، فەرمووی: (ئەمەیان مافی خۆتە) فەرمانی کرد نانو ئاوی پێ درا، جا ئەم پیاوەیان گۆڕییەوە بەدوو هاوەڵەکەی کە هۆزی ثەقیف دیلیان کردبوون!

فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) عەضبای گلدایەوە بۆ خۆی، هەتا رۆژێ فرە خواکان (موشریکەکان) هێرشیان هێنایە سەر دەوروبەری شاری مەدینە، ژنێکی ئەنصارییان بەدیل بردو عەضباشیان بەتاڵانی گرتو بردیان بۆ وڵاتی

خۆیانو ژنەکەیان بە کۆتو زنجیر بەستەوە، ئەو هۆزە دەستووریان وابوو ئاژەڵو ماڵاتی خۆیانیان لەبەردەمی ماڵەکانیاندا دەکردە پەچەوەو مۆڵ دەداو وشترەکانی خۆیان بەشەو لەپەچەی بەرماڵەکانیاندا پیخ دەدا، جا شەوێ ژنەکە خۆی لە کۆتەکەی قوتارکردو رۆیشت بۆناو وشترەکان، هەتا سواری وشترێ ببێو خۆی قوتاربکا، هەرکە لە وشترێ بۆ ئەم مەبەستە نزیك دەبۆوە، وشترەکە دەیقۆڕاند، ئەویش وازی لێ دەهێنا، هەتا گەیشتە لای عەضباء، ئەو نابۆڕێنێ. فەرمووی: عەضباء بەڕاستی وشترە مێچکەیەکی سەرنەرمی هێمن بوو، جا ژنەکە سواری دەبێو لەسەر پاشەڵی دادەنیشێ، ئەوجا دەیەی لێ دەکاو بەغار دەیبا، دوایی هەستی پێ دەکەنو شوێنی دەکەون بەڵام نایگرنەوە. فەرمووی: نەزردەکا بۆ خودای گەورەی باڵا دەست، ئەگەر لەسەر پشتی عەضباء رزگاری بکا، سەری ببڕێ! جا خودا رزگاری دەکا، کاتێ دەگاتە مەدینە، خەڵکەکە دەیبیننو دەڵێن: ئەمە عەزبایە، ئەمە وشترە مێنگەکەی پێغەمبەرە، ژنەکە دەڵێ: من نەزرم کردووە ئەگەر لەسەر پشتی ئەم وشترە خودا رزگارم بکا، سەری ببڕم!

خەڵکەکە رۆیشتن بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) وە ئەم باسەیان باسکرد بۆی، ئەویش بۆ سەرسامی فەرمووی: (سوبحانەڵلا، پاکیو بێ گەردیی هەر بۆ خودایە! بەڕاستی پاداشی چاکە بەخراپە ئاوا دەبێ، نەزری کردووە بۆ خودا ئەگەر خودا لەسەر پشتی ئەو وشترە رزگاری بکا، سەری ببڕێ!). ئەوجا فەرمووی: (نەزری گوناه دانامەزرێ، شتێکیش کە ماڵی بەندە نەبێ نەزری دانامەزرێ). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٢، ژمارە: ٢٥٣٢}.

### ٧٩١) کەفارەتی نەزر. (٤٢١١ - ٤٢٢٩)

### باب: فِي كَفَّارَةِ النَّذْرِ

١٠٠٩- عَنْ عُقْبَةَ بْنِ عَامِرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « كَفَّارَةُ النَّذْرِ، كَفَّارَةُ الْيَمِينِ ». {الحديث: ٤٢٢٩ = ٤٢٢٢ فم}:

**عوقبـەی کـوڕی عـامیر** (ڕەزای خـودای لێ بـێ) **فـەرمووی: پێغەمبـەر** (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (کەفارەتی نەزریش وەك کەفارەتی سوێند وایـە). {تـاج/٣، لاپـەڕە: ١٤٢، زنجیرە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٤٣}.

**ڕوونکردنەوە:**

ڕاجیایی لەواتای ئەم فەرموودەیـەدا هەیـە، ڕای دروسـت ئەمەیـە کـە مەبەسـت لەم فەرموودەیە بڕگەی یەکەمە لەم چەند بڕگەی کەفارەتە:

١ -(هەر نەزرێ دیاری نەکرابێ، وەك کەسێ بڵێ: (نەزرێکم لەسەربێ بۆ خودا) ئـەوە ئەم جۆرە نەزرە کەفارەتەکەی کەفارەتی سوێندەو تەواو).

٢ - کەسێ نەزرێ بکا، دوایی لەتواناید نەبێ کە جێبەجێی بکا، وەك بڵێ: (نەزربێ وشترێ بکەم بـەخێر) دوایـی توانـای ئـەوەی نـەبێ، ئـەوە کـەفارەتی سـوێندی دەکەوێتە سەرو بەس.

٣ لە نەزری لیجاجا ئەگەر حەنث ڕوویدا، ئـەوا نـەزرکار، سەرپشـکە کـە جێبـەجێی بکا، یا کەفارەتی سوێندبدا، وەك بڵێ: (ئەگەر قسەم لەگەڵ زەید کرد نەزربێ لەسـەرم بـۆ خـودا حـەجێ بکـەم) جـا ئەگـەر نەزرەکـەی شـکان واتـە: قسـەی لەگەڵ زەید کرد، سەرپشـکە لـەنێوانی ئـەم دوو شـتەدا: یـا حەجەکـە بکـا، یـا کەفارەتی سوێند بدا.

٤ لـەکاتی نـەزری گوناهـا، کـەفارەتی سـوێندی دەکەوێتـە سـەر، وە نەزرەکـەی دانامەزرێو دروست نییە کە جێبەجێی بکا، بەهیچ جۆرێ!!



# ٢٤- نامەی سوێند (كِتَابُ الأيْمَانِ)

{بڕوانە: تاج/٣، لاپەڕە: ١٣٠، زنجیرە: ١٢٣، ژمارە: ٢٤٩٨ هەتا زنجیرە: ١٣٥، ژمارە: ٢٥٤٨} + {تەجریدی بوخاری/٥، لاپەڕە: ٣٠٥، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٠٨٤ هەتا زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٠٨٥} + {فیقهی ئاسان، بەرگی دووەم، زنجیرە: ٣٧٨، لاپەڕە: ١٠٢٢ هەتا زنجیرە: ٣٨٦}.

## ٧٩٢) ڕێگرتن لەسوێند خواردن بەسەری باوكیو شتی وا. (٤٢٣٠ - ٤٢٣٨)
## بَابُ: النَّهْيُ أَنْ يَحْلِفَ بِأَبِيهِ

١٠١٠- عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قال: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ »، قَالَ عُمَرُ: فَوَاللَّهِ مَا حَلَفْتُ بِهَا مُنْذُ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) نَهَى عَنْهَا، ذَاكِرًا، وَلاَ آثِرًا. {الحديث: ٤٢٣٠ = ٤٢٢٣ فم. بخاری. أيمان ونذور: ٦٦٤٧، ٦١٠٨. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٥٠. نسائی. أيمان ونذور: ٣٧٧٦. تحفة الأشراف: ١٠٥١٨}:

ئەم فەرموودەیە لەتاجول ئوصولا ئاوایە:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) گەیشت بەدەستەیێ سوار، عومەریان تیابوو، لەوكاتەدا عومەر سوێندی بەباوكی دەخوارد، جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بانگی لێكردنو فەرمووی: (هۆشیاربن! كەخودای گەورەو مەزن قەدەغەی كردووە لەئێوە كە سوێند بخۆن بەباوو باپیرتان، وەك ئەوە بڵێن بەسەری بابم، بەگۆڕی بابم، جا ئەو كەسەی كەدەیەوێ سوێند بخوا، با یاسوێند بەخودا بخوا، یا بێ دەنگ بێو سوێند بەشتی تر نەخوات، عومەر (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: بەخودا لەوساوە كە ئەمەم لە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بیستووە كە ئەمەی قەدەغە كردووە، ئیتر هێشتا نەخۆم سوێندم پێیان خواردووەو نە لەدەمی كەسی تریشەوە سوێندی وام گێڕاوەتەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە:

٢٥٠٢ — ش/د/ت/ن = بوخاریو موسلیمو ئەبو داوودو تەرمەزیو نەسائی. پڕگۆڕی پیرۆزیان لەنووری خودابێ}.

١٠١١- عَنْ ابْنَ عُمَرَ (رَضِـيَ اللهُ عَنْهُمـا) قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ (صَـلَّى اللهُ عَلَيْـهِ وَسَلَمَ): « مَنْ كَانَ حَالِفًا فَلاَ يَحْلِفْ إِلاَّ بِاللَّهِ »، وَكَانَتْ قُرَيْشٌ تَحْلِـفُ بِآبَائِهَـا، قَـالَ: « لاَ تَحْلِفُـوا بِآبَـائِكُمْ ». {الحـديث: ٤٢٣٥ = ٤٢٢٨ فـم. تجريـد/٣، رقـم: ١٥٠٣ = ٣٨٣٦، ٢٦٧٩ = ١١٢٥ تجريد}:

ئیبنو عومەر (ڕەزای خودایان لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (هۆشیاربن! کەسێ دەیەوێ سوێند بخوات باسوێند نەخوات مەگەر بەخودا، بەغەیری خودا سوێند نەخوات).

دەستووری قوڕەیش وابوو لەسەردەمی نەزانیدا سوێندیان بەسەری باو باپیریان دەخوارد، وەك ئەوە دەیانگوت: سوێندم بەباوکم، یا بەسەری بابم، یا بەچاوی تۆ، یا وێنەی ئەمانە، پێغەمبەریش (درووودی خودای لەسەر بێ) بەم بۆنەیەوە فەرمووی: (سوێند بەباو باپیرانتان مەخۆن).

## ٧٩٣) ڕێگریی لەسوێند خواردن بەبتو شتی وا. (٤٢٣٠ - ٤٢٣٨)
## باب: النَّهْيُ عَنِ الحلْفِ بِالطَّوَاغي

١٠١٢- عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ سَمُرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تَحْلِفُوا بِالطَّوَاغِى وَلاَ بِآبَائِكُمْ ». {الحديث: ٤٢٣٨ = ٤٢٣١ فم}:

عەبدوڕەحمانی کوڕی سەموورە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درووودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێند بەبتو خودا درۆزنەکان مەخۆن، کەبەهۆی ئەوانەوە خەڵکێکی زۆر سەر لێشێواوو گومڕا بوون، هەروەها سوێند بەباو باپیرانیشتان مەخۆن).

٧٩٤) كەسێ سوێندی بەلاتو بەعوززا خوارد بابڵێ: (لا إله إلاّ اللّهُ)(٤٢٣٠ - ٤٢٣٦)
باب: مَنْ حلفَ باللاّت والعُزّى فلْيقُلْ: لا إله إلاّ اللّهُ

١٠١٣- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « مَنْ حَلَفَ مِنْكُمْ فَقَالَ فِى حَلِفِهِ بِاللاَّتِ فَلْيَقُلْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ، تَعَالَ أُقَامِرْكَ. فَلْيَتَصَدَّقْ ». وفي رواية: « مَنْ حَلَفَ بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى ». {الحديث: ٤٢٣٦ = ٤٢٢٩ فم. بخاري. تفسير: ٤٨٦٠، ٦١٠٧، ٦٣٠١، ٦٦٥٠. أبو داود. أيمان ونذور: ٣٢٤٧. ترمذي. نذور وأيمان: ١٥٤٥. نسائي. أيمان ونذور: ٣٧٨٤}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێکتان سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا، لەسەر عادەتی سەردەمی نەزانی، گوتی: بەلاتو بەعوززا، بابڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ: هیچ خودایەکی ترنییە بێجگە لەیەزدانی پاك) ئەو کەسەشی بەهاورێکەی بڵێ: وەرە باقومار بکەین، باخێرێ بکا، لەکەفارەتی ئەو قسە پیسەدا. {تاج/٣، لاپەڕە: ١٢٢، زنجیرە: ١٢٤، ژمارە: ٢٥٠٣ — ش/د/ت/ن}.

٧٩٥} إنْ شاءَ الله کردن لەکاتی سوێند خواردندا سوننەتە. (٤٢٦١ - ٤٢٦٦)
باب: استحبابُ الثنيا في اليَمِن

١٠١٤- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « قَالَ سُلَيْمَانُ بْنُ دَاوُدَ نَبِيُّ اللَّهِ عليهما السلام: لأَطُوفَنَّ اللَّيْلَةَ عَلَى سَبْعِينَ امْرَأَةً كُلُّهُنَّ تَأْتِى بِغُلاَمٍ يُقَاتِلُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ، فَقَالَ لَهُ صَاحِبُهُ أَوِ الْمَلَكُ: قُلْ إِنْ شَاءَ اللَّهُ، فَلَمْ يَقُلْ، وَنَسِيَ، فَلَمْ تَأْتِ وَاحِدَةٌ مِنْ نِسَائِهِ إِلاَّ وَاحِدَةٌ جَاءَتْ بِشِقِّ غُلاَمٍ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): وَلَوْ قَالَ: إِنْ شَاءَ اللَّهُ. لَمْ يَحْنَثْ وَكَانَ دَرَكًا لَهُ فِى حَاجَتِهِ ». {الحديث: ٤٢٦٢ = ٤٢٥٥ فم. بخاري. جهاد: ٢٨١٩، ٥٢٤٢، ٦٦٣٩، ٦٧٢٠، ٧٤٦٩. تحفة الأشراف: ١٣٥٣٥}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سولەیمان پێغەمبەر (سلاوی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: سوێندم بەخودا، ئەم شەو

دەخولێمەوە بەسەر حەفتا ژنمدا، لەگەڵیان دروست دەبم، هەموویان هەریەکی سەرو کوڕیان دەبێ، دەجەنگن لەپێناوی ئاینی خودادا).

جا فریشتەکەی هاوڕێی پێی فەرموو: بڵێ: إنْ شَاءَ اللّه: خوا حەزکا) بەڵام لەبیری چوو، ئەم وشە پیرۆزەی نەگوت، جا هیچ کام لەژنەکانی منالّیان نەبوو، تەنیا ژنێکیان نەبێ کە نیوە کوڕێکی بوو، ئەوەندە ناتەواوو کەم ئەندام بوو، دەتوت نیوە منالّە).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر سولەیمان لەکاتی ئەم سوێند خواردنەدا بیگوتبایە: خوا یاربێو خوا حەزکا هەریەکێ لەم حەفتا ژنە کوڕێکی دەبێ، لەپێناوی خودادا دەجەنگێ، ئەگەر وای بگوتبایە سوێندەکەی نەدەکەوتو ئاواتەکەشی دەهاتە دیو خودا حەفتا کوڕەکەی پێ دەداو لەپێناوی خودادا غەزایان دەکرد).

## ٧٩٦) سوێند بەپێی نیازی سوێنددەرە نەك بەپێی نیازی سوێندخۆر (٤٢٥٩ - ٤٢٦٠)

## بَابٌ: يَمِينُ الْحَالِفِ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ

١٠١٥- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ): « الْيَمِينُ عَلَى نِيَّةِ الْمُسْتَحْلِفِ ». {الحديث: ٤٢٦٠ = ٤٢٥٣ فم}:

ئەبو هورەیرە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوێند بەپێی نیازی سوێنددەرە نەوەك بەپێی نیازی سوێند خۆر). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٨، ژمارە: ٢٥١٥}.

## ٧٩٧) کەسێ بەسوێندی درۆ مافی مرۆیەکی موسوڵمان بپچڕێ بۆ خۆی ئاگری دۆزەخ بۆ خۆی مسۆگەر دەکا. (٣٥١ - ٣٥٧)

## باب: مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ وَجَبَتْ لَهُ النَّارُ

١٠١٦- عَنْ أَبِي أُمَامَةَ يعني الحارثي أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ: « مَنِ اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ فَقَدْ أَوْجَبَ اللَّهُ لَهُ النَّارَ، وَحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ »، فَقَالَ لَهُ

رَجُلٌ: يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا، قَالَ: « وَإِنْ قَضِيبًا مِنْ أَرَاكٍ ». {الحديث: ٣٥١}:

ئـەبو ئوومامـەی حـاریثی (رەزای خـودای لێ بێ) فـەرمووی: پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) فـەرمووی: (کەسێ بەسوێندی ناهەق مافی مرۆیـەکی موسوڵمان بپچڕێ، خودای گەورە ئاگری دۆزەخی بۆ پێویست دەکاو بەهەشتی لەسەر قەدەغـە دەکا). پیاوێ پێی گوت: قوربان! ئەی پێغەمبەری خودا! باشتێکی کەمیش بێ؟ فـەرمووی: (بـادار سیواکێکیش بێ).

١٠١٧- عَنْ بْنِ وَائِلِ بن حُجر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ مِنْ حَضْرَمَوْتَ، وَرَجُلٌ مِنْ كِنْدَةَ إِلَى رسول الله (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ)، فَقَالَ الْحَضْرَمِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ هَذَا قَدْ غَلَبَنِى عَلَى أَرْضٍ لِى، كَانَتْ لأَبِى، فَقَالَ الْكِنْدِيُّ: هِيَ أَرْضِى فِى يَدِى أَزْرَعُهَا، لَيْسَ لَهُ فِيهَا حَقٌّ، فَقَالَ النبي (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لِلْحَضْرَمِيِّ: « أَلَكَ بَيِّنَةٌ »؟ قَالَ: لاَ، قَالَ: « فَلَكَ يَمِينُهُ »، قَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّ الرَّجُلَ فَاجِرٌ لاَ يُبَالِى عَلَى مَا حَلَفَ عَلَيْهِ، وَلَيْس يَتَوَرَّعُ مِنْ شَيْءٍ، فَقَالَ: « لَيْسَ لَكَ مِنْهُ إِلاَّ ذَلِكَ »، فَانْطَلَقَ لِيَحْلِفَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ) لَمَّا أَدْبَرَ: « أَمَا لَئِنْ حَلَفَ عَلَى مَالِهِ لِيَأْكُلَهُ ظُلْمًا لَيَلْقَيَنَّ اللَّهَ وَهُوَ عَنْهُ مُعْرِضٌ ». {الحديث: ٣٥٦ = ٣٧٠ فم}:

وائیلی کوڕی حوجر (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی حەضرەمەوتیو پیاوێکی کیندەیی هاتنە لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) کابرای حەزرەمەوتی گوتی: ئەی پێغەمبـەری خـودا! زەوییـەکی بـاوکم هـەبوو، ئێستا بـووە بـەهی مـن، ئەمـە لێـی داگیرکـردوومو زەوتـی کـردووە بـۆ خـۆی، کـابرای کینـدەییش گـوتی: زەوی زەوی خۆمەو، وابەدەستی خۆمەوەو دایدەچێنمو مافی ئـەوی پێوە نییە. پێغەمبـەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) بە حەزرەمەوتییەکەی فەرموو: (ئایا بەڵگەو نیشانەت هەیە، کە ئـەم زەوییـە هـی تۆیـەو هـی ئـەو نییـە؟) گـوتی: نـەء. فـەرمووی: دەبـۆت هەیـە کەسـوێندی بـدەی). گـوتی: ئـەی پێغەمبـەری خـودا! ئەمـە پیاوێکـە بـەدکارە، دەربەستی سوێندخواردن نایەت لەهیچ کۆناکاتەوە!

فەرمووی: (دەهەر مافی ئەوەندەت هەیە لەسەری کە سوێندی بدەیت). جا کابراکە هەڵسا کە سوێند بخوات. حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) لەو کاتەدا کە کابرا بەرەو سوێندگاکە ملی نا، کەوا باوبوو لەسەردەمی پێغەمبەردا، لەلای مینبەرەکەی پێغەمبەرا سوێندیان دەخوارد، حەزرەت لەوکاتەدا فەرمووی: (ئەگەر سوێند بخوات لەسەر ماڵی ئەو پیاوە، تابەناڕەوا بیخوات، لەرۆژی قیامەتدا، کە دەچێتەوە دیداری خودا، خودا لووتەلا دەبێ لێی‌و رووی نازی ناداتێ). {تاج/٣، زنجیرە: ١١٤، ژمارە: ٢٤٧١ + تەجرید/٣، ژمارە: ١٠٣٦ = ٢٣٥٦}.

## ٧٩٨) ئەگەر کەسێ لەسەر شتێ سوێندی خوارد، بەڵام روانی کە سوێندەکەی بخوات باشترە، با سوێندەکەی بشکێنێ‌و چی باشە ئەوە بکات‌و کەفارەتی سوێندەکەی بدا. (٤٢٣٩ - ٤٢٥٨)

## باب: مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَى خَيْراً مِنْهَا فَلْيُكَفِّرْ وَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ

١٠١٨- عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَتَيْتُ النَّبِيَّ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) فِي رَهْطٍ مِنَ الأَشْعَرِيِّينَ نَسْتَحْمِلُهُ، فَقَالَ: « وَاللَّهِ لاَ أَحْمِلُكُمْ، وَمَا عِنْدِي مَا أَحْمِلُكُمْ عَلَيْهِ »، قَالَ: فَلَبِثْنَا مَا شَاءَ اللَّهُ، ثُمَّ أُتِيَ بِإِبِلٍ فَأَمَرَ لَنَا بِثَلاَثِ ذَوْدٍ غُرِّ الذُّرَى، فَلَمَّا انْطَلَقْنَا، قُلْنَا (أَوْ قَالَ بَعْضُنَا لِبَعْضٍ): لاَ يُبَارِكُ اللَّهُ لَنَا، أَتَيْنَا رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَسْتَحْمِلُهُ، فَحَلَفَ أَنْ لاَ يَحْمِلَنَا، ثُمَّ حَمَلَنَا، فَأَتَوْهُ فَأَخْبَرُوهُ، فَقَالَ: « مَا أَنَا حَمَلْتُكُمْ وَلَكِنَّ اللَّهَ حَمَلَكُمْ، وَإِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ ثُمَّ أَرَى خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، وَأَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ ». {الحديث: ٤٢٣٩ = ٤٢٣٢ فم. تجريد/٤، رقم: ١٦١٧ = ٤٤١٥، ٤٣٨٥. انظر رقم: ١٦١١ تجريد}:

ئەبو مووسای ئەشعەری (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: لەگەڵ دەستەیەکی ئەشعەری چووین بۆ خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) داوامان لێی کرد کە وڵاخی سواریمان بداتێ، هەتا لەخزمەتیدا بچین بۆ غەزای تەبووك، وارێکەوت لەوکاتەدا تووڕە بوو، بۆیە سوێندی خوارد کە وڵاخمان نەداتێ‌و فەرمووی: (بەخودا نە وڵاخی سواریتان پێ دەدەم‌و نە وڵاخی باری‌و نە ئەوەندە وڵاخیشم هەیە کەبیدەم بەئێوە بۆ ئەم

غەزایە سواری بن، یاتفاقی لێ بنێن). ئێمەیش ئەوەندەی حەزی خودای لەسەر بوو مایندەوە، ئیتر زۆری نەخایاند کە وشتری تالانی زۆریان بۆیهێنا، جا فەرمانی کرد کە سێ جووت وشتری دووگ سپییان پێماندا، جاکاتێ وشترەکانمان وەرگرتو ویستمان بڕۆین، گوتمان: کارێکی باشمان نەکرد، چونکە پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئاگای لەوە نەمابوو، کە سوێندی خواردووە، وە ئێمەیش ئەوەمان بەهەل زانیو یادیمان نەخستەوە، کەشتێکی واهەیە، کەواتە: خوا پیرۆزی ناکا لێمان، جامن خۆم چوومە خزمەتیو مەترسییەکەی خۆمانم عەرزی کرد، فەرمووی: (من ولاخی سواریم نەداوە بەئێوە، ئەوە لەسایەی خوداوە بوو کە ولاخی سواریی بۆرەخساندن، وەکی تریش سوێندم بەخودا، خوا حەزکا، من سوێند لەسەر هەرچی بخۆم، وە لەپاشا بۆم دەربکەوێ بەبارێکی تردا باشترە، چی باش بێ، ئەوە دەکەمو کەفارەتی سوێندەکەم دەدەم). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٤١}.

١٠١٩- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: أَعْتَمَ رَجُلٌ عِنْدَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) ثُمَّ رَجَعَ إِلَى أَهْلِهِ فَوَجَدَ الصِّبْيَةَ قَدْ نَامُوا، فَأَتَاهُ أَهْلُهُ بِطَعَامِهِ، فَحَلَفَ لاَ يَأْكُلُ مِنْ أَجْلِ صِبْيَتِهِ، ثُمَّ بَدَا لَهُ فَأَكَلَ، فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَذَكَرَ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ، فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا، فَلْيَأْتِهَا، وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ ». {الحديث: ٤٢٤٧ = ٤٢٤٠ فم}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ لەخزمەتی پێغەمبەردا مایەوە، هەتا شەو درەنگ بوو، ئەوجا گەڕایەوە بۆ ماڵەوەی بۆلای کەسوکاری، دەبینێ منداڵەکانی خەوتوون بەبێ شێو، جا ژنەکەی شێوەکەی بۆهێنا، ئەویش لەبەر پەرۆشی بۆ منداڵەکانی، سوێندی خوارد کەلێی نەخوات، لەپاشا وای بەباش زانی کە نانەکەی بخوا، جاهات بۆ خزمەتی پێغەمبەرو عەرزی کرد ئەی پێغەمبەری خودا! ئەمشەو کەڕۆشتمەوە شتێکی وا روویدا؟ پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر کەسێ سوێندی لەسەر شتێ خواردو لەئەنجاما بۆی دەرکەوت کە

بەپێچەوانەوە باشە، با باشەکە بکاو سوێندەکەی بخوات‌و کەفارەتی سوێندەکەی بدات). {تاج/٣، زنجیرە: ١٣٤، ژمارە: ٢٥٤٠ ج/٤}.

## ٧٩٩) باسی کەفارەتی سوێند. (٤٢٦٧)
## بابٌ: فِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ

١٠٢٠- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ: رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَمَ): « وَاللَّهِ لأَنْ يَلَجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِى أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِىَ كَفَّارَتَهُ الَّتِى فَرَضَ اللَّهُ ». {الحديث: ٤٢٦٧ = ٤٢٥٩ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٤٩ = ٦٦٢٤، ٢٣٨، ٨٧٦، ٨٩٦، ٢٩٥٦، ٣٤٨٦، ٦٨٨٧، ٧٠٣٦، ٧٤٩٥، ٦٦٢٥، ٦٦٢٦}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: خۆشەویست (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرمویٚ: (بەخودا ئەگەر کەسێکتان لەسەر شتێ سوێند لەکەسوکاری بخواو لەپاشا ورِکی لێ بگرێ‌و لێی پەشیمان نەبێتەوە، وەلحاڵ پەشیمان بوونەوە لەوشتە باشتربێ، ئەوە بەو پێ لێداگرتنە گوناهی زۆرتر دەگا لەلای خودا، هەتا ئەوە کەسوێندەکەی بشکێنێ‌و ئەو کەفارەتە بدا کەخودا دایناوە بۆ سوێند). {تاج/٣، زنجیرە: ١٢٦، ژمارە: ٢٥١٢}.



# ٢٥- نامەی نارِەوایی خوێن رشتنی نارِەوا باسی تۆڵە سەندنو باسی خوێنو خوێنبایی

{بروانە: تاج/٣، زنجیرە: ٨١، لاپەڕە: ٣ لەژمارە: ٢٢٨٨وە هەتا ٢٣٦٩ + تەجریدی بوخاری/٥، ژمارە: ٢٠٦٥ هەتا ژمارە: ٢٠٨٠ بەرگی/٥، لاپەڕە: ٣٢٢ + فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٣٠، زنجیرە: ٣٠٢ هەتا لاپەڕە: ٩٣٤، زنجیرە: ٣٤٦}.

## ٨٠٠) نارِەوایی خوێنوماڵو نامووس. (٤٣٥٩ - ٤٣٦٢)

## باب: تَحْرِيمُ الدِّمَاءِ وَالأَمْوَالِ وَالأَعْرَاضِ

١٠٢١- عَنْ أَبِى بَكْرَةَ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ) عَنِ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « إِنَّ الزَّمَانَ قَدِ اسْتَدَارَ كَهَيْئَتِهِ يَوْمَ خَلَقَ اللَّهُ السَّمَوَاتِ وَالأَرْضَ السَّنَةُ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ، ثَلاَثَةٌ مُتَوَالِيَاتٌ: ذُو الْقَعْدَةِ، وَذُو الْحِجَّةِ، وَالْمُحَرَّمُ، وَرَجَبٌ، شَهْرُ مُضَرَ الَّذِى بَيْنَ جُمَادَى وَشَعْبَانَ»، ثُمَّ قَالَ: أَىُّ شَهْرٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ ذَا الْحِجَّةِ »؟ قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: « فَأَىُّ بَلَدٍ هَذَا »؟ قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ الْبَلْدَةَ ؟». قُلْنَا: بَلَى، قَالَ: « فَأَىُّ يَوْمٍ هَذَا؟». قُلْنَا: اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَعْلَمُ، قَالَ: فَسَكَتَ حَتَّى ظَنَنَّا أَنَّهُ سَيُسَمِّيهِ بِغَيْرِ اسْمِهِ، قَالَ: « أَلَيْسَ يَوْمَ النَّحْرِ ؟». قُلْنَا: بَلَى يَا رَسُولَ اللَّهِ، قَالَ: « فَإِنَّ دِمَاءَكُمْ وَأَمْوَالَكُمْ (قَالَ مُحَمَّدٌ: وَأَحْسِبُهُ قَالَ) وَأَعْرَاضَكُمْ، حَرَامٌ عَلَيْكُمْ كَحُرْمَةِ يَوْمِكُمْ هَذَا، فِى بَلَدِكُمْ هَذَا، فِى شَهْرِكُمْ هَذَا، وَسَتَلْقَوْنَ رَبَّكُمْ، فَيَسْأَلُكُمْ عَنْ أَعْمَالِكُمْ، فَلاَ تَرْجِعُنَّ بَعْدِى ضُلاَّلاً يَضْرِبُ بَعْضُكُمْ رِقَابَ بَعْضٍ، أَلاَ لِيُبَلِّغِ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ، فَلَعَلَّ بَعْضَ مَنْ يُبَلَّغُهُ يَكُونُ أَوْعَى لَهُ مِنْ بَعْضِ مَنْ سَمِعَهُ ». ثُمَّ قَالَ: « أَلاَ هَلْ بَلَّغْتُ »؟ {الحديث: ٤٣٥٩ = ٤٣٥١ فم. تجريد/١، رقم: ٦٠ = ٦٧، ١٠٥، ١٧٤١، ٣١٩٧، ٤٤٠٦، ٤٦٦٢، ٥٥٥٠، ٧٠٧٨، ٧٤٤٧. تحفة الأشراف: ١١٦٨٢}:

ئەبو بەكرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) لەو حەجەدا، كە لەپاش كۆچ كردی، كە ناوداره بە حەجی ماڵاوایی، لە وتارێكدا فەرمووی: (چەرخ چووەتەوە دۆخی جارانی خۆیو، زەمان هەڵسووڕاوەتەوە سەر ئەو شێوەیەی خۆی، كە خودای گەورە ئاسمانەكانو زەوی دروست كردو شەوو رۆژو مانگو ساڵی دانا، ئیمساڵ ساڵ بووەتەوە بەدوانزە مانگو هەموو مانگێ لەدوانزە مانگەی خودا كەوتۆتەوە شوێنی راستەقینەی خۆیو (نەسیئ) نەما، وە وەك سەردەمی پێغەمبەرەكان (درودی خودا لە پێغەمبەری خوداو گشت پێغەمبەرەكانی تر بێ) ئەوەی رەوایە بووەتەوە بەرەواو ئەوەی نارەوایە بووەتەوە بەنارەوا، وە ئەو گۆڕانو دەستكاریی شەریعەتە كە لەسەردەمی نەزانیدا كرابوون، هەموو راست كرانەوە، وە ئەو مانگانە چواریان مانگی حەرامنو خاوەن رێزو قەدرو نرخنو لەبەرئەوە شەڕو شۆڕو هەراو جەنگیان زۆر تیا حەرامە، وە ئەم چوار مانگە سیانیان بەرودوانو بەشوێن یەكادێن، كەناو جەژنانو نۆمینەو موحەڕەمن، ئەوی تریشیان تەنیایە، كە مانگی رەجەبە كە مەشهووره بە رەجەبی هۆزی موضەر، لەبەرئەوە كەهۆزی موضەر زۆر قەدری ئەم مانگە دەگرن، كە دەكەوێتە بەینی جومادای دووەمو كوڵە مانگەوە).

ئەوجا خۆشەویست فەرمووی: (ئەم مانگە چ مانگێكە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن. فەرمووی: جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) ماوەیێ خامۆش بوو، تەنانەت خامۆشییەكەی وا درێژەی كێشا زەینمان بۆئەوە چوو كەناوەكەی بگۆڕێو ناوێ تری لێ بنێ، بەڵام فەرمووی: (ئەرێ ئەمە مانگی نۆمینەی حاجیان نییە كە حەجی تیادەكرێ؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: جادیسان ماوەیێ تر بێ دەنگ بوو، تەنانەت زەینمان بۆ ئەوە چوو كەناوەكەی بگۆڕێو ناوێكی تری لێ بنێ. فەرمووی: (ئەرێ ئەمە شاری مەككە نییە؟) گوتمان: بەڵێ خۆیەتی. فەرمووی: (ئەی ئەم رۆژە چ رۆژێكە؟) گوتمان: خوداو پێغەمبەری خودا باشتری لێ دەزانن، فەرمووی: دیسان ماوەیەكی تر

خامۆش بوو، دیسان گومانمان بۆئەوە چوو کەناوەکەی بگۆڕیّو ناوێکی تری لیّ بنیّ. بەڵام فەرمووی: (دیارە کە ئەمە ڕۆژی جەژنی قوربانە کە قوربانی تیادا دەکریّ) گوتمان: بەڵیّ ئەوە، ئەی پێغەمبەری خودا! فەرمووی: (دەی باش بزانن، کە سەرو ماڵو نامووستان بەیەکتری حەرامە، وەك چۆن شکاندی ڕێزی ئەم ڕۆژەتان حەرامە ئاوا، بەتایبەتی ئەگەر شکاندنی ڕێزی ئەم ڕۆژەتان لەم شارەتانابیّو لەم مانگەشتانا بیّ). فەرمووشی (دروودی خودای لەسەر بیّ): (وە بەزوویش دەچنەوە بەردیوانی خودای پەروەردگارتان، یەکە یەکە پرسیارتان لیّ دەکا، سەبارەت بەکارو کردەوەکانتان، جا نەکەن پاش مەرگی من بگەڕێنەوە سەر حاڵی پێشینتانو گومڕاو سەرلێشێواو ببنەوەو وەك جاری جاران ببنەوە بەهۆزی خۆ خۆرو بەشیر گەردنی یەکتری ببەڕێنن، هۆشیاربن، با ئامادەبوانی ئەم وتارو ڕیّو ڕەسمانە خۆیان لەبەریان بکەنو رایان بگەیەنن بەکەسانیّ کە ئێستا لێرە نینو نادیارن، چونکە ئومێدە هەندیّ کەس لەوانەی کەئەم فەرموودەو فەرمایشتانەیان پیّ رادەگەیەنریّ، باشتر تێی بگەنو وەری بگرن لەو کەسانەی کە بەگوێی خۆیان دەیانبیستن).

لەپاشا فەرمووی: (دەی ئەوا من ئەرکی سەرشانی خۆمم ڕاگەیاند). {تاج/٢، زنجیرە: ١١٢، ژمارە: ١٦٠٩}.

## ٨٠١) لەرۆژی قیامەتدا یەکەم شت کەئادەمیزاد دادگایی دەکریّ لەسەری، پرسی خوێن ڕشتنە. (٤٣٥٧ - ٤٣٥٨)

## باب: أَوَّلُ مَايُقْضَى يَوْمَ القِيامَةِ في الدِّماءِ

١٠٢٢- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَوَّلُ مَا يُقْضَى بَيْنَ النَّاسِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ فِى الدِّمَاءِ ». {الحديث: ٤٣٥٧ = ٤٣٤٩ ف.م = فم = فتح الملهم. تجريد = مختصر صحيح البخارى/ ٥، رقم: ٢٠٣١ = ٦٥٣٣، ٦٨٦٤. ترمذى. ديات: ١٣٩٦. نسائى. تحريم الدم: ٤٠٠٣}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لیّ بیّ) فەرمووی: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بیّ) فەرمووی: (لەرۆژی قیامەتدا، یەکەم شت کە ئادەمیزاد لەسەری دادگایی دەکریّ،

پرسی خوێن رشتن‌و مرۆڤ بەنارەوا کوشتنە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، لاپەرە: ٤، ژمارە: ٢٢٨٨ ج/٤ + ریاض/٤، لاپەرە: ١٣٣٤، زنجیرە: ٣٧٠، ژمارە: ١٨٤٥/٣٨}.

## ٨٠٢) بەچی رشتنی خوێنی مرۆی موسوڵمان رەوا دەبێ؟ (٤٣٥١ - ٤٣٥٤)

## بابُ: مايُحِلُّ دَمَ الرَّجُلِ المُسْلِم

١٠٢٣- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّـهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ يَحِلُّ دَمُ امْرِئٍ مُسْلِمٍ يَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللَّـهُ، وَأَنِّـي رَسُولُ اللَّـهِ إِلاَّ بِإِحْدَى ثَـلاَثٍ: الثَّيِّـبُ الزَّانِـي، وَالـنَّفْسُ بِـالنَّفْسِ، وَالتَّـارِكُ لِدِينِـهِ الْمُفَـارِقُ لِلْجَمَاعَـةِ ». {الحديث: ٤٣٥١ = ٤٣٤٣ فم. تجريد/٥، رقم: ٢٠٧٦ = ٦٨٧٨. أبو داود. حدود: ٤٣٥٢. ترمذي. ديات: ١٤٠٣. نسائي. تحريم الدماء: ٤٠٣٧. تحفة الأشراف: ٩٥٦٧}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (رەزای خودای لێ بێ) دەفەرموێ: خۆشەویست (درووودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەر موسوڵمانێ شایەتمان بهێنێ‌و بڵێ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلـهَ إِلاَّ اللّـهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحمداً رَسُولُ اللّـهِ: بەدڵ باوەڕدەکەم‌و بەزمان دەڵێم‌و شایەتی دەدەم کە هەرخودا خودایەو بەس، خودای تر نییە، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵایش پێغەمبەری رەوانەکراوی خودایە). هەرکەسێ ئەم شایەتییە بدا، ئیتر خوێنی ئەوکەسە حەرامەو بەهیچ شێوەیێ خوێنی بەکەس رەوانابێ، مەگەر لەیەکێ لەم سێ کاتانەدا نەبێ: بێوەی داوێنپیس، چ ژن بێ، چ پیاو، یاکەسێ بەنارەوا کەسێ بەقەستی بکوژێ، یا لەئایینی خۆی وەرگەڕێ‌و لە کۆمەڵەی موسوڵمانان تەرابێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٥}.

## ٨٠٣) بریاری کەسێ لەئیسلام وەرگەڕێ‌و دژی ئیسلام شەڕبکاو خەڵک بکوژێ. (٤٣٢٩ - ٤٣٣٦)

## بابُ: الحُكْمُ فِيمَنْ يَرْتَدُّ عَنِ الإِسْلامِ ويَقْتُلُ ويُحارِبُ

١٠٢٤- عَنْ أَنَسْ بن مَالِك (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ نَفَرًا مِنْ عُكْلٍ ثَمانِيَةً قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَبَـايَعُوهُ عَلَـى الإِسْـلامِ، فَاسْـتَوْخَمُوا الأَرْضَ، وَسَـقُمَتْ

أَجْسَامُهُمْ فَشَكَوْا ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ: « أَلاَ تَخْرُجُونَ مَعَ رَاعِينَا فِى إِبِلِهِ فَتُصِيبُونَ مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا »؟ فَقَالُوا: بَلَى، فَخَرَجُوا فَشَرِبُوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا، فَصَحُّوا، فَقَتَلُوا الرَّاعِىَ، وَطَرَدُوا الإِبِلَ، فَبَلَغَ ذَلِكَ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَبَعَثَ فِى آثَارِهِمْ، فَأُدْرِكُوا فَجِىءَ بِهِمْ، فَأَمَرَ بِهِمْ فَقُطِعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ، وَسُمِرَ أَعْيُنُهُمْ، ثُمَّ نُبِذُوا فِى الشَّمْسِ حَتَّى مَاتُوا. {الحديث: ٤٣٣٠ = ٤٣٢٢ فم. تجريد/١، رقم: ١٧٦ = ٢٣٣، ١٥٠١، ٣٠١٨، ٤١٩٢، ٤١٩٣، ٤٦١٠، ٥٦٨٥، ٥٦٨٦، ٥٧٢٧، ٦٨٠٢، ٦٨٠٣، ٦٨٠٤، ٦٨٠٥، ٦٨٩٩. أبو داود. حدود: ٤٣٦٤. نسائي. تحريم الدم: ٤٠٣٦. تحفة الأشراف: ٩٤٥}:

ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: تاقمێ لەهۆزی عوكل، ژمارەیان هەشت كەس بوو، هاتنە خزمەتی حەزرەتو موسوڵمان بوونو پەیمانیان دا بە پێغەمبەر، لەسەر پابەندبوون بەئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە، پاش ماوەیێ هەوای مەدینەیان پێ نەكەوت، جەستەیان دەرداوی بوو، سكاڵای ئەوەیان لای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) كرد، فەرمووی: (كە لەگەڵ شوانەكەی ئێمەدا، بچن بۆ دەرەوەی مەدینە، بۆ ناو رانە وشترە زەكاتەكانو لەوێ بۆ دەرمان لە گمێزو شیری وشترەكان بخۆن، هەتا سكتان دەكەوێتە ڕێو لەو نەخۆشینە رزگارتان دەبێ).

ئەوانیش گوتیان: بەڵێ باشەو، وەهایانكردو لەگەڵ شوانی وشترەكانا دەرچوونو لەگمێزو لەشیری وشترەكانیان خواردەوەو چاكبوونەوە، كەچی نامەردو بێ پەیمان دەرچوونو رۆژێ لەڕۆژان لەئیسلام وەردەگەڕێنو سەرەڕای ئەوەیشە شوانەكەی پێغەمبەر زۆر بەبێ نەزاكەت دەكوژن، دەستو پێی دەبڕنو دڕك ئەكەن بەچاویدا، تادەمرێ! ئینجا وشترەكانیش دەدەنە بەرو دەیان فڕێنن بۆ وڵاتی خۆیان، كاتێ پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بەم كارەساتەی زانی، كۆمەڵێ پیاوی نارد بەشوێنیاناو لەڕێ دەیانگرنەوەو دیلیان دەكەنو دەیانهێننەوە بۆ مەدینە. جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) چاوەڕێی فەرمانی خودای كرد، تا ئایەتی سیو سێ لەسوورەتی مائیدە هاتە خوارەوە، ئەوجا بەپێی ئەو ئایەتە، حەزرەت فەرمانی كرد

دەستو پایان بڕینو بەبسماری سوورەوە کراو چاویان ڕشتن، لەپاشیشا برینەکانیان نەبرژاندنەوەو تیماریان نەکردن بەڵکوو تووڕیان دانە ناو خڕە بەرداوییەکەوە لەدەرەوەی شار، کەپێی دەگوترێ: ئەلحەررە، داوای ئاویان دەکردکەس ئاوی نەدەدانێ، هەتا مردن!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، لاپەڕە: ٣٠، ئایەتی: {إِنَّمَا جَزَاءُ الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَادًا ...} + {تاج/٣، زنجیرە: ٨٨، ژمارە: ٢٣٣٧}.

## ٨٠٤) تاوانی ئەو کەسەی کەپیاو کوشتنی داهێنا. (٤٣٥٥ - ٤٣٥٦)
## بابٌ: إِثْمُ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ

١٠٢٥- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن مسعود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « لاَ تُقْتَلُ نَفْسٌ ظُلْمًا إِلاَّ كَانَ عَلَى ابْنِ آدَمَ الأَوَّلِ كِفْلٌ مِنْ دَمِهَا لأَنَّهُ كَانَ أَوَّلَ مَنْ سَنَّ الْقَتْلَ ». {الحديث: ٤٣٥٥ = ٤٣٤٧ فم. تجريد/٤، رقم: ١٣٤٠ = ٣٣٣٥، ٦٨٦٧، ٧٣٢١ فتح الباري. ترمذي. علم: ٢٦٧٣. نسائي. تحريم الدم: ٣٩٩٦. تحفة الأشراف: ٩٥٦٨}:

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود (ڕەزای خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) دەفەرموێ: (هەرکەسێ بەناڕەوا بکوژرێ، بەشێ لەئۆباڵی خوێن ڕشتنەکەی بە ئەستۆی کوڕە پێشووەکەی ئادەمە، واتە بەملی قابیلی کوڕی ئادەمە، کەهابیلی برای کوشت، چونکە ئەو یەکەم کەس بوو کەپیاو کوشتنی داهێنا). وەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا لەسوورەتی مائیدەدا، لەئایەتی سییەمدا دەفەرموێ: {فَطَوَّعَتْ لَهُ نَفْسُهُ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُ فَأَصْبَحَ مِنَ الْخَاسِرِينَ}

واتە: دەروونی پیسی قابیل، کوشتنی هابیلی برایی لەبەرچاوی جوان کرد، وەکوشتی، ئیتر قابیل بەم کردەوە ناشیرینو ناپەسەندە بوو بەپیاوێکی زیانباری پیاو کوژی دۆڕاو لەهەردوو جیهاندا). {تاج/٣، زنجیرە: ٨١، ژمارە: ٢٢٨٧}.

## ٨٠٥) سزای كەسێ خۆكوژیی بكاو خۆی بكوژێ، بەچی خۆی بكوژێ بەوە لەناو دۆزەخا ئازار دەدرێ. (٢٩٦ - ٣٠٤)

## بابٌ: مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِشَيْئٍ عُذِّبَ بِهِ فِي النَّارِ

١٠٢٦- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَنْ قَتَلَ نَفْسَهُ بِحَدِيدَةٍ، فَحَدِيدَتُهُ فِي يَدِهِ يَتَوَجَّأُ بِهَا فِي بَطْنِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ شَرِبَ سَمًّا فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَحَسَّاهُ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا، وَمَنْ تَرَدَّى مِنْ جَبَلٍ فَقَتَلَ نَفْسَهُ فَهُوَ يَتَرَدَّى فِي نَارِ جَهَنَّمَ، خَالِدًا مُخَلَّدًا فِيهَا أَبَدًا ». {الحديث: ٢٩٦ = ٣١٢ فم}:

**ئەبو هورەیرە** (رەزای خودای لێ بێ) **فەرمووی: خۆشەویست** (دروودی خودای لەسەر بێ) **دەفەرموێ:** (كەسێ بەپارچە ئاسنێ خۆی بكوژێ، ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا ئەو پارچە ئاسنە دەگرێ بەدەستیەوەو خۆش خۆش دەیكا بەورگی خۆیا، ئیتر هەتا هەتایە، لەئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو ئەوە حاڵیەتی، وەكەسێ زەهر بخواتەوەو بەزەهر خۆی بكوژێ، ئەوە لەئاگری دۆزەخیشا زەهرەكەی هەروا لەناوی دەستیاو پەیتا پەیتا دەیخواتەوەو هەتا هەتایە، بە ئێجگاری لەئاگری دۆزەخدا دەبێو هەمیشەیش ئەمە حاڵو كارو پیشەی دەبێ! وەكەسێ لە كێوێكەوە، یا لەبەرزاییەكەوە خۆی بەربداتەوەو خۆی بكوژێ، ئەوە هەمیشە لەو كێوەوە خۆی هەڵدەداتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو هەتا هەتایە ئەوە كارو پیشەیەتیو بەئێجگاری تیا دەمێنێتەوە).

١٠٢٧- عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُما): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) الْتَقَى هُوَ وَالْمُشْرِكُونَ، فَاقْتَتَلُوا، فَلَمَّا مَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَى عَسْكَرِهِ، وَمَالَ الآخَرُونَ إِلَى عَسْكَرِهِمْ، وَفِي أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) رَجُلٌ لاَ يَدَعُ لَهُمْ شَاذَّةً ولا فاذَّة إلاَّ اتَّبَعَهَا، يَضْرِبُهَا بِسَيْفِهِ، فَقَالُوا: مَا أَجْزَأَ مِنَّا الْيَوْمَ أَحَدٌ كَمَا أَجْزَأَ فُلاَنٌ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَا إِنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ »! فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ: أَنَا صَاحِبُهُ أَبَدًا، قَالَ: فَخَرَجَ مَعَهُ، كُلَّمَا وَقَفَ، وَقَفَ مَعَهُ، وَإِذَا أَسْرَعَ، أَسْرَعَ مَعَهُ، قَالَ: فَجُرِحَ الرَّجُلُ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ، وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَى سَيْفِهِ، فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ

إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فَقَالَ: أَشْهَدُ أَنَّكَ رَسُولُ اللَّهِ، فَقَالَ: « وَمَا ذَاكَ »؟ قَالَ: الرَّجُلُ الَّذِي ذَكَرْتَ آنِفًا أَنَّهُ مِنْ أَهْلِ النَّارِ فَأَعْظَمَ النَّاسُ ذَلِكَ، فَقُلْتُ: أَنَا لَكُمْ بِهِ، فَخَرَجْتُ فِي طَلَبِهِ حَتَّى جُرِحَ جُرْحًا شَدِيدًا، فَاسْتَعْجَلَ الْمَوْتَ، فَوَضَعَ نَصْلَ سَيْفِهِ بِالأَرْضِ وَذُبَابَهُ بَيْنَ ثَدْيَيْهِ، ثُمَّ تَحَامَلَ عَلَيْهِ فَقَتَلَ نَفْسَهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عِنْدَ ذَلِكَ: « إِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ الْجَنَّةِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ النَّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَعْمَلُ عَمَلَ أَهْلِ النَّارِ، فِيمَا يَبْدُو لِلنَّاسِ، وَهُوَ مِنْ أَهْلِ الْجَنَّةِ ». {الحديث: ٣٠٢ = ٣١٨ فم. تجريد/٤، رقم: ١٥٧١ = ٤٢٠٣، ٤٢٠٢، ٤٢٠٧، ٦٤٩٣، ٦٦٠٣. تحفة الأشراف: ٤٧٨٠ ، ٤٧٨٧}:

سەهلی کوڕی سەعدی ئەل‌ساعیدی (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پێغەمبەرو سوپاکەی لەگەڵ دوژمنی هاوبەشپەیداکارانا، ئاوقەدی یەکتری بوونو بوو بەجەنگو کوشتار لەنێوانیاندا، جا کاتێ هەردوولا بەرەو بەرەی خۆیان کشانەوە، پیاوێ هەبوو لەناو یارانی پێغەمبەردا، لەکاتی شەڕەکەدا، بەرەنگاری هەریەکێ لە لەشکری دوژمن ببوایە بوارەی نەدەدا، بە شمشێر دایدەگرت. یارانی پێغەمبەر (دروودی خودا لە پێغەمبەرو ڕەزای خودا لەیارانی بێ) فەرموویان: بەڕاستی ئەمڕۆ فیسارەکەس فریامان کەوت، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەی ئەو زەلامە لە ئەهلی دۆزەخە). پیاوێ لە موسوڵمانان فەرمووی: دەبێ من دوای بکەومو ئەم هۆ نهێنییەی کەدەبێ بەهۆی چوونە دۆزەخی بدۆزمەوە!

فەرمووی: جا شوێنی دەکەوێ لەکاتی شەڕکردنو هەڵمەتبردندا، پیاوە ئازاکە لەکوێ دەوێستێ، ئەویش لەوێ لەگەڵی دەوێستێ، لەکوێ خێرا دەڕوا ئەویش لەوێ خێرا دەڕوا، جا لەکاتی شەڕو هەراو پێکهەڵپڕژانا، پیاوە ئازاکە زامار دەکرێو زامێکی سەختی لێ دەکرێ، جا پەلە لەمەرگی خۆی دەکا، مشتووی شمشێرەکەی لەسەر زەوییەکە دادەنێو نووکەکەی لەنێوانی هەردوو مەمکیدا دادەنێو ئەوجا بەهەموو هێزی خۆی بە حوججەت خۆی دەدا بەسەر شمشێرەکەیداو خۆی دەکوژێ!

جا پیاوەکەی کە شوێنی کەوتبوو هاتەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ)و عەرزیکرد: شایەتی بەهەق دەدەم کەتۆ پێغەمبەری رەوانەکراوی خودای بۆ سەر بەرەی ئادەمیزاد، فەرمووی: (چۆن). گوتی: چونکە ئەوەی کە فەرمووت لەبارەی ئەو پیاوەوە هاتەدی، ئەوەبوو کەتۆ فەرمووت ئەو پیاوە لەخەڵکی دۆزەخە، خەڵکەکە ئەوەیان لەلا زەحمەتو ئەستەم بوو، چۆن چۆنی ئەو ئەوەندە ئازاو سوودمەندبێ بۆ سوپای ئیسلام کەچی دۆزەخی بێت؟!

منیش پێیانم گوت: لێی گەڕێن بۆ منو من ئەم مەتەڵەتان بۆ هەڵ دەهێنمو ئەم نهێنییەتان بۆ دەردەخەم، ئیتر شوێنی کەوتم، جا پیاوە چۆن چۆنی زامار بوو، وەچۆن چۆنی خۆی کوشت، ئاوا لەنووکەوە گێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) جا پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) پاش بیستنی ئەم داستانە فەرمووی: (پیاوی واهەیە کردارو رەفتاری وەك کردارو رەفتاری بەهەشتیی وایە، لەخەڵك وایە بەهەشتییە، بەڵام خۆی دۆزەخییە، پیاوی وایش هەیە بە پێچەوانەوە، لەخەڵك وایە کە دۆزەخییە، بەڵام خۆی بەهەشتییە). خودا بمانپارێزێ لەشتی وا). {بڕوانە: تاج/١، لاپەڕە: ٤٠، زنجیرە: ٦ فەرموودەی چوارەم چاپی یەکەم = ژمارە: ٣٧، ٣٨، ٣٩، ٤٠، ٤١، تاج/١، چ/٤}.

## ٨٠٦) کەسێ بە بەردو شتی وا کەسێ بکوژێ، بەهەمان شت دەکوژرێتەوە. (٤٣٣٧ - ٤٣٤١)

## بابٌ: مَنْ قَتَلَ بِحَجَرٍ قُتِلَ بِمِثْلِهِ

١٠٢٨- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ جَارِيَةً وُجِدَ رَأْسُهَا قَدْ رُضَّ بَيْنَ حَجَرَيْنِ، فَسَأَلُوهَا مَنْ صَنَعَ هَذَا بِكِ؟ فُلاَنٌ؟ فُلاَنٌ؟ حَتَّى ذَكَرُوا يَهُودِيًّا؟ فَأَوْمَأَتْ بِرَأْسِهَا، فَأُخِذَ الْيَهُودِيُّ فَأَقَرَّ، فَأَمَرَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنْ يُرَضَّ رَأْسُهُ بِالْحِجَارَةِ. {الحديث: ٤٣٤١ = ٤٣٣٣ فم. ٣/، رقم: ١٠٥٣ = ٢٤١٣، ٢٧٤٦، ٥٢٥٩، ٦٨٧٦، ٦٨٧٧، ٦٨٧٩، ٦٨٨٤، ٦٨٨٥. ترمذي. ديات: ١٣٩٤. نسائي. قَسَامَة: ٤٧٥٦. ابن ماجة. ديات: ٤٧٥٦. تحفة الأراف:١٣٩١}:

پێشەوا ئەنەسی کوڕی مالیك (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێکی جوولەکە، لەسەر هەنێ خشڵ، لەنێوانی دوو بەرددا سەری کچۆڵەیەکی ئەنصاری شکاندبوو، لەپاشا تووری دابووە ناو بیرێکەوە، کاتێك دۆزیانەوە هێشتا نیوە گیانێکی تیادامابوو، جالێیان دەپرسی: کێ وای لێ کردی؟ ئایا فیسارە کەس بوو؟ ئایا ئەمبوو؟ ئایا ئەو بوو؟ تاناوی کابرایەکی جوولەکەیان هێناو گوتیان: ئایا فیسارە جوولەکە وای لێ کردوویت؟ ئەویش سەری لەقاندو بەسەری ئاماژەی کرد، ئا ئەو وای لێ کردووم، جا کابرای جووەیان هێناو، پێی لەتاوانی خۆی ناو ددانی بەکارەکەدا ناو چووە ژێری، پێغەمبەریش (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمانیدا، لەنێوانی دوو بەرددا سەری ئەویشیان شکاندو لەباتی کچۆڵە ئەنصارییەکە کوشتیانەوە). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٢، چ/٤}.

## ٨٠٧) کەسێ دەستی پیاوێ بگەزێو ئەویش لەتاوانا دەستی خۆی راپسکێنێو دوو ددانی بکەوێنێ. (٤٣٤٢ - ٤٣٤٩)

## بَابٌ: مَنْ عَضَّ يَدَ رَجُلٍ فَانْتَزَعَهُ

١٠٢٩- عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ (رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما): أَنَّ رَجُلاً عَضَّ يَدَ رَجُلٍ، فَانْتَزَعَ يَدَهُ، فَسَقَطَتْ ثَنِيَّتُهُ أَوْ ثَنَايَاهُ، فَاسْتَعْدَى رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « مَا تَأْمُرُنِي؟ تَأْمُرُنِي أَنْ آمُرَهُ أَنْ يَدَعَ يَدَهُ فِي فِيكَ تَقْضَمُهَا كَمَا يَقْضَمُ الْفَحْلُ؟! ادْفَعْ يَدَكَ حَتَّى يَعَضَّهَا، ثُمَّ انْتَزِعْهَا ». {الحديث: ٤٣٤٦ = ٤٣٣٨ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢١٩ = ٢٩٧٣، ١٨٤٨، ٢٢٦٩، ٤٤١٧، ٦٨٩٣}:

عیمرانی کوڕی حوصەین (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: پیاوێ دەستی پیاوێ دەگەزێ، ئەویش لەتاوانا، کەدەستی خۆی رادەپسکێنێ لەدەمی کابرای گازگر، دوو ددانی پێشینەی کابرا لەگەڵ دەستیا دەکەون! جا بۆ دادخوایی و سکاڵا هاتنە خزمەتی حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (چیت لەمن دەوێ؟ دەتەوێ لەمن کەمن پێی بڵێم: واز لەدەستی بێنێ لەدەمی تۆدا، تۆ وەك نێرە وشتر پەنجەی بکرۆژی؟ دەی باشە من بەتۆ دەڵێم: تۆ پەنجەی خۆت بدەبەو، بادایکرۆژێ، ئایا لەکاتی وادا تۆ

دەستی خۆت راناپسکێنی؟ دەی ئەویش وەك تۆ، کەواتە خوێنت ناکەوێ). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٧، ژمارە: ٢٣٣٠، ج/٤}.

## ٨٠٨) تۆڵەی برین مەگەر خۆیان بەخوێن رازی بن. (٤٣٥٠)

## بابٌ: القصاصُ مِنَ الجِراحِ إلاَّ أنْ يَرْضَوا بالدِّيَةِ

١٠٣٠- عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ): أَنَّ أُخْتَ الرُّبَيِّعِ أُمَّ حَارِثَةَ جَرَحَتْ إِنْسَانًا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « الْقِصَاصَ الْقِصَاصَ »، فَقَالَتْ أُمُّ الرَّبِيعِ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَيُقْتَصُّ مِنْ فُلاَنَةَ؟ وَاللَّهِ لاَ يُقْتَصُّ مِنْهَا، فَقَالَ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « سُبْحَانَ اللَّهِ! يَا أُمَّ الرَّبِيعِ، الْقِصَاصُ كِتَابُ اللَّهِ »، قَالَتْ: لاَ وَاللَّهِ لاَ يُقْتَصُّ مِنْهَا أَبَدًا، قَالَ: فَمَا زَالَتْ حَتَّى قَبِلُوا الدِّيَةَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّ مِنْ عِبَادِ اللَّهِ مَنْ لَوْ أَقْسَمَ عَلَى اللَّهِ لأَبَرَّهُ ».
{الحديث: ٤٣٥٠ = ٤٣٤٢ فم. تجريد/٣، رقم: ١١٥٦ = ٢٨٠٦، ٢٨٠٥، ٤٠٤٨، ٤٧٨٣}:

ئەنەس (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: ئوممو حاریسەی خوشکی روبەییع، کەسێکی زامارکردبوو، ددانێکی شکاندبوو، بۆ داد پرسی چوونە خزمەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (دەشێ لە تۆڵەی ئەوەدا تۆڵە لەمیش بسەندرێ، بەڵام دایکی رەبیع فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا! تۆڵە لەفیسار دەسێنرێ؟ بەو خودایە ئومێد بەکەرەمی خودا، خوا حەزکا، خوایاربێ، شتی وانابێ، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (سوبحانەڵلا!! ئەی دایکی رەبیع! تۆڵە سەندن لەکاتی وادا، فەرمانی قورئانە کەنامەی خودایە، ئوممو رەبیعیش گوتی: بەو خودایە شتی وانەبووەو نەدەبێ. گوتی: ئیتر ئەو ژنە هەروازی نەهێناو کۆڵی نەدا هەتا کەسوکاری ددان شکاوەکە بەخوێن رازی بوونو برێ ماڵیان لەخوێنی ددانەکەدا وەرگرتو وازیان لەتۆڵە سەندن هێنا، ئەوجا حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێ) بۆ پەسنی جوانی دایکی رەبیع فەرمووی: (هەندێ لەبەندەکانی خودا ئەوەندە لەلای خودا نازدارو خۆشەویستو خاتردارن، ئەگەر بەئومێدی لوتفی خودا، سوێند لەسەر شتێ

بخۆن، خودای گەورە سوێندیان ناخاتو ئەو شتە بەدڵی ئەوان دەکا). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٢، ژمارە: ٢٣٠٤، چ/٤} . {فیقهی ئاسان/٢، زنجیرە: ٣٠٦} .

## ٨٠٩) کەسێ پێ لەکوشتنی کەسێ بنێ دەکوژرێتەوە مەگەر خاوەن خوێنەکە چاوپۆشی لێ بکاو لێی خۆش بێ. (٤٣٦٣ - ٤٣٦٤)

## باب: مَنْ أَقَرَّ بِالقَتْلِ فَأَسْلَمَ إِلَى الوَلِيِّ فَعَفَى عَنْهُ

١٠٣١- عَنْ عَلْقَمَةَ بْنَ وَائِلٍ أَنَّ أَبَاهُ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) حَدَّثَهُ قَالَ: إِنِّي لَقَاعِدٌ مَعَ النَّبِيِّ (صلى الله عليه وسلم)، إِذْ جَاءَ رَجُلٌ يَقُودُ آخَرَ بِنِسْعَةٍ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ: هَذَا قَتَلَ أَخِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَقَتَلْتَهُ »؟ (فَقَالَ: إِنَّهُ لَوْ لَمْ يَعْتَرِفْ أَقَمْتُ عَلَيْهِ الْبَيِّنَةَ) قَالَ: نَعَمْ، قَتَلْتُهُ، قَالَ: « كَيْفَ قَتَلْتَهُ »؟ قَالَ: كُنْتُ أَنَا وَهُوَ نَخْتَبِطُ مِنْ شَجَرَةٍ، فَسَبَّنِي، فَأَغْضَبَنِي، فَضَرَبْتُهُ بِالْفَأْسِ عَلَى قَرْنِهِ فَقَتَلْتُهُ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ (صلى الله عليه وسلم): « هَلْ لَكَ مِنْ شَيْءٍ تُؤَدِّيهِ عَنْ نَفْسِكَ »؟ قَالَ: مَا لِي مَالٌ إِلاَّ كِسَائِي وَفَأْسِي، قَالَ: « فَتَرَى قَوْمَكَ يَشْتَرُونَكَ »؟ قَالَ: أَنَا أَهْوَنُ عَلَى قَوْمِي مِنْ ذَاكَ، فَرَمَى إِلَيْهِ بِنِسْعَتِهِ، وَقَالَ: « دُونَكَ صَاحِبَكَ »، فَانْطَلَقَ بِهِ الرَّجُلُ، فَلَمَّا وَلَّى قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنْ قَتَلَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ »، فَرَجَعَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ بَلَغَنِي أَنَّكَ قُلْتَ: « إِنْ قَتَلَهُ فَهُوَ مِثْلُهُ »، وَأَخَذْتُهُ بِأَمْرِكَ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « أَمَا تُرِيدُ أَنْ يَبُوءَ بِإِثْمِكَ وَإِثْمِ صَاحِبِكَ »؟ قَالَ: يَا نَبِيَّ اللَّهِ (لَعَلَّهُ قَالَ) بَلَى. قَالَ: « فَإِنَّ ذَاكَ كَذَاكَ ». قَالَ: فَرَمَى بِنِسْعَتِهِ، وَخَلَّى سَبِيلَهُ. {الحديث: ٤٣٦٣ = ٤٣٥٥} :

عەلقەمەی کوڕی وائیل (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: باوکم گێڕایەوە بۆم، فەرمووی: ڕۆژێ خۆم لەخزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێ) دانیشتبووم، لەناکاو پیاوێ، بەپەتێکی چەرمین، پیاوێکی تری سنك کردبوو، بەکێشی دەکردوو هێنای بۆلای پێغەمبەر، گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەم کابرایە برایەکی منی کوشتووە، پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: پێی: (ئایا راستە تۆ برای ئەوت کوشتووە؟) برای کوژراوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! ئەگەر پێ لەتاوانەکەیشی نەنێ، بەڵگەو شایەتی لەسەر راست دەکەمەوە، کابرای بکوژیش

چووە ژێری‌و گوتی: بەڵێ کوشتوومە، فەرمووی: (چۆن‌و بۆچی کوشتت؟). گوتی: من‌و ئەو گەڵامان لەدرەختێ دەوەران بەقەڵەنگ، هەتا کۆی بکەینەوە بۆ ئالیك‌و ئالفی ئاژەڵ، لەسەرئەوە جنێوی پێمداو تووڕەی کردم‌و رقم هەڵساو تەورێکم کێشا بەتەپڵی سەریداو کوشتم. پێغەمبەریش پێی فەرموو: (ئایا ماڵێ شتێکت هەیە کەبیدەی بەخوێنداو خۆت لەکوشتنەوە رزگار بکەیت؟) کابرا گوتی: تەنیا ئەم باڵا پۆشەو ئەم تەورەم هەیە. پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەی رادەبینی لەخزمانی خۆت کە خوێنت بۆ بدەن‌و بتکڕنەوەو لەکوشتن رزگارت بکەن؟). گوتی: من گەڵێ لەوە بێ بایەخترم لەلای خزمانم کەشتی وام بۆبکەن. پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) کە بێ هیوابوو، لەرزگارکردنی کابرا، سەری پەتەکەی کە لەملی کابرادا بوو، هەڵدا بۆ خاوەن خوێنەکەو پێی فەرموو: (ئەوە بکوژی براکەتە، چی لێ دەکەی بیکە).

جا پیاوەکە بکوژی براکەی برد بۆ شوێنێ کە لەباتی براکەی بیکوژێتەوە، جا کاتێ بردی، پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەگەر بیکوژێ ئەویش وەك ئەو بکوژە!).

جا کابرا گەڕایەوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! بۆیان گێڕامەوە کەتۆ فەرمووتە: (ئەگەر بیکوژێتەوە ئەویش وەك ئەو بکوژە!) دەی خۆمن لەخۆمەوە نایکوژمەوە، بەفەرمانی تۆ دەیکوژمەوە؟ فەرمووی (دروودی خودای لەسەر بێ): (ئەی بۆ ناتەوێ کەئەو ئۆباڵی تۆش‌و ئۆباڵی برایەکەشتی بەئەستۆ بێ، چونکە کۆستی تۆی خستووەو براکەشتی لەژیان بێ بەشکردووە) فەرمووی: پیاوەکەیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! (وادەزانم گوتیشی) بەڵێ دەمەوێ. فەرمووی: (دەی ئەگەر بیبەخشی ئۆباڵی تۆو ئۆباڵی براکەتی بەئەستۆ دەبێ) فەرمووی: جا پیاوەکە پەتەکەی فڕێداو بەرەڵای کردو نەیکوشتەوە.

**٨١٠) خوێنی ژنێ بدرێ لە ورگیو دووگیان بێو بەرەکەی فرێ بداو خۆشی بمرێو خوێنی مناڵە لەبارچووەکەیش.** (٤٣٦٥ - ٤٣٧٣)

**بابٌ: دِيَةُ الْمَرْأَةِ يُضْرَبُ بَطْنُهَا فَتُلْقِي جَنِينَهَا وَتَمُوتُ وَدِيَةُ الْجَنِينِ**

١٠٣٢- عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) قَالَ: اقْتَتَلَتِ امْرَأَتَانِ مِنْ هُذَيْلٍ فَرَمَتْ إِحْدَاهُمَا الأُخْرَى، بِحَجَرٍ، فَقَتَلَتْهَا وَمَا فِي بَطْنِهَا، فَاخْتَصَمُوا إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم)، فَقَضَى رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّ دِيَةَ جَنِينِهَا غُرَّةٌ: عَبْدٌ أَوْ وَلِيدَةٌ، وَقَضَى بِدِيَةِ الْمَرْأَةِ عَلَى عَاقِلَتِهَا وَوَرَّثَهَا وَلَدَهَا وَمَنْ مَعَهُمْ، فَقَالَ حَمَلُ بْنُ النَّابِغَةِ الْهُذَلِيُّ: يَا رَسُولَ اللَّهِ كَيْفَ أَغْرَمُ مَنْ لاَ شَرِبَ وَلاَ أَكَلَ، وَلاَ نَطَقَ وَلاَ اسْتَهَلَّ، فَمِثْلُ ذَلِكَ يُطَلُّ! فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِنَّمَا هَذَا مِنْ إِخْوَانِ الْكُهَّانِ، مِنْ أَجْلِ سَجْعِهِ الَّذِي سَجَعَ». {الحديث: ٤٣٦٧ = ٤٣٥٩ فم. تجريد/٥، رقم: ١٨٨٦ = ٥٧٥٨، ٥٧٥٩، ٥٧٦٠، ٦٧٤٠، ٦٩٠٤، ٦٩٠٩، ٦٩١٠. أبو داود. ديات: ٤٥٧٦. نسائي. قسامة: ٤٨٣٣. تحفة الأشراف: ١٣٣٢٠}:

ئەبو هورەیرە (رەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: دووژنی هوزەیلی، بوو بەشەڕیان، یەکێکیان بەردێکی گرتە ئەوی تریانو خۆیو سکەکەی کوشت، جا کەبۆ دادخوازیو دادگایی، دادیان بردەلای پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بڕیاریدا: کەخوێنی سکەکەی دەکاتە سەرێ، ئیتر ئەو سەرە بەندەبێ، یا کەنیزەك بێ دەبێ، وە بڕیاریشی دا کەخوێنی ژنە کوژراوەکەو خوێنی سکە لەبارچووەکەی لەسەر خوێنڕەسانی ژنە تاوانبارە بکوژەکەیە، نەك لەسەر ژنەکە خۆی، وە کەلەپووری ژنە کوژراوەکەشی دا بەمناڵەکانیو بەخزمەکانی تری، جا حەمەلی کوڕەزای نابیغەی هوزەلیش گوتی: ئەی پێغەمبەری خودا! من چی ببژێرم، ئەم ئاوەلەیە کە لەسکی دایکیدا کوژراوە، نەچەشکەی نانو ئاوی کردووەو، نە ورتەی لەدەم دەرهاتووەو نەنقەی لێوە هاتووە، شتی وا خوێنی نییە!

پێغەمبەریش (دروودی خودای لەسەر بێ) فەرمووی: (ئەمە بەمقسە قوتانەیدا، وا دەردەکەوێ کە لەدەستەی کوڵە نانیو کاهینانە!). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٤، ژمارە: ٢٣٢٢ — ش/د/ت/ن، ج/٤}.

## ٨١١) جۆرە زيانو برينىَ، خوێنى ناكەوىَ. (٤٤٤٠ - ٤٤٤٤)
## بابٌ: الجُبَارُ الَّذى لاديَةَ لَهُ

١٠٣٣- عَنْ أَبِى هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ) عَنْ رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) أَنَّـهُ قَالَ: « الْبِئْرُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَالْمَعْدِنُ جُبَارٌ، وَالْعَجْمَاءُ جَرْحُهَا جُبَارٌ، وَفِى الرِّكَازِ الْخُمْسُ ». {الحديث: ٤٤٤٣ = ٤٤٣٤ فم}:

ئـــەبو هـــورەيرە (رەزای خـــودای لیٚ بـــیٚ) دەفـــەرموێ: خۆشەويســـت (دروودی خـــودای لەســـەر بـــیٚ) دەفەرموێ: (كانو بير ئەگەر شتێكيان تێكەوت، يا رمان بەسەريا، شتەكە زامار بوو، يامرد، وە لەوەدا سووچى خاوەن كان، يا سووچـى خـاوەن بيرەكـەى تيانـەبوو، ئـەوە ئەو شتە خـوێنى نييـەو فيرۆيـە، هـەروەها ئـاژەڵو مـاڵاتو وڵاخـيش ئەگـەر زيانـێ بدەن، كەسێ زامـار بكـەن، بـەبێ سووچـى خاوەنەكـەيان، خـوێنى نييـە، گەنجينـەى كۆنى دۆزراوەيش پێنجيەكى هى زەكاتە). {تاج/٢، زنجيرە: ٩، ژمارە: ١٢١٥}.

**روونكردنەوە:**

لەڕاستيدا زۆر لەشێوەو وێنەو جۆرەكانى سەوداو مامەڵەو باوو نەريتو كێشە كۆمەڵايەتييـەكان، لەســەر شـێوەى دێرينيـان نـەماونو بەشـێوەيەكى تـر سـەريان هەڵداوە، ئێستا كارەساتى رێگـەو بـانو رووخـانى كـانو مـردن بـە تـەزووى كارەبـاو رووداوى دڵتەزێنى زۆرى تريـەيدا بوون، كە زانـا كۆششـكارەكان دەتـوانن لـەم جـۆرە فەرموودانە، بڕيارە شەرعييەكانيان بدۆزنەوە.



# ٢٦- نامەی پاکانە (قەسامە) (كِتَابُ الْقَسَامَةِ)

{بڕوانە: فیقهی ئاسان/٢، لاپەڕە: ٨٦٧، زنجیرە: ٣١٧ چاپی تەهران. تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩ ج/٤} + {تجرید/٣، ژمارە: ١٢٨٢ = ٣١٧٣}.

## ٨١٢) لەبابەتی پاکانەدا (قەسامەد) سوێند دەدرێ بەکێ؟. (٤٣١٨ - ٤٣٢٨)
## بَابٌ: مَنْ يحلف فِيهَا

١٠٣٤- عَنْ سَهْلِ بْنِ أَبِى حَثْمَةَ عَنْ رِجَالٍ مِنْ كُبَرَاءِ قَوْمِهِ: أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ وَمُحَيِّصَةَ خَرَجَا إِلَى خَيْبَرَ مِنْ جَهْدٍ أَصَابَهُمْا، فَأَتَى مُحَيِّصَةُ فَأَخْبَرَ أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ سَهْلٍ قَدْ قُتِلَ وَطُرِحَ فِى عَيْنٍ أَوْ فَقِيرٍ، فَأَتَى يَهُودَ فَقَالَ: أَنْتُمْ وَاللَّهِ قَتَلْتُمُوهُ، قَالُوا: وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، ثُمَّ أَقْبَلَ حَتَّى قَدِمَ عَلَى قَوْمِهِ فَذَكَرَ لَهُمْ ذَلِكَ، ثُمَّ أَقْبَلَ هُوَ وَأَخُوهُ حُوَيِّصَةُ وَهُوَ أَكْبَرُ مِنْهُ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ سَهْلٍ، فَذَهَبَ مُحَيِّصَةُ لِيَتَكَلَّمَ، وَهُوَ الَّذِى كَانَ بِخَيْبَرَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) لِمُحَيِّصَةَ: « كَبِّرْ كَبِّرْ ». (يُرِيدُ السِّنَّ)، فَتَكَلَّمَ حُوَيِّصَةُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ مُحَيِّصَةُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): « إِمَّا أَنْ يَدُوا صَاحِبَكُمْ، وَإِمَّا أَنْ يُؤْذِنُوا بِحَرْبٍ ». فَكَتَبَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) إِلَيْهِمْ فِى ذَلِكَ فَكَتَبُوا: إِنَّا وَاللَّهِ مَا قَتَلْنَاهُ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لِحُوَيِّصَةَ وَمُحَيِّصَةَ وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ: « أَتَحْلِفُونَ وَتَسْتَحِقُّونَ دَمَ صَاحِبِكُمْ »؟ قَالُوا: لاَ، قَالَ: « فَتَحْلِفُ لَكُمْ يَهُودُ »؟ قَالُوا: لَيْسُوا بِمُسْلِمِينَ، فَوَدَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ عِنْدِهِ، فَبَعَثَ إِلَيْهِمْ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِائَةَ نَاقَةٍ، حَتَّى أُدْخِلَتْ عَلَيْهِمُ الدَّارَ، فَقَالَ سَهْلٌ: فَلَقَدْ رَكَضَتْنِى مِنْهَا نَاقَةٌ حَمْرَاءُ. {الحديث: ٤٣٢٥ = ٤٣١٧ فم. تجريد/٣، رقم: ١٢٨٢ = ٣١٧٣، ٢٧٠٢، ٦١٤٣، ٦٨٩٤، ٧١٩٢. أبو داود. ديات: ٤٥٢٠. ترمذى. ديات: ١٤٢٢. نسائى. قسامة: ٤٧٢٤. تحفة الأشراف: ٤٦٤٤}:

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (ڕەزای خودای لێ بێ) فەرمووی: کۆمەڵێ لە گەورە پیاوانی خزمانی خۆم گێڕایانەوە بۆم: کە عەبدوڵڵای کوڕی سەهل و موحەییصەی کوڕی

مەسعوودی کوڕی زەیـد (رەزای خودایان لێ بێ) دەچـن بـۆ خەیبـەر، خەیبـەر ئـەو سـەردەمە ئاشتو بێ شەڕو شـۆڕ دەبـیو لەلایـەنی موسـوڵمانانەوە ئـازاد کرابـوو، لەبـەر بـاری گرانی گوزەران دەچن بۆ ئـەوێ، لـەوێ بـەناو باخـە خورماکانـا بڵاودەبنـەوە، لـەوێ عەبدوڵلایان دەکوژرێ، کە موحەییسـەی ئـامۆزای دەیدۆزێتـەوە دەڕوانـێ لـەخوێنی خۆیدا گەوزاوە، جالەوێ دەینێژێو دەگەڕێتـەوە بـۆلای جوولەکـەکانو پێیـان دەڵـێ کە عەبدوڵلا کوژراوە، وەفڕێ درابـووە کارێزێکـەوە، یانـاو بیرێکـی دەم پـەلی نزیکـە دەستەوە، وە دەڵێ: بەخودا ئێوە کوشتووتانە، دەڵێن: بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە، جـا موحەییصـە هاتـەوە بۆنـاو هۆزەکـەیو هەواڵەکـەی پـێ گـوتنو ئـەوجا خـۆیو حوەیصەی برایو عەبدوڕەحمانی کوڕی سەهل چوون بۆ خزمەتی پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) حوەیصـە لـە موحەییصـە گـەورەتر بـوو، عەبـدوڕەحمانیش بـرای کوژراوەکە بوو، جـا موحەییصـە ویسـتی قسـەبکا، چـونکە ئـەو لەگـەڵ کوژراوەکـەدا بووە لەخەیبەر، بەڵام پێغەمبەر پێی فەرموو: (ڕێزی لەخۆت گەورەتر بگرە با ئەو دەسـت بەقسـە کـردن بکـا) مەبەسـتی پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) ئـەوەبوو کێتـان بەتەمـەن گـەورەترە، بـا ئـەو دەسـت بەقسـە کـردن بکـا، جـا حوەیسـە چیرۆکەکەی گێڕایـەوە، ئـەوجا موحەییصـەی براشـی قسـەیکرد، پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بـێ) فەرمووی: (ئەگەر بەهۆی پاکانەی ئێوەوە خوێنەکە تلایـەوە بەسـەر جوولەکـەکانا، ئەوە یادەبێ خوێنی کوژراوەکەتان بدەنێ، یادەبـێ بـێ پـەیمان دەرچـنو بـارودۆخی جەنگ رابگەیەنن لەنێوانی ئێمەو ئەواندا!).

جا پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێ) سەبارەت بەم بابەتـە کاغـەزێکی نووسـی بۆیـان، ئەوانیش وەڵامیان نووسییەوە: (بەخودا ئێمە نەمان کوشتووە، جا پێغەمبـەر (دروودی خودای لەسەر بێ) بە حوەیسـەو موحەیسـەو عەبـدوڕەحمانی فـەرموو: (ئایـا ئێـوە سوێند دەخۆن کە ئەوان کوشتوویانە، هەتا خوێنی کوژراوەکەتان بچێتە ئەستۆی ئـەوانو خوێنتـان پـێ بـدەن؟). گوتیـان: نـەء، سـوێند نـاخۆین، فـەرمووی: (کەواتـە جوولەکەکان پاکانەتان بۆدەکەنو سوێندتان بۆ دەخۆن کە ئەوان نەیانکوشتووە؟).

گوتیـان: ئەوانـە موسـولمان نـین. جـا پێغەمبـەر (دروودی خـودای لەسـەر بێ) خـۆی لەوشـتری زەکات، خوێنی کوژراوەکەی دا، پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) سەد وشتری مێنگەی نارد بۆیان تاکرانە ژوورەوە بۆیان، سەهل فەرمووی: وشترێکی سووریان لەقەیەکی لێدام). {تاج/٣، زنجیرە: ٨٦، ژمارە: ٢٣٢٩} .

**ڕوونکردنەوە:**

سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە (ڕەزای خودای لێ بێ) ئەنصارییە، ئەوسییە، ڕاستتر ئەوەیە کە لەکاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا (درودی خودای لەسەر بێ) تەمەنی حەوت هەشت ساڵانە بووە، وە لەهاوڕێ بچکۆلەکانی پێغەمبەرە، گێڕانەوەی بەجوانی لە پێغەمبەرەوە هەیە، سەهل لەبوخاریدا سێ فەرموودەی هەیە، بەخەڵکی مەدینە دەژمێرێ، لەویش مردووە، (ڕەزاو ڕەحمەتی خودای لێ بێ).

### ٨١٣) هێشتنەوەی سوێندی پاکانە لەسەر شێوەی خۆی. (٤٣١٨ - ٤٣٢٨)
### بابٌ: إِقْرَارُ الْقَسَامَةِ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ

١٠٣٥- عَنْ رَجُلٍ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنَ الأَنْصَارِ: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) أَقَرَّ الْقَسَامَةَ عَلَى مَا كَانَتْ عَلَيْهِ فِي الْجَاهِلِيَّةِ. {الحديث: ٤٣٢٦ = ٤٣١٨ فم} :

پیاوێ لەیارانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێ) کە لەیاریدەدەرانی (ئەنصار) بوو، فەرمووی: پێغەمبەری خودا (درودی خوای لەسەر بێ) سوێندی پاکانە، کە سوێندێکە بە کۆمەڵ دەخورێ، لەسەر شێوەی خۆی هێشتەوە، وەك سەردەمی نەزانی چۆن بوو ئاوا.

# پێڕستی سەرە باسەکان

## ٣- نامەی رۆژوو

## ١١- نامەی ژنهێنان ٢٩٠

## ١٨- نامەی كڕین و فرۆشتن

## ١٩- نامەی مڵکانە



## ٢٠- نامەی راسپێریو خێرکردنو خەڵاتو ژینە بەخش